# به كوردى

**بەرگی چوارەم**

**پەڕاوەکانی.. هەڵگرتنەوەی ونبوو ، ستەمکاریەکان ، هاوبەشی، ڕەهن ، ئازادکردنی کۆیلە، نامە بۆ نوسراو ، بەخشین ،شایەتیدان ، ڕێکەوتن، مەرجەکان ، وەسیەت کردن، خەبات و تێکۆشان، پێنج یەکی دەستکەوت**


**نوسینی**

**أبو عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري**

**وەرگێڕانی**

**محمد ملا صالح بامۆکی**

# ( صحيح البخاري ) به كوردى

بەرگی چوارەم

نووسینی..أبو عبدالله محمد بن اسماعیل البخاری

وەرگێڕانی.. محمد ملا صالح باموكی

چاپی یەكەم ٢٠٢٣

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

دیزاین .. ئەحمەد

لە بڵاوكراوەكانی كتێبخانەی تیشك

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٤٥- كِتَابُ فِي اللقطة

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٤٥- پەڕاوێک دەربارەی هەڵگرتنەوەی ونبوو

## ١ -بابٌ: وإِذَا أَخْبَرَهُ رَبُّ اللُّقطةِ بِالعَلَامَةِ دَفَعَ إِلَيْهِ

## ١- باسێک: ئەگەر خاوەنی شتە دۆزراوەکە نیشانەکەی پێ وت دۆزەرەوەکە دەیداتەوە پێی

٢٤٢٦- حَدَّثَنَا آدَمُ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ. وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَلَمَةَ، سَمِعْتُ سُوَيْدَ بْنَ غَفَلَةَ قَالَ: لَقِيتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷺ فَقَالَ: أَخَذْتُ صُرَّةً مِائَةَ دِينَارٍ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: "عَرِّفْهَا حَوْلًا". فَعَرَّفْتُهَا حَوْلَهَا فَلَمْ أَجِدْ مَنْ يَعْرِفُهَا، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَقَالَ: "عَرِّفْهَا حَوْلًا" فَعَرَّفْتُهَا فَلَمْ أَجِدْ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ ثَلاَثًا، فَقَالَ: "احْفَظْ وِعَاءَهَا وَعَدَدَهَا وَوِكَاءَهَا، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا، وَإِلاَّ فَاسْتَمْتِعْ بِهَا". فَاسْتَمْتَعْتُ، فَلَقِيتُهُ بَعْدُ بِمَكَّةَ فَقَالَ: لَا أَدْرِي ثَلَاثَةَ أَحْوَالٍ أَوْ حَوْلًا وَاحِدًا[١].

**٢٤٢٦- سوەیدی کوڕی غەفەلە دەڵێ: بە ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ گەیشتم وتی: کیسەیەکم هەڵگرت[٢] سەد دیناری تیابوو، جا هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٣٧.

(٢) دۆزیمەوە.

**فەرمووی: ((ساڵێك جاڕی بۆ بدە))، منیش ساڵێك جاڕم بۆ دا، بەڵام كەسم نەدی بیناسێتەوە[١] (خاوەنی بێت)، پاشان هاتمەوە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ساڵێك جاڕی بۆ بدە))، (منیش ساڵێكی تر) جاڕم بۆ دا و كەسم نەدی (بیناسێتەوە و خاوەنی بێت)، پاشان بۆ جاری سێیەم هاتمەوە خزمەتی و فەرمووی: ((بزانە لەچیدایە و ژمارەی چەندە و بەچی بەستراوە، جا ئەگەر خاوەنەكەی هات[٢] باشە، ئەگەر نەهات ئەوە خۆت سوودی لێ وەرگرە [٣]))،**

**(ئوبەی دەڵێ) : منیش سوودم لێی بینی، (شوعبە دەڵێ): ئینجا دوای ماوەیەك[٤] لە مەككە بە (سەلەمەی كوڕی كوهەیل) گەیشتم و وتی: نازانم سێ ساڵ یان یەك ساڵ (جاڕی بۆ بدرێت).**

## ٢- بابُ ضَالَّةِ الإبلِ

٢٤٢٧- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَبَّاسٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ رَبِيعَةَ، حَدَّثَنِي يَزِيدُ -مَوْلَى المُنْبَعِثِ- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ النَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلَهُ عَمَّا يَلْتَقِطُهُ، فَقَالَ: "عَرِّفْهَا سَنَةً، ثُمَّ احْفَظْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا، فَإِنْ جَاءَ أَحَدٌ يُخْبِرُكَ بِهَا، وَإِلاَّ فَاسْتَنْفِقْهَا". قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَضَالَّةُ الغَنَمِ؟ قَالَ: "لَكَ، أَوْ لأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ". قَالَ: ضَالَّةُ الإِبِلِ؟ فَتَمَعَّرَ وَجْهُ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: "مَا لَكَ وَلَهَا؟ مَعَهَا حِذَاؤُهَا وَسِقَاؤُهَا، تَرِدُ المَاءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ".

## ٢- باسی (حوكمی) وشتری ونبوو

**٢٤٢٧- زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ دەڵێ: دەشتەكییەك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێ كرد دەربارەی ئەو شتانەی دەیدۆزێتەوە، ئەویش**

---

(١) خاوەنی نەبوو.

(٢) وە ناوونیشانەكەی تەواو بوو بیدەرەوە.

(٣) بیبە بۆ خۆت.

(٤) لە صەحیحی موسلیمدا دەڵێ: پاش دە ساڵ بە سەلەمە گەیشتم وتی: یەک ساڵ جاڕی بۆ بدە. صحیح مسلم فەرموودەی ژمارە (١٧٢٣).

فەرمووی: ((ساڵێك جاڕی بۆ بدە و پاشان بزانە كیسەكە و ئەو پەتەی پێی بەستراوە چییە و چۆنە، ئینجا ئەگەر كەسێك هات و ناوونیشانەكانی پێ وتیت (بیدەرەوە)، ئەگەر نا خەرجی بكە بۆ خۆت))، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەڕی ونبوو چی لێ بكرێت؟ فەرمووی: ((ئەوە بۆ تۆیە یان بۆ براكەتە یان بۆ گورگە))، وتی: ئەی وشتری ونبوو؟ ڕەنگی ڕووخساری پێغەمبەر ﷺ گۆڕا و فەرمووی: ((تۆ هەقت چییە بەسەریەوە؟ ئەو پێڵاو و جەوەنە ئاوی خۆی پێیە، دەڕوات بۆ ئاوخواردن و لەگەڵای درەختەكان دەخوات)).

## ٣- بابُ ضَالَّةِ الغَنَمِ

٢٤٢٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ يَزِيدَ -مَوْلَى المُنْبَعِثِ- أَنَّهُ سَمِعَ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ ﷺ يَقُولُ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ اللُّقَطَةِ، فَزَعَمَ أَنَّهُ قَالَ: "اعْرِفْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً". يَقُولُ يَزِيدُ: إِنْ لَمْ تُعْتَرَفِ اسْتَنْفَقَ بِهَا صَاحِبُهَا وَكَانَتْ وَدِيعَةً عِنْدَهُ -قَالَ يَحْيَى: فَهَذَا الَّذِي لَا أَدْرِي أَفِي حَدِيثِ رَسُولِ اللهِ ﷺ هُوَ أَمْ شَيْءٌ مِنْ عِنْدِهِ؟ - ثُمَّ قَالَ: كَيْفَ تَرَى فِي ضَالَّةِ الغَنَمِ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "خُذْهَا، فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ، أَوْ لِأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ". قَالَ يَزِيدُ: وَهِيَ تُعَرَّفُ أَيْضًا. ثُمَّ قَالَ: كَيْفَ تَرَى فِي ضَالَّةِ الإِبِلِ؟ قَالَ: فَقَالَ: "دَعْهَا، فَإِنَّ مَعَهَا حِذَاءَهَا وَسِقَاءَهَا، تَرِدُ المَاءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ، حَتَّى يَجِدَهَا رَبُّهَا"[1].

## ٣- باسی (حوكمی) مەڕی ونبوو

٢٤٢٨- یەزید ـی خزمەتكاری مونبەعیس- دەگێڕێتەوە كە لە زەیدی كوڕی خالیدی ﷺ بیستووە دەیوت: پرسیاری شتی دۆزراوە لە پێغەمبەر ﷺ كرا، ئەو دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بزانە لە چیدایە و بەچی بەستراوە، پاشان ساڵێك جاڕی بۆ بدە))، یەزید

(١) بڕوانە: ٩١.

دەڵێ: ئەگەر خاوەنی نەزانرا ئەوەی دۆزیویەتیەوە خەرجی بكات و سپاردە دەبێت لای، - یەحیا دەڵێ: ئا ئەمە (كە دەیڵێ) نازانم لە فەرموودەكەی پێغەمبەردایە ﷺ، یان شتێكە لە لایەن خۆیەوە وتویەتی؟- پاشان وتی: ڕاو بۆچوونت دەربارەی مەڕی ونبوو چییە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بیبە لای خۆت، چونكە بێگومان مەڕە ونبووەكە بۆ تۆیە یان بۆ براكەتە، یان بۆ گورگە))، یەزید دەڵێ: مەڕی ونبووش دەبێ جاڕی بۆ بدرێت، پاشان كابرا وتی: ئەی ڕاو بۆچوونت دەربارەی وشتری ونبوو چییە؟ دەڵێ فەرمووی: ((وازی لێ بێنە، چونكە بێگومان پێڵاو جەوەنە ئاوی خۆی پێیە، خۆی دەڕوات ئاو دەخواتەوە و (گەڵای) درەختەكان دەخوات هەتا خاوەنەكەی دەیدۆزێتەوە)).

## ٤- بابٌ: إِذَا لَمْ يُوجَدْ صَاحِبُ اللُّقَطَةِ بَعْدَ سَنَةٍ فَهْيَ لِمَنْ وَجَدَهَا

٢٤٢٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ يَزِيدَ -مَوْلَى الْمُنْبَعِثِ- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنِ اللُّقَطَةِ، فَقَالَ: "اعْرِفْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا، وَإِلاَّ فَشَأْنَكَ بِهَا". قَالَ: فَضَالَّةُ الغَنَمِ؟ قَالَ: "هِيَ لَكَ، أَوْ لأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ". قَالَ: فَضَالَّةُ الإِبِلِ؟ قَالَ: "مَا لَكَ وَلَهَا؟ مَعَهَا سِقَاؤُهَا وَحِذَاؤُهَا، تَرِدُ المَاءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ، حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا"[1].

## ٤- باسێك : ئەگەر پاش ساڵێك دۆزراوەكە خاوەنی نەبوو ئەوە بۆ ئەو كەسە دەبێ كە دۆزیویەتیەوە

٢٤٢٩- یەزید-ی خزمەتكاری مونبەعیس - كە لە زەیدی كوڕی خالیدەوە ﵁ دەگێڕێتەوە وتی: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خواو ﷺ پرسیاری شتی دۆزراوەی لێ كرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بزانە لە چیدایە و بەچی

(١) بڕوانە: ٩١.

بەستراوە، پاشان ساڵێك جاڕی بۆ بدە، جا ئەگەر خاوەنەكەی هات بۆی (بیدەرەوە)، ئەگەر نا بیبە بۆ خۆت))، (یەزید) دەڵێ: پاشان پیاوەكە وتی: دەربارەی مەڕی ونبوو (چی دەڵێیت)؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مەڕە ونبووەكە بۆ تۆیە یان بۆ براكەتە یان بۆ گورگە))، پاشان كابرا وتی: دەربارەی وشتری ونبوو (چی دەڵێیت)؟ فەرمووی: ((تۆ چیتە بەسەریەوە كە پێڵاو و جەوەنەی ئاوی خۆی پێیە، خۆی دەڕوات ئاو دەخواتەوەو (گەڵای) درەختەكان دەخوات هەتا خاوەنەكەی دەیدۆزێتەوە)).

## ٥ - بابٌ: إِذَا وَجَدَ خَشَبَةً فِي البَحْرِ أَوْ سَوْطًا أَوْ نَحْوَهُ

٢٤٣٠- وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي جَعْفَرُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ هُرْمُزَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ ذَكَرَ رَجُلًا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، وَسَاقَ الحَدِيثَ: "فَخَرَجَ يَنْظُرُ لَعَلَّ مَرْكَبًا قَدْ جَاءَ بِمَالِهِ، فَإِذَا هُوَ بِالخَشَبَةِ فَأَخَذَهَا لأَهْلِهِ حَطَبًا، فَلَمَّا نَشَرَهَا وَجَدَ المَالَ وَالصَّحِيفَةَ"[1].

## ٥- باسێک: ئەگەر لە دەریادا دارێک یان قەمچییەک یان شتێک لەوجۆرەی بینی (هەڵیبگرێت یان نا؟)

٢٤٣٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ كە باسی پیاوێكی جوولەكەی كرد، ئیتر فەرموودەكەی گێڕایەوە[2]: ((ئینجا (خاوەن قەرزەكە) لە ماڵ هاتبووە دەرەوە سەیری دەكرد، بەڵكو بەلەمێك پارەكەی بۆ هێنابێت، لەپڕ (لەناو دەریاكەدا) كۆتەرە دارێكی بینی، ئەویش وەك داری سووتاندن بردیەوە بۆ ماڵەوەیان، ئینجا كە لەتی كرد و شكاندی پارەكە و نامەكەی تێدا بینی)).

---

(١) بڕوانە: ١٤٩٨.

(٢) فەرموودەكە دوورو درێژە، بوخاری لێرەدا هەمووی ناهێنێ تەنها ئەو بەشەی دێنێ.

## ٦ - بابٌ: إِذَا وَجَدَ تَمْرَةً فِي الطَّرِيقِ

٢٤٣١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِتَمْرَةٍ فِي الطَّرِيقِ قَالَ: "لَوْلاَ أَنِّي أَخَافُ أَنْ تَكُونَ مِنَ الصَّدَقَةِ لأَكَلْتُهَا"[1].

## ٦- باسێک : ئەگەر کەسێک یەک دەنکە خورمای بینی لە ڕێگادا

**٢٤٣١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەلای دەنکێك خورمادا تێپەڕی لەڕێگادا کەوتبوو، فەرمووی: ((ئەگەر نەترسامایە لەوەی کە ئەم دەنکە خورمایە لە خورمای زەکات بێت دەمخوارد)).**

٢٤٣٢- وَقَالَ يَحْيَى: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنِي مَنْصُور. وَقَالَ زَائِدَة، عَنْ مَنْصُورِ، عَنْ طَلْحَةَ: حَدَّثَنَا أَنَس وَحَدَّثَنَا مُحَمَّد بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّام بْنِ منَبِّهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "إِنِّي لأَنْقَلِبُ إِلَى أَهْلِي، فَأَجِدُ التَّمْرَةَ سَاقِطَةً عَلَى فِرَاشِي فَأَرْفَعُهَا لآكُلَهَا، ثُمَّ أَخْشَى أَنْ تَكُونَ صَدَقَةً فَأُلقِيَهَا"[2].

**٢٤٣٢- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((بێگومان من (هەندێ جار) دەگەڕێمەوە ماڵەوە و دەنکێ خورما دەبینم لەسەر نوێنەکەم کەوتووە، جا بەرزی دەکەمەوە تا بیخۆم، پاشان دەترسم لە خورمای زەکات بێت، بۆیە فڕێی دەدەم)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٠٥٥.

(٢) بڕوانە: ٢٠٥٥.

# ٧ - بابٌ: كَيْفَ تُعَرَّفُ لُقطةُ أهْلِ مَكّةَ؟

وَقَالَ طَاوُسٌ: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ "لا يَلتَقِطُ لُقَطَتَهَا إِلَّا مَنْ عَرَّفَهَا". وَقَالَ خَالِد: عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ "لَا تُلْتَقَطُ لُقَطَتُهَا إِلَّا لِمُعَرِّفٍ".

## ٧- باسێک: چۆن جاڕ دەدرێت بۆ شتی ونبووی خەڵكی مەككە؟

**تاووس لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((ونبووی مەککە هەڵناگیرێت مەگەر بۆ کەسێك جاڕی بۆ بدات))، وە خالید لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ونبووی مەککە هەڵناگیرێت مەگەر کەسێك جاڕی بۆ بدات)).**

٢٤٣٣- وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ سَعِيدٍ حَدَّثَنَا رَوْحٌ حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ عَنْ عِكْرِمَةَ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَا يُعْضَدُ عِضَاهُهَا وَلَا يُنَفَّرُ صَيْدُهَا وَلَا تَحِلُّ لُقَطَتُهَا إِلَّا لِمُنْشِدٍ وَلَا يُخْتَلَى خَلَاهَا فَقَالَ عَبَّاسٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِلَّا الْإِذْخِرَ فَقَالَ إِلَّا الْإِذْخِرَ[1].

**٢٤٣٣- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مەککە درەختی نابڕدرێت و نێچیری ڕاو نانرێت، هەڵگرتنەوەی ونبووی ڕەوا نییە بۆ جاڕدەر نەبێ، گیا و پووشی نابڕدرێت))، جا عەبباس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە (ئیزخیر) گژوگیا، فەرمووی: ((جگە لە ئیزخیر)).**

٢٤٣٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ

(١) بڕوانە: ١٣٤٩.

قَالَ: لَمَّا فَتَحَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ مَكَّةَ قَامَ فِي النَّاسِ، فَحَمِدَ اللهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: "إِنَّ اللهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الفِيلَ، وَسَلَّطَ عَلَيْهَا رَسُولَهُ وَالمُؤْمِنِينَ، فَإِنَّهَا لَا تَحِلُّ لأَحَدٍ كَانَ قَبْلِي، وَإِنَّهَا أُحِلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، وَإِنَّهَا لَا تَحِلُّ لأَحَدٍ بَعْدِي، فَلَا يُنَفَّرُ صَيْدُهَا وَلَا يُخْتَلَى شَوْكُهَا، وَلَا تَحِلُّ سَاقِطَتُهَا إِلَّا لِمُنْشِدٍ، وَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ: إِمَّا أَنْ يُفْدَى، وَإِمَّا أَنْ يُقِيدَ". فَقَالَ العَبَّاسُ: إِلَّا الإِذْخِرَ، فَإِنَّا نَجْعَلُهُ لِقُبُورِنَا وَبُيُوتِنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "إِلَّا الإِذْخِرَ". فَقَامَ أَبُو شَاهٍ -رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ اليَمَنِ- فَقَالَ: اكْتُبُوا لِي يَا رَسُولَ اللهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "اكْتُبُوا لأَبِي شَاهٍ". قُلْتُ لِلأَوْزَاعِيِّ: مَا قَوْلُهُ: اكْتُبُوا لِي يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ هَذِهِ الخُطْبَةَ الَّتِي سَمِعَهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ[1].

**٢٤٣٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: -کاتێك خوا شاری مەککەی لەسەر دەستی پێغەمبەرەکەی ﷺ ئازاد کرد، پێغەمبەر ﷺ لەناو خەڵکەکەدا هەستایەوە (وتارێکی دا)، سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: ((بێگومان خوای گەورە (خاوەن) فیلەکانی ڕاگرت (و نەیهێشت بڕۆنە) مەککە، (کە بەنیاز بوون کەعبە بڕوخێنن)، وە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئیماندارانی زاڵ کرد بەسەر مەککە و دانیشتووانەکەیدا، ئەوسا بزانن بۆ هیچ کەس پێش من حەڵاڵ نەبووە (بجەنگێ تێیدا)، بەڵام بێگومان لەساتێکی ڕۆژدا جەنگان بۆ من تیایدا حەڵاڵ کرا، وە بێگومان لەدوای منیش بۆ کەس حەڵاڵ نابێ، جا کەواتە نێچیری ڕاو نانرێ، دڕکی هەڵناکەنرێ و دروست نییە شتی ونبوو (ی خەڵك) هەڵگیرێتەوە، مەگەر (هەڵگرەوەکە) جاڕی بۆ بدات، وە هەر کەس کەسێکی کوژرا ئەوە کەس و کارەکەی سەرپشکە لەم دوو بڕیارە: یان خوێنی دەدرێ، یان (بکوژەکە) دەکوژرێتەوە)). جا عەبباس(ی کوڕی عەبدولموتتەلیب) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە گژوگیا، چونکە ئێمە بۆ ماڵ و گۆڕەکانمان بەکاری دەهێنین؟**

---

(١) بڕوانە: ١١٢.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((جگە لەگژوگیا))، جا ئەبو شاه- کە پیاوێکی یەمەنی بوو- هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو فەرموودەی خۆتم بۆ بنووسنەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەو فەرمووده بنووسنەوە بۆ ئەبو شاه))، (وەلیدی کوڕی موسلیم دەڵێ): وتم بە ئەوزاعی: مەبەست لە (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم وتارەی خۆتم بۆ بنووسنەوە) چی بوو؟ وتی: مەبەستی ئەو وتارە بوو کە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست.

## ٨ - بابٌ:لَا تُحْتَلَبُ مَاشِيَةُ أَحَدٍ بِغَيْرِ بإذْنه

٢٤٣٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "لَا يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ امْرِئٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِ، أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ تُؤْتَى مَشْرُبَتُهُ فَتُكْسَرَ خِزَانَتُهُ، فَيُنْتَقَلَ طَعَامُهُ؟ فَإِنَّمَا تَخْزُنُ لَهُمْ ضُرُوعُ مَوَاشِيهِمْ أَطْعِمَاتِهِمْ، فَلاَ يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِهِ".

## ٨- باسێک: ئاژەڵی هیچ کەس نادۆشرێت بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی

٢٤٣٥- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هیچ کەسێك ئاژەڵ و ماڵاتی کەس نەدۆشێت بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی، ئایا کەسێك لە ئێوە پێی خۆشە ڕۆیشتبنە شوێنی خۆراك و گەنجینەکەی شکێنرابێ، وە خۆراکەکە گوێزرابێتەوە (و بردرا بێت)؟ چونکە بێگومان گوانی ئاژەڵەکانیان خواردنی ئەوانی تێدا هەڵگیراوە، کەواتە با کەس ئاژەڵی کەسی تر نەدۆشێت بە مۆڵەتی خاوەنەکەی نەبێت)).

## ٩ - بابٌ: إِذَا جَاءَ صَاحِبُ اللُّقَطَةِ بَعْدَ سَنَةٍ رَدَّهَا عَلَيْهِ" لأَنَّهَا وَدِيعَةٌ عِنْدَهُ

٢٤٣٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ يَزِيدَ -مَوْلَى الْمُنْبَعِثِ- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنِ اللُّقَطَةِ، قَالَ: "عَرِّفْهَا سَنَةً، ثُمَّ اعْرِفْ وِكَاءَهَا وَعِفَاصَهَا، ثُمَّ اسْتَنْفِقْ بِهَا، فَإِنْ جَاءَ رَبُّهَا فَأَدِّهَا إِلَيْهِ". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، فَضَالَّةُ الغَنَمِ؟ قَالَ: "خُذْهَا، فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ، أَوْ لِأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ". قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَضَالَّةُ الإِبِلِ؟ قَالَ: فَغَضِبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى احْمَرَّتْ وَجْنَتَاهُ -أَوِ احْمَرَّ وَجْهُهُ- ثُمَّ قَالَ: "مَا لَكَ وَلَهَا؟ مَعَهَا حِذَاؤُهَا وَسِقَاؤُهَا، حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا"[١].

## ٩- باسێک: ئەگەر خاوەنی شتە ونبووەکە پاش ساڵێک هات بیداتەوە پێی، چونکە سپاردە بووە لای دۆزەرەوەکە

**٢٤٣٦- یەزیدی - خزمەتکاری مونبەعیس - لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پیاوێك پرسیاری شتی دۆزراوەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ساڵێك جاری بۆ بدە، پاشان بزانە بەچی بەستراوە و لە چیدایە، پاشان خەرجی بکە، جا ئەگەر خاوەنەکەی هات بۆی بیدەرەوە))، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی بۆ مەڕی ونبوو (چی دەفەرمووی)؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مەڕە ونبووەکە ببە لای خۆت، چونکە بێگومان مەڕەکە بۆ تۆیە یان بۆ براکەتە، یان بۆ گورگە))، (پاشان کابرا) وتی: ئەی بۆ وشتری ونبوو (چی دەفەرمووی)؟ زەید وتی: جا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە توڕە بوو هەتا هەردوو**

(١) بڕوانە: ٩١.

كوڵمی سوور بوونەوە- یان ڕووخساری سوور بویەوە-، پاشان فەرمووی: ((تۆ چیتە بەسەریەوە؟ كە پێڵاو و جەوەنەی ئاوی خۆی پێیە، (خۆی دەڕوات ئاو دەخواتەوەو گەڵای درەختەكان دەخوات) هەتا خاوەنەكەی دەیدۆزێتەوە)).

## ١٠ - بَابٌ: هَلْ يَأْخُذُ اللُّقَطَةَ وَلَا يَدَعُهَا تَضِيعُ حَتَّى لَا يَأْخُذَهَا مَنْ لَا يَسْتَحِقُّ؟

٢٤٣٧- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ قَالَ: سَمِعْتُ سُوَيْدَ بْنَ غَفَلَةَ قَالَ: كُنْتُ مَعَ سَلْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَزَيْدِ بْنِ صُوحَانَ فِي غَزَاةٍ، فَوَجَدْتُ سَوْطًا. فَقَالَ لِي: أَلْقِهِ. قُلْتُ: لَا، وَلَكِنْ إِنْ وَجَدْتُ صَاحِبَهُ، وَإِلَّا اسْتَمْتَعْتُ بِهِ. فَلَمَّا رَجَعْنَا حَجَجْنَا، فَمَرَرْتُ بِالْمَدِينَةِ، فَسَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷺ، فَقَالَ: وَجَدْتُ صُرَّةً عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ فِيهَا مِائَةُ دِينَارٍ، فَأَتَيْتُ بِهَا النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: "عَرِّفْهَا حَوْلًا". فَعَرَّفْتُهَا حَوْلًا ثُمَّ أَتَيْتُ، فَقَالَ: "عَرِّفْهَا حَوْلًا". فَعَرَّفْتُهَا حَوْلًا ثُمَّ أَتَيْتُهُ، فَقَالَ: "عَرِّفْهَا حَوْلًا". فَعَرَّفْتُهَا حَوْلًا ثُمَّ أَتَيْتُهُ الرَّابِعَةَ، فَقَالَ: "اعْرِفْ عِدَّتَهَا وَوِكَاءَهَا وَوِعَاءَهَا، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا، وَإِلَّا اسْتَمْتِعْ بِهَا"[1].

حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سَلَمَةَ بهذا قَالَ: فَلَقِيتُهُ بَعْدُ بِمَكَّةَ، فَقَالَ: لَا أَدْرِي أَثَلَاثَةَ أَحْوَالٍ أَوْ حَوْلًا وَاحِدًا.

## ١٠- باسێك: ئایا (دروستە) كەسێك شتی ونبوو هەڵگرێتەوە وازی لێ نەهێنێت بفەوتێت تا كەسێكی نەشیاو هەڵینەگرێتەوە؟

٢٤٣٧- سوەیدی كوڕی غەفلە دەڵێ: من لەگەڵ سولەیمانی كوڕی ڕەبیعە و زەیدی كوڕی صوحاندا بووم لە غەزایەكدا، ئینجا قەمچییەكەم دۆزیەوە، (یەكێكیان) پێی

---

(١) بڕوانە: ٢٤٢٦.

وتم: فرێی بدە، وتم: نەخێر فرێی نادەم، بەڵكو ئەگەر خاوەنەكەیم دۆزیەوە (دەیدەمەوە)، نەشمدۆزیەوە بۆ خۆم سوودی لێ دەبینم، جا كە گەڕاینەوە حەجمان كرد و بەناو مەدینەدا تێپەڕیم و پرسیارم لە ئوبەی كوڕی كەعب كرد ، ئوبەیش وتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ كیسەیەكم دۆزیەوە سەد دیناری تێدابوو، بردمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: ((ساڵێك جاڕی بۆ بدە))، منیش ساڵێك جاڕم بۆ دا، پاشان هاتمەوە خزمەتی، فەرمووی ﷺ: ((ساڵێك جاڕی بۆ بدە))، ئینجا ساڵێك جاڕم بۆ دا، پاشان هاتمەوە خزمەتی بۆ چوارەم جار و فەرمووی: ((بزانە چەند دانەیە و بەچی بەستراوە و لەچیدایە، ئینجا ئەگەر خاوەنەكەی هات (بیدەرەوە)، ئەگەر نەهات خۆت سوودی لێ ببینە)).
(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) عەبدان بۆی گێڕامەوە وتی: باوكم بۆی گێڕامەوە لە شوعبەوە لە سەلەمەوە ئەم فەرموودەی بۆ گێڕامەوە، شوعبە دەڵێ: دواتر لە مەككە بەسەهلی كوڕی كوهەیل گەیشتم، وتی: نازانم سێ ساڵ یان یەك ساڵی بوو (كە جاڕی بۆ بدات).

## ١١- بابُ مَنْ عَرَّفَ اللُّقطَةَ وَلَمْ يَدْفَعْهَا إِلى السُّلْطانِ

٢٤٣٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ رَبِيعَةَ، عَنْ يَزِيدَ -مَوْلَى المُنْبَعِثِ- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ اللُّقَطَةِ، قَالَ: "عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ جَاءَ أَحَدٌ يُخْبِرُكَ بِعِفَاصِهَا وَوِكَائِهَا، وَإِلَّا فَاسْتَنْفِقْ بِهَا". وَسَأَلَهُ عَنْ ضَالَّةِ الإِبِلِ، فَتَمَعَّرَ وَجْهُهُ قَالَ: "مَا لَكَ وَلَهَا؟ مَعَهَا سِقَاؤُهَا وَحِذَاؤُهَا، تَرِدُ المَاءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ، دَعْهَا حَتَّى يَجِدَهَا رَبُّهَا". وَسَأَلَهُ عَنْ ضَالَّةِ الغَنَمِ، فَقَالَ: "هِيَ لَكَ أَوْ لِأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ"[1].

---

(١) بڕوانە: ٩١.

## ١١- باسی کەسێک جاڕ بدات بۆ شتی ونبوو و نەیدات بە دەسەڵاتدارانی وڵات

٢٤٣٨- یەزید -ی خزمەتکاری مونبەعیس- لە زەیدی کوڕی خالیدەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە دەشتەکییەك دەربارەی شتی دۆزراوە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ساڵێك جاڕی بۆ بدە، جا ئەگەر کەسێك پێی وتیت لە چیدایە و بەچی بەستراوە (بۆی بگێڕەرەوە)، ئەگەر کەسیش نەهات ئەوە بۆ خۆت خەرجی بکە))، وە پرسیاری لێ کرد دەربارەی وشتری ونبوو، ڕووخساری پێغەمبەر ﷺ گرژ بوو، فەرمووی: ((تۆ چیتە بەسەریەوە؟ کە پێڵاو و جەوەنەی ئاوی خۆی پێیە، خۆی دەڕوات ئاو دەخواتەوەو (گەڵای) درەختەکان دەخوات، هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە))، هەروەها دەربارەی مەڕی ونبوو پرسیاری لێ کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((مەڕەکە بۆ تۆیە یان بۆ براکەتە، یان بۆ گورگە)).

## ١٢- بابٌ

٢٤٣٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا النَّضْرُ، أَخْبَرَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: أَخْبَرَنِي البَرَاءُ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ ﷺ. حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ رَجَاءٍ حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ ﷺ قَالَ: انْطَلَقْتُ، فَإِذَا أَنَا بِرَاعِي غَنَمٍ يَسُوقُ غَنَمَهُ فَقُلْتُ: لِمَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: لِرَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ. فَسَمَّاهُ فَعَرَفْتُهُ. فَقُلْتُ: هَلْ فِي غَنَمِكَ مِنْ لَبَنٍ؟ فَقَالَ: نَعَمْ. فَقُلْتُ: هَلْ أَنْتَ حَالِبٌ لِي؟ قَالَ: نَعَمْ. فَأَمَرْتُهُ، فَاعْتَقَلَ شَاةً مِنْ غَنَمِهِ، ثُمَّ أَمَرْتُهُ أَنْ يَنْفُضَ ضَرْعَهَا مِنَ الغُبَارِ، ثُمَّ أَمَرْتُهُ أَنْ يَنْفُضَ كَفَّيْهِ، فَقَالَ هَكَذَا -ضَرَبَ إِحْدَى كَفَّيْهِ بِالأُخْرَى- فَحَلَبَ كُثْبَةً مِنْ لَبَنٍ، وَقَدْ جَعَلْتُ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ إِدَاوَةً عَلَى فَمِهَا خِرْقَةٌ، فَصَبَبْتُ عَلَى اللَّبَنِ، حَتَّى بَرَدَ أَسْفَلُهُ، فَانْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقُلْتُ: اشْرَبْ يَا رَسُولَ اللهِ. فَشَرِبَ حَتَّى رَضِيتُ[1].

---

(١) بڕوانە: ٣٦١٥، ٣٦٥٢، ٣٩٠٨، ٣٩١٧، ٥٦٠٧.

## ١٢- باسێک

٢٤٣٩- ئەبو بەکر[١] ﷺ دەڵێ: ڕۆیشتم، جا شوانەمەڕێکم بینی مەڕەکانی دابوویە بەر و دەیبردن، منیش پێم وت: تۆ شوانی کێیت؟ وتی: شوانی پیاوێکی قورەیشیم و ناوی هێنا و منیش ناسیم، جا وتم: لەناو مەڕەکانتاندا هەیە شیری هەبێت؟ وتی: بەڵێ، وتم: ئایا بۆم دەدۆشیت؟ وتی: بەڵێ، جا فەرمانم پێکرد بیدۆشێت، شوانەکەش مەڕێکی لە ڕانەکە گرت، پاشان فەرمانم پێکرد کە گوانی مەڕەکە لە تۆزو خۆڵ بتەکێنێت، پاشان فەرمانم پێکرد تۆزوخۆڵی دەستەکانیشی بتەکێنێت، جا وتی: ئاوەها -دەستێکیانی دا بەدەستەکەی تریدا- جا کەمێك شیری دۆشی، وە جەوەنەیەك کە پەڕۆیەك بەسەر دەمەکەیەوە بوو تایبەتم کردبوو بە پێغەمبەری خواوە ﷺ، جا ئاوم کرد بەسەر شیرەکەدا هەتا ژێرەکەی سارد بوو، ئەوسا بردمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺو وتم: فەرموو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیخۆرەوە، ئەویش ئەوەندەی خواردەوە هەتا دڵخۆش بووم[٢].

---

(١) ئەم فەرموودەیە بوخاری بە دوو ڕێگا هێناویەتی، یەکێکیان درێژە و یەکێکیان کورتە.

(٢) کە پێغەمبەر ﷺ زۆری خواردەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٤٦- كِتابُ المظَالِمِ في المظَالِمِ والغَصْبِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٤٦- پەڕاوی ستەمكاريەكان

## دەربارەی ستەمكاريەكان و داگيركردن

**وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى:** ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ ﴿٤٣﴾ ﴾ **إبراهيم**. رَافِعِي الْمُقْنِعُ وَالْمُقْمِحُ وَاحِدٌ وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ مُهْطِعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ **إبراهيم**. مُدِيمِي النَّظَرِ وَيُقَالُ مُسْرِعِينَ: ﴿ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ۖ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾ ﴾ **إبراهيم**. يَعْنِي جُوفًا لَا عُقُولَ لَهُمْ: ﴿ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ ۗ أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِى مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدْ مَكَرُوا۟ مَكْرَهُمْ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ ﴿٤٦﴾ فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤٧﴾ ﴾ **إبراهيم**.

**وە باسی ئەم فەرمايشتەی خوای بەرز و بڵند: (وا مەزانە خوا بێ ئاگايە لەوەی ستەمكاران دەيكەن، بێگومان ئەو دوايان دەخات بۆ ڕۆژێك كە چاوەكان تێيدا ئەبڵەق دەبن (و نانۆقێن) لەترسا بەچەسپانی دەڕۆن (بەدەم بانگ كەريانەوە)،**

سەریان بەرز کردۆتەوە (بۆ ئاسمان)، ﴿ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ ﴾ واتە: سەریان بەرزکردۆتەوە بۆ ئاسمان، (الْمُقْنِعُ) لەگەڵ (الْمُقْمِحُ) ماناکەیان وەك یەك وایە.

موجاهید دەڵێ: ﴿ مُهْطِعِينَ ﴾ بەردەوام دەڕوانن، وە دەوترێ: ﴿ مُهْطِعِينَ ﴾ یانی بە چەسپانی دەڕۆن (پێڵوی چاویان ناتروكێنن و دڵیان خاڵییە لەتێگەشتن)، واتە: ناوەوەیان خاڵییە لەژیری و تێگەشتن، (وە ئەی موحەممەد ﷺ خەڵکی ئاگادار بکە و بترسێنە لەو ڕۆژەی کە سزایان بۆ دێت، ئینجا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە (لەسەرەمەرگدا) دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان بۆ ماوەیەکی کەم دوامان بخە تا وەڵامی بانگەوازەکەت بدەینەوە و شوێنی پێغەمبەران بکەوین، ئەی ئێوە نەبوون پێشتر سوێندتان خوارد کە هەگیز لەناوناچن، هەر لەجێ و شوێنی ئەوانە نیشتەجێ بوون کە ستەمیان لە خۆیان کرد، بەڕوونی بۆتان دەرکەوت کە چیمان بەسەر هێنان، نموونەی زۆریشمان بۆتان هێنایەوە، بێگومان ئەو (بێ باوەڕانە) پیلانی گەورەی خۆیانیان گێڕا (دژی پێغەمبەرەکانیان)، بەڵام هەموو پیلانەکەیان لای خوا (نووسراوە)، وە هەرچەند پیلانەکەیان شاخەکانی پێ بترازێ و لەبن بێ، جا وا گومان مەبە خوا ئەو بەڵێنەی داویەتی بە پێغەمبەران بەدی ناهێنێ، بەڕاستی خودا خاوەن دەسەڵاتی تۆڵەسێنە).

## ١- بابُ قِصَاصِ المَظَالِمِ

٢٤٤٠- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي المُتَوَكِّلِ النَّاجِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: "إِذَا خَلَصَ المُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ حُبِسُوا بِقَنْطَرَةٍ بَيْنَ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيَتَقَاصُّونَ مَظَالِمَ كَانَتْ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيَا، حَتَّى إِذَا نُقُّوا وَهُذِّبُوا أُذِنَ لَهُمْ بِدُخُولِ الجَنَّةِ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ ﷺ بِيَدِهِ

لأَحَدُهُمْ بِمَسْكَنِهِ فِي الجَنَّةِ أَدَلُّ بِمَنْزِلِهِ كَانَ فِي الدُّنْيَا". وَقَالَ يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ عَنْ قَتَادَةَ حَدَّثَنَا أَبُو المُتَوَكِّلِ[1].

## ١- باسی تۆڵەسەندنەوەی ستەمکارییەکان

**٢٤٤٠- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((کاتێ باوەڕداران لەئاگری دۆزەخ ڕزگاریان بوو، لە پردێکدا لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا ڕادەگیرێن، ئینجا تۆڵەی ئەو ستەمکارییانەی لەدونیادا لە نێوانیاندا بووە لە یەکتری دەسەننەوە، هەتا پاك و خاوێن دەکرێنەوە ڕێگەیان پێ دەدرێت بە چوونە بەهەشت، ئینجا سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، هەر یەك لەو بەهەشتییانە شارەزاترە بە ماڵەکەی لە بەهەشتدا لەو ماڵەی کە هەیبووە لە دونیادا))، (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) یونوسی کوڕی موحەممەد دەڵێ: شەیبان بۆی گێڕاینەوە لە قەتادەوە دەڵێ: ئەبو موتەوەکیل بۆی گێڕاینەوە[2].**

## ٢- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾﴾ هود.

٢٤٤١- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ قَالَ: أَخْبَرَنِي قَتَادَةُ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ المَازِنِيِّ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أَمْشِي مَعَ ابْنِ عُمَرَ ﷺ آخِذٌ بِيَدِهِ إِذْ عَرَضَ رَجُلٌ، فَقَالَ: كَيْفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فِي النَّجْوَى؟ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: "إِنَّ اللهَ يُدْنِي المُؤْمِنَ فَيَضَعُ عَلَيْهِ كَنَفَهُ، وَيَسْتُرُهُ فَيَقُولُ: أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ فَيَقُولُ:

(١) بڕوانە: ٦٥٣٥.

(٢) مەبەستی بوخاری لە گێڕانەوەی ئەم سەنەدە موعەلەقە ئەوەیە کە بڵێ: قەتادە بەڕاشکاوی لە ئەبو موتەوەکیلی بیستووە و گێڕاوەتەوە.(إرشاد الساري:٤٤٧/٥).

نَعَمْ أَيْ رَبِّ. حَتَّى إِذَا قَرَّرَهُ بِذُنُوبِهِ وَرَأَى فِي نَفْسِهِ أَنَّهُ هَلَكَ قَالَ: سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا، وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَكَ اليَوْمَ. فَيُعْطَى كِتَابَ حَسَنَاتِهِ، وَأَمَّا الكَافِرُ وَالمُنَافِقُونَ، فَيَقُولُ الأَشْهَادُ: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ﴾ هود[١].

## ٢-باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بێداربن نەفرینی خوا بۆ ستەمکارانە)

**٢٤٤١- صەفوانی کوڕی موحریزی مازینی وتی: لەکاتێکدا من دەستی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم ﷺ گرتبوو لەگەڵیدا بەڕێگادا دەڕۆیشتم، لەپڕ کابرایەکی تووش هات و وتی: دەربارەی چپە و سرتەکردن[٢] چۆنت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە؟ عەبدوڵڵاش وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بێگومان خوا باوەڕدار لەخۆی نزیك دەکاتەوە، باڵی میهرەبانی خۆی لەسەر دادەنێت و دایدەپۆشێت[٣]، جا پێی دەفەرموێ: ئایا فلانە گوناهت دەزانیت (بیرت دێتەوە)؟ ئایا فلانە گوناهت لەبیرە؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، تا وای لێ دەکات دان بنێت بەهەموو گوناهەکانیدا، وە لە ناخی خۆیدا دڵنیا دەبێ تیاچووە، خوا دەفەرموێ: لە دنیادا بۆم پۆشیت، وە من ئەمڕۆش لێت خۆش دەبم و بۆت دەپۆشم، ئەوسا نامەی چاکەکانی دەدرێت بەدەستیەوە، بەڵام کافر و ناپاکەکان شایەتەکان[٤] پێیان دەڵێن: (ئا ئەوانە ئەو کەسانەن (لە دونیادا) درۆیان هەڵدەبەست بەناوی پەروەردگاریانەوە، بێداربن نەفرینی خودا بۆ ستەمکارانە).**

(١) بڕوانە: ٤٦٨٥، ٦٠٧٠، ٧٥١٤.

((٢) مەبەستی چپەو سرتەکردنە لە نێوان خوداو بەندەکانیدا لە ڕۆژی قیامەتدا. (بڕوانە:إرشاد الساری: ٤٤٨/٥).

((٣) لەو خەڵکەی لەوێدان لە ڕۆژی قیامەتدا.

((٤) وە شایەتەکان لە پێغەمبەران و فریشتەکان، هەموو مرۆڤ وجنۆکەکان.

## ٣ - بابٌ: لَا يَظْلِمُ المُسْلِمُ المُسْلِمَ وَلَا يُسْلِمُهُ

٢٤٤٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ سَالِمًا أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "المُسْلِمُ أَخُو المُسْلِمِ، لَا يَظْلِمُهُ وَلَا يُسْلِمُهُ، وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللهُ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرُبَاتِ يَوْمِ القِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ القِيَامَةِ"[1].

## ٣- باسێک: مسوڵمان ستەم لە مسوڵمان ناکات و پشتی بەرنادات[2]

**٢٤٤٢- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مسوڵمان برای مسوڵمانە، ستەمی لێ ناکات، پشتی بەرنادات (لە بەرانبەر ناحەزیدا کە ستەمی لێ بکات)، وە هەرکەس پێویستی برایەکی جێبەجێ بکات، خواش پێویستی ئەو جێبەجێ دەکات، هەر کەسێکیش ناڕەحەتییەك لەسەر مسوڵمانێك لا بات، خواش ناڕەحەتییەك لە ناڕەحەتییەکانی ڕۆژی قیامەتی لەسەر لادەبات، هەرکەسێکیش (کەموکوڕی) مسوڵمانێك بپۆشێت، خواش لەڕۆژی قیامەتدا (کەموکوڕییەکانی) ئەو دەپۆشێت)).**

## ٤ - بابٌ: أَعِنْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا

٢٤٤٣- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَنَسٍ، وَحُمَيْدٌ الطَّوِيلُ سَمِعَا أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ "انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا"[1].

---

(١) بڕوانە: ٦٩٥١.

(٢) لَا يُسْلِمُهُ: لێناگەڕێ کەسێک یان شتێک ئەزیەت و ئازاری بدات.

## ٤- باسێک: یارمەتی براکەت بدە ستەمکار بوو یان ستەم لێکراو

**٢٤٤٣- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((یارمەتی براکەت بدە ستەمکار بوو یان ستەملێکراو)).**

٢٤٤٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا نَنْصُرُهُ مَظْلُومًا، فَكَيْفَ نَنْصُرُهُ ظَالِمًا؟ قَالَ: "تَأْخُذُ فَوْقَ يَدَيْهِ"[٢].

**٢٤٤٤- ئەنەس ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((یارمەتی براکەت بدە ستەمکار بوو یان ستەملێکراو))، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی کە ستەملێکراوە یارمەتی دەدەین، ئەی چۆن یارمەتی بدەین کە ستەمکار بوو؟! فەرمووی: ((دەستی بگرە لە ستەم کردن)).**

## ٥- بابُ نَصْرِ المَظْلُومِ

٢٤٤٥- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَشْعَثِ بْنِ سُلَيْمٍ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ سُوَيْدٍ، سَمِعْتُ البَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ بِسَبْعٍ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ. فَذَكَرَ: عِيَادَةَ المَرِيضِ، وَاتِّبَاعَ الجَنَائِزِ، وَتَشْمِيتَ العَاطِسِ، وَرَدَّ السَّلَامِ، وَنَصْرَ المَظْلُومِ، وَإِجَابَةَ الدَّاعِي، وَإِبْرَارَ المُقْسِمِ[٣].

---

(١) بڕوانە: ٢٤٤٤، ٦٩٥٢.

(٢) بڕوانە: ٢٤٤٣.

(٣) بڕوانە: ١٢٣٩.

## ٥- باسی یارمەتیدانی ستەم لێكراو

**٢٤٤٥- بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێكردین بەحەوت شت، ڕێگریشی لێ كردین لەحەوت شت، جا فەرمووی: سەردانی نەخۆش، شوێن جەنازە و مردووان كەوتن، وتنی (یرحمك الله) بۆ كەسێك كە دەپژمێت و دەڵێ: (الحمد لله)، وەڵامدانەوەی سەلامكردن، یارمەتیدانی ستەم لێكراو، بەدەم داوەتەوە چوون، نەشكاندنی سوێندی كەسێك كە سوێندی خواردوە.**

٢٤٤٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "المُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا". وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ[1].

**٢٤٤٦- ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرمووی: ((باوەڕدار بۆ باوەڕدار وەك كۆشك وایە، هەندێكی هەندێكی تری بەیەكەوە دەبەستێت و قایم دەكات))، ئینجا پەنجەكانی كرد بەناو یەكتریدا.**

## ٦- بابُ الانْتِصَارِ مِنَ الظَّالِمِ

لِقَوْلِهِ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿ لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾ ﴾ النساء. ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الشورى، قَالَ إِبْرَاهِيمُ: كَانُوا يَكْرَهُونَ أَنْ يُسْتَذَلُّوا، فَإِذَا قَدَرُوا عَفَوْا.

## ٦- باسی تۆڵەسەندنەوە لە ستەمكار

**بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (خوا ئاشكراكردنی قسەی نابەجێ و خراپی پێ خۆش نییە، مەگەر كەسێك ستەمی لێكرا بێ (بۆی دروستە خراپەی**

(١) بڕوانە: ٤٨١.

ستەمكار ئاشكرا بكات)، وە خوا هەمیشە بیسەری زانایە)، (وە ئەوانەی كاتێك دەست درێژیان لێ دەكرێت تۆڵەی خۆیان دەسێنن، وە سەر داناخەن). ئیبراهیم دەڵێ: پێشینان پێیان ناخۆش بوو زەبوون بكرێن، بەڵام ئەگەر دەسەڵاتیان هەبووایە دەبوران و چاوپۆشیان دەكرد.

## ٧- بابُ عَفْوِ المَظْلُومِ

لِقَوْلِهِ تَعَالَى ﷻ: ﴿ إِن تُبْدُواْ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُواْ عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾ ﴾ النساء. ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿٤٣﴾ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِىٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴿٤٤﴾ ﴾ الشورى.

## ٧- باسی لێبوردنی ستەم لێكراو

بەبەڵگەی فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەگەر خێر و چاكە دەرخەن (بە ئاشكرا بیكەن) یان بیشارنەوە، یان ببورن لە خراپەیەك، ئەوە بێگومان خوا هەمیشە لێبوردەی بەتوانایە)، (وە تۆڵەی هەر خراپەیەك خراپەیەكە بە وێنەی خۆی، جا هەركەسێك ببورێ و ئاشتی بكات، ئەوە پاداشتی ئەو لای خوایە، بەڕاستی خوا ستەمكارانی خۆش ناوێ، وە هەركەس تۆڵە بسەنێ لەپاش ئەوەی ستەمی لێكراوە، ئا ئەوانە هیچ خەتایەكیان لەسەر نییە، خەتا هەر لەسەر ئەو كەسانەیە كە ستەم لە خەڵكی دەكەن، وە بەناهەق لەسەر زەویدا خراپەكاری دەكەن، ئەوانە سزای زۆر سەختیان بۆ هەیە، وە هەركەس خۆگر و لێبوردە بێ،

بەڕاستى ئەمە لەكارە پڕ بايەخە پەسەندەكانە، وە هەركەس خوا گومڕاى بكات، لەپاش ئەوە هيچ دۆست و يارمەتيدەرێكى نييە، وە ستەمكارەكان دەبينى كاتێك سزاى (خوا) دەبينن دەڵێن: ئايا ڕێگەيەك هەيە بگەڕێينەوە بۆ دونيا).

## ٨- بابٌ: الظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ القِيَامَةِ

٢٤٤٧- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ المَاجِشُونُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "الظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ القِيَامَةِ".

## ٨- باسێک: ستەم کردن تاریکستانە لە ڕۆژی قیامەتدا

٢٤٤٧- عەبدوڵلاى كوڕى عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموويەتى: ((ستەم كردن تاريكستانە (بۆ ستەمكارەكە) لە ڕۆژى دواييدا)).

## ٩- بابُ الِاتِّقَاءِ وَالحَذَرِ مِنْ دَعْوَةِ المَظْلُومِ

٢٤٤٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ بْنُ إِسْحَاقَ المَكِّيُّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ صَيْفِيٍّ، عَنْ أَبِي مَعْبَدٍ -مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى اليَمَنِ، فَقَالَ: "اتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومِ، فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللهِ حِجَابٌ"[1].

## ٩- باسی خۆپاراستن و ئاگا لەخۆبون لە دوعا لێکردنی ستەم لێکراو[2]

٢٤٤٨- عەبدوڵلاى كوڕى عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ موعازى نارد بۆ يەمەن و فەرمووى: ((لە دوعاو نزاى ستەم لێكراو خۆت بپارێزە، چونكە دڵنيابە لە نێوان ئەو دوعايە و خوادا هيچ پەردەيەك نييە)).

---

(١) بڕوانە: ١٣٩٥.

(٢) واتە: ستەم نەكردن و خۆپارستان لە ئەوەى ستەم لێكراو دوعات لێ بكات ئەگەر ستەمى لێ بكەيى.

## ١٠- بابُ مَنْ كَانَتْ لَهُ مَظْلَمَةٌ عِنْدَ الرَّجُلِ فَحَلَّلَهَا لَهُ، هَلْ يُبَيِّنُ مَظْلَمَتَهُ؟

٢٤٤٩- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ المَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مَنْ كَانَتْ لَهُ مَظْلَمَةٌ لأَحَدٍ مِنْ عِرْضِهِ أَوْ شَيْءٍ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهُ اليَوْمَ، قَبْلَ أَنْ لَا يَكُونَ دِينَارٌ وَلَا دِرْهَمٌ، إِنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ فَحُمِلَ عَلَيْهِ". قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: قَالَ إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ: إِنَّمَا سُمِّيَ المَقْبُرِيَّ، لأَنَّهُ كَانَ نَزَلَ نَاحِيَةَ المَقَابِرِ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: وَسَعِيدٌ المَقْبُرِيُّ هُوَ مَوْلَى بَنِي لَيْثٍ، وَهُوَ سَعِيدُ بْنُ أَبِي سَعِيدٍ، وَاسْمُ أَبِي سَعِيدٍ كَيْسَانُ[١].

## ١٠- باسی كەسێك ستەمی لێكرابێت لە لایەن كەسێكەوە و گەردنی ئەو كەسە ئازاد كرد بێت، ئایا پێویستە ستەم لێ كردنەكەی ڕوون بكاتەوە كە چییە؟

**٢٤٤٩- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەریەك ستەم و ناهەقییەكی لەبرایەكی مسوڵمانی كردبێت دەربارەی شەرەف و ئابڕووی یان هەر شتێكی تر، ئەوە با ئەمڕۆ گەردنی خۆی پێ ئازاد بكات، پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت دینار و درهەم نەبێت، ئەگەر كردەوەی چاكی هەبێت بەئەندازەی ئەو ستەمەی لەو كەسەی كردوە لێی دەسەنرێت (دەدرێت بەستەم لێكراوەكە)، وە ئەگەر چاكەی نەبوو لە گوناهی ستەم لێكراوەكە وەردەگیرێت و دەدرێت بە كۆڵیدا)). ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئیسماعیلی كوڕی ئەبو ئوەیس دەڵێ: بێگومان بۆیە سەعید بە (المَقْبُرِيَّ) ناونراوە، چونكە ڕۆیشتووە لەبەشێكی گۆڕستاندا[٢] دانیشتووە. ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ:**

(١) بڕوانە: ٦٥٣٤.

((٢) لە شاری مەدینە.(إرشاد الساري: ٥/٤٥٦)

سەعید مەقبوری خزمەتکاری بەنی لەیسە، کە سەعیدی کوڕی ئەبو سەعیدە، وە ناوی ئەبو سەعید کەیسانە.

## ١١ - بابٌ: إِذَا حَلَّلَهُ مِنْ ظُلْمِهِ فَلَا رُجُوعَ فِيهِ

٢٤٥٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂: ﴿ وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا ﴿١٢٨﴾ ﴾ النساء، قَالَتِ: الرَّجُلُ تَكُونُ عِنْدَهُ المَرْأَةُ، لَيْسَ بِمُسْتَكْثِرٍ مِنْهَا، يُرِيدُ أَنْ يُفَارِقَهَا، فَتَقُولُ: أَجْعَلُكَ مِنْ شَأْنِي فِي حِلٍّ. فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي ذَلِكَ[1].

## ١١- باسێک: ئەگەر ئازادی کرد لەو ستەمەی لێی کردووە، ئەوە بۆی نییە لەو ئازادکردنە پەشیمان بێتەوە

**٢٤٥٠- عائیشە ﵂ دەربارەی ئەم ئایەتە: (وە ئەگەر ئافرەتێك ترسا لەگوێ پێنەدان یان پشت هەڵکردنی مێردەکەی)، دەڵێ: پیاوێك هاوسەرێکی هەیە نایەوێت لە ژیانی هاوسەریدا زۆر لەگەڵیدا بمێنێتەوە، دەیەوێ تەڵاقی بدات و لێی جیابێتەوە، ئافرەتەکەش دەڵێ: سەبارەت بە هەق و مافی خۆم گەردنت ئازاد دەکەم، ئیتر ئەم ئایەتە لەو بارەیەوە دابەزی.**

## ١٢ - بابٌ: إِذَا أَذِنَ لَهُ أَوْ أَحَلَّهُ وَلَمْ يُبَيِّنْ كَمْ هُوَ

٢٤٥١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي حَازِمِ بْنِ دِينَارٍ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أُتِيَ بِشَرَابٍ، فَشَرِبَ مِنْهُ، وَعَنْ يَمِينِهِ غُلَامٌ، وَعَنْ

---

(١) بڕوانە: ٢٦٩٤، ٤٦٠١، ٥٢٠٦.

يَسَارِهِ الأَشْيَاخُ، فَقَالَ لِلْغُلاَمِ: "أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَ هَؤُلاَءِ؟ ". فَقَالَ الغُلاَمُ: لاَ وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ، لاَ أُوثِرُ بِنَصِيبِي مِنْكَ أَحَدًا. قَالَ: فَتَلَّهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي يَدِهِ"[1].

## ١٢- باسێک: ئەگەر کەسێک مۆڵەتی کەسێکی دا یان گەردنی ئازاد کرد، بەڵام ڕوونی نەکردەوە مۆڵەتدانەکە یان ئازادکردنەکە چەندە

**٢٤٥١- سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ گێڕایەوە کە جامێك ئاویان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا و لێی خواردەوە، لای ڕاستییەوە مێردمنداڵێك بوو (لە هەموو ئەو کەسانەی لەوێ بوون تەمەنی کەمتر بوو)، پیاوە پیر و بە تەمەنەکانیش لەلای چەپیەوە بوون، فەرمووی ﷺ بە مێردمنداڵەکە: ((ڕێگەم دەدەیت کە ئاوەکە بدەم بەم پیاوە بەتەمەنانە؟)) مێرد منداڵەکەش وتی: نا سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی خۆم لە بەرماوی تۆ بەکەس نادەم و باوی نادەم بەسەر خۆمدا، سەهل دەڵێ: پێغەمبەریش ﷺ جامەکەی دایە دەستی.**

## ١٣- بابُ إِثْمِ مَنْ ظَلَمَ شَيْئًا مِنَ الأَرْضِ

٢٤٥٢- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ حَدَّثَنِي طَلْحَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَمْرِو بْنِ سَهْلٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: "مَنْ ظَلَمَ مِنَ الأَرْضِ شَيْئًا طُوِّقَهُ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ"[2].

---

(١) بروانە: ٢٣٥١.

(٢) بروانە: ٣١٩٨.

## ١٣- باسی تاوانی ئەو کەسەی کەمێک لەزەوی بەستەم داگیر کردبێت

**٢٤٥٢- سەعیدی كوڕی زەید ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەركەس بەشێك لەزەوی بەستەم داگیر بكات، بە ئەندازەی حەوت چینی زەوی دەكرێتە گەردنی[1])).**

٢٤٥٣- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أُنَاسٍ خُصُومَةٌ، فَذَكَرَ لِعَائِشَةَ ﵂، فَقَالَتْ: يَا أَبَا سَلَمَةَ، اجْتَنِبِ الأَرْضَ، فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: "مَنْ ظَلَمَ قِيدَ شِبْرٍ مِنَ الأَرْضِ طُوِّقَهُ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ"[2].

**٢٤٥٣- موحەممەدی كوڕی ئیبڕاهیم دەگێڕێتەوە كە ئەبو سەلەمە ﷺ بۆی گێڕایەوە كە لە نێوان ئەو و كەسانێكدا ناكۆكی هەبوو، ئینجا ئەوەی بۆ عائیشە ﵂ باسكرد بوو، عائیشەش ﵂ وتبووی: ئەی ئەبو سەلەمە خۆت لە (داگیركردنی) زەوی بپارێزە، چونكە بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:**

---

(١) طُوِّقَهُ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ: بە چەند شێوەی تر مانا كراوە:

١- لەڕۆژی دواییدا ناچار دەكرێت ئەو زەویەی بەستەم داگیری كردوە گڵ وخۆڵەكەی بكات بە كۆڵەوە و بیبات بۆ مەحشەر

٢- ناچار دەكرێت ئەو زەویەی بەستەم داگیری كردوە، گڵەكەی هەڵ بكەنێت تا دەگاتە ئاو، پاشان بەكۆڵ هەڵی بگرێت و بیبات بۆ مەحشەر.(إرشاد الساري: ٤٥٨/٥).

٣- دەبرێت بەناخی زەویدا، جا ئەو زەوییەی داگیری كردووە دەچێتە ملی وەک تەوق، ملی ئەوەنـدە ئەستوور دەكرێت تا ئەو زەوییەی داگیری كردووە هەڵی بگرێت. ئیمامی بەغەوی دەڵـێ: ئەم مانـای سێیەمیان ڕاستر و بەهێزترە، چونكە فەرموودەكەی عەبدوڵلای كوڕی عـومەر پـشتیوانی لـێ دەكـات، كە بە ژمـارە: (٢٤٥٤) ئیمامی بوخاری هێناوەتی. بڕوانە:( إرشاد الساری: ٤٥٨/٥).

(٢) بڕوانە: ٣١٩٥.

((هەركەس بەئەندازەی بستێك لە زەوی ستەم بكات، حەوت چینی زەوییەكە(ی داگیری كردوە) دەكرێتە گەردنی)).

٢٤٥٤- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ المُبَارَكِ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مَنْ أَخَذَ مِنَ الأَرْضِ شَيْئًا بِغَيْرِ حَقِّهِ خُسِفَ بِهِ يَوْمَ القِيَامَةِ إِلَى سَبْعِ أَرَضِينَ". قال الفِرَبْرِيُّ: قَالَ أَبُو جَعْفرِ بنُ أَبِي حَاتم: قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ هَذَا الحَدِيثُ لَيْسَ بِخُرَاسَانَ فِي كِتَابِ ابْنِ المُبَارَكِ، أَمْلاَهُ عَلَيْهِمْ بِالبَصْرَةِ[1].

**٢٤٥٤- سالیم لە باوكیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر كەس بەشێك لە زەویدا بە ناڕەوا داگیر بكات و بیبات، لە ڕۆژی دواییدا بەحەوت چینی زەوییدا دەبرێتە خوارەوە)) فیرەبری دەڵێ: ئەبو جەعفەری كوڕی حاتیم دەڵێ: ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئەم فەرموودەی باسكراوە لە كتێبەكەی عەبدوڵلای كوڕی موبارەكدا نییە كە لە خۆراسان تۆماری كردووە، بەڵكو لە بەصرە بۆ قوتابییەكانی گێڕاوەتەوە و خوێندوویەتیەوە بۆیان.**

## ١٤ - بابٌ: إِذَا أَذِنَ إِنْسَانٌ لآخَرَ شَيْئًا جَازَ

٢٤٥٥- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ جَبَلَةَ: كُنَّا بِالمَدِينَةِ فِي بَعْضِ أَهْلِ العِرَاقِ، فَأَصَابَنَا سَنَةٌ، فَكَانَ ابْنُ الزُّبَيْرِ يَرْزُقُنَا التَّمْرَ، فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ يَمُرُّ بِنَا فَيَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الإِقْرَانِ، إِلَّا أَنْ يَسْتَأْذِنَ الرَّجُلُ مِنْكُمْ أَخَاهُ[2].

(١) بڕوانە: ٣١٩٦.

(٢) بڕوانە: ٢٤٨٩، ٢٤٩٠، ٥٤٤٦.

## ١٤- باسێک: ئەگەر کەسێک مۆڵەتی کەسێک بدات لەشتێکدا دروستە

**٢٤٥٥- جەبەلە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە لەگەڵ هەندێك لەخەڵكی عێراق لەمەدینە بووین، ئینجا گرانی و قات و قڕییەكمان تووش بوو، عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیریش خورمای پێمان دەدا، عەبدوڵڵای كوڕی عومەریش ﷺ بەلاماندا تێدەپەڕی و دەیوت: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لەپێكەوە خواردنی دوو خورما كردووە، مەگەر كەسێك لە ئێوە مۆڵەت لە براكەی وەربگرێت.**

٢٤٥٦- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ، أَنَّ رَجُلًا مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ أَبُو شُعَيْبٍ كَانَ لَهُ غُلاَمٌ لَحَّامٌ، فَقَالَ لَهُ أَبُو شُعَيْبٍ: اصْنَعْ لِي طَعَامَ خَمْسَةٍ لَعَلِّي أَدْعُو النَّبِيَّ ﷺ خَامِسَ خَمْسَةٍ. وَأَبْصَرَ فِي وَجْهِ النَّبِيِّ ﷺ الجُوعَ، فَدَعَاهُ، فَتَبِعَهُمْ رَجُلٌ لَمْ يُدْعَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّ هَذَا قَدِ اتَّبَعَنَا أَتَأْذَنُ لَهُ؟ ". قَالَ: نَعَمْ[١].

**٢٤٥٦- ئەبو مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە كە پیاوێكی ئەنصاری كە ئەبو شوعەیبیان پێ دەوت خزمەتكارێكی هەبوو گۆشت فرۆش بوو، ئەبو شوعەیب پێی وت: خواردنێكم بۆ دروست بكە بەشی پێنج كەس بكات، چونكە من دەمەوێ پێغەمبەر ﷺ دەعوەت بكەم كە یەكێكە لە پێنج كەسەكە، چونكە لە دەم و چاویدا برسێتی خوێندبوویەوە، ئینجا دەعوەتی كرد، وە پیاوێكی تریش[٢] كە دەعوەت نەكرابوو دوایان كەوت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەم پیاوە شوێنمان كەوتووە، ئایا ڕێگەی دەدەیت (بێتە ژوورەوە)) ) ئەنصارییەكە وتی: بەڵێ (ڕێگەی دەدەم).**

(١) بڕوانە: ٢٠٨١.

(٢) زیاد لە پێنج كەسەكە.

## ١٥- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿وَهُوَ أَلَدُّ ٱلْخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾﴾ البقرة

٢٤٥٧- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللهِ الأَلَدُّ الخَصِمُ"[1].

## ١٥- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (كەچی ئەو دوژمنێكی سەرسەختە[2])

**٢٤٥٧- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان بوغزاویترینی پیاوەكان لای خوا ئەو كەسانەن كە دوژمنێكی سەرسەختن)).**

## ١٦- بابُ إِثْمِ مَنْ خَاصَمَ فِي بَاطِلٍ وَهْوَ يَعْلَمُهُ

٢٤٥٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ زَيْنَبَ بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ أُمَّهَا أُمَّ سَلَمَةَ ﵂ -زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ- أَخْبَرَتْهَا عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ خُصُومَةً بِبَابِ حُجْرَتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: "إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّهُ يَأْتِينِي الخَصْمُ، فَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ مِنْ بَعْضٍ، فَأَحْسِبُ أَنَّهُ صَدَقَ، فَأَقْضِيَ لَهُ بِذَلِكَ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ، فَلْيَأْخُذْهَا أَوْ فَلْيَتْرُكْهَا"[3].

---

(١) بروانە: ٤٥٢٣، ٧١٨٨.

(٢) واتە: زۆر بە ڕەقی و توندی دوژمنایەتی دەكەن و هیچی تێدا ناهێڵنەوە.

(٣) بروانە: ٢٦٨٠، ٦٩٦٧، ٧١٦٩، ٧١٨١، ٧١٨٥.

## ١٦- باسی تاوانی ئەو کەسەی دەمەقاڵێ دەکات لەناهەقداو دەشزانێت ناحەقە

٢٤٥٨- عورِوەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە زەینەبی کچی ئوممو سەلەمە بۆی گێڕایەوە کە ئوممو سەلەمەی دایکی ﷺ -کە خێزانی پێغەمبەرە ﷺ- لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆی گێڕایەوە، کە لەبەر دەرگای ژوورەکەیدا گوێی لەدەنگە دەنگێك بوو، ئەویش هاتەدەر بۆلایان و فەرمووی: ((بێگومان من مرۆڤم، بەڕاستی داواچی دێنە لام، جا لەوانەیە هەندێکتان لە هەندێکتان قسەزانتر و زمانپاراوتر بن، ئەوسا منیش وا گومان دەبەم ئەو کەسە ڕاست دەکات، ئیتر حوکم دەدەم بە قازانجی ئەو، بۆیە هەرکەس بڕیارم بۆدا کە مافی مسوڵمانێك ببات، ئەوە بێگومان پارچەیەکە لە ئاگری دۆزەخ، جا خۆی ئازادە بیبات یان وازی لێ بێنێت)).

## ١٧ – بابٌ: إذَا خَاصَمَ فَجَرَ

٢٤٥٩- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ خَالِدٍ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا، أَوْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْ أَرْبَعَةٍ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ، حَتَّى يَدَعَهَا إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ"[1].

## ١٧- باسێك: ئەگەر ناكۆكی بوو لەگەڵ كەسێكدا جنێوی دا[2]

٢٤٥٩- عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((چوار (سیفەت) هەن لەهەر کەسێکدا هەبن ئەوە ناپاکێکی

(١) بڕوانە: ٣٤.

(٢) ئەوە سیفەتێکی ناپاکی تێدایە.

تەواوە، یان سیفەتێکی لەو چوار (سیفەت)ـە تێدا بێت ئەوە سیفەتێکی ناپاکی تێدایە هەتا وازی لێ دێنێ: کاتێك قسە بکات درۆ بکات، کاتێك پەیمانێك بدات نەیباتە سەر، کاتێك شتێکی پێ سپێردرا خیانەتی لێ بکات، هەروەها کاتێك کێشە و ناکۆکی هەبێت لەگەڵ خەڵکدا جنێو بدات و سنوور ببەزێنێت)).

## ١٨- بابُ قِصَاصِ المَظْلُومِ إِذَا وَجَدَ مَالَ ظَالِمِهِ

وَقَالَ ابْنُ سِيرِينَ يُقَاصُّهُ. وَقَرَأَ: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ ﴿١٢٦﴾﴾ النحل.

٢٤٦٠- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنِي عُرْوَةُ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: جَاءَتْ هِنْدُ بِنْتُ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ مِسِّيكٌ، فَهَلْ عَلَيَّ حَرَجٌ أَنْ أُطْعِمَ مِنَ الَّذِي لَهُ عِيَالَنَا؟ فَقَالَ: "لَا حَرَجَ عَلَيْكِ أَنْ تُطْعِمِيهِمْ بِالمَعْرُوفِ"[1].

## ١٨- باسی تۆڵەکردنەوەی ستەملێکراو ئەگەر ماڵی ستەمکارەکەی بەردەست کەوت

ئیبنو سیرین دەڵێ: ستەملێکراو بەئەندازەی ماڵەکەی خۆی لە ماڵی ستەمکارەکە ببات. وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وە ئەگەر تۆڵەتان سەندەوە، ئەوە بەئەندازەی ئەو ستەمەی لە دژتان کراوە تۆڵە بکەنەوە).

٢٤٦٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: هیندی کچی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیلی زۆر دەست قوچاوە، جا ئایا تاوانم دەگات لەوەی هی ئەوە بژێوی ماڵ و

(١) بڕوانە: ٢٢١١.

مندالّمی لێ بدەم؟ ئەویش فەرمووی: ((هیچ تاوانت لەسەر نییە (لەماڵی ئەو) خۆراكیان پێ بدەیت بە ئەندازەی پێویست)).

٢٤٦١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي يَزِيدُ، عَنْ أَبِي الخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: قُلْنَا لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّكَ تَبْعَثُنَا فَنَنْزِلُ بِقَوْمٍ لَا يَقْرُونَا، فَمَا تَرَى فِيهِ؟ فَقَالَ لَنَا: "إِنْ نَزَلْتُمْ بِقَوْمٍ، فَأُمِرَ لَكُمْ بِمَا يَنْبَغِي لِلضَّيْفِ فَاقْبَلُوا، فَإِنْ لَمْ يَفْعَلُوا فَخُذُوا مِنْهُمْ حَقَّ الضَّيْفِ"[1].

٢٤٦١- عوتبەی كوڕی عامیر ﷺ وتی: وتمان بەپێغەمبەر ﷺ:جەنابت دەماننێریت (بۆ كارێك)، جا لای هۆزێك دادەبەزین میوانداریمان ناكەن، ڕای جەنابت چییە لەوبارەیەوە؟ فەمووی: ((ئەگەر لای هۆزێك لاتان دا و دابەزین، وە ئەوەی پێویستە بۆ میوان فەرمان كرا بۆتان بكرێت ئەوە لێیان قبولّ بكەن، بەلاّم ئەگەر وایان نەكرد، ئەوە ئەوەی مافی میوانە لێیان بسەنن (با بەزۆریش بێت).

## ١٩- بابُ مَا جَاءَ فِي السَّقَائِفِ

وَجَلَسَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ فِي سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ[2].

٢٤٦٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، وَأَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ، عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ حِينَ تَوَفَّى اللهُ نَبِيَّهُ ﷺ: إِنَّ الأَنْصَارَ اجْتَمَعُوا فِي سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ، فَقُلْتُ لأَبِي بَكْرٍ: انْطَلِقْ بِنَا، فَجِئْنَاهُمْ فِي سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ[3].

---

(١) بڕوانە: ٦١٣٧.

(٢) بڕوانە: ٥٦٣٧.

(٣) بڕوانە: ٣٤٤٥، ٣٩٢٨، ٤٠٢١، ٦٨٢٩، ٦٨٣٠، ٧٣٢٣.

## ١٩- باسی ئەوەی دەربارەی سابات و کەپرەکان هاتووە

وە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لەژێر کەپرەکەی هۆزی ساعیدەدا دانیشتوون[١].

٢٤٦٢- عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە گێڕایەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما بۆی گێڕایەوە لە عومەرەوە رضي الله عنه کاتێك خوای گەورە پێغەمبەرەکەی مراند عومەر وتی: بێگومان ئەنصارییەکان لە کەپر و سێبەرەکانی هۆزی ساعیدە کۆبوونەوە، منیش بە ئەبو بەکرم رضي الله عنه وت: با بڕۆین، ئیتر ئێمەش ڕۆیشتینە لای ئەنصارییەکان لە ژێرکەپر و سێبەرەکانی تایفەی ساعیدەدا بوون.

## ٢٠- بابٌ: لَا يَمْنَعُ جَارٌ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَهُ فِي جِدَارِهِ

٢٤٦٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "لَا يَمْنَعُ جَارٌ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَهُ فِي جِدَارِهِ". ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: مَا لِي أَرَاكُمْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ؟! وَاللهِ لأَرْمِيَنَّ بِهَا بَيْنَ أَكْتَافِكُمْ[٢].

## ٢٠- باسێک: با هیچ دراوسێیەک ڕێگە نەگرێت دراوسێیەکەی دارێک بچەقێنێت بەدیوارەکەیدا

٢٤٦٣- ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((با هیچ دراوسێیەك ڕێگە نەگرێت دراوسێیەکەی دارێك بچەقێنێت بەدیوارەکەیدا))، پاشان ئەبو هوڕەیرە دەڵێ: چییە دەتانبینم پشتی لێ

---

(١) مەبەستی ئیمامی بوخاری فەرموودەی (٥٦٣٧) کە لە صەحیحەکەیدا لە (كتابُ الأشربة، بابُ الشرب من قدح النبي وآنيتِهِ) هێناویەتی.

(٢) بڕوانە: ٥٦٢٧، ٥٦٢٨.

**هەڵدەكەن؟! سوێند بەخوا لەسەر شانیشتان بێت هەر دایدەنێم[1] (با پێشتان ناخۆش بێت).**

## ٢١- بابُ صَبِّ الخَمْرِ فِي الطَّرِيقِ

٢٤٦٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ أَبُو يَحْيَى، أَخْبَرَنَا عَفَّانُ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، حَدَّثَنَا ثَابِتٌ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ: كُنْتُ سَاقِيَ القَوْمِ فِي مَنْزِلِ أَبِي طَلْحَةَ، وَكَانَ خَمْرُهُمْ يَوْمَئِذٍ الفَضِيخَ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مُنَادِيًا يُنَادِي: أَلاَ إِنَّ الخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ. قَالَ: فَقَالَ لِي أَبُو طَلْحَةَ: اخْرُجْ فَأَهْرِقْهَا، فَخَرَجْتُ فَهَرَقْتُهَا، فَجَرَتْ فِي سِكَكِ المَدِينَةِ، فَقَالَ بَعْضُ القَوْمِ: قَدْ قُتِلَ قَوْمٌ وَهْيَ فِي بُطُونِهِمْ. فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓاْ ﴿٩٣﴾ ﴾ المائدة. الآيَةَ[2].

## ٢١-باسی ڕشتنی عارەق لە ڕێگا و كۆڵانەكاندا

**٢٤٦٤- ئەنەس ﷺ دەڵێ: من لە ماڵی ئەبو تەڵحەدا شەرابگێڕی كۆمەڵێك بووم، لەو كاتەدا عارەقەكەیان لەفەریكە خورما بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی دا بەجارڕدەرێك جاڕ بدا و بڵێ: (خەڵكینە!) بێداربن بێگومان عارەق حەڕام كراوە، ئەنەس وتی: جا ئەبو تەڵحە پێی وتم: بڕۆ ئەو عارەقە بڕێژە، منیش بردم ڕشتم، ئینجا عارەقەكە بەكۆڵانەكانی مەدینەدا دەڕۆیشت، ئینجا كەسانێك وتیان: بێگومان كۆمەڵێك مسوڵمان شەهید بوون و عارەقیان خواردۆتەوە، ئیتر خوا بەو هۆیەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ئەوانەی كە باوەڕیان هێناوە و كردەوە**

---

(١) واتە: ناچارتان دەكەم لەسەر جێبەجێ كردنی ئەم سوننەتە با حەزیشی لێ نەكەن، یان داری دراوسێیەكە لەسەر شانیشتان بێت دایدەنێم، یان بەدەنگی بەرز ئەم فەرمایشتە لەناوتاندا دەڵێم.

(٢) بڕوانە: ٤٦١٧، ٤٦٢٠، ٥٥٨٠، ٥٥٨٢، ٥٥٨٣، ٥٥٨٤، ٥٦٠٠، ٥٦٢٢، ٧٢٥٣.

چاكەكانيان كردووە هيچ گوناهێكيان لەسەر نەبووە و نييە لەوەی خواردوويانە (عارەق و پارەی قومار پێش حەڕام كردنيان)).

## ٢٢- بابُ أَفْنِيَةِ الدُّورِ وَالجُلُوسِ فِيهَا وَالجُلُوسِ عَلَى الصُّعُدَاتِ

وَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَابْتَنَى أَبُو بَكْرٍ مَسْجِدًا بِفِنَاءِ دَارِهِ، يُصَلِّي فِيهِ وَيَقْرَأُ القُرْآنَ، فَيَتَقَصَّفُ عَلَيْهِ نِسَاءُ المُشْرِكِينَ وَأَبْنَاؤُهُمْ يَعْجَبُونَ مِنْهُ، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَوْمَئِذٍ بِمَكَّةَ[1].

## ٢٢- باسی حەوشەی نێوان ماڵ و خانووەكان و دانيشتن تياياندا، وە دانيشتن لە ڕێگا و بانەكاندا

**عائيشە ﵂ دەڵێ: ئەبو بەكر لە حەوشەی خانووەكەيدا مزگەوتێكی دروست كردبوو، نوێژی دەكرد و قورئانی تێدا دەخوێند، جا ئافرەت و منداڵی بتپەرستەكان لێی كۆدەبوونەوە (بە جۆرێك دەكەوتن بەسەر يەكتريدا)، پێی سەرسام دەبوون، لەوكاتەشدا پێغەمبەر ﷺ لە مەككەدا بوو.**

٢٤٦٥- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو عُمَرَ حَفْصُ بْنُ مَيْسَرَةَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "إِيَّاكُمْ وَالجُلُوسَ عَلَى الطُّرُقَاتِ". فَقَالُوا: مَا لَنَا بُدٌّ، إِنَّمَا هِيَ مَجَالِسُنَا نَتَحَدَّثُ فِيهَا. قَالَ: "فَإِذَا أَبَيْتُمْ إِلَّا المَجَالِسَ فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهَا" قَالُوا: وَمَا حَقُّ الطَّرِيقِ؟ قَالَ: "غَضُّ البَصَرِ، وَكَفُّ الأَذَى، وَرَدُّ السَّلَامِ، وَأَمْرٌ بِالمَعْرُوفِ، وَنَهْيٌ عَنِ المُنْكَرِ"[2].

---

(١) بڕوانە: ٤٧٦.

(٢) بڕوانە: ٦٢٢٩.

٢٤٦٥- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((ئاگاداربن لەسەر ڕێگاوبانەكان دامەنیشن، هاوەڵانیش وتیان: چارمان نییە هەر دادەنیشین، بێگومان هەرئەوە جێگای دانیشتنمانە و دەمەتەقێی تێدا دەكەین، فەرمووی ﷺ: ((جا ئەگەر هەر دادەنیشن، ئەوە مافی ڕێگاوبان بدەن))، وتیان مافی ڕێگا چییە؟ فەرمووی: ((چاوپاراستن و ئازارنەدان(ی خەڵكی)، وەڵامدانەوەی سەلام و فەرماندان بەچاكە و قەدەغەكردنی خراپە)).

## ٢٣- بابُ الآبَارِ عَلَى الطُّرُقِ إِذَا لَمْ يُتَأَذَّ بِهَا

٢٤٦٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ عَنْ سُمَيٍّ -مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ- عَنْ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: "بَيْنَا رَجُلٌ بِطَرِيقٍ، اشْتَدَّ عَلَيْهِ العَطَشُ فَوَجَدَ بِئْرًا فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ، ثُمَّ خَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ العَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الكَلْبَ مِنَ العَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كَانَ بَلَغَ مِنِّي. فَنَزَلَ البِئْرَ، فَمَلأَ خُفَّهُ مَاءً، فَسَقَى الكَلْبَ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَإِنَّ لَنَا فِي البَهَائِمِ لأَجْرًا؟ فَقَالَ: "فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ"[1].

## ٢٣- باسی (هەڵكەندنی) بیر لەسەر ڕێگاو بانەكاندا ئەگەر نەدەبوویە هۆی زیان گەیاندن

٢٤٦٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لەكاتێكدا پیاوێك بەڕێگادا دەڕۆیشت تینوویەتی زۆری بۆ هێنابوو، ئینجا بیرێكی بینی و دابەزیە ناو بیرەكەو ئاوی لێ خواردەوە، پاشان هاتە دەرەوە،

(١) بڕوانە: ١٧٣.

بینی سەگێك زمانی دەرهێناوە و هەناسە بڕكێیەتی و لە تینوانا خۆڵ دەخوات، پیاوەکەش وتی: بێگومان ئەم سەگە لەتینوویەتیدا گەیشتۆتە ئەو حاڵەی بە من گەیشتبوو، بۆیە دابەزیە ناو بیرەکەو خوفەکەی پڕکرد لە ئاو (و لەبیرەکە هاتە سەرەوە)و سەگەکەی ئاودا، بەو هۆیەوە خودا سوپاسی کرد و لێی خۆشبوو))، هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی ئێمە (لەچاکەکردن) لەگەڵ ئاژەڵ و بێ زماندا پاداشتمان هەیە؟ فەرمووی: ((لە (ئاودانی) هەموو خاوەن گیاندارێکی زیندوودا پاداشت هەیە)).

## ٢٤- بابُ إِمَاطَةِ الأَذَى

وَقَالَ هَمَّامٌ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: "يُمِيطُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ"[1].

## ٢٤- باسی لابردنی هەر شتێک زیانی هەبێت (لەسەر ڕێگای خەڵک)

هەممام دەگێڕێتەوە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: (( (مسوڵمان) شتێك زیانی هەبێت لایبەرێت لەسەر ڕێگا (ی خەڵك) خێر و چاکەیە بۆی)).

## ٢٥- بابُ الغُرْفَةِ وَالعُلِّيَّةِ المُشْرِفَةِ وَغَيْرِ المُشْرِفَةِ فِي السُّطُوحِ وَغَيْرِهَا

٢٤٦٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: أَشْرَفَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى أُطُمٍ مِنْ آطَامِ المَدِينَةِ، ثُمَّ قَالَ: "هَلْ تَرَوْنَ مَا أَرَى إِنِّي أَرَى مَوَاقِعَ الفِتَنِ خِلاَلَ بُيُوتِكُمْ كَمَوَاقِعِ القَطْرِ"[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٧٠٧.

(٢) بڕوانە: ١٨٧٨.

## ٢٥- باسی ژووری سەرەوەی خانوو و بەرزاییەک شوێنی لێوە دیار بێ یان دیار نەبێ سەربان بێ یان هەر جێگایەکی تر

**٢٤٦٧- ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەسەر قەڵایەك لە قەڵایەکانی مەدینە سەرنجی دا و فەرمووی: ((ئەوەی من دەیبینم ئێوەش دەیبینن؟ بێگومان شوێنی ئاشوب و ئاژاوە دەبینم لەناو ماڵ و خانووەکانیاندا، وەك دڵۆپی لێزمەی باران دادەبارێن[1])).**

٢٤٦٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي ثَوْرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: لَمْ أَزَلْ حَرِيصًا عَلَى أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ ﷺ عَنِ الْمَرْأَتَيْنِ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ اللَّتَيْنِ قَالَ اللهُ لَهُمَا: ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴿٤﴾ ﴾ التحريم، فَحَجَجْتُ مَعَهُ، فَعَدَلَ وَعَدَلْتُ مَعَهُ بِالإِدَاوَةِ، فَتَبَرَّزَ حَتَّى جَاءَ، فَسَكَبْتُ عَلَى يَدَيْهِ مِنَ الإِدَاوَةِ فَتَوَضَّأَ، فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، مَنِ الْمَرْأَتَانِ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ اللَّتَانِ قَالَ اللهُ ﷻ لَهُمَا: ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴿٤﴾ ﴾ التحريم، فَقَالَ وَاعَجَبِي لَكَ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، عَائِشَةُ، وَحَفْصَةُ. ثُمَّ اسْتَقْبَلَ عُمَرُ الحَدِيثَ يَسُوقُهُ، فَقَالَ: إِنِّي كُنْتُ وَجَارٌ لِي مِنَ الأَنْصَارِ فِي بَنِي أُمَيَّةَ بْنِ زَيْدٍ -وَهْيَ مِنْ عَوَالِي الْمَدِينَةِ- وَكُنَّا نَتَنَاوَبُ النُّزُولَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَيَنْزِلُ يَوْمًا وَأَنْزِلُ يَوْمًا، فَإِذَا نَزَلْتُ جِئْتُهُ مِنْ خَبَرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ مِنَ الأَمْرِ وَغَيْرِهِ، وَإِذَا نَزَلَ فَعَلَ مِثْلَهُ، وَكُنَّا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ نَغْلِبُ النِّسَاءَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى الأَنْصَارِ إِذَا هُمْ قَوْمٌ تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ، فَطَفِقَ نِسَاؤُنَا يَأْخُذْنَ مِنْ أَدَبِ نِسَاءِ الأَنْصَارِ،

---

(١) پێغەمبەر ﷺ بەم فەرموودەیە وەک موعجیزەیەک ئاماژە دەکات بەو ئاشووب و جەنگانەی کە لە داهاتوودا لە مەدینەدا ڕوو دەدەن، وەک ڕووداوی حەڕە و ئەو جۆرە ئاشوبانە. بڕوانە: إرشاد الساری: ٩١/٨.

فَصِحْتُ عَلَى امْرَأَتِي، فَرَاجَعَتْنِي، فَأَنْكَرْتُ أَنْ تُرَاجِعَنِي، فَقَالَتْ: وَلِمَ تُنْكِرُ أَنْ أُرَاجِعَكَ؟ فَوَاللهِ إِنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ ﷺ لَيُرَاجِعْنَهُ، وَإِنَّ إِحْدَاهُنَّ لَتَهْجُرُهُ اليَوْمَ حَتَّى اللَّيْلِ. فَأَفْزَعَنِي، فَقُلْتُ: خَابَتْ مَنْ فَعَلَ مِنْهُنَّ بِعَظِيمٍ، ثُمَّ جَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي، فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَقُلْتُ: أَيْ حَفْصَةُ، أَتُغَاضِبُ إِحْدَاكُنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ اليَوْمَ حَتَّى اللَّيْلِ؟! فَقَالَتْ: نَعَمْ. فَقُلْتُ: خَابَتْ وَخَسِرَتْ، أَفَتَأْمَنُ أَنْ يَغْضَبَ اللهُ لِغَضَبِ رَسُولِهِ ﷺ فَتَهْلِكِينَ؟ لَا تَسْتَكْثِرِي عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَلَا تُرَاجِعِيهِ فِي شَيْءٍ، وَلَا تَهْجُرِيهِ، وَاسْأَلِينِي مَا بَدَا لَكِ، وَلَا يَغُرَّنَّكِ أَنْ كَانَتْ جَارَتُكِ هِيَ أَوْضَأَ مِنْكِ وَأَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ -يُرِيدُ عَائِشَةَ- وَكُنَّا تَحَدَّثْنَا أَنَّ غَسَّانَ تُنْعِلُ النِّعَالَ لِغَزْوِنَا، فَنَزَلَ صَاحِبِي يَوْمَ نَوْبَتِهِ فَرَجَعَ عِشَاءً، فَضَرَبَ بَابِي ضَرْبًا شَدِيدًا، وَقَالَ: أَنَائِمٌ هُوَ؟ فَفَزِعْتُ فَخَرَجْتُ إِلَيْهِ. وَقَالَ: حَدَثَ أَمْرٌ عَظِيمٌ. قُلْتُ: مَا هُوَ؟ أَجَاءَتْ غَسَّانُ؟ قَالَ: لَا، بَلْ أَعْظَمُ مِنْهُ وَأَطْوَلُ، طَلَّقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ نِسَاءَهُ. قَالَ: قَدْ خَابَتْ حَفْصَةُ وَخَسِرَتْ، كُنْتُ أَظُنُّ أَنَّ هَذَا يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ، فَجَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي، فَصَلَّيْتُ صَلَاةَ الفَجْرِ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَدَخَلَ مَشْرُبَةً لَهُ فَاعْتَزَلَ فِيهَا، فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ، فَإِذَا هِيَ تَبْكِي. قُلْتُ: مَا يُبْكِيكِ؟ أَوَلَمْ أَكُنْ حَذَّرْتُكِ أَطَلَّقَكُنَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ؟ قَالَتْ: لَا أَدْرِي، هُوَ ذَا فِي المَشْرُبَةِ. فَخَرَجْتُ، فَجِئْتُ المِنْبَرَ، فَإِذَا حَوْلَهُ رَهْطٌ يَبْكِي بَعْضُهُمْ، فَجَلَسْتُ مَعَهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَجِدُ، فَجِئْتُ المَشْرُبَةَ الَّتِي هُوَ فِيهَا فَقُلْتُ لِغُلَامٍ لَهُ أَسْوَدَ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ. فَدَخَلَ، فَكَلَّمَ النَّبِيَّ ﷺ ثُمَّ خَرَجَ، فَقَالَ: ذَكَرْتُكَ لَهُ، فَصَمَتَ، فَانْصَرَفْتُ حَتَّى جَلَسْتُ مَعَ الرَّهْطِ الَّذِينَ عِنْدَ المِنْبَرِ، ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَجِدُ فَجِئْتُ -فَذَكَرَ مِثْلَهُ- فَجَلَسْتُ مَعَ الرَّهْطِ الَّذِينَ عِنْدَ المِنْبَرِ، ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَجِدُ فَجِئْتُ الغُلَامَ فَقُلْتُ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ -فَذَكَرَ مِثْلَهُ- فَلَمَّا وَلَّيْتُ مُنْصَرِفًا، فَإِذَا الغُلَامُ يَدْعُونِي قَالَ: أَذِنَ لَكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ. فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ، فَإِذَا هُوَ مُضْطَجِعٌ عَلَى رِمَالِ حَصِيرٍ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فِرَاشٌ، قَدْ أَثَّرَ الرِّمَالُ بِجَنْبِهِ، مُتَّكِئٌ عَلَى وِسَادَةٍ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، ثُمَّ قُلْتُ: وَأَنَا قَائِمٌ: طَلَّقْتَ نِسَاءَكَ؟ فَرَفَعَ بَصَرَهُ إِلَيَّ، فَقَالَ: "لَا". ثُمَّ قُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ أَسْتَأْنِسُ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ رَأَيْتَنِي وَكُنَّا مَعْشَرَ

قُرَيْشٍ نَغْلِبُ النِّسَاءَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى قَوْمٍ تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ، فَذَكَرَهُ، فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ ﷺ، ثُمَّ قُلْتُ: لَوْ رَأَيْتَنِي، وَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ، فَقُلْتُ: لَا يَغُرَّنَّكِ أَنْ كَانَتْ جَارَتُكِ هِيَ أَوْضَأَ مِنْكِ وَأَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ-يُرِيدُ عَائِشَةَ- فَتَبَسَّمَ أُخْرَى، فَجَلَسْتُ حِينَ رَأَيْتُهُ تَبَسَّمَ، ثُمَّ رَفَعْتُ بَصَرِي فِي بَيْتِهِ، فَوَاللهِ مَا رَأَيْتُ فِيهِ شَيْئًا يَرُدُّ البَصَرَ غَيْرَ أَهَبَةٍ ثَلَاثَةٍ، فَقُلْتُ: ادْعُ اللهَ فَلْيُوَسِّعْ عَلَى أُمَّتِكَ، فَإِنَّ فَارِسَ وَالرُّومَ وُسِّعَ عَلَيْهِمْ وَأُعْطُوا الدُّنْيَا، وَهُمْ لَا يَعْبُدُونَ اللهَ، وَكَانَ مُتَّكِئًا. فَقَالَ: "أَوَفِي شَكٍّ أَنْتَ يَا ابْنَ الخَطَّابِ؟! أُولَئِكَ قَوْمٌ عُجِّلَتْ لَهُمْ طَيِّبَاتُهُمْ فِي الحَيَاةِ الدُّنْيَا". فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، اسْتَغْفِرْ لِي. فَاعْتَزَلَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ الحَدِيثِ حِينَ أَفْشَتْهُ حَفْصَةُ إِلَى عَائِشَةَ، وَكَانَ قَدْ قَالَ: "مَا أَنَا بِدَاخِلٍ عَلَيْهِنَّ شَهْرًا". مِنْ شِدَّةِ مَوْجَدَتِهِ عَلَيْهِنَّ حِينَ عَاتَبَهُ اللهُ. فَلَمَّا مَضَتْ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ فَبَدَأَ بِهَا، فَقَالَتْ لَهُ عَائِشَةُ: إِنَّكَ أَقْسَمْتَ أَنْ لَا تَدْخُلَ عَلَيْنَا شَهْرًا، وَإِنَّا أَصْبَحْنَا لِتِسْعٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، أَعُدُّهَا عَدًّا. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ". وَكَانَ ذَلِكَ الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَأُنْزِلَتْ آيَةُ التَّخْيِيرِ فَبَدَأَ بِي أَوَّلَ امْرَأَةٍ، فَقَالَ: "إِنِّي ذَاكِرٌ لَكِ أَمْرًا، وَلَا عَلَيْكِ أَنْ لَا تَعْجَلِي حَتَّى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ". قَالَتْ: قَدْ أَعْلَمُ أَنَّ أَبَوَيَّ لَمْ يَكُونَا يَأْمُرَانِي بِفِرَاقِكَ. ثُمَّ قَالَ: "إِنَّ اللهَ قَالَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الأحزاب". قُلْتُ: أَفِي هَذَا أَسْتَأْمِرُ أَبَوَيَّ؟ فَإِنِّي أُرِيدُ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ. ثُمَّ خَيَّرَ نِسَاءَهُ، فَقُلْنَ مِثْلَ مَا قَالَتْ عَائِشَةُ[1].

(١) بڕوانە: ٨٩.

٢٤٦٨- عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: بەردەوام سووربووم لەسەر ئەوەی كە پرسیار لە عومەر ﷺ بكەم دەربارەی ئەو دوو ئافرەتە لە خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ كە خوای گەورە بەهەردووكیانی فەرمووە: ((ئەی حەفصە و عائیشە) ئەگەر هەردووكتان تەوبە بكەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا (جێی خۆیەتی)، چونكە بەڕاستی دڵتان لایدا (لەهەق و ڕاستی))، جا حەججم كرد لەگەڵیدا، وە لەڕێگاكە لایدا، منیش لەگەڵیدا بەمەسینەیەكەوە لامدا، ئینجا ڕۆیشت بۆ چۆڵەوانییەك بۆ دەست بەئاوگەیاندن، هەتا هاتەوە، ئینجا لەمەسینەكە ئاوم كرد بەدەستەكانیدا و دەست نوێژی گرت، ئەوسا وتم: ئەی پێشەوای ئیمانداران ئەو دوو ئافرەتە كێ بوون لەخێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ كە بەهەردووكیان وترا: (ئەگەر هەردووكتان تەوبە بكەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا)، عومەریش وتی: سەرم لێت سووڕ دەمێنێ ئیبنو عەبباس، عائیشە و حەفصە بوون، پاشان عومەر دەستی كرد بەگێڕانەوەی بەسەرهاتەكە و وتی: من و دراوسێیەكی ئەنصارییم كە لەتایفەی ئومەییەی كوڕی زەید بوو-كە لە عەوالی مەدینە بوون-، وە هەردووكمان بە نۆرە دەڕۆیشتنیە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، جا ڕۆژێك ئەو دەڕۆیشت و ڕۆژێك من دەڕۆیشتم، جا ئەگەر من بڕۆیشتمایە هەر هەواڵ و كاروبارێك ئەو ڕۆژە هەبوو یان شتێكی تر بۆم دەهێنایەوە، وە ئەگەر ئەو بڕۆیشتایە هەمان شتی دەكرد، وە ئێمەی تاقمی قورەیش زاڵ بووین بەسەر ئافرەتاندا، بەڵام كە هاتینە (مەدینە) بۆلای ئەنصارییەكان ئەوان گەلێك بوون ئافرەتانیان زاڵ بوون بەسەریاندا، بۆیە ئافرەتانی ئێمە دەستیان كرد بە وەرگرتنی خوو و نەریتی ئافرەتانی ئەنصاری، جا من جارێك قیڕاندم بەسەر خێزانەكەمدا، ئەویش وەڵامی دامەوە، جا وەڵامدانەوەكەی بەلامەوە كارێكی خراپ بوو، خێزانم وتی: بۆ لات خراپە وەڵامت بدەمەوە؟ دەی سوێند بەخوا هاوسەرەكانی پێغەمبەر ﷺ وەڵامی پێغەمبەر ﷺ دەدەنەوە، وە بێگومان

هاوسەری هەیە لە سەرەتای ڕۆژەوە تا شەو دەنگ لە پێغەمبەر ﷺ دادەبڕێ، جا ئەم هەواڵە ترساندمی، بۆیە وتم: هەركامیان ئەمە (لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ) بكات خەسارەتمەند بووەو هەڵەیەكی گەورەی كردووە، پاشان جلوبەرگەكەم لەبەر كرد و ڕۆیشتم بۆ ماڵی حەفصە و پێم وت: ئەی حەفصە! ئایا هەریەكێك لە ئێوە پێغەمبەر ﷺ تووڕە دەكەن و هەموو ڕۆژەكە دەنگی لێدادەبڕن تا شەو دادێ؟ حەفصە وتی: بەڵێ، عومەر دەڵێ: منیش وتم: ئەو هاوسەرەی (وا دەكات) خەسارەتمەند و ماڵوێران بووە، ئایا ناترسێت بە هۆی تووڕەیی پێغەمبەرەوە ﷺ خوا لێی تووڕە ببێت و لەناو بچێت؟ حەفصە تۆ داوای شتی زۆر لە پێغەمبەری خوا ﷺ مەكەو وەڵام و بەرپەرچی مەدەرەوە لەهیچ شتێكدا (كە دەیفەرموێ) و دەنگی لێ دامەبڕە، وە هەر پێویستیەكت هەبوو داوا لە من بكە، بادراوسێ و هاوڕێیەكەت[1] كە لەتۆ جوانتر و خۆشەویستترە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ - مەبەستی عائیشە بوو- نەتخەڵەتێنێت و بەهەڵەتدا نەبات[2].

وە ئێمەی هاوەڵان لەناو خۆماندا باسی ئەوەمان دەكرد كە بێگومان غەسسان[3] وڵاخەكانیان ناڵ دەكەن (وەك خۆ ئامادكردن) بۆ هێرشكردنە سەرمان، جا هاوڕێ ئەنصارییەكەم لەسەرەی خۆیدا ڕۆیشت (بۆ خزمەتی پیغەمبەر ﷺ) و عیشا گەڕایەوە، زۆر بەتوندی لەدەرگاكەمی دا و وتی: ئایا عومەر خەوتووە؟ منیش زۆر ترسام ڕۆیشتمە دەرەوە بۆ لای، وتی: ڕووداوێكی گەورە ڕوویداوە! وتم: چییە؟! غەسسان هاتووە (هێرشی هێناوە)، وتی: نەخێر بەڵكو لەوەش گەورەتر و ترسناكتر! پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانەكانی تەڵاق داوە!! عومەر وتی:

---

((١) بریتییە لە دوو ئافرەت كە هەردووكیان خێزانی پیاوێک بن.

((٢) مەبەستی عومەر بەم وتەیەی كە بە حەفصەی وتووە ئەوە بووە كە ئەگەر عائیشە ئەو شتانەی كرد كە من لە تۆم قەدەغە كردووە، تۆ مەیكە و بەو مەخەڵەتێ.

((٣) دەسەڵاتدارانی شام كە سەر بەڕۆم بوون.

بەڕاستی حەفصە زەرەرمەند و ماڵوێران بوو، من گومانم وابوو ئەم تەڵاقدانە نزیکەو ڕوودەدات، ئینجا جلوبەرگەکەم لەبەرکرد، نوێژی بەیانیم لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ کرد، جا پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە ژوورە بەرزەکەی خۆی بەتەنها لەوێدا بوو، منیش چووم بۆ لای حەفصە، دەبینم دەگری، وتم: بۆچی دەگریت؟ ئایا من ئاگادارم نەکردیت لەم مەترسییە؟ ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ تەڵاقی داون؟ حەفصە وتی: نازانم، پێغەمبەر ﷺ ئا ئەوەتا لەو ژوورە بەرزەدایە، ئینجا هاتمە دەرەوە (لە ماڵی حەفصە)، ڕۆیشتم بۆ لای دوانەگەکەی مزگەوت، دەبینم کۆمەڵێك بەدەوریدان و هەندێکیان دەگرین، منیش کەمێك لەگەڵیاندا دانیشتم، پاشان دڵم نارەحەت بوو، بۆیە ڕۆیشتم بۆ لای ئەو ژوووورە بەرزەی کە پێغەمبەری ﷺ تێدایە، بە خزمەتکارە ڕەش پێستەکەی پێغەمبەرم ﷺ وت: داوای مۆڵەت بکە بۆ عومەر، خزمەتکارەکەش چووە ژوورەوە و قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کرد، پاشان هاتە دەرەوە وتی بەعومەر: باسی تۆم بۆ کرد بێدەنگ بوو، عومەر دەڵێ: منیش گەڕامەوە هەتا دانیشتم لەلای ئەو کۆمەڵەی لای دوانگەکە بوون، پاشان ئەوەی لەدڵمدا بوو نارەحەتی کردم، جارێکی تر هاتمەوە (داوای مۆڵەتم کرد لە خزمەتکارەکە)، ئەویش وشەکەی پێشووی دووبارە کردەوە، ئیتر لەگەڵ ئەو کۆمەڵەی لای دوانگەکە بوون دانیشتم، پاشان (بۆ جاری) سێیەم دڵم نارەحەت بوو، ڕۆیشتم بۆ لای خزمەتکارەکەی و وتم: داوای مۆڵەت بۆ عومەر بکە، هەر قسەی پێشووی کردوە، جا کە گەڕامەوە لەپڕ خزمەتکارەکە بانگی کردم و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دایت، منیش ڕۆیشتمە خزمەتی، دیم لەسەر حەسیرێکی تەنراو ڕاکشابوو، کە لە نێوان پێغەمبەر ﷺو حەسیرەکدا هیچ فەرش و نوێنێك نەبوو، ئاسەواری پەتی حەسیرەکە لەلاتەنیشتیدا دەرچوو بوو، پاڵی دابوویەوە بەپشتییەکی چەرمەوە، ناو ئاخنەی پەلی دارخورما بوو، منیش سەلامم لێکرد، پاشان هەر بەپێوە بووم

وتم: خێزانەكانت تەڵاق داوە؟ ئەویش چاوی بەرزكردەوە و سەیری كردم و فەرمووی: ((نەخێر))، پاشان هەر بە پێوە (لەدڵی خۆمدا) وتم: دڵی خۆش دەكەم و بێتاقەتی لادەبەم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزگە ئێمەی قوڕەیشیت دەبینی زاڵ دەبووین بەسەر ئافرەتانماندا، بەڵام كاتێك هاتینە لای كەسانێك ئافرەتەكانیان زاڵ دەبن بەسەریاندا، ئیتر بەسەرهاتەكەی گێڕایەوە[1] پێغەمبەریش ﷺ پێكەنی، پاشان وتم: خۆزگە منت دەدی كاتێك ڕۆیشتمە ماڵی حەفصە و پێم وت: لەبەر ئەوەی هەوێیەكەت -مەبەست پێی عائیشەیە- لە تۆ جوانتر و خۆشەویستترە لای پێغەمبەر ﷺ با نەتخەڵەتێنێ، جارێكی تر پێغەمبەر ﷺ پێكەنی، كە بینیم پێكەنی منیش دانیشتم، پاشان چاوم بەرزكردەوە و گێڕام بەماڵەكەیدا، سوێند بەخوا شتێكم بەرچاو نەكەوت سێ پێستەی خۆشەنەكراو نەبێت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوا لە خوا بكە دەروو لە ئوممەتەكەت بكاتەوە، چونكە بەڕاستی فارس و ڕۆم دەروویان لێكراوەتەوە و دونیایان پێدراوە، لە كاتێكدا ئەوان خوا ناپەرستن، پێغەمبەر ﷺ پاڵی دابۆوە و فەرمووی: ((ئایا ئیبنو خەتتاب تۆ گومانت هەیە[2]؟ ئەوانە كەسانێكن خۆشییەكانیان بۆ پێشخراوە بۆ ژیانی دونیا)) منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبوونم بۆ بكە. پێغەمبەریش ﷺ كەنارگیر بوو بوو لەبەر ئەو قسەی حەفصە لای عائیشەی ئاشكرای كردبوو، وە بێگومان پێغەمبەر ﷺ فەرموبووی: ((من یەك مانگ ناڕۆمە ماڵ خێزانەكانم))، (ئەمەش) بە هۆی توڕەبوونیەوە بوو لێیان، كە خوا سەرزەنشتی كرد[3]، جا

---

(١) كە لە نێوان خۆی و خێزانیدا ڕووی داوە.

(٢) كە بەهرەی قیامەت لە بەهرەی دونیا باشترە.

(٣) كە فەرمووی: ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆ شتێک كە خوا بۆی حەڵاڵ كردوویت لە خۆتی حەرام دەكەیت ڕەزامەندی خێزانەكانت دەوێ.

**كاتێك بیست و نۆ ڕۆژی تەواو بوو، پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بۆ لای عائیشە و لەوەوە دەستی پێكرد، عائیشەش عەرزی كرد: تۆ سوێندت خوارد كە یەك مانگ نەیەیتە لامان، وە بێگومان ئێمە ئێستا لەبیست و نۆیەم داین، خۆم بە ژماردن (ڕۆژەكانم) ژماردووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((مانگ بیست و نۆ ڕۆژە))، وە ئەم مانگە بیست و نۆ ڕۆژە، عائیشە وتی: بەو هۆیەوە ئایەتی سەرپشك كردنمان دابەزی، جا پێغەمبەر ﷺ لەمنەوە یەكەم ئافرەت بووم دەستی (بە سەرپشك كردنەكە) كرد، فەرمووی: ((من كارێكت بۆ باس دەكەم، زیانی نییە پەلە نەكەیت هەتا بڕیار و ڕای دایك و باوكت وەردەگریت))، عائیشە دەڵێ: بەدڵنیاییەوە دەزانم كە بێگومان دایك و باوكم هەرگیز فەرمانم پێ ناكەن بە جیابوونەوە لەتۆ، پاشان فەرمووی: خوای گەورە دەفەرموێ: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بەخێزانەكانت بڵێ: ئەگەر ئێوە ژیانی دونیا و ڕازاوەیی ئەوتان دەوێ، دەی هەمووتان وەرن موتعەتان[1] پێ بدەم و تەڵاقتان بدەم بەتەڵاقدانێكی چاك و بێ زیان، وە ئەگەر ئێوە خواو پێغەمبەرەكەی و پاداشتی ڕۆژی دواییتان دەوێ، ئەوە بێگومان خوا بۆ چاكەكاران لە ئێوە پاداشتێكی گەورەی ئامادە كردووە)، عائیشە دەڵێ: وتم ئا بۆ ئەمە بڕیار وپرسی دایك و باوكم بكەم؟ بێگومان من خوا و پێغەمبەرەكەی و ڕۆژی دواییم دەوێ، پاشان پێغەمبەر ﷺ خێزانەكانی تریشی سەرپشك كرد، ئەوانیش هەموو هەمان وتەی عائیشەیان دووبارە كردەوە.**

٢٤٦٩- حَدَّثَنَا ابْنُ سَلاَمٍ حَدَّثَنَا الفَزَارِيُّ عَنْ حُمَيْدٍ الطَّوِيلِ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ آلَى رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ نِسَائِهِ شَهْرًا، وَكَانَتِ انْفَكَّتْ قَدَمُهُ فَجَلَسَ فِي عِلِّيَّةٍ لَهُ، فَجَاءَ عُمَرُ، فَقَالَ أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ قَالَ: "لَا، وَلَكِنِّي آلَيْتُ مِنْهُنَّ شَهْرًا". فَمَكُثَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ، ثُمَّ نَزَلَ، فَدَخَلَ عَلَى نِسَائِهِ.

---

((١) موتعە: پارە و شتومەكێكە دەدرێتە ئافرەتی تەڵاقدراو.

٢٤٦٩- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی خوارد کە یەك مانگ سەرجێیی نەکات لەگەڵ خێزانەکانیدا، وە قاچێکی لەجێ چوو بوو، جا لە ژوورێکی بەرزی خۆیدا دانیشتبوو، ئینجا عومەر هات و وتی: ((ئەی پێغەمبەر ﷺ ئایا خێزانەکانت تەڵاق داوە؟ فەرمووی: ((نەخێر بەڵام سوێندم خواردووە یەك مانگ نەچمە لایان))، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بیست و نۆ ڕۆژی پێ چوو بوو، پاشان (لە ژوورە بەرزەکەی) هاتە خوارەوە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە لای خێزانەکانی.

## ٢٦- بابُ مَنْ عَقَلَ بَعِيرَهُ عَلَى البَلَاطِ أَوْ بَابِ المَسْجِدِ

٢٤٧٠- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ حَدَّثَنَا أَبُو عَقِيلٍ حَدَّثَنَا أَبُو المُتَوَكِّلِ النَّاجِيُّ قَالَ أَتَيْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ المَسْجِدَ، فَدَخَلْتُ إِلَيْهِ، وَعَقَلْتُ الجَمَلَ فِي نَاحِيَةِ البَلَاطِ فَقُلْتُ هَذَا جَمَلُكَ. فَخَرَجَ فَجَعَلَ يُطِيفُ بِالجَمَلِ قَالَ: "الثَّمَنُ وَالجَمَلُ لَكَ"[1].

## ٢٦- باسی کەسێک وشترەکەی بەستبێتەوە لە جێگایەکی بەردڕێژکراو یان لای دەرگای مزگەوتدا

٢٤٧٠- ئەبو موتەوەکیلی ناجی دەڵێ: ڕۆیشتمە لای جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە مزگەوتەوە، منیش چومە ژوورەوە بۆ لای، وشترەکەشم لەلایەکی بەردڕێژکراوەکەدا بەستەوە و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە وشترەکەتە، ئەویش (لە مزگەوت) هاتە دەرەوە دەستی کرد بەسووڕانەوە بەدەوری وشترەکەدا وفەرمووی: ((نرخەکەی و وشترەکەش بۆ خۆت)).

(١) بڕوانە: ٤٤٣.

## ٢٧- بَابُ الوُقُوفِ وَالبَوْلِ عِنْدَ سُبَاطَةِ قَوْمٍ

٢٤٧١- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، أَوْ قَالَ: لَقَدْ أَتَى النَّبِيُّ ﷺ سُبَاطَةَ قَوْمٍ فَبَالَ قَائِمًا[1].

## ٢٧- باسی (دروستی) وەستان و میزكردن لای زبڵدانی خەڵكی شوێنێكدا

**٢٤٧١- حوزەیفە ﷺ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەری خوام ﷺ بینی یان وتی: پێغەمبەر ﷺ هات لای زبڵدانی خەڵكی شوێنێك، جا بەپێوە میزی كرد.**

## ٢٨- بَابُ مَنْ أَخَذَ الغُصْنَ وَمَا يُؤْذِي النَّاسَ فِي الطَّرِيقِ فَرَمَى بِهِ

٢٤٧٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ، وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ فَأَخَذَهُ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ"[2].

## ٢٨- باسی كەسێک لقی دار یان هەر شتێک زیان بەخەڵكی بگەیەنێت لە ڕێگادا هەڵگرێت و فڕێی بدات

**٢٤٧٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لەكاتێكدا پیاوێك بەڕێگادا دەڕۆیشت لقێكی دڕكاوی لەسەر ڕێگایەكدا دی، هەڵیگرت و لایبرد، خواش سوپاسی كرد (كردەوەكەی لێ گیرا كرد) و لێی خۆش بوو)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٢٤.

(٢) بڕوانە: ٦٥٢.

## ٢٩ - بابٌ: إِذَا اخْتَلَفُوا فِي الطَّرِيقِ الميتَاءِ -وَهْيَ: الرَّحْبَةُ تَكُونُ بَيْنَ الطَّرِيقِ- ثُمَّ يُرِيدُ أَهْلُهَا البُنْيَانَ، فَتُرِكَ مِنْهَا الطَّرِيقُ سَبْعَةَ أَذْرُعٍ

٢٤٧٣- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ خِرِّيتٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ قَضَى النَّبِيُّ ﷺ إِذَا تَشَاجَرُوا فِي الطَّرِيقِ (الميتاء) بِسَبْعَةِ أَذْرُعٍ.

## ٢٩- باسێک: ئەگەر خەڵکەکە دەبارەی ڕێگایەکی گشتی ناکۆک بوون کە -بریتییە لە شوێنێکی فراوان لە نێوان ڕێگاکەدایە -پاشان خەڵکی ئەو جێگایە دەیانەوێت لەو شوێنە فراوانەدا خانوو دروست بکەن، ئینجاحەوت گەز لەو شوێنەدا بۆ ڕێگا بەجێهێڵرا

**٢٤٧٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەگەر خەڵکی کێشەیان بوو لەسەر ئەندازەی ڕێگا (ی گشتی)، ئەوە پێغەمبەر ﷺ بڕیاری داوە حەوت گەز بێت.**

## ٣٠- بابُ النُّهْبَى بِغَيْرِ إِذْنِ صَاحِبِهِ

وَقَالَ عُبَادَةُ: بَايَعْنَا النَّبِيَّ ﷺ أَنْ لاَ نَنْتَهِبَ[١].

٢٤٧٤- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَدِيُّ بْنُ ثَابِتٍ سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ يَزِيدَ الأَنْصَارِيَّ -وَهُوَ جَدُّهُ أَبُو أُمِّهِ- قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ النُّهْبَى وَالمُثْلَةِ[٢].

---

(١) بڕوانە: ١٨.

(٢) بڕوانە: ٥٥١٦.

## ٣٠- باسی جەردەیی و تاڵانی بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی

**عوبادە دەڵێ: پەیمانمان بەپێغەمبەر ﷺ دا کە تاڵان و ڕاوڕووت نەکەین.**

**٢٤٧٤- عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدی ئەنصاری ﷺ -کە باپیرەی عەدی کوڕی سابیتە لەسەری دایکیەوە[١]- دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کرد لە تاڵان و ڕاوڕووت و شێواندنی لاشەی مرۆڤ و لووت و گوێ بڕینی.**

٢٤٧٥- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، حَدَّثَنَا عُقَيْلٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَنْتَهِبُ نُهْبَةً يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهْوَ مُؤْمِنٌ". وَعَنْ سَعِيدٍ وَأَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ، إِلَّا النُّهْبَةَ.

قَالَ الفِرَبْرِيُّ: وَجَدْتُ بِخَطِّ أَبِي جَعْفَرٍ: قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: تَفْسِيرُهُ: أَنْ يُنْزَعَ مِنْهُ، يُرِيدُ الإِيمَانَ[٢].

**٢٤٧٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((داوێن پیس داوێن پیسی ناکات لەکاتی داوێن پیسییەکەیدا باوەڕدار بێت، وە (عارەق خۆر) عارەق ناخواتەوە و لەکاتی عارەق خواردنەوەکەیدا باوەڕدار بێت، وە (دز) دزی ناکات و لە کاتی دزی کردنەکەیدا باوەڕدار بێت، وە (تاڵانچی) تاڵانی هیچ شتێکی بەنرخ ناکات کە خەڵك بۆ تاڵانکردنەکەی بڕوانن و لەکاتی تاڵانی دەکات باوەڕدار بێت)).**

**وێنەی ئەم فەرموودەیە لەسەعید و ئەبو سەلەمە و ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، جگە لەو بەشەی (وە تاڵانی هیچ ...).**

---

(١) واتە باوکی دایکی عەدییە.

(٢) بڕوانە: ٥٥٧٨، ٦٧٧٢، ٦٨١٠.

فێرەبری دەڵێ: بەدەستخەتی ئەبو جەعفەر[١] دیومە: ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ڕاڤەو مانای: (لَا يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ) واتە: لەدڵی دەردەهێنرێت مەبەستی باوەڕەکەیەتی.

## ٣١- بابُ كَسْرِ الصَّلِيبِ وَقَتْلِ الخِنْزِيرِ

٢٤٧٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ قَالَ أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ المُسَيَّبِ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: "لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا مُقْسِطًا، فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلَ الخِنْزِيرَ، وَيَضَعَ الجِزْيَةَ، وَيَفِيضَ المَالُ حَتَّى لَا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ"[٢].

## ٣١- باسی شکاندنی خاچ و کوشتنی بەراز

٢٤٧٦- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت، هەتا عیسای کوڕی مەریەم ﷺ لەئاسمانەوە نەیەتە خوارەوە بۆ ناوتان بەفەرمانڕەوییەکی دادپەروەر، ئەوسا خاچ دەشکێنێ و بەراز دەکوژێت و سەرانە هەڵدەگرێت، وە ماڵ و سامان ئەوەندە زۆر دەبێت هەتا کەس وەری ناگرێت)).

## ٣٢ - بابٌ: هَلْ تُكْسَرُ الدِّنَانُ الَّتِي فِيهَا الخَمْرُ أَوْ تُخَرَّقُ الزِّقَاقُ؟فَإِنْ كَسَرَ صَنَمًا أَوْصَلِيبًا أَوْ طُنْبُورًا أَوْمَا لَا يُنْتَفَعُ بِخَشَبِهِ

وَأُتِيَ شُرَيْحٌ فِي طُنْبُورٍ كُسِرَ فَلَمْ يَقْضِ فِيهِ بِشَيْءٍ

---

(١) ئیبن ئەبو حاتیمە کە نووسەری بوخاری بووە.

(٢) بڕوانە: ٢٢٢٢.

٢٤٧٧- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ الضَّحَّاكُ بْنُ مَخْلَدٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى نِيرَانًا تُوقَدُ يَوْمَ خَيْبَرَ. قَالَ: "عَلَى مَا تُوقَدُ هَذِهِ النِّيرَانُ". قَالُوا: عَلَى الحُمُرِ الإِنْسِيَّةِ. قَالَ: "اكْسِرُوهَا، وَأَهْرِقُوهَا". قَالُوا: أَلاَ نُهْرِيقُهَا وَنَغْسِلُهَا؟ قَالَ: "اغْسِلُوا". قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: كَانَ ابن أَبِي أُوَيْسٍ يَقُولُ: الُحمُرِ الأَنَسِيَّةِ. بِنَصْبِ الألَفِ وَالنُّون[1].

## ٣٢- باسێک: ئایا کوپە عارەقی تێدا بێت دەشکێنرێت یان خیگە[2] عارەقی تێدا بێت دەدڕێنرێت؟جا ئەگەر کەسێک بت یان خاچ یان سەمتوور یان شتێک سوود لە تەختەکانی نابینرێت بشکێنێت (حوکمەکەی چییە؟)

(دووکەس) هێنرایە لای شورەیح (کێشەیان بوو) دەربارەی سەمتوورێك شکێنرابوو، هیچ بژاردنێکی نەخستەسەر شکێنەرەکە.

٢٤٧٧- سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی غەزای خەیبەردا چەند ئاگرێکی بینی دەکرایەوە فەرمووی: ((ئەم ئاگرانە بۆ (کوڵاندنی) چی کراونەتەوە؟))، وتیان بۆ (کوڵاندنی گۆشتی) گوێدرێژی ماڵی کراونەتەوە، فەرمووی: ((مەنجەڵ و قابلەمەکانی بشکێنن و (چییان تیایە) بیڕێژن))، وتیان: ئایا بیڕێژین و بیانشۆین؟ فەرمووی: ((بیانشۆن)).

ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئیبنو ئەبو ئوەیس دەڵێ: (الحُمُرِ الأَنَسِيَّةِ) وشەی (الأنَسية) هەمزە و نوونەکە هەردووکیان سەریان هەیە.

---

(١) بروانە: ٤١٩٦، ٥٤٩٧، ٦١٤٨، ٦٣٣١، ٦٨٩١.

(٢) کوندە: پێستی بزنە دوای سەربڕینی خۆش دەکرێت و ئاوی تێدەکرێت. دیارە لەوسەردەمەدا عارەقیشیان تێکردوە.

٢٤٧٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنَا ابن أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ مَكَّةَ، وَحَوْلَ الكَعْبَةِ ثَلَاثُمِائَةٍ وَسِتُّونَ نُصُبًا، فَجَعَلَ يَطْعَنُهَا بِعُودٍ فِي يَدِهِ، وَجَعَلَ يَقُولُ: ﴿ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ ﴾ الإسراء[1].

**٢٤٧٨- عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە ناو شاری مەككە، بەچواردەوری كەعبەدا سێ سەد و شەست بتی تێدابوو، جا پێغەمبەر ﷺ دەستی كرد بە پیاكێشانیان بەدارێك كە بەدەستییەوە بوو، زوو زوو دەیفەرموو: ((ئایینی ڕاست هات و ئایینی ناهەق و بەتاڵ نەما ڕۆیشت)).**

٢٤٧٩- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْن الْمنْذِرِ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ القَاسِمِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّهَا كَانَتِ اتَّخَذَتْ على سَهْوَةٍ لَهَا سِتْرًا فِيهِ تَمَاثِيلُ، فَهَتَكَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَاتَّخَذَتْ مِنْهُ نُمْرُقَتَيْنِ، فَكَانَتَا فِي البَيْتِ يَجْلِسُ عَلَيْهِمَا[2].

**٢٤٧٩- عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە كە ئەو پەردەیەكی كردبوو بۆ تاقێكی خۆی، كە چەند بوكەڵەیەكی تیابوو، پێغەمبەریش ﷺ پەردەكەی لابرد یان دڕاندی، ئیتر عائیشەش دوو پشتی[3] لێ دروست كرد، جا ئەو دوو پشتییە لە ماڵی عائیشەدا بوون و پێغەمبەر ﷺ پاڵی پێوە دەدان (یان لەسەریان دادەنیشت).**

---

(١) بڕوانە: ٤٢٨٧، ٤٧٢٠.

(٢) بڕوانە: ٥٩٥٤، ٥٩٥٥، ٦١٠٩.

(٣) نُمْرُقَة: بەمانای قاڵیچە و ڕاخەریش هاتووە، بۆیە لە كۆتایی فەرمودەكەدا عائیشە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەسەریان دادەنیشت.

## ٣٣- بابُ مَنْ قَاتَلَ دُونَ مَالِه

٢٤٨٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ حَدَّثَنَا سَعِيدٌ -هُوَ: ابْنُ أَبِي أَيُّوبَ- قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الأَسْوَدِ عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: "مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ".

## ٣٣- باسی کەسێک لە پێناو ماڵ و سامانیدا بجەنگێت

**٢٤٨٠- عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەرکەس لە پێناو پارێزگاری لە ماڵ و سامانیدا بکوژرێت ئەوە شەهیدە)).**

## ٣٤ - بابٌ: إِذَا كَسَرَ قَصْعَةً أَوْ شَيْئًا لِغَيْرِه

٢٤٨١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ عَنْ حُمَيْدٍ عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ عِنْدَ بَعْضِ نِسَائِهِ، فَأَرْسَلَتْ إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ مَعَ خَادِمٍ بِقَصْعَةٍ فِيهَا طَعَامٌ فَضَرَبَتْ بِيَدِهَا، فَكَسَرَتِ الْقَصْعَةَ، فَضَمَّهَا وَجَعَلَ فِيهَا الطَّعَامَ، وَقَالَ: "كُلُوا". وَحَبَسَ الرَّسُولَ وَالْقَصْعَةَ حَتَّى فَرَغُوا، فَدَفَعَ الْقَصْعَةَ الصَّحِيحَةَ وَحَبَسَ الْمَكْسُورَةَ[1].

وقال إبنُ أَبِي مريم:أخبرنا يحيى بنُ أيوبَ: حَدَّثَنَا حُميدٌ: حَدَّثَنَا أَنَسٌ، عنِ النَّبِيَّ ﷺ

## ٣٤- باسێک: ئەگەر کەسێک قاپێک[2] یان هەر شتێکی تری کەسێک بشکێنێت

**٢٤٨١- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لای یەکێك لە خێزانەکانی بوو، یەکێك لەدایکانی ئیمانداران بەخزمەتکارێکیدا قاپێکی**

---

(١) بڕوانە: ٥٢٢٥.

(٢) قَصْعَةٌ : بەقاپی دروستکراو لە تەختە دەڵێن. (فتح الباري: ١٥٨/٦)

**نارد کە خۆراکی تێدابوو، جا ئەو خێزانەی (کە پێغەمبەر ﷺ لە ماڵیدا بوو) دەستێکی هەڵدا لەقاپەکە و قاپەکە شکا، پێغەمبەریش ﷺ لکاندیەوە بەیەکەوە و خۆراکەکەی تێکردەوە، وە (بە هاوەڵانی) فەرموو: ((بخۆن))، وە پێغەمبەر ﷺ خزمەتکارەکە و قاپەکەی لای خۆی هێڵایەوە تا لەنان خواردنەکە بوونەوە، جا پێغەمبەر ﷺ قاپێکی ساغی[1] پێدا ناردەوە، قاپە شکاوەکەی لای خۆی هێڵایەوە.**

**ئیبنو ئەبو مەریەم دەڵێ: یەحیای کوڕی ئەیووب بۆی گێڕاینەوە، وتی: حومەید بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەنەس بۆی گێڕاینەوە لە پێغەمبەرەوە[2] ﷺ.**

## ٣٥ - بابٌ: إِذَا هَدَمَ حَائِطًا فَلْيَبْنِ مِثْلَهُ

٢٤٨٢- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "كَانَ رَجُلٌ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ، يُقَالُ لَهُ جُرَيْجٌ، يُصَلِّي، فَجَاءَتْهُ أُمُّهُ فَدَعَتْهُ، فَأَبَى أَنْ يُجِيبَهَا، فَقَالَ أُجِيبُهَا أَوْ أُصَلِّي؟ ثُمَّ أَتَتْهُ، فَقَالَتِ: اللَّهُمَّ لَا تُمِتْهُ حَتَّى تُرِيَهُ وُجُوهَ الْمُومِسَاتِ. وَكَانَ جُرَيْجٌ فِي صَوْمَعَتِهِ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ: لَأَفْتِنَنَّ جُرَيْجًا. فَتَعَرَّضَتْ لَهُ فَكَلَّمَتْهُ فَأَبَى، فَأَتَتْ رَاعِيًا، فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا فَوَلَدَتْ غُلَامًا، فَقَالَتْ: هُوَ مِنْ جُرَيْجٍ. فَأَتَوْهُ، وَكَسَرُوا صَوْمَعَتَهُ فَأَنْزَلُوهُ وَسَبُّوهُ، فَتَوَضَّأَ وَصَلَّى ثُمَّ أَتَى الغُلَامَ، فَقَالَ: مَنْ أَبُوكَ يَا غُلَامُ قَالَ الرَّاعِي. قَالُوا نَبْنِي صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ؟ قَالَ: لَا، إِلَّا مِنْ طِينٍ"[3].

---

(١) کە هی عائیشە بوو لەبری ئەوەی شکاندی.

(٢) گێڕانەوەی فەرموودەکەیە بەڕێگایەکی تر. مەبەستی ئیمام بوخاری ئەوەیە کە حومەیـد ئەم فەرمـوودەی لە ئەنەس بیستووە.(إرشاد الساري:٥/٤٩٣)

(٣) بڕوانە: ١٢٠٦.

## ٣٥- باسێک: ئەگەر کەسێک دیواری کەسێکی ڕوخاند با وەک خۆی بۆی دروست بکاتەوە

**٢٤٨٢- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((پیاوێك هەبوو لە بەنو ئیسرائیل پێی دەوترا جورەیج، نوێژی دەكرد، دایكی هات بۆ لای و بانگی كرد، بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە، بەخۆی وت وەڵامی دایكم بدەمەوە یان نوێژەكەم بكەم؟ پاشان جارێكی تر دایكی هاتەوە (هەر وەڵامی نەدایەوە)، دایكی وتی: خوایە نەیمرێنیت هەتا دەموچاوی ئافرەتی داوێن پیسی پیشان دەدەیت، وە جورەیج ل پەرستگاكەی خۆیدا بوو، ئافرەتێك وتی: سوێند بێت جورەیج لەخشتەبەرم و تووشی فیتنەی بكەم، ئینجا ئافرەتەكە خۆی نیشانی جورەیج دا و قسەی لەگەڵدا كرد (زینای لەگەڵ بكات)، جورەیج ڕازی نەبوو، جا ئافرەتەكە ڕۆیشت بۆ لای شوانێك و زینای لەگەڵدا كرد و ئافرەتەكە كوڕێكی بوو، ئینجا وتی: ئەو كوڕە لەجورەیجە، جا هاتن بۆ جورەیج و پەرستگاكەیان شكاند (ڕوخاند) و هێنایانە خوارەوە و جنێویان پێدا، ئەویش دەست نوێژی گرت و نوێژی كرد، پاشان هات بۆ لای كوڕەكە (كە لەئافرەتەكەبوو بوو) و پێی وت: كوڕەكە كێ باوكتە؟ كوڕە منداڵەكەش وتی: شوانەكە، وتیان: پەرستگاكەت لەئاڵتون بۆ دروست بكەینەوە؟ جورەیج وتی: نابێ هەر دەبێ لە قوڕ بێت)).**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٤٧- كِتَابُ الشَّرِكَةِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٤٧- پەڕاوی هاوبەشی

## ١- بَابُ الشَّرِكَةِ فِي الطَّعَامِ وَالنِّهْدِ وَالعُرُوضِ

وَكَيْفَ قِسْمَةُ مَا يُكَالُ وَيُوزَنُ مُجَازَفَةً أَوْ قَبْضَةً قَبْضَةً، لَمَّا لَمْ يَرَ المُسْلِمُونَ فِي النَّهْدِ بَأْسًا أَنْ يَأْكُلَ هَذَا بَعْضًا، وَهَذَا بَعْضًا وَكَذَلِكَ مُجَازَفَةُ الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ، وَالقِرَانُ فِي التَّمْرِ.

## ١- باسی هاوبەشی لە خۆراک و خەرجی ڕێبواران و کاڵاکاندا

**وە چۆنیەتی دابەشکردنی ئەوەی دەپێورێت و دەکێشرێت بە گۆترە بێت یان بە مشت مشت بێت، لەبەرئەوەی مسوڵمانان بەلایانەوە ئاسایی بووە دەربارەی کەسانێك لە سەفەردا خۆراك کۆکەنەوەو تێکەڵی بکەن، ئەمەیان ئەوەندەی بخوات و ئەوەیان ئەوەندە بخوات (بەگۆترە)، هەروەها ئاڵتون بەزیو و زیو بەئاڵتون بەگۆترە، وە دوو دەنك خورما پێکەوە خواردن.**

٢٤٨٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﵄ أَنَّهُ قَالَ بَعَثَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَعْثًا قِبَلَ السَّاحِلِ، فَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الجَرَّاحِ وَهُمْ ثَلَاثُمِائَةٍ وَأَنَا فِيهِمْ، فَخَرَجْنَا حَتَّى إِذَا كُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ فَنِيَ الزَّادُ، فَأَمَرَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِأَزْوَادِ ذَلِكَ الجَيْشِ فَجُمِعَ ذَلِكَ كُلُّهُ فَكَانَ مِزْوَدَيْ تَمْرٍ، فَكَانَ يُقَوِّتُنَا كُلَّ يَوْمٍ قَلِيلًا قَلِيلًا، حَتَّى فَنِيَ، فَلَمْ

يَكُنْ يُصِيبُنَا إِلَّا تَمْرَةٌ تَمْرَةٌ، فَقُلْتُ وَمَا تُغْنِي تَمْرَةٌ فَقَالَ لَقَدْ وَجَدْنَا فَقْدَهَا حِينَ فَنِيَتْ. قَالَ ثُمَّ انْتَهَيْنَا إِلَى البَحْرِ فَإِذَا حُوتٌ مِثْلُ الظَّرِبِ، فَأَكَلَ مِنْهُ ذَلِكَ الجَيْشُ ثَمَانِيَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، ثُمَّ أَمَرَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِضِلَعَيْنِ مِنْ أَضْلَاعِهِ فَنُصِبَا، ثُمَّ أَمَرَ بِرَاحِلَةٍ، فَرُحِلَتْ ثُمَّ مَرَّتْ تَحْتَهُمَا فَلَمْ تُصِبْهُمَا[1].

**٢٤٨٣- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی نارد بەرەو کەناری دەریا، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی کردە لێپرسراویان، کە ئەوان سێ سەد کەس بوون و منیشی تیابووم، جا لەمەدینە دەرچووین، کاتێك لەبەشێکی ڕێگاکەدا بووین ئازووقەمان تەواو بوو، ئەبو عوبەیدە فەرمانی کرد بەو بەشە ئازووقەیەی کە سوپاکە مابووی (لای کەسەکان) هەمووی کۆکرایەوە، دوو تورەکە خورما بوو، ئینجا هەموو ڕۆژێك کەمە کەمە پێی دەداین بیخۆین، تا کۆتایی هات (کەمێکی نەبێت)، ئیتر دانە دانە نەبێت خورمامان بەرنەدەکەوت، (وەهب دەڵێ:) - منیش وتم (بە جابیر): دەی دەنکە خورمایەك چ سوودی هەیە (بۆ لابردنی برسیەتی)؟ جابیر وتی: کە خورما تەواو بوو ئینجا دەمانزانی دەنکە خورمایەك چەند گرنگە- جابیر دەڵێ: پاشان گەیشتینە کەنار دەریا، جا نەهەنگێکمان بینی بەقەد شاخێکی بچکۆلە دەبوو، ئیتر ئەو سوپایە هەژدە شەو و ڕۆژ لێیان خوارد، ئینجا ئەبو عوبەیدە فەرمانی کرد بە دوو پەراسوو لەپەراسووکانی بە قنجی دانران، پاشان فەرمانی کرد بە وشترێك و باری لێنرا، پاشان بەژێر دوو پەراسووەکەدا ڕۆیشت و بێ ئەوەی بەر پەراسووەکان بکەوێت (ئەوەندە بەرز و گەورە بوون).**

٢٤٨٤- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مَرْحُومٍ، حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ عَنْ سَلَمَةَ ﷺ قَالَ: خَفَّتْ أَزْوَادُ القَوْمِ وَأَمْلَقُوا، فَأَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ فِي نَحْرِ إِبِلِهِمْ فَأَذِنَ لَهُمْ، فَلَقِيَهُمْ عُمَرُ

---

(١) بڕوانە: ٢٩٨٣، ٤٣٦٠، ٤٣٦١، ٤٣٦٢، ٥٤٩٣، ٥٤٩٤.

فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ مَا بَقَاؤُكُمْ بَعْدَ إِبِلِكُمْ؟ فَدَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا بَقَاؤُهُمْ بَعْدَ إِبِلِهِمْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "نَادِ فِي النَّاسِ فَيَأْتُونَ بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ". فَبُسِطَ لِذَلِكَ نِطَعٌ، وَجَعَلُوهُ عَلَى النِّطَعِ. فَقَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَدَعَا وَبَرَّكَ عَلَيْهِ، ثُمَّ دَعَاهُمْ بِأَوْعِيَتِهِمْ، فَاحْتَثَى النَّاسُ حَتَّى فَرَغُوا، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ"[1].

**٢٤٨٤- سەلەمە ﷺ دەڵێ: خەڵكی ئازووقە و توێشوویان كەم بوویەوە و هەژار كەوتن (لە غەزادا)، بۆیە هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ ڕێگە پێدانیان بۆ سەربڕینی وشترەكانیان، پێغەمبەریش ﷺ مۆڵەتی دان، ئینجا عومەر ﷺ پێیان گەیشت و ئەو هەواڵەیان پێدا، عومەریش وتی: ئێوە لەدوای (سەربڕینی) وشترەكانتان چۆن دەمێنن و بەردەوام دەبن[2]؟ بۆیە عومەر ڕۆیشتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەم خەڵكە دوای (سەبڕینی) وشترەكانیان چۆن دەمێنن؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((جاڕبدە بەناو خەڵكیدا با توێشووە زیادەكانیان بێنن))، جا چەرمێكیان ڕاخست بۆ ئەو مەبەستە، توێشووە زیادەكانیان كردە سەری، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و لەخوا پاڕایەوە و نزای پیت و فەڕی كرد، پاشان داوای كرد خەڵكەكە هۆڕ (تورەكە)و هەگبەكانیان بێنن، خەڵكەكەش بەمشت تێیان دەكرد هەتا تەواو بوون، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((شایەتی دەدەم كە هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە جگە لەخوا، وە شایەتیش دەدەم كە من نێردراو پێغەمبەری ﷺ خوام)).**

٢٤٨٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، حَدَّثَنَا أَبُو النَّجَاشِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ العَصْرَ فَنَنْحَرُ جَزُورًا، فَتُقْسَمُ عَشْرَ قِسَمٍ، فَنَأْكُلُ لَحْمًا نَضِيجًا قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ.

---

(١) بڕوانە: ١٩٨٢.

((٢) چونكە دەبێ زۆر بەپێ بڕۆن ئەوەش دەبێتە هۆی مردن و لەناوچونتان.

**٢٤٨٥- ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ نوێژی عەسرمان دەکرد، ئینجا وشترێکمان سەردەبڕی، ئینجا گۆشتەکەیمان دەکرد بە دە بەشەوە، ئەوسا گۆشتێکی لێنراوی پێگەیشتوومان دەخوارد پێش ئەوەی خۆر ئاوا ببێت.**

٢٤٨٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّ الأَشْعَرِيِّينَ إِذَا أَرْمَلُوا فِي الغَزْوِ أَوْ قَلَّ طَعَامُ عِيَالِهِمْ بِالمَدِينَةِ، جَمَعُوا مَا كَانَ عِنْدَهُمْ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ اقْتَسَمُوهُ بَيْنَهُمْ فِي إِنَاءٍ وَاحِدٍ بِالسَّوِيَّةِ، فَهُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ".

**٢٤٨٦- ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەشعەرییەکان ئەگەر لەکاتی جەنگدا توێشوویان تەواو بوایە، یان خۆراکیماڵ و منداڵیان لەمەدینە کەم ببوایەتەوە، هەرچیان هەبووایە لەسەر یەك پارچە قوماش کۆیان دەکردەوە، پاشان بەیەك قاپ بەیەکسانی لە نێوان خۆیاندا دابەشیان دەکرد، جا بۆیە ئەوان لە منن و منیش لەوانم)).**

## ٢- بابُ مَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ فِي الصَّدَقَةِ

٢٤٨٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ المُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي ثُمَامَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَنَسٍ، أَنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ كَتَبَ لَهُ فَرِيضَةَ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَالَ: "وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ"[1].

(١) بڕوانە: ١٤٤٨.

# ٢- باسی ئەو ماڵەی هاوبەشە ئەوە بێگومان هەردووکیان بەیەکسانی لە زەکاتداندا بەشە زەکاتەکەی لێ وەردەگیرێ[١]

**٢٤٨٧- سومامەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەنەس دەگێڕێتەوە کە ئەنەس ﷛ بۆی گێڕایەوە: ئەو زەکاتەی دیاریکراوە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ ئەبو بەکر ﷛ بۆی نووسی کە فەرموویەتی: ((ئەو ماڵەی کە تێکەڵاوە (لە نێوان دوو شەریك یان زیاتردا)، ئەوە بێگومان (کە زەکاتیان دا) هەردووکیان بەئەندازەی ماڵەکەی بەشە زەکاتی لێ وەردەگیرێ)).**

## ٣- بابُ قِسْمَةِ الغَنَمِ

٢٤٨٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الحَكَمِ الأَنْصَارِيُّ حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِذِي الحُلَيْفَةِ فَأَصَابَ النَّاسَ جُوعٌ، فَأَصَابُوا إِبِلًا وَغَنَمًا. قَالَ وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ فِي أُخْرَيَاتِ القَوْمِ فَعَجِلُوا وَذَبَحُوا وَنَصَبُوا القُدُورَ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِالقُدُورِ فَأُكْفِئَتْ، ثُمَّ قَسَمَ فَعَدَلَ عَشْرَةً مِنَ الغَنَمِ بِبَعِيرٍ فَنَدَّ مِنْهَا بَعِيرٌ، فَطَلَبُوهُ فَأَعْيَاهُمْ، وَكَانَ فِي القَوْمِ خَيْلٌ يَسِيرَةٌ، فَأَهْوَى رَجُلٌ مِنْهُمْ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ اللهُ، ثُمَّ قَالَ: "إِنَّ لِهَذِهِ البَهَائِمِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الوَحْشِ، فَمَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا". فَقَالَ جَدِّي إِنَّا نَرْجُو -أَوْ نَخَافُ- العَدُوَّ غَدًا، وَلَيْسَتْ مَعَنَا مُدى، أَفَنَذْبَحُ بِالقَصَبِ؟ قَالَ: "مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ، فَكُلُوهُ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ، وَسَأُحَدِّثُكُمْ عَنْ ذَلِكَ، أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الحَبَشَةِ"[٢].

---

[١] واتە بە گوێرەی ژمارەی ئاژەڵەکانیان زەکات دەدەن.

[٢] بڕوانە: ٢٥٠٧، ٣٠٧٥، ٥٤٩٨، ٥٥٠٣، ٥٥٠٦، ٥٥٠٩، ٥٥٤٣، ٥٥٤٤.

## ٣- باسی دابەشکردنی مەڕ بەژمارە

٢٤٨٨- عەبایەی کوڕی ریفاعەی کوڕی ڕافیعی کوڕی خەدیج لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە (کە ڕافیعی کوڕی خەدیج) دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین لە زولحولەیفە، خەڵك تووشی برسیەتی هاتن، ئینجا چەند سەر وشتر و مەڕیان دەستکەوت، ڕافیع دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە دواوەی لەشکرەکە بوو، جا خەڵکانێك پەلەیان کردو (لەوەی دەستیان کەوتبوو)، سەریان بڕین و مەنجەڵیان خستە سەر (ئاگر)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد کە مەنجەڵەکان (قلْپ بکرێنەوە)، ئەوسا مەنجەڵەکان قلْپ کرانەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ (وشتر و مەڕەکانی) دابەشکرد و هەر دە سەر مەڕێکی لەجێی وشترێك دانا، جا وشترێك لەو وشترانە یاخی بوو، بەدوایدا ڕۆیشتن، بەڵام ماندووی کردن (بۆیان نەگیرایەوە)، وە لەناو خەڵکەکەدا چەند ئەسپسوارێکی کەم هەبوو، ئینجا پیاوێکیان تیرێکی تێگرت، ئیتر خوا (بەهۆی ئەو تیرەوە) جوڵەی لێ بڕی و ڕایگرت، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەم ئاژەڵانە یاخی بوونێکیان هەیە وەك یاخی بوونی ئاژەڵی کێوی، جا هەر کامێکیان لەدەستتان دەرچوو (بۆتان نەگیرا) ئاوای لێ بکەن))، (عەبایە دەڵێ) باپیرەم وتی: ئێمە سبەینێ بەتەمای دەستکەوتین لەدوژمنەوە -یان دەترسین لێیان- و چەقۆشمان پێ نییە[1]، ئایا دەتوانین بەقامیش (ئاژەڵ) سەربببڕین؟ فەرمووی ﷺ : ((هەر شتێك خوێنی بڕژێنێت و ناوی خوای لەسەر هێنرا بێ ئەوە بیخۆن، بەڵام بەددان و نینۆك نابێت، لەو بارەشەوە قسەتان بۆ دەکەم، سەبارەت بەددان ئەوە ئێسکێکە، وە سەبارەت بە نینۆکیش ئەوە چەقۆی خەڵکی حەبەشەیە)).

---

(١) بۆیە شمشێرەکانیان بەکار ناهێنن بۆ سەربڕین، بۆ ئەوەی کول نەبێت بۆ جەنگ کردن.

## ٤- بابُ القِرَانِ فِي التَّمْرِ بَيْنَ الشُّرَكَاءِ حَتَّى يَسْتَأْذِنَ أَصْحَابَهُ

٢٤٨٩- حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنَا جَبَلَةُ بْنُ سُحَيْمٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﵄ يَقُولُ نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَقْرُنَ الرَّجُلُ بَيْنَ التَّمْرَتَيْنِ جَمِيعًا، حَتَّى يَسْتَأْذِنَ أَصْحَابَهُ[١].

## ٤- باسی دوو خورما پێکەوە (خواردن) نابێ لە نێوان هاوبەشەکاندا هەتا مۆڵەت لە هاوڕێکانی وەرنەگرێت

**٢٤٨٩- ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردووە کە پیاو دوو خورما پێکەوە بخوات بەجارێك، هەتا مۆڵەت لە هاوڕێیەکانی وەرنەگرێت.**

٢٤٩٠- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ جَبَلَةَ قَالَ: كُنَّا بِالمَدِينَةِ فَأَصَابَتْنَا سَنَةٌ، فَكَانَ ابْنُ الزُّبَيْرِ يَرْزُقُنَا التَّمْرَ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَمُرُّ بِنَا فَيَقُولُ: لَا تَقْرُنُوا فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الإِقْرَانِ، إِلَّا أَنْ يَسْتَأْذِنَ الرَّجُلُ مِنْكُمْ أَخَاهُ[٢].

**٢٤٩٠- جەبەلە دەڵێ: ئێمە (لەگەڵ هەندێك لەخەڵکی عێراقدا)[٣] لە مەدینە بووین، ئینجا گرانی و قات و قڕییەکمان تووشبوو، عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریش خورمای پێمان دەدا، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﵄ بەلاماندا تێدەپەڕی و دەیوت: دوو خورما پێکەوە مەخۆن، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لەپێکەوە خواردنی دوو خورما کردووە، مەگەر کەسێك لەئێوە مۆڵەت لەبراکەی وەربگرێت.**

(١) بڕوانە: ٢٤٥٥.

(٢) بڕوانە: ٢٤٥٥.

(٣) ئەو زیادە بوخاری پێشتر هێناویەتی لە فەرموودەی: ٢٤٥٥ صەحیحەکەیدا.

## ٥- بابُ تَقْوِيمِ الأَشْيَاءِ بَيْنَ الشُّرَكَاءِ بِقِيمَةِ عَدْلٍ

٢٤٩١- حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مَيْسَرَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مَنْ أَعْتَقَ شِقْصًا لَهُ مِنْ عَبْدٍ -أَوْ شِرْكًا، أَوْ قَالَ نَصِيبًا- وَكَانَ لَهُ مَا يَبْلُغُ ثَمَنَهُ بِقِيمَةِ العَدْلِ، فَهْوَ عَتِيقٌ، وَإِلاَّ فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ". قَالَ: لَا أَدْرِي قَوْلُهُ: "عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ". قَوْلٌ مِنْ نَافِعٍ أَوْ فِي الحَدِيثِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

## ٥- باسی نرخدانان بۆ شتەکان بەنرخدانانێکی ڕاست لە نێوان هاوبەشەکاندا

**٢٤٩١- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس بەشی خۆی لەکۆیلەیەك -یان (وتی:) بەشێکی هاوبەش یان بەشێك- ئازاد بکات، ئەگەر ئەوەندەی پارە هەبوو بگاتە نرخی کۆیلەیەك بەڕێکی، ئەوە هەمووی ئازادکراوە، ئەگەر نا ئەوە بێگومان ئەوەندەی ئازادکراوە ئازاد دەبێت)). (ئەیوب) دەڵێ: نازانم ئەم بڕگەیە (ئەوەندەی ئازادکراوە ئازاد دەبێت) وتەی نافیعە، یان بەشێکە لەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە.**

٢٤٩٢- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ بَشِيرِ بْنِ نَهِيكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مَنْ أَعْتَقَ شَقِيصًا مِنْ مَمْلُوكِهِ فَعَلَيْهِ خَلاَصُهُ فِي مَالِهِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ قُوِّمَ المَمْلُوكُ، قِيمَةَ عَدْلٍ ثُمَّ اسْتُسْعِيَ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ"[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٥٠٣، ٢٥٢١، ٢٥٢٢، ٢٥٢٣، ٢٥٢٤، ٢٥٢٥، ٢٥٥٣.

(٢) بڕوانە: ٢٥٠٤، ٢٥٢٦، ٢٥٢٧.

**٢٤٩٢- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەرکەس بەشێك لە کۆیلەکەی ئازاد بکات، ئەوە لەسەریەتی هەمووی لەپارەی خۆی ئازاد بکات، خۆ ئەگەر ماڵی نەبوو کۆیلەکە بەنرخی کاتی کۆیلەیی ڕێك دەقەبلێنرێت، پاشان کەسابەتی لێ داوا دەکریٚ[1] بێ توند و گران کردن لەسەری)).**

## ٦ - بابٌ: هَلْ يُقْرَعُ فِي القِسْمَةِ وَالِاسْتِهَامِ فِيهِ

٢٤٩٣- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ قَالَ: سَمِعْتُ عَامِرًا يَقُولُ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مَثَلُ القَائِمِ عَلَى حُدُودِ اللهِ وَالوَاقِعِ فِيهَا كَمَثَلِ قَوْمٍ اسْتَهَمُوا عَلَى سَفِينَةٍ، فَأَصَابَ بَعْضُهُمْ أَعْلاَهَا وَبَعْضُهُمْ أَسْفَلَهَا، فَكَانَ الَّذِينَ فِي أَسْفَلِهَا إِذَا اسْتَقَوْا مِنَ المَاءِ مَرُّوا عَلَى مَنْ فَوْقَهُمْ فَقَالُوا: لَوْ أَنَّا خَرَقْنَا فِي نَصِيبِنَا خَرْقًا، وَلَمْ نُؤْذِ مَنْ فَوْقَنَا. فَإِنْ يَتْرُكُوهُمْ وَمَا أَرَادُوا هَلَكُوا جَمِيعًا، وَإِنْ أَخَذُوا عَلَى أَيْدِيهِمْ نَجَوْا وَنَجَوْا جَمِيعًا"[2].

## ٦- باسێک: ئایا تیروپشک دەکرێ لە دابەشکردنی (هاوبەشەکاندا)؟ وە وەرگرتنی بەش تێیدا

**٢٤٩٣- نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرموێ: ((نموونەی ئەو کەسەی وەستاوە لەسەر سنوورەکانی خوا و ئەو کەسەی کەوتۆتە ناویەوە، وەك نموونەی کەسانێك وان کە لەسەر کەشتییەك تیر و پشك بکەن، ئینجا هەندێکیان بەشی سەرەوەی کەشتییەکەیان بەردەکەوێت، وە هەندێکیشیان بەشی خوارەوەیان بەردەکەوێت، جا ئەوانەی لەبەشی خوارەوەن کە بیانەوێ ئاو بخۆنەوە بەسەر ئەوانەدا دەڕۆن لەسەریانەوەن، بۆیە دەڵێن:**

---

(١) داوای کەسابەت لە کۆیلەکە دەکرێت (إرشاد الساري:٥٠٧/٥).

(٢) بڕوانە: ٢٦٨٦.

ئەگەر ئێمە لەبەشەکەی خۆماندا کونێکی تێ بکەین و ئەزیەت بەوانەی لەسەرمانەوە نەگەیەنین (باشترە) جا ئەگەر لێیان گەڕێین ئەو کارەی دەیانەوێت بیکەن هەموویان تیادەچن، خۆ ئەگەر دەستیان بگرن خۆیان و ئەوانیش ڕزگاریان دەبێت)).

## ٧- بابُ شَرِكَةِ اليَتِيمِ وَأَهْلِ المِيرَاثِ

٢٤٩٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ العَامِرِيُّ الأُوَيْسِيُّ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﵂. وَقَالَ اللَّيْثُ حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ[1] أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﵂ عَنْ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ﴿٣﴾ ﴾ النساء. فَقَالَتْ: يَا ابْنَ أُخْتِي، هِيَ اليَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا تُشَارِكُهُ فِي مَالِهِ، فَيُعْجِبُهُ مَالُهَا وَجَمَالُهَا، فَيُرِيدُ وَلِيُّهَا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا بِغَيْرِ أَنْ يُقْسِطَ فِي صَدَاقِهَا، فَيُعْطِيهَا مِثْلَ مَا يُعْطِيهَا غَيْرُهُ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ وَيَبْلُغُوا بِهِنَّ أَعْلَى سُنَّتِهِنَّ مِنَ الصَّدَاقِ، وَأُمِرُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا طَابَ لَهُمْ مِنَ النِّسَاءِ سِوَاهُنَّ.

قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ اسْتَفْتَوْا رَسُولَ اللهِ ﷺ بَعْدَ هَذِهِ الآيَةِ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِى ٱلنِّسَآءِ ﴿١٢٧﴾ ﴾ النساء. إِلَى قَوْلِهِ ﴿ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴿١٢٧﴾ ﴾ النساء. وَالَّذِي ذَكَرَ اللهُ أَنَّهُ يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الكِتَابِ الآيَةُ الأُولَى الَّتِي قَالَ فِيهَا ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿٣﴾ ﴾ النساء. قَالَتْ عَائِشَةُ: وَقَوْلُ اللهِ فِي الآيَةِ الأُخْرَى: ﴿ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴿١٢٧﴾ ﴾ النساء. يَعْنِي: هِيَ رَغْبَةُ أَحَدِكُمْ لِيَتِيمَتِهِ

(١) لە عروەی کوڕی زوبەیرەوە بە دوو سەنەد ئیمامی بوخاری ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

التِي تَكُونُ فِي حَجْرِهِ، حِينَ تَكُونُ قَلِيلَةَ المَالِ وَالجَمَالِ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا رَغِبُوا فِي مَالِهَا وَجَمَالِهَا مِنْ يَتَامَى النِّسَاءِ إِلَّا بِالقِسْطِ مِنْ أَجْلِ رَغْبَتِهِمْ عَنْهُنَّ[1].

## ٧- باسی هاوبەشی هەتیو لەگەڵ میراتگرەکاندا

**٢٤٩٤- عورووەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە ئەو پرسیاری لە عائیشە ﵂ کرد دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن لە (مارەیی) ئەو ئافرەتە بێ باوکانەدا (مارەیان مەکەن)، ئەوە مارە بکەن لەو ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆتان دوو دوو یان سیان سیان یان چوار چوار)، عائیشەش وتی: ئەی خوشکەزای خۆم ئەوە کچێکی هەتیوە لای سەرپەرشتیارەکەیەتی، کچە هەتیوەکە دەبێتە هاوبەشی سەرپەرشتیارەکەی لە ماڵەکەیدا، وە سەرپەرشتیارەکە حەزی لە سامان و جوانی کچە هەتیوەکەیە، بۆیە دەیەوێ مارەی بکات لەخۆی بەبێ ئەوەی دادگەر بێت لەمارەییەکەیدا، وە ئەوەندەی مارەیی بداتێ کە کەسێکی تر بە کچە هەتیوەکەی دەدا (ئەگەر مارەی بکات)، لەبەر ئەوە ڕێگریان لێکرا ئەو کچە هەتیوانە مارە بکەن، مەگەر دادگەر بن بەرانبەریان و بەرزترین ڕێژەی مارەییان پێ بدەن، وەك ئافرەتانی تری هاوشێوەی خۆیان، وە فەرمانیان پێکرا (ئەگەر ئەوەیان نەکرد) حەزیان لە هەر ئافرەتێکە جگە لەوان مارە بکەن. عورووە دەڵێ: عائیشە وتی: پاشان خەڵکی پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دوای دابەزینی ئەو ئایەتە[2] جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندا: (وە (ئەی موحەممەد ﷺ پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ئافرەتان، بڵێ: خوا وەڵامتان دەداتەوە دەربارەیان، وە ئەوەی لە قورئان بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە (وەڵامێکە) لەبارەی کچانی هەتیوەوە، ئەوەی بۆیان**

(١) بڕوانە: ٢٧٦٣، ٤٥٧٣، ٤٥٧٤، ٤٦٠٠، ٥٠٦٤، ٥٠٩٢، ٥٠٩٨، ٥١٢٨، ٥١٣١، ٥١٤٠، ٦٩٦٥.

(٢) ئایەتی سێی سورەتی نیساء

نووسراوە (لەمیراتی باوکیان) پێیان نادەن، وە حەزناکەن مارەیان بکەن (لەبەر میراتەکەشیان ناهێڵن شوو بکەن)، عائیشە دەڵێ: ئەوەی خوای گەورە باسی کردوە کە لەقورئاندا بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە لەئایەتی یەکەمدا کە تێیدا فەرمووی: (وە ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن لە (مارەیی) ئەو ئافرەتە بێ باوکانەدا (مارەیان مەکەن)، ئەوە لەو ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆتان مارە بکەن)، لەگەڵ فەرمایشتی خوای گەورە لەم ئایەتەدا: (وە حەزناکەن مارەیان بکەن)، مەبەست لێی ئەوەیە کەستان حەزی لێی نییە ئەو کچە هەتیوەی لایەتی مارە بکات کە سامان و جوانی کەمە، جا بۆیە رێگریان لێ کرا ئەو کچە هەتیوەی حەزیان لە ماڵ و جوانییەتی لەکچانی هەتیو مارە بکەن، مەگەر دادگەر بن لەبەر مارەنەکردنیان بۆ ئەو کچە هەتیوانەیان سامان و جوانیان کەمە.

## ٨- بابُ الشَّرِكَةِ فِي الأَرَضِ وَغَيْرِهَا

٢٤٩٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا جَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ الشُّفْعَةَ فِي كُلِّ مَا لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتِ الحُدُودُ وَصُرِّفَتِ الطُّرُقُ فَلاَ شُفْعَةَ[١].

## ٨- باسی هاوبەشی لە زەوی و زار و شتی تردا

٢٤٩٥- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ شوفعەی[١] داناوە لەهەموو ماڵێکدا (هاوبەش بێت و) بەش نەکرابێت، جا ئەگەر سنوورەکان دانران و ڕێگاو بانەکان دیاری کران ئیتر شوفعە نییە.

(١) بڕوانە: ٢٢١٣.

## ٩ - بابٌ: إِذَا اقْتَسَمَ الشُّرَكَاءُ الدُّورَ أَوْ غَيْرَهَا فَلَيْسَ لَهُمْ رُجُوعٌ وَلَا شُفْعَةٌ

٢٤٩٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ قَضَى النَّبِيُّ ﷺ بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ مَا لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتِ الحُدُودُ وَصُرِّفَتِ الطُّرُقُ فَلاَ شُفْعَةَ[٢].

## ٩- باسێک: ئەگەر هاوبەشەکان خانوو یان شتی تریان بەش کرد ئەوە پەشیمان بوونەوە و شوفعەیان بۆ نییە

**٢٤٩٦- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە هەمووماڵێکدا کە بەش نەکرابێت بڕیاری شوفعەی بۆ داوە، ئینجا ئەگەر سنوورەکان دانران و ڕێگاکان دیاریکران، ئیتر شوفعە نییە.**

## ١٠- بابُ الِاشْتِرَاكِ فِي الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ وَمَا يَكُونُ فِيهِ الصَّرْفُ

٢٤٩٧- ٢٤٩٨- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ عُثْمَانَ -يَعْنِي: ابْنَ الأَسْوَدِ قَالَ: أَخْبَرَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ أَبِي مُسْلِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا المِنْهَالِ عَنِ الصَّرْفِ يَدًا بِيَدٍ فَقَالَ: اشْتَرَيْتُ أَنَا وَشَرِيكٌ لِي شَيْئًا يَدًا بِيَدٍ وَنَسِيئَةً، فَجَاءَنَا البَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: فَعَلْتُ أَنَا وَشَرِيكِي زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ، وَسَأَلْنَا النَّبِيَّ ﷺ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: "مَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ فَخُذُوهُ، وَمَا كَانَ نَسِيئَةً فَذَرُوهُ".

---

(١) شوفعە: واتە یەکێک لە هاوبەشەکان بەشەکەی خۆی بفرۆشێ، ئینجا هاوبەشەکەی تری بڕوات شتەکە لە کڕیارەکە بسەنێتەوە بەو پارەی پێی کڕیوە، هەرچەند پێشی خۆش نەبێت.

(٢) بڕوانە: ٢٢١٣.

## ١٠- باسی هاوبەشی لە ئاڵتون و زیو و ئەو پارانەی بەیەكتری دەگۆڕدرێنەوە (دروستە)

٢٤٩٧- ٢٤٩٨- سولەیمانی كوڕی ئەبو موسلیم دەڵێ: دەربارەی پارە گۆڕینەوە ئەگەر دەست بەدەست بێت پرسیارم لە ئەبو مینهال كرد، ئەویش وتی: من و شەریكێكم شتێكمان كڕی كە دەست بەدەست بێت بەقەرز(١)، ئینجا بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ هات بۆ لامان و پرسیارمان لێ كرد، وتی: من و زەیدی كوڕی ئەرقەمی هاوبەشم ئەو مامەڵەیەمان كرد و پرسیارمان لە پێغەمبەر ﷺ كرد دەربارەی، فەرمووی: ((ئەوەی دەست بەدەست بوو وەریگرن (و بیكەن)، ئەوەشی قەرز بوو وازی لێ بێنن)).

## ١١- بابُ مُشَارَكَةِ الذِّمِّيِّ وَالمُشْرِكِينَ فِي المُزَارَعَةِ

٢٤٩٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ بْنُ أَسْمَاءَ عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: أَعْطَى رَسُولُ اللهِ ﷺ خَيْبَرَ اليَهُودَ أَنْ يَعْمَلُوهَا وَيَزْرَعُوهَا وَلَهُمْ شَطْرُ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا.

## ١١- باسی هاوبەشی مسوڵمان لەگەڵ گاور و جوولەكەی پەیمان لەگەڵكراو، وە هاوبەشی مسوڵمان لەگەڵ هاوبەشدانەران لەبەكرێدانی زەوی و زار بەبەشێك لە بەرهەمەكەی

٢٤٩٩- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زەوی خەیبەری دایە جوولەكەكان كە كاری تیا بكەن و بیكەنە كشتوكاڵ، جا نیوەی ئەوەی لێی پەیدا دەبێ و دەڕوێ بۆ ئەوان بێت.

---

(١) واتە: بەقەرز كڕیمان، وەك فەرمـوودەی ژمـارە (٣٩٣٩ - ٣٩٤٠) بوخاریـدا هـاتووە (بـاعَ شریـك لي دَراهـمَ في السوقِ نسیئة) بەڵام لەكاتی وەرگرتنیدا دەبێ نرخ و كاڵاكە دەست بەدەست بێت.

## ١٢- بابُ قِسْمَةِ الغَنَمِ وَالعَدْلِ فِيهَا

٢٥٠٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَعْطَاهُ غَنَمًا يَقْسِمُهَا عَلَى صَحَابَتِهِ ضَحَايَا، فَبَقِيَ عَتُودٌ، فَذَكَرَهُ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: "ضَحِّ بِهِ أَنْتَ"[١].

## ١٢- باسی بەشکردنی مەڕ و ماڵات و دادپەروەری تێیدا

**٢٥٠٠- عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ چەند سەر مەڕێکی پێدا کە دابەشی بکات بەسەر هاوەڵانیدا بیکەنە قوربانی، جا گیسکێك مایەوە و باسی کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: ((تۆ بۆ خۆت بیکە بەقوربانی)).**

## ١٣- بابُ الشَّرِكَةِ فِي الطَّعَامِ وَغَيْرِه

وَيُذْكَرُ أَنَّ رَجُلًا سَاوَمَ شَيْئًا فَغَمَزَهُ آخَرُ، فَرَأَى عُمَرُ أَنَّ لَهُ شَرِكَةً.

٢٥٠١- ٢٥٠٢- حَدَّثَنَا أَصْبَغُ بْنُ الفَرَجِ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدٌ عَنْ زُهْرَةَ بْنِ مَعْبَدٍ، عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ هِشَامٍ -وَكَانَ قَدْ أَدْرَكَ النَّبِيَّ ﷺ وَذَهَبَتْ بِهِ أُمُّهُ زَيْنَبُ بِنْتُ حُمَيْدٍ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، بَايِعْهُ. فَقَالَ: "هُوَ صَغِيرٌ". فَمَسَحَ رَأْسَهُ وَدَعَا لَهُ.

وَعَنْ زُهْرَةَ بْنِ مَعْبَدٍ أَنَّهُ كَانَ يَخْرُجُ بِهِ جَدُّهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ هِشَامٍ إِلَى السُّوقِ فَيَشْتَرِي الطَّعَامَ، فَيَلْقَاهُ ابْنُ عُمَرَ وَابْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ فَيَقُولَانِ لَهُ: أَشْرِكْنَا، فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ دَعَا لَكَ بِالبَرَكَةِ. فَيَشْرَكُهُمْ، فَرُبَّمَا أَصَابَ الرَّاحِلَةَ كَمَا هِيَ، فَيَبْعَثُ بِهَا إِلَى المَنْزِلِ[١].

---

(١) بڕوانە: ٢٣٠٠.

## ١٣- باسی هاوبەشی لەخۆراک و شتی تردا

دەگێڕنەوە کە پیاوێك سەودای شتێکی دەکرد، پیاوێکی تر ئاماژەیەکی بۆ کرد، عومەر ڕای وایە ئەو پیاوەی دووەم هاوبەشیەتی.

٢٥٠١- ٢٥٠٢- زوهرەی کوڕی مەعبەد لە باپیریەوە عەبدوڵلای کوڕی هیشام - کە بەخزمەتی پێغەمبەر ﷺ گەیشتووە (بەمنداڵی)-، وە دایکی کە زەینەبی کچی حومەیدە بردوویەتی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی لێ وەرگرە، ئەویش فەرموویەتی: (ئەو منداڵە) ئینجا دەستی هێناوە بەسەریدا و دوعای خێری بۆ کردووە.

وە زوهرەی کوڕی مەعبەد دەگێڕێتەوە کە باپیرەی عەبدوڵلای کوڕی هیشام لە ماڵەوە دەیبردە دەرەوە بۆ بازاڕ و خۆراکی دەکڕی، وە ئیبنو عومەر و ئیبنو زوبەیر رضي الله عنهم پێی دەگەیشتن، هەردووکیان پێیان دەوت: بمانکە بەهاوبەشی خۆت، چونکە بێگومان پێغەمبەر ﷺ دوعای فەڕ و بەرەکەتی بۆ کردوویت، ئەویش دەیکردن بەهاوبەشی خۆی، جاری وا هەبوو وشترێ باربەری قازانج دەکرد، ئەوسا وشترە باربەرەکەی دەناردەوە بۆ ماڵەوە.

## ١٤- بابُ الشَّرِكَةِ فِي الرَّقِيقِ

٢٥٠٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ بْنُ أَسْمَاءَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي مَمْلُوكٍ وَجَبَ عَلَيْهِ أَنْ يُعْتِقَ كُلَّهُ، إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ قَدْرَ ثَمَنِهِ يُقَامُ قِيمَةَ عَدْلٍ وَيُعْطَى شُرَكَاؤُهُ حِصَّتَهُمْ وَيُخَلَّى سَبِيلُ الْمُعْتَقِ"[٢].

---

(١) بڕوانە: ٧٢٠١، ٦٣٥٣.

(٢) بڕوانە: ٢٤٩١.

## ١٤- باسی هاوبەشی لەکۆیلەدا

**٢٥٠٣- ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەرکەس بەشێك لە کۆیلەیەك ئازاد بکات، پێویستە لەسەری کۆیلەکە هەمووی ئازاد بکات، ئەگەر بە ئەندازەی نرخی کۆیلەکە پارەی هەبوو بەنرخی ڕاستی خۆی دەخەملێنرێت و (نرخی) بەشی هاوبەشەکانی دەدرێت و کۆیلەکەش ئازاد دەکرێت)).**

٢٥٠٤- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ عَنْ بَشِيرِ بْنِ نَهِيكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مَنْ أَعْتَقَ شِقْصًا لَهُ فِي عَبْدٍ أُعْتِقَ كُلُّهُ، إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ، وَإِلَّا يُسْتَسْعَ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ"[1].

**٢٥٠٤- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەرکەس بەشێك کە هەیەتی لە کۆیلەیەکدا ئازادی کرد، ئەوە کۆیلەکە هەمووی ئازاد دەبێ، ئەگەر (ئازادکارەکە) ماڵ و سامانی هەبوو (هەمووی ئازاد بکات)، ئەگەر نەیبوو داوا لە کۆیلەکە دەکرێت کارو کەسابەت بکات (بۆ ئازادکردنی خۆی) بەبێ زەخت و زۆر لێ کردنی[2])).**

## ١٥- بابُ الِاشْتِرَاكِ فِي الهَدْيِ وَالبُدْنِ، وَإِذَا أَشْرَكَ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِي هَدْيِهِ بَعْدَ مَا أَهْدَى

٢٥٠٥- ٢٥٠٦- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ المَلِكِ بْنُ جُرَيْجٍ عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ.

وَعَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ صُبْحَ رَابِعَةٍ مِنْ ذِي الحَجَّةِ مُهِلِّينَ بِالحَجِّ، لَا يَخْلِطُهُمْ شَيْءٌ، فَلَمَّا قَدِمْنَا أَمَرَنَا فَجَعَلْنَاهَا عُمْرَةً، وَأَنْ نَحِلَّ إِلَى

---

(١) بڕوانە: ٢٤٩٢.

(٢) لەکار و کەسابەتەکەیدا بەپێی توانای داوای کار و کەسابەتی لێ بکرێ.

نِسَائِنَا، فَفَشَتْ فِي ذَلِكَ القَالَةُ. قَالَ عَطَاءٌ فَقَالَ جَابِرٌ فَيَرُوحُ أَحَدُنَا إِلَى مِنًى وَذَكَرُهُ يَقْطُرُ مَنِيًّا. فَقَالَ جَابِرٌ بِكَفِّهِ، فَبَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَامَ خَطِيبًا فَقَالَ: "بَلَغَنِي أَنَّ أَقْوَامًا يَقُولُونَ كَذَا وَكَذَا، وَاللهِ لأَنَا أَبَرُّ وَأَتْقَى للهِ مِنْهُمْ، وَلَوْ أَنِّي اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ، وَلَوْلاَ أَنَّ مَعِي الهَدْيَ لأَحْلَلْتُ". فَقَامَ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هِيَ لَنَا أَوْ لِلأَبَدِ فَقَالَ: "لَا بَلْ لِلأَبَدِ". قَالَ وَجَاءَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ -فَقَالَ أَحَدُهُمَا يَقُولُ لَبَّيْكَ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ. وَقَالَ: وَقَالَ الآخَرُ لَبَّيْكَ بِحَجَّةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُقِيمَ عَلَى إِحْرَامِهِ، وَأَشْرَكَهُ فِي الهَدْيِ[١].

## ١٥- باسی هاوبەشی لە ئاژەڵ و وشتری هەدی دا، وە ئەگەر پیاوێک پیاوێکی کرد بەهاوبەشی خۆی لەئاژەڵی هەدیدا دوای ئەوەی ئاژەڵی هەدی هێناوە

**٢٥٠٥- ٢٥٠٦- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس[٢] ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەیانی ڕۆژی چوارەمی زولحیجە هاتنە مەککە، ئیحرامیان بەحەج بەستبوو، هیچی تریان لەگەڵ تێکەڵ نەکردبوو، جا کە گەیشتینە (مەککە) فەرمانی پێکردین (ئیحرامەکەمان) کرد بەعومرە، ئازاد بووین کە بچینە لای خێزانەکانمان. جا لەو بارەیە قسە و باسێك[٣] بڵاوبوویەوە، عەتا دەڵێ: جابیر ﷺ وتی: ئینجا یەکێکمان دەڕوا بۆ مینا و چووکی ئاوی لێ دەچۆڕێ[٤]، - جا جابیر بەدەستی ئاماژەی بۆ ئاوەچۆڕی چووکی کرد- ئەمە گەیشتەوە بەپێغەمبەر ﷺ هەستا و وتاری دا و فەرمووی: ((پێمگەیشتووە کە کەسانێك واو**

---

(١) بڕوانە: ١٠٨٥، ١٥٥٧.

(٢) ئەم فەرموودەیە دوو ڕشتەو سەنەدی هەیە، یەکەمیان لە جابیرەوە، دووەمیان لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ.

(٣) کە گوایە عومرەکە دروست نییە لە مانگەکانی حەجکردندا.

(٤) لەبەر کورتی نێوان جووتبوونیان و ئیحرام بەستن و ڕۆیشتنیان بۆ مینا.

وا دەڵێن، سوێند بەخوا من لەهەموویان چاکەکارتر و زیاتر لەخوا دەترسم، ئەگەر ئەوەی لەکاری من ڕابورد ئێستا بووایە ئاژەڵی هەدیم نەدەهێنا، وە لەبەر ئەوە نەبووایە من ئاژەڵی هەدیم پێیە ئیحرامم دەشکاند))، جا سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشون هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە هەر بۆ ئێمەیە یان هەتا هەتایە؟ فەرمووی: ((نەخێر، هەر بۆ ئێوە نییە بەڵکو بۆ هەتا هەتایە))، جابیر دەڵێ: عەلی کوڕی ئەبوتالیب هات، یەکێکیان وتی: دەڵێ[1]: ئیحرامم بەست بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامی پێ بەست، وە جابیر وتی: ئەوی دیکەشیان[2] وتی: ئیحرامم بەست بەئیحرامی حەجەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد (بەعەلی) لەسەر ئیحرامەکەی بەردەوام بێت، وە کردیە هاوبەش لەئاژەڵی هەدیەکاندا.

## ١٦- بابُ مَنْ عَدَلَ عَشْرًا مِنَ الغَنَمِ بِجَزُورٍ فِي القِسْمَةِ

٢٥٠٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رِفَاعَةَ، عَنْ جَدِّهِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِذِي الحُلَيْفَةِ مِنْ تِهَامَةَ، فَأَصَبْنَا غَنَمًا وَإِبِلًا، فَعَجِلَ القَوْمُ، فَأَغْلَوْا بِهَا القُدُورَ، فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَمَرَ بِهَا فَأُكْفِئَتْ، ثُمَّ عَدَلَ عَشْرًا مِنَ الغَنَمِ بِجَزُورٍ، ثُمَّ إِنَّ بَعِيرًا نَدَّ وَلَيْسَ فِي القَوْمِ إِلَّا خَيْلٌ يَسِيرَةٌ، فَرَمَاهُ رَجُلٌ فَحَبَسَهُ بِسَهْمٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "إِنَّ لِهَذِهِ البَهَائِمِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الوَحْشِ، فَمَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا". قَالَ: قَالَ جَدِّي: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّا نَرْجُو -أَوْ نَخَافُ- أَنْ نَلْقَى العَدُوَّ غَدًا وَلَيْسَ مَعَنَا مُدًى، فَنَذْبَحُ بِالقَصَبِ؟ فَقَالَ: "اعْجَلْ -أَوْ أَرْنِي-، مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ فَكُلُوا، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ، وَسَأُحَدِّثُكُمْ عَنْ ذَلِكَ، أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الحَبَشَةِ"[3].

---

(١) کە عەلییە.

(٢) کە ئیبن عەبباسە.

(٣) بڕوانە: ٢٤٨٨.

## ١٦- باسی ئەوەی دە سەر مەڕی لەدابەشکردندا بە وشترێک داناوە

٢٥٠٧- عەبایەی کوڕی ریفاعە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە ڕافیعی کوڕی خەدیجە دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین لە زولحولەیفەدا لە تیهامە، ئینجا چەند سەر وشتر و مەڕمان دەستکەوت، جا خەڵکەکە پەلەیان کرد و (سەریان بڕین)، مەنجەڵەکانیان خستە سەر (ئاگر) و کوڵاندیان، جا پێغەمبەری خواش ﷺ هات و فەرمانی کرد (کە مەنجەڵەکان قڵپ بکرێنەوە)، ئەوسا مەنجەڵەکان قڵپ کرانەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ (وشتر و مەڕەکانی دابەشکرد)، هەر دە سەر مەڕی لەبەرانبەری وشترێك دانا، پاشان وشترێك لەو وشترانە یاخی بوو، وە لەناو خەڵکەکەدا چەند ئەسپ سوارێکی کەم هەبوو، ئینجا پیاوێك تیرێکی بۆ هاویشت و بەتیرەکە جوڵەی لێ بڕی (کوشتی)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەم ئاژەڵانە یاخی بوونێکیان هەیە وەك یاخی بوونی ئاژەڵی کێوی، جا هەر کامێکیان لەدەستتان دەرچوو (بۆتان نەگیرا)، ئاوای لێ بکەن))، عەبایە دەڵێ: باپیرەم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە سبەینێ بەتەمای دەستکەوتین لە دوژمنەوە -یان دەترسین- کە بە دوژمن دەگەین، وە چەقۆشمان پێ نییە، ئایا بە قامیش (ئاژەڵ) سەرببڕین[١]؟ فەرمووی: ((بەپەلە -خێرا- سەری ببڕە، هەر شتێك خوێنی لێ بهێنێت و ناوی خوای لەسەر هێنرا بێ ئێوە بیخۆن، بەڵام ددان و نینۆك نابێت، لەوبارەشەوە قسەتان بۆ دەکەم: سەبارەت بەددان ئەوە ئێسکە، وە سەبارەت بەنینۆك ئەوە چەقۆی خەڵکی حەبەشەیە)).

(١) بۆیە شمشێرەکانیان بەکار ناهێنن بۆ سەربڕین، بۆ ئەوەی کول نەبێت بۆ جەنگ کردن.

# ٤٨- كِتَابُ الرَّهْنِ(١)

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٤٨- پەڕاوی ڕەهن

## ١ - بابٌ: فِي الرَّهْنِ فِي الحَضَرِ

وقول الله تعالى: ﴿ وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ ﴿٢٨٣﴾ ﴾ البقرة.

٢٥٠٨- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: وَلَقَدْ رَهَنَ النَّبِيُّ ﷺ دِرْعَهُ بِشَعِيرٍ، وَمَشَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِخُبْزِ شَعِيرٍ وَإِهَالَةٍ سَنِخَةٍ، وَلَقَدْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: "مَا أَصْبَحَ لآلِ مُحَمَّدٍ ﷺ إِلَّا صَاعٌ، وَلَا أَمْسَى". وَإِنَّهُمْ لَتِسْعَةُ أَبْيَاتٍ(٢).

## ١- باسێك: دەربارەی ڕەهن كردن لەشاردا

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەگەر لەسەر سەفەر بوون و نووسەرێكتان دەست نەكەوت، ئەوە ڕەهنێك وەرگرن).**

**٢٥٠٨- ئەنەس ﷺ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەر ﷺ زرێكەی خستبوویە ڕەهنەوە لەبری قەرزی برێك جۆدا، ئەنەس دەڵێ: من ڕۆیشتم نانی جۆم برد بۆ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ڕۆنی بۆن كردوودا، وەڵڵاهی بێگومان گوێم لێ بوو**

(١) الرّهن: ڕەهن شتێكە - نرخی هەبێت- قەرزار لە بارمتەی قەرزەكەیدا لای ئەو كەسەی قەرزەكەی پێداوە دایدەنێت، ئەگەر لە كاتی دیاریكراو بۆ دانەوەی قەرزەكە قەرزەكەی نەدایەوە دەفرۆشرێت و قەرزەكەی لێ دەدرێتەوە.

(٢) بڕوانە: ٢٠٦٩.

**دەیفەرموو ﷺ: ((هیچ کات بەیانی نەبۆتەوە و شەو دانەهاتووە هاوسەرانی موحەممەد ﷺ لە یەك مەن (جۆ) زیاتریان هەبێ، وە بێگومان هاوسەرانی نۆ ماڵ بوون)).**

## ٢- بابُ مَنْ رَهَنَ دِرْعَهُ

٢٥٠٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ تَذَاكَرْنَا عِنْدَ إِبْرَاهِيمَ الرَّهْنَ، وَالقَبِيلَ فِي السَّلَفِ، فَقَالَ إِبْرَاهِيمُ حَدَّثَنَا الأَسْوَدُ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اشْتَرَى مِنْ يَهُودِيٍّ طَعَامًا إِلَى أَجَلٍ، وَرَهَنَهُ دِرْعَهُ[(١)].

## ٢- باسی ئەوەی زرێکەی بەبارمتە دانابوو

**٢٥٠٩- عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خۆراکی لە جوولەکەیەك کڕیبوو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، وە زرێکەی وەك بارمتە لای دانابوو.**

## ٣- بابُ رَهْنِ السِّلَاحِ

٢٥١٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ عَمْرٌو: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مَنْ لِكَعْبِ بْنِ الأَشْرَفِ؟ فَإِنَّهُ آذَى اللهَ وَرَسُولَهُ ﷺ". فَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ: أَنَا. فَأَتَاهُ فَقَالَ: أَرَدْنَا أَنْ تُسْلِفَنَا وَسْقًا أَوْ وَسْقَيْنِ. فَقَالَ ارْهَنُونِي نِسَاءَكُمْ. قَالُوا: كَيْفَ نَرْهَنُكَ نِسَاءَنَا، وَأَنْتَ أَجْمَلُ العَرَبِ؟ قَالَ: فَارْهَنُونِي أَبْنَاءَكُمْ. قَالُوا كَيْفَ نَرْهَنُ أَبْنَاءَنَا فَيُسَبُّ أَحَدُهُمْ، فَيُقَالُ: رُهِنَ بِوَسْقٍ أَوْ وَسْقَيْنِ؟ هَذَا عَارٌ عَلَيْنَا وَلَكِنَّا نَرْهَنُكَ اللَّأْمَةَ -قَالَ سُفْيَانُ يَعْنِي: السِّلَاحَ- فَوَعَدَهُ أَنْ يَأْتِيَهُ، فَقَتَلُوهُ، ثُمَّ أَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرُوهُ.

---

(١) بڕوانە: ٢٠٦٨.

## ٣- باسی چەک دانان لەبارمتەدا

٢٥١٠- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کێ کەعبی کوڕی ئەشرەفم لەکۆڵدەکاتەوە[١]؟ چونکە بەڕاستی ئازاری خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ داوە))، موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ﷺ وتی: من، ئینجا ڕۆیشت بۆ لای کەعب وتی: دەمانەوێت وەسقێك یان دوو وەسق (خۆراك)مان بەقەرز پێ بدەی، کەعبیش وتی: ئافرەتەکانتانم بەبارمتە لا دانێن، وتیان: چۆن دەبێ ئافرەتەکانمان بەبارمتە دانێین، لە کاتێکدا تۆ جوانترین کەسی عەرەبیت؟ وتی: منداڵەکانتانم بەبارمتە لا دانێن، وتیان: چۆن منداڵەکانمانت بە بارمتە لا دانێین، ئینجا جنێو بدرێت بە یەکێکیان، جا بوترێت لە بارمتەی وەسقێك یان دوو وەسقدا دانراوە، ئەمە عەیب شورەییە بۆمان، بەڵام چەکت بە بارمتە لا دادەنێین، -سوفیان دەڵێ: (اللَّأْمَةَ) واتە: چەك و سیلاح- جا (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) بەڵێنی پێ دا کە بێتەوە بۆ لای کەعب، ئینجا (موحەممەد و چەند کەسێك بەشەو هاتنەوە بۆ لای و) کەعبیان کوشت، پاشان هاتنەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەیان پێدا.

## ٤ - بابٌ: الرَّهْنُ مَرْكُوبٌ وَمَحْلُوبٌ

وَقَالَ مُغِيرَةُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ: تُرْكَبُ الضَّالَّةُ وَتُحْلَبُ بِقَدْرِ عَلَفِهَا، وَالرَّهْنُ مِثْلُهُ.

٢٥١١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ، عَنْ عَامِرٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: "الرَّهْنُ يُرْكَبُ بِنَفَقَتِهِ، وَيُشْرَبُ لَبَنُ الدَّرِّ إِذَا كَانَ مَرْهُونًا"[٢].

---

(١) دەیکوژێت و لەناوی دەبات(إرشاد الساري:٥/٥٢٤).

(٢) بڕوانە: ٢٥١٢.

## ٤- باسێک: (ئاژەڵی) بارمته سواربوون و دۆشینی (دروسته)

**موغیره له ئیبراهیمەوه دەگێڕێتەوه و دەڵێ: ئاژەڵی ونبوو سواری دەبن و شیری دەدۆشرێت به ئەندازەی ئالیك پێدانی، ئاژەڵی بارمتەش بەهەمان شێوەیه.**

**٢٥١١- ئەبو هورەیره ﷺ له پێغەمبەرەوه ﷺ دەگێڕێتەوه که ئەو فەرموویەتی: ((وڵاخی بارمته بۆ سواری بەکاردەهێنرێت لەبری بەخێوکردنی، وه شیری گوانی ئاژەڵی بارمته دەخورێتەوه (بەهۆی بەخێوکردنی) ئەگەر بارمته بوو)).**

٢٥١٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا زَكَرِيَّاءُ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ. "الرَّهْنُ يُرْكَبُ بِنَفَقَتِهِ إِذَا كَانَ مَرْهُونًا، وَلَبَنُ الدَّرِّ يُشْرَبُ بِنَفَقَتِهِ إِذَا كَانَ مَرْهُونًا، وَعَلَى الذِي يَرْكَبُ وَيَشْرَبُ النَّفَقَةُ"(١).

**٢٥١٢- ئەبو هورەیره ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((وڵاخی بارمته بۆ سواری بەکاردەهێنرێت بەهۆی بەخێوکردنی ئەگەر بارمته بوو، وه شیری گوانی ئاژەڵی بارمته دەخورێتەوه لەبری بەخێوکردنی ئەگەر بارمته بوو، وه بەخێوکردنی لەسەر ئەو کەسەیه سواری دەبێت و شیرەکەی دەخواتەوه)).**

## ٥- بابُ الرَّهْنِ عِنْدَ اليَهُودِ وَغَيْرِهِمْ

٢٥١٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتِ اشْتَرَى رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ يَهُودِيٍّ طَعَامًا وَرَهَنَهُ دِرْعَهُ(٢).

---

(١) بڕوانه: ٢٥١١.

(٢) بڕوانه: ٢٠٦٨.

## ٥- باسی ڕەهن دانان لای جوولەکە و خەڵکی تر

٢٥١٣- عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەندێك خۆراکی لە جوولەکەیەك بە قەرزی ماوەیەك کڕی و زرێ ئاسنینەکەی بەبارمتە لا دانا.

## ٦ – بابٌ: إِذَا اخْتَلَفَ الرَّاهِنُ وَالمُرْتَهِنُ وَنَحْوُهُ، فَالبَيِّنَةُ عَلَى المُدَّعِي، وَاليَمِينُ عَلَى المُدَّعَى عَلَيْهِ

٢٥١٤- حَدَّثَنَا خَلَّادُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا نَافِعُ بْنُ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: كَتَبْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، فَكَتَبَ إِلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى أَنَّ اليَمِينَ عَلَى المُدَّعَى عَلَيْهِ[1].

## ٦- باسێک: ئەگەر بارمتە دانەر و بارمتە وەرگرناکۆک بوون و هاوشێوەی ئەمە، جا لەسەر داواکارە شایەتی هەبێ و داوالێکراویش سوێندخواردنی لەسەرە

٢٥١٤- ئیبنو ئەبو مولەیکە دەڵێ: نامەیەکم نووسی بۆ ئیبنو عەبباس ﵄، ئەویش لە وەڵامدا بۆی نووسیم: بێگومان پێغەمبەر ﷺ بڕیاری دا کە سوێند خواردن لەسەر داوالێکراوە.

٢٥١٥- ٢٥١٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ ﵁: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ يَسْتَحِقُّ بِهَا مَالًا وَهْوَ فِيهَا فَاجِرٌ، لَقِيَ اللهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ فَأَنْزَلَ اللهُ تَصْدِيقَ ذَلِكَ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾ فقرأ الى ﴿ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٧﴾ ﴾ آل عمران. ثُمَّ إِنَّ الأَشْعَثَ بْنَ قَيْسٍ خَرَجَ إِلَيْنَا فَقَالَ مَا

---

(١) بڕوانه: ٢٦٦٨، ٤٥٥٢.

يُحَدِّثُكُمْ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ؟ قَالَ: فَحَدَّثْنَاهُ قَالَ: فَقَالَ: صَدَقَ، لَفِيَّ وَاللهِ أُنْزِلَتْ، كَانَتْ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ خُصُومَةٌ فِي بِئْرٍ، فَاخْتَصَمْنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "شَاهِدُكَ أَوْ يَمِينُهُ". قُلْتُ: إِنَّهُ إِذًا يَحْلِفُ وَلَا يُبَالِي. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ يَسْتَحِقُّ بِهَا مَالًا هُوَ فِيهَا فَاجِرٌ، لَقِيَ اللهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ". فَأَنْزَلَ اللهُ تَصْدِيقَ ذَلِكَ، ثُمَّ اقْتَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَـٰٓئِكَ لَا خَلَـٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٧﴾ ﴾ آل عمران.

**٢٥١٥- ٢٥١٦- ئەبو وائیل دەڵێ: عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعود) ﷺ وتی: هەرکەسێك سوێندێك بخوات ماڵێکی پێ بکات بەهی خۆی، لەو سوێند خواردنەشیدا درۆ بکات، کاتێك دەگاتە خزمەتی خوای گەورە زۆر لێی توڕەیە، جا خوا ڕاستی ئەمەی دابەزاند: (بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا و سوێندەکانیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن، ئەوانە بێ بەشن (لەبەهرەی خوا) لەڕۆژی دواییدا، وە خوا لەڕۆژی قیامەتدا قسەیان لەگەڵ ناکات و تەماشایان ناکات، وە لەگوناهیان خۆش نابێت، وە سزای بەئازاریان بۆ هەیە)، پاشان ئەشعەسی کوڕی قەیس هاتە دەر بۆ لامان و وتی: ئەبو عەبدوڕەحمان[1] چیتان بۆ باس دەکات؟ ئەبو وائیل وتی: ئێمەش قسەی عەبدوڵڵامان بۆ باس کرد، ئەشعەس وتی: ڕاست دەکات، ئەو ئایەتە دەربارەی من دابەزی سوێند بەخوا، لە نێوان من و پیاوێکدا ناکۆکی هەبوو لەسەر بیرێك کێشەکەمان بردە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دوو شایەتی تۆ یان سوێند خواردنی ئەو))، وتم: بێگومان ئەو سوێند دەخوات باکی نییە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس سوێند بخوات ماڵێکی پێ بکات**

(١) مەبەست پێی عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودە ﷺ.

بەهی خۆی، لەو سوێند خواردنەشیدا درۆ بکات، کاتێك دەگاتە خزمەتی خوای گەورە ئەوە خودا زۆر لێی توڕەیە))، جا خواش ڕاستی ئەمەی دابەزاند: (بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا و سوێندەکانیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن، ئەوانە بێ بەشن (لەبەهرەی خوا) لەڕۆژی دواییدا، وە خوا لە ڕۆژی قیامەتدا قسەیان لەگەڵ ناکات و تەماشایان ناکات، وە لەگوناهیان خۆش نابێت، وە سزایی بەئازاریان بۆ هەیە).

# ٤٩- كِتَابُ الْعِتْقِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٤٩- پەڕاوی ئازادکردنی کۆیلە

## ١- بابٌ: فِي العِتْقِ وَفَضْلِه

وَقَوْلِهِ تعالى: ﴿ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴿١٥﴾ ﴾ البلد.

## ١- باسێک: دەربارەی گەورەیی ئازادکردنی کۆیلە

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئازادکردنی کۆیلەیە و نان دانە لەڕۆژی گرانی و برسێتیدا بەهەتیوی خزم).**

٢٥١٧- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُس، حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي وَاقِدُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي سَعِيدٌ ابْنُ مَرْجَانَةَ صَاحِبُ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ قَالَ: قال لِي أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "أَيُّمَا رَجُلٍ أَعْتَقَ امْرَأً مُسْلِمًا اسْتَنْقَذَ اللهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنْهُ مِنَ النَّارِ". قَالَ سَعِيدُ ابْنُ مَرْجَانَةَ فَانْطَلَقْتُ بِهِ إِلَي عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، فَعَمَدَ عَلِيُّ بْنُ حُسَيْنٍ ﷺ إِلَى عَبْدٍ لَهُ قَدْ أَعْطَاهُ بِهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ عَشَرَةَ آلَافِ دِرْهَمٍ -أَوْ أَلْفَ دِينَارٍ- فَأَعْتَقَهُ[١].

**٢٥١٧- سەعیدی کوڕی مەرجانە کە هاوڕێی عەلی کوڕی حوسەینە دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ پێی وتم: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر پیاوێك کۆیلەیەکی**

(١) بروانە: ٦٧١٥.

مسوڵمان ئازاد بکات، خوا بەهەر ئەندامێکی ئەو کۆیلە ئەندامێکی ئازادکارەکە لە ئاگری دۆزەخ ئازاد دەکات))، سەعیدی کوڕی مەرجانە دەڵێ: منیش بەم فەرموودەیەوە ڕۆیشتم بۆ لای عەلی کوڕی حوسەین ﷺ، جا عەلی کوڕی حوسەینیش ڕۆیشت بۆ لای بەندەیەکی کە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر دە هەزار درهەم - یان هەزار دیناری پێدابوو - ئازادی کرد.

## ٢- بابٌ: أيُّ الرِّقاب أفْضَلُ؟

٢٥١٨- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي مُرَاوِحٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ: أَيُّ العَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: "إِيمَانٌ بِاللهِ، وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ". قُلْتُ فَأَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: "أَغْلاَهَا ثَمَنًا، وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا". قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَلْ؟ قَالَ: "تُعِينُ صَانِعًا أَوْ تَصْنَعُ لأَخْرَقَ". قَالَ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَلْ؟ قَالَ: "تَدَعُ النَّاسَ مِنَ الشَّرِّ، فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ تَصَدَّقُ بِهَا عَلَى نَفْسِكَ".

## ٢- باسێک: کام کۆیلە پاداشتی زیاترە (ئازاد بکرێت)؟

**٢٥١٨- ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد کام کردەوەیە چاکترینە؟ فەرمووی: ((باوەڕبوون بە خوا و خەباتکردن لە ڕێی خوادا))، وتم: کام کۆیلە (ئازادکردنی) چاکترینە؟ فەرمووی: ((ئەوەیان نرخی گرانتر بێت و لای خاوەنەکەی چاك و نایاب بێت))، وتم: ئەگەر نەمتوانی بیکەم؟ فەرمووی: ((یارمەتی پیشەزانێك بدە یان شتێك دروست بکە بۆ کەسێك سەرکوێرە [1]))، وتم: ئەی ئەگەر ئەویشم نەکرد و نەمتوانی، فەرمووی: ((واز لەخراپە بێنە بەرانبەر بەخەڵکی، ئەوە بێگومان خێرو چاکەیەکە بەرانبەر بەخۆت دەیکەیت)).**

(١) هیچ نازانێت.

## ٣- بابُ مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ العَتَاقَةِ فِي الكُسُوفِ وَالآيَاتِ

٢٥١٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ مَسْعُودٍ، حَدَّثَنَا زَائِدَةُ بْنُ قُدَامَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ المُنْذِرِ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄ قَالَتْ: أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِالعَتَاقَةِ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ. تَابَعَهُ عَلِيٌّ، عَنِ الدَّرَاوَرْدِيِّ عَنْ هِشَامٍ(١).

## ٣- باسی ئەوەی سوننەتە لەئازادکردنی کۆیلە لەکاتی خۆرگیران و نیشانەکانی لەو جۆرە(٢)

**٢٥١٩- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەکاتی خۆرگیراندا فەرمانی کرد بەئازادکردنی کۆیلە. عەلی لەدەراوەردیەوە لەهیشامەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوەو پاڵپشتی گێڕانەوەکەی مووسای کوڕی مەسعودی کردووە.**

٢٥٢٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، حَدَّثَنَا عَثَّامٌ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ المُنْذِرِ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄ قَالَتْ: كُنَّا نُؤْمَرُ عِنْدَ الخُسُوفِ بِالعَتَاقَةِ(٣).

**٢٥٢٠- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەڵێ: ئێمە لەکاتی مانگگیراندا فەرمانمان پێدەکرا بەئازادکردنی کۆیلە.**

## ٤ - بابٌ: إِذَا أَعْتَقَ عَبْدًا بَيْنَ اثْنَيْنِ أَوْ أَمَةً بَيْنَ الشُّرَكَاءِ

٢٥٢١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ سَالِمٍ عَنْ أَبِيهِ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مَنْ أَعْتَقَ عَبْدًا بَيْنَ اثْنَيْنِ، فَإِنْ كَانَ مُوسِرًا قُوِّمَ عَلَيْهِ، ثُمَّ يُعْتَقُ".

---

(١) بروانە: ٨٦.

(٢) وەک مانگ گیران و تاریکی زۆر و شتی لەو جۆرە.

(٣) بروانە: ٨٦.

# ٤- باسێک: ئەگەر کەسێک کۆیلەیەک ئازاد بکات کە هاوبەشە لە نێوان دوو کەسدا یان کەنیزەکێک ئازاد بکات کە هاوبەشە لە نێوان چەند کەسێکدا

**٢٥٢١- سالیم دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵڵای باوکیەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((هەرکەس کۆیلەیەك ئازاد بکات کە هاوبەشە لە نێوان دوو کەسدا، جا ئەگەر دەوڵەمەند بوو بەنرخەکەی لەسەری دادەنرێ[1] بە شێوەیەکی دادگەرانە، پاشان ئازاد دەبێت)).**

٢٥٢٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ، فَكَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ العَبْدِ، قُوِّمَ العَبْدُ قِيمَةَ عَدْلٍ، فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ وَعَتَقَ عَلَيْهِ، وَإِلاَّ فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ".

**٢٥٢٢- ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەرکەس بەشی خۆی لە کۆیلەیەك ئازاد بکات، وە ئەوەندەی پارە هەبوو بگاتە نرخی کۆیلەکە، کۆیلەکە دەقەبلێنرێت بەشێوەیەکی دادگەرانە و (نرخی) بەشی هاوبەشەکانی دەدات و کۆیلەکە ئازاد دەبێت لەسەر دەستی ئەو، ئەگەر نەیبوو ئەوە بێگومان ئەوەندەی ئازاد دەبێت کە ئازادی کردووە)).**

٢٥٢٣- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ أَبِي أُسَامَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي مَمْلُوكٍ فَعَلَيْهِ عِتْقُهُ كُلِّهِ، إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَهُ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مالٌ يُقَوَّمُ عَلَيْهِ قِيمَةَ عَدْلٍ، فَأُعْتِقَ مِنْهُ مَا أَعْتَقَ"[2].

---

(١) پارەی هاوبەشەکەی دەدات و پاشان ئازادی دەکات.

(٢) بڕوانە: ٢٤٩١.

حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا بِشْرٌ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ. اخْتَصَرَهُ.

**٢٥٢٣- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس بەشی خۆی لەکۆیلەیەك ئازاد بکات، ئەوە لەسەریەتی هەمووی ئازاد بکات، ئەگەر ئەوەندەی پارە هەبوو بگاتە نرخی کۆیلەکە، ئەگەر ئەوەندە پارەی نەبوو کە بەشەکەی تری پێ بقەبلێنرێ بە شێوەیەکی دادگەرانە، ئەوە ئەوەندەی لێی ئازادکراوە ئازاد دەبێت)).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) موسەددەد بۆی گێڕاینەوەو وتی: بیشر بۆی گێڕانەوە لە عەبدوڵلاوە، ئینجا فەرموودەکەی پێشووی گێڕایەوە بەکورتی.**

٢٥٢٤- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مَنْ أَعْتَقَ نَصِيبًا لَهُ فِي مَمْلُوكٍ -أَوْ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ- وَكَانَ لَهُ مِنَ المَالِ مَا يَبْلُغُ قِيمَتَهُ بِقِيمَةِ العَدْلِ، فَهُوَ عَتِيقٌ". قَالَ نَافِعٌ: "وَإِلَّا فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ". قَالَ أَيُّوبُ: لَا أَدْرِي أَشَيْءٌ قَالَهُ نَافِعٌ، أَوْ شَيْءٌ فِي الحَدِيثِ[1].

**٢٥٢٤- ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەرکەس بەشی خۆی لەکۆیلەیەك - یان بەشە هاوبەشەکەی ئەو لەکۆیلەیەکدا- ئازاد بکات، وە ئەوەندەی پارە هەبوو بگاتە نرخی کۆیلەکە بێ زیاد و کەم، ئەوە بێگومان کۆیلەکە ئازادبووە)). نافیع دەڵێ: ((ئەگەر نەیبوو، ئەوە بێگومان ئەوەندەی ئازاد دەبێ کە ئازادی کردووە)). ئەیوب دەڵێ: نازانم ئەم بڕگەیە: (ئەوەندەی ئازادکراوە ئازاد دەبێت) نافیع خۆی وتویەتی، یان بەشێکە لە فەرموودەکە (ی پێغەمبەر ﷺو گێڕدراوەتەوە)[2].**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٩١.

(٢) کە بڕگەی کۆتایی فەرموودەکەیە:(ئەگەر نەیبوو ئەوە بێگومان ئەوەندەی ئازاد دەبێت کە ئازادی کردووە).

٢٥٢٥- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مِقْدَامٍ، حَدَّثَنَا الفُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، أَخْبَرَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُفْتِي فِي العَبْدِ أَوِ الأَمَةِ يَكُونُ بَيْنَ شُرَكَاءَ، فَيُعْتِقُ أَحَدُهُمْ نَصِيبَهُ مِنْهُ، يَقُولُ: قَدْ وَجَبَ عَلَيْهِ عِتْقُهُ كُلِّهِ، إِذَا كَانَ لِلَّذِي أَعْتَقَ مِنَ المَالِ مَا يَبْلُغُ، يُقَوَّمُ مِنْ مَالِهِ قِيمَةَ العَدْلِ، وَيُدْفَعُ إِلَى الشُّرَكَاءِ أَنْصِبَاؤُهُمْ، وَيُخَلَّى سَبِيلُ المُعْتَقِ. يُخْبِرُ ذَلِكَ ابْنُ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَرَوَاهُ اللَّيْثُ وَابْنُ أَبِي ذِئْبٍ وَابْنُ إِسْحَاقَ وَجُوَيْرِيَةُ وَيَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ أُمَيَّةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. مُخْتَصَرًا[١].

**٢٥٢٥- نافیع دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ کە ئیبنو عومەر فەتوای دەدا دەربارەی کۆیلە یان کەنیزەك کە هاوبەش بێت لە نێوان چەند کەسێکدا، جا یەکێکیان بەشەکەی خۆی ئازاد بکات لەو کۆیلە یان کەنیزەکە، ئەوە لەسەریەتی هەمووی ئازاد کات، ئەگەر ئەو کەسەی کە ئازادی کردووە ئەوەندە سامانی هەبێت بگاتە نرخی ئازادکردنەکە، کۆیلەکە دەقەبلێنرێت لەماڵەکەی بەنرخێکی دادگەرانە، وە بەشی هاوبەشەکان دەدرێت لەنرخەکەی، جا کۆیلە ئازادکراوەکە ئازاد دەکرێ، عەبدوڵلای کوڕی عومەر ئەمەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕایەوە، هەروەها ئەم فەرموودە هەر یەك لە لەیس، ئیبنو ئەبی زیئب، ئیبنو ئیسحاق، جومیریيە، یەحیای کوڕی سەعیدو ئیسماعیلی کوڕی ئومەییە هەموویان لە نافیعەوە گێڕاویانەتەوە، ئەوییش لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە کورتتر لە گێڕانەوەکەی پێشوو گێڕاویەتیەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٩١.

## ٥ - بابٌ: إِذَا أَعْتَقَ نَصِيبًا فِي عَبْدٍ، وَلَيْسَ لَهُ مَالٌ، اسْتُسْعِيَ العَبْدُ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ، عَلَى نَحْوِ الكِتَابَةِ

٢٥٢٦- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي رَجَاءٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، سَمِعْتُ قَتَادَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي النَّضْرُ بْنُ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ بَشِيرِ بْنِ نَهِيكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مَنْ أَعْتَقَ شَقِيصًا مِنْ عَبْدٍ"[1].

## ٥- باسێک: ئەگەر کەسێک بەشێکی لە کۆیلەیەک ئازاد کرد،وە سامانی نەبوو (هەمووی ئازاد بکات)، داوا لەکۆیلەکە دەکرێت کەسابەت بکات بێ زەحمەت لێ کردن، وەک ئەوەی کە کۆیلەکە لەگەڵ خاوەنەکەی نووسراو دەنووسن (بۆ ئازادکردنی بەپارەیەکی دیاری کراو)

**٢٥٢٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس بەشێك لە کۆیلەیەك ئازاد بکات))**

٢٥٢٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ بَشِيرِ بْنِ نَهِيكٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: "مَنْ أَعْتَقَ نَصِيبًا -أَوْ شَقِيصًا- فِي مَمْلُوكٍ، فَخَلَاصُهُ عَلَيْهِ فِي مَالِهِ إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ، وَإِلَّا قُوِّمَ عَلَيْهِ، فَاسْتُسْعِيَ بِهِ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ". تَابَعَهُ حَجَّاجُ بْنُ حَجَّاجٍ، وَأَبَانُ، وَمُوسَى بْنُ خَلَفٍ، عَنْ قَتَادَةَ. اخْتَصَرَهُ شُعْبَةُ[2].

**٢٥٢٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەرکەسێك بەشێکی -یان هەندێکی- لەکۆیلەیەك ئازاد کرد، ئەوە ئازاد کردنی کۆیلەکەی**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٩٢.

(٢) بڕوانە: ٢٤٩٢.

لەسەرە لەماڵی خۆی ئەگەر ماڵی هەبوو، ئەگەر نەیبوو (هەمووی ئازاد بکات) بەنرخی خۆی لەسەری دادەنرێت، وە داوا لەکۆیلەکە دەکرێت کەسابەت بکات بێ زەحمەت لێ کردنی))، هەر یەك لە حەجاجی کوڕی حەجاج و ئەبان و مووسای کوڕی خەلەف گێڕاویانەتەوە لە قەتادەوە، پاڵپشتی گێڕانەوەکەی سەعیدیان کردووە. هەروەها شوعبە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە و کورتی کردوەتەوە (و باسی داوای کەسابەت لێ کردنی نەهێناوە).

## ٦- بابُ الخَطَإِ وَالنِّسْيَانِ فِي العَتَاقَةِ وَالطَّلَاقِ وَنَحْوِهِ، وَلَا عَتَاقَةَ إِلَّا لِوَجْهِ اللهِ

وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى"(١). وَلَا نِيَّةَ لِلنَّاسِي وَالمُخْطِئِ.

٢٥٢٨- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّ اللهَ تَجَاوَزَ لِي عَنْ أُمَّتِي مَا وَسْوَسَتْ بِهِ صُدُورُهَا، مَا لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَكَلَّمْ"(٢).

## ٦- باسی هەڵەکردن و لەبیرچوون لە ئازادکردن و تەڵاقدان و شتی لەوجۆرە،وە ئازادکردنی کۆیلە دروست نییە مەگەر لەبەر ڕەزامەندی خوا بێت

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((بۆ هەموو کەسێك ح نیەتێك هەبێت ئەوە دەنووسرێت))، ئەو کەسەی بەهەڵە یان بەلەبیرچوون شتێك بکات نییەتی نییە و لەسەری نانووسرێت.

(١) بڕوانە: ١.

(٢) بڕوانە: ٥٢٦٩، ٦٦٦٤.

**٢٥٢٨- ئەبو هورەیرە ﷛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوای گەورە لەبەر من چاوپۆشی لە ئوممەتەکەم کردووە لەو دالْغە (گومان)انەی بەدڵیاندا هاتووە (و دێت)، هەتا بە کردەوە نەیکەن یان بەگوفتار نەیڵێن)).**

٢٥٢٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنْ سُفْيَانَ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَقَّاصٍ اللَّيْثِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﷛، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "الأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ، وَلِامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ، فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ".

**٢٥٢٩- عومەری کوڕی خەتتاب ﷛ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەموو کردەوەکان بەنیازی دڵن، هەرکەس نیازی دڵی چی بێت پاداشتی ئەوەی دەدرێتەوە، جا هەرکەس کۆچکردنەکەی لەبەر ڕەزامەندی خواو بۆ لای پێغەمبەرەکەی ﷺ، بێت ئەوە کۆچەکەی بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی، بەڵام هەر کەسێك کۆچەکەی بۆ بەدەستهێنانی دونیا بێت، یان لەبەر ئافرەتێك بێت کە مارەی بکات، ئەوە کۆچەکەی بۆ ئەوەیە کە لەپێناویدا کۆچی کردووە)).**

## ٧ - بابٌ: إِذَا قَالَ رَجُلٌ لِعَبْدِهِ: هُوَ للهِ. وَنَوَى العِتْقَ، وَالإِشْهَادُ فِي العِتْقِ

٢٥٣٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ نُمَيْرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ بِشْرٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛ أَنَّهُ لَمَّا أَقْبَلَ يُرِيدُ الإِسْلاَمَ وَمَعَهُ غُلاَمُهُ، ضَلَّ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِنْ صَاحِبِهِ، فَأَقْبَلَ بَعْدَ ذَلِكَ وَأَبُو هُرَيْرَةَ جَالِسٌ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: النَّبِيُّ ﷺ "يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، هَذَا غُلاَمُكَ قَدْ أَتَاكَ". فَقَالَ: أَمَا إِنِّي أُشْهِدُكَ أَنَّهُ حُرٌّ. قَالَ فَهُوَ حِينَ يَقُولُ:
يَا لَيْلَةً مِنْ طُولِهَا وَعَنَائِهَا ... عَلَى أَنَّهَا مِنْ دَارَةِ الكُفْرِ نَجَّتِ[1].

(١) بروانە: ٢٥٣١، ٢٥٣٢، ٤٣٩٣.

## ٧- باسێک: ئەگەر پیاوێک بە کۆیلەکەی ووت: ئەو کۆیلەیە بۆ خوا بێت و مەبەستی ئازادکردن بوو، وە (حوکمی) شایەتی دان لە ئازادکردنی کۆیلەدا

**٢٥٣٠- قەیس گێڕایەوە کە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێك ئەو هات ویستی (مسوڵمان بێت و) بێتە ناو ئیسلامەوە، غولامەکەشی لەگەڵدا بوو، هەردووکیان لەیەکتری ون بوون، جا دواتر غولامەکەی هاتەوە و ئەبو هورەیرە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەبو هورەیرە ئەوە غولامەکەتە هاتەوە بۆ لات))، ئەبو هورەیرە وتی: دەی من تۆ دەکەم بەشایەت کە ئەو ئازادە، دەڵێ: ئەوە لەکاتێکدا بوو کە ئەبو هورەیرە دەیوت:**

**ئای لە درێژی و ماندوویێتی شەوگارێك .... بەڵام ئەو شەوە ڕزگاری کردین لە کافرستانی**

٢٥٣١- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَدِمْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ قُلْتُ فِي الطَّرِيقِ:

يَا لَيْلَةً مِنْ طُولِهَا وَعَنَائِهَا ... عَلَى أَنَّهَا مِنْ دَارَةِ الكُفْرِ نَجَّتِ

قَالَ: وَأَبَقَ مِنِّي غُلَامٌ لِي فِي الطَّرِيقِ -قَالَ:- فَلَمَّا قَدِمْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بَايَعْتُهُ، فَبَيْنَا أَنَا عِنْدَهُ إِذْ طَلَعَ الغُلَامُ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: "يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، هَذَا غُلَامُكَ". فَقُلْتُ هُوَ حُرٌّ لِوَجْهِ اللهِ، فَأَعْتَقْتُهُ. لَمْ يَقُلْ أَبُو كُرَيْبٍ، عَنْ أَبِي أُسَامَةَ: حُرٌّ[1].

**٢٥٣١- قەیس گێڕایەوە کە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێك ڕۆیشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ (لە مەدینە) لەڕێگادا ئەم شیعرەم دەوت:**

---

(١) بڕوانە: ٢٥٣٠.

ئای لەدرێژی و ماندوویێتی شەوگارێك .... بەڵام ئەو شەوە ڕزگاری كردین لەكافرستانی ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: لەڕێگادا غولامەكەم هەڵهات و ڕای كرد، دەڵێ: جا كاتێك گەیشتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بەیعەتم پێدا، ئینجا لەكاتێكدا من لە خزمەتیدا بووم، لەپڕ غولامەكە دەركەوت و پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وتم: ((ئەی ئەبو هوڕەیرە ئەوە غولامەكەتە))، منیش وتم: ئەوە ئازاد بێت لەبەر ڕەزامەندی خوا، ئیتر ئازادم كرد. ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئەبو كوڕەیب لە ئوسامەوە گێڕاویەتیەوە و نەیوتووە: ئازادە.

٢٥٣٢- حَدَّثَنَا شِهَابُ بْنُ عَبَّادٍ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ قَالَ: لَمَّا أَقْبَلَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، وَمَعَهُ غُلاَمُهُ وَهْوَ يَطْلُبُ الإِسْلاَمَ، فَأَضَلَّ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ ...بِهَذَا، وَقَالَ: أَمَا إِنِّي أُشْهِدُكَ أَنَّهُ للهِ[1].

٢٥٣٢- قەیس دەڵێ: كاتێك ئەبو هوڕەیرە ﷺ هات و غولامەكەی لەگەڵدا بوو، وە ئەبو هوڕەیرە بەدوای ئیسلامدا دەگەڕا، هەریەكەیان هاوڕێكەی ون كردبوو، ئیتر فەرموودەكە بەوێنەی فەرموودەكەی پێشوو دەگێڕێتەوە، وە ئەبو هوڕەیرە دەڵێ: بەڕاستی من تۆ دەكەمە شایەت كە ئەو ئازادە لەبەر خوا.

## ٨- بابُ أُمِّ الوَلَدِ

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: "مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّهَا".

٢٥٣٣- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: إِنَّ عُتْبَةَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ عَهِدَ إِلَى أَخِيهِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ أَنْ يَقْبِضَ

(١) بڕوانە: ٢٥٣٠.

إِلَيْهِ ابْنَ وَلِيدَةِ زَمْعَةَ، قَالَ عُتْبَةُ إِنَّهُ ابْنِي. فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زَمَنَ الفَتْحِ أَخَذَ سَعْدٌ ابْنَ وَلِيدَةِ زَمْعَةَ، فَأَقْبَلَ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَقْبَلَ مَعَهُ بِعَبْدِ بْنِ زَمْعَةَ، فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا ابْنُ أَخِي، عَهِدَ إِلَيَّ أَنَّهُ ابْنُهُ. فَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا أَخِي ابْنُ وَلِيدَةِ زَمْعَةَ، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِهِ. فَنَظَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى ابْنِ وَلِيدَةِ زَمْعَةَ، فَإِذَا هُوَ أَشْبَهُ النَّاسِ بِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ بْنَ زَمْعَةَ". مِنْ أَجْلِ أَنَّهُ وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِيهِ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "احْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ بِنْتَ زَمْعَةَ". مِمَّا رَأَى مِنْ شَبَهِهِ بِعُتْبَةَ. وَكَانَتْ سَوْدَةُ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ(١).

## ٨- باسی (حوکمی) دایکی منداڵ

**ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوەو فەرموویەتی: ((لە نیشانەکانی ڕۆژی دواییە کە کەنیزەك خاوەنەکەی ببێت(٢))).**

**٢٥٣٣- عائیشە ﷺ دەڵێ: عوتبەی کوڕی ئەبی وەققاص بەسەعدی کوڕی ئەبی وەققاصی برای وت: کوڕی کەنیزەکەکەی زەمعە (کە عەبدوڕەحمانە) وەربگرێت و بهێنێتە لای خۆی، عوتبە وتی: بێگومان ئەو (عەبدوڕەحمان) کوڕی منە، جا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی ئازادکردنی مەککە هات (بۆ مەککە)، سەعد کوڕی کەنیزەکەکەی زەمعەی وەرگرت و هێنای بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، عەبدی کوڕی زەمعەشی لەگەڵیدا هێنا، ئینجا سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە برازامە، براکەم وەسێتی بۆ کردووم کە ئەو (عەبدوڕەحمان) کوڕیەتی، عەبدی کوڕی زەمعەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە برامە، کوڕی**

---

(١) بڕوانە: ٢٠٥٣.

(٢) واتە: کەنیزەکێک پیاوێک مارەی دەکات و سەرجێیی لەگەڵ دەکات و کوڕێکی لێ دەبێت، ئەم کوڕە دوای مردنی باوکی دەبێتە خاوەنی دایکی، بەڵام دایکی ئازاد دەبێت، چونکە دروست نییە مرۆڤ دایک و باوکی خۆی بکاتە کۆیلە.

کەنیزەکی زەمعەیە، لە ماڵ و سەرجێی ئەودا لە دایك بوو[١]، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری کوڕی کەنیزەکەکەی زەمعەی کرد، دەبینێت زۆر لە عوتبە دەچێت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((ئەی عەبد ئەم کوڕە هی تۆیە))، لەبەر ئەوەی کەنیزەکەکە لە ماڵ و سەرجێی باوکیدا بووە. وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی سەودەی کچی زەمعە خۆتی لێ داپۆشە و با نەتبینێ))، لەبەر ئەوەی بینی (عەبدوڕەحمان) لە عوتبە دەچێت، وە سەودە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ بوو.

## ٩- بابُ بَيْعِ المُدَبَّرِ

٢٥٣٤- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: أَعْتَقَ رَجُلٌ مِنَّا عَبْدًا لَهُ عَنْ دُبُرٍ، فَدَعَا النَّبِيُّ ﷺ بِهِ فَبَاعَهُ. قَالَ جَابِرٌ مَاتَ الغُلاَمُ عَامَ أَوَّلَ[٢].

## ٩- باسی فرۆشتنی کۆیلەی چاوەڕوانکراو[٣] (دروستە)

٢٥٣٤- جابیری کوڕی عەبدوڵلا رضي الله عنهما دەڵێ: پیاوێك لەئێمە[٤] کۆیلەیەکی هەبوو ئازادی کرد دوای مردنی (ئەگەر مرد)، پێغەمبەریش ﷺ جاڕی بۆ داو[٥] و فرۆشتی. جابیر دەڵێ: کۆیلە لاوەکە مرد لە ساڵی یەکەمی (ئیمارەتی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیردا)[٦].

(١) واتە: ئەو کەنیزەکە کاتێک عەبدوڕەحمانی بووە زەمعە خاوەن و گەورەی بووە.

(٢) بڕوانە: ٢١٤١.

(٣) واتە: ئەگەر خاوەنەکەی مرد کۆیلەکە ئازاد دەکرێ.

(٤) واتە: ئەنصارییەکان.

(٥) فەرمووی: کێ دەیکڕێ؟

(٦) ئەو زیادەی نێوان کەوانەکان لە صەحیحی موسلیمدایە (فتح الباري: ٢٠٨/٦).

## ١٠- بابُ بَيْعِ الوَلاَءِ وَهِبَتِه

٢٥٣٥- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ دِينَارٍ، سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الوَلاَءِ، وَعَنْ هِبَتِهِ[1].

## ١٠- باسی (ڕێگری کردن لە) فرۆشتنی هەقداری و بەخشینی

**٢٥٣٥- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە فرۆشتنی هەقداری (کۆیلەی ئازادکراو)، وە ڕێگریشی کرد لە بەخشینی[2].**

٢٥٣٦- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتِ: اشْتَرَيْتُ بَرِيرَةَ، فَاشْتَرَطَ أَهْلُهَا وَلاَءَهَا، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: "أَعْتِقِيهَا، فَإِنَّ الوَلاَءَ لِمَنْ أَعْطَى الوَرِقَ". فَأَعْتَقْتُهَا، فَدَعَاهَا النَّبِيُّ ﷺ فَخَيَّرَهَا مِنْ زَوْجِهَا فَقَالَتْ: لَوْ أَعْطَانِي كَذَا وَكَذَا مَا ثَبَتُّ عِنْدَهُ. فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا[3].

**٢٥٣٦- عائیشە ﷺ دەڵێ: بەریرەم کڕی، ئینجا خاوەنەکانی بەمەرجیان گرت کە هەقداری بەریرە بۆ ئەوان بێت، منیش ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمووی: ((ئازادی بکە، چونکە بێگومان هەقداری بۆ ئەو کەسەیە زیو (پارە)ـی داوە))، منیش ئازادم کرد، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەریرەی بانگ کرد و سەرپشکی کرد لە (مانەوە لای) مێردەکەی، بەریرەش وتی: ئەگەر ئەوە و ئەوەشم پێبدات لای نامێنمەوە، ئیتر جیابوونەوەی خۆی هەڵبژارد.**

---

(١) بڕوانە: ٦٧٥٦.

(٢) ئیبنو بەتتال دەڵێ: زانایان یەک دەنگن گۆڕینی نەسەب دروست نییە، جا ئەگەر حوکمی هەقداری (وەلا ) حوکمی نەسەبی هەیە، کەواتە چۆن نەسەب ناگوردرێ، هەقداریش ناگۆردرێ، عەرەبەکان لە سەردەمی نەفامیدا هەقداریان دەگۆڕی بە فرۆشتن، بەڵام ئایینی ئیسلام ئەوەی قەدەغەکرد. بڕوانە: إرشاد الساري: ٥٥٣/٥.

(٣) بڕوانە: ٤٥٦.

## ١١ - بابٌ: إِذَا أُسِرَ أَخُو الرَّجُلِ أَوْ عَمُّهُ، هَلْ يُفَادَى إِذَا كَانَ مُشْرِكًا؟

وَقَالَ أَنَسٌ: قَالَ العَبَّاسُ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَادَيْتُ نَفْسِي، وَفَادَيْتُ عَقِيلًا[١].

وَكَانَ عَلِيٌّ لَهُ نَصِيبٌ فِي تِلْكَ الغَنِيمَةِ التِي أَصَابَ مِنْ أَخِيهِ عَقِيلٍ وَعَمِّهِ عَبَّاسٍ.

٢٥٣٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ مُوسَى، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَنَسٌ ﷺ أَنَّ رِجَالًا مِنَ الأَنْصَارِ اسْتَأْذَنُوا رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالُوا: ائْذَنْ لَنَا فَلْنَتْرُكْ لِابْنِ أُخْتِنَا عَبَّاسٍ فِدَاءَهُ. فَقَالَ: "لَا تَدَعُونَ مِنْهُ دِرْهَمًا"[٢].

## ١١- باسێك: ئەگەر پیاوێك برای یان مامی دیل كرا،ئایا بریتی (فیدیە) بۆ دەدرێت ئەگەر هاوبەشدانەر بوو؟

**ئەنەس ﷺ دەڵێ: عەبباس بە پێغەمبەری ﷺ وت: بریتی خۆم و بریتی عەقیلم دا.**

**هەروەها عەلی لەو دەستكەوتەی كە لە عەقیلی برای و عەبباسی مامی دەست كەوت بەشێكی هەبوو تێیدا.**

**٢٥٣٧- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە كە چەند پیاوێكی ئەنصاری مۆڵەتیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ خواست و وتیان: مۆڵەتمان بدە با دەست هەڵگرین لەبریتی عەبباسی خوشكەزامان، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دەست لەیەك درهەمی هەڵناگرن)).**

## ١٢- بابُ عِتْقِ المُشْرِكِ

٢٥٣٨- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، أَخْبَرَنِي أَبِي، أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ ﷺ أَعْتَقَ فِي الجَاهِلِيَّةِ مِائَةَ رَقَبَةٍ، وَحَمَلَ عَلَى مِائَةِ بَعِيرٍ، فَلَمَّا أَسْلَمَ حَمَلَ عَلَى مِائَةِ

(١) بڕوانە: ٤٢١.

(٢) بڕوانە: ٣٠٤٨، ٤٠١٨.

بَعِيرٍ، وَأَعْتَقَ مِائَةَ رَقَبَةٍ، قَالَ: فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ أَشْيَاءَ كُنْتُ أَصْنَعُهَا فِي الجَاهِلِيَّةِ، كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا، يَعْنِي أَتَبَرَّرُ بِهَا، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "أَسْلَمْتَ عَلَى مَا سَلَفَ لَكَ مِنْ خَيْرٍ"[1].

## ١٢- باسی (حوکمی) ئازادکردنی کۆیلەی هاوبەشدانەر

**٢٥٣٨- هیشام دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە کە حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ لە سەردەمی نەفامیدا[2] سەد بەندەی ئازاد کردبوو، وە سەد وشتری تەرخان کردبوو بۆ سواربوونیان (بۆ حەج)، جا کاتێك مسوڵمان بوو سەد وشتری تەرخان کرد بۆ سوار بوونیان (بۆ حەج)، سەد بەندەشی ئازاد کرد، حەکیم وتی: جا پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم بدەرێ دەربارەی شتانێك من لە سەردەمی نەفامیدا دەمکرد، من بەنیازی چاکە دەمکردن، (هیشام دەڵێ) واتە: مەبەستم لێیان چاکەکردن بوو (بەرانبەر بەخەڵکی)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((تۆ لەسەر ئەو چاکانە مسوڵمان بوویت کە پێشتر کردووتە)).**

## ١٣- بابُ مَنْ مَلَكَ مِنَ العَرَبِ رَقِيقًا، فَوَهَبَ وَبَاعَ وَجَامَعَ وَفَدَى وَسَبَى الذُّرِّيَّةَ

وَقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَمَن رَّزَقْنَٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا هَلْ يَسْتَوُۥنَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ ﴾ النحل.

---

(١) بڕوانە: ١٤٣٦.

(٢) کە بتپەرست بووە.

# ١٣- باسى كەسێک کەنیزەک و کۆیلەیەکی عەرەبی بوو بێت، جا بەخشی بێتی و فرۆشتبێتی و سەرجێیی لەگەڵ کرد بێت و لە بریتیدا دابێتی، وە باسی ژن و منداڵی عەرەبی بەدیل گرتبێت

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەو بالآدەست: (خوا نموونەی هێناوەتەوە بە بەندەیەکی خاوەندار کە توانای بەسەر هیچ شتێکدا نییە، لەگەڵ کەسێکی (باوەڕدار) کە ڕزق و ڕۆزی چاکمان پێدابێ لەلایەن خۆمانەوە، ئەویش لەو (ڕۆزی)یە ببەخشێت بەنهێنی و بەئاشکرا، ئایا ئەو دووانە یەکسانن؟! سوپاس و ستایش بۆ خوا، بەڵام زۆربەیان نازانن).**

٢٥٣٩- ٢٥٤٠- حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: أَخْبَرَنِي اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، ذَكَرَ عُرْوَةُ أَنَّ مَرْوَانَ وَالمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ أَخْبَرَاهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَامَ حِينَ جَاءَهُ وَفْدُ هَوَازِنَ، فَسَأَلُوهُ أَنْ يَرُدَّ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ وَسَبْيَهُمْ، فَقَالَ: "إِنَّ مَعِي مَنْ تَرَوْنَ، وَأَحَبُّ الحَدِيثِ إِلَيَّ أَصْدَقُهُ، فَاخْتَارُوا إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ: إِمَّا المَالَ، وَإِمَّا السَّبْيَ، وَقَدْ كُنْتُ اسْتَأْنَيْتُ بِهِمْ". وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ انْتَظَرَهُمْ بِضْعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً حِينَ قَفَلَ مِنَ الطَّائِفِ، فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ غَيْرُ رَادٍّ إِلَيْهِمْ إِلَّا إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ قَالُوا: فَإِنَّا نَخْتَارُ سَبْيَنَا. فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فِي النَّاسِ، فَأَثْنَى عَلَى اللهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: "أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ إِخْوَانَكُمْ جَاءُونَا تَائِبِينَ، وَإِنِّي رَأَيْتُ أَنْ أَرُدَّ إِلَيْهِمْ سَبْيَهُمْ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يُطَيِّبَ ذَلِكَ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ عَلَى حَظِّهِ حَتَّى نُعْطِيَهُ إِيَّاهُ مِنْ أَوَّلِ مَا يُفِيءُ اللهُ عَلَيْنَا فَلْيَفْعَلْ". فَقَالَ النَّاسُ: طَيَّبْنَا ذَلِكَ. قَالَ: "إِنَّا لَا نَدْرِي مَنْ أَذِنَ مِنْكُمْ مِمَّنْ لَمْ يَأْذَنْ، فَارْجِعُوا حَتَّى يَرْفَعَ إِلَيْنَا عُرَفَاؤُكُمْ أَمْرَكُمْ". فَرَجَعَ النَّاسُ، فَكَلَّمَهُمْ عُرَفَاؤُهُمْ، ثُمَّ رَجَعُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَخْبَرُوهُ أَنَّهُمْ طَيَّبُوا وَأَذِنُوا، فَهَذَا الذِي بَلَغَنَا عَنْ سَبْيِ هَوَازِنَ. وَقَالَ أَنَسٌ قَالَ عَبَّاسٌ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَادَيْتُ نَفْسِي، وَفَادَيْتُ عَقِيلًا[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٣٠٧، ٢٣٠٨.

٢٥٣٩- ٢٥٤٠- عورِوە دەڵێ: مەڕوان و میسوەری کوڕی مەخرِەمە بۆیان گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك نوێنەرەکانی هەوازین هاتنە خزمەتی هەستایە سەرپێ، ئینجا داوایان لێی کرد کە سامان و ژن و منداڵەکانیان بۆ بگێڕێتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان من ئەو خەڵکەم لەگەڵدایە کە دەیان بینن، وە خۆشەویستترین وتە لای من ڕاستترینیەتی، کەواتە یەکێك لەو دووانە هەڵبژێرن[1]: یان ماڵ و سامانەکە، یان ژن و منداڵە دیلەکان، وە بێگومان من پەلەم نەکرد و چاوەڕوانیم کردن))، وە پێغەمبەر ﷺ کاتێك گەڕایەوە لەتائیف دە بۆ پازدە شەو چاوەڕوانی کردن، ئینجا کە بۆیان ڕوونبوویەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها یەکێك لەو دووانەیان[2] بۆ دەگێڕێتەوە، وتیان: کەواتە ژن و منداڵە دیلەکانمان هەڵدەبژێرین، ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو خەڵکەکەدا هەستایەوە، سوپاس و ستایشی خوای کرد بەو شێوەی شیاوی بێت، پاشان فەرمووی: ((دوای سوپاسی خوا، جا بەڕاستی ئەم برایانەتان بەپەشیمانییەوە[3] هاتوون بۆ لای ئێمە، وە من ڕام وایە کە ژن و منداڵە گیراوەکانیان بدەینەوە، جا هەرکەستان پێی خۆشە و لەناخیەوە حەز دەکات ئەو کارە بکات با بیکات، وە هەر کەسێکیشتان پێی خۆشە بەشەکەی خۆی وەك خۆی بمێنێتەوە هەتا یەکەم دەستکەوت خوای گەورە پێمان دەبەخشێت دەیدەینێ، با وابکات))، خەڵکەکەش وتیان: ئێمە بەوە ڕازین و پێمان خۆشە (و بۆیان دەگێڕینەوە)، ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی ئێمە نازانین کێتان مۆڵەتی داوەو کێتان مۆڵەت نەداوە[4]، کەواتە بگەڕێنەوە (بۆ

---

(١) کە بۆتان بگێڕمەوە و بتاندەمەوە.

(٢) یان ژن و منداڵەکانیان یا ماڵ و سامانەکانیان.

(٣) واتە: موسوڵمان بوون و پەشیمانن لە ڕابردوویان.

(٤) بۆ گێڕانەوەی ژن و منداڵە گیراوەکانیان.

**شوێنی خۆتان) با نوێنەر و سەرپەرشتیارەکانتان بڕیاری ئێوە بەرزبکەنەوە بۆمان))، ئیتر خەڵکەکەش گەڕانەوە و نوێنەرەکانیان قسەیان لەگەڵ کردن، پاشان نوێنەرەکانیان گەڕانەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، هەواڵیان پێدا کە خەڵکەکە هەموو پێیان خۆشە و مۆڵەتیان دا بەگێڕانەوەیان. (زوهری دەڵێ:) جا ئەوەیە دەربارەی ژن و منداڵە دیلەکانی هەوازین پێمان گەیشتووە. ئەنەس ﷺ دەڵێ: عەبباس ﷺ بەپێغەمبەری ﷺ وت: جا من بریتی خۆم و بریتی عەقیلم داوە (کاتێك بەدیل گیراین لەجەنگی بەدردا).**

٢٥٤١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الحَسَنِ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عَوْنٍ قَالَ: كَتَبْتُ إِلَى نَافِعٍ فَكَتَبَ إِلَيَّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَغَارَ عَلَى بَنِي المُصْطَلِقِ وَهُمْ غَارُّونَ وَأَنْعَامُهُمْ تُسْقَى عَلَى المَاءِ، فَقَتَلَ مُقَاتِلَتَهُمْ، وَسَبَى ذَرَارِيَّهُمْ، وَأَصَابَ يَوْمَئِذٍ جُوَيْرِيَةَ. حَدَّثَنِي بِهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، وَكَانَ فِي ذَلِكَ الجَيْشِ.

**٢٥٤١- ئیبنو عەون دەڵێ: نامەم نووسی بۆ نافیع[١]، ئەویش وەڵامی بۆ نووسیمەوە[٢]: بێگومان پێغەمبەر ﷺ لەناکاودا هێرشی کردە سەر بەنی موصتەلیق کە بێ ئاگابوون، وە ئاژەڵ و ماڵاتەکەیان لەسەر ئاوێك بوون ئاو دەدران، ئینجا پیاوە جەنگاوەرەکانیان کوژران، وە ژن و منداڵەکانیان بەدیل گیران، لەو ڕۆژەدا ئەو (پێغەمبەر ﷺ) جوەیریەی بەرکەوت [٣]، (نافیع دەڵێ:) عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ ئەم فەرموودەی بۆ گێڕامەوە کە خۆی لەو لەشکرەدا بووە.**

---

(١) دەربارەی بانگکردنی کافران بۆ ئیسلام پێش جەنگ کردن لەگەڵیان.

(٢) کە بانگ کردن لە سەرەتای ئیسلامەوە بوو، ئەوە پێغەمبەر ﷺ دای بەسەر بەنی موصتەلەقدا، لەکاتێکدا بێ ئاگابوون.

(٣) کە لەو ئافرەتانە بوو بەدیل گیرابوون.

٢٥٤٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ قَالَ: رَأَيْتُ أَبَا سَعِيدٍ ﷺ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ بَنِي الْمُصْطَلِقِ، فَأَصَبْنَا سَبْيًا مِنْ سَبْيِ العَرَبِ، فَاشْتَهَيْنَا النِّسَاءَ، فَاشْتَدَّتْ عَلَيْنَا العُزْبَةُ وَأَحْبَبْنَا العَزْلَ، فَسَأَلْنَا رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: "مَا عَلَيْكُمْ أَنْ لَا تَفْعَلُوا، مَا مِنْ نَسَمَةٍ كَائِنَةٍ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ إِلَّا وَهْيَ كَائِنَةٌ"[1].

**٢٥٤٢- ئیبنو موحەیریز دەڵێ: ئەبو سەعیدم بینی و پرسیار(ی عەزل [2]))ـم لێکرد، ئەویش وتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ (لە مەدینە) دەرچووین بۆ غەزای بەنی موصتەلیق، جا کۆمەڵێك ئافرەتمان لەئافرەتانی عەرەب دەست بەسەردا گرت، جا دڵمان بۆ ئافرەتان چوو، چونکە بێ ژنی و دوور لە هاوسەری زۆری بۆ هێنابووین، وە حەزمان دەکرد عەزل بکەین، بۆیە پرسیارمان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: ((هیچتان لەسەر نییە عەزل بکەن[3]، ئەوەی (خوا بیەوێ) ببێت تا ڕۆژی قیامەت هەر دەبێت)).**

٢٥٤٣- حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ القَعْقَاعِ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَا أَزَالُ أُحِبُّ بَنِي تَمِيمٍ. وَحَدَّثَنِي ابْنُ سَلَامٍ، أَخْبَرَنَا جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ الحَمِيدِ، عَنِ المُغِيرَةِ عَنِ الحَارِثِ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَعَنْ عُمَارَةَ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: مَا زِلْتُ أُحِبُّ بَنِي تَمِيمٍ مُنْذُ ثَلَاثٍ سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ يَقُولُ فِيهِمْ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: "هُمْ أَشَدُّ أُمَّتِي عَلَى الدَّجَّالِ". قَالَ: وَجَاءَتْ صَدَقَاتُهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "هَذِهِ صَدَقَاتُ قَوْمِنَا". وَكَانَتْ سَبِيَّةٌ مِنْهُمْ عِنْدَ عَائِشَةَ، فَقَالَ: "أَعْتِقِيهَا فَإِنَّهَا مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ"[4].

---

(١) بڕوانە: ٢٢٢٩.

(٢) عەزل: واتە لەکاتی جووتبووندا پیاو ئاوی خۆی بگرێتەوە و نەهێڵێ بڕژێتە منداڵدانی ئافرەتەکەوە.

(٣) لە (إرشاد الساري: ٢١٨/٤) دەڵێ: [لا]ـی (أن لاتفعلوا) زیادەیە.

(٤) بڕوانە: ٤٣٦٦.

٢٥٤٣- ئەبو زورعە لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: بەردەوام بەنی تەمیمم خۆش دەوێت. (بەڕشتەی دووەم گێڕدراوەتەوە:) ئەبو زورعە لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: تا ماوم بەنی تەمیمم خۆش دەوێت، لەو كاتەوەی سێ فەرموودەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە لەبارەیانەوە دەیفەرموو، لێم بیست دەیفەرموو: ((ئەوان لەبەهێزترینی ئوممەتی منن لەبەرانبەری دەججالدا)). ئەبو هوڕەیرە وتی: كاتێك زەكاتەكەیان هات پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەمە زەكاتی خزمەكانمانە))، وە كەنیزەكێك لەوان لای عائیشە بوو، پێغەمبەر ﷺ بە عائیشەی فەرموو: ((ئازادی بكە، چونكە بێگومان لەنەوەی ئیسماعیلە)).

## ١٤- بابُ فَضْلِ مَنْ أَدَّبَ جَارِيَتَهُ وَعَلَّمَهَا

٢٥٤٤- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، سَمِعَ مُحَمَّدَ بْنَ فُضَيْلٍ، عَنْ مُطَرِّفٍ عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مَنْ كَانَتْ لَهُ جَارِيَةٌ فَعَالَهَا، فَأَحْسَنَ إِلَيْهَا ثُمَّ أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، كَانَ لَهُ أَجْرَانِ"[1].

## ١٤- باسی گەورەیی ئەو كەسەی كەنیزەكەكەی پەروەردەبكات و فێری زانستی بكات

٢٥٤٤- ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەركەسێك كەنیزەكێكی هەبوو بە خێوی كرد، وە چاكەی لەگەڵدا كرد، پاشان ئازادی كرد و بەشووی دا، ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە)).

---

(١) بروانە: ٩٧.

## ١٥- بَابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: "العَبِيدُ إِخْوَانُكُمْ فَأَطْعِمُوهُمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ"

وَقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ ۞ وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ﴾ النساء. ذِي القُرْبَى: القَرِيبُ، وَالجُنُبُ: الغَرِيبُ، الجَارُ الجُنُبُ يَعْنِي: الصَّاحِبَ فِي السَّفَرِ.

## ١٥- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((کۆیلەکان براتانن، کەواتە لەو خۆراکەی خۆتان دەیخۆن دەرخواردی ئەوانیشی بدەن))

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: ((بەس خوا بپەرستن و هیچ شتێك مەکەن بەهاوبەشی، هەروەها لەگەڵ دایك وباوکتاندا چاك بن،وە لەگەڵ خزمە نزیکەکان و هەتیوان و هەژاران و هاوسێی خزم و هاوسێی بێگانە، یان دوور و هاوڕێی هەمیشەیی، یان هاوڕێی سەفەر و ڕێبوار و ئەوانەی بوون بەموڵکتان (چاك بن لەگەڵیاندا)، بەڕاستی خوا ئەو کەسەی خۆش ناوێ کە خۆ بەزل زان و شانازی کار بێ)). ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: (ذِي القُرْبَى) یانی: خزم، (الجُنُبُ): بێگانە (الجَارُ الجُنُبُ): یانی هاوڕێی سەفەر.**

٢٥٤٥- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا وَاصِلٌ الأَحْدَبُ قَالَ: سَمِعْتُ المَعْرُورَ بْنَ سُوَيْدٍ قَالَ: رَأَيْتُ أَبَا ذَرٍّ الغِفَارِيَّ ﷺ وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ وَعَلَى غُلاَمِهِ حُلَّةٌ فَسَأَلْنَاهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ إِنِّي سَابَبْتُ رَجُلًا فَشَكَانِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ: "أَعَيَّرْتَهُ بِأُمِّهِ". ثُمَّ قَالَ: "إِنَّ إِخْوَانَكُمْ خَوَلُكُمْ جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ، وَلَا تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ فَأَعِينُوهُمْ"[١].

---

(١) بڕوانە: ٣٠.

**٢٥٤٥- مەعروری کوڕی سوەید دەڵێ: ئەبو زەڕی غیفاریم ﷺ بینی پۆشاکێکی جوانی لەبەردا بوو، غولامەکەشی پۆشاکێکی جوانی لەبەردا بوو، ئێمەش پرسیارمان لێ کرد لەوبارەیەوە، ئەویش وتی: بێگومان من لەگەڵ پیاوێکدا بوو بە شەڕە جنێومان (کە بیلالە)، ئینجا ئەو پیاوە لای پێغەمبەر ﷺ شکاتی لێ کردم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی بەمن: ((ئەنگیت لێ گرت بەهۆی دایکیەوە؟)) پاشان فەرمووی: ((براکانتان کارەکانتان بۆ جێبەجێ دەکەن خوا ئەوانی خستۆتە ژێر دەستی ئێوە، جا هەر کەس براکەی لەژێر دەستیا بوو، لەوەی خۆی دەیخوات دەرخواردی ئەویشی بدات، خۆی چ پۆشاکێك دەپۆشێ ئەوەش بەو بپۆشێ، زیاتر لەتوانای خۆشیان ئەرك مەخەنە سەرشانیان، ئەگەر ئەرکی قورستان خستە سەر شانیان ئەوا یارمەتیان بدەن)).**

## ١٦- بَابُ العَبْدِ إِذَا أَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ وَنَصَحَ سَيِّدَهُ

٢٥٤٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "العَبْدُ إِذَا نَصَحَ سَيِّدَهُ وَأَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ، كَانَ لَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ"[1].

## ١٦- باسی پاداشتی کۆیلە ئەگەر بەچاکی بەندایەتی پەروەردگاری کرد و دڵسۆزی بۆ گەورەکەشی نواند

**٢٥٤٦- ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کۆیلە ئەگەر دڵسۆزی نواند بۆ گەورەکەی، وە بەچاکی بەندایەتی پەروەردگاریشی کرد، ئەوە دوو جار پاداشتی بۆ هەیە)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٥٥٠.

٢٥٤٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "أَيُّمَا رَجُلٍ كَانَتْ لَهُ جَارِيَةٌ فَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ تَأْدِيبَهَا، وَأَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَأَيُّمَا عَبْدٍ أَدَّى حَقَّ اللهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ، فَلَهُ أَجْرَانِ"[1].

**٢٥٤٧- ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر پیاوێك كەنیزەكێكی هەبێت بە جوانی ئەدەبی بدات، ئازادی بكات و بەشووی بدات ئەوە دوو پاداشتی هەیە، وە هەر بەندەیەك مافی خوا و مافی خاوەنەكانی جێ بەجێ بكات، ئەوەش دوو پاداشتی هەیە)).**

٢٥٤٨- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ المُسَيَّبِ يَقُولُ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ: "لِلْعَبْدِ المَمْلُوكِ الصَّالِحِ أَجْرَانِ" وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْلاَ الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ وَالحَجُّ وَبِرُّ أُمِّي، لأَحْبَبْتُ أَنْ أَمُوتَ وَأَنَا مَمْلُوكٌ ".

**٢٥٤٨- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بۆ بەندەی خاوەنداری چاك دوو پاداشت هەیە))، (ئەبو هوڕەیرە دەڵێ:) سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر لەبەر خەبات كردن لە پێناوی خوادا و حەجكردن و چاكەكردن لەگەڵ دایكمدا نەبووایە، پێم خۆش بوو كە دەمردم كۆیلە بوومایە.**

٢٥٤٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "نِعْمَ مَا لأَحَدِهِمْ، يُحْسِنُ عِبَادَةَ رَبِّهِ وَيَنْصَحُ لِسَيِّدِهِ".

**٢٥٤٩- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری ﷺ فەرمووی: ((ئای چەند بەهرەیەكی گەورەیە ئەوەی بۆ هەر یەكێكیان هەیە[2]، كە بەندایەتی پەروەردگاری بە چاكی دەكات و دڵسۆز دەبێت بۆ گەورەكەشی)).**

---

(١) بڕوانە: ٩٧.

(٢) مەبەستی كۆیلەی چاكە.

## ١٧- بابُ كَرَاهِيَةِ التَّطاوُلِ عَلَى الرَّقِيقِ، وَقَوْلِهِ: عَبْدِي، أَوْ أَمَتِي

وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۝٣٢﴾ النور، وَقَالَ: ﴿عَبْدًا مَّمْلُوكًا ۝٧٥﴾ النحل، ﴿وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلْبَابِ ۝٢٥﴾ يوسف، وَقَالَ: ﴿مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۝٢٥﴾ النساء. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ"[١]. وَ﴿ٱذْكُرْنِي عِندَ رَبِّكَ ۝٤٢﴾ يوسف: سَيِّدِكَ، "وَمَنْ سَيِّدُكُمْ؟

## ١٧- باسی ناپەسەندی خۆ بەزیادزانین بەسەر کۆیلەدا و ناپەسەندی وتەی کۆیلەکەم یان کەنیزەکەکەم

**وە خوای بەرز و بڵند دەفەرموێ: (ئەوانەی ئیماندار و چاکن لە کۆیلەکان و لە کەنیزەکەکانتان). وە فەرمووی: (بەندەیەکی خاوەندار)، هەروەها دەفەرموێ: (وە هەردووکیان (یوسف و ئافرەتەکە) تووشی مێردی (گەورەی) ئافرەتەکە بوون لەبەردەم دەرگاکە (ی دەرەوە)). وە فەرمووی: (لە کەنیزەکە باوەڕدارەکانتان). هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەستن بەپیری گەورەکەتانەوە[٢])). وە فەرمووی: (باسم بکە لای گەورەکەت[٣]))، ﴿رَبِّكَ﴾ واتە: گەورەکەت، (کێ گەورەتانە؟).**

٢٥٥٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "إِذَا نَصَحَ العَبْدُ سَيِّدَهُ، وَأَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ، كَانَ لَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ"[٤].

---

(١) بڕوانە: ٣٠٤٣.

(٢) بەئەنصارییەکان دەفەرموێ: هەستن بەپیری سەعدی کوڕی موعازەوە، کە بریندار بوو بەسوار وڵاخێکەوە بوو، داوای لێکرد هەستن و دایگرن لەوڵاخەکەی.

(٣) مەبەستی پادشایە کە گەورەی وڵاتە.

(٤) بڕوانە: ٢٥٤٦.

**٢٥٥٠- عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کۆیلە ئەگەر دڵسۆزی نواند بۆ خاوەن و گەورەکەی، وە بەچاکی بەندایەتی پەروەردگاریشی کرد بێت، ئەوە دووجار پاداشتی بۆ هەیە)).**

٢٥٥١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ:"المَمْلُوكُ الَّذِي يُحْسِنُ عِبَادَةَ رَبِّهِ، وَيُؤَدِّي إِلَى سَيِّدِهِ الذِي لَهُ عَلَيْهِ مِنَ الحَقِّ وَالنَّصِيحَةِ وَالطَّاعَةِ، لَهُ أَجْرَانِ"[1].

**٢٥٥١- ئەبو مووسا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((ئەو کۆیلەیەی بەجوانی بەندایەتی پەروەردگاری دەکات، وە ئەو ماف و دڵسۆزی و گوێڕایەڵیەی لەسەریەتی بۆ خاوەن وگەورەکەی جێبەجێی دەکات، دوو پاداشتی بۆ هەیە)).**

٢٥٥٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: "لَا يَقُلْ أَحَدُكُمْ: أَطْعِمْ رَبَّكَ، وَضِّئْ رَبَّكَ، اسْقِ رَبَّكَ. وَلْيَقُلْ سَيِّدِي مَوْلاَيَ. وَلَا يَقُلْ أَحَدُكُمْ: عَبْدي أَمَتِي. وَلْيَقُلْ فَتَايَ وَفَتَاتِي وَغُلاَمِي".

**٢٥٥٢- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((کەستان نەڵێت (بەکۆیلەی کەسێکی تر) خواردن بدە بە (رَبَّكَ)[2] پەروەرێنت، ئاوی دەستنوێژ بکە بەدەستی (رَبَّكَ) پەروەرێنتدا، وە ئاوی خواردنەوە بدە بە**

---

(١) بڕوانە: ٩٧.

(٢) وشەی (ربّ) بەکارنەهێنێ بۆ گەورە و خاوەنی کۆیلەکە، چونکە ئەو وشەیە بۆ پەروەردگار بەکاردەهێنرێت.

**(رَبَّكَ) پەروەرێنت، بەڵكو بڵێ: گەورەم و بەڕێزم، وە با كەستان نەڵێ بەندەكەم! كەنیزەكەكەم! بەڵكو بڵێ: كوڕەكەم! كچەكەم! غولامەكەم!)).**

٢٥٥٣- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مَنْ أَعْتَقَ نَصِيبًا لَهُ مِنَ العَبْدِ، فَكَانَ لَهُ مِنَ المَالِ مَا يَبْلُغُ قِيمَتَهُ، يُقَوَّمُ عَلَيْهِ قِيمَةَ عَدْلٍ، وَأُعْتِقَ مِنْ مَالِهِ، وَإِلَّا فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ"[1].

**٢٥٥٣- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەركەسێك بەشێكی هەبوو لە كۆیلەیەك و ئازادی كرد، جا ئەگەر ئەوەندە سامانی هەبوو دەگەیشتە نرخی كۆیلەكە، نرخی كۆیلەكەی بەدادپەروەرانە دەقەبلێنرێ، وە لە سامانی ئەو ئازاد دەبێت، ئەگەر نەیبوو، ئەوە بێگومان ئەوەندەی كە ئازادی كردووە ئازاد بووە)).**

٢٥٥٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "كُلُّكُمْ رَاعٍ فَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالأَمِيرُ الذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ وَهْوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ وَهْوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ بَعْلِهَا وَوَلَدِهِ وَهْيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُمْ، وَالعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ وَهْوَ مَسْئُولٌ عَنْهُ، أَلَا فَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ"[2].

**٢٥٥٤- عوبەیدوڵلا دەڵێ: نافیع بۆی گێڕامەوە لە عەبدوڵلاوە ﷺ كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەمووتان شوان و بەرپرسن، وە هەمووتان بەرپرسیارن لە شوانییەكەتان، جا ئەو پێشەوایەی بەرپرسی خەڵكەو بەرپرسیارە لێیان، پیاو**

---

(١) بروانە: ٢٤٩١.

(٢) بروانە: ٨٩٣.

**شوان و بەرپرسە لە ماڵ و منداڵی خۆی و بەرپرسیارە لێیان، وە ئافرەت لە ماڵی مێردی و منداڵەکانیدا شوانە و بەرپرسیارە لێیان، کۆیلە و خزمەتکار شوانە لەماڵی گەورەکەیدا و بەرپرسە لێی، ئاگاداربن هەمووتان شوان و بەرپرسن، وە هەر یەکەتان بەرپرسیارە لە شوانییەتەکەی)).**

٢٥٥٥- ٢٥٥٦- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللهِ، سَمِعْتُ أَبَا هريرَةَ ﷺ، وَزَيْدَ بْنَ خَالِدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "إِذَا زَنَتِ الأَمَةُ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِذَا زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِذَا زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا -فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ- بِيعُوهَا وَلَوْ بِضَفِيرٍ"[1].

**٢٥٥٥- ٢٥٥٦- ئەبو هورەیرە و زەیدی کوڕی خالید ﷺ دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەنیزەك زینای کرد ئەوە دار حەدی لێ بدەن، پاشان ئەگەر (جارێکی تر) زینای کردەوە، ئەوە داری حەدی لێبدەن، پاشان ئەگەر زینای کردەوە[2] -لە سێیەم جار یان چوارەم جاردا- ئەوە بیفرۆشن، با بەگوریسێکی مووینیش بێت)).**

## ١٨ - بابٌ: إِذَا أَتَاهُ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ

٢٥٥٧- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: "إِذَا أَتَى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ، فَإِنْ لَمْ يُجْلِسْهُ مَعَهُ، فَلْيُنَاوِلْهُ لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ، أَوْ أُكْلَةً أَوْ أُكْلَتَيْنِ، فَإِنَّهُ وَلِيَ عِلاَجَهُ"[3].

---

(١) بڕوانە: ٢١٥٣.

(٢) داری حەدی لێبدا، ئینجا بیفرۆشێ.

(٣) بڕوانە: ٥٤٦٠.

## ١٨- باسێک: ئەگەر کەسێک خزمەتکارەکەی خواردنی بۆ هێنا

٢٥٥٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر كەسێك لەئێوە خزمەتكارەكەی خواردنی بۆ هێنا، جا ئەگەر لەگەڵ خۆی داینەنیشاند، دە با پاروویەك یان دوو پارووی[1] پێ بدات، چونكە بێگومان ئەو كۆیلەیە خواردنەكەی ئامادە كردووە و دروستی كردووە)).

## ١٩ - بابٌ: العَبْدُ رَاعٍ فِي مَالِ سَيِّدِهِ وَنَسَبَ النَّبِيُّ ﷺ المَالَ إِلَى السَّيِّدِ

٢٥٥٨- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: "كُلُّكُمْ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالإِمَامُ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ فِي أَهْلِهِ رَاعٍ وَهْوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالمَرْأَةُ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا رَاعِيَةٌ وَهْيَ مَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا، وَالخَادِمُ فِي مَالِ سَيِّدِهِ رَاعٍ وَهْوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ -قَالَ: فَسَمِعْتُ هَؤُلاَءِ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ وَأَحْسِبُ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: وَالرَّجُلُ فِي مَالِ أَبِيهِ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ- فَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ"[2].

## ١٩- باسێک: کۆیلە شوان و بەپرسیارە لە ماڵی گەورەکەیدا، پێغەمبەر ﷺ ماڵ و سامانی داوەتە پاڵ گەورەی کۆیلەکە

٢٥٥٨- زوهری دەڵێ: سالیمی كوڕی عەبدوڵڵا بۆی گێڕامەوە لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: كە ئەو لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست دەیفەرموو:

---

(١) (لقمة أو لقمتين) يان (أكلة أو أكلتين) بە یەک مانا دێن، گێڕەرەوەكەش دوو دڵ بووە كە كام لەو دوو ڕستە وتراوە، بۆیە هەردووكیانی هێناوە.

(٢) بڕوانە: ٨٩٣.

((هەمووتان شوان و بەرپرسن، وە بەرپرسیارن لە شوانییەكەتان، جا پێشەوا بەرپرسە و بەرپرسیارە لە بەرپرسیاریەتییەكەی، پیاو شوانە لەناوماڵ و منداڵیدا و بەرپرسیارە لە شوانیەتییەكەی، وە ئافرەت شوانە لە ماڵی مێردەكەیدا و بەرپرسیارە لە شوانیەتییەكەی، وە بەردەست و خزمەتكار شوانە لە ماڵی گەورەكەیدا و بەرپرسە لە شوانیەتییەكەی)). - ئیبنو عومەر ﷺ وتی: من ئا ئەمانەم لە پێغەمبەر ﷺ بیست، وا گومان دەبەم پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پیاو لەماڵی باوكیدا شوانە و بەرپرسیارە لە شوانیەتییەكەی -، جا هەمووتان شوانن، وە هەمووتان بەرپرسیارن لە شوانیەتییەكەتان)).

## ٢٠ - بابٌ : إِذَا ضَرَبَ العَبْدَ فَلْيَجْتَنِبِ الوَجْهَ

٢٥٥٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ قَالَ: وَأَخْبَرَنِي ابْنُ فُلَانٍ، عَنْ سَعِيدٍ المَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَحَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "إِذَا قَاتَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْتَنِبِ الوَجْهَ".

## ٢٠- باسێك: ئەگەر پیاوێك لە كۆیلەیدا، با خۆ بپارێزێ لەلێدانی دەم و چاو

٢٥٥٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە[١] لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر كەسێكتان بەشەڕ هات، با خۆ بپارێزێ لە لێدانی ڕووخسار)).

---

(١) ئەم فەرموودەیە بە دوو ڕشتە و سەنەد گێڕدراوەتەوە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ).

# ٥٠- كِتَابُ المُكَاتبِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٥٠- پەڕاوی نامە بۆ نووسراو[١]

### بابُ إثمِ مَنْ قذفَ مملوكهُ

### ١-بابُ المُكَاتَبِ وَنُجُومِهِ فِي كُلِّ سَنَةٍ نَجْمٌ

وَقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ﴿٣٣﴾ ﴾ النور. وَقَالَ رَوْحٌ، عَنِ ابن جُرَيْجٍ: قُلْتُ لِعَطَاءٍ: أَوَاجِبٌ عَلَيَّ إِذَا عَلِمْتُ لَهُ مَالًا أَنْ أُكَاتِبَهُ؟ قَالَ: مَا أُرَاهُ إِلَّا وَاجِبًا. وَقَالَه عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ: قُلْتُ لِعَطَاءٍ: أَتَاثُرُهُ عَنْ أَحَدٍ؟ قَالَ: لَا. ثُمَّ أَخْبَرَنِي أَنَّ مُوسَى بْنَ أَنَسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ سِيرِينَ سَأَلَ أَنَسًا المُكَاتَبَةَ -وَكَانَ كَثِيرَ المَالِ- فَأَبَى، فَانْطَلَقَ إِلَى عُمَرَ فَقَالَ كَاتِبْهُ. فَأَبَى، فَضَرَبَهُ بِالدِّرَّةِ وَيَتْلُو عُمَرُ: ﴿ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ﴿٣٣﴾ ﴾ النور، فَكَاتَبَهُ.

---

(١) مەبەست پێی ئەو کۆیلەیە گەورەکەی نامەی بۆ دەنووسی کە ڕێژەیەک پارە بدات بە گەورەکەی لەبەرانبەر ئازادکردنیدا، لە پاش نامە نووسینەکە ئیتر کۆیلەکە کار دەکات تا بیدات لە پێناو ئازادبوونی خۆیدا.

## باسی تاوانی ئەو کەسەی کۆیلەکەی بەداوێنپیسی تاوانبار کردبێت[1]

## ١- باسی کۆیلەی نامە بۆ نووسراو و دیاری کراوەکان و ڕێژەی پارەی دیاری کراو بۆ هەر ساڵێک (کە دەبێت کۆیلەکە بیدات بە گەورەکەی)

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە ئەوانەی داوای نووسراوی ئازادبوون دەکەن (بۆ کڕینەوەی خۆیان) لە بەندە و کەنیزەکەکانتان، ئەوە نووسراوی ئازادبوونیان لەگەڵ بنووسن (بۆ کڕینەوە و ئازادبوونی خۆیان) ئەگەر خێرتان لەواندا بەدی دەکرد، وە لەوماڵەی کە خوا بەئێوەی داوە پێیان بدەن). ڕەوح لە ئیبنو جورەیجەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: بەعەتام وت: ئایا واجبە لەسەرم ئەگەر زانیم کۆیلەکەم ماڵی هەیە نووسراوی ئازادبوونی لەگەڵدا بنووسم؟ عەتا وتی: من ڕام وایە واجبە. عەمری کوڕی دیناریش وتوویەتی: واجبە، ئیبنو جورەیج دەڵێ: وتم بە عەتا: ئەم ڕایە لە کەسێکی پێشووترەوە دەگێڕیتەوە؟ وتی: نەخێر، پاشان دواتر پێی وتم: کە مووسای کوڕی ئەنەس بۆی گێڕاوەتەوە کە سیرین[2] داوای لە ئەنەس کرد نامەی ئازادکردنی لەگەڵدا بنووسێت -وە ئەنەس سامانی زۆر بوو-، بۆیە نووسینی ئازادبوونی بۆ نەنووسی، جا سیرین ڕۆیشت بۆ لای عومەر ﷺ، عومەریش وتی (بەئەنەس): نووسراوی لەگەڵ بنووسە، ئەنەس هەر نەینووسی. بۆیە بەقامچی لێی دا و عومەر ئەم

---

(١) ئیمامی بوخاری هیچ فەرمووودەیەکی بۆ ئەم سەرە باسە نەهێناوە پێدەچێ بە بۆشی هێڵا بێتیەوە تا فەرموودەیەکی تیا بنوسێت کە بەمانای ئەو مەبەستە بێت بەڵام بۆی نەکراوە، بەڵام لە (کتاب الحدود، باب قذف العبید) ئەم فەرمودەی هێناوە:( مَن قَذَفَ مَمْلُوكَهُ، وَهو بَرِيءٌ ممَّا قالَ، جُلِدَ يَومَ القِيَامَةِ) بەژمارە (٦٨٥٨) جا پێدەچێت بەو فەرمودەی ئاماژەی کردبێت دەچێتە چوارچێوەی ئەم باسەوە:(إرشاد الساری: ٥٧٧/٥) .

(٢) کۆیلەی ئەنەسی کوڕی مالیک بوو.

ئایەتەی خوێندەوە: (نووسراویان لەگەڵ بنووسن ئەگەر خێرتان تێدا بەدی کردن)، ئینجا ئەنەس نووسراوی لەگەڵدا نووسی.

٢٥٦٠- وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂ إِنَّ بَرِيرَةَ دَخَلَتْ عَلَيْهَا تَسْتَعِينُهَا فِي كِتَابَتِهَا وَعَلَيْهَا خَمْسَةُ أَوَاقٍ، نُجِّمَتْ عَلَيْهَا فِي خَمْسِ سِنِينَ، فَقَالَتْ لَهَا عَائِشَةُ -وَنَفِسَتْ فِيهَا-: أَرَأَيْتِ إِنْ عَدَدْتُ لَهُمْ عَدَّةً وَاحِدَةً، أَيَبِيعُكِ أَهْلُكِ، فَأُعْتِقَكِ، فَيَكُونَ وَلاَؤُكِ لِي؟ فَذَهَبَتْ بَرِيرَةُ إِلَى أَهْلِهَا، فَعَرَضَتْ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ فَقَالُوا: لَا، إِلَّا أَنْ يَكُونَ لَنَا الوَلاَءُ، قَالَتْ عَائِشَةُ فَدَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ. فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: "اشْتَرِيهَا فَأَعْتِقِيهَا، فَإِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ". ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: "مَا بَالُ رِجَالٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللهِ؟ مَنِ اشْتَرَطَ شَرْطًا لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ فَهْوَ بَاطِلٌ، شَرْطُ اللهِ أَحَقُّ وَأَوْثَقُ"[١].

**٢٥٦٠- عوروە دەڵێ: عائیشە ﵂ وتی: بەریرە هات بۆ لای، داوای یارمەتی لێ کرد بۆ نووسراوەکەی (کە ئازاد ببێ)، کە پێنج ئۆقییەی لەسەرە بیدات، ئەو دابەش و دیاری کراوە لەسەری بەپێنج ساڵ بیدات، عائیشەش پێی وت-حەزیشی لێ بوو-: پێم بڵێ ئەگەر من هەر هەموو پارەکەیان بەیەکجار بدەمێ، ئایا خاوەنەکانت دەتفرۆشن، ئەوسا ئازادت کەم، وە هەقدارییەکەت[٢] بۆ من بێت؟ بەریرەش ڕۆیشت بۆ لای خاوەنەکەی و ئەو پێشنیارەی خستە بەردەمیان، ئەوانیش وتیان: نەخێر (ناتفرۆشین)، مەگەر هەقدارییەکەت بۆ ئێمە بێت، عائیشە وتی: منیش ڕۆیشتمە خزمەت پێغەمبەری خواو ﷺ ئەو باسەم بۆ**

---

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

(٢) هەقداری کەنیزەک یان کۆیلەی ئازادکراوە کە بە عەرەبی پێی دەڵێن: (الوَلاَءُ)، ئەو پەیوەندییەیە دوای مردنی کەنیزەک یان کۆیلەی ئازادکراو هەرچی ماڵ و سامانیان هەبوو بۆ ئازادکارەکەی دەبێت.

**گێڕایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ بە عائیشەی فەرموو: ((بیکڕە و ئازادی بکە، چونکە بێگومان هەقداری بۆ ئەو کەسەیە کۆیلەکە ئازاد دەکات))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو فەرمووی: ((ئەوە پیاوانێك بۆچی کۆمەڵە مەرجێك دادەنێن کە لەکتێبی خوای گەورەدا نییە؟ هەرکەس مەرجێك دابنێ لەقورئانەکەی خوادا نەبێت ئەوە بەتاڵە، مەرجی خوای گەورە بەهێزترو چەسپاوترە)).**

## ٢- بابُ مَا يَجُوزُ مِنْ شُرُوطِ المُكَاتَبِ، وَمَنِ اشْتَرَطَ شَرْطًا لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ

فيه ابنُ عُمر، عن النبي ﷺ.

٢٥٦١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ بَرِيرَةَ جَاءَتْ تَسْتَعِينُهَا فِي كِتَابَتِهَا، وَلَمْ تَكُنْ قَضَتْ مِنْ كِتَابَتِهَا شَيْئًا، قَالَتْ لَهَا عَائِشَةُ ارْجِعِي إِلَى أَهْلِكِ، فَإِنْ أَحَبُّوا أَنْ أَقْضِيَ عَنْكِ كِتَابَتَكِ، وَيَكُونَ وَلاَؤُكِ لِي فَعَلْتُ. فَذَكَرَتْ ذَلِكَ بَرِيرَةُ لأَهْلِهَا، فَأَبَوْا وَقَالُوا إِنْ شَاءَتْ أَنْ تَحْتَسِبَ عَلَيْكِ فَلْتَفْعَلْ، وَيَكُونَ وَلاَؤُكِ لَنَا، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: "ابْتَاعِي فَأَعْتِقِي، فَإِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ". قَالَ ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: "مَا بَالُ أُنَاسٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللهِ؟ مَنِ اشْتَرَطَ شَرْطًا لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ فَلَيْسَ لَهُ، وَإِنْ شَرَطَ مِائَةَ مَرَّةٍ، شَرْطُ اللهِ أَحَقُّ وَأَوْثَقُ"[١].

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

## ٢- باسی ئەو مەرجانەی کە دروستن لەگەڵ نووسراو کراودا، بنوسرێت وە کەسێک مەرجێک دابنێت لە کتێبی خوادا نەبێت

لەم باسەدا فەرموودەی ئیبنو عومەر ﷺ هەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە[١].

٢٥٦١- ئیبنو شیهاب لە عورِوە دەگێڕێتەوە کە عائیشە بۆی گێڕایەوە وتی: کە بەریرە هات داوای لێ کرد یارمەتی بدا (بۆ ئازادکردنی) لە نوسراوی ئازادوبونەکەیدا[٢]، کە هیچ پارەیەکی نوسراوی ئازادکردنەکەی نەدابوو، عائیشەش پێی وت : بڕۆرەوە بۆ لای خاوەنەکەت، جا ئەگەر حەزیان کرد پارەی ئازادکردنەکەت بدەم و هەقدارییەکەت [٣] بۆ من بێت، ئەوە دەیکەم، ئینجا بەریرە ئەو وتەی باسکرد بۆ خاوەنەکەی، بەڵام (خاوەنەکانی) ڕازی نەبوون، وتیان: ئەگەر ویستی پاداشتی ئازادکردنی تۆی هەبێت ئەوە با بیکات، هەقدارییەکەشت بۆ ئێمە بێت، ئینجا بەریرە ئەو وتەی (خاوەنەکەی بەعائیشە وت، ئەویش) عەرزی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە عائیشەی فەرموو: ((بیکڕە و ئازادی بکە، چونکە بەڕاستی هەقداری بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردووە))، دەڵێ: پاشان پێغەمبەر ﷺ هەڵسا و فەرمووی: ((ئەوە خەڵکانێك چییانە کۆمەڵە مەرجێك دادەنێن لە کتێبەکەی خوادا نییە؟ جا هەر کەس مەرجێك دابنێ لە کتێبی خوادا نەبێ، ئەوە هیچی بۆ نییە با سەد مەرجیش دابنێ، مەرجی خوا ڕاستتر و چەسپاوترە)).

---

(١) بڕوانە: ٢١٥٦.

(٢) کە لەگەڵ خاوەنەکەیدا نووسیویەتی بۆ ئازادکردنی.

(٣) هەقداری کەنیزەک یان کۆیلەی ئازادکراوە، ئەو پەیوەندییەیە دوای مردنیان هەرچیان هەبوو بۆ ئازادکارەکەیەتی.

٢٥٦٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: أَرَادَتْ عَائِشَةُ -أُمُّ الْمُؤْمِنِينَ- أَنْ تَشْتَرِيَ جَارِيَةً لِتُعْتِقَهَا، فَقَالَ أَهْلُهَا: عَلَى أَنَّ وَلاَءَهَا لَنَا. قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "لَا يَمْنَعُكِ ذَلِكِ، فَإِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ"[١].

**٢٥٦٢- عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: عائیشەی -دایکی باوەڕداران- ویستی کەنیزەکێك بکڕێت بۆ ئەوەی ئازادی بکات، جا خاوەنەکەی وتی: بەمەرجێك هەقدارییەکەی بۆ ئێمە بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (بە عائیشە) : ((با ئەو قسەیان ڕێگرت نەبێ، چونکە بێگومان هەقداری بۆ ئەو کەسەیە کۆیلەکەی ئازاد کردووە)).**

## ٣- بابُ اسْتِعَانَةِ الْمُكَاتَبِ، وَسُؤَالِهِ النَّاسَ

٢٥٦٣- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: جَاءَتْ بَرِيرَةُ فَقَالَتْ إِنِّي كَاتَبْتُ أَهْلِي عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ، فِي كُلِّ عَامٍ وَقِيَّةٌ، فَأَعِينِينِي. فَقَالَتْ عَائِشَةُ: إِنْ أَحَبَّ أَهْلُكِ أَنْ أَعُدَّهَا لَهُمْ عَدَّةً وَاحِدَةً، وَأُعْتِقَكِ فَعَلْتُ، وَيَكُونَ وَلاَؤُكِ لِي. فَذَهَبَتْ إِلَى أَهْلِهَا، فَأَبَوْا ذَلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ عَرَضْتُ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ، فَأَبَوْا إِلَّا أَنْ يَكُونَ الوَلاَءُ لَهُمْ. فَسَمِعَ بِذَلِكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَسَأَلَنِي فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: "خُذِيهَا، فَأَعْتِقِيهَا، وَاشْتَرِطِي لَهُمُ الوَلاَءَ، فَإِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ". قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي النَّاسِ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: "أَمَّا بَعْدُ، فَمَا بَالُ رِجَالٍ مِنْكُمْ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللهِ؟ فَأَيُّمَا شَرْطٍ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ فَهْوَ بَاطِلٌ، وَإِنْ كَانَ مِائَةَ شَرْطٍ، فَقَضَاءُ اللهِ أَحَقُّ، وَشَرْطُ اللهِ أَوْثَقُ، مَا بَالُ رِجَالٍ مِنْكُمْ يَقُولُ أَحَدُهُمْ: أَعْتِقْ يَا فُلاَنُ وَلِيَ الوَلاَءُ. إِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ"[٢].

---

(١) بڕوانە: ٢١٥٦.

(٢) بڕوانە: ٤٥٦.

# ٣- باسی داوای هاوکاری کۆیلەی نووسراو بۆ کراو، وە داواکردنی لە خەڵک (دروستە)

٢٥٦٣- عائیشە ﵂ وتی: بەریرە ﵂ هات بۆلام و وتی: خۆم کڕیوەتەوە لە گەورەکەم بەنۆ ئۆقییە[1]، بۆ هەر ساڵێك ئۆقییەیەك بدەم، جا یارمەتیم بدە. عائیشەش وتی: ئەگەر گەورەکانت پێی خۆشە من هەموو پارەکەیان بە یەکجار دەدەمێ، ئەوا من پارەکەیان دەدەمێ، وە ئازادت دەکەم و ئەوە دەیکەم، وە دەبێ هەقدارییەکەت بۆ من بێت. جا بەریرە ڕۆیشت بۆ لای گەورەکانی (و پێی وتن)، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون بەو (مەرجە) بۆی، بەریرە وتی: من ئەو پێشنیازەم خستە بەردەمیان و پێم وتن، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون مەگەر هەقدارییەکەم بۆ ئەوان بێت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بیست و پرسیاری لێ کردم، منیش هەواڵەکەم پێدا، جا فەرمووی: ((وەری بگرە و ئازادی بکە و هەقدارییەکە بەمەرج دابنێ بۆ ئەوان، چونکە بێگومان هەقداری بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردووە))، عائیشە ﵂ وتی: جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو خەڵکەکەدا هەستایەوەو سوپاس و ستایشی خوای کردو پاشان فەرمووی: ((دوای ئەوە... ئەوە پیاوانێك لەئێوە چییانە کۆمەڵە مەرجێك دادەنێن لە قورئانەکەی خوادا نییە؟ جا هەر مەرجێك کە لە قورئانەکەی خوادا نەبێت ئەوە بەتاڵە، باسەد مەرجیش بێت، کەواتە حوکمی خوا ڕاسترە، وە مەرجی خوا پتەوتر و بەهێزترە، ئەوە پیاوانێك لەئێوە چییانە کەسێکیان دەڵێ: فلانەکەس تۆ کۆیلەکەت ئازاد بکە و هەقدارییەکەی بۆ منە! بێگومان هەقداری بۆ ئەو کەسەیە بەندەکەی ئازاد کردووە)).

---

(١) هەر ئۆقییەک چل درهەم دەکات، واتە: نۆ ئۆقییەکە (٣٦٠) درهەم دەکات. بڕوانە:(إرشاد الساري: ٥/٥٨٤).

# ٤- بابُ بَيْعِ المُكَاتَبِ إِذَا رَضِيَ

وَقَالَتْ عَائِشَةُ: هُوَ عَبْدٌ مَا بَقِيَ عَلَيْهِ شَيْءٌ. وَقَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: مَا بَقِيَ عَلَيْهِ دِرْهَمٌ. وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: هُوَ عَبْدٌ إِنْ عَاشَ وَإِنْ مَاتَ وَإِنْ جَنَى، مَا بَقِيَ عَلَيْهِ شَيْءٌ.

# ٤- باسی فرۆشتنی کۆیلەی نووسراو بۆکراو (دروستە) ئەگەر کۆیلەکە رازی بێت

**عائیشە ﵂ دەڵێ: کۆیلەی نووسراو بۆکراو هەرکۆیلەیە تا بەشێك لەو پارەیەی لەسەریەتی مابێت و نەیدابێ. زەیدی کوڕی سابت دەڵێ: تا درهەمێکی لەسەر مابێت (هەر کۆیلەیە). ئیبنو عومەر دەڵێ: ئەو کۆیلەیەیە ئەگەر ژیا و ئەگەر مرد و ئەگەر تاوانی کرد، تا شتێك پارەی لەسەر مابێت و نەیدابێت (هەر کۆیلەیە).**

٢٥٦٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ بَرِيرَةَ جَاءَتْ تَسْتَعِينُ عَائِشَةَ أُمَّ المُؤْمِنِينَ ﵂، فَقَالَتْ لَهَا: إِنْ أَحَبَّ أَهْلُكِ أَنْ أَصُبَّ لَهُمْ ثَمَنَكِ صَبَّةً وَاحِدَةً فَأُعْتِقَكِ فَعَلْتُ. فَذَكَرَتْ بَرِيرَةُ ذَلِكَ لأَهْلِهَا، فَقَالُوا: لَا، إِلَّا أَنْ يَكُونَ وَلاَؤُكِ لَنَا. قَالَ مَالِكٌ: قَالَ يَحْيَى: فَزَعَمَتْ عَمْرَةُ أَنَّ عَائِشَةَ ذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: "اشْتَرِيهَا وَأَعْتِقِيهَا، فَإِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ"[1].

**٢٥٦٤- عەمرەی کچی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە کە بەریرە ﵂ هات، داوای یارمەتی لە عائیشەی دایکی باوەڕداران ﵂ کرد، ئەویش پێی وت: ئەگەر گەورەکانت پێیان خۆشە من هەموو نرخەکەی تۆیان بەیەکجار دەدەمێ و ئازادت بکەم، ئەوە ئەو کارە دەکەم، بەریرەش ئەوەی بۆ خاوەنەکانی باسکرد،**

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

ئەوانیش وتیان: نەخێر (ناتفرۆشین)، مەگەر هەقدارییەکەت بۆ ئێمە بێت. مالیك وتی: یەحیا وتی: عەمرە دەڵێ: عائیشە ﵂ ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، ئەویش فەرموی: ((بیکرە و ئازادی بکە، چونکە بێگومان هەقداری بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردووە)).

## ٥ - بابٌ: إِذَا قَالَ الْمُكَاتَبُ: اشْتَرِنِي وَأَعْتِقْنِي، فَاشْتَرَاهُ لِذَلِكَ

٢٥٦٥- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ بْنُ أَيْمَنَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي أَيْمَنُ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ ﵂ فَقُلْتُ: كُنْتُ غُلاَمًا لِعُتْبَةَ بْنِ أَبِي لَهَبٍ، وَمَاتَ وَوَرِثَنِي بَنُوهُ، وَإِنَّهُمْ بَاعُونِي مِنَ ابْنِ أَبِي عَمْرٍو، فَأَعْتَقَنِي ابْنُ أَبِي عَمْرٍو، وَاشْتَرَطَ بَنُو عُتْبَةَ الوَلاَءَ. فَقَالَتْ: دَخَلَتْ بَرِيرَةُ وَهْيَ مُكَاتَبَةٌ فَقَالَتِ اشْتَرِينِي وَأَعْتِقِينِي. قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَتْ: لَا يَبِيعُونِي حَتَّى يَشْتَرِطُوا وَلاَئِي. فَقَالَتْ لَا حَاجَةَ لِي بِذَلِكَ. فَسَمِعَ بِذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺأَوْ بَلَغَهُ- فَذَكَرَ لِعَائِشَةَ، فَذَكَرَتْ عَائِشَةُ مَا قَالَتْ لَهَا، فَقَالَ: "اشْتَرِيهَا وَأَعْتِقِيهَا، وَدَعِيهِمْ يَشْتَرِطُونَ مَا شَاءُوا". فَاشْتَرَتْهَا عَائِشَةُ فَأَعْتَقَتْهَا، وَاشْتَرَطَ أَهْلُهَا الوَلاَءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ، وَإِنِ اشْتَرَطُوا مِائَةَ شَرْطٍ"[1].

## ٥- باسێك: ئەگەر كۆیلەی نووسراو بۆكراو بڵێ بەكەسێك: بمكڕە و ئازادم بكە، ئەو كەسەش كڕی بۆ ئەو مەبەستە (دروستە)

٢٥٦٥- ئەبی ئەیمەن دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای عائیشە ﵂ وتم: من غوڵامی عوتبەی کوڕی ئەبو لەهەب بووم، وە عوتبە مردو من بوومە میراتی کوڕەکانی،

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

وە کوڕانی عوتبە فرۆشتمیان بەئیبنو ئەبو عەمر، ئیبنو ئەبو عەمریش ئازادی کردم، کوڕانی عوتبە هەقدارییان بەمەرج دانابوو (لە فرۆشتنەکەدا)، عائیشەش وتی: بەریرە هاتەلام ئەو نووسراوی خۆکڕینەوەی کردبوو، جاوتی بەمن: من بکڕە و ئازادم بکە، عائیشەش وتی: بەڵێ باشە، بەریرە وتی: خاوەنەکانم نامفرۆشن هەتا هەقداریم بۆ ئەوان نەبێ، عائیشەش وتی: من پێویستیم بەوە نییە، جا پێغەمبەر ﷺ گوێی لەو قسانە بوو -یان پێی گەیشت-، ئینجا (بەریرە) بۆ عائیشەی باس کرد، عائیشەش بۆی گێڕایەوە چی بە بەریرە وتووە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بیکڕە و ئازادی کە، وە وازیان لێ بێنە هەر مەرجێکیان حەز لێیە با دابنێن))، ئیتر عائیشەش کڕی و ئازادی کرد، خاوەنەکەشی مەرجی هەقداری دانا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەقداری بۆ ئەو کەسەیە بەندەکەی ئازاد کردووە با سەد مەرجیش دانێن)).

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٥١- (كِتابُ الهِبَةِ)وَفَضْلِهَا وَالتَّحْرِيضِ عليْهَا

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٥١- پەڕاوی بەخشین و خەڵات [1] و گەورەیی و هاندان لەسەری

### ١-بابٌ

٢٥٦٦- حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ المَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "يَا نِسَاءَ المُسْلِمَاتِ، لَا تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا، وَلَوْ فِرْسِنَ شَاةٍ" [2].

### ١- باسێک

**٢٥٦٦- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((ئەی ئافرەتانی مسوڵمان! هیچ دراوسێیەك خەڵاتی دراوسێیەكەی بەكەم نەزانێت، با سمی مەڕێكیش بێت)).**

٢٥٦٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأُوَيْسِيُّ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ رُومَانَ عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ لِعُرْوَةَ: ابْنَ أُخْتِي، إِنْ كُنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى الهِلاَلِ ثُمَّ الهِلاَلِ، ثُمَّ الهِلاَلِ، ثَلاَثَةَ أَهِلَّةٍ فِي شَهْرَيْنِ، وَمَا أُوقِدَتْ فِي

---

(١) الهِبَةِ: بەخشین و خەڵات: پێدانی ماڵێکە، یان کەڵک و سوودی شتێکە بە کەسێک بێ بەرانبەر لە ژیانی دونیادا.(إرشاد الساري: ٣/٦).

(٢) بڕوانە: ٦٠١٧.

أَبْيَاتِ رَسُولِ اللهِ ﷺ نَارٌ. فَقُلْتُ يَا خَالَةُ، مَا كَانَ يُعِيشُكُمْ؟ قَالَتِ: الأَسْوَدَانِ التَّمْرُ وَالمَاءُ، إِلَّا أَنَّهُ قَدْ كَانَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ جِيرَانٌ مِنَ الأَنْصَارِ كَانَتْ لَهُمْ مَنَائِحُ، وَكَانُوا يَمْنَحُونَ رَسُولَ اللهِ ﷺ مِنْ أَلْبَانِهِمْ، فَيَسْقِينَا.

**٢٥٦٧- عوروه له عائیشەوه ﵂ دەگێڕێتەوە کە عائیشە بەعوروەی وت: خوشکەزای خۆم ئێمە سەیری مانگی یەك شەوەمان دەکرد، پاشان مانگێکی یەك شەوەی تر، پاشان مانگێکی یەك شەوەی تر، (سەیری) سێ مانگی یەك شەوە(مان دەکرد) لە دوو مانگدا، (لەو ماوەیەدا) لە ماڵەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئاگر نەکراوەتەوە، منیش وتم: پورێ! ئەی بەچی دەژیان؟! عائیشە وتی: دوو خواردنە ڕەشەکە[1]: خورما و ئاو، بەڵام بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ چەند دراوسێیەکی ئەنصارییان هەبوو، ئاژەڵی شیرداریان هەبوو، لە شیری ئەو ئاژەڵانەیان دەهێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش دەیدا پێمان بیخۆینەوە.**

## ٢- بابُ القليلِ منَ الهبَةِ

٢٥٦٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "لَوْ دُعِيتُ إِلَى ذِرَاعٍ أَوْ كُرَاعٍ لأَجَبْتُ، وَلَوْ أُهْدِيَ إِلَيَّ ذِرَاعٌ أَوْ كُرَاعٌ لَقَبِلْتُ"[2].

## ٢- باسی بەخشینێکی کەم

**٢٥٦٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر دەعوەت بکرێم بۆ باسکە مەڕێك یان قاچە مەڕێك دەچم، بەدەم دەعوەتەکەوە، وە ئەگەر بەدیاریش باسکە مەڕێك یان قاچە مەڕێکم بۆ بهێنرێت، بەدڵنیاییەوە وەری دەگرم)).**

(١) خورما ڕەشە و ئاویش ڕەنگی نییە، بەڵام ڕەشی خورماکە کراوە بەناو بۆ هەردووکیان.(إرشاد الساري: ٦/٦).

(٢) بروانە: ٥١٧٨.

## ٣- بابُ مَن اسْتَوْهَبَ مِنْ أصْحَابِهِ شَيْئًا

وَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "اضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ سَهْمًا"[1].

٢٥٦٩- حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَرْسَلَ إِلَى امْرَأَةٍ مِنَ المُهَاجِرِينَ، وَكَانَ لَهَا غُلاَمٌ نَجَّارٌ، قَالَ لَهَا: "مُرِي عَبْدَكِ فَلْيَعْمَلْ لَنَا أَعْوَادَ المِنْبَرِ". فَأَمَرَتْ عَبْدَهَا، فَذَهَبَ فَقَطَعَ مِنَ الطَّرْفَاءِ، فَصَنَعَ لَهُ مِنْبَرًا، فَلَمَّا قَضَاهُ أَرْسَلَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَدْ قَضَاهُ، قَالَ ﷺ: "أَرْسِلِي بِهِ إِلَيَّ". فَجَاءُوا بِهِ، فَاحْتَمَلَهُ النَّبِيُّ ﷺ فَوَضَعَهُ حَيْثُ تَرَوْنَ[2].

## ٣- باسی کەسێک داوای بەشێک لە هاوڕێکانی بکات

**ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لەگەڵ بەشەکانی خۆتان بەشێکیش بۆ من دانێن)).**

**٢٥٦٩- سەهل ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ لای ئافرەتێك لە کۆچەران، کە غولامێکی دارتاشی هەبوو، فەرمووی بەو ئافرەتە: ((فەرمان بە بەندەکەت بکە کە دوانگەیەکمان لەدار و تەختە بۆ دروست بکات))، ئافرەتەکەش فەرمانی بە بەندەکەی کرد، بەندەکەش ڕۆیشت (لەغابە) دارگەزی بڕی و دوانگەیەکی بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست کرد، ئینجا کە تەواوی کرد، ئافرەتەکە هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ کە بەندەکە دوانگەکەی تەواوکردوە، پێغەمبەریش فەرمووی (بەئافرەتەکە): ((بەو بەندەیەدا بۆم بنێرە))، ئینجا**

---

(١) بڕوانە: ٢٢٧٦.

(٢) بڕوانە: ٣٧٧.

هێنایان، پێغەمبەر ﷺ (فەرمانی کرد و کەسێك) هەڵی گرت، ئا لەو جێگایەی کە دەیبینن (ئێستا دانراوە) دای نا[١].

٢٥٧٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ السَّلَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ يَوْمًا جَالِسًا مَعَ رِجَالٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فِي مَنْزِلٍ فِي طَرِيقِ مَكَّةَ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ نَازِلٌ أَمَامَنَا، وَالقَوْمُ مُحْرِمُونَ، وَأَنَا غَيْرُ مُحْرِمٍ، فَأَبْصَرُوا حِمَارًا وَحْشِيًّا، وَأَنَا مَشْغُولٌ أَخْصِفُ نَعْلِي، فَلَمْ يُؤْذِنُونِي بِهِ، وَأَحَبُّوا لَوْ أَنِّي أَبْصَرْتُهُ، وَالتَفَتُّ فَأَبْصَرْتُهُ، فَقُمْتُ إِلَى الفَرَسِ فَأَسْرَجْتُهُ، ثُمَّ رَكِبْتُ وَنَسِيتُ السَّوْطَ وَالرُّمْحَ، فَقُلْتُ لَهُمْ: نَاوِلُونِي السَّوْطَ وَالرُّمْحَ. فَقَالُوا: لَا وَاللهِ، لَا نُعِينُكَ عَلَيْهِ بِشَيْءٍ. فَغَضِبْتُ فَنَزَلْتُ فَأَخَذْتُهُمَا، ثُمَّ رَكِبْتُ، فَشَدَدْتُ عَلَى الحِمَارِ فَعَقَرْتُهُ، ثُمَّ جِئْتُ بِهِ وَقَدْ مَاتَ، فَوَقَعُوا فِيهِ يَأْكُلُونَهُ، ثُمَّ إِنَّهُمْ شَكُّوا فِي أَكْلِهِمْ إِيَّاهُ، وَهُمْ حُرُمٌ، فَرُحْنَا وَخَبَأْتُ العَضُدَ مَعِي، فَأَدْرَكْنَا رَسُولَ اللهِ ﷺ فَسَأَلْنَاهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: "مَعَكُمْ مِنْهُ شَيْءٌ؟ ". فَقُلْتُ: نَعَمْ. فَنَاوَلْتُهُ العَضُدَ فَأَكَلَهَا، حَتَّى نَفَّدَهَا وَهْوَ مُحْرِمٌ. فَحَدَّثَنِي بِهِ زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ عن النَّبِيِّ ﷺ[٢].

**٢٥٧٠- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی قەتادەی سەلەمی لە باوکیەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە دەڵێ: من ڕۆژێك لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووم لە جێگایەکدا لەڕێگای مەککە، پێغەمبەری خواش ﷺ لە پێشی ئێمەوە لایدابوو و دابەزیبوو، خەڵکەکەش ئیحرامیان بەستبوو، بەڵام من ئیحرامم نەبەستبوو،**

---

(١) بڕگەی کۆتایی فەرمودەکە وا دەگەیەنێت کە پێغەمبەر ﷺ دوانگەکەی هەڵگرت و داینا، بەڵام وەک لەگێڕانەوەیەکی تری بوخاریدا هاتووە هاوەڵان ئەو کارەیان کردووە بە فەرمانی ئەو (فەرموودەی: ٩١٧)، بوخاری لەنامەی نوێژ باسی وتاردان لەسەر دوانگە هێناویەتی.

(٢) بڕوانە: ١٨٢١.

ئینجا هاوەڵان کەرەکێوییەکیان بینی، لەو کاتەدا من خەریك بووم پێڵاوەکەم دەدوورییەوە (و چاکم دەکرد)، ئاگاداریان نەکردمەوە لێی، حەزیان دەکرد و ئاواتە خوازبوون من کەرە کێوییەکەم بدیبایە، منیش لامکردەوە و بینیم، یەکسەر ڕۆیشتم بۆ لای ئەسپەکەم و زینەکەم لێ کرد، پاشان سواری بووم، قامچی و ڕمەکەم لەبیر چوو، پێم وتن: قەمچی و ڕمەکە بدەن بەدەستمەوە، وتیان: نا سوێند بەخوا بەهیچ شتێك یارمەتیت نادەین بۆ (کوشتنی)، منیش توڕەبووم و دابەزیم، هەردووکیانم هەڵگرتەوە، پاشان سوار بوومەوە، هێرشم برد بۆ کەرەکێویەکەو کوشتم (و سەرم بڕی)، پاشان هێنامەوە بەمردوویی، جا تێی بەربوون و دەیانخوارد، پاشان گومانیان بوو لە دروستی خواردنی، کە ئەوان لەئیحرامدا بوون، ئینجا ڕۆیشتین، وە من دەستێکیم هەڵگرت (شاردمەوە)، پاشان گەیشتین بە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری ئەوەمان لێ کرد، فەرمووی ﷺ: ((هیچتان پێماوە لە گۆشتەکەی)) وتم: بەڵێ، جا دەستەکەیم پێدا و خواردی هەتا هەمووی تەواو کرد، لە کاتێکدا لەئیحرامدا بوو. (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئینجا زەیدی کوڕی ئەسلەم بۆی گێرامەوە لە عەتای کوڕی یەسارەوە، لە ئەبی قەتادەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە.

## ٤- بابُ مَنِ اسْتَسْقَى

وَقَالَ سَهْلٌ قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: "اسْقِنِي"[١].

٢٥٧١- حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلَالٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو طَوَالَةَ -اسْمُهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ- قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ يَقُولُ: أَتَانَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي دَارِنَا هَذِهِ،

---

(١) بڕوانە: ٥٢٥٦.

فَاسْتَسْقَى، فَحَلَبْنَا لَهُ شَاةً لَنَا، ثُمَّ شُبْتُهُ مِنْ مَاءِ بِئْرِنَا هَذِهِ، فَأَعْطَيْتُهُ وَأَبُو بَكْرٍ عَنْ يَسَارِهِ، وَعُمَرُ تُجَاهَهُ، وَأَعْرَابِيٌّ عَنْ يَمِينِهِ، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ عُمَرُ: هَذَا أَبُو بَكْرٍ. فَأَعْطَى الأَعْرَابِيَّ فَضْلَهُ، ثُمَّ قَالَ: "الأَيْمَنُونَ، الأَيْمَنُونَ، أَلاَ فَيَمِّنُوا". قَالَ أَنَسٌ: فَهْيَ سُنَّةٌ، فَهْيَ سُنَّةٌ. ثَلاَثَ مَرَّاتٍ[1].

## ٤- باسی كەسێك داوای ئاو بكات بیخواتەوە

**سەهل دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: ((ئاوم بۆ بێنە بیخۆمەوە)).**

**٢٥٧١- سولەیمانی كوڕی بیلال دەڵێ: ئەبو تەواله -كە ناوی عەبدوڵڵای كوڕی عەبدوڕەحمانە- وتی: لە ئەنەسم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەم ماڵ و خانووەماندا هات بۆ ماڵمان و داوای ئاوی خواردنەوەی كرد، ئێمەش مەڕێكمان هەبوو بۆمان دۆشی، پاشان شیرەكەم تێكەڵ كرد لەگەڵ ئاوی ئەم بیرەمان، جا دام بەپێغەمبەر ﷺ، ئەبو بەكریش لای چەپییەوە بوو، عومەریش لە بەرانبەریدا بوو، عەرەبێكی دەشتەكیش لای ڕاستییەوە بوو، جا كە لێ بوویەوە، عومەر وتی: ئەوە ئەبو بەكرە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەرماوەكەی دا بە عەرەبە دەشتەكییەكە، پاشان فەرمووی: ((بیدە بەوانەی لای ڕاست، بیدە بەوانەی لای ڕاست، جا ئاگاداربن بەلای ڕاست بیگێڕن))، ئەنەس وتی: ئەو لەڕاستەوە (دەست پێكردنە) سوننەتە، ئەوە سوننەتە، سێ جار دووبارەی كردەوە.**

## ٥- بابُ قَبُولِ هَدِيَّةِ الصَّيْدِ

وَقَبِلَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ أَبِي قَتَادَةَ عَضُدَ الصَّيْدِ[2].

**٢٥٧٢-** حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدِ بْنِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: أَنْفَجْنَا أَرْنَبًا بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَسَعَى القَوْمُ فَلَغَبُوا، فَأَدْرَكْتُهَا فَأَخَذْتُهَا، فَأَتَيْتُ

---

(١) بڕوانە: ٢٣٥٢.

(٢) بڕوانە: ١٨٢١.

بِهَا أَبَا طَلْحَةَ فَذَبَحَهَا، وَبَعَثَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ بِوَرِكِهَا -أَوْ فَخِذَيْهَا، قَالَ: فَخِذَيْهَا. لَا شَكَّ فِيهِ- فَقَبِلَهُ. قُلْتُ: وَأَكَلَ مِنْهُ؟ قَالَ: وَأَكَلَ مِنْهُ. ثُمَّ قَالَ بَعْدُ: قَبِلَهُ[1].

## ٥- باسی وەرگرتنی نێچیری دیاری (لە ڕاوچی)

**پێغەمبەر دەست و شانی نێچیرەکەی[2] لە ئەبو قەتادە وەرگرت.**

**٢٥٧٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە (مَرِّ الظَّهْرَانِ)[3] کەروێشکێکمان هەڵساند و ڕاو نا، خەڵکەکە ڕایان کرد بەشوێنیدا، ماندوو بوون (و نەیانگرت)، بەڵام من پێی گەیشتم و گرتم، ئینجا هێنام بۆ ئەبو تەڵحەو ئەویش سەری بڕی، نەرمە ڕانێکی -یان دوو ڕانەکەی، (شوعبە) دەڵێ: دوو ڕانەکەی، گومانی تێدا نییە[4]- نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ وەریگرت، وتم : لێشی خوارد؟ وتی: لێشی خوارد، پاشان دواتر وتی: وەریگرت.**

## ٦- باب قَبُولِ الهَدِيَّةِ

**٢٥٧٣-** حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ ﷺ أَنَّهُ أَهْدَى لِرَسُولِ اللهِ ﷺ حِمَارًا وَحْشِيًّا وَهْوَ بِالأَبْوَاءِ -أَوْ بِوَدَّانَ- فَرَدَّ عَلَيْهِ، فَلَمَّا رَأَى مَا فِي وَجْهِهِ قَالَ: "أَمَا إِنَّا لَمْ نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إِلَّا أَنَّا حُرُمٌ"[5].

---

(١) بڕوانە: ٥٤٨٩، ٥٥٣٥.

(٢) کە کەرە وەحشییەک بوو، بڕوانە فەرموودەی: (٢٥٧٠)صەحیحی بوخاری.

(٣) شوێنێکە پێنج میل لە مەککەوە دوورە.

(٤) لە پێشدا وتی: نەرمەڕانێکی یان دوو ڕانەکەی، گومانی هەبوو، بەڵام دواتر وتی: دوو ڕانەکەی بەبێ گومان.

(٥) بڕوانە: ١٨٢٥.

## ٦- باسی وەرگرتنی دیاری

**٢٥٧٣- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ لە صەعبی کوڕی جەسامەوە دەگێڕێتەوە کە کەرەکێوییەکی بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لە ئەبوا -یان وەددان- بوو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ دایەوە پێی، ئینجا کە پێغەمبەر ﷺ پێناخۆش بوونی لە دەم و چاویدا بینی فەرمووی: (دڵنیابە تەنها لەبەر ئەوەی لە ئیحرامداین لێمان وەرنەگرتی و پێمان دایتەوە)).**

## ٧- بابُ قَبُولِ الهَدِيَّةِ[1]

**٢٥٧٤-** حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عَائِشَةَ، يَبْتَغُونَ بِهَا -أَوْ يَبْتَغُونَ بِذَلِكَ- مَرْضَاةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ[2].

## ٧- باسی وەرگرتنی خەڵات

**٢٥٧٤- هیشام لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لە عائیشە ﷺ کە خەڵکی دەیانویست کە دیاری بردنەکەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ لەسەری ماڵی عائیشەدا بێت، -یان دەیانویست بەبردنی لەوکاتەدا- ڕەزامەندی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەست بێنن.**

**٢٥٧٥-** حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ إِيَاسٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: أَهْدَتْ أُمُّ حُفَيْدٍ -خَالَةُ ابْنِ عَبَّاسٍ- إِلَى النَّبِيِّ ﷺ أَقِطًا وَسَمْنًا

---

(١) ئیبنو حەجەر دەڵێ: ئەمە دووبارە بونەوەیەکی بێ سودە، لە ڕیوایەتی ئەبی زەڕدا ئەم سەرەباسە هاتووە، بەڵام نەسەفی بە(باب من قبل الهدية) هێناوەیەتی.(فتح الباري:٦/٢٥٤).

(٢) بڕوانە: ٢٥٨٠، ٢٥٨١، ٣٧٧٥.

وَأَضُبًّا، فَأَكَلَ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ الأَقِطِ وَالسَّمْنِ، وَتَرَكَ الضَّبَّ تَقَذُّرًا. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَأُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَلَوْ كَانَ حَرَامًا مَا أُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ"[1].

**٢٥٧٥- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: دایکی حوفەید - کە پوری ئیبنو عەبباسە ﷺ - کەشك و ڕۆن و چەند بزن مژەیەکی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا پێغەمبەر ﷺ لەکەشك و ڕۆنەکەی خوارد، بەڵام وازی لەبزن مژەکە هێنا لەبەر بێزهاتنەوەی لێی، ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەو بزن مژەیە لەسەر خوانی پێغەمبەری خوا ﷺ خورا، وە ئەگەر حەڕام بوایە لەسەر خوانی پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەخورا.**

٢٥٧٦- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، حَدَّثَنَا مَعْنٌ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أُتِيَ بِطَعَامٍ سَأَلَ عَنْهُ: "أَهَدِيَّةٌ أَمْ صَدَقَةٌ" فَإِنْ قِيلَ: صَدَقَةٌ. قَالَ لأَصْحَابِهِ: "كُلُوا". وَلَمْ يَأْكُلْ، وَإِنْ قِيلَ: هَدِيَّةٌ. ضَرَبَ بِيَدِهِ ﷺ فَأَكَلَ مَعَهُمْ.

**٢٥٧٦- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر خواردنێکیان بۆ بهێنایە، پرسیاری ئەو خواردنەی دەکرد: ((ئایا دیارییە یان خێر؟)) جا ئەگەر بوترایە: خێرە، بە هاوەڵانی دەفەرموو: ((بخۆن))، خۆی نەیدەخوارد، بەڵام ئەگەر بوترایە: دیاریە، خۆشی دەستی بۆ دەبرد و لەگەڵیاندا دەیخوارد.**

٢٥٧٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِلَحْمٍ فَقِيلَ: تُصُدِّقَ عَلَى بَرِيرَةَ. قَالَ: "هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ، وَلَنَا هَدِيَّةٌ".

**٢٥٧٧- ئەنەس ﷺ دەڵێ: گۆشتێکیان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا وترا: خێرێکە بە بەریرە کراوە، ئەویش فەرمووی: ((ئەو گۆشتە بۆ بەریرە خێرە و بۆ ئێمە دیارییە)).**

(١) بروانە: ٥٣٨٩، ٥٤٠٢، ٧٣٥٨.

٢٥٧٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ قَالَ: سَمِعْتُهُ مِنْهُ، عَنِ القَاسِمِ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ بَرِيرَةَ، وَأَنَّهُمُ اشْتَرَطُوا وَلاَءَهَا، فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "اشْتَرِيهَا فَأَعْتِقِيهَا، فَإِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ". وَأُهْدِيَ لَهَا لَحْمٌ، فَقَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: "هَذَا تُصُدِّقَ عَلَى بَرِيرَةَ هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ وَلَنَا هَدِيَّةٌ". وَخُيِّرَتْ. قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ زَوْجُهَا حُرٌّ أَوْ عَبْدٌ قَالَ شعْبَة: سَأَلْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ عَنْ زَوْجِهَا، قَالَ: لَا أَدْرِي أَحرّ أَمْ عبد[1].

**٢٥٧٨- قاسیم دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە رضي الله عنها کە ویستی بەریڕە بکڕێت، خاوەنەکانی وەلائیان بەمەرج گرت، جا ئەمە بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکرا، ئەویش فەرمووی (بەعائیشە): ((بیکڕە و ئازادی بکە، چونکە بێگومان هەقداری بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردووە))، وە گۆشتێك بەدیاری هێنرا بۆ (بەریڕە)، پێغەمبەریش فەرمووی: ((ئەم گۆشتە خێرە بەبەریڕە کراوە؟ بۆ ئەو خێرە و بۆ ئێمە دیارییە))، وە بەریڕە سەرپشك کرا[2]، عەبدوڕەحمان دەڵێ: مێردەکەی ئازادە یان کۆیلەیە؟ شوعبە دەڵێ: پرسیارم لە عەبدوڕەحمان کرد دەربارەی مێردەکەی بەریڕە، عەبدوڕەحمان وتی: نازانم ئازاد بوو یان کۆیلە بوو.**

٢٥٧٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الحَسَنِ، أَخْبَرَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى عَائِشَةَ رضي الله عنها فَقَالَ: "عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ ". قَالَتْ لَا، إِلَّا شَيْءٌ بَعَثَتْ بِهِ أُمُّ عَطِيَّةَ مِنَ الشَّاةِ التِي بُعِثَت إِلَيْهَا مِنَ الصَّدَقَةِ. قَالَ: "إِنَّهَا قَدْ بَلَغَتْ مَحِلَّهَا"[3].

---

(١) بروانە: ٤٥٦.

(٢) لە نێوان مانەوە لای مێردەکەی و جیابوونەوە لێی.

(٣) بروانە: ١٤٤٦.

**٢٥٧٩- ئوممو عەتییە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چووە ماڵی عائیشە ﵂ و فەرمووی: ((هیچتان هەیە؟)) عائیشەش وتی: نەخێر، پشکێك نەبێ کە ئوممو عەتییە ناردوویەتی لە مەڕێکی خێر کە بۆی نێردراوە، فەرمووی: ((بێگومان ئەو خێرە گەیشتۆتە شوێنی خۆی[1] و حەڵاڵ بوو)).**

## ٨- بابُ مَنْ أَهْدَى إِلَى صَاحِبِهِ، وَتَحَرَّى بَعْضَ نِسَائِهِ دُونَ بَعْضٍ

٢٥٨٠- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّاسُ يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمِي. وَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: إِنَّ صَوَاحِبِي اجْتَمَعْنَ. فَذَكَرَتْ لَهُ، فَأَعْرَضَ عَنْهَا[2].

## ٨- باسی کەسێک دیاری بنێرێت بۆ هاوڕێیەکی مەبەستی بێت (دیارییەکەی) بۆ ماڵی خێزانێکی بەرێت لەناو خێزانەکانیدا

**٢٥٨٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: خەڵکی بۆ هێنانی دیارییەکانیان (بۆ پێغەمبەر ﷺ) بەدوای ئەو ڕۆژەدا دەگەڕان پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی من بێت، ئوممو سەلەمە ﵂ وتی: ئافرەتانی هاوڕێم (لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی من) کۆبوونەوە، منیش (قسەی خێزانەکانیم[3])) بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکرد، بەڵام پێغەمبەر ﷺ گوێی بە قسەکەی ئەو (ئوممو سەلەمە) نەدا.**

٢٥٨١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَخِي، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ نِسَاءَ رَسُولِ اللهِ ﷺ كُنَّ حِزْبَيْنِ: فَحِزْبٌ فِيهِ عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ وَصَفِيَّةُ

---

(١) واتە: بەوەرگرتنی ئوممو عەتیە خێر بۆتە ماڵی، ئەویش وەک دیاری ناردوویەتی بۆ عائیشە.

(٢) بڕوانە: ٢٥٧٤.

(٣) کە پێغەمبەر ﷺ بەخەڵک بڵێ لە هەر ماڵێک بوو دیارییەکەی بۆ ببەن.

وَسَوْدَةُ، وَالحِزْبُ الآخَرُ أُمُّ سَلَمَةَ وَسَائِرُ نِسَاءِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَكَانَ المُسْلِمُونَ قَدْ عَلِمُوا حُبَّ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَائِشَةَ، فَإِذَا كَانَتْ عِنْدَ أَحَدِهِمْ هَدِيَّةٌ يُرِيدُ أَنْ يُهْدِيَهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ أَخَّرَهَا، حَتَّى إِذَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي بَيْتِ عَائِشَةَ بَعَثَ صَاحِبُ الهَدِيَّةِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي بَيْتِ عَائِشَةَ.

فَكَلَّمَ حِزْبُ أُمِّ سَلَمَةَ، فَقُلْنَ لَهَا: كَلِّمِي رَسُولَ اللهِ ﷺ يُكَلِّمُ النَّاسَ، فَيَقُولُ: مَنْ أَرَادَ أَنْ يُهْدِيَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ هَدِيَّةً فَلْيُهْدِهِ إِلَيْهِ حَيْثُ كَانَ مِنْ بُيُوتِ نِسَائِهِ، فَكَلَّمَتْهُ أُمُّ سَلَمَةَ بِمَا قُلْنَ، فَلَمْ يَقُلْ لَهَا شَيْئًا، فَسَأَلْنَهَا. فَقَالَتْ: مَا قَالَ لِي شَيْئًا. فَقُلْنَ لَهَا: فَكَلِّمِيهِ. قَالَتْ: فَكَلَّمَتْهُ حِينَ دَارَ إِلَيْهَا أَيْضًا، فَلَمْ يَقُلْ لَهَا شَيْئًا، فَسَأَلْنَهَا. فَقَالَتْ مَا قَالَ لِي شَيْئًا. فَقُلْنَ لَهَا: كَلِّمِيهِ حَتَّى يُكَلِّمَكِ. فَدَارَ إِلَيْهَا فَكَلَّمَتْهُ، فَقَالَ لَهَا: "لَا تُؤْذِينِي فِي عَائِشَةَ، فَإِنَّ الوَحْيَ لَمْ يَأْتِنِي، وَأَنَا فِي ثَوْبِ امْرَأَةٍ إِلَّا عَائِشَةَ". قَالَتْ: فَقَالَتْ: أَتُوبُ إِلَى اللهِ مِنْ أَذَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ.ثُمَّ إِنَّهُنَّ دَعَوْنَ فَاطِمَةَ بِنْتَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَأَرْسَلْتْ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ تَقُولُ: إِنَّ نِسَاءَكَ يَنْشُدْنَكَ اللهَ العَدْلَ فِي بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ. فَكَلَّمَتْهُ. فَقَالَ: "يَا بُنَيَّةُ، أَلَا تُحِبِّينَ مَا أُحِبُّ". قَالَتْ: بَلَى. فَرَجَعَتْ إِلَيْهِنَّ فَأَخْبَرَتْهُنَّ، فَقُلْنَ: ارْجِعِي إِلَيْهِ. فَأَبَتْ أَنْ تَرْجِعَ، فَأَرْسَلْنَ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ، فَأَتَتْهُ فَأَغْلَظَتْ، وَقَالَتْ: إِنَّ نِسَاءَكَ يَنْشُدْنَكَ اللهَ العَدْلَ فِي بِنْتِ ابن أَبِي قُحَافَةَ. فَرَفَعَتْ صَوْتَهَا، حَتَّى تَنَاوَلَتْ عَائِشَةَ وَهْيَ قَاعِدَة فَسَبَّتْهَا، حَتَّى إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَيَنْظُرُ إِلَى عَائِشَةَ هَلْ تَكَلَّمُ، قَالَ: فَتَكَلَّمَتْ عَائِشَةُ تَرُدُّ عَلَى زَيْنَبَ حَتَّى أَسْكَتَتْهَا. قَالَتْ: فَنَظَرَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى عَائِشَةَ وَقَالَ: "إِنَّهَا بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ"(١).

قَالَ البُخَارِيُّ: الكَلَامُ الأَخِيرُ قِصَّة فَاطِمَةَ يُذْكَرُ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ رَجُلٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ. وَقَالَ أَبُو مَرْوَانَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ عُرْوَةَ: كَانَ النَّاسُ يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عَائِشَةَ. وَعَنْ هِشَامٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ، وَرَجُلٍ مِنَ المَوَالِي، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الحارِثِ بْنِ هِشَامٍ: قَالَتْ عَائِشَة: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَاسْتَأْذَنَتْ فَاطِمَةُ.

---

(١) بروانە: ٢٥٧٤.

٢٥٨١- عائیشە ﵂ دەڵێ: خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو کۆمەڵ بوون، کۆمەڵێکیان عائیشە و حەفصە و صەفییە و سەودەی تێدابوون، کۆمەڵەکەی تریان ئوممو سەلەمەو خێزانەکانی تری پێغەمبەری خوا بوون ﷺ، مسوڵمانەکانیش بە دڵنیایی و چاك دەیانزانی بە(زیادە) خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ عائیشە، بۆیە ئەگەر یەکێکیان دیارییەکی ببوایە و بیویستبایە پێشکەشی بکات بەپێغەمبەری خوا ﷺ، دوای دەخست هەتا ئەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵی عائیشە دەبوو، خاوەنی دیارییەکە دیارییەکەی دەنارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی عائیشەدا. جا کۆمەڵەی ئوممو سەلەمە قسەیان کردو وتیان بەئوممو سەلەمە: تۆ قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بکە، با قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکات و بڵێ پێیان: هەرکەس ویستی دیارییەك بنێرێت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ با دیارییەکەی بۆ بنێرێت لە هەر ماڵێکی خێزانەکانی بوو، ئوممو سەلەمەش قسەکەی ئەوانی بە پێغەمبەر ﷺ وت: بەلام پێغەمبەر ﷺ هیچی پێ نەوت (وەلامی نەدایەوە)، ئینجا کۆمەڵەکەی ئوممو سەلەمە پرسیاریان لە ئوممو سەلەمە کرد (وەلامی چی بوو)؟ وتی: هیچ وەلامێکی نەدامەوە، جا بە ئوممو سەلەمەیان وت: جارێکی تر قسەی لەگەڵ بکە، ئینجا ئوممو سەلەمە لەوکاتەی نۆبەی خۆی بوو قسەی لەگەڵ کرد، بەلام هیچی پێ نەوت و وەلامی نەدایەوە، جا ئافرەتان پرسیاریان لە ئوممو سەلەمە کرد؟ ئەویش وتی: هیچی پێ نەوتم، ئینجا بەئوممو سەلەمەیان وت: هەر قسەی لەگەڵ بکە هەتا قسەت لەگەڵ دەکات (وەلامت دەداتەوە)، جا کە پێغەمبەر ﷺ هاتەوە بۆ ماڵی ئەو ئوممو سەلەمەو قسەی لەگەڵ کرد، ئەویش فەرمووی پێی: ((ئازارم مەدە سەبارەت بە عائیشە، چونکە بەڕاستی نیگام بۆ نەهاتووە لە ناو نوێنی هیچ ژنێکدا جگە لە عائیشە))، ئوممو سەلەمەش وتی: داوای لێخۆش بوون لەخوا دەکەم لە ئازاردانت ئەی پێغەمبەری

خوا ﷺ، پاشان هەموویان فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوایان ﷺ بانگ کردو ناردیان بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بڵێت: بێگومان هاوسەرەکانت داوات لێ دەکەن لەبەر خوا دادپەروەر بیت سەبارەت بە کچی ئەبو بەکر، جا فاتیمە (لەوبارەیەوە) قسەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی کچی خۆشەویستم! ئەوی من پێم خۆش بێت تۆش پێت خۆش نییە؟)) فاتیمەش وتی: بەڵێ، جا فاتیمە گەڕایەوە بۆ لای هاوسەرەکانی (پێغەمبەر ﷺ) و هەواڵەکەی پێدان، ئەوانیش وتیان: بڕۆرەوە بۆ لای، فاتیمە ڕازی نەبوو بگەڕێتەوە، ئینجا زەینەبی کچی جەحشیان نارد، ڕۆیشتە لای پێغەمبەر ﷺ و بەزبری و توندی قسەی کرد، وتی: بەڕاستی هاوسەرەکانت داوات لێ دەکەن لەبەر خوا دادپەروەر بی لەگەڵیان لەبەرانبەر کچەکەی ئیبنو ئەبی قوحافە، دەنگیشی بەرزکردەوەو هەتا قسەشی بەعائیشە وت کە دانیشتبوو جنێویشی پێدا، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ سەرنجی عائیشەی دەدا ئاخۆ وەڵام دەداتەوە، دەڵێ: ئینجا عائیشە دەستی بەقسەکردو بەرپەرچی زەینەبی بەجۆرێ دایەوە هەتا بێدەنگی کرد، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ سەیری عائیشەی کرد و فەرمووی: ((بەڕاستی کچی ئەبو بەکرە)).

(ئیمامی) بوخاری دەڵێ: بەشی کۆتایی فەرموودەکە کە باسی فاتیمەی تێدایە، گێڕدراوەتەوە لە هیشامی کوڕی عورِوەوە، لە پیاوێکەوە، لەزوهرییەوە، لەموحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمانەوە. هەروەها ئەبو مەڕوان دەیگێڕێتەوە لەهیشامەوە لە عورِوەوە دەڵێ: خەڵکی بۆ بردنی دیارییەکانیان چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەیان دەکرد کە پێغەمبەر ﷺ لەماڵی عائیشەیە. وە هیشام دەگێڕێتەوە لەپیاوێکی قوڕەیشی و پیاوێکی غەیرە عەرەبەوە لەزوهریەوە، لەموحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشامەوە دەڵێ: عائیشە وتی: من لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووم، فاتیمە مۆڵەتی خواست لە پێغەمبەر ﷺ بێتە ژوورەوە.

## ٩- بَابُ مَا لَا يُرَدُّ مِنَ الهَدِيَّةِ

٢٥٨٢- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا عَزْرَةُ بْنُ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي ثُمَامَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَيْهِ فَنَاوَلَنِي طِيبًا، قَالَ: كَانَ أَنَسٌ ﷺ لَا يَرُدُّ الطِّيبَ. قَالَ وَزَعَمَ أَنَسٌ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَا يَرُدُّ الطِّيبَ[1].

## ٩- باسی ئەو دیارییانەی ناگەڕێنرێنەوە

**٢٥٨٢- عەزرەی کوڕی سابیتی ئەنصاری دەڵێ: سومامەی کوڕی عەبدوڵلا بۆی گێڕامەوە، عەزرە وتی: ڕۆیشتمە ژوورەوە بۆ لای (سومامە) بۆنێکی خۆشی پێدام، وتی: ئەنەس ﷺ بۆنی خۆشی نەدەگەڕاندەوە، وتی: ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هیچ کات بۆنی خۆشی نەدەگەڕاندەوە.**

## ١٠- بَابُ مَنْ رَأَى الهِبَةَ الغَائِبَةَ جَائِزَةً

٢٥٨٣- ٢٥٨٤- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ ذَكَرَ عُرْوَةُ أَنَّ المِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ ﷺ وَمَرْوَانَ أَخْبَرَاهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حِينَ جَاءَهُ وَفْدُ هَوَازِنَ قَامَ فِي النَّاسِ، فَأَثْنَى عَلَى اللهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: "أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ إِخْوَانَكُمْ جَاءُونَا تَائِبِينَ، وَإِنِّي رَأَيْتُ أَنْ أَرُدَّ إِلَيْهِمْ سَبْيَهُمْ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يُطَيِّبَ ذَلِكَ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ عَلَى حَظِّهِ حَتَّى نُعْطِيَهُ إِيَّاهُ مِنْ أَوَّلِ مَا يُفِيءُ اللهُ عَلَيْنَا". فَقَالَ النَّاسُ: طَيَّبْنَا لَكَ[2].

---

(١) بڕوانە: ٥٩٢٩.

(٢) بڕوانە: ٢٣٠٧، ٢٣٠٨.

## ١٠- باسی کەسێک ڕای وایە بەخشینی شتێک ئامادە نییە دروستە

٢٥٨٣- ٢٥٨٤- عورِوه دەڵێ: میسوەری کوڕی مەخرەمە و مەڕوانی (کوڕی حەکەم) بۆیان گێڕامەوە کاتێك نوێنەرەکانی هەوازین هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە ناو مسوڵماناندا هەستایە سەرپێ و سوپاس و ستایشی خوای کرد بەو شێوەی شیاوی بێت، پاشان فەرمووی: ((دوای ئەمە، بەڕاستی ئەم برایانەتان بە پەشیمانییەوە[1] هاتوون بۆ لای ئێمە، وە من ڕام وایە ژن و منداڵە گیراوەکانیان بدەینەوە، جا هەرکەستان پێی خۆشە و لەناخیەوە حەز دەکات با ئەو کارە بکات، وە هەر کەسێکیش پێی خۆشە بەشەکەی خۆی وەك خۆی بمێنێتەوە هەتا یەکەم دەستکەوت خوای گەورە پێمان دەبەخشێت دەیدەینێ))، خەڵکەکەش وتیان: ئێمە لەبەر تۆ پێمان خۆشە (و بۆیان دەگێڕینەوە).

## ١١- بابُ المُكَافَأة فِي الهدية

٢٥٨٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقْبَلُ الهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا. لَمْ يَذْكُرْ وَكِيعٌ وَمُحَاضِرٌ عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ.

## ١١- باسی پاداشت دانەوە لە دیاری و بەخشیندا

٢٥٨٥- هیشام لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە لە عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری وەردەگرت و پاداشتی دەدایەوە (خەڵاتی دەکردەوە). (ئیمامی بوخاری

(١) واتە: موسوڵمان بوون و پەشیمانن لە ڕابردوویان.

دەڵێ:) وەکیع و موحازیر گێڕاویانەتەوە لە هیشامەوە لە باوکیەوە نەیانووتووە لە عائیشەوە (یەکسەر عورۆوە وتوویەتی لە پێغەمبەرەوە[١])).

# ١٢- بابُ الهِبَةِ لِلْوَلَدِ

وَإِذَا أَعْطَى بَعْضَ وَلَدِهِ شَيْئًا لَمْ يَجُزْ، حَتَّى يَعْدِلَ بَيْنَهُمْ وَيُعْطِيَ الآخَرِينَ مِثْلَهُ، وَلَا يُشْهَدُ عَلَيْهِ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "اعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلَادِكُمْ فِي العَطِيَّةِ"[٢].

وَهَلْ لِلْوَالِدِ أَنْ يَرْجِعَ فِي عَطِيَّتِهِ؟ وَمَا يَأْكُلُ مِنْ مَالِ وَلَدِهِ بِالْمَعْرُوفِ وَلَا يَتَعَدَّى؟ وَاشْتَرَى النَّبِيُّ ﷺ مِنْ عُمَرَ بَعِيرًا، ثُمَّ أَعْطَاهُ ابْنَ عُمَرَ، وَقَالَ: "اصْنَعْ بِهِ مَا شِئْتَ"[٣].

## ١٢- باسی (حوکمی) بەخشین بە کوڕ و منداڵ

ئەگەر پیاوێك دیارییەك بدات بەکوڕێکی دروست نییە، هەتا دادگەر نەبێت لە نێوانیاندا و هاوشێوەی ئەو دیارییەش نەدات بە منداڵەکانی تری، وە شایەتی لەدژی نادرێت[٤]. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لە بەخشیندا دادگەر بن لە نێوان منداڵەکانتاندا)).

هەروەها ئایا باوك بۆی هەیە لە بەخشینەکەی پەشیمان بێتەوە؟ تا چەند باوك بۆی دروستە لە ماڵی کوڕەکەی بخوات بەپێی پێویست بێ زیادەڕۆیی؟ وە

---

(١) کەواتە بەو دوو ڕێگایە: لە وەکیع و موحازیرەوە فەرموودەکە مورسەلە، واتە: سەحابەکە ناونەهێنراوە. تابیعی لە پێغەمبەرەوە ﷺ، گێڕاویەتیەوە، بەڵام لە ڕێگەی عیسای کوڕی یونس لە هیشامەوە لە عائیشەوە فەرموودەکە پەیوەست و صەحیحە.

(٢) بڕوانە: ٢٥٨٧.

(٣) بڕوانە: ٢١١٥.

(٤) واتە: ئەگەر باوکەکە جیاوازی کرد لە نێوان منداڵەکانیدا لە بەخشیندا، نابێت شایەتی لە دژی بدرێت لای قازی. بڕوانە: إرشاد الساري: ٢٢/٦.

**پێغەمبەر ﷺ وشترێکی لەعومەر کڕی، پاشان بەخشی بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و فەرمووی: ((بەویستی خۆت چی لێ دەکەی بیکە)).**

٢٥٨٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَمُحَمَّدِ بْنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ أَنَّهُمَا حَدَّثَاهُ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، أَنَّ أَبَاهُ أَتَى بِهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي هَذَا غُلاَمًا. فَقَالَ: "أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَ مِثْلَهُ؟ "، قَالَ: لاَ. قَالَ: "فَارْجِعْهُ"[1].

**٢٥٨٦- نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕێتەوە کە باوکی بردی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: من غوڵامێکم بەخشیوە بەم کوڕەم، ئەویش فەرمووی: ((هەموو کوڕەکانت هاوشێوەی ئەمت پێ بەخشیون؟)) باوکم وتی: نەخێر، فەرمووی: ((کەواتە بیگەڕێنەرەوە (و مەیدە بەئەویش) )).**

## ١٣- بابُ الإِشْهَادِ فِي الهِبَةِ

٢٥٨٧- حَدَّثَنَا حَامِدُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ ﷺ وَهُوَ عَلَى المِنْبَرِ يَقُولُ: أَعْطَانِي أَبِي عَطِيَّةً، فَقَالَتْ عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ لاَ أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ اللهِ ﷺ. فَأَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أَعْطَيْتُ ابْنِي مِنْ عَمْرَةَ بِنْتِ رَوَاحَةَ عَطِيَّةً، فَأَمَرَتْنِي أَنْ أُشْهِدَكَ يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ: "أَعْطَيْتَ سَائِرَ وَلَدِكَ مِثْلَ هَذَا؟ ". قَالَ: لاَ. قَالَ: "فَاتَّقُوا اللهَ، وَاعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلاَدِكُمْ". قَالَ: فَرَجَعَ فَرَدَّ عَطِيَّتَهُ[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٥٨٧، ٢٦٥٠.

(٢) بڕوانە: ٢٥٨٦.

## ١٣- باسی شایەتیدان لە خەڵات و بەخشیندا

٢٥٨٧- عامیر دەڵێ: گوێم لە نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ بوو لەسەر دوانگە بوو دەیوت: باوکم دیارییەکی پێ بەخشیم، جا عەمرەی کچی ڕەواحە[1] وتی: ڕازی نابم هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەیتە شایەت (لەوبارەیەوە)، ئەویش ڕۆیشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: بێگومان من خەڵاتێکم داوەتە کوڕەکەم کە لە عەمرەی کچی ڕەواحەیە، جا عەمرەش فەرمانی پێکردووم کە تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم بەشایەت (لەسەری)، ئەویش فەرمووی: ((ئایا منداڵەکانی ترت وەك ئەم خەڵات کردووە؟)) باوکم وتی: نەخێر، فەرمووی: (کەواتە لە خوا بترسن و دادگەربن لە نێوان منداڵەکانتاندا))، ئیتر (باوکم) گەڕایەوە و لە خەڵاتەکەی پەشیمان بوویەوە.

## ١٤- بابُ هِبَةِ الرَّجُلِ لِامْرَأَتِهِ وَالمَرْأَةِ لِزَوْجِهَا

قَالَ إِبْرَاهِيمُ: جَائِزَةٌ. وَقَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ: لَا يَرْجِعَانِ. وَاسْتَأْذَنَ النَّبِيُّ ﷺ نِسَاءَهُ فِي أَنْ يُمَرَّضَ فِي بَيْتِ عَائِشَةَ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "العَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ". وَقَالَ الزُّهْرِيُّ فِيمَنْ قَالَ لِامْرَأَتِهِ: هَبِي لِي بَعْضَ صَدَاقِكِ أَوْ كُلَّهُ. ثُمَّ لَمْ يَمْكُثْ إِلَّا يَسِيرًا حَتَّى طَلَّقَهَا فَرَجَعَتْ فِيهِ، قَالَ يَرُدُّ إِلَيْهَا إِنْ كَانَ خَلَبَهَا، وَإِنْ كَانَتْ أَعْطَتْهُ عَنْ طِيبِ نَفْسٍ لَيْسَ فِي شَيْءٍ مِنْ أَمْرِهِ خَدِيعَةٌ جَازَ، قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا ﴿٤﴾ ﴾ النساء.

---

(١) کە دایکی نوعمانی کوڕی بەشیر بوو ﷺ.

## ١٤- باسی خەڵاتی پیاو بۆ خێزانی و خەڵاتی ئافرەتیش بۆ مێردەکەی

**ئیبراهیم دەڵێ: دروستە. عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێ: هەردووکیان بۆیان نییە پەشیمان ببنەوە لە خەڵاتەکەیان. وە پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی لە هاوسەرەکانی خواست لە ماڵی عائیشە چارەسەری بۆ بکرێ (لەکاتی نەخۆشییەکەیدا). هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسەی لە خەڵاتەکەی پەشیمان بێتەوە، وەك سەگ وایە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی خۆی)). زوهری دەربارەی ئەو پیاوەی بەهاوسەرەکەی بڵێت: بەشێك یان هەموو مارەییەکەتم پێ ببەخشە. پاشان زۆری پێ نەچێت تەڵاقی بدات، جا ئافرەتەکە لەبەخشینەکەی پەشیمان بێتەوە، زوهری دەڵێ: مارەییەکەی بۆ دەگەڕێتەوە ئەگەر فێڵی لێ کردبوو، بەڵام ئەگەر (بێ فێڵ و) بەڕەزامەندی و لەدڵەوە پێیدابوو، هیچ فێڵێکی تێدا نەبوو، ئەوە دروستە، خوای بەرز و بڵند دەفەرموێ: (جا ئەگەر بە دڵ پێیان خۆش بوو بەخشینی شتێك لەو (مارەییە) بە ئێوە، ئەوسا ئێوەش بەخۆشی بیخۆن و نۆشی گیانتان بێ).**

٢٥٨٨- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ مَعْمَرٍ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: لَمَّا ثَقُلَ النَّبِيُّ ﷺ فَاشْتَدَّ وَجَعُهُ اسْتَأْذَنَ أَزْوَاجَهُ أَنْ يُمَرَّضَ فِي بَيْتِي، فَأَذِنَّ لَهُ، فَخَرَجَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ، تَخُطُّ رِجْلاَهُ الأَرْضَ، وَكَانَ بَيْنَ العَبَّاسِ، وَبَيْنَ رَجُلٍ آخَرَ. فَقَالَ عُبَيْدُ اللهِ: فَذَكَرْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ مَا قَالَتْ عَائِشَةُ، فَقَالَ لِي: وَهَلْ تَدْرِي مَنِ الرَّجُلُ الَّذِي لَمْ تُسَمِّ عَائِشَةُ؟ قُلْتُ: لَا. قَالَ: هُوَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ.

**٢٥٨٨- عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێك نەخۆشییەکەی پێغەمبەر ﷺ قورس بوو، ئازاری بەهێزو توند بوو، مۆڵەتی خواست لەخێزانەکانی کە لەماڵی مندا چاودێری نەخۆشییەکەی بکرێت، ئەوانیش مۆڵەتیان داو ڕازی بوون، جا لە**

نێوان دوو پیاودا (چوونە ژێر باڵی) پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ هاتە دەرەوە، قاچەکانی بە زەویدا دەخشان، لە نێوان عەبباس و پیاوێکی تردا بوو، عوبەیدوڵا وتی: ئەو قسەی عائیشە وتی باسم کرد بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما، ئەویش پێی وتم: ئایا دەزانی پیاوەکەی تر کێ بووە عائیشە ناوی نەهێناوە؟ وتم: نەخێر، وتی: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو رضي الله عنه.

٢٥٨٩- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا ابْنُ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "العَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالكَلْبِ يَقِيءُ، ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ".

٢٥٨٩- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسەی پاشگەز بێتەوە لە بەخشینەکەی، وەك سەگ وایە بڕشێتەوە، پاشان بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی)).

## ١٥- بابُ هِبَةِ المَرْأَةِ لِغَيْرِ زَوْجِهَا وَعِتْقُهَا إِذَا كَانَ لَهَا زَوْجٌ فَهُوَ جَائِزٌ، إِذَا لَمْ تَكُنْ سَفِيهَةً، فَإِذَا كَانَتْ سَفِيهَةً لَمْ يَجُزْ، قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ ﴿٥﴾﴾ النساء.

٢٥٩٠- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللهِ عَنْ أَسْمَاءَ رضي الله عنها قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا لِي مَالٌ إِلَّا مَا أَدْخَلَ عَلَيَّ الزُّبَيْرُ، فَأَتَصَدَّقُ؟ قَالَ: "تَصَدَّقِي، وَلَا تُوعِي فَيُوعَى عَلَيْكِ"[1].

---

(١) بڕوانە: ١٤٣٣.

## ١٥- باسی خەڵاتی ژن بەکەسێک جگە لە مێردەکەی، وە ئازادکردنی (کەنیزەک) ئەگەر ژنەکە مێردی هەبوو دروستە، ئەگەر ژنەکە گێل و کەم عەقڵ نەبوو، بەڵام ئەگەر ژنەکە گێل و کەم عەقڵ بوو دروست نییە، خوای گەورەش دەفەرموێ: (وە ماڵەکانتان مەدەنە گێل و کەم عەقڵەکانتان)

**٢٥٩٠- ئەسما ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هیچ ماڵ و سامانێکم نییە جگە لەوەی زوبەیر بۆم بێنێ و پێم بدات، دەی ئایا من بیکەم بەخێر؟ فەرمووی: ((ببەخشە و کۆی مەکەرەوە لە تورەکەدا (و نەیبەخشیت)، بەهۆیەوە خواش لەتۆی بگرێتەوە)).**

٢٥٩١- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نُمَيْرٍ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ عَنْ فَاطِمَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "أَنْفِقِي، وَلَا تُحْصِي فَيُحْصِيَ اللهُ عَلَيْكِ، وَلَا تُوعِي فَيُوعِيَ اللهُ عَلَيْكِ"(١).

**٢٥٩١- ئەسما ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە ئەسما: (( ببەخشە و مەیژمێرە و بە زۆری مەزانە، ئەوسا (ئەگەر وابکەی) خواش لەسەرت دەژمێرێ و لێت دەگرێتەوە، کۆی مەکەرەوە لە تورەکەدا (و نەیبەخشیت)، ئەگینا خواش لەتۆی دەگرێتەوە و لێت دەشارێتەوە)).**

٢٥٩٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، عَنِ اللَّيْثِ، عَنْ يَزِيدَ، عَنْ بُكَيْرٍ، عَنْ كُرَيْبٍ -مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ- أَنَّ مَيْمُونَةَ بِنْتَ الحَارِثِ ﷺ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا أَعْتَقَتْ وَلِيدَةً وَلَمْ تَسْتَأْذِنِ النَّبِيَّ ﷺ،

---

(١) بڕوانە: ١٤٣٣.

فَلَمَّا كَانَ يَوْمُهَا الذِي يَدُورُ عَلَيْهَا فِيهِ قَالَتْ: أَشَعَرْتَ يَا رَسُولَ اللهِ أَنِّي أَعْتَقْتُ وَلِيدَتِي؟ قَالَ: "أَوَفَعَلْتِ؟ ". قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: "أَمَا إِنَّكِ لَوْ أَعْطَيْتِيهَا أَخْوَالَكِ كَانَ أَعْظَمَ لأَجْرِكِ". وَقَالَ بَكْرُ بْنُ مُضَرَ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ بُكَيْرٍ، عَنْ كُرَيْبٍ: إِنَّ مَيْمُونَةَ أَعْتَقَتْ[1].

**٢٥٩٢- کوڕەیبی- غولامی ئیبنو عەبباس ﷺ- دەگێڕێتەوە کە مەیمونەی کچی حاریس ﷺ هەواڵی پێدا کە ئەو کەنیزەکێکی (خۆی) ئازاد کرد و پرسی بە پێغەمبەر ﷺ نەکرد، جا کە ئەو ڕۆژە هات سەرەی مەیمونە بوو، پێغەمبەر ﷺ دەهات بۆ لای ئەو، مەیمونە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەستت کردو زانیت کە من کەنیزەکەکەم ئازاد کرد؟ فەرمووی: ((ئەو کارەت کرد؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((جا ئەگەر ئەو کەنیزەکەت ببەخشیبایە بە خاڵۆکانت پاداشتەکەت گەورەتر دەبوو)). (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) بەکری کوڕی موزەڕ دەگێڕێتەوە لەعەمرەوە، لەبوکەیرەوە، لە کوڕەیبەوە دەڵێ: بێگومان مەیموونە کەنیزەکێکی ئازاد کرد[2].**

**٢٥٩٣-** حَدَّثَنَا حِبَّانُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ، وَكَانَ يَقْسِمُ لِكُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ يَوْمَهَا وَلَيْلَتَهَا، غَيْرَ أَنَّ سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا وَلَيْلَتَهَا، لِعَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، تَبْتَغِي بِذَلِكَ رِضَا رَسُولِ اللهِ ﷺ[3].

**٢٥٩٣- عوروە دەڵێ: عائیشە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیویستایە سەفەرێك بکات قورعەی دەکرد لە نێوان هاوسەرەکانیدا، جا هەرکامیان ناوی**

---

(١) بڕوانە: ٢٥٩٤.

(٢) لەم فەرمووده موعەلەقەدا عەمری کوڕی حاریس وەک بەزیدی کوڕی حەبیبی کردووە، کە دەڵێ: لە کورەیبەوە.

(٣) بڕوانە: ٢٦٣٧، ٢٦٦١، ٢٦٨٨، ٢٨٧٩، ٤٠٢٥، ٤١٤١، ٤٦٩٠، ٤٧٤٩، ٤٧٥٠، ٤٧٥٧، ٥٢١٢، ٦٦٦٢، ٦٦٧٩، ٧٣٦٩، ٧٥٠٠، ٧٥٤٥.

دەربچووایە لەگەڵ خۆی دەیبرد، وە بۆ هەر هاوسەرێك لەوان شەو و ڕۆژێكی بۆ دیاری كردبوو، جگە لە سەودەی كچی زەمعە كە شەو و ڕۆژەكەی خۆی بەخشی بوو بە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ، بەم كارەی دەیویست ڕەزامەندی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆی بەدەست بێنێ.

## ١٦ - بابٌ: بِمَنْ يُبْدَأُ بِالهَدِيَّةِ؟

٢٥٩٤- وَقَالَ بَكْرٌ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ بُكَيْرٍ، عَنْ كُرَيْبٍ -مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ-: إِنَّ مَيْمُونَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَعْتَقَتْ وَلِيدَةً لَهَا، فَقَالَ لَهَا: "وَلَوْ وَصَلْتِ بَعْضَ أَخْوَالِكِ كَانَ أَعْظَمَ لأَجْرِكِ"[١].

## ١٦- باسێك: لەكێوە دەست بەدیاری پێدان بكرێت؟

٢٥٩٤- لە كوڕەیبی - غولامی ئیبنو عەبباس - دەگێڕێتەوە: كە مەیمونەی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ كەنیزەكێكی خۆی ئازاد كرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێی: ((ئەگەر یەكێك لەخاڵۆكانت پێ بەسەر كردبایەوە (و پێت ببەخشیبایە) گەورەتر بوو بۆ پاداشتەكەت)).

٢٥٩٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي عِمْرَانَ الجَوْنِيِّ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ -رَجُلٍ مِنْ بَنِي تَيْمِ بْنِ مُرَّةَ- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ لِي جَارَيْنِ، فَإِلَى أَيِّهِمَا أُهْدِي؟ قَالَ: "إِلَى أَقْرَبِهِمَا مِنْكِ بَابًا"[٢].

٢٥٩٥- عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دوو دراوسێم هەیە، جا دیاری بۆ كامیان ببەم و پێی ببەخشم؟ فەرمووی: ((بۆ ئەوەیان ببە دەرگاكەی لێتەوە نزیكترە)).

---

(١) بڕوانە: ٢٥٩٢.

(٢) بڕوانە: ٢٢٥٩.

## ١٧- بابُ مَنْ لَمْ يَقْبَلِ الهَدِيَّةَ لِعِلَّةٍ

وَقَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ كَانَتِ الهَدِيَّةُ فِي زَمَنِ النبي ﷺ هَدِيَّةً، وَاليَوْمَ رِشْوَةٌ.

٢٥٩٦- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ الصَّعْبَ بْنَ جَثَّامَةَ اللَّيْثِيَّ -وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ يُخْبِرُ أَنَّهُ أَهْدَى لِرَسُولِ اللهِ ﷺ حِمَارَ وَحْشٍ وَهْوَ بِالأَبْوَاءِ -أَوْ بِوَدَّانَ- وَهْوَ مُحْرِمٌ، فَرَدَّهُ، قَالَ صَعْبٌ: فَلَمَّا عَرَفَ فِي وَجْهِي رَدَّهُ هَدِيَّتِي قَالَ: "لَيْسَ بِنَا رَدٌّ عَلَيْكَ، وَلَكِنَّا حُرُمٌ"[1].

## ١٧- باسی کەسێک دیاری وەرنەگرتووە لەبەر هۆکارێک

**عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێ: دیاری لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری بوو، بەڵام ئێستا بەرتیلە.**

**٢٥٩٦- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە کە لە صەعبی کوڕی جەسسامەی لەیسی بیستووە (کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بوو) دەیگێڕایەوە، کە ئەو لە ئەبوا - یان وەددان بوو -، کەرە کێوییەکی کردە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە ئیحرامدا بوو، بۆیە وەری نەگرت، صەعب دەڵێ: جا کە پێغەمبەر ﷺ لە دەم و چاومدا بێتاقەتی هەست پێکرد بە وەرنەگرتنی دیارییەکەم، فەرمووی: ((ئێمە لەخۆمانە نەمانداوەتەوە بەسەرتدا، بەڵکو لەبەر ئەوەیە ئێمە لەئیحرامداین)).**

٢٥٩٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ رضي الله عنه قَالَ: اسْتَعْمَلَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا مِنَ الأَزْدِ يُقَالُ لَهُ: ابْنُ الأُتْبِيَّةِ عَلَى

---

(١) بڕوانە: ١٨٢٥.

الصَّدَقَةِ، فَلَمَّا قَدِمَ قَالَ: هَذَا لَكُمْ، وَهَذَا أُهْدِيَ لِي. قَالَ: "فَهَلاَّ جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ أَوْ بَيْتِ أُمِّهِ، فَيَنْظُرَ يُهْدَى لَهُ أَمْ لَا؟! وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يَأْخُذُ أَحَدٌ مِنْهُ شَيْئًا إِلَّا جَاءَ بِهِ يَوْمَ القِيَامَةِ يَحْمِلُهُ عَلَى رَقَبَتِهِ، إِنْ كَانَ بَعِيرًا لَهُ رُغَاءٌ أَوْ بَقَرَةً لَهَا خُوَارٌ أَوْ شَاةً تَيْعَرُ -ثُمَّ رَفَعَ بِيَدِهِ، حَتَّى رَأَيْنَا عُفْرَةَ إِبْطَيْهِ- اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ". ثَلاَثًا[1].

**٢٥٩٧- ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی هۆزی ئەزدی کردە سەرپەرشتیاری کۆکردنەوەی زەکات، کە پێیان دەوت ئیبنو ئوتبییە، جا کاتێك (کارەکەی تەواو کرد) هاتەوە، وتی: ئەمە زەکاتەکەی ئێوەیە، ئەمەشیان دیاریە و بەخشراوە بەمن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر وایە دەی بۆ ئەو کەسە دانەنیشت لەماڵی باوکیدا یان لە ماڵی دایکیدا، ئەوسا بیبینیایە دیاری پێ دەدرێت یان نا؟ سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە کەسێك نییە لە ئێوە شتێك ببات، مەگەر لە ڕۆژی دواییدا دێت ئەو شتە بەسەر ملیەوە هەڵدەگرێت، ئەگەر وشترێك بوو بارە باری دێ، یان مانگایەك بوو قۆڕە قۆڕی دێ، یان مەڕێك بوو باعە باعی دێ))، پاشان پێغەمبەر ﷺ دەستی بەرزکردەوە، هەبۆرای[2] هەردوو بن هەنگڵیمان بینی و فەرمووی: ((خوایە وا من گەیاندم، خوایە وا من گەیاندم)) سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە.**

## ١٨ - بابٌ: إِذَا وَهَبَ هِبَةً أَوْ وَعَدَ ثُمَّ مَاتَ قَبْلَ أَنْ تَصِلَ إِلَيْهِ

وَقَالَ عَبِيدَةُ: إِنْ مَاتَا وَكَانَتْ فُصِلَتِ الهَدِيَّةُ وَالمُهْدَى لَهُ حَيٌّ فَهْيَ لِوَرَثَتِهِ، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ فُصِلَتْ فَهْيَ لِوَرَثَةِ الذِي أَهْدَى. وَقَالَ الحَسَنُ أَيُّهُمَا مَاتَ قَبْلُ فَهْيَ لِوَرَثَةِ المُهْدَى لَهُ. إِذَا قَبَضَهَا الرَّسُولُ.

---

(١) بروانە: ٩٢٥.

(٢) واتە: سپیایی بن باڵ.

٢٥٩٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُنْكَدِرِ، سَمِعْتُ جَابِرًا ﷺ قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: "لَوْ جَاءَ مَالُ البَحْرَيْنِ أَعْطَيْتُكَ هَكَذَا ثَلاَثًا". فَلَمْ يَقْدَمْ حَتَّى تُوُفِّيَ النَّبِيُّ ﷺ، فَأَمَرَ أَبُو بَكْرٍ مُنَادِيًا فَنَادَى: مَنْ كَانَ لَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ عِدَةٌ أَوْ دَيْنٌ فَلْيَأْتِنَا. فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَعَدَنِي. فَحَثَى لِي ثَلاَثًا[1].

## ١٨- باسێک: ئەگەر کەسێک شتێکی بەخشی یان بەڵێنێکی دا و پاشان مرد پێش ئەوەی بەخشینەکە یان بەڵێندراوەکە بگاتە دەستی کەسەکە

**عەبیدە دەڵێ: ئەگەر بەخشەرەکەو پێ بەخشراوەکە مردن و دیارییەکە وەرگیرابوو، پێ بەخشراوەکەش زیندوو بوو (پاشان مرد) ئەوە بۆ میراتگرانی پێ بەخشراوەکە دەبێت، بەڵام ئەگەر وەرنەگیرابوو ئەوە بۆ میراتگرانی بەخشەرەکە دەبێت. وە حەسەن دەڵێ: هەرکامیان لەپێشدا مردن ئەوە بۆ میراتگرانی پێ بەخشراوەکە دەبێت، ئەگەر نێردراوەکە بەخشینەکەی وەرگرتبوو.**

**٢٥٩٨- جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە منی فەرموو: ((ئەگەر ماڵ (سەرانە)ی بەحرەین هات ئەوەندەت دەدەمێ سێ جار[2]))، بەڵام ماڵی بەحرەین نەهات هەتا پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، ئینجا ئەبو بەکر فەرمانی بە جاڕدەرێك کرد و جاڕی دا: هەر کەسێك بەڵێنێك یان قەرزێکی هەیە لای پێغەمبەر ﷺ با بێت بۆ لای ئێمە، منیش ڕۆیشتم وتم: پێغەمبەر ﷺ ئەو بەڵێنەی پێدام، ئینجا ئەبو بەکریش سێ مشت (پارە) ی پێدام[3].**

---

(١) بڕوانە: ٢٢٩٦.

(٢) سێ جار فەرمووی: ئەوەندە ئەوەندە ئەوەندە.

(٣) هەر مشتەی پێنج سەد بوو.

# ١٩ - بابٌ: كَيْفَ يُقْبَضُ العَبْدُ وَالمَتَاعُ؟

وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ كُنْتُ عَلَى بَكْرٍ صَعْبٍ، فَاشْتَرَاهُ النَّبِيُّ ﷺ وَقَالَ: "هُوَ لَكَ يَا عَبْدَ اللهِ"[1].

٢٥٩٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ المِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ رضي الله عنهما قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَقْبِيَةً، وَلَمْ يُعْطِ مَخْرَمَةَ مِنْهَا شَيْئًا، فَقَالَ مَخْرَمَةُ: يَا بُنَيَّ، انْطَلِقْ بِنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ. فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، فَقَالَ: ادْخُلْ فَادْعُهُ لِي. قَالَ: فَدَعَوْتُهُ لَهُ، فَخَرَجَ إِلَيْهِ وَعَلَيْهِ قَبَاءٌ مِنْهَا، فَقَالَ: "خَبَأْنَا هَذَا لَكَ". قَالَ: فَنَظَرَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: رَضِيَ مَخْرَمَةُ[2].

## ١٩- باسێک: کە چۆن کۆیلە و کاڵای بەخشراو وەردەگیرێت؟

**ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: من سواری نوما و وشترێکی سەرسەخت بووم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ (لە منی) کڕی و فەرمووی: ((عەبدوڵڵا ئەو وشترە بۆ تۆ)).**

**٢٥٩٩- ئیبنو ئەبو مولەیکە دەگێڕێتەوە لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند کەوایەکی دابەش کرد، لەو کەوایانە هیچی نەدا بە مەخرەمە، مەخرەمەش وتی: کوڕم با بڕۆین بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش لەگەڵی ڕۆیشتم وتی: بڕۆ ژوورەوە و بانگی بکە بۆم، میسوەر دەڵێ: منیش پێغەمبەرم ﷺ بانگ کرد بۆی، ئەویش هاتە دەرەوە بۆ لای باوکم و یەکێك لەکەوایەکانی لەبەردا بوو، فەرمووی: ((ئەمەمان بۆ تۆ شاردۆتەوە))، میسوەر دەڵێ: مەخرەمە سەیری کەوایەکەی کردو پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((مەخرەمە ڕازییە[3])).**

---

(١) بڕوانە: ٢١١٥.

(٢) بڕوانە: ٢٦٥٧، ٣١٢٧، ٥٨٠٠، ٥٨٦٢، ٦١٣٢.

(٣) ئیبنو حەجەر دەڵێ: داوودی دەڵێ ئەم ڕستە: (مەخرەمە ڕازییە) فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ وەک پرسیار فەرموویەتی، واتە: ئایا ڕازی بوویت؟ ئیبنو تین دەڵێ: دەگونجێ ئەم وتەیە قسەی مەخرەمە بێت نەک پێغەمبەر ﷺ، ئیبنو حەجەر دەڵێ: ئەم ڕایە دەچێتە زیهن و عەقڵەوە، واتە: ڕاستر وایە قسەی مەخرەمە بێت. بڕوانە: فتح الباري: ٢٧٨/٦، إرشاد الساري: ٣٦/٦.

## ٢٠ - بابٌ: إِذَا وَهَبَ هِبَةً وَقَبَضَهَا الآخَرُ، وَلَمْ يَقُلْ: قَبِلْتُ

٢٦٠٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّد بْنُ مَحْبوبٍ، حَدَّثَنَا عبد الوَاحِدِ، حَدَّثَنَا مَعْمَر، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: هَلَكْت. فَقَالَ: "وَمَا ذَاكَ؟ ". قَالَ: وَقَعْتُ بِأَهْلِي فِي رَمَضَانَ. قَالَ: "تَجِدُ رَقَبَةً؟ ". قَالَ: لَا. قَالَ: "فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ". قَالَ: لَا. قَالَ: "فَتَسْتَطِيعُ أَنْ تُطْعِمَ سِتِّينَ مِسْكِينًا؟ ". قَالَ: لَا. قَالَ: فَجَاءَ رجلٌ مِنَ الأنصَارِ بِعَرَقٍ -وَالعَرَقُ: الِمكْتَل- فِيهِ تَمْرٌ، فَقَالَ: "اذْهَبْ بهذا فَتَصَدَّقْ بِه". قَالَ: عَلَى أَحْوَجَ مِنَّا يَا رَسُولَ اللهِ؟! وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالَحْقِّ مَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَحْوَجُ مِنَّا. قَالَ: "اذْهَبْ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ"[1].

## ٢٠- باسێك: ئەگەر كەسێك بەخشێك ببەخشێ و پێ بەخشراوەكە وەری بگرێت و نەڵێت وەرمگرت (دروستە)

**٢٦٠٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: تیاچووم، فەرمووی: ((چی بووە؟)) وتی: لەڕەمەزاندا لەگەڵ هاوسەرەكەمدا دروست بووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەندەیەكت هەیە (ئازادی بكەیت)؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((دەتوانیت دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بیت؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((ئەی دەتوانیت خواردنی شەست هەژار بدەیت؟)) وتی: نەخێر، (ئەبو هورەیرە) دەڵێ: پیاوێكی ئەنصاری زەمبیلەیەكی - (العَرَقُ): زەمبیلەیە[2]- هێنا (بۆ پێغەمبەر ﷺ) خورمای تێدابوو، فەرمووی: ((ئەم زەمبیلە خورما بەرە و بیكە بە خێر[3]))، پیاوەكە وتی: ئەی**

---

(١) بڕوانە: ١٩٣٦.

(٢) لە دەقی عەرەبییەكەیدا دەڵێ: العرق : المكتل)، واتە: العرق: زەنبیلە.

(٣) لە كەفارەتی تاوانەكەت.

پێغەمبەری خوا ﷺ بیدەم بە لەخۆمان هەژارتر؟ دەی سوێند بەو زاتەی تۆی بە هەق ناردووە لەمسەر بۆ ئەوسەری مەدینە[1] ماڵێکی تێدا نییە لە ماڵ و منداڵی من هەژارتر بن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بڕۆ دەرخواردی ماڵ و منداڵەکانتی بدە)).

## ٢١ - بَابٌ: إِذَا وَهَبَ دَيْنًا عَلَى رَجُلٍ

قَالَ شُعْبَةُ، عَنِ الحَكَمِ: هُوَ جَائِزٌ. وَوَهَبَ الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ لِرَجُلٍ دَيْنَهُ وَقَالَ النَّبِيُّ - ﷺ: "مَنْ كَانَ لَهُ عَلَيْهِ حَقٌّ فَلْيُعْطِهِ، أَوْ لِيَتَحَلَّلْهُ مِنْهُ". وَقَالَ جَابِرٌ: قُتِلَ أَبِي وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، فَسَأَلَ النَّبِيُّ ﷺ غُرَمَاءَهُ أَنْ يَقْبَلُوا ثَمَرَ حَائِطِي، وَيُحَلِّلُوا أَبِي.

## ٢١- باسێک: ئەگەر قەرزێکی لای کەسێک بێت پێی ببەخشێت

شوعبە لە حەکەمەوە دەیگێڕێتەوە و دەڵێ: دروستە. حەسەنی کوڕی عەلی قەرزێکی لای پیاوێك بوو پێی بەخشی. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس مافێکی لای کەسێك بوو، ئەوە با مافەکەی بداتێ، یان گەردنی ئازاد بکات لەو مافەی لایەتی)). هەروەها جابیر ﷺ دەڵێ: باوکم کوژراو قەرزێکی (زۆری) لەسەر بوو، جا پێغەمبەر ﷺ داوای لە خاوەن قەرزەکانی کرد کە بەری باخە خورماکەم وەرگرن و گەردنی باوکم ئازاد بکەن.

٢٦٠١- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ حَدَّثَنِي ابْنُ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَاهُ قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ شَهِيدًا، فَاشْتَدَّ الغُرَمَاءُ فِي حُقُوقِهِمْ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَكَلَّمْتُهُ، فَسَأَلَهُمْ أَنْ يَقْبَلُوا

(١) یان لە نێوان دوو شاخەکەیدا.

ثَمَرَ حَائِطِي وَيُحَلِّلُوا أَبِي، فَأَبَوْا، فَلَمْ يُعْطِهِمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَائِطِي، وَلَمْ يَكْسِرْهُ لَهُمْ، وَلَكِنْ قَالَ: "سَأَغْدُو عَلَيْكَ". فَغَدَا عَلَيْنَا حَتَّى أَصْبَحَ، فَطَافَ فِي النَّخْلِ، وَدَعَا فِي ثَمَرِهِ بِالبَرَكَةِ، فَجَدَدْتُهَا فَقَضَيْتُهُمْ حُقُوقَهُمْ، وَبَقِيَ لَنَا مِنْ ثَمَرِهَا بَقِيَّةٌ، ثُمَّ جِئْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَهْوَ جَالِسٌ، فَأَخْبَرْتُهُ بِذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِعُمَرَ: "اسْمَعْ -وَهْوَ جَالِسٌ- يَا عُمَرُ". فَقَالَ: أَلاَّ يَكُونُ قَدْ عَلِمْنَا أَنَّكَ رَسُولُ اللهِ؟ وَاللهِ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللهِ[1].

**٢٦٠١- ئیبنو کەعبی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە کە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ هەواڵی پێدا کە باوکی لەجەنگی ئوحوددا کوژراو شەهید بوو، ئینجا خاوەن قەرزەکانیش پێداگیر بوون لەسەر داوای مافەکانیان (قەرزەکانیان)، منیش ڕۆیشتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و قسەم لەگەڵ کرد، ئەویش داوای لێ کردن کە بەروبوومی باخەکەم وەربگرن و گەردنی باوکم ئازاد بکەن، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ باخەکەمی پێنەدان و خورماکەی بۆ لێ نەکردنەوە (لە دار خورماکان)، بەڵکو فەرمووی: ((بەیانی زوو دێمە لات))، ئینجا بەیانی ڕۆژ بوویەوە هات بۆ لامان، وە گەڕا بەناو دارخورماکاندا، دوعای فەڕ و بەرەکەتی بە بەروبوومەکەیدا خوێند، منیش خورماکەم لێ کردەوە و قەرزەکانیانم دایەوە، هەندێکیش لەبەروبوومی خورماکە بۆ خۆمان مایەوە، پاشان هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، ئەو هەواڵەم پێدا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی بە عومەر -کە دانیشتبوو-: ((گوێ بگرە ئەی عومەر!))، عومەریش وتی: مەگەر ئێمە نەمانزانیوە تۆ پێغەمبەری خوای؟ سوێند بەخوا تۆ پێغەمبەری خوایت.**

---

(١) بڕوانە: ٢١٢٧.

## ٢٢- بَابُ هِبَةِ الوَاحِدِ لِلْجَمَاعَةِ

وَقَالَتْ أَسْمَاءُ لِلْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ وَابْنِ أَبِي عَتِيقٍ: وَرِثْتُ عَنْ أُخْتِي عَائِشَةَ بِالغَابَةِ، وَقَدْ أَعْطَانِي بِهِ مُعَاوِيَةُ مِائَةَ أَلْفٍ، فَهُوَ لَكُمَا.

٢٦٠٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ قَزَعَةَ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِشَرَابٍ فَشَرِبَ، وَعَنْ يَمِينِهِ غُلَامٌ، وَعَنْ يَسَارِهِ الأَشْيَاخُ، فَقَالَ لِلْغُلَامِ: "إِنْ أَذِنْتَ لِي أَعْطَيْتُ هَؤُلَاءِ". فَقَالَ: مَا كُنْتُ لأُوثِرَ بِنَصِيبِي مِنْكَ يَا رَسُولَ اللهِ أَحَدًا. فَتَلَّهُ فِي يَدِهِ[1].

## ٢٢- باسی کەسێک خەڵاتێک بدات بەکۆمەڵێک

ئەسما بەقاسیمی کوڕی موحەممەدو ئیبنو ئەبو عەتیقی وت: لە عائیشەی خوشکمەوە ماڵێکم لە غابە[2] بەمیرات بۆمایەوە، وە بێگومان موعاوییە سەد هەزاری پێدام بەو موڵکە (پێم نەدا)، ئەوە بۆ هەردووکتان بێت.

٢٦٠٢- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ وتی: جامێك ئاو هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ و لێی خواردەوە، کوڕێکی بچووك لای ڕاستیەوە بوو، وە پیاوە پیرو بەتەمەنەکانیش لای چەپیەوە بوون، جا فەرمووی بە کوڕە بچکۆلەکە: ((کوڕە بچکۆل ڕێگەم دەدەیت کە ئاوەکە بدەم بە ئا ئەم (پیاوە بەتەمەن)انە؟)) کوڕە بچکۆلەکەش وتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! بەشی خۆم لە بەرماوی تۆ بەکەس نادەم و باوی نادەم بەسەر خۆمدا، پێغەمبەریش ﷺ جامەکەی دایە دەستی.

## ٢٣- بَابُ الهِبَةِ المَقْبُوضَةِ وَغَيْرِ المَقْبُوضَةِ، وَالمَقْسُومَةِ وَغَيْرِ المَقْسُومَةِ

وَقَدْ وَهَبَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ لِهَوَازِنَ مَا غَنِمُوا مِنْهُمْ، وَهْوَ غَيْرُ مَقْسُومٍ[1].

---

(١) بروانە: ٢٣٥١.

(٢) غابە شوێنێکە لە نزیک مەدینە لەعەوالی.

٢٦٠٣- وَقَالَ ثَابِتٌ: حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ، عَنْ مُحَارِبٍ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي المَسْجِدِ فَقَضَانِي وَزَادَنِي[٢].

## ٢٣- باسی خەڵاتی وەرگیراو و وەرنەگیراو، وە خەڵاتی بەشکراو و بەشنەکراو

**بێگومان پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ئەو دەستکەوتانەی لە هۆزی هەوازینیان گرتبوو بەخشیانەوە پێیان لەکاتێکدا دابەش نەکرابوو.**

**٢٦٠٣- موحاریب دەگێڕێتەوە لە جابیرەوە ﷺ دەڵێ: لە مزگەوتدا ڕۆیشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ جا قەرزەکەی[٣] دامەوە و زیادەشی پێدام.**

٢٦٠٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَارِبٍ، سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ يَقُولُ بِعْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ بَعِيرًا فِي سَفَرٍ، فَلَمَّا أَتَيْنَا المَدِينَةَ قَالَ: "ائْتِ المَسْجِدَ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ". فَوَزَنَ -قَالَ شُعْبَةُ: أُرَاهُ فَوَزَنَ لِي فَأَرْجَحَ، فَمَا زَالَ مِنْهَا شَيْءٌ حَتَّى أَصَابَهَا أَهْلُ الشَّأْمِ يَوْمَ الحَرَّةِ[٤].

**٢٦٠٤- موحاریب دەڵێ: لە جابیری کوڕی عەبدوڵلام ﷺ بیست دەیوت لە سەفەرێکدا وشترێکم فرۆشت بە پێغەمبەر ﷺ، جا کاتێك هاتینەوە بۆ مەدینە فەرمووی: ((وەرە بۆ مزگەوت و دوو ڕکات نوێژ بکە))، ئینجا (نرخی وشترەکەمی بۆم) کێشا- شوعبە دەڵێ: وا دەزانم وتی: جا کێشای بۆم و پارسەنگیشی بوو- جابیر دەڵێ: جا ئەو پارەیە هەندێکی هەر مابوو هەتا سوپاکەی خەڵکی شام لە ڕۆژی حەڕڕەدا بردیان.**

---

(١) بڕوانە: ٢٣٠٧، ٢٣٠٨.

(٢) بڕوانە: ٤٤٣.

(٣) کە نرخی وشترێک بوو بە نوقیەک لێی کڕیبووم.

(٤) بڕوانە: ٤٤٣.

٢٦٠٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أُتِيَ بِشَرَابٍ، وَعَنْ يَمِينِهِ غُلَامٌ، وَعَنْ يَسَارِهِ أَشْيَاخٌ، فَقَالَ لِلْغُلَامِ: "أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَ هَؤُلَاءِ؟ ". فَقَالَ الغُلَامُ: لَا، وَاللهِ لَا أُوثِرُ بِنَصِيبِي مِنْكَ أَحَدًا. فَتَلَّهُ فِي يَدِهِ[1].

**٢٦٠٥- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە کە جامێك ئاوی خواردنەوە هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، لەلای ڕاستیەوە مێردمنداڵێك بوو، لای چەپیشیەوە چەند پیاوێکی بەتەمەن بوون، فەرمووی بە مێردمنداڵەکە: ((ڕێگەم دەدەیت ئاوەکە بدەم بە ئا ئەم (پیاوە بەتەمەن)انە؟))، مێرد منداڵەکەش وتی: نا بەخوا، بەشی خۆم لە بەرماوی تۆ بەکەس نادەم و باوی نادەم بەسەر خۆمدا، پێغەمبەریش ﷺ جامەکەی دایە دەستی.**

٢٦٠٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُثْمَانَ بْنِ جَبَلَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ لِرَجُلٍ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ دَيْنٌ فَهَمَّ بِهِ أَصْحَابُهُ، فَقَالَ: "دَعُوهُ، فَإِنَّ لِصَاحِبِ الحَقِّ مَقَالًا". وَقَالَ: "اشْتَرُوا لَهُ سِنًّا فَأَعْطُوهَا إِيَّاهُ". فَقَالُوا: إِنَّا لَا نَجِدُ سِنًّا إِلَّا سِنًّا هِيَ أَفْضَلُ مِنْ سِنِّهِ. قَالَ: "فَاشْتَرُوهَا فَأَعْطُوهَا إِيَّاهُ، فَإِنَّ مِنْ خَيْرِكُمْ أَحْسَنَكُمْ قَضَاءً"[2].

**٢٦٠٦- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك قەرزی لای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، (داوای دانەوەی قەرزەکەی لێکرد و قسەی توند و زبری بە پێغەمبەر ﷺ وت)، هاوەڵانیش ویستیان بچن بە گژیدا، فەرمووی: ((وازی لێبێنن چونکە بەڕاستی خاوەن ماف هەقی قسەی هەیە))، وە فەرمووی: ((وشترێکی هاوتەمەنی وشترەکەی خۆی بۆ بکڕن و بیدەنەوە پێی))، وتیان: لە وشترەکەی**

(١) بڕوانە: ٢٣٥١.

(٢) بڕوانە: ٢٣٠٥.

خۆی چاکتر نەبێ نیمانە، فەرمووی: ((بۆی بکڕن و بیدەنێ، چونکە بەڕاستی چاکترینتان ئەو کەسەیە چاکتر قەرز بداتەوە)).

## ٢٤ - بابٌ: إِذَا وَهَبَ جَمَاعَةٌ لِقَوْمٍ

٢٦٠٧- ٢٦٠٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الحَكَمِ وَالمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ أَخْبَرَاهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ حِينَ جَاءَهُ وَفْدُ هَوَازِنَ مُسْلِمِينَ، فَسَأَلُوهُ أَنْ يَرُدَّ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ وَسَبْيَهُمْ، فَقَالَ لَهُمْ: "مَعِي مَنْ تَرَوْنَ، وَأَحَبُّ الحَدِيثِ إِلَيَّ أَصْدَقُهُ، فَاخْتَارُوا إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ: إِمَّا السَّبْيَ وَإِمَّا المَالَ، وَقَدْ كُنْتُ اسْتَأْنَيْتُ". وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ انْتَظَرَهُمْ بِضْعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً حِينَ قَفَلَ مِنَ الطَّائِفِ، فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ غَيْرُ رَادٍّ إِلَيْهِمْ إِلَّا إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ قَالُوا فَإِنَّا نَخْتَارُ سَبْيَنَا. فَقَامَ فِي المُسْلِمِينَ فَأَثْنَى عَلَى اللهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: "أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ إِخْوَانَكُمْ هَؤُلَاءِ جَاءُونَا تَائِبِينَ، وَإِنِّي رَأَيْتُ أَنْ أَرُدَّ إِلَيْهِمْ سَبْيَهُمْ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يُطَيِّبَ ذَلِكَ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ عَلَى حَظِّهِ حَتَّى نُعْطِيَهُ إِيَّاهُ مِنْ أَوَّلِ مَا يُفِيءُ اللهُ عَلَيْنَا فَلْيَفْعَلْ". فَقَالَ النَّاسُ: طَيَّبْنَا يَا رَسُولَ اللهِ لَهُمْ. فَقَالَ لَهُمْ: "إِنَّا لَا نَدْرِي مَنْ أَذِنَ مِنْكُمْ فِيهِ مِمَّنْ لَمْ يَأْذَنْ، فَارْجِعُوا حَتَّى يَرْفَعَ إِلَيْنَا عُرَفَاؤُكُمْ أَمْرَكُمْ". فَرَجَعَ النَّاسُ فَكَلَّمَهُمْ عُرَفَاؤُهُمْ، ثُمَّ رَجَعُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَخْبَرُوهُ أَنَّهُمْ طَيَّبُوا وَأَذِنُوا. وَهَذَا الذِي بَلَغَنَا مِنْ سَبْيِ هَوَازِنَ. هَذَا آخِرُ قَوْلِ الزُّهْرِيِّ، يَعْنِي فَهَذَا الَّذِي بَلَغَنَا.

## ٢٤- باسێک: ئەگەر کۆمەڵێک شتێک بەهۆزێک ببەخشن

٢٦٠٧- ٢٦٠٨- عوروە گێڕاوەیە کە: مەڕوانی کوڕی حەکەم و میسوەری کوڕی مەخرەمە بۆیان گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک نوێنەرەکانی هەوازین بەمسوڵمانییەتی هاتنە خزمەتی، ئینجا داوایان لێی کرد کە سامان و ژن و

منداڵە دیلەکانیان بداتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێیان: ((من ئەو خەڵکەم لەگەڵدایە کە دەیان بینن، وە خۆشەویستترین وتە لە لای من ڕاستترینیەتی، کەواتە یەکێك لەو دووانە هەڵبژێرن[١]: یان ژن و منداڵە دیلەکان، یان ماڵ و سامانەکە، وە بێگومان من پەلەم نەکرد و چاوەڕوانیم کردن))، وە پێغەمبەری خوا ﷺ سیازدە بۆ نۆزدە شەو چاوەڕوانی کردن کاتێك لە تائیف گەڕایەوە، ئینجا کە نوێنەرەکان بۆیان ڕوونبوویەوە کە پێغەمبەر ﷺ تەنها یەکێك لەو دووانەیان[٢] بۆ دەگێڕێتەوە، وتیان: کەواتە ئێمە ژن و منداڵە دیلەکانمان هەڵدەبژێرین، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ لەناو مسوڵماناندا هەستایە سەرپێ و سوپاس و ستایشی خوای کرد بەو شێوەی شیاوی بێت، پاشان فەرمووی: ((دوای سوپاسی خوا، بەڕاستی ئا ئەم برایانەتان بەپەشیمانییەوە[٣] هاتوون بۆ لای ئێمە، وە من بۆچوونم وایە ژن و منداڵە گیراوەکانیان بدەینەوە، جا هەرکەستان پێی خۆشە و لەناخیەوە حەز دەکات با ئەو کارە بکات، وە هەر کەسێکیش پێی خۆشە بەشەکەی خۆی وەك خۆی بمێنێتەوە، هەتا یەکەم دەستکەوت خوای گەورە پێمان دەبەخشێت و دەیدەینێ، با وا بکات))، خەڵکەکەش وتیان: ئێمە پێمان خۆشە(و بۆیان دەگێڕینەوە)، ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی ئێمە نازانین کێتان مۆڵەتی داوەو و کێتان مۆڵەتی نەداوە[٤]، کەواتە بگەڕێنەوە (جێگای خۆتان)، با نوێنەر و سەرپەرشتیارەکانتان بڕیاری ئێوە بەرزبکەنەوە بۆمان))، ئیتر خەڵکەکەش گەڕانەوە و نوێەرەکانیان قسەیان لەگەڵ کردن، پاشان نوێنەرەکانیان گەڕانەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری

---

(١) کە بۆتان بگێڕمەوە و بتاندەمەوە.

(٢) یان ژن و منداڵەکانیان، یان ماڵ و سامانەکانیان.

(٣) واتە: مسوڵمان بوون و پەشیمانن لە ڕابردوویان.

(٤) بۆ گێڕانەوەی ژن و منداڵە گیراوەکانیان.

خوا ﷺ و هەواڵیان پێدا کە خەڵکەکە هەموو پێیان خۆشە و مۆڵەتیان دا بە گێڕانەوەیان. (زوهری دەڵێ:) جا ئەمە ئەوەیە دەربارەی ژن و منداڵە دیلەکانی هەوازین پێمان گەیشتووە، (عوقەیل دەڵێ:) ئەمە کۆتایی وتەکەی زوهرییە، مەبەستی: ئەوەی کە پێمان گەیشتووە.

## ٢٥- بابٌ: مَنْ أُهْدِيَ لَهُ هَدِيَّةٌ وَعِنْدَهُ جُلَسَاؤُهُ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ

وَيُذْكَرُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ جُلَسَاءَهُ شُرَكَاءُ. وَلَمْ يَصِحَّ.

٢٦٠٩- حَدَّثَنَا ابْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ أَخَذَ سِنًّا، فَجَاءَ صَاحِبُهُ يَتَقَاضَاهُ فَقَالَ: "إِنَّ لِصَاحِبِ الحَقِّ مَقَالًا". ثُمَّ قَضَاهُ أَفْضَلَ مِنْ سِنِّهِ وَقَالَ: "أَفْضَلُكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضَاءً"[1].

## ٢٥- باسێک: هەر کەسێک دیارییەکی پێ بەخشرا کۆمەڵێک لای دانیشتبون، ئەوە ئەو کەسە خۆی لەپێشترە بە وەرگرتنی دیارییەکە

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە ئەو کەسانەی لەگەڵیدا دانیشتوون هاوبەشن لە دیارییەکەدا، بەڵام ئەم گێڕانەوە[2] لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ ڕاست نییە.

٢٦٠٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە (وشترێکی وەرگرت بەقەرز) کە تەمەنێکی دیاری کراوی هەبوو، ئینجا خاوەنەکەی هات و داوای قەرزەکەی کرد (بەتوند و زبری)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان

(١) بڕوانە: ٢٣٠٥.

(٢) یان لەم باسە هیچ فەرمودەیەکی ڕاست ودروست نیە.

**خاوەن هەق هەقی قسەی هەیە))، پاشان قەرزەکەی بۆ بژارد بە وشترێکی باشتر و گەورەتر لە وشترەکەی خۆی و فەرمووی: ((چاکترینتان ئەو کەسەتانە قەرزەکە بەچاکتر بداتەوە)).**

٢٦١٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرٍو، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ كَانَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ فَكَانَ عَلَى بَكْرٍ لِعُمَرَ صَعْبٍ، فَكَانَ يَتَقَدَّمُ النَّبِيَّ ﷺ، فَيَقُولُ أَبُوهُ يَا عَبْدَ اللهِ، لَا يَتَقَدَّمِ النَّبِيَّ ﷺ أَحَدٌ. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ - ﷺ: "بِعْنِيهِ". فَقَالَ عُمَرُ: هُوَ لَكَ. فَاشْتَرَاهُ ثُمَّ قَالَ: "هُوَ لَكَ يَا عَبْدَ اللهِ، فَاصْنَعْ بِهِ مَا شِئْتَ"(١).

**٢٦١٠- عەمر لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ئەو لە سەفەرێکدا لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بوو، سواری نۆما وشترێکی سەرسەخت بوو کە هی عومەر بوو ﷺ، پێشی وشترەکەی پێغەمبەر ﷺ دەکەوت، عومەری باوکی پێی دەوت: ئەی عەبدوڵلا هیچ کەس پێش پێغەمبەر ﷺ نەکەوێت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەعومەری فەرموو: ((ئەم وشترەم پێ بفرۆشە))، عومەریش وتی دیاری بێت بۆ تۆ، جا پێغەمبەر ﷺ لێی کڕی، پاشان فەرمووی: ((ئەی عەبدوڵلا ئەم وشترە بۆ تۆ، بەویستی خۆت چی لێ دەکەیت لێی بکە)).**

## ٢٦ - بابٌ: إِذَا وَهَبَ بَعِيرًا لِرَجُلٍ وَهُوَ رَاكِبُهُ، فَهُوَ جَائِزٌ

٢٦١١- وَقَالَ الْحمَيْدِيُّ: ثَنَا سُفْيَانُ، ثَنَا عَمْرٌو، عَنِ ابن عُمَرَ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، وَكُنْتُ عَلَى بَكْرٍ صَعْبٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِعُمَرَ: "بِعْنِيهِ". فَابْتَاعَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "هُوَ لَكَ يَا عَبْدَ اللهِ".

(١) بروانە: ٢١١٥.

## ٢٦- باسێک: ئەگەر کەسێک وشترێکی بەخشی بەکەسێك کە ئەو کەسە بە سواریەوە بوو ئەوە دروستە

**٢٦١١- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەفەرێکدا لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین، من سواری نۆما وشترێکی سەرسەخت بووم (کە هی عومەر بوو)، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بە عومەری فەرموو: ((ئەم وشترەم پێ بفرۆشە))، عومەریش پێی فرۆشت، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەم وشترە بۆ تۆ ئەی عەبدوڵلا)).**

## ٢٧- بابُ هَدِيَّةِ مَا يُكْرَهُ لُبْسُهَا

٢٦١٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: رَأَى عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ حُلَّةً سِيَرَاءَ عِنْدَ بَابِ المَسْجِدِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوِ اشْتَرَيْتَهَا فَلَبِسْتَهَا يَوْمَ الجُمُعَةِ وَلِلْوَفْدِ قَالَ: "إِنَّمَا يَلْبَسُهَا مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ فِي الآخِرَةِ". ثُمَّ جَاءَتْ حُلَلٌ، فَأَعْطَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عُمَرَ مِنْهَا حُلَّةً، وَقَالَ أَكَسَوْتَنِيهَا وَقُلْتَ فِي حُلَّةِ عُطَارِدٍ مَا قُلْتَ! فَقَالَ: "إِنِّي لَمْ أَكْسُكَهَا لِتَلْبَسَهَا". فَكَسَا عُمَرُ أَخًا لَهُ بِمَكَّةَ مُشْرِكًا[1].

## ٢٧- باسی (دروستە) شتێك بەدیاری ببەخشرێ کە ناپەسندە لەبەرکردنی

**٢٦١٢- عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب پۆشاکێکی خەت خەتی ئاوریشمی بینی لەبەر دەرگای مزگەوتدا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزگە ئەم پۆشاکەت بکڕیبایە بۆ ڕۆژانی هەینی و (بۆ پێشوازی) شاند و نوێنەر لەبەرت بکردبایە، فەرمووی: ((بێگومان کەسێك**

---

(١) بڕوانە: ٨٨٦.

ئەم پۆشاكە (ئاوریشمە) لەبەر دەكات لە ڕۆژی دواییدا هیچ بەشێكی نەبێت))، پاشان چەند پۆشاكێكی ئاوریشمی هات بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ پۆشاكێكیانی بەخشی بەعومەر، عومەر وتی: ئەم پۆشاكەت پێدام لەكاتێكدا جەنابت دەربارەی پۆشاكەكەی عوتارید (كە لەبەردەمی مزگەوتدا دەفرۆشرا) ئەوەت فەرمووو كە فەرمووت (ئەمەم بۆ ڕوون بكەوە؟) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان من ئەم پۆشاكەم پێ نەداوی تا لەبەری بكەیت))، ئیتر عومەریش دای بە برایەكی بتپەرستی لە مەككە لەبەری بكات.

٢٦١٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ أَبُو جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ أَتَى النَّبِيُّ ﷺ بَيْتَ فَاطِمَةَ فَلَمْ يَدْخُلْ عَلَيْهَا، وَجَاءَ عَلِيٌّ فَذَكَرَتْ لَهُ ذَلِكَ، فَذَكَرَهُ لِلنَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: "إِنِّي رَأَيْتُ عَلَى بَابِهَا سِتْرًا مَوْشِيًّا". فَقَالَ: "مَا لِي وَلِلدُّنْيَا". فَأَتَاهَا عَلِيٌّ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهَا، فَقَالَتْ لِيَأْمُرْنِي فِيهِ بِمَا شَاءَ. قَالَ: "تُرْسِلُ بِهِ إِلَى فُلاَنٍ. أَهْلِ بَيْتٍ بِهِمْ حَاجَةٌ".

٢٦١٣- ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ماڵی فاتیمە، بەڵام نەهاتە ژوورەوە بۆ لای فاتیمە، كە عەلی هاتەوە و فاتیمە ئەو باسەی بۆ گێڕایەوە، عەلیش ئەو باسەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس كرد (هۆكاری چی بووە؟)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان پەردەیەكی ڕەنگاو ڕەنگم بینی بەسەر دەرگاكەیەوە))، جا فەرمووی ﷺ: ((من چیم داوە لە دونیا)) جا عەلی هات بۆ لای فاتیمە و فەرموودەكەی بۆ گێڕایەوە، فاتیمەش وتی: لەبارەی پەردەكەوە با فەرمانم پێ بكات بەوەی دەیەوێت، فەرمووی: ((ئەو پەردەیە بنێرە بۆ فلان كەس كە خێزانێكی نەدارن پێویستیان پێیەتی)).

٢٦١٤- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ المَلِكِ بْنُ مَيْسَرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ وَهْبٍ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: أَهْدَى إِلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ حُلَّةً سِيَرَاءَ فَلَبِسْتُهَا، فَرَأَيْتُ الغَضَبَ فِي وَجْهِهِ، فَشَقَقْتُهَا بَيْنَ نِسَائِي(١).

**٢٦١٤- عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پۆشاکێکی خەت خەت کە ئاوریشمی تێکەڵ بوو بەدیار بۆ ناردم، منیش لەبەرم کرد، جا (کە پێغەمبەر ﷺ دی لەبەرمدا) توڕەییم لە دەم و چاویدا بینی، بۆیە منیش لەتم کرد، لە نێوان ئافرەتانی ماڵەوەماندا (دابەشم کرد وەك سەرپۆش).**

## ٢٨- بابُ قبُولِ الهَدِيَّةِ مِنَ المُشْرِكِينَ

وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: "هَاجَرَ إِبْرَاهِيمُ ﷺ بِسَارَةَ فَدَخَلَ قَرْيَةً فِيهَا مَلِكٌ -أَوْ جَبَّارٌ- فَقَالَ: أَعْطُوهَا آجَرَ".

وَأُهْدِيَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ شَاةٌ فِيهَا سُمٌّ. وَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: أَهْدَى مَلِكُ أَيْلَةَ لِلنَّبِيِّ ﷺ بَغْلَةً بَيْضَاءَ، وَكَسَاهُ بُرْدًا، وَكَتَبَ لَهُ بِبَحْرِهِمْ.

## ٢٨- باسی وەرگرتنی دیاری لە هاوبەش دانەران (دروستە)

**ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((ئیبراهیم ﷺ لەگەڵ سارە کۆچیان کرد، ئینجا ڕۆیشتە شارێکەوە کە پادشایەك -یان زۆردارێکی- تێدا بوو، وتی: ئاجەر(٢) بدەن بە سارە)).**

**وە (گۆشتی) مەڕێك بەدیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ژەهری پێوە بوو. ئەبو حومەید دەڵێ: پادشای ئەیلە هێسترێکی سپی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ،**

(١) بڕوانە: ٥٣٦٦، ٥٨٤٠.

(٢) بە هاجەریش هاتووە، کەنیزەکێک بووە ئەو پادشایە داویەتی بە سارە.(إرشاد الساري:٥١/٦).

پێغەمبەریش ﷺ پۆشاكێكی خەت خەتی بەدیاری بۆ نارد و نامەیەكی بۆ نووسی، بەگەورەی وڵاتی خۆی (هێشتیەوە).

٢٦١٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ قَتَادَةَ، حَدَّثَنَا أَنَسٌ ﷺ قَالَ: أُهْدِيَ لِلنَّبِيِّ ﷺ جُبَّةُ سُنْدُسٍ -وَكَانَ يَنْهَى عَنِ الحَرِيرِ- فَعَجِبَ النَّاسُ مِنْهَا، فَقَالَ: "وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَمَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الجَنَّةِ أَحْسَنُ مِنْ هَذَا"[1].

**٢٦١٥- قەتادە دەڵێ: ئەنەس ﷺ بۆی گێڕاینەوە جوبیەیەكی ئاوریشمی ئەستوور بەدیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ -وە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری دەكرد لە پۆشینی ئاوریشم-، خەڵك بەو جوبیە سەرسام بوون، ئەویش فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە دەستەسڕەكانی سەعدی كوڕی موعاز لە بەهەشتدا لەمە چاكتر و جوانترە)).**

٢٦١٦- وَقَالَ سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ: إِنَّ أُكَيْدِرَ دُومَةَ أَهْدَى إِلَى النَّبِيِّ - ﷺ[2].

**٢٦١٦- ئەنەس ﷺ دەڵێ: بێگومان ئوكەیدری (پادشای) دۆمە[3] دیارییەكی بۆ پێغەمبەر ﷺ نارد (كە جوبیەیەكی ئاوریشم بوو).**

٢٦١٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ يَهُودِيَّةً أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ بِشَاةٍ مَسْمُومَةٍ، فَأَكَلَ مِنْهَا، فَجِيءَ بِهَا فَقِيلَ: أَلاَ نَقْتُلُهَا؟ قَالَ: "لاَ". فَمَا زِلْتُ أَعْرِفُهَا فِي لَهَوَاتِ رَسُولِ اللهِ ﷺ.

---

(١) بڕوانە: ٦١٦١، ٣٢٤٨.

(٢) بڕوانە: ٢٦١٥.

(٣) دۆمە جەندەل: شارێكە نزیک تەبوک باخی دارخورما و كشتوكاڵی هەیە، دە قۆناغ لە مەدینەوە دوورە، وە هەشت قۆناغ لە دیمەشقەوە دوورە.(إرشاد الساري:٥٢/٦).

**٢٦١٧- هیشامی کوڕی زەید دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئافرەتێکی جولەکە مەڕێکی ژەهراوی هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ لێی خوارد، ئینجا ئافرەتەکەیان هێناو وترا: ئایا ئەم ئافرەتە نەکوژین؟ فەرمووی: ((نەخێر))، ئەنەس دەڵێ: من بەردەوام شوێنەواری ئەو (خواردنە ژەهراوییەم) هەست پێدەکرد لە مەلاشوو و گەرووی[1] پێغەمبەردا ﷺ.**

٢٦١٨- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا المُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ثَلاَثِينَ وَمِائَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "هَلْ مَعَ أَحَدٍ مِنْكُمْ طَعَامٌ؟ ". فَإِذَا مَعَ رَجُلٍ صَاعٌ مِنْ طَعَامٍ أَوْ نَحْوُهُ، فَعُجِنَ ثُمَّ جَاءَ رَجُلٌ مُشْرِكٌ -مُشْعَانٌّ طَوِيلٌ- بِغَنَمٍ يَسُوقُهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "بَيْعًا أَمْ عَطِيَّةً؟ " أَوْ قَالَ: "أَمْ هِبَةً؟ ". قَالَ: لَا، بَلْ بَيْعٌ. فَاشْتَرَى مِنْهُ شَاةً، فَصُنِعَتْ وَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِسَوَادِ البَطْنِ أَنْ يُشْوَى، وَايْمُ اللهِ مَا فِي الثَّلاَثِينَ وَالمِائَةِ إِلَّا قَدْ حَزَّ النَّبِيُّ ﷺ لَهُ حُزَّةً مِنْ سَوَادِ بَطْنِهَا، إِنْ كَانَ شَاهِدًا أَعْطَاهَا إِيَّاهُ، وَإِنْ كَانَ غَائِبًا خَبَأَ لَه، فَجَعَلَ مِنْهَا قَصْعَتَيْنِ، فَأَكَلُوا أَجْمَعُونَ، وَشَبِعْنَا، فَفَضَلَتِ القَصْعَتَانِ، فَحَمَلْنَاهُ عَلَى البَعِيرِ. أَوْ كَمَا قَالَ[2].

**٢٦١٨- عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر ﷺ دەڵێ: ئێمە سەد و سی کەس بووین لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا کەسێك لەئێوە خواردنی پێیە؟))، لەوکاتەدا بینیمان پیاوێك مەنێك یان ئەو ئەندازەیە ئاردی پێیە، جا کرا بەهەویر و شێلرا، پاشان پیاوێکی بتپەرستی قژ ئاڵسکاوی درێژ- هات، ڕانە مەڕێکی دابوویە بەر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (بەپیاوەکە): ((ئەم مەڕانە دەفرۆشی یان دەیبەخشی؟))، یان فەرمووی: ((بە خەڵات**

---

(١) کە بەهۆیەوە هەندێک جار نەخۆش دەکەوت.(إرشاد الساري:٦/٥٣).

(٢) بڕوانە: ٢٢١٦.

دەیدەیت؟))، پیاوەکە وتی: بەبەخشین و خەلات نایدەم، بەلکو بە فرۆشتن دەیفرۆشم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ مەڕێکی لێ کڕی، (سەربڕاو) چاککرا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد ناو سکەکەی (سی و جگەرەکەی) ببرژێنن، جا سوێند بەخوا لەو سەد و سی کەسە کەس نەما پێغەمبەر ﷺ پارچەیەکی لەو ناوسکە بۆ نەبڕێت و (بەشی نەدات)، جا ئەگەر ئامادەبووایە پێی دەدا، وە ئەگەر ئامادە نەبووایە بۆی هەلدەگرت، گۆشتی ئەو مەڕە (دوای کولانی) کرایە دوو تەشتی گەورەوە، هەمووی لێی خواردو تێرمان خوارد، هەندێکیش لەو دوو تەشتە مایەوە، نامان لە وشترێك، یان وەك ئەوەی ئەو وتی.

## ٢٩- بابُ الهَدِيَّةِ لِلْمُشْرِكِينَ

وَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ الممتحنة.

## ٢٩- باسی پێدانی دیاری بەهاوبەشدانەران

ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بلند: (خوا رێتان لێ ناگرێ لەگەل ئەوانەی کە جەنگیان لەدژتان نەکردووە لەسەر ئەم دینە، وە دەریان نەکردوون لە جێگەو شوێنەکانتان کە چاکەیان لەگەل بکەن، وە دادیان لەگەل بنوێنن، بێگومان خوا دادگەرانی خۆش دەوێت).

٢٦١٩- حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلاَلٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: رَأَى عُمَرُ حُلَّةً عَلَى رَجُلٍ تُبَاعُ فَقَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: ابْتَعْ هَذِهِ الحُلَّةَ

تَلْبَسْهَا يَوْمَ الجُمُعَةِ وَإِذَا جَاءَكَ الوَفْدُ. فَقَالَ: "إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذَا مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ فِي الآخِرَةِ". فَأُتِيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْهَا بِحُلَلٍ، فَأَرْسَلَ إِلَى عُمَرَ مِنْهَا بِحُلَّةٍ، فَقَالَ عُمَرُ: كَيْفَ أَلْبَسُهَا وَقَدْ قُلْتَ فِيهَا مَا قُلْتَ؟! قَالَ: "إِنِّي لَمْ أَكْسُكَهَا لِتَلْبَسَهَا، تَبِيعُهَا أَوْ تَكْسُوهَا". فَأَرْسَلَ بِهَا عُمَرُ إِلَى أَخٍ لَهُ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ[1].

**٢٦١٩- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب پۆشاکێکی خەت خەتی ئاوریشمی بینی لەبەر دەرگای مزگەوتدا دەفرۆشرا، وتی بە پێغەمبەر ﷺ: ئەم پۆشاکە بکڕە بۆ ڕۆژانی هەینی و بۆ پێشوازی وەفد و نوێنەر کە دێت بۆ لات لەبەری بکە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان کەسێك ئەم پۆشاکە (ئاوریشمە) لەبەر دەکات لەڕۆژی دواییدا هیچ بەشێکی نەبێت))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لەو جۆرە چەند پۆشاکێکی ئاوریشمی بۆ هات، جا پۆشاکێکیانی نارد بۆ عومەری کوڕی خەتتاب، عومەریش وتی: چۆن لەبەری بکەم لەکاتێکدا جەنابت دەربارەی ئەوەت فەرموو کە فەرمووت (ئەمەم بۆ ڕوون بکەوە)؟! پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی من بۆ ئەوە ئەم پۆشاکەم پێ نەداوی کە لەبەری بکەیت، بیفرۆشە، یان بەکەسێکی تری بپۆشە))، بۆیە عومەری کوڕی خەتتاب ناردی بۆ برایەکی لە مەککە بوو پێش ئەوەی مسوڵمان ببێت.**

**٢٦٢٠-** حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ قَالَتْ: قَدِمَتْ عَلَيَّ أُمِّي وَهْيَ مُشْرِكَةٌ، فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَاسْتَفْتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ قُلْتُ: إِنَّ أُمِّي قَدِمَتْ وَهْيَ رَاغِبَةٌ، أَفَأَصِلُ أُمِّي؟ قَالَ: "نَعَمْ صِلِي أُمَّكِ"[2].

---

(١) بڕوانە: ٨٨٦.

(٢) بڕوانە: ٣١٨٣، ٥٩٧٨، ٥٩٧٩.

٢٦٢٠- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر[1] ﷺ دەڵێ: دایکم لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ هات بۆ لام لەکاتێکدا بتپەرست بوو، جا پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و وتم: بێگومان دایکم هاتووە، بەتەمایە شتێکی پێبدەم، جا ئایا چاکە لەگەڵ دایکمدا بکەم؟ فەرمووی: ((بەڵێ چاکە لەگەڵ دایکت بکە))[2].

## ٣٠- بابٌ: لَا يَحِلُّ لِأَحَدٍ أَنْ يَرْجِعَ فِي هِبَتِهِ وَصَدَقَتِهِ

٢٦٢١- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ وَشُعْبَةُ قَالَا: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "العَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالعَائِدِ فِي قَيْئِهِ"[3].

## ٣٠- باسێک: بۆ هیچ کەس دروست نییە کە لە خەڵاتەکەی و خێرەکەی پەشیمان بێتەوە

٢٦٢١- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسەی پاشگەزبێتەوە لە بەخشینەکەی، وەك ئەو (سەگە) وایە بڕشێتەوە، پاشان بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی)).

٢٦٢٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الْمُبَارَكِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السَّوْءِ، الَّذِي يَعُودُ فِي هِبَتِهِ كَالكَلْبِ يَرْجِعُ فِي قَيْئِهِ"[4].

---

(١) سەرنج: دایکی ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ئافرەتێک بوو ئەبو بەکر لە جاهیلیەتدا تەڵاقی دابوو، کەواتە ئەسما و عائیشە دایکیان جیایە. بڕوانە: فتح الباری: ٢٨٧/٥.

(٢) ئەم فەرموودە بەم جۆرەش دروستە مانا بکرێت: دایکم هاتووە حەزدەکات من ببینێت، ئایا سەردانی بکەم؟ فەرمووی: ((بەڵێ سەردانی بکە).

(٣) بڕوانە: ٢٥٨٩.

(٤) بڕوانە: ٢٥٨٩.

**٢٦٢٢- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئێمە نموونەی ناشیرینمان نییە (وەك نموونەی) ئەو كەسەی لە بەخشینەكەی پاشگەز دەبێتەوە، وەك ئەو سەگە وایە كە دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەكەی خۆی (و دەیخوات)[1])).**

٢٦٢٣- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ قَزَعَةَ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: حَمَلْتُ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَأَضَاعَهُ الذِي كَانَ عِنْدَهُ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِيَهُ مِنْهُ، وَظَنَنْتُ أَنَّهُ بَائِعُهُ بِرُخْصٍ، فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: "لَا تَشْتَرِهِ، وَإِنْ أَعْطَاكَهُ بِدِرْهَمٍ وَاحِدٍ، فَإِنَّ العَائِدَ فِي صَدَقَتِهِ كَالكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ"[2].

**٢٦٢٣- زەیدی كوڕی ئەسلەم لە باوكیەوە دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: لە عومەری كوڕی خەتتابم بیست ﷺ دەیوت: ئەسپێكم بەخشی بەپیاوێك بۆ خەبات و جیهاد لە ڕێی خوادا سواری بێ، ئەو كەسەش ئەسپەكەی لابوو خزمەتی نەكرد و گوێی پێ نەدا، بۆیە ویستم لێی بكڕمەوە، وە گومانم وابوو بە هەرزان دەیفرۆشێ، جا پرسیارم لە پێغەمبەر كرد ﷺ لەو بارەوە، ئەویش فەرمووی: ((مەیكڕەوە با بەیەك دیرهەمیش بتداتێ، چونكە ئەو كەسەی لە خێرەكەی دەگەڕێتەوە (دەیكڕێتەوە)، وەك ئەو سەگە وایە دەگەڕێتەوە بۆ ڕشانەوەكەی خۆی دەخواتەوە)).**

## ٣١- بابٌ

٢٦٢٤- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ أَنَّ بَنِي صُهَيْبٍ -مَوْلَى ابْنِ جُدْعَانَ- ادَّعَوْا بَيْتَيْنِ وَحُجْرَةً، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَعْطَى ذَلِكَ صُهَيْبًا، فَقَالَ مَرْوَانُ: مَنْ يَشْهَدُ لَكُمَا عَلَى ذَلِكَ؟ قَالُوا: ابْنُ عُمَرَ. فَدَعَاهُ فَشَهِدَ: لَأَعْطَى رَسُولُ اللهِ ﷺ صُهَيْبًا بَيْتَيْنِ وَحُجْرَةً. فَقَضَى مَرْوَانُ بِشَهَادَتِهِ لَهُمْ.

---

(١) ئەم زیادەیە لە موسلیمدا هاتووە بە ژمارە (٤١٧٠).

(٢) بڕوانە: ١٤٩٠.

## ٣١- باسێک

٢٦٢٤- عەبدوڵڵای کوڕی عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبو مولەیکە دەگێڕێتەوە کە کوڕانی صوهەیبی -ئازادکراوی ئیبنو جودعان- دەیانوت:[١] پێغەمبەری خوا ﷺ دوو خانوو و هۆدەیەکی بەخشیوە بە صوهەیب (ی باوکیان)، مەڕوانیش وتی پێیان: کێ شایەتیتان بۆ دەدات لەسەر ئەو قسەیەتان؟ وتیان: ئیبنو عومەر ﷺ، مەڕوانیش ئیبنو عومەری بانگ کرد، ئەویش شایەتی دا کە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو خانوو و هۆدەیەکی بەخشیوە بەصوهەیب، ئینجا مەڕوانیش لەسەر شایەتییەکەی ئیبنو عومەر بڕیاری بۆ دان.

## ٣٢- بابُ مَا قِيلَ فِي العُمْرَى وَالرُّقْبَى

أَعْمَرْتُهُ الدَّارَ فَهْيَ عُمْرَى جَعَلْتُهَا لَهُ ﴿ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ﴿٦١﴾ ﴾ هود: جَعَلَكُمْ عُمَّارًا.

٢٦٢٥- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَضَى النَّبِيُّ ﷺ بِالعُمْرَى أَنَّهَا لِمَنْ وُهِبَتْ لَهُ[٢].

## ٣٢- باسی ئەوەی کە وتراوە دەربارەی بەخشین بە کەسێک تا لە ژیاندا بێت، وە بەخشینی چاوەڕوانی[٣]

خانووەکەم پێدا تا لە ژیاندا بێت ئەوە (عُمری)یە، واتە: کردمە موڵکی ئەو (تا لەژیاندا بێت)، ئەم ئایەتەش: (خوا ئێوەی کردوە بەئاوەدانکەرەوە تێیدا)، کردوونی بەئاوەدانکەرەوەی.

---

(١) لەبەردەم مەڕوانی کوڕی حەکەمدا کە کاربەدەستی مەدینە بوو، بەفەرمانی موعاویە کە گەورەی موسڵمانان بوو.(فتح الباري:٦/٢٩٧).

(٢) بڕوانە: ٢٦٢٦.

(٣) بەخشینی چاوەڕوانی ئەوەیە کەسێک بڵێت: ئەم شتەم بەخشی بە تۆ ئەگەر من پێش تۆ مردم بۆ تۆ، ئەگەر تۆ لە پێش مندا مردی ئەوە بگەڕێتەوە بۆ خۆم.(بڕوانە:فتح الباري:٦/٢٩٨).

٢٦٢٥- جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بڕیاری دا کە بێگومان عومرا بۆ ئەو کەسەیە پێی بەخشراوە.

٢٦٢٦- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ قَالَ: حَدَّثَنِي النَّضْرُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ بَشِيرِ بْنِ نَهِيكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "العُمْرَى جَائِزَةٌ".
وَقَالَ عَطَاءٌ: حَدَّثَنِي جَابِرٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. نَحْوَهُ[(١)].

٢٦٢٦- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((بەخشین بەکەسێك تا لەژیاندا بێ دروستە))، عەتا دەڵێ: جابیر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ وێنەی فەرموودەکەی پێشووی[(٢)] بۆ گێڕامەوە.

## ٣٣- بابُ مَنِ اسْتَعَارَ مِنَ النَّاسِ الفَرَسَ

٢٦٢٧- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا يَقُولُ كَانَ فَزَعٌ بِالمَدِينَةِ فَاسْتَعَارَ النَّبِيُّ ﷺ فَرَسًا مِنْ أَبِي طَلْحَةَ يُقَالُ لَهُ المَنْدُوبُ، فَرَكِبَ فَلَمَّا رَجَعَ قَالَ: "مَا رَأَيْنَا مِنْ شَيْءٍ، وَإِنْ وَجَدْنَاهُ لَبَحْرًا"[(٣)].

## ٣٣- باسی کەسێک ئەسپێک لە خەڵک بخوازێت

٢٦٢٧- قەتادە دەڵێ: لە ئەنەسم ﷺ بیست دەیوت: لە مەدینەدا ترس و بیمێك دروست بوو[(٤)]، جا پێغەمبەریش ﷺ ئەسپێکی لە ئەبو تەڵحە خواست کە پێی

(١) بڕوانە: ١٦٢٥.

(٢) کە ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕایەوە بەژمارە: ٢٦٢٦.

(٣) بڕوانە: ٢٨٢٠، ٢٨٥٧، ٢٨٦٢، ٢٨٦٦، ٢٨٦٧، ٢٩٠٨،٢٩٦٨، ٢٩٦٩، ٣٠٤٠، ٦٠٢٣، ٦٢١٢.

(٤) گوایە دوژمن بێنە سەر مەدینە یان شتێک لەوجۆرە.

دەوترا: (المَنْدُوبُ)، ئینجا سواری بوو، جا کە گەڕایەوە فەرمووی: ((هیچ شتێکمان نەبینی[١]، وە بەڕاستی ئەم ئەسپە زۆر خێرایە و بەهەڵمەتە)).

## ٣٤- بابُ الاسْتِعَارَةِ لِلْعَرُوسِ عِنْدَ البِنَاءِ

٢٦٢٨- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ بْنُ أَيْمَنَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: دَخَلْتُ على عَائِشَةَ ﵂ وَعَلَيْهَا دِرْعُ قِطْرٍ ثَمَنُ خَمْسَةِ دَرَاهِمَ، فَقَالَتِ: ارْفَعْ بَصَرَكَ إِلَى جَارِيَتِي، انْظُرْ إِلَيْهَا فَإِنَّهَا تُزْهَى أَنْ تَلْبَسَهُ فِي البَيْتِ، وَقَدْ كَانَ لِي مِنْهُنَّ دِرْعٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَمَا كَانَتِ امْرَأَةٌ تُقَيَّنُ بِالْمَدِينَةِ إِلَّا أَرْسَلَتْ إِلَيَّ تَسْتَعِيرُهُ.

## ٣٤- باسی خواستنی (جل و بەرگ) بۆ بووک و زاوا لەکاتی ژن هێناندا

٢٦٢٨- ئەبو واحیدی کوڕی ئەیمەن دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە وتی: ڕۆیشتم بۆ ماڵی عائیشە ﵂ کراسێکی (قیطری[٢]) لەبەردابوو، کە نرخەکەی پێنج درهەم بوو، عائیشە وتی: سەربەرزکەرەوە و تەماشای کەنیزەکەکەم بکە، خۆی لەوە بەگەورەتر دەزانی لە ماڵەوە لەبەری بکا، وە لە ڕابردوودا من لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا یەکێك لەم پۆشاکانەم هەبوو، هەر ئافرەتێك لە مەدینە بڕازێنرایەتەوە بە بووکی، دەینارد بۆ لام و دەیخواست (تا خۆی پێ بڕازێنێتەوە).

---

(١) مایەی ترسان بێت.

(٢) جۆرە پۆشاکێکە لە یەمەن دروست دەکرا و دەهێنرا بۆ مەدینە و شوێنەکانی تر.(بڕوانە: فتح الباري:٦/٣٠٢).

## ٣٥- بابُ فَضْلِ المَنِيحَةِ

٢٦٢٩- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "نِعْمَ المَنِيحَةُ اللِّقْحَةُ الصَّفِيُّ مِنْحَةً، وَالشَّاةُ الصَّفِيُّ تَغْدُو بِإِنَاءٍ وَتَرُوحُ بِإِنَاءٍ". حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ وَإِسْمَاعِيلُ، عَنْ مَالِكٍ قَالَ: "نِعْمَ الصَّدَقَةُ"[1].

## ٣٥- باسی گەورەیی پێدانی ئاژەڵ بەکەسێک بۆ شیر و ماستەکەی

**٢٦٢٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((چاکترین بەخشین پێدانی ئاژەڵێکی شیرای ئاوسە، بەکەسێك بۆ شیر و ماستەکەی، هەروەها مەڕێکی چاکی شیرا، بەیانیان و ئێواران جامێ شیر دەبەخشێت بەو کەسە(ی پێی بەخشراوە) )). بوخاری دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی یوسف و ئیسماعیل لە مالیکەوە دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((چەند خێرێکی گەورەیە)).**

٢٦٣٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ أَخْبَرَنَا ابْن وَهْبٍ، حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ المُهَاجِرُونَ المَدِينَةَ مِنْ مَكَّةَ وَلَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ -يَعْنِي: شَيْئًا- وَكَانَتِ الأَنْصَارُ أَهْلَ الأَرْضِ وَالعَقَارِ، فَقَاسَمَهُمُ الأَنْصَارُ عَلَى أَنْ يُعْطُوهُمْ ثِمَارَ أَمْوَالِهِمْ كُلَّ عَامٍ وَيَكْفُوهُمُ العَمَلَ وَالمَئُونَةَ، وَكَانَتْ أُمُّهُ أُمُّ أَنَسٍ أُمُّ سُلَيْمٍ. كَانَتْ أُمَّ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، فَكَانَتْ أَعْطَتْ أُمُّ أَنَسٍ رَسُولَ اللهِ ﷺ عِذَاقًا، فَأَعْطَاهُنَّ النَّبِيُّ ﷺ أُمَّ أَيْمَنَ مَوْلاَتَهُ أُمَّ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا فَرَغَ مِنْ قَتْلِ أَهْلِ خَيْبَرَ فَانْصَرَفَ إِلَى المَدِينَةِ، رَدَّ المُهَاجِرُونَ إِلَى الأَنْصَارِ مَنَائِحَهُمُ الَّتِى

---

(١) بروانه: ٥٦٠٨.

كَانُوا مَنَحُوهُمْ مِنْ ثِمَارِهِمْ، فَرَدَّ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى أُمِّهِ عِذَاقَهَا، وَأَعْطَى رَسُولُ اللهِ ﷺ أُمَّ أَيْمَنَ مَكَانَهُنَّ مِنْ حَائِطِهِ[1].

وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ شَبِيبٍ أَخْبَرَنَا: أَبِي، عَنْ يُونُسَ بِهَذَا، وَقَالَ مَكَانَهُنَّ مِنْ خَالِصِهِ.

**٢٦٣٠- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: كاتێك كۆچەران لە مەككەوە هاتن بۆ مەدینە، بەدەستی بەتاڵ و خاڵی هاتن -واتە: هیچیان نەبوو-، ئەنصارییەكانیش خاوەنی زەوی و زار و باخ بوون، بۆیە ئەنصارییەكان كۆچەرییەكانیان كردە بەشدار لەگەڵ خۆیاندا، لەسەر ئەوەی كە هەموو ساڵێك نیوەی بەروبوومی باخەكانیان پێ بدەن، كۆچەرییەكان لەبری ئەوان كاری خزمەتكردن و ئاودێری باخەكان بكەن، دایكی ئەنەس كە ناوی ئوممو سولەیم بوو دایكی عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو تەڵحەش بوو[2]، دایكی ئەنەس چەند دارخورمایەكی[3] خۆی دابوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ چەند دارخورمایەكەی[4] دا بەدایكی ئەیمەن، كە دایكی ئوسامەی كوڕی زەیدە. ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ هەواڵی دامێ پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی خەیبەر بوویەوەو گەڕایەوە بۆ مەدینە، كۆچبەران ئەو دارخورمایانەیان گێڕایەوە بۆ ئەنصارییەكان كە پێشتر بەروبوومەكەیان پێ بەخشیبوون، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دارخورماكەی دایكی ئەنەسی گێڕایەوە بۆی، لەجیاتی ئەو دارخورمایە پێغەمبەری خوا ﷺ لە باخەكەی خۆی بەشی ئوممو ئەیمەنی دا. ئەحمەدی كوڕی شەبیب دەڵێ: باوكم ئەم فەرموودەی بۆی گێڕاینەوە لەیونسەوە، بەڵام وتی: لەجیاتی ئەو دارخورمایە بەشی ئوممو ئەیمەنی دا لەماڵی تایبەتی خۆی.**

---

(١) بڕوانە: ٣١٢٨، ٤٠٣٠، ٤١٢٠.

(٢) واتە: ئەنەس و تەڵحە بران و لە دایكەوە بەڵام باوكیان جیایە.

(٣) یان بەروبوومی دار خورماكانی.

(٤) یان بەروبوومی دار خورماكانی.

٢٦٣١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، عَنْ حَسَّانَ بْنِ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي كَبْشَةَ السَّلُولِيِّ، سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "أَرْبَعُونَ خَصْلَةً أَعْلاَهُنَّ مَنِيحَةُ العَنْزِ، مَا مِنْ عَامِلٍ يَعْمَلُ بِخَصْلَةٍ مِنْهَا رَجَاءَ ثَوَابِهَا وَتَصْدِيقَ مَوْعُودِهَا إِلَّا أَدْخَلَهُ اللهُ بِهَا الجَنَّةَ". قَالَ حَسَّانُ: فَعَدَدْنَا مَا دُونَ مَنِيحَةِ العَنْزِ، مِنْ رَدِّ السَّلاَمِ، وَتَشْمِيتِ العَاطِسِ، وَإِمَاطَةِ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ وَنَحْوِهِ، فَمَا اسْتَطَعْنَا أَنْ نَبْلُغَ خَمْسَ عَشْرَةَ خَصْلَةً.

**٢٦٣١- عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((چل ئاکاری چاك هەن، بەرزترینیان بەخشینی بزنێکە (بەکەسێك شیر و ماستەکەی بخوات و دواتر بگەڕێنرێتەوە)، جا هەرکەسێك کار بەیەکێك لەو ئاکارە چاك و جوانانە بکات بەئومێدی پاداشتەکەی و باوەڕبوون بەبەڵێنەکەی خوا لەسەری، بێگومان خوا دەیخاتە بەهەشتەوە)). حەسسان دەڵێ: جا ئێمە ئەوەی لە خوارووی بەخشینی بزنەوە بوو (بۆ شیر و ماستەکەی) لە ئاکارە چاکەکان ژماردمان: لەوەڵامدانەوەی سەلام، کەسێك پژمی و (الحَمدُ لله)ی کرد پێی بڵێیت: (يَرحمُكَ الله)، لابردنی داروبەرد و شتی وا لەسەر ڕێگادا، بەڵام نەمانتوانی بیگەیەنینە پانزە ئاکاری چاك.**

٢٦٣٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي عَطَاءٌ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كَانَتْ لِرِجَالٍ مِنَّا فُضُولُ أَرَضِينَ فَقَالُوا : نُؤَاجِرُهَا بِالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ وَالنِّصْفِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا أَوْ لِيَمْنَحْهَا أَخَاهُ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُمْسِكْ أَرْضَهُ"(١).

**٢٦٣٢- جابیر ﷺ وتی: پیاوانێك لە ئێمە زەویان هەبوو لە خۆیان زیاد بوو، جا وتیان: دەیدەین بەکشتیاری بە سێ یەك یان چوار یەك یان نیوە. پێغەمبەریش**

(١) بڕوانە: ١٤٨٧.

ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس زەوی هەیە باخۆی دایچێنێت یان بیبەخشێت بەبراکەی (دایچێنێت)، خۆ ئەگەر واینەکرد با زەوییەکەی بهێڵێتەوە (هیچی لێ نەکات) )).

٢٦٣٣- وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، حَدَّثَنِي الزُّهْرِيُّ، حَدَّثَنِي عَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ، حَدَّثَنِي أَبُو سَعِيدٍ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنِ الهِجْرَةِ، فَقَالَ: "وَيْحَكَ، إِنَّ الهِجْرَةَ شَأْنُهَا شَدِيدٌ، فَهَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟ " قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: "فَتُعْطِي صَدَقَتَهَا؟ ". قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: "فَهَلْ تَمْنَحُ مِنْهَا شَيْئًا؟ ". قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: "فَتَحْلُبُهَا يَوْمَ وِرْدِهَا؟". قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: "فَاعْمَلْ مِنْ وَرَاءِ البِحَارِ، فَإِنَّ اللهَ لَنْ يَتِرَكَ مِنْ عَمَلِكَ شَيْئًا"[١].

**٢٦٣٣- ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: دەشتەکییەك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێ کرد دەربارەی کۆچکردن، ئەویش فەرمووی: ((هاوار بۆ تۆ! بەڕاستی کۆچکردن کارێکی سەخت و گرانە، ئایا وشترت هەیە؟))، وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((زەکاتیشی دەدەیت؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((هیچ لەو وشترانە دەدەیت بەخەڵك کە شیر و ماستەکەی بخۆن))، وتی: بەڵێ، فەرمووی: (لە ڕۆژی خۆی[٢] دەیدۆشی؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((کەواتە تۆ چاکەکە بکە، با لەوپەڕی دەریاکانیشەوە بێت، ئەوە دڵنیابە خوا هیچێك لەکردەوەکانت فەرامۆش ناکات)).**

٢٦٣٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ طَاوُسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَعْلَمُهُمْ بِذَاكَ -يَعْنِي: ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ إِلَى أَرْضٍ تَهْتَزُّ زَرْعًا فَقَالَ: "لِمَنْ هَذِهِ". فَقَالُوا: اكْتَرَاهَا فُلَانٌ. فَقَالَ: "أَمَا إِنَّهُ لَوْ مَنَحَهَا إِيَّاهُ كَانَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهَا أَجْرًا مَعْلُومًا"[٣].

---

(١) بڕوانە: ١٤٥٢.

(٢) لە هەندێ نوسخەی بوخاریدا (ورودها) واتە: لە ڕۆژی نۆرەی ئاوخواردنەوەیدا دەیفرۆشی؟.(إرشاد الساري:٦/٦٧).

(٣) بڕوانە: ٢٣٣٠.

٢٦٣٤- عەمر لە تاووسەوە گێڕایەوە وتی: زاناترینیان بەو باسە -مەبەستی: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس بوو ﷺ- بۆی گێڕامەوە، كە پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بۆ لای زەوییەك كشتوكاڵەكەی دەشەكایەوە، فەرمووی: ((ئەمە هی كێیە؟))، عەرزیان كرد: هی فلانەو بەكرێی داوە، ئەویش فەرمووی: ((سا بێگومان ئەگەر پێی ببەخشیبایە ئەوە چاكتر بوو بۆی لەوەی كرێیەكی دیاری كراو لە بەرانبەریدا وەربگری)).

## ٣٦ - بابٌ: إِذَا قَالَ:أَخْدَمْتُكَ هَذِهِ الجَارِيَةَ عَلَى مَا يَتَعَارَفُ النَّاسُ، فَهُوَ جَائِزٌ

وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: هَذِهِ عَارِيَّةٌ. وَإِنْ قَالَ: كَسَوْتُكَ هَذَا الثَّوْبَ، فَهُوَ هِبَةٌ.

٢٦٣٥- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا ابو الزِّنَادِ، عَنِ الأعرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "هَاجَرَ إِبْرَاهِيمُ بِسَارَةَ، فَأَعْطَوْهَا آجَرَ، فَرَجَعَتْ فَقَالَتْ: أَشَعَرْتَ أَنَّ اللهَ كَبَتَ الكَافِرَ وَأَخْدَمَ وَلِيدَةً؟ ". وَقَالَ ابن سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هريرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: "فَأَخْدَمَهَا هَاجَرَ"[١].

## ٣٦- باسێك: ئەگەر كەسێك وتی: ئەم كەنیزەكەم كردە خزمەتكارت بەو جۆرەی باوی ناو خەڵكە ئەوە دروستە

هەندێك كەس[٢] دەڵێن: ئەمە خواستنە، ئەگەر كەسێك بڵێت: ئەم پۆشاكەم پێدای بیپۆشی ئەوە بەخشینە.

٢٦٣٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئیبراهیم ﷺ لەگەڵ سارە كۆچیان كرد، ئینجا (پادشایەك) ئاجەری دابە سارە،

(١) بڕوانە: ٢٢١٧.

(٢) كرمانی دەڵێ: مەبەستی ئیمام بوخاری زانایانی مەزهەبی حەنەفییە.(إرشاد الساري:٦٨/٦).

جاگەڕایەوە و وتی: (بەئیبراهیم) ئایا زانیت و هەستت کرد کە خوا لووتی ئەو کافرەی شکاندو کەنیزەکێکیشی پێدام بۆ خزمەتکاری؟)). ئیبنو سیرین دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((پادشاکە هاجەری دا بەسارە بۆ خزمەتکاری)).

## ٣٧- بَابٌ: إِذَا حَمَلَ رَجُلًا عَلَى فَرَسٍ فَهُوَ كَالعُمْرَى وَالصَّدَقَةِ

وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: لَهُ أَنْ يَرْجِعَ فِيهَا.

٢٦٣٦- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ قَالَ: سَمِعْتُ مَالِكًا يَسْأَلُ زَيْدَ بْنَ أَسْلَمَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: قَالَ عُمَرُ ﷺ حَمَلْتُ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَرَأَيْتُهُ يُبَاعُ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: "لَا تَشْتَرِ، وَلَا تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ"[1].

## ٣٧- باسێک: ئەگەر کەسێک کەسێکی سواری ئەسپێک کرد، ئەوە ئەو کارە وەک بەخشینی تا لە ژیاندابێت و پێی ببەخشی وایە

هەندێك کەس[2] دەڵێن: ئەو کەسەی ئەسپەکەی داوە دروستە پەشیمان ببێتەوە.

٢٦٣٦- عومەر ﷺ دەڵێ: ئەسپێکم بەخشی بەپیاوێك تا لەڕێی خوادا جیهادی پێ بکات، جا دواتر ئەسپەکەم دی دەفرۆشرێت، منیش پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مەیکڕە، پەشیمانیش مەبەرەوە لە بەخشینەکەت)).

(١) بڕوانە: ١٤٩٠.

(٢) مەبەستی ئیمام بوخاری: ئەبو حەنیفەیە ڕەحمەتی خوای لێ بێ.(إرشاد الساري:٦/٧٠).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٥٢- كِتابُ الشهاداتِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٥٢- پەڕاوی شایەتیدان

## ١- بابُ مَا جَاءَ فِي البَيِّنَةِ عَلَى المُدَّعِي

**لقوله تعالى:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَٱكْتُبُوهُ ۚ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌۢ بِٱلْعَدْلِ ۚ وَلَا يَأْبَ كَاتِبٌ أَن يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُ ۚ فَلْيَكْتُبْ وَلْيُمْلِلِ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ فَإِن كَانَ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُۥ بِٱلْعَدْلِ ۚ وَٱسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ ۖ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحْدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَىٰهُمَا ٱلْأُخْرَىٰ ۚ وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْ ۚ وَلَا تَسْـَٔمُوٓاْ أَن تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓاْ ۖ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا ۗ وَأَشْهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ ۚ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ ۚ وَإِن تَفْعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقٌۢ بِكُمْ ۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٨٢﴾ ﴾ **البقرة. وقول الله تعالى:** ﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُواْ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓاْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾ ﴾ **النساء.**

# ١- باسی ئەوەی هاتووە لەبارەی داواکار دەبێ شايەتی هەبێت

بەبەڵگەی ئەم فەرمايشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ئەگەر قەرزێکتان لەيەکتری کرد بۆ ماوەيەکی ناوبراو (دياريکراو) ئەوە بينووسن، وە با نووسەرێك لە نێوانتاندا دادگەرانە بينووسێ، وە هيچ نووسەرێك با سەرپێچی نەکات لە نووسينی (سەنەدی قەرز)دا، هەر وەك خوا ئەوی فێری نووسين کردوە با بينووسێ، وە با ئەو کەسە دەقی سەنەدەکە بڵێ کە قەرزەکەی بەسەرەوەيە، وە لەپەروەردگاری بترسێ، وە هيچی لێ کەم نەکاتەوە، ئينجا ئەگەر ئەو کەسەی قەرزەکەی بەسەرەوەيە کەم ئاوەز بوو يان لاواز بوو، يان نەيدەتوانی خۆی دەقی سەنەدەکە بڵێت، ئەوە با گەورەکەی بەڕاستی (بەڕێکی) بيڵێت، وە لە پياوانی خۆتان (مسوڵمان) دوو شاهيد بگرن، ئينجا ئەگەر دوو پياو نەبوو ئەوە با پياوێك و دوو ژن بن لەوانەی پەسەنديان دەکەن لە شاهيدەکان، بۆ ئەوەی ئەگەر يەکێکيان لەبيری چوو با ئەوی تريان بيری بخاتەوە، با شاهيدەکان سەرپێچی نەکەن کاتێك بانگ کران (بۆ شايەتيدان)، وە بێزار مەبن لەوەی کە بينووسن بچووك بێت يان گەورە، تا کاتی خۆی ئەم نووسينەتان بەلای خواوە ڕاستترە و چەسپێنەرترە بۆ شايەتی دانەکە، وە نزيکترە لەوەی کە نەکەونە گومانەوە، مەگەر کاتێك ئەو کردەوەيە بازرگانييەکی دەست بەدەست بێ بيگێڕن لەناو خۆتاندا، ئەوە لەم کاتەدا گوناهتان ناگات ئەگەر نەينووسن، وە کاتێك کڕين و فرۆشتنتان کرد شاهيد بگرن، وە با زيان بە نووسەر و شاهيد نەگەيەندرێ، وە ئەگەر زيانتان گەياند ئەوە بێگومان گوناهتان دەگات، وە لەخوا بترسن، وە خوا فێرتان دەکات، وە خوا بەهەموو شتێك زانايە)، وە ئەم فەرمايشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی ئەو

**كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە! بەردەوام زۆر دادگەربن، لەبەر خوا شايەتی بدەن با شايەتيەكە دژ بەخۆشتان بێ، يان دژی باوك و دايك و خزمە نزيكەكانتان بێت، ئەگەر (شايەتی لەسەر دراوەكە) دەوڵەمەند بێت يان هەژار (شايەتييەكە هەر بدەن)، چونكە خوا بەوان لە پێشترە (و قازانجيان چاكتر دەزانێت)، كەواتە شوێن ئارەزوو مەكەون بۆ ئەوەی لەهەق لانەدەن، وە ئەگەر (شايەتييەكە) پێچەوانە بدەن، يان نەيدەن و گوێی نەدەنێ، ئەوە بەڕاستی خوا بەكارەكانتان ئاگادارە).**

## ٢ - بابٌ: إِذَا عَدَّلَ رَجُلٌ رجلًا فَقَالَ: لَا نَعْلَمُ إِلَّا خَيْرًا أَوْقَال: مَا عَلِمْتُ إِلَّا خَيْرًا وساقَ حديثَ الإفكِ فقال النبي ﷺ لأسامةَ حينَ عدّلَهُ، قالَ أهلُكَ ولا نعلمُ الاّ خيراً

٢٦٣٧- حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ النُّمَيْرِيُّ حَدَّثَنَا ثَوْبَانُ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، وَابْنُ الْمُسَيَّبِ، وَعَلْقَمَةُ بْنُ وَقَّاصٍ، وَعُبَيْدُ اللهِ، عَنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ ﵂ -وَبَعْضُ حَدِيثِهِمْ يُصَدِّقُ بَعْضًا- حِينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الإِفْكِ مَا قَالُوا، فَدَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلِيًّا وَأُسَامَةَ حِينَ اسْتَلْبَثَ الوَحْيُ يَسْتَأْمِرُهُمَا فِي فِرَاقِ أَهْلِهِ، فَأَمَّا أُسَامَةُ فَقَالَ: أَهْلُكَ وَلَا نَعْلَمُ إِلَّا خَيْرًا. وَقَالَتْ بَرِيرَةُ: إِنْ رَأَيْتُ عَلَيْهَا أَمْرًا أَغْمِصُهُ أَكْثَرَ مِنْ أَنَّهَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ تَنَامُ عَنْ عَجِينِ أَهْلِهَا، فَتَأْتِي الدَّاجِنُ فَتَأْكُلُهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مَنْ يَعْذِرُنَا مِنْ رَجُلٍ بَلَغَنِي أَذَاهُ فِي أَهْلِ بَيْتِي، فَوَاللهِ مَا عَلِمْتُ مِنْ أَهْلِي إِلَّا خَيْرًا، وَلَقَدْ ذَكَرُوا رَجُلًا مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِ إِلَّا خَيْرًا "[١].

---

(١) بڕوانە: ٢٥٩٣.

## ٢- باسێک: ئەگەر پیاوێک کەسێک بەچاک بناسێنێ و بڵێ: جگە لەچاکە هیچمان لەبارەیەوە نەزانیوە، یان بڵێ: تەنها چاکەم (لەبارەیەوە) زانیوە، وە فەرموودەی (إفک) دەهێنێ و پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئوسامە ڕاوێژ دەکات، ئوسامەش دەڵێ: خێزانی خۆتە جگە لەچاکە لەبارەیەوە نازانین

٢٦٣٧- ئیبنو شیهاب دەڵێ: بۆیان گێڕامەوە هەریەك لە عورِوە و ئیبنو موسەییەب و عەلقەمەی کوڕی وەققاص و عوبەیدوڵڵا دەربارەی بەسەرهاتی عائیشە ﵂ دەڵێ: -هەندێکیان ڕاستی ئەوانی تریان دەسەلمێنێ و پاڵپشتی یەکتری دەکردن لە گێڕانەوەکەیاندا- کاتێك ئەو بوهتان چییانە وتیان پێی (عائیشە) زینای کردووە، پێغەمبەری خواش ﷺ عەلی و ئوسامەی ﵄ بانگ کرد، کاتێك دابەزینی نیگا زۆر دواکەوت، ڕایانی وەردەگرت دەربارەی جیابوونەوە لە (عائیشەی ﵂ خێزانی)، جا ئوسامە وتی: ئەو خێزانی خۆتە و چاکە نەبێت لەبارەیەوە نەمانزانیوە، بەریرەش وتی: من شتێکم لێ نەدیوە بەعەیبی بگرم لێی، تەنها ئەوە نەبێت کچێك بوو تەمەنی کەم بوو، بەسەر هەویری (نان کردنی)ماڵەوەیان خەوی لێ دەکەوت، جا ئەو ئاژەڵەی لە ماڵەوە بوو دەهات و هەویرەکەی دەخوارد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((کێ یارمەتیم دەدا و پشتیوانم دەکات بچم بەگژی ئەم پیاوەدا ئەزێت و ئازاری بەخاو خێزانم گەیاندووە؟ دەی سوێند بەخوا من جگە لە چاکە لەخێزانم نەدیوە، وە ناوی پیاوێکیشیان هێناوە (کە زینای کردبێ لەگەڵ عائیشەدا) جگە لە چاکەم نەزانیوە لەبارەیەوە)).

## ٣- بابُ شَهَادَةِ المُخْتَبِي

وَأَجَازَهُ عَمْرُو بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: وَكَذَلِكَ يُفْعَلُ بِالكَاذِبِ الفَاجِرِ. وَقَالَ الشَّعْبِيُّ وَابْنُ سِيرِينَ وَعَطَاءٌ وَقَتَادَةُ: السَّمْعُ شَهَادَةٌ. وَقَالَ الحَسَنُ: يَقُولُ لَمْ يُشْهِدُونِي عَلَى شَيْءٍ، ولكني سَمِعْتُ كَذَا وَكَذَا.

## ٣- باسی شایەتیدانی کەسێک خۆی پەنادابێت[١]

**عەمری کوڕی حورەیس ئەو شایەتیدانەی بەلاوە دروستە و ڕێگەی پێداوە و دەڵێ بەم شێوەیەش شایەت دەگیرێت لەگەڵ درۆزنی خراپەکاردا[٢]. شەعبی و ئیبنو سیرین و عەتا و قەتادە دەڵێن: بیستن شایەتی دانەو دروستە. حەسەن دەڵێ: ئەگەر پیاوێك گوێی لە کەسانێك بوو شتێکیان وت، ڕۆیشت بۆ لای دادوەر وتی: نەیانکردووم بەشایەت لەسەر هیچ شتێك، بەڵام گوێم لێ بوو ئاوا و ئاوایان دەوت.**

٢٦٣٨- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ سَالِمٌ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: انْطَلَقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ الأَنْصَارِيُّ يَؤُمَّانِ النَّخْلَ التِي فِيهَا ابْنُ صَيَّادٍ، حَتَّى إِذَا دَخَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ طَفِقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، وَهْوَ يَخْتِلُ أَنْ يَسْمَعَ مِنِ ابْنِ صَيَّادٍ شَيْئًا قَبْلَ أَنْ يَرَاهُ، وَابْنُ صَيَّادٍ مُضْطَجِعٌ عَلَى فِرَاشِهِ فِي قَطِيفَةٍ لَهُ فِيهَا رَمْرَمَةٌ -أَوْ زَمْزَمَةٌ- فَرَأَتْ أُمُّ ابْنِ صَيَّادٍ النَّبِيَّ ﷺ وَهْوَ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، فَقَالَتْ لِابْنِ صَيَّادٍ أَيْ صَافِ، هَذَا مُحَمَّدٌ. فَتَنَاهَى ابْنُ صَيَّادٍ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "لَوْ تَرَكَتْهُ بَيَّنَ"[٣].

---

(١) مەبەست پێی کەسێک لە شوێنێکدایە گوێی لە قسەکانە، بەڵام نایبینێت، چونکە بەربەستێک هەیە لە نێوانیاندا. (خۆی حەشارداوە).

(٢) کە قەرزدار بێت بەئاشکرا دان نانێت بە قەرزدارییەکەیدا، بەڵام ئەگەر خاوەن قەرز تەنها بێت لەگەڵیدا و شایەتەکە خۆی حەشاردابێت و گوێی لە قسەکانی بێت، دان دەنێت بە قەرزەکەدا، شایەتەکەش دواتر شایەتی دەدات.

(٣) بڕوانە: ١٣٥٥.

**٢٦٣٨- سالیم دەڵێ: لە عەبدوڵڵای کوری عومەرم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا و ﷺ ئوبەی کوڕی کەعبی ئەنصاری ﷺ دەرچوون بەرەو ئەو باخە دارخورمایەی کە ئیبنو صەییادی لێ بوو، (ڕۆیشتن) هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو باخەکە، بەبەینی دارخورماکاندا خۆی (لێ) دەشاردەوە، دەیویست بەشێوەیەك ئیبنو صەییاد هەست نەکات، هەندێك قسەی لێ ببیستێ پێش ئەوەی ئیبنو صەییاد پێغەمبەر ﷺ ببینێ، ئیبنو صەییاد لەسەر نوێنێك کە لە قەدیفە بوو ڕاکشابوو، لەژێریدا لەبەری خۆیەوە دەمی دەجوڵاند و قسەی دەکرد[1]، جا دایکی ئیبنو صەییاد پێغەمبەری ﷺ بینی لەکاتێکدا خۆی دەدایە پاڵ دارخورماکان (تا ئیبنو صەییاد نەیبینێ)، دایکی بە ئیبنو صەییادی وت: ئەی صاف (کە ناوی ئیبنو صەییادە) ئەوە موحەممەدە ﷺ، ئیتر ئیبنو صەییادیش کۆتایی بەدەم جوڵاندنەکەی هێنا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر دایکی وازی لێ بهێنایە ئاشکرا دەبوو)).**

**٢٦٣٩-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: جَاءَتِ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ القُرَظِيِّ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ كُنْتُ عِنْدَ رِفَاعَةَ، فَطَلَّقَنِي فَأَبَتَّ طَلَاقِي، فَتَزَوَّجْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ، إِنَّمَا مَعَهُ مِثْلُ هُدْبَةِ الثَّوْبِ. فَقَالَ: "أَتُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ؟ لَا حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ". وَأَبُو بَكْرٍ جَالِسٌ عِنْدَهُ، وَخَالِدُ بْنُ سَعِيدِ بْنِ العَاصِ بِالبَابِ يَنْتَظِرُ أَنْ يُؤْذَنَ لَهُ، فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ، أَلَا تَسْمَعُ إِلَى هَذِهِ مَا تَجْهَرُ بِهِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ؟[2].

---

(١) رَمْرَمَةٌ -أَوْ زَمْزَمَةٌ: ئەم دوو وشەیە کە لە فەرموودەکەدا هاتووە، ڕاوییەکە گومانی بوو لە نێوان ئەو دوو وشەیەدا کامیانی وتووە، وە هەردوو وشەکە ( رَمْرَمَةٌ یان زَمْزَمَةٌ) یەک مانایان هەیە، کە دەنگی نزم قسەکردنە بە هێواشی.

(٢) بڕوانە: ٥٢٦٠، ٥٢٦١، ٥٢٦٥، ٥٣١٧، ٥٧٩٢، ٥٨٢٥، ٦٠٨٤.

**٢٦٣٩- عائیشه ﷺ دەڵێ: خێزانی ڕیفاعەی قوڕەزی هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: من خێزانی ڕیفاعه بووم بەتەڵاقی یەکجاری تەڵاقی دام، ئینجا شووم کرد به عەبدوڕەحمانی کوڕی زوبەیر، بێگومان زەکەری ئەو وەك ڕیشاڵی قوماش وایه (نەرمه و ڕەق نابێ)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دەتەوێت بگەڕێیتەوه بۆ لای ریفاعە؟! نابێ هەتا تۆ شیرینی و لەزەتی عەبدوڕەحمان نەچەژی، ئەو شیرینی و لەزەتی تۆ نەچەژێ))، ئەبو بەکریش لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو، خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصیش لەبەر دەرگاکه بوو، چاوەڕوان بوو مۆڵەتی پێ بدرێت (بێتە ژوورەوه)، وتی: ئەی ئەبو بەکر گوێت لێیه ئەو ئافرەته لای پێغەمبەر ﷺ به ئاشکرا چی دەڵێت؟!**

## ٤ - بابٌ: إِذَا شَهِدَ شَاهِدٌ أَوْ شُهُودٌ بِشَيْءٍ، فَقَالَ آخَرُونَ: مَا عَلِمْنَا ذَلِكَ، يُحْكَمُ بِقَوْلِ مَنْ شَهِدَ

قَالَ الحُمَيْدِيُّ: هَذَا كَمَا أَخْبَرَ بِلَالٌ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِي الكَعْبَةِ. وَقَالَ الفَضْلُ: لَمْ يُصَلِّ. فَأَخَذَ النَّاسُ بِشَهَادَةِ بِلَالٍ. كَذَلِكَ إِنْ شَهِدَ شَاهِدَانِ أَنَّ لِفُلَانٍ عَلَى فُلَانٍ أَلْفَ دِرْهَمٍ وَشَهِدَ آخَرَانِ بِأَلْفٍ وَخَمْسِمِائَةٍ، يُقْضَى بِالزِّيَادَةِ.

## ٤- باسێک: ئەگەر شایەتێک یان چەند شایەتێک شایەتیان لەسەر شتێک دا،وە کەسانێکی تر وتیان: ئێمە ئەو شتەمان نەزانیووە، کار بەقسەی ئەوە دەکرێت شایەتی داوە

**حومەیدی دەڵێ: ئەم باسه وەك ئەوە وایه که بیلال ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ لەناو کەعبەدا نوێژی کرد، بەڵام فەزڵ وتی: نوێژی نەکرد، خەڵکی کاریان بەشایەتییەکەی بیلال کرد. هەروەها (هەمان حوکمه) ئەگەر دوو شایەت**

**شايەتيان دا فلانەكەس هەزار درهەمی لای فلانەكەسە، بەلام دوو شايەتی تر شايەتيان دا وتيان هەزار و پێنج سەد درهەمی لايە، كار بەشايەتی زياترەكەيان دەكرێ (كە هەزار و پێنج سەدە).**

٢٦٤٠- حَدَّثَنَا حِبَّان، أَخْبَرَنَا عبد اللهِ، أَخْبَرَنَا عمر بْن سَعِيدِ بْنِ أَبِي حُسَيْنٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عبد اللهِ بْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الحارِثِ أَنَّهُ تَزَوَّجَ ابنةً لأَبِي إِهَابِ بْنِ عَزِيزٍ، فَأَتَتْهُ امْرَأَة فَقَالَتْ: قَدْ أَرْضَعْتُ عُقْبَةَ وَالَّتِي تَزَوَّجَ. فَقَالَ لَهَا عُقْبَةُ: مَا أَعْلَمُ أَنَّكِ أَرْضَعْتِنِي وَلَا أَخْبَرْتِنِي. فَأَرْسَلَ إِلَى آلِ أَبِي إِهَابٍ يَسْأَلهُمْ، فَقَالُوا: مَا عَلِمْنَا أَرْضَعَتْ صَاحِبَتَنَا. فَرَكِبَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ فَسَأَلهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "كَيْفَ وَقَدْ قِيلَ؟! ". فَفَارَقَهَا، وَنَكَحَتْ زَوْجًا غَيْرَهُ[(١)].

**٢٦٤٠- عەبدوڵلای كوڕی ئەبی مولەيكە لە عوقبەی كوڕی حاريسەوە ﷺ دەيگێڕێتەوە: كە عوقبە كچێكی ئەبو ئيهابی كوڕی عەزيزی مارە كرد، ئينجا ئافرەتێك هات بۆ لای عوقبە وتی: بە دڵنياييەوە من شيرم داوە بە عوقبە و ئەو ئافرەتەش كە مارەی كردووە، عوقبەش پێی وت : من ئاگادار نيم كە تۆ شيرت بە من دابێ، وە ئەمەشت بەمن نەوتووە، جا عوقبە كەسێكی نارد بۆ لای بنەماڵەی ئەبی ئيهاب پرسياری لێ كردن، ئەوانيش وتيان نەمانزانيوە و ئاگادار نين شيری دابێت بەو كچەمان، ئينجا عوقبە سواری وڵاخەكەی بوو ڕۆيشت بۆ مەدينە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و پرسياری لێ كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((چۆن دەبێتە (خێزانت) لەكاتێكدا وتراوە (كە شيرتان بەيەكەوە خواردووە) ))، ئيتر عوقبەش لێی جيا بوويەوە، ئافرەتەكە شووی كرد بە پياوێكی ديكە.**

---

(١) بروانە: ٨٨.

# ٥- بابُ الشُّهَدَاءِ العُدُولِ

وَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ وَأَشْهِدُواْ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ ﴿٢﴾ ﴾ الطلاق: وَ﴿ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ ﴿٢٨٢﴾ ﴾ البقرة.

٢٦٤١- حَدَّثَنَا الحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُتْبَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ أُنَاسًا كَانُوا يُؤْخَذُونَ بِالوَحْيِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَإِنَّ الوَحْيَ قَدِ انْقَطَعَ، وَإِنَّمَا نَأْخُذُكُمُ الآنَ بِمَا ظَهَرَ لَنَا مِنْ أَعْمَالِكُمْ، فَمَنْ أَظْهَرَ لَنَا خَيْرًا أَمِنَّاهُ وَقَرَّبْنَاهُ، وَلَيْسَ إِلَيْنَا مِنْ سَرِيرَتِهِ شَيْءٌ، اللهُ يُحَاسِبُهُ فِي سَرِيرَتِهِ، وَمَنْ أَظْهَرَ لَنَا سُوءًا لَمْ نَأْمَنْهُ وَلَمْ نُصَدِّقْهُ، وَإِنْ قَالَ: إِنَّ سَرِيرَتَهُ حَسَنَةٌ.

## ٥- باسی شاهێدی دادپەروەر

**وە فەرمایشتی خوای بەرز و بڵند: (وە دوو شاهیدی دادپەروەر لەخۆتان بگرن)، وە (لەوانەی کە پەسەندیان دەکەن لە شاهیدەکان).**

**٢٦٤١- عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە دەڵێ: لە عومەری کوڕی خەتتابم ﷺ بیست دەیوت: بێگومان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کەسانێك بە هۆی نیگاوە (خراپەکانیان دەزانراو) سزا دەدران، وە بەڕاستی ئێستا نیگا پچڕاوە[1]، بۆیە ئێمە لە ئێستادا بەگوێرەی ئەوەی لە کردەوەکانتانەوە بۆمان دەردەکەوێت مامەڵەتان لەگەڵدا دەکەین، جا هەر کەس کردەوەی باشی لێ ببینین، ئەوە بە ئەمینی دەزانین و لە خۆمانی نزیك دەکەینەوە، وە ئێمە هیچ پەیوەندیمان بە شاراوە و ناخیەوە نییە، خوا بۆ خۆی لێپرسینەوەی شتە شاراوەکانی دەکات، هەر کەسیش کردەوەی خراپی لێ ببینین، لای ئێمە ئەمین نییە و باوەڕی پێ ناکەین، با بڵێ بێگومان پەنهان و شاراوەی چاك و باشە.**

---

(١) چونکە پێغەمبەر ﷺ لە ژیاندا نەماوە.

## ٦- بابُ تَعْدِيلِ كَمْ يَجُوزُ؟

٢٦٤٢- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْن حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: مُرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِجَنَازَةٍ، فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقَالَ: "وَجَبَتْ". ثُمَّ مرَّ بِأُخْرى، فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا شَرًّا -أَوْ قَالَ غَيْرَ ذَلِكَ- فَقَالَ: "وَجَبَتْ". فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، قلْتَ لهذا: وَجَبَتْ، ولهذا: وَجَبَتْ؟ قَالَ: "شَهَادَةُ القَوْمِ، المُؤْمِنُونَ شُهَدَاءُ اللهِ فِي الأَرْضِ"[1].

## ٦- باسی بە چەند کەس دادپەروەری دەسەلمێت؟

**٢٦٤٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: مردوویەك بەلای پێغەمبەردا ﷺ براو خەڵکەکە بەچاکی باسیان کرد، فەرمووی ﷺ: ((پێویست بوو[2]))، پاشان مردوویەکی تریان بەلایدا برد و بەخراپی باسیان کرد -یان شتێکی تری وت-: فەرمووی ﷺ: ((پێویست بوو))، عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەمەیانت فەرموو: ((پێویست بوو))، بەوەشیانت فەرموو: ((پێویست بوو))، فەرمووی: ((شایەتیدانی کەسانێك (وەرگیراوە)، باوەڕداران شایەتیدەرانی خوان لەزەویدا)).**

٢٦٤٣- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا دَاوُدُ بْنُ أَبِي الفُرَاتِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ قَالَ: أَتَيْتُ المَدِينَةَ وَقَدْ وَقَعَ بِهَا مَرَضٌ، وَهُمْ يَمُوتُونَ مَوْتًا ذَرِيعًا، فَجَلَسْتُ إِلَى عُمَرَ ﷺ، فَمَرَّتْ جِنَازَةٌ، فَأُثْنِيَ خَيْرٌ، فَقَالَ عُمَرُ: وَجَبَتْ. ثُمَّ مُرَّ بِأُخْرَى، فَأُثْنِيَ خَيْرًا، فَقَالَ: وَجَبَتْ. ثُمَّ مُرَّ بِالثَّالِثَةِ، فَأُثْنِيَ شَرًّا، فَقَالَ: وَجَبَتْ. فَقُلْتُ: مَا وَجَبَتْ يَا أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ؟ قَالَ: قُلْتُ كَمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "أَيُّمَا مُسْلِمٍ شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ بِخَيْرٍ أَدْخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ". قُلْنَا: وَثَلَاثَةٌ؟ قَالَ: "وَثَلَاثَةٌ". قُلْتُ: وَاثْنَانِ؟ قَالَ: "وَاثْنَانِ". ثُمَّ لَمْ نَسْأَلْهُ عَنِ الوَاحِدِ[3].

---

(١) بڕوانە: ١٣٦٧.

(٢) وَجَبَ: واتە پێویست بوو، بوو بەئەرک، کەوتە ئەستۆی. بڕوانە: ئەلمونجید بەکوردی: ٤٣٨/٥.

(٣) بڕوانە: ١٣٦٨.

٢٦٤٣- ئەبو ئەسوەد دەڵێ: ڕۆیشتمە شاری مەدینە نەخۆشییەکی تێدا بڵاوبووبۆوە، خەڵکی زۆر پێ دەمرد، ئینجا لای عومەر ﷺ دانیشتم، جا جەنازەیەکیان بەلایدا برد، وە بەچاکی باسی کرا، عومەر وتی: پێویست بوو، پاشان جەنازەیەکی تریان برد، وە بە چاکی باسیان کرد، عومەریش وتی: پێویست بوو، جەنازەی سێیەم برا، وە بەخراپی باسی کرا، عومەریش وتی: پێویست بوو، منیش وتم: چی پێویست بوو ئەی پێشەوای ئیمانداران؟ وتی: ئەو قسەی من کردم پێغەمبەریش ﷺ هەمان فەرمایشتی فەرموو: ((هەر مسوڵمانێك چوار کەس شایەتی چاکی بۆ بدەن خوا دەیخاتە بەهەشتەوە))، وتمان: سیانیش؟ فەرمووی: ((سیانیش))، وتم: دووانیش؟ فەرمووی: ((دووانیش))، پاشان پرسیاری یەك شایەتمان لێ نەکرد.

## ٧- بابُ الشَّهَادَةِ عَلَى الأَنْسَابِ، وَالرَّضَاعِ المُسْتَفِيضِ، وَالمَوْتِ القَدِيمِ

وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "أَرْضَعَتْنِي وَأَبَا سَلَمَةَ ثُوَيْبَةُ". وَالتَّثَبُّتِ فِيهِ.

٢٦٤٤- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَخْبَرَنَا الحَكَمُ، عَنْ عِرَاكِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵄ قَالَتِ: اسْتَأْذَنَ عَلَيَّ أَفْلَحُ فَلَمْ آذَنْ لَهُ، فَقَالَ: أَتَحْتَجِبِينَ مِنِّي وَأَنَا عَمُّكِ؟! فَقُلْتُ: وَكَيْفَ ذَلِكَ؟ قَالَ: أَرْضَعَتْكِ امْرَأَةُ أَخِي بِلَبَنِ أَخِي. فَقَالَتْ: سَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: "صَدَقَ أَفْلَحُ، ائْذَنِي لَهُ"[1].

## ٧- باسی شاهێدیدان لەسەر ڕەچەڵەک و شیرپێدانی بڵاوبۆوە و مردنی کۆن

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سوومیبە شیری داوە بە من و ئەبو سەلەمە))، وە پێویستی دڵنیابوون و پشت ڕاستکردنەوە دەربارەی شیرپێدان.

---

(١) بڕوانە: ٤٧٩٦، ٥١٠٣، ٥١١١، ٥٢٣٩، ٦١٥٦.

**٢٦٤٤- عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﵂ کە وتی: ئەفلەح مۆڵەتی خواست بۆ هاتنە ژوورەوە بۆ لام، منیش مۆڵەتم نەدا، ئەویش وتی: بۆ خۆتم پیشان نادەیت لەکاتێکدا من مامەی تۆم؟ منیش وتم: چۆنە ئەوە (کە تۆ مامی منی)؟ وتی: خێزانی براکەم شیری پیداوی کە شیرەکەی هی براکەمە، عائیشە وتی: لەوبارەیەوە پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: ((ئەفلەح ڕاست دەکات مۆڵەتی بدە)).**

٢٦٤٥- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ جَابِرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِي بِنْتِ حَمْزَةَ: "لَا تَحِلُّ لِي، يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ، هِيَ بِنْتُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ"[١].

**٢٦٤٥- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەربارەی کچی حەمزە فەرمووی: ((ئەو بۆ من حەڵاڵ نییە[٢]، ئەوەی بەهۆی ڕەچەڵەکەوە حەرامە بەهۆی شیرخواردنیشەوە حەرام دەبێت، ئەو ئافرەتە کچی برای شیری منە))[٣].**

٢٦٤٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ -زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ- أَخْبَرَتْهَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ عِنْدَهَا، وَأَنَّهَا سَمِعَتْ صَوْتَ رَجُلٍ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِ حَفْصَةَ. قَالَتْ عَائِشَةُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أُرَاهُ فُلَانًا. لِعَمِّ حَفْصَةَ مِنَ الرَّضَاعَةِ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا رَجُلٌ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِكَ.

---

(١) بڕوانە: ٥١٠٠.

(٢) سەرنج : هەموو شیرخواردنێک مەحرەمیەت دروست ناکات، بەڵکو ئەو شیر خواردنە مەحرەمیەت دروست دەکات کە منداڵ لە تەمەنی دوو ساڵیدا بیخوات، وە دەبێت لاشەی منداڵەکە بەهێز بکات، وە ئەوە ڕێژەیە بخوات کە بەتەنها شیرەکە برسێتی منداڵە شیرەخۆرەکە نەهێڵێت و لایببات.

(٣) مارەی بکەم.

قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "أُرَاهُ فُلاَنًا". لِعَمِّ حَفْصَةَ مِنَ الرَّضَاعَةِ. فَقَالَتْ: عَائِشَةُ لَوْ كَانَ فُلاَنٌ حَيًّا -لِعَمِّهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ- دَخَلَ عَلَيَّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "نَعَمْ، إِنَّ الرَّضَاعَةَ تُحَرِّمُ مَا يَحْرُمُ مِنَ الوِلاَدَةِ"[1].

**٢٦٤٦- عەمرەی کچی عەبدورەحمان دەگێڕێتەوە کە عائیشەی ﵂ -خێزانی پێغەمبەر ﷺ -بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی ئەو (عائیشە) بوو، وە عائیشە گوێی لەدەنگی پیاوێك بوو داوای مۆڵەتی دەکرد بۆ چوونە ژوورەوە لەماڵی حەفصە، عائیشە دەڵێ منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وابزانم فلانە کەسە، مەبەستی مامی شیری حەفصە بوو، عائیشەش وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە پیاوێکە داوای مۆڵەت دەکات بێتە ژوورەوە بۆ ماڵی تۆ، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((وابزانم فلانەکەسە))، مەبەستی مامەی شیری حەفصەبوو، عائیشەش وتی: ئەگەر فلانەکەس زیندوو بووایە-مەبەستی مامەی شیری خۆی بوو- بهاتبایە بۆ ماڵی من (دروست بوو)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ دروست بوو، بێگومان ئەوەی بە ڕەچەڵەك و لە دایك بوون حەرام بێت، بە شیرخواردنیش حەرام دەبێت)).**

**٢٦٤٧-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْن كَثِيرٍ أَخْبَرَنَا سُفْيَان، عَنْ أَشْعَثَ بْنِ أَبِي الشَّعْثَاءِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مَسْرُوقٍ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ وَعِنْدِي رَجُلٌ، قَالَ: "يَا عَائِشَةُ، مَنْ هذا". قُلْتُ: أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ. قَالَ: "يَا عَائِشَةُ،انْظُرْنَ مَنْ إِخْوَانُكُنَّ، فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ مِنَ المَجَاعَةِ". تَابَعَهُ ابن مَهْدِيٍّ، عَنْ سُفْيَانَ[2].

**٢٦٤٧- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای من پیاوێك لە ماڵی من بوو، فەرمووی: ئەی عائیشە! ئەم پیاوە کێیە؟ وتم: برای شیریمە، فەرمووی: ئەی**

(١) بڕوانە: ٣١٠٥، ٥٠٩٩.

(٢) بڕوانە: ٥١٠٢.

عائيشه! سەرنج بدەن بزانن براكانتان كێن، چونكه بێگومان ئەو شیرخواردنه (مەحرەمیەت دروست دەكات) كه برسێتی نەهێڵێ)). ئیبنو مەهدی لە سوفیانەوە گێڕاویەتییەوەو پاڵپشتی گێڕانەوەكەی محمدی كوڕی كەسیری كردووە.

## ٨- بابُ شَهَادَةِ القَاذِفِ وَالسَّارِقِ وَالزَّانِي

وَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ ﴿٥﴾ ﴾ النور. وَجَلَدَ عُمَرُ أَبَا بَكْرَةَ وَشِبْلَ بْنَ مَعْبَدٍ وَنَافِعًا بِقَذْفِ المُغِيرَةِ، ثُمَّ اسْتَتَابَهُمْ، وَقَالَ: مَنْ تَابَ قَبِلْتُ شَهَادَتَهُ. وَأَجَازَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُتْبَةَ، وَعُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ، وَسَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ، وَطَاوُسٌ، وَمُجَاهِدٌ، وَالشَّعْبِيُّ، وَعِكْرِمَةُ، وَالزُّهْرِيُّ، وَمُحَارِبُ بْنُ دِثَارٍ، وَشُرَيْحٌ، وَمُعَاوِيَةُ بْنُ قُرَّةَ. وَقَالَ أَبُو الزِّنَادِ: الأَمْرُ عِنْدَنَا بِالمَدِينَةِ إِذَا رَجَعَ القَاذِفُ عَنْ قَوْلِهِ اسْتَغْفَرَ رَبَّهُ، قُبِلَتْ شَهَادَتُهُ. وَقَالَ الشَّعْبِيُّ وَقَتَادَةُ: إِذَا أَكْذَبَ نَفْسَهُ جُلِدَ وَقُبِلَتْ شَهَادَتُهُ. وَقَالَ الثَّوْرِيُّ: إِذَا جُلِدَ العَبْدُ ثُمَّ أُعْتِقَ جَازَتْ شَهَادَتُهُ، وَإِنِ اسْتُقْضِيَ المَحْدُودُ فَقَضَايَاهُ جَائِزَةٌ. وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: لَا تَجُوزُ شَهَادَةُ القَاذِفِ، وَإِنْ تَابَ، ثُمَّ قَالَ: لَا يَجُوزُ نِكَاحٌ بِغَيْرِ شَاهِدَيْنِ، فَإِنْ تَزَوَّجَ بِشَهَادَةِ مَحْدُودَيْنِ جَازَ، وَإِنْ تَزَوَّجَ بِشَهَادَةِ عَبْدَيْنِ لَمْ يَجُزْ. وَأَجَازَ شَهَادَةَ المَحْدُودِ وَالعَبْدِ وَالأَمَةِ لِرُؤْيَةِ هِلَالِ رَمَضَانَ.

## وَكَيْفَ تُعْرَفُ تَوْبَتُهُ؟

وَقَدْ نَفَى النَّبِيُّ ﷺ الزَّانِيَ سَنَةً. وَنَهَى عَنْ كَلَامِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ وَصَاحِبَيْهِ حَتَّى مَضَى خَمْسُونَ لَيْلَةً[1].

---

(١) بڕوانه: ٢٧٥٧.

## ٨- باسی شاهێدی دانی بوختان كەر و دز و زیناكار

وە ئەم فەرمايشتەی خوا بەرز و بڵندە: (ڕوە ئەوانەی بوهتانی (زینا) دەدەنە پاڵ ئافرەتانی داوێنپاك، لە پاشان چوار شاهێد ناهێنن (لەسەر ڕاستی بوهتانەكەيان)، ئەوە هەشتا دار (شەلاق)يان لێ بدەن، ئیتر هەرگیز شايەتيان لێ وەرمەگرە، وە ئەوانە لە سنوور دەرچوون ﴿٤﴾ جگە لەوانەی تەوبە دەكەن ﴿٥﴾). وە عومەر ﷺ شەلاقی دا لە ئەبو بەكرە و شيبلی كوڕی مەعبەد و نافيع لەبەر بوختانی زیناكردنيان بۆ موغيرە، پاشان داوای تەوبەكردنی لێ كردن، وتی: هەركەستان تەوبە بكات (لەو تاوانەی كردوويەتی) شايەتی وەردەگرم. وە هەريەك لە عەبدوڵلای كوڕی عوتبە و عومەری كوڕی عەبدولعەزيز و سەعيدی كوڕی جوبەير و تاووس و موجاهيد و شەعبی و عيكريمە و زوهری و موحاريبی كوڕی ديسار و شورەيح و موعاويەی كوڕی قوررە شايەتی شەلاقدراو[1] دروستە لايان. وە ئەبو زيناد دەڵێ: لای ئێمەی زانايانی مەدينە ئەگەر بوختان كەرەكە پەشيمان بوويەوە لەبوختانەكەی و داوای لێخۆشبوونی لە پەروەردگاری كرد، شايەتييەكەی وەردەگيرێت. وە شەعبی و قەتادە دەڵێن: ئەگەر خۆی بەدرۆخستەوە شەلاقی لێ دەدرێت و شايەتی وەردەگرێت. وە سەوری دەڵێ: ئەگەر كۆيلە شەلاق درا، پاشان ئازاد كرا، شايەتی دانی دروستە، وە ئەگەر شەلاق لێدراوێك داوای لێكرا ببێت بەدادوەر، ئەوە بڕيارو دادوەرييەكانی دروستە و ڕەوايە. وە هەندێك كەس (ئەبو حەنيفە) دەڵێن: شايەتی شەلاقدراو دروست نييە، با تەوبەش بكات. پاشان دەڵێ: هيچ مارە بڕينێك دروست نييە بەدوو شايەت نەبێت، بەڵام ئەگەر ئافرەتێكی مارەكرد بە

---

(١) بەهۆی بوختان كردنی بۆ پياو و ئافرەتی موسڵمانی داوێن پاك.

**شایەتی دوو شەلاقدراو دروستە، وە ئەگەر كەسێك ئافرەتێكی مارەكرد بەشایەتی دوو كۆیلە دروست نییە، وە (هەندێك كەس) شایەتی شەلاقدراو كۆیلە و كەنیزەكی ڕێگە پێدراوەو لای دروستە بۆ بینینی مانگی ڕەمەزان.**

## وەتەوبەكردنی شەلاقدراو چۆن دەزانرێت؟

**پێغەمبەر ﷺ بۆ ماوەی ساڵێك زیناكاری لەشوێنی خۆی دوورخستۆتەوە. وە پێغەمبەر ﷺ قسەكردنی لەگەڵ كەعبی كوڕی مالیك و دوو هاوڕێیەكەی بۆ ماوەی پەنجا ڕۆژ قەدەغەكرد[١].**

٢٦٤٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ امْرَأَةً سَرَقَتْ فِي غَزْوَةِ الفَتْحِ، فَأُتِيَ بِهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَقُطِعَتْ يَدُهَا. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَحَسُنَتْ تَوْبَتُهَا وَتَزَوَّجَتْ، وَكَانَتْ تَأْتِي بَعْدَ ذَلِكَ فَأَرْفَعُ حَاجَتَهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ[٢].

**٢٦٤٨- عوروە دەڵێ: ئافرەتێك لەغەزای ئازادكردنی مەككەدا دزی كرد، ئینجا هێنرا بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان فەرمانی كرد و دەستی بڕا، عائیشە ﵂ دەڵێ: ئینجا ئەو ئافرەتە تەوبەیەكی چاكی كرد و شووی كرد، جا پاش ئەوە دەهات بۆ لای من، منیش هەر پێویستییەكی هەبووایە دەمگەیاند بەپێغەمبەری خوا ﷺ.**

---

(١) بە هۆی دواكەوتنی هەردووكیان لە بەشداری كردن لە غەزای تەبووكدا لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ﷺ بەبێ هیچ هۆو عوزرێک، چیرۆک و باسەكەشیان بە درێژی لە فەرمودەی: (٤٤١٨)ی صەحیحی بوخاریدا هاتووە.

(٢) بڕوانە: ٣٤٧٥، ٣٧٣٢، ٣٧٣٣، ٤٣٠٤، ٦٧٨٧، ٦٧٨٨، ٦٨٠٠.

٢٦٤٩- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ أَمَرَ فِيمَنْ زَنَى وَلَمْ يُحْصِنْ بِجَلْدِ مِائَةٍ وَتَغْرِيبِ عَامٍ[1].

**٢٦٤٩- زەیدی کوڕی خالید ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرمانی کردووە دەربارەی ئەو کەسەی (کچ یان کوڕ بووایە و) زینای بکردایە سەد شەلاقی لێبدرێت، ساڵێکیش دووربخرێتەوە لەشوێنی خۆی.**

## ٩ - بَابٌ: لَا يَشْهَدُ عَلَى شَهَادَةِ جَوْرٍ إِذَا أُشْهِدَ

٢٦٥٠- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا أَبُو حَيَّانَ التَّيْمِيُّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ قَالَ: سَأَلَتْ أُمِّي أَبِي بَعْضَ المَوْهِبَةِ لِي مِنْ مَالِهِ، ثُمَّ بَدَا لَهُ فَوَهَبَهَا لِي فَقَالَتْ لَا أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ النَّبِيَّ ﷺ. فَأَخَذَ بِيَدِي وَأَنَا غُلَامٌ، فَأَتَى بِيَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أُمَّهُ بِنْتَ رَوَاحَةَ سَأَلَتْنِي بَعْضَ المَوْهِبَةِ لِهَذَا، قَالَ: "أَلَكَ وَلَدٌ سِوَاهُ؟ ". قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَأُرَاهُ قَالَ: "لَا تُشْهِدْنِي عَلَى جَوْرٍ". وَقَالَ أَبُو حَرِيزٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ: "لَا أَشْهَدُ عَلَى جَوْرٍ"[2].

## ٩- باسێک: شایەتی نەدان لەسەر ستەم و نادادی ئەگەر داوای شایەتی لێکرا

**٢٦٥٠- نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دایکم داوای شتێکی لە باوکم کرد لە سامانی باوکم کە بیبەخشێت بەمن، پاشان باوکم بۆی ڕوون بوویەوە و بەخشی پێم، جا**

---

(١) بڕوانە: ٢٣١٤.

(٢) بڕوانە: ٢٥٨٦.

**دایکم وتی: ڕازی نابم هەتا پێغەمبەر ﷺ نەکەیت بە شایەت لەسەری، جا باوکم دەستی گرتم کە من مێردمنداڵ بووم، بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: بێگومان دایکی ئەم کوڕە (عەمرەی) کچی ڕەواحەیە، داوای لێ کردووم ماڵێکم ببەخشم بەم کوڕە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((جگە لەم کوڕە منداڵی ترت هەیە؟))، وتی: بەڵێ، جا وابزانم فەرمووی: ((من مەکە بەشایەت لەسەر ستەم و نادادی)). وە ئەبو حەریز لە شەعبیەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((من شایەتی نادەم لەسەر ستەم و ناڕەوایی)).**

٢٦٥١- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو جَمْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ زَهْدَمَ بْنَ مُضَرِّبٍ قَالَ: سَمِعْتُ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "خَيْرُكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ". قَالَ عِمْرَانُ: لَا أَدْرِي أَذَكَرَ النَّبِيُّ ﷺ بَعْدُ قَرْنَيْنِ أَوْ ثَلَاثَةً. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّ بَعْدَكُمْ قَوْمًا يَخُونُونَ وَلَا يُؤْتَمَنُونَ، وَيَشْهَدُونَ وَلَا يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَنْذِرُونَ وَلَا يَفُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهِمُ السِّمَنُ"[1].

**٢٦٥١- عیمرانی کوڕی حوصەین رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((چاکترینتان (خەڵکی) چەرخی منە، پاشان ئەو خەڵکانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن))، عیمران وتی: نازانم ئایا پێغەمبەر ﷺ دوو چەرخی فەرموو یان سێ چەرخ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان لە پاش ئێوە کەسانێك دێن خیانەت دەکەن و ئەمانەت ناپارێزن، شایەتی دەدەن بێ ئەوەی داوای شایەتی دانیان لێ کرابێت، وە نەزر دەکەن و نایبەنە سەر، هەروەها قەڵەوبوون لەناویاندا پەیدادەبێت و دەردەکەوێت)).**

(١) بڕوانە: ٣٦٥٠، ٦٤٢٨، ٦٦٩٥.

**٢٦٥٢-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَجِيءُ أَقْوَامٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ، وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ". قَالَ إِبْرَاهِيمُ: وَكَانُوا يَضْرِبُونَنَا عَلَى الشَّهَادَةِ وَالعَهْدِ[١].

**٢٦٥٢- عەبدوڵلا (ی کوڕی مەسعود) ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((چاکترینی خەڵك خەڵکی چەرخ و سەردەمی منە، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان کەسانێك دێن شایەتی دانی یەکێکیان پێش سوێندخواردنی دەکەوێت، وە سوێندخواردنی پێش شایەتی دانی دەکەوێ[٢])). ئیبراهیم دەڵێ: ئێمە لە ڕابردوودا لەسەر شایەتی دان و پەیمانی خوا لێیان دەداین[٣].**

## ١٠ - بابُ مَا قِيلَ فِي شَهَادَةِ الزُّورِ

لِقَوْلِه ﷻ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ ﴿٧٢﴾ ﴾ الفرقان. وَكِتْمَانِ الشَّهَادَةِ لقوله: ﴿ وَلَا تَكْتُمُوا۟ ٱلشَّهَـٰدَةَ ۚ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨٣﴾ ﴾ البقرة. ﴿ تَلْوُۥٓا۟ ﴿١٣٥﴾ ﴾ النساء. أَلْسِنَتَكُمْ بِالشَّهَادَةِ.

---

(١) بڕوانە: ٣٦٥١، ٦٤٢٩، ٦٦٥٨.

(٢) ئەوانە ئەو کەسانەن مکوڕن لەسەر سوێند خواردن، سەرگەرمی بڵاوکردنەوەی سوێند خواردنن لە ناو خەڵکیدا، وە سوێند دەخۆن لەسەرئەوی شایەتی لەسەر دەدەن، جا جاری وا هەیە پێش شایەتیدانەکە سوێند دەخۆن، جاری واش هەیە بە پێچەوانەوە، وە دەگونجێ مەبەست لێی پەلەکردن بێت لە شایەتیدان و سوێندخواردندا، ئەوەندە سوورە لەسەریان پەلەیەتی، هەتا نازانێ بەکامیان دەست پێ بکات، وەک ئەوە وایە هەر یەکەیان پێش ئەوەی دیکەیان بکەوێت لەبەر گوێ نەدان بە ئیسلامەوە.

(٣))) بۆ ئەوەی بەدرۆ شایەتی نەدەین.

## ١٠- باسی ئەوەی وتراوە دەربارەی شاهێدی دانی درۆ

بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای باڵادەست و گەورە: (وە (بەندەکانی خوا) کەسانێکن کە شایەتی درۆ نادەن)، (وە ئەوەی ووتراوە دەربارەی) شاردنەوەی شایەتی دان بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوا: (وە شایەتی دان مەشارنەوە، ئەو کەسەی بیشارێتەوە ئەوە بەڕاستی بەدڵ گوناهبارە، وە خوا ئاگادارە بە هەموو کردەوەیەکتان). ﴿ تَلْوُۥٓا۟ ﴿١٣٥﴾ ﴾ واتە: (ئەگەر) زمانتان بە شایەتیدان (ی ناهەق وەرچەرخێنن).

٢٦٥٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُنِيرٍ، سَمِعَ وَهْبَ بْنَ جَرِيرٍ، وَعَبْدَ الْمَلِكِ بْنَ إِبْرَاهِيمَ قَالَا: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الكَبَائِرِ، قَالَ: "الإِشْرَاكُ بِاللهِ، وَعُقُوقُ الوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَشَهَادَةُ الزُّورِ". تَابَعَهُ غُنْدَرٌ وَأَبُو عَامِرٍ، وَبَهْزٌ، وَعَبْدُ الصَّمَدِ، عَنْ شُعْبَةَ[1].

٢٦٥٣- ئەنەس ﷺ وتی: پرسیاری گوناهە گەورەکان لە پێغەمبەر ﷺ کرا (کامانەن؟)، فەرمووی: ((هاوبەش دانان بۆ خوا، سەرپێچی کردنی دایك وباوك، کوشتنی مرۆڤ وە شایەتیدانی درۆ)). هەریەك لەغوندەر و ئەبو عامیر و بەهز و عەبدوصەمەد ئەم فەرموودەیە دەگێڕنەوە، پاڵپشتی گێڕانەوەکەی وەهبی کوڕی جەریر لە شوعەبەوە دەکەن.

٢٦٥٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، حَدَّثَنَا الجُرَيْرِيُّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الكَبَائِرِ". ثَلاَثًا. قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ: "الإِشْرَاكُ بِاللهِ، وَعُقُوقُ الوَالِدَيْنِ". وَجَلَسَ وَكَانَ مُتَّكِئًا فَقَالَ: "أَلاَ وَقَوْلُ

(١) بڕوانە: ٥٩٧٧، ٦٨٧١.

الزُّورِ". قَالَ: فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا لَيْتَهُ سَكَتَ. وَقَالَ إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ: حَدَّثَنَا الجُرَيْرِيُّ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ[1].

**٢٦٥٤- عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا هەواڵتان پێ بدەم گوناهە هەرە گەورەکان چین؟))، سێ جار ئەم وتەیەی دووبارەکردەوە. ئێمەش وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! هەواڵمان بدەرێ، فەرمووی: ((هاوبەش دانان بۆ خواو سەرپێچی کردنی دایك و باوك))، وە پێغەمبەر ﷺ پاڵیدابوویەوە، ڕاست بوویەوە و دانیشت و فەرمووی: ((ئاگاداربن وتەی درۆش))، ئەنەس دەڵێ: جا بەبەردەوامی ئەم وتەی دووبارە دەکردەوە، هەتا دەمان وت: خۆزگە بێدەنگ بووایە (بۆ ئەوەی ئازاری خۆی نەدات). (ئەم فەرموودە بەڕێگەیەکی تریش هاتووە:) ئیسماعیلی کوڕی ئیبڕاهیم دەڵێ: جورەیریی بۆی گێڕاینەوە وتی: عەبدوڕەحمان بۆی گێڕاینەوە.**

## ١١- بابُ شَهَادَةِ الأَعْمَى، وَأَمْرِهِ، وَنِكَاحِهِ وَإِنْكَاحِهِ، وَمُبَايَعَتِهِ، وَقَبُولِهِ فِي التَّأْذِينِ وَغَيْرِهِ، وَمَا يُعْرَفُ بِالأَصْوَاتِ

وَأَجَازَ شَهَادَتَهُ قَاسِمٌ وَالحَسَنُ وَابْنُ سِيرِينَ وَالزُّهْرِيُّ وَعَطَاءٌ. وَقَالَ الشَّعْبِيُّ: تَجُوزُ شَهَادَتُهُ إِذَا كَانَ عَاقِلًا. وَقَالَ الحَكَمُ: رُبَّ شَيْءٍ تَجُوزُ فِيهِ. وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: أَرَأَيْتَ ابْنَ عَبَّاسٍ لَوْ شَهِدَ عَلَى شَهَادَةٍ أَكُنْتَ تَرُدُّهُ؟ وَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَبْعَثُ رَجُلًا، إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ أَفْطَرَ، وَيَسْأَلُ عَنِ الفَجْرِ فَإِذَا قِيلَ لَهُ: طَلَعَ. صَلَّى رَكْعَتَيْنِ. وَقَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ يَسَارٍ: اسْتَأْذَنْتُ عَلَى عَائِشَةَ فَعَرَفَتْ صَوْتِي، قَالَتْ سُلَيْمَانُ، ادْخُلْ، فَإِنَّكَ مَمْلُوكٌ مَا بَقِيَ عَلَيْكَ شَيْءٌ. وَأَجَازَ سَمُرَةُ بْنُ جُنْدَبٍ شَهَادَةَ امْرَأَةٍ مُنْتَقِبَةٍ.

---

(١) بروانە: ٥٩٧٦، ٦٢٧٣، ٦٢٧٤، ٦٩١٩.

## ١١- باسی (حوكمی) شایەتیدانی نابینا و كاروباری تردا و ژن هێنان و بەشوودانی، كڕین و فرۆشتنی، وەرگرتنی وتەی لە بانگدان و شتی تر، وە ئەوەی بە دەنگەكاندا دەزانرێت

قاسیم و حەسەن و ئیبنو سیرین و زوهری و عەتا شایەتیدانی نابینایان لای دروستە و ڕێگەیان پێداوە. شەعبی دەڵێ : شایەتیدانی نابینا دروستە ئەگەر ژیر و عاقڵ بوو. حەكەم دەڵێ: لە هەندێك شتدا شایەتیدانی نابینا دروستە. زوهری دەڵێ: پێم بڵێ ئەگەر ئیبنو عەبباس شایەتی بدات لەسەر شتێك ئایا تۆ شایەتیدانەكەی وەرناگری[١]. ئیبنو عەبباس پیاوێكی دەنارد كاتێك خۆر ئاوا دەبوو (بزانێ ئاوا بووە)، جا ڕۆژووی دەشكاند، وە پرسیاری بانگی بەیانی دەكرد، جا ئەگەر بوترایە بانگ بوو دوو ڕكات نوێژی دەكرد[٢]. سولەیمانی كوڕی یەسار دەڵێ: داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەم كرد لە عائیشە ﵂، ئەویش دەنگی ناسیم، وتی: سولەیمانیت؟ وەرە ژوورەوە، چونكە تۆ كۆیلەیت هیچ پارەت لەسەر نەماوە[٣]. سەمورەی كوڕی جوندەب شایەتیدانی ئافرەتی پەچە بەسەری قبوڵ كردووە و بەلایەوە دروست بووە.

٢٦٥٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ بْنِ مَيْمُونٍ، أَخْبَرَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا يَقْرَأُ فِي المَسْجِدِ، فَقَالَ: "رَحِمَهُ اللهُ، لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً، أَسْقَطْتُهُنَّ مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا".

وَزَادَ عَبَّادُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَائِشَةَ تَهَجَّدَ النَّبِيُّ ﷺ فِي بَيْتِي، فَسَمِعَ صَوْتَ عَبَّادٍ يُصَلِّي فِي المَسْجِدِ، فَقَالَ: "يَا عَائِشَةُ، أَصَوْتُ عَبَّادٍ هَذَا؟ ". قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: "اللَّهُمَّ ارْحَمْ عَبَّادًا"[٤].

---

(١) چونكە لە كۆتایی تەمەنیدا نابینا بوو.(بڕوانە: إرشاد الساري:٦/٩٨).

(٢) بە بیستنی هەواڵەكە بێ ئەوەی كەسەكە ببینێت.

(٣) كۆیلەی عائیشە بووە نووسراوی لەگەڵ كردووە، هەموو پارەكەی داوە و هیچی لەسەر نەماوە.

(٤) بڕوانە: ٥٠٣٧، ٥٠٣٨، ٥٠٤٢، ٦٣٣٥.

**٢٦٥٥- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتدا گوێی لەپیاوێك بوو قورئانی دەخوێند، فەرمووی: ((خوا ڕەحمی پێ بكات، بەڕاستی ئەومندە و ئەومندە ئایەتی بیرخستمەوە كە من لەو سووڕەتە و لەو سووڕەتە دەمپەڕاند)). عەببادی كوڕی عەبدوڵڵا گێڕاویەتیەوە لە عائیشەوە ﷺ ئەم زیادەی هێناوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەماڵی مندا شەو نوێژی كرد، گوێی لەدەنگی عەبباد بوو لە مزگەوتدا نوێژی دەكرد، فەرمووی: ((عائیشە ئەوە دەنگی عەببادە؟))، وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((خوایە ڕەحم بەعەبباد بكەیت)).**

**٢٦٥٦-** حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، أَخْبَرَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّ بِلاَلًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ" أَوْ قَالَ: "حَتَّى تَسْمَعُوا أَذَانَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ". وَكَانَ ابن أُمِّ مَكْتُومٍ رَجُلًا أَعْمَى، لَا يُؤَذِّن حَتَّى يَقُولَ لَهُ النَّاس: أَصْبَحْتَ[1].

**٢٦٥٦- سالیمی كوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان بیلال (ڕەمەزانان) لە شەودا بانگ دەدات، كەواتە بخۆن و بخۆنەوە هەتا بانگ(ی دووەم) دەدرێ))، یان فەرمووی: ((هەتا گوێتان لە بانگی عەبدوڵڵای كوڕی ئوممی مەكتوم دەبێ)). (عەبدوڵڵا یان ئیبنو شیهاب) وتی: عەبدوڵڵای كوڕی ئوممی مەكتوم پیاوێكی كوێر بوو، بانگی بەیانی نەدەدا هەتا خەڵكی پێیان دەوت: بانگی بەیانی بووە.**

**٢٦٥٧-** حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ وَرْدَانَ حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ عَنِ المِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ ﷺ قَالَ: قَدِمَتْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ أَقْبِيَةٌ، فَقَالَ لِي أَبِي مَخْرَمَةُ:

---

(١) بڕوانە: ٦١٧.

انْطَلِقْ بِنَا إِلَيْهِ عَسَى أَنْ يُعْطِيَنَا مِنْهَا شَيْئًا. فَقَامَ أَبِي عَلَى البَابِ فَتَكَلَّمَ، فَعَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ صَوْتَهُ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ وَمَعَهُ قَبَاءٌ، وَهُوَ يُرِيهِ مَحَاسِنَهُ وَهُوَ يَقُولَ: "خَبَأْتُ هَذَا لَكَ، خَبَأْتُ هَذَا لَكَ"[١].

**٢٦٥٧- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو مولەیکە لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە ﵄ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: چەند کەوایەك هاتبوو بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا مەخرەمەی باوکم پێی وتم: با بڕۆین بۆ خزمەتی، بەڵکو لەو کەوایانە کەوایەکمان بداتێ (و ڕۆیشتن)، ئینجا باوکم لای دەرگاکە وەستابوو قسەی دەکرد، پێغەمبەر ﷺ دەنگی ناسی و هاتە دەرەوە، کەوایەکی پێبوو، جوانییەکانی کەواکەی پیشانی باوکم دەدا و دەیفەرموو: ((ئەمەم بۆ تۆ شاردۆتەوە، ئەمەم بۆ تۆشاردۆتەوە)).**

## ١٢- بابُ شَهَادَةِ النِّسَاءِ

وَقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ ﴿٢٨٢﴾ ﴾ البقرة.

٢٦٥٨- حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي زَيْدٌ، عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ:"أَلَيْسَ شَهَادَةُ المَرْأَةِ مِثْلَ نِصْفِ شَهَادَةِ الرَّجُلِ؟ ". قُلْنَا بَلَى. قَالَ: "فَذَلِكَ مِنْ نُقْصَانِ عَقْلِهَا"[٢].

## ١٢- باسی شایەتیدانی ئافرەت (دروستە)

**ئەم فەرمایشتەی خوای باڵادەست و گەورە: (ئینجا ئەگەر دوو پیاو نەبوو (شایەتی بدەن)، ئەوە با پیاوێك و دوو ژن بن).**

---

(١) بڕوانە: ٢٥٩٩.

(٢) بڕوانە: ٣٠٤.

**٢٦٥٨- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئایا شایەتی دانی ئافرەت وەك نیوەی شایەتی پیاو نییە؟)) وتمان: بەڵێ وایە، فەرمووی: ((دەی ئەوە ناتەواوی عەقڵێتی)).**

## ١٣- باب شَهَادَةِ الإِمَاءِ وَالعَبِيدِ

وَقَالَ أَنَسٌ: شَهَادَةُ العَبْدِ جَائِزَةٌ إِذَا كَانَ عَدْلًا. وَأَجَازَهُ شُرَيْحٌ وَزُرَارَةُ بْنُ أَوْفَى . وَقَالَ ابْنُ سِيرِينَ: شَهَادَتُهُ جَائِزَةٌ، إِلَّا العَبْدَ لِسَيِّدِهِ . وَأَجَازَهُ الحَسَنُ وَإِبْرَاهِيمُ فِي الشَّيْءِ التَّافِهِ. وَقَالَ شُرَيْحٌ كُلُّكُمْ بَنُو عَبِيدٍ وَإِمَاءٍ.

## ١٣- باسی (حوکمی) شایەتیدانی کەنیزەک و کۆیلە

**ئەنەس ﷺ دەڵێ: شایەتیدانی کۆیلە دروستە ئەگەر مسوڵمانێکی ڕاست بوو[1]. شوڕەیح و زوڕارەی کوڕی ئەوفا شایەتی کۆیلەیان پێ دروستە. ئیبنو سیرین دەڵێ: شایەتیدانەکەی دروستە، تەنیا کۆیلە لە بەرانبەر گەورەکەی نەبێت، حەسەن و ئیبراهیم شایەتی کۆیلە و کەنیزەکیان لەسەر شتی کەم نرخ ڕێگەپێداوە و لایان دروستە. شوڕەیح دەڵێ: هەمووتان کوڕی کۆیلە و کەنیزەکانن.**

**٢٦٥٩-** حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الحَارِثِ. وَحَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقْبَةُ بْنُ الحَارِثِ -أَوْ سَمِعْتُهُ مِنْهُ- أَنَّهُ تَزَوَّجَ أُمَّ يَحْيَى بِنْتَ أَبِي إِهَابٍ. قَالَ: فَجَاءَتْ أَمَةٌ سَوْدَاءُ فَقَالَتْ: قَدْ أَرْضَعْتُكُمَا. فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَأَعْرَضَ عَنِّي. قَالَ: فَتَنَحَّيْتُ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، قَالَ: "وَكَيْفَ وَقَدْ زَعَمَتْ أَنْ قَدْ أَرْضَعَتْكُمَا؟! ". فَنَهَاهُ عَنْهَا[2].

---

(١) ئەوەندە گوناهبار نەبێ پێی فاسق بوو بێ.

(٢) بروانە: ٨٨.

٢٦٥٩- ئیبنو ئەبو مولەیکە دەڵێ: عوقبەی کوڕی حاریس بۆی گێڕامەوە -یان لێم بیست- کە عوقبە ئوممو یەحیای کچی ئەبو ئیهابی مارەکرد، عوقبە دەڵێ: ئینجا کەنیزەکێکی ڕەشپێست هات و وتی: بێگومان من شیرم داوە بەهەردووکتان (عوقبە و خێزانەکەی)، منیش ئەم قسەیەم بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، ئەویش ڕووی لێ وەرچەرخاندم، عوقبە دەڵێ: لەولایە لاچووم (ڕۆیشتمە بەرانبەری)، قسەی کەنیزەکەکەم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: ((ئیتر چۆن (خێزانتە) کە دەڵێ شیری بە هەردووکتان داوە؟!))، بۆیە قەدەغەی کرد لێی (کە هاوسەری بیت).

## ١٤- بَابُ شَهَادَةِ المُرْضِعَةِ

٢٦٦٠- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ سَعِيدٍ عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الحَارِثِ قَالَ تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً، فَجَاءَتِ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ أَرْضَعْتُكُمَا. فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: "وَكَيْفَ وَقَدْ قِيلَ؟! دَعْهَا عَنْكَ" أَوْ نَحْوَهُ[1].

## ١٤- باسی شایەتیدانی ئافرەتی شیردەر

٢٦٦٠- ئیبنو ئەبو مولەیکە لەعوقبەی کوڕی حاریسەوە گێڕایەوە (کە عوقبە) وتی: ئافرەتێکم مارەکرد، عوقبە دەڵێ: ئینجا ئافرەتێك هات و وتی: بێگومان من شیرم داوە بە هەردووکتان (عوقبە و خێزانەکەی)، جا منیش ڕۆیشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ (و ئەم قسەیەم بۆباس کرد)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئیتر چۆن (خێزانتە) کە وتراوە (شیری بەهەردووکتان داوە)؟! وازی لێ بێنە))، یان وتەیەکی لەم جۆرەی فەرموو.

---

(١) بڕوانە: ٨٨.

## ١٥- بَابُ تَعْدِيلِ النِّسَاءِ بَعْضِهِنَّ بَعْضًا

٢٦٦١- حَدَّثَنَا أَبُو الرَّبِيعِ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ -وَأَفْهَمَنِي بَعْضَهُ أَحْمَدُ- حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، وَسَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، وَعَلْقَمَةَ بْنِ وَقَّاصٍ اللَّيْثِيِّ، وَعُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الإِفْكِ مَا قَالُوا، فَبَرَّأَهَا اللهُ مِنْهُ، قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَكُلُّهُمْ حَدَّثَنِي طَائِفَةً مِنْ حَدِيثِهَا، وَبَعْضُهُمْ أَوْعَى مِنْ بَعْضٍ، وَأَثْبَتُ لَهُ اقْتِصَاصًا، وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمُ الحَدِيثَ الَّذِي حَدَّثَنِي عَنْ عَائِشَةَ، وَبَعْضُ حَدِيثِهِمْ يُصَدِّقُ بَعْضًا. زَعَمُوا أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ أَزْوَاجِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ، فَأَقْرَعَ بَيْنَنَا فِي غَزَاةٍ غَزَاهَا، فَخَرَجَ سَهْمِي، فَخَرَجْتُ مَعَهُ بَعْدَ مَا أُنْزِلَ الحِجَابُ، فَأَنَا أُحْمَلُ فِي هَوْدَجٍ وَأُنْزَلُ فِيهِ. فَسِرْنَا حَتَّى إِذَا فَرَغَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ غَزْوَتِهِ تِلْكَ، وَقَفَلَ وَدَنَوْنَا مِنَ المَدِينَةِ، آذَنَ لَيْلَةً بِالرَّحِيلِ، فَقُمْتُ حِينَ آذَنُوا بِالرَّحِيلِ، فَمَشَيْتُ حَتَّى جَاوَزْتُ الجَيْشَ، فَلَمَّا قَضَيْتُ شَأْنِي أَقْبَلْتُ إِلَى الرَّحْلِ، فَلَمَسْتُ صَدْرِي، فَإِذَا عِقْدٌ لِي مِنْ جَزْعِ أَظْفَارٍ قَدِ انْقَطَعَ، فَرَجَعْتُ فَالتَمَسْتُ عِقْدِي، فَحَبَسَنِي ابْتِغَاؤُهُ، فَأَقْبَلَ الَّذِينَ يَرْحَلُونَ لِي، فَاحْتَمَلُوا هَوْدَجِي فَرَحَلُوهُ عَلَى بَعِيرِي الَّذِي كُنْتُ أَرْكَبُ، وَهُمْ يَحْسِبُونَ أَنِّي فِيهِ، وَكَانَ النِّسَاءُ إِذْ ذَاكَ خِفَافًا لَمْ يَثْقُلْنَ وَلَمْ يَغْشَهُنَّ اللَّحْمُ، وَإِنَّمَا يَأْكُلْنَ العُلْقَةَ مِنَ الطَّعَامِ، فَلَمْ يَسْتَنْكِرِ القَوْمُ حِينَ رَفَعُوهُ ثِقَلَ الهَوْدَجِ فَاحْتَمَلُوهُ وَكُنْتُ جَارِيَةً حَدِيثَةَ السِّنِّ، فَبَعَثُوا الجَمَلَ وَسَارُوا، فَوَجَدْتُ عِقْدِي بَعْدَ مَا اسْتَمَرَّ الجَيْشُ، فَجِئْتُ مَنْزِلَهُمْ وَلَيْسَ فِيهِ أَحَدٌ، فَأَمَمْتُ مَنْزِلِي الَّذِي كُنْتُ بِهِ، فَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ سَيَفْقِدُونِي فَيَرْجِعُونَ إِلَيَّ، فَبَيْنَا أَنَا جَالِسَةٌ غَلَبَتْنِي عَيْنَايَ فَنِمْتُ. وَكَانَ صَفْوَانُ بْنُ المُعَطَّلِ السُّلَمِيُّ ثُمَّ الذَّكْوَانِيُّ مِنْ وَرَاءِ الجَيْشِ، فَأَصْبَحَ عِنْدَ مَنْزِلِي فَرَأَى سَوَادَ إِنْسَانٍ نَائِمٍ فَأَتَانِي، وَكَانَ يَرَانِي قَبْلَ الحِجَابِ، فَاسْتَيْقَظْتُ بِاسْتِرْجَاعِهِ حِينَ أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ، فَوَطِئَ يَدَهَا فَرَكِبْتُهَا فَانْطَلَقَ يَقُودُ بِي الرَّاحِلَةَ، حَتَّى أَتَيْنَا الجَيْشَ بَعْدَ مَا نَزَلُوا مُعَرِّسِينَ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ، فَهَلَكَ مَنْ هَلَكَ، وَكَانَ الَّذِي تَوَلَّى الإِفْكَ

عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ، فَقَدِمْنَا المَدِينَةَ فَاشْتَكَيْتُ بِهَا شَهْرًا، وَالنَّاسُ يُفِيضُونَ مِنْ قَوْلِ أَصْحَابِ الإِفْكِ، وَيَرِيبُنِي فِي وَجَعِي أَنِّي لَا أَرَى مِنَ النَّبِيِّ ﷺ اللُّطْفَ الَّذِي كُنْتُ أَرَى مِنْهُ حِينَ أَمْرَضُ، إِنَّمَا يَدْخُلُ فَيُسَلِّمُ ثُمَّ يَقُولُ: "كَيْفَ تِيكُمْ؟ ". لَا أَشْعُرُ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ حَتَّى نَقَهْتُ، فَخَرَجْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ قِبَلَ المَنَاصِعِ مُتَبَرَّزُنَا، لَا نَخْرُجُ إِلَّا لَيْلًا إِلَى لَيْلٍ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ نَتَّخِذَ الكُنُفَ قَرِيبًا مِنْ بُيُوتِنَا، وَأَمْرُنَا أَمْرُ العَرَبِ الأُوَلِ فِي البَرِّيَّةِ أَوْ فِي التَّنَزُّهِ، فَأَقْبَلْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ بِنْتُ أَبِي رُهْمٍ نَمْشِي، فَعَثُرَتْ فِي مِرْطِهَا، فَقَالَتْ: تَعِسَ مِسْطَحٌ، فَقُلْتُ لَهَا: بِئْسَ مَا قُلْتِ، أَتَسُبِّينَ رَجُلًا شَهِدَ بَدْرًا؟ فَقَالَتْ يَا هَنْتَاهْ، أَلَمْ تَسْمَعِي مَا قَالُوا؟ فَأَخْبَرَتْنِي بِقَوْلِ أَهْلِ الإِفْكِ، فَازْدَدْتُ مَرَضًا إِلَى مَرَضِي. فَلَمَّا رَجَعْتُ إِلَى بَيْتِى دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَسَلَّمَ فَقَالَ: "كَيْفَ تِيكُمْ؟ ". فَقُلْتُ: ائْذَنْ لِي إِلَى أَبَوَيَّ -قَالَتْ: وَأَنَا حِينَئِذٍ أُرِيدُ أَنْ أَسْتَيْقِنَ الخَبَرَ مِنْ قِبَلِهِمَا- فَأَذِنَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَتَيْتُ أَبَوَيَّ، فَقُلْتُ لِأُمِّي: مَا يَتَحَدَّثُ بِهِ النَّاسُ؟ فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّةُ، هَوِّنِي عَلَى نَفْسِكِ الشَّأْنَ، فَوَاللهِ لَقَلَّمَا كَانَتِ امْرَأَةٌ قَطُّ وَضِيئَةٌ عِنْدَ رَجُلٍ يُحِبُّهَا وَلَهَا ضَرَائِرُ إِلَّا أَكْثَرْنَ عَلَيْهَا. فَقُلْتُ: سُبْحَانَ اللهِ! وَلَقَدْ يَتَحَدَّثُ النَّاسُ بِهَذَا؟! قَالَتْ: فَبِتُّ تِلْكَ اللَّيْلَةَ حَتَّى أَصْبَحْتُ لَا يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلَا أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، ثُمَّ أَصْبَحْتُ، فَدَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، وَأُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ حِينَ اسْتَلْبَثَ الوَحْيُ، يَسْتَشِيرُهُمَا فِي فِرَاقِ أَهْلِهِ، فَأَمَّا أُسَامَةُ فَأَشَارَ عَلَيْهِ بِالَّذِي يَعْلَمُ فِي نَفْسِهِ مِنَ الوُدِّ لَهُمْ، فَقَالَ أُسَامَةُ: أَهْلُكَ يَا رَسُولَ اللهِ، وَلَا نَعْلَمُ وَاللهِ إِلَّا خَيْرًا.

وَأَمَّا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَمْ يُضَيِّقِ اللهُ عَلَيْكَ، وَالنِّسَاءُ سِوَاهَا كَثِيرٌ، وَسَلِ الجَارِيَةَ تَصْدُقْكَ. فَدَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ بَرِيرَةَ فَقَالَ: "يَا بَرِيرَةُ، هَلْ رَأَيْتِ فِيهَا شَيْئًا يَرِيبُكِ؟ ". فَقَالَتْ بَرِيرَةُ: لَا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ، إِنْ رَأَيْتُ مِنْهَا أَمْرًا أَغْمِصُهُ عَلَيْهَا قَطُّ أَكْثَرَ مِنْ أَنَّهَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ تَنَامُ عَنِ العَجِينِ، فَتَأْتِي الدَّاجِنُ فَتَأْكُلُهُ. فَقَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ يَوْمِهِ، فَاسْتَعْذَرَ مِنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أُبَيٍّ ابْنِ سَلُولَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مَنْ يَعْذِرُنِي مِنْ رَجُلٍ بَلَغَنِى أَذَاهُ فِي أَهْلِي؟ فَوَاللهِ مَا عَلِمْتُ عَلَى أَهْلِي إِلَّا خَيْرًا، وَقَدْ ذَكَرُوا رَجُلًا مَا

عَلِمْتُ عَلَيْهِ إِلَّا خَيْرًا، وَمَا كَانَ يَدْخُلُ عَلَى أَهْلِي إِلَّا مَعِي ". فَقَامَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَا وَاللهِ أَعْذِرُكَ مِنْهُ، إِنْ كَانَ مِنَ الأَوْسِ ضَرَبْنَا عُنُقَهُ، وَإِنْ كَانَ مِنْ إِخْوَانِنَا مِنَ الخَزْرَجِ أَمَرْتَنَا فَفَعَلْنَا فِيهِ أَمْرَكَ. فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ وَهُوَ سَيِّدُ الخَزْرَجِ -وَكَانَ قَبْلَ ذَلِكَ رَجُلًا صَالِحًا وَلَكِنِ احْتَمَلَتْهُ الحَمِيَّةُ- فَقَالَ: كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللهِ، لَا تَقْتُلُهُ وَلَا تَقْدِرُ عَلَى ذَلِكَ، فَقَامَ أُسَيْدُ بْنُ الحُضَيْرِ فَقَالَ: كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللهِ، وَاللهِ لَنَقْتُلَنَّهُ، فَإِنَّكَ مُنَافِقٌ تُجَادِلُ عَنِ المُنَافِقِينَ. فَثَارَ الحَيَّانِ: الأَوْسُ وَالخَزْرَجُ حَتَّى هَمُّوا، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى المِنْبَرِ فَنَزَلَ فَخَفَّضَهُمْ حَتَّى سَكَتُوا وَسَكَتَ.

وَبَكَيْتُ يَوْمِي لَا يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلَا أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، فَأَصْبَحَ عِنْدِي أَبَوَايَ، قَدْ بَكَيْتُ لَيْلَتَيْنِ وَيَوْمًا حَتَّى أَظُنُّ أَنَّ البُكَاءَ فَالِقٌ كَبِدِي. قَالَتْ: فَبَيْنَا هُمَا جَالِسَانِ عِنْدِي وَأَنَا أَبْكِي، إِذِ اسْتَأْذَنَتِ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَأَذِنْتُ لَهَا، فَجَلَسَتْ تَبْكِي مَعِي، فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ إِذْ دَخَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَجَلَسَ، وَلَمْ يَجْلِسْ عِنْدِي مِنْ يَوْمِ قِيلَ فِيَّ مَا قِيلَ قَبْلَهَا، وَقَدْ مَكُثَ شَهْرًا لَا يُوحَى إِلَيْهِ فِي شَأْنِي شَيْءٌ -قَالَتْ- فَتَشَهَّدَ ثُمَّ قَالَ: "يَا عَائِشَةُ، فَإِنَّهُ بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا، فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللهُ، وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ، فَإِنَّ العَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِهِ ثُمَّ تَابَ، تَابَ اللهُ عَلَيْهِ".

فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ مَقَالَتَهُ قَلَصَ دَمْعِي حَتَّى مَا أُحِسُّ مِنْهُ قَطْرَةً، وَقُلْتُ لأَبِي: أَجِبْ عَنِّي رَسُولَ اللهِ ﷺ. قَالَ: وَاللهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ. فَقُلْتُ لأُمِّي: أَجِيبِي عَنِّي رَسُولَ اللهِ ﷺ فِيمَا قَالَ. قَالَتْ: وَاللهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ. قَالَتْ: وَأَنَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ لَا أَقْرَأُ كَثِيرًا مِنَ القُرْآنِ فَقُلْتُ: إِنِّي وَاللهِ لَقَدْ عَلِمْتُ أَنَّكُمْ سَمِعْتُمْ مَا يَتَحَدَّثُ بِهِ النَّاسُ، وَوَقَرَ فِي أَنْفُسِكُمْ وَصَدَّقْتُمْ بِهِ، وَلَئِنْ قُلْتُ لَكُمْ: إِنِّي بَرِيئَةٌ -وَاللهُ يَعْلَمُ إِنِّي لَبَرِيئَةٌ- لَا تُصَدِّقُونِي بِذَلِكَ، وَلَئِنِ اعْتَرَفْتُ لَكُمْ بِأَمْرٍ -وَاللهُ يَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ- لَتُصَدِّقُنِّي، وَاللهِ مَا أَجِدُ لِي وَلَكُمْ مَثَلًا إِلَّا أَبَا يُوسُفَ إِذْ قَالَ: ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا

تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ يوسف، ثُمَّ تَحَوَّلْتُ عَلَى فِرَاشِي وَأَنَا أَرْجُو أَنْ يُبَرِّئَنِي اللهُ، وَلَكِنْ وَاللهِ مَا ظَنَنْتُ أَنْ يُنْزِلَ فِي شَأْنِي وَحْيًا، وَلأَنَا أَحْقَرُ فِي نَفْسِي مِنْ أَنْ يُتَكَلَّمَ بِالقُرْآنِ فِي أَمْرِي، وَلَكِنِّي كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللهُ، فَوَاللهِ مَا رَامَ مَجْلِسَهُ، وَلَا خَرَجَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ البَيْتِ حَتَّى أُنْزِلَ عَلَيْهِ، فَأَخَذَهُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنَ البُرَحَاءِ، حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِثْلُ الجُمَانِ مِنَ العَرَقِ فِي يَوْمٍ شَاتٍ، فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَكَانَ أَوَّلَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا أَنْ قَالَ لِي: "يَا عَائِشَةُ، احْمَدِي اللهَ فَقَدْ بَرَّأَكِ اللهُ". فَقَالَتْ لِي أُمِّي: قُومِي إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ. فَقُلْتُ: لَا وَاللهِ، لَا أَقُومُ إِلَيْهِ، وَلَا أَحْمَدُ إِلَّا اللهَ. فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ﴿١١﴾ ﴾ النور، الآيَاتِ. فَلَمَّا أَنْزَلَ اللهُ هَذَا فِي بَرَاءَتِي.قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ ﷺ وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحِ بْنِ أُثَاثَةَ لِقَرَابَتِه مِنْهُ: وَاللهِ لَا أُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ شَيْئًا أَبَدًا بَعْدَ مَا قَالَ لِعَائِشَةَ. فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ النور. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: بَلَى، وَاللهِ إِنِّي لأُحِبُّ أَنْ يَغْفِرَ اللهُ لِي، فَرَجَعَ إِلَى مِسْطَحٍ الَّذِي كَانَ يُجْرِي عَلَيْهِ. وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَسْأَلُ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ عَنْ أَمْرِي، فَقَالَ: "يَا زَيْنَبُ، مَا عَلِمْتِ؟ مَا رَأَيْتِ؟ ". فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَحْمِي سَمْعِي وَبَصَرِي، وَاللهِ مَا عَلِمْتُ عَلَيْهَا إِلَّا خَيْرًا، قَالَتْ: وَهْيَ الَّتِي كَانَتْ تُسَامِينِي، فَعَصَمَهَا اللهُ بِالوَرَعِ.

قَالَ: وَحَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ مِثْلَهُ. قَالَ وَحَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَيَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ مِثْلَهُ[1].

## ١٥- باسی بە مسوڵمانی چاک زانینی هەندێک لەئافرەتان بۆ هەندێکیان

**٢٦٦١- ئیبنو شیهابی زوهری دەگێڕێتەوە لە عوروەی کوڕی زوبەیر و سەعیدی کوڕی موسەییەب و عەلقەمەی کوڕی وەققاصی لەیسی و عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوقبە لە عائیشەی ﷺ هاوسەری پێغەمبەرەوە ﷺ: کاتێك بوختانچییەکان ئەو بوختانە نارەوایەیان دایە پاڵی و خوای گەورە پاك و بێگەردی عائیشەی خستەڕوو، زوهری دەڵێ: هەریەك لەو کەسانە(ی ناوهێنران لە پێشەوە) بەشێك لەبەسەرهاتەکەی عائیشەیان بۆ گێڕاومەتەوە، وە هەندێکیان لە هەندێکیان چاکتری لەبەرە و شێوەی گێڕانەوەکەی بەهێزترە، وە لە هەریەکێکیانەوە ئەو بەشەی فەرموودەکەم وەرگرتووە و لەبەرکردووە کە لە عائیشەوە دەیگێڕێتەوە، وە فەرموودەی هەندێکیان پاڵپشتی هەندێکی تریان دەکات، دەڵێن: کە عائیشە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکات بیویستایە بڕۆیشتایە بۆ سەفەرێك تیروپشکی دەکرد لە نێوان خێزانەکانیدا، جا بۆ هەر خێزانێکی دەرچووبایە، لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ سەفەرەکە، ئینجا لەغەزایەکدا تیروپشکی کرد لە نێوانماندا، بۆ من (عائیشە) دەرچوو، منیش لەگەڵی ڕۆیشتم دوای ئەوەی ئایەتی (حیجاب) دابەزی بوو، جا من لەکەژاوەدا هەڵدەگیرام و**

---

(١) بڕوانە: ٢٥٩٣.

دادەبەزێنرام، ئیتر ڕۆیشتین هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لەو غەزایە بوویەوە و گەڕایەوە و نزیك بوونەوە لەمەدینە، شەوێکیان ئاگاداری دا بەڕۆیشتن (و گەڕانەوە بۆ مەدینە) منیش کاتێك ئاگاداری درا ڕۆیشتم تا لەلەشکرەکە تێپەڕیم (دەستم بەئاو گەیاند)، جا کە تەواوبووم لە پێویستییەکەم گەڕامەوە بۆ لای شوێنەکەی خۆم، کە دەستم دا لەسنگم دەبینم ملوانکەکەم کە لەموروی (أَظْفَارٍ)ـە[1] پچڕاوە، بۆیە گەڕامەوە بۆ دۆزینەوەی موروی ملوانکەکەم، جا بەدواگەڕانی ملوانکەکەم دوای خستم، وە ئەوانەی کەژاوەکەی منیان باردەکرد هاتبوون، کەژاوەکەی منیان خستبووە سەر پشتی وشترەکەم کە من سواری دەبووم، وایان زانیبوو من لە کەژاوەکەدام، وە ئافرەتان لەوکات و ڕۆژگارەدا سوکەڵە بوون، قورس نەبوون و گۆشتیان زۆر پێوە نەبوو، بێگومان خواردنی کەمیان دەخوارد، جا بۆیە ئەوانەی کەژاوەکەیان هەڵگرتبوو، هیچ شتێکی نائاساییان هەست پێ نەکردبوو، لەبەر قورسی کەژاوەکە کە هەڵیانگرتبوو، منیش ئافرەتێکی گەنجی کەم تەمەن بووم، ئیتر وشترەکەیان هەڵساندبوو و ڕۆیشتبوون، منیش ملوانکەکەم دۆزییەوە دوای ئەوەی لەشکرەکە ڕۆیشتبوون، هاتمە جێگاکەی ئەوان کەسی لێ نەمابوو، ئیتر ڕۆیشتم بەرەو جێگاکەی خۆم کە پێشتر لێی بووم، چونکە دەمزانی کە دەزانن منیان گوم کردووە دەگەڕێنەوە بەشوێنمدا. لەکاتێکدا من دانیشتبووم خەو زۆری بۆ چاوەکانم هێنابوو، خەوم لێ کەوتبوو، وە صەفوانی کوڕی موعەتتەلی سولەمی پاشان زەکوانی لەدوای لەشکرەکەوە بوو، کە ڕۆژ بوویەوە هاتە لای جێگاکەی من، وە ڕەشایی کەسێکی خەوتووی بینیبوو، جا هات بۆ لای من، وە ئەو پێش پێویست بوونی (حیجاب)

---

(١) یا (ظَفارِ): جۆرە مورویەکی ڕەشە خەتی سپی تێدایە لە شێوەی دەمار. (إرشاد الساري القسطلاني: ١٠٨/٦).

منی دەبینی، وە من لە دەنگی (إنا لله وإنا إليه راجعون)ی ئەو خەبەرم بوویەوە کاتێك وشترەکەی خوست دا، دەستەکانی پێ خستە زەوی، ئیتر منیش سواری بووم، وە بەخێرایی ڕەشوەی وشترەکەمی ڕادەکێشا، هەتا گەشتینەوە بەلەشکرەکە دوای ئەوەی لایان دابوو، باریان خستبوو لەنیوەڕۆدا، (لەوێدا قسە و قسەلۆك دەستی پێکرد)، جا ئەوەی تیاچوو تیاچوو، وە ئەوکەسەی بوختانەکەی بلاو کردبۆوە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو. ئینجا گەشتینەوە مەدینە و یەك مانگ نەخۆش کەوتم، خەڵك قسەی بوختان چییەکانیان بلاو دەکردەوە، وە لەنەخۆشییەکەمدا گومانم بۆ دروست بوو بوو کە ئەو سۆز و لوتفە لە پێغەمبەردا ﷺ نابینم کە جاران نەخۆش دەکەوتم هەیبوو بۆم، تەنها کە دەهاتەوە ماڵەوە سەلامی دەکرد، پاشان دەیفەرموو: ((کچەکەتان چۆنە[1]؟)) هەستم بەهیچ لەو قسە و قسەلۆکە نەکردبوو هەتا لەنەخۆشییەکەم چاك بوومەوە، جا من و دایکی میستەح ڕوو بە مەناصیع ڕۆیشتینە دەرەوە کە شوێنی دەستبەئاو گەیاندنمان بوو، شەو بۆ شەو نەبووایە نەدەڕۆیشتینە دەرەوە، ئەوە پێش ئەوە بوو کە ئاودەست دروست بکەین لەنزیك ماڵەکانمان، عادەتی ئێمە لەم بارەیەوە وەك عادەتی عەرەبە پێشووەکان بوو، لە چۆڵەوانی دەستمان بەئاو دەگەیاند، جا من و دایکی میستەح (کە کچی ئەبوڕوهم بوو) هاتینەوە، ئاسایی دەڕۆیشتین، قاچی لەعەباکەی گیرا و پێی هەڵکەوت، قسەیەکی بەمیستەح وت، منیش وتم: قسەیەکی خراپت کرد، ئایا تۆ جنێو بەپیاوێك دەدەیت بەشداری غەزای بەدری کردووە؟ دایکی میستەح وتی:

---

(١) كَيفَ تيكُم واتە: کچەکەتان چۆنە، تيكم إشارة لمؤنـث والخطـاب لجمـع مـذكر. بڕوانە: منحـة البـاري بـشرح صحيح البخاري زكريا ابن محمد ابن احمد ابن زكريا الانصاري: ٤٤٢/٥.

ئەی کچەکە! ئایا نەتبیستووە خەڵکی چی دەڵێن؟ ئینجا ئەوەی بوختانچییەکان دەیڵێن بۆی گێڕامەوە، ئیتر ئەم نەخۆشییەش چوویە سەر نەخۆشییە پێشووەکەم، جا کە گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆم پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆلام و سەلامی کردو فەرمووی: ((کچەکەتان چۆنە؟))، منیش وتم: مۆڵەتم بدە بڕۆم بۆ لای دایك و باوکم -عائیشە دەڵێ: من لەو کاتەدا دەمویست ڕاستی هەواڵەکە لە دایك و باوکمەوە بزانم-، پێغەمبەری خواش ﷺ مۆڵەتی دام و ڕۆیشتم بۆ لای دایك و باوکم، وە بەدایکمم وت: خەڵك چی دەڵێن دەربارەم؟ دایکم وتی: کچی شیرینم نارەحەت مەبە و خەفەت مەخۆ، سوێند بەخوا کەم ئافرەت هەیە جوان بێت و مێردەکەی خۆشی بوێت و هەوێی هەبێت، قسەو قسەلۆکی لەسەر نەکرێ! منیش وتم: پاك و بێگەردی بۆ خوا، هەر بەڕاستی خەڵکی ئاوەها دەربارەم قسە دەکەن؟! عائیشە دەڵێ: ئەو شەوە تا بەیانی فرمێسك لەچاوم وشك نەبوویەوە، وە خەوم لێ نەکەوت پاشان کە ڕۆژم لێ بوویەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی کوڕی ئەبو تالیب و ئوسامەی کوڕی زەیدی بانگ کردبوو، کاتێك نیگا نەهات و دواکەوت ڕاوێژی پێکردبوون دەربارەی جیابوونەوە لە خێزانی[1]، جا ئوسامە ئەوەی عەرز کرد کە لەناخی خۆیدا هەستی پێدەکرد لەخۆشەویستی بۆیان، ئوسامە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! خێزانی خۆتە سوێند بەخوا چاکە نەبێت لەبارەیەوە نایزانین.

بەڵام عەلی کوڕی ئەبو تالیب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوا ڕێگەی لێ تەسك نەکردویتەوە (بۆ ژن هێنان)، جگە لەو ئافرەتی تر زۆرە، وە پرسیار لە کەنیزەکەکە بکە ڕاستیت پێ دەڵێ، جا پێغەمبەری خواش ﷺ بەریرەی بانگ

(١) واتە: عائیشە رضي الله عنها.

**کرد و فەرمووی: ((ئەی بەریرە! ئایا شتێکت لە عائیشە دیوە بتخاتە گومانەوە؟ بەریرەش وتی: نەخێر سوێند بەو زاتەی تۆی بەڕاستی ناردووە، هیچ شتێکم لێ نەدیوە نەنگی بێت بۆی، تەنها ئەوە نەبێت کچۆڵەیەکی منالکارە، بەسەر هەویرەکەوە خەوی لێ دەکەوێت، ئەو ئاژەڵەی لە ماڵەوەیە[1] دێت و هەویرەکە دەخوات.**

**ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ هەر ئەو ڕۆژە هەستاو ڕۆیشتە سەر دوانگە، سکاڵای حاڵی خۆی کرد لەدەستی (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول)، فەرمووی: ((کێ یارمەتیم دەدا بچم بەگژی پیاوێکدا ئەزیەت و ئازاری بەخاوخێزانم گەیاندووە؟ جا سوێند بەخوا جگە لەچاکە هیچم لەخێزانم نەدیوە، وە باسی پیاوێکیان کردووە جگە لە چاکە هیچم لێ نەدیوە، وە لەگەڵ خۆمدا نەبێت نەهاتۆتە ژوورەوە بۆ ناو ماڵ و خێزانم)). جا سەعدی کوڕی موعاز هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من یارمەتیت دەدەم، سوێند بەخوا لەدژی ئەو کەسە، ئەگەر لەهۆزی ئەوسە دەدەین لەگەردنی، وە ئەگەر لەبرایانمانە لە هۆزی خەزرەج فەرمانمان پێ بکە، ئێمەش فەرمانەکەت جێ بەجێ دەکەین. ئینجا سەعدی کوڕی عوبادە هەستا، کە سەرۆکی هۆزی خەزرەج بوو -کە پێشتر پیاوێکی چاك بوو، بەڵام دەماری خزمایەتی جوڵاو- وتی: (بە سەعدی کوڕی موعاز) سوێند بەخوا درۆ دەکەیت، نایکوژی و ناشتوانی ئەو کارە بکەیت، ئینجا ئوسەیدی کوڕی حوزەیر هەستاو وتی: سوێند بەخوا تۆ درۆ دەکەیت، سوێند بەخوا بەدڵنیاییەوە دەیکوژین، چونکە تۆ دوو ڕوویت و دەمەقاڵێ دەکەیت لەسەر دوو ڕووەکان، جا هەردوو لایان ئەوس و خەزرەج هەستان، ویستیان**

---

(١) ئەو ئاژەڵەی لە ماڵەوەیە، کە بە عەرەبی پێی دەڵێن: (الـداجن)، ئەو حەیـوان و ئـاژەڵەیە هەر لەمـاڵەوەیە و ناڕوات بۆ دەرودەشت بلەوەڕێ. بڕوانە: إرشاد الساري: ١١٣/٦.

جەنگ لە دژی یەكتر بەرپابكەن! لەوكاتەدا پێغەمبەری خوا لەسەر دوانگەكە بوو، هاتە خوارەوە و هێوری كردنەوە و بێ دەنگ بوون، پێغەمبەریش بێدەنگ بوو.

عائیشە دەڵێ: من ئەو ڕۆژە هەمووی گریام، فرمێسك لەچاوم وشك نەبوویەوە، وە خەو نەچووە چاوم، جا بۆ بەیانییەكەی دایك و باوكم لابوو، دوو شەو و ڕۆژێك بەردەوام گریام، هەتا گومانم وابوو گریان و خەفەت دەمكوژێت، عائیشە دەڵێ: جا لەكاتێكدا دایك و باوكم لامان دانیشتبوون، منیش دەگریام، لەپڕ ئافرەتێكی ئەنصاری مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی خواست، منیش مۆڵەتم دا، هاتە ژوورەوەو دانیشت لەگەڵ من دەگریا، جا لەكاتێكدا ئێمە لەم حاڵەتەدا بووین، لەپڕ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوەو دانیشت، كە پێشتر لام دانەدەنیشت لەو ڕۆژەوەی ئەو قسەو قسەڵۆكە بۆ من دروست كرابوو، مانگێك بوو دەربارەی من هیچ نیگای بۆ نەدەهات، عائیشە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله)، پاشان فەرمووی: ((ئەی عائیشە! بێگومان دەربارەی تۆ ئەوە و ئەوە بەمن گەیشتووە، جا ئەگەر تۆ بێتاوان بیت، ئەوە بێگومان خوا بێ تاوانیت ڕوون دەكاتەوە، وە ئەگەر تاوانێكیشت كردووە ئەوە داوای لێخۆشبوون لەخوا بكە، وە پەشیمان بەرەوە و بگەڕێرەوە بۆ لای خوا، چونكە بەڕاستی ئەگەر مرۆڤ دان بەتاوانەكەیدا بنێت و پاشان بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، خواش تەوبەی لێ گیرا دەكات))، جا كەپێغەمبەری خوا ﷺ وتەكەی تەواو كرد، فرمێسكم وشك بوویەوە، بەجۆرێك هەستم نەدەكرد یەك فرمێسك لەچاوم بێت، وە وتم بەباوكم: لەجیاتی من وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەرەوە، باوكم وتی: وەڵڵاهی نازانم چی بڵێم بەپێغەمبەری خوا ﷺ، ئینجا وتم بەدایكم: لەجیاتی من وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەرەوە دەربارەی ئەوەی فەرمووی، دایكم وتی: وەڵڵاهی نازانم چی بڵێم بە پێغەمبەری خوا ﷺ، عائیشە

دەڵێ: منیش کچۆڵەیەکی منالکاربووم، قورئانی زۆرم نەخوێندبوو، منیش وتم: وەللاهی دڵنیابن من دەزانم ئێوە ئەو قسە و قسەڵۆکەی خەڵك دەربارەی من دەیلێن بیستووتانە، لەدڵ و دەروونتاندا جێگیر بووە و باوەڕتان پێ کردووە، خۆ ئەگەر من پێتان بڵێم: من بێ تاوانم -خواش دەزانێ کەمن بێ تاوانم-، ئێوە باوەڕم پێ ناکەن بەوەی دەیڵێم، بەڵام ئەگەر دان بەو تاوانەدا بنێم لەبەردەم ئێوەدا -خوا دەزانێ بێ تاوانم-، ئەوە باوەڕم پێ دەکەن، وەللاهی نموونەی وتەیەك نادۆزمەوە لەم مەسەلەی من و ئێوە بچێت، جگە لە وتەکەی باوکی یوسف ﷺ کە فەرمووی: ( (وتی جا ئارام دەگرم) بەئارامگرتنێکی چاك و پەسەند، خواش یارمەتیدەرمە لەسەر ئەوەی باسی دەکەن).

پاشان لەسەر نوێنەکەم خۆم وەرچەرخاند، ئومێدەوار بووم کە خوا بێ تاوانیم دەربخات، بەڵام سوێند بەخوا گومانم نەدەبرد کە دەربارەی ئەم کارەی من نیگا دابەزێت، وە پێم وابوو من لە دڵی خۆمدا لەوە کەمترم کە قورئان دەربارەی کاری من فەرمایشت بفەرموێ، بەڵام من ئومێدم دەکرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەخەودا خەوێك ببینێ، خوا بێ تاوانی منی دەربخات، جا سوێند بەخوا پێغەمبەر ﷺ لەشوێنی خۆی نەڕۆیشت، وە کەس لەو خەڵکەی لەوێدا بوون نەڕۆیشتنە دەرەوە، هەتا نیگا بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزی، جا پێغەمبەر ﷺ حاڵەتی هاتنی نیگا دایگرت کە تایەکی قورس بوو، تەنانەت دڵۆپی ئارەقی دانە دانە وەك گۆی مرواری بەڕووخساریدا دەهاتە خوارەوە، لەبەر عەرەق کردنی لە ڕۆژی ساردی زستاندا.

جا کاتێك نیگاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەواو بوو، ئاسایی بوویەوە، پێغەمبەر ﷺ پێدەکەنی، جا یەکەم وشەیەك لە دەمی هاتە دەرەوە ئەوە بوو بەمنی فەرموو: ((ئەی عائیشە! سوپاسی خوا بکە کە بێ تاوانی تۆی دەرخست))، دایکیشم پێی وتم: هەستە بچۆ بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، منیش وتم: نەخێر!

**بەخوا ناچم بۆ خزمەتی، جگە لەخوا سوپاسی کەس ناکەم، جا خوای بەرز و بڵند ئەم چەند ئایەتەی دابەزاند: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ﴿١١﴾﴾ النور[1].**

**جا کاتێك خوا ئەم ئایەتانەی دابەزاند دەربارەی بێ تاوانی و پاکێتی من، ئەبو بەکری صدیق -کە خەرج و مەسرەفی میستەحی کوڕی ئوساسەی دەکێشا لەبەر نزیکی و خزمایەتی- وتی: سوێند بەخوا ئیتر خەرجی میستەح بەهیچ جۆرێك ناکێشم، دوای ئەو بوختانەی بۆ عائیشەی کرد، ئینجا خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُوْلِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾ النور، واتە: ئەوانەتان خاوەنی چاکە و سەروەت و سامانن سوێند نەخۆن کە یارمەتی بەخزمان و هەژاران و کۆچەران نەدەن لەپێناوی خوادا، وە با لێبوردەبن و چاوپۆشی بکەن، ئایا پێتان خۆش نییە خوا لێتان خۆش بێت؟! وە خوا لێ خۆش بووی میهرەبانە.**

**جا ئەبو بەکر ﷺ وتی: بەڵێ سوێند بەخوا پێم خۆشە کە خوا لێم خۆش بێت، ئیتر ئەو خەرجی جارانی گێڕایەوە بۆ میستەح، وە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لە زەینەبی کچی جەحش ﷺ کرد بوو دەربارەی من (پێش دابەزینی ئایەتەکە) و فەرمووی پێی: ((زەینەب چی دەزانی؟ چیت بینیوە؟))، ئەویش وتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! گوێم و چاوم دەپارێزم، وەڵڵاهی جگە لەچاکە هیچم لێ نەبینیوە، عائیشە ﷺ دەڵێ: (لەناو خێزانەکانیدا) تەنها زەینەب هاوتای من بوو لەجوانی و پلەی لای پێغەمبەردا ﷺ، بەڵام بەهۆی خواناسی و خۆپارێزییەوە خوا پاراستی.**

---

(١) واتە: (بێگومان ئەوانەی کە ئەو بوختانەیان (بۆ عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەڵبەست، دەستەیەک بوون لە خۆتان). لە ئایەتی: ١١ تا ئایەتی: ٢٢ی سوورەتی نووری دابەزاند.

**(ئەبو ڕەبیع سولەیمانی کوڕی داود)[١] دەڵێ: فولەیح بۆی گێڕاینەوە لە هیشامی کوڕی عورڕوەوە، لە عورڕوەوە لە عائیشە و عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە هاوشێوەی فەرموودەکەی (فولەیح لە زوهری و لە عورڕوەوە).**

**هەروەها (ئەبو ڕەبیع) دەڵێ: فولەیح بۆی گێڕاینەوە لە ڕەبیعی کوڕی ئەبو عەبدورڕەحمان و یەحیای کوڕی سەعیدەوە، لە قاسیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکرەوە، هاوشێوەی فەرموودەکەی (فولەیح لە زوهری و لە عورڕوەوە).**

## ١٦ - بابٌ: إِذَا زَكَّى رَجُلٌ رَجُلًا كَفَاهُ

وَقَالَ أَبُو جَمِيلَةَ: وَجَدْتُ مَنْبُوذًا، فَلَمَّا رَآنِي عُمَرُ قَالَ: عَسَى الغُوَيْرُ أَبْؤُسًا. كَأَنَّهُ يَتَّهِمُنِي، قَالَ عَرِيفِي: إِنَّهُ رَجُلٌ صَالِحٌ قَالَ: كَذَاكَ، اذْهَبْ وَعَلَيْنَا نَفَقَتُهُ.

## ١٦- باسێک: ئەگەر پیاوێک پیاوێک بەچاک بناسێنێت ئەوەی بەسە

**ئەبو جەمیلە دەڵێ: منداڵێکی فڕێدراوم دۆزیەوە، جا کاتێك عومەر بینیمی وتی: لەوانەیە ئەشکەوتە بچکۆلە ببێتە مایەی بەدبەختی خراپە[٢]، وەك بڵێی عومەر ﷺ گومانی خراپەم پێ دەبات، سەرپەرشتیاری هۆزەکەم وتی: بێگومان پیاوێکی چاکە، عومەر وتی: هەروایە کە تۆ دەڵێیت، بڕۆ خەرجی ئەو منداڵە لەسەر ئێمەیە (لە خەزێنەی دەوڵەت).**

---

(١) کە مامۆستای بوخارییە.

(٢) ئەمەی لە عەرەبییەکەدا هاتووە پەندێکی عەرەبییە، بۆ ئەوە دەوترێت شتێک بەڕواڵەت چاک بێت، بەڵام ترسی یەک کەوتنی لێ بکرێ، ئەصمەعی دەڵێ: ئەصڵەکەی ئەم ڕووداوەیە کە کۆمەڵێک کەس ڕۆیشتوونەتە ناو ئەشکەوتێکەوە شەو تێیدا بمێننەوە، ئەشکەوتەکە رووخاوە بەسەریاندا و هەموو مردوون.

٢٦٦٢- حَدَّثَنَا ابْنُ سَلاَمٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ الحَذَّاءُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَثْنَى رَجُلٌ عَلَى رَجُلٍ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: "وَيْلَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ، قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ". مِرَارًا، ثُمَّ قَالَ: "مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَادِحًا أَخَاهُ لا مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ: أَحْسِبُ فُلاَنًا، وَاللهُ حَسِيبُهُ، وَلَا أُزَكِّي عَلَى اللهِ أَحَدًا، أَحْسِبُهُ كَذَا وَكَذَا، إِنْ كَانَ يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنْهُ"[١].

**٢٦٦٢- عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پیاوێك مەدح و ستایشی پیاوێکی کرد لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ، فەرمووی ﷺ : ((ماڵ وێران ملی هاوڕێکەت پەڕاند))، چەند جار دووبارەی کردەوە، پاشان فەرمووی: ((هەرکام لە ئێوە ناچار بوو ستایشی براکەی بکات با بڵێت: پێم وایە فلان کەس وایە، لەگەڵ ئەوەشدا خوا چاکتر دەیناسێ و پاکانە بۆ کەس ناکەم لای خوای گەورە، پێم وایە ئاوا و ئاوایە، ئەگەر بزانی ئەو شتەی تێدایە)).**

## ١٧- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ الإِطْنَابِ فِي المَدْحِ، وَلْيَقُلْ مَا يَعْلَمُ

٢٦٦٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ زَكَرِيَّاءَ، حَدَّثَنَا بُرَيْدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا يُثْنِي عَلَى رَجُلٍ، وَيُطْرِيهِ فِي مَدْحِهِ فَقَالَ: "أَهْلَكْتُمْ -أَوْ قَطَعْتُمْ- ظَهْرَ الرَّجُلِ"[٢].

## ١٧- باسی ئەوەی ناپەسەندە لە ڕۆچوون لە ستایشدا و با ئەوە بڵێت کە دەیزانێت و بەس

**٢٦٦٣- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گوێی لێ بوو پیاوێك ستایشی پیاوێکی دەکردو لە ستایشکردنیدا ڕۆچوو بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پیاوەکەتان لەناو برد، یان پشتی کابراتان شکاند)).**

---

(١) بڕوانە: ٦٠٦١، ٦١٦٢.

(٢) بڕوانە: ٦٠٦٠.

## ١٨- بابُ بُلُوغِ الصِّبْيَانِ وَشَهَادَتِهِمْ

وَقَوْلِ ﷻ: ﴿ وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَـٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ ﴿٥٩﴾ ﴾ النور. وَقَالَ مُغِيرَةُ: احْتَلَمْتُ وَأَنَا ابْنُ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً. وَبُلُوغُ النِّسَاءِ فِي الحَيْضِ؛ لِقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ وَٱلَّـٰٓـِٔى يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ﴿٤﴾ ﴾ الطلاق، وَقَالَ الحَسَنُ بْنُ صَالِحٍ:أَدْرَكْتُ جَارَةً لَنَا جَدَّةً بِنْتَ إِحْدَى وَعِشْرِينَ.

## ١٨- باسی (تەمەنی) باڵغبوونی منداڵان و (حوكمی) شايەتيدانيان

**وە باسی ئەو فەرمايشتەی خوای باڵادەستی گەورە: (وە كاتێ منداڵەكانتان باڵغ بوون، ئەوسا دەبێ مۆڵەت وەربگرن). موغيرە دەڵێ: من تەمەنم دوازدە ساڵ بوو لەشگران بووم. وە باسی باڵغبوونی ئافرەتان لەكاتی كەوتنە بێ نوێژی بەبەڵگەی ئەم فەرمايشتەی خوای باڵادەستی گەورە: (ئەو ئافرەتانەی كە بێ هيوا دەبن لە كەوتنە بێ نوێژی لە ژنانتان، ئەگەر (دەربارەی زانينی عيدەيان) دوو دڵ بوون، ئەوا عيدەيان سێ مانگە، وە (هەروەها) ئەوانەش كە (لەبەر منداڵی) هێشتا نەكەوتوونەتە بێ نوێژی، وە ژنانی سك پڕ عيدەيان ئەو كاتەيە كە سكەكەيان دابنێن). حەسەنی كوڕی صاڵح دەڵێ: بە دراوسێيەكی ئافرەتمان گەيشتووم بوو بوو بەنەنك[1] تەمەنی بيست و يەك ساڵ بوو.**

٢٦٦٤- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ عُمَرَ ﭭ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَرَضَهُ يَوْمَ أُحُدٍ وَهْوَ ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً فَلَمْ يُجِزْنِي، ثُمَّ عَرَضَنِي يَوْمَ الخَنْدَقِ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ فَأَجَازَنِي. قَالَ نَافِعٌ:

---

(١) نەنک ئەو ئافرەتەيە كچەكەی منداڵی بوو بێ.

فَقَدِمْتُ عَلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ وَهْوَ خَلِيفَةٌ، فَحَدَّثْتُهُ هَذَا الحَدِيثَ، فَقَالَ: إِنَّ هَذَا لَحَدٌّ بَيْنَ الصَّغِيرِ وَالكَبِيرِ. وَكَتَبَ إِلَى عُمَّالِهِ أَنْ يَفْرِضُوا لِمَنْ بَلَغَ خَمْسَ عَشْرَةَ[1].

**٢٦٦٤- نافيع دەڵێ: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕامەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕۆژی غەزای ئوحوددا تەماشای كردووە، لەكاتێكدا تەمەنی چواردە ساڵ بووە، بۆیە ڕێگەی نەدام (بەشداری غەزا بكەم)، پاشان لە ڕۆژی غەزای خەندەقدا تەماشای كردم كە تەمەنم پازدە ساڵ بوو، بۆیە ڕێگەی دام (بەشدار بم). نافیع دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ خزمەتی عومەری كوڕی عەبدولعەزیز كە خەلیفە بوو، ئەم فەرموودەیەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش وتی: بێگومان تەمەنی پازدە ساڵی سنووری نێوان بچووكی و گەورەییە، وە نامەی نووسی بۆ كاربەدەستانی، كە ئەوەی تەمەنی پازدە ساڵە بەشە ئازووقەی بۆ ببڕنەوە[2].**

٢٦٦٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا صَفْوَانُ بْنُ سُلَيْمٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: "غُسْلُ يَوْمِ الجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ"[3].

**٢٦٦٥- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەیباتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خۆ شۆردنی ڕۆژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو كەسێكی باڵغ)).**

## ١٩- بابُ سُؤَالِ الحَاكِمِ المُدَّعِيَ: هَلْ لَكَ بَيِّنَةٌ؟ قَبْلَ اليَمِينِ

٢٦٦٦- ٢٦٦٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ وَهْوَ فِيهَا فَاجِرٌ، لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، لَقِيَ اللهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ".

---

(١) بڕوانە: ٤٠٩٧.

(٢) لە تۆماری سەربازیدا وەک پیاو دانرێت.

(٣) بڕوانە: ٨٥٨.

قَالَ: فَقَالَ الأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ: فِيَّ وَاللهِ كَانَ ذَلِكَ، كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ مِنَ الْيَهُودِ أَرْضٌ فَجَحَدَنِي، فَقَدَّمْتُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: "أَلَكَ بَيِّنَةٌ؟ ". قَالَ: قُلْتُ لَا. قَالَ: فَقَالَ لِلْيَهُودِيِّ: "احْلِفْ". قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِذًا يَحْلِفَ وَيَذْهَبَ بِمَالِي. قَالَ: فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾ آل عمران، إِلَى آخِرِ الآيَةِ[1].

## ١٩- باسی پرسیاری دادوەر لە داواکار ئایا شایەتت هەیە؟ پێش سوێند دانی داوا لێکراو

**٢٦٦٦- ٢٦٦٧- عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکەسێك سوێندێك بخوات، لەو سوێند خواردنەشیدا درۆ بکات، بۆ ئەوەی ماڵی کەسێکی مسوڵمان (بۆ خۆی) پێ ببچڕێت، کە دەگات بە خوا (لە دوارۆژدا) زۆر لێی توڕەیە))، وتی: ئینجا ئەشعەسی کوڕی قەیس وتی: سوێند بەخوا ئەوە لەبارەی منەوە بوو، لە نێوان من و کابرایەکی جوولەکەدا زەوییەك هەبوو (بیرێکی تێدابوو هی من بوو)، بەڵام ئەو دانی بە مافەکەی مندا نەدەنا، بۆیە منیش بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ بەمنی فەرموو: ((شایەتت هەیە؟)) وتم: نەخێر، بەجوولەکەی فەرموو: ((سوێند بخۆ))، ئەشعەس دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەواتە سوێند دەخوا ماڵەکەم دەبات، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا و سوێندەکانیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشن). تا کۆتایی ئایەتەکە.**

## ٢٠- بابُ اليَمِينُ عَلَى المُدَّعَى عَلَيْهِ فِي الأَمْوَالِ وَالحُدُودِ

وَقَالَ ﷺ: "شَاهِدَاكَ أَوْ يَمِينُهُ"[2].

(١) بڕوانە: ٢٣٥٦، ٢٣٥٧.

(٢) بڕوانە: ٢٣٥٦، ٢٣٥٧.

وَقَالَ قُتَيْبَةُ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابن شُبْرُمَةَ، كَلَّمَنِي أَبُو الزِّنَادِ فِي شَهَادَةِ الشَّاهِدِ وَيَمِينِ الْمُدَّعِي، فَقُلْتُ: قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ وَٱسْتَشْهِدُوا۟ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ ﴿٢٨٢﴾ ﴾ البقرة، الآية. قُلْتُ: إِذَا كَانَ يُكْتَفَى بِشَهَادَةِ شَاهِدٍ وَيَمِينِ الْمُدَّعِي، فَمَا تَحْتَاجُ أَنْ تُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرى؟ مَا كَانَ يَصْنَعُ بِذِكْرِ هذِه الأُخْرى؟

## ٢٠- باسی سوێندخواردن لەسەر داوالێکراوە لە ماڵ و سامان و سنوورەکاندا

**پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (دوو شایەت (قسەت دەسەلمێنێ)، یان سوێند خواردنی (بەرانبەرەکەت [١])). قوتەیبە دەڵێ: سوفیان بۆی گێڕاینەوە لە ئیبنو شوبرومەوە وتی: ئەبو زیناد[٢] دەربارەی شایەتی دانی شایەت و سوێند خواردنی داواکار قسەی لەگەڵ کردم، منیش وتم: خوای گەورە دەفەرموێ: (وە دوو شایەت بگرن لە پیاوانی خۆتان (مسوڵمان)، ئینجا ئەگەر دوو پیاو نەبوو، ئەوە باپیاوێك و دوو ژن بن لەوانەی کە پەسەندیان دەکەن لەشایەتەکان، بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێکیان لەبیری چوو با ئەوی تریان بیری بخاتەوە)، وتم: ئەگەر بەشاهیدی یەك شایەت و سوێندخواردنی داواکار بەس بێت، دەی کەواتە ئیتر چ پێویستییەك دەکات ئافرەتێکیان بیری ئەوی تریانی بخاتەوە؟ ئەو چی دەکات بەبیرخستنەوەی ئافرەتی دووەمیان بۆ یەکەمیان؟**

---

(١) هەقەکە دەبێت بەهی بەرانبەرەکەت.

(٢) ئیبنو شوبرومە کە قازی کوفە بووە و ساڵی ١٤٤ـی کۆچی مردووە دەڵێ: ئەبو زیناد کە قازی مەدینە بووە پێی وتم: یەک شایەت و سوێندی داواکار دروستە و کاری پێ دەکرێ وحوکمی پێ دەدرێت، بۆچوونی وەک زانایانی شارەکەی وایە کە مەدینەیە، بەڵا ئیبنو شوبرومە ڕای وایە شایەتێک و سوێندی داواکار حوکمی پێ ناکرێت، ئەمیش بۆچوونی وەک بۆچوونی زانایانی شارەکەی خۆی وایە کە کوفەیە، کە بۆچونی حەنەفیەکانە. بڕوانە: غرشاد الساري: ١٢٦/٦.

٢٦٦٨- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ حَدَّثَنَا نَافِعُ بْنُ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: كَتَبَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﵄ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى بِالْيَمِينِ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ[1].

**٢٦٦٨- ئیبنو ئەبو مولەیکە وتی: ئیبنو عەبباس ﵄ نامەیەکی نووسی[2] کە پێغەمبەر ﷺ بڕیاری دا، کە سوێند خواردن لەسەر داوالێکراوە.**

## بابٌ

٢٦٦٩- ٢٦٧٠- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ: "مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ يَسْتَحِقُّ بِهَا مَالًا لَقِيَ اللهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ، ثُمَّ أَنْزَلَ اللهُ تَصْدِيقَ ذَلِكَ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾ إِلَى ﴿ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٧﴾ ﴾ آل عمران. ثُمَّ إِنَّ الأَشْعَثَ بْنَ قَيْسٍ خَرَجَ إِلَيْنَا فَقَالَ: مَا يُحَدِّثُكُمْ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَحَدَّثْنَاهُ بِمَا قَالَ، فَقَالَ صَدَقَ، لَفِيَّ أُنْزِلَتْ، كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ خُصُومَةٌ فِي شَيْءٍ، فَاخْتَصَمْنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: "شَاهِدَاكَ أَوْ يَمِينُهُ". فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّهُ إِذًا يَحْلِفُ وَلَا يُبَالِي. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ يَسْتَحِقُّ بِهَا مَالًا وَهْوَ فِيهَا فَاجِرٌ لَقِيَ اللهَ ﷻ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ". فَأَنْزَلَ اللهُ تَصْدِيقَ ذَلِكَ، ثُمَّ اقْتَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ[3].

## باسێک

**٢٦٦٩- ٢٦٧٠- عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەرکەس سوێند بخوات (بەدرۆ) بۆ ئەوەی ماڵ و سامانێکی**

---

(١) بڕوانە: ٢٥١٤.

(٢) لە وەڵامی نامەیەکدا کە ئیبن ئەبو مولەیکە بۆی نوسیبوو پرسیاری لێ کردبوو.(بڕوانە: إرشاد الساري: ١٢٧/٦).

(٣) بڕوانە: ٢٣٥٦، ٢٣٥٧.

پێ بچڕێت (بۆ خۆی)، کە دەگات بەخوا (لە ڕۆژی دواییدا) خوا زۆر لێی توڕەیە))، پاشان خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند وەك پشتڕاستکردنەوەی ئەوە: (بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا و سوێندەکانی خۆیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشن) تا دەگاتە (سزای سەخت)، پاشان ئەشعەسی کوڕی قەیس هات بۆ لامان و وتی: ئەبو عەبدوڕەحمان چیتان بۆ باس دەکات؟ ئێمەش ئەوەی ئەو (ئەبو عەبدوڕەحمان) وتی بۆمان گێڕایەوە، ئەشعەسیش وتی: ڕاست دەکات، ئەم ئایەتە لەسەر من دابەزی، لە نێوان من و پیاوێکدا ناکۆکی هەبوو لەسەر شتێك، جا هەردوکمان کێشەکەمان برد بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دوو شایەت بێنە یان سوێند خواردنی ئەو))، منیش عەرزم کرد: بێگومان ئەو سوێند دەخوات و لای گرنگ نییە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس سوێند بخوات بۆ ئەوەی ماڵ و سامانێکی پێ بچڕێت (بۆ خۆی)، لە سوێند خوارد نەکەشیدا درۆ بکات، کە دەگات بە خوای باڵادەست و گەورە (لە ڕۆژی دواییدا) خوا زۆر لێی توڕەیە))، ئیتر خوداش ئەم ئایەتەی دابەزاند بۆ پشتگیری و ڕاستی فەرموودەکە، پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە.

## ٢١- بابٌ: إِذَا ادَّعَى أَوْ قَذَفَ فَلَهُ أَنْ يَلْتَمِسَ البَيِّنَةَ، وَيَنْطَلِقَ لِطَلَبِ البَيِّنَةِ

٢٦٧١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ هِشَامٍ، حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭭ، أَنَّ هِلاَلَ بْنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ امْرَأَتَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ بِشَرِيكِ بْنِ سَحْمَاءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "البَيِّنَةُ أَوْ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ". فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِذَا رَأَى أَحَدُنَا عَلَى امْرَأَتِهِ رَجُلًا يَنْطَلِقُ يَلْتَمِسُ البَيِّنَةَ؟ فَجَعَلَ يَقُولُ: "البَيِّنَةَ وَإِلَّا حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ". فَذَكَرَ حَدِيثَ اللِّعَانِ[1].

---

(١) بڕوانە: ٤٧٤٧، ٥٣٠٧.

## ٢١- باسێک: ئەگەر کەسێک وتی: شتێکی لای کەسێکی ترە یان تاوانی زینای دایەپاڵ کەسێک ئەوە بۆی هەیە بەشوێن شاهیددا بگەڕێت، وە بڕوات بۆ پەیداکردن و هێنانی شاهید

٢٦٧١- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە هیلالی کوڕی ئومەییە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ خێزانەکەی خۆی تاوانبارکرد بەزیناکردن لەگەڵ شەریکی کوڕی سەحما، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((شاهید بێنە یان شەلاق لە پشتت دەدرێت))، جا هیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر کەسێك لە ئێمە پیاوێك ببینێ بەسەر ژنەکەیەوە لەو کاتەدا بڕوا بەدوای شاهیددا بگەڕێت؟ پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: ((شاهید بێنە ئەگەر نا شەلاق لە پشتت دەدرێت))، ئینجا ئیبنو عەبباس ﷺ باسی فەرموودەی لیعانی کرد.

## ٢٢- بابُ اليَمِينِ بَعْدَ العَصْرِ

٢٦٧٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ الحَمِيدِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللهُ، وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ رَجُلٌ عَلَى فَضْلِ مَاءٍ بِطَرِيقٍ يَمْنَعُ مِنْهُ ابْنَ السَّبِيلِ، وَرَجُلٌ بَايَعَ رَجُلًا لَا يُبَايِعُهُ إِلَّا لِلدُّنْيَا، فَإِنْ أَعْطَاهُ مَا يُرِيدُ وَفَى لَهُ، وَإِلاَّ لَمْ يَفِ لَهُ، وَرَجُلٌ سَاوَمَ رَجُلًا بِسِلْعَةٍ بَعْدَ العَصْرِ، فَحَلَفَ بِاللهِ لَقَدْ أُعْطِيَ بِهِ كَذَا وَكَذَا، فَأَخَذَهَا"(١).

## ٢٢- باسی سوێندخواردن پاش عەسر

٢٦٧٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((سێ جۆر کەس خوا لە ڕۆژی دواییدا قسەیان لەگەڵدا ناکات، سەیریان ناکات، پاکیان ناکاتەوە، سزای سەختیان بۆ هەیە: پیاوێك لەسەر ڕێگایەکدابێت ئاوی لە

(١) بڕوانە: ٢٣٥٨.

پێویستی خۆی زیاتر هەبێ نەیدات بەڕێبوار، پیاوێکیش بەیعەت بدات بەپیاوێك تەنها لەبەر قازانجی دونیایی بەیعەتی پێ بدات، جا ئەگەر لەوەی دەیەوێت پێی بدات بەیعەتەکەی لەگەڵدا دەباتە سەر، وە ئەگەر نا بەیعەتەکەی لەگەڵدا ناباتە سەر، پیاوێکیش پاش عەسر مامەڵەی کاڵاکەی لەگەڵ کەسێکدا بکات و سوێند بخوات بە خوا کە بێگومان ئەوەندەو ئەوەندەی پێدراوە، (ئینجا کەسێك باوەڕ بەو سوێندەی بکات) و کاڵاکەی لێ بکڕێت.

## ٢٣ - بابٌ: يَحْلِفُ المُدَّعَى عَلَيْهِ حَيْثُمَا وَجَبَتْ عَلَيْهِ اليَمِينُ، وَلَا يُصْرَفُ مِنْ مَوْضِعٍ إِلَى غَيْرِهِ

قَضَى مَرْوَانُ بِاليَمِينِ عَلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ عَلَى المِنْبَرِ، فَقَالَ:أَحْلِفُ لَهُ مَكَانِي. فَجَعَلَ زَيْدٌ يَحْلِفُ، وَأَبَى أَنْ يَحْلِفَ عَلَى المِنْبَرِ، فَجَعَلَ مَرْوَانُ يَعْجَبُ مِنْهُ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "شَاهِدَاكَ أَوْ يَمِينُهُ".وَلَم يَخُصَّ مَكَانًا دُونَ مَكَانٍ[١].

٢٦٧٣- حَدَّثَنَا مُوسَى بْن إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عبد الوَاحِدِ عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنِ ابن مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مَنْ حَلَفَ على يَمِينٍ لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالًا لقِيَ اللهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ"[٢].

## ٢٣- باسێک: داوالێکراو لەو جێگایەدا سوێند دەخوات کە سوێند خواردن پێویست بووە لەسەری، وە نابێ لەو جێگایە بڕوات بۆ جێگا و شوێنێکی تر

مەڕوانی کوڕی حەکەم لەسەر دوانگە[٣] بڕیاری دا لەسەر زەیدی کوڕی سابیت بەسوێندخواردن، زەیدیش وتی: من لەشوێنی خۆمدا سوێندی بۆ دەخۆم، جا

(١) بڕوانە: ٢٣٥٦، ٢٣٥٧.

(٢) بڕوانە: ٢٣٥٦، ٢٣٥٧.

(٣) دوانگەی مزگەوتی مەدینە، چونکە مەڕوان والی مەدینە بوو.

زەید دەستی کرد بە سوێند خواردن و ڕازی نەبوو لەسەر دوانگەکە سوێند بخوات، مەڕوانیش سەرسام بوو بەزەید. وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دوو شایەتەکەت بێنە یان شەلاق لە پشتت دەدرێت))، شوێن و جێگایەکی دیاریکراوی دیاری نەکرد، وە تایبەتی نەکرد بەشوێنێکەوە.

٢٦٧٣- ئیبنو مەسعود ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەسێك سوێندێك بخوات بۆ ئەوەی ماڵێکی پێ داببڕێت بۆ خۆی، کە دەگات بەپەروەردگاری (لەقیامەتدا) زۆر لێی توڕەیە)).

## ٢٤ - بَابٌ: إِذَا تَسَارَعَ قَوْمٌ فِي اليَمِينِ

٢٦٧٤- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ عَرَضَ عَلَى قَوْمٍ اليَمِينَ فَأَسْرَعُوا، فَأَمَرَ أَنْ يُسْهَمَ بَيْنَهُمْ فِي اليَمِينِ أَيُّهُمْ يَحْلِفُ.

## ٢٤- باسێک: ئەگەر چەند کەسێک هەر یەکەیان دەیویست پێشتر سوێند بخوات

٢٦٧٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ سوێندخواردنی پێشنیارکرد بۆ چەند کەسێك (کێشە هەبوو لە نێوانیاندا)، هەریەکەیان پەلەی بوو ئەو پێشتر سوێند بخوات، بۆیە فەرمانی کرد کە تیروپشك بکەن لە نێوانیاندا دەربارەی سوێند خواردنەکە، تا کامیان پێشتر سوێند بخوات.

## ٢٥- باب قَوْلِ اللهِ تَعَالَى:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾ آل عمران.

٢٦٧٥- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، أَخْبَرَنَا العَوَّامُ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ أَبُو إِسْمَاعِيلَ السَّكْسَكِيُّ، سَمِعَ عَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ يَقُولُ: أَقَامَ رَجُلٌ سِلْعَتَهُ فَحَلَفَ بِاللهِ لَقَدْ أُعْطِيَ بِهَا مَا لَمْ يُعْطَهَا، فَنَزَلَتْ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾ آل عمران. وَقَالَ ابْنُ أَبِي أَوْفَى: النَّاجِشُ آكِلُ رِبًا خَائِنٌ[1].

## ٢٥- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا و سوێندەکانی خۆیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن)

**٢٦٧٥- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەڵێ: پیاوێك کاڵایەکی دانابوو بۆ فرۆشتن، وە سوێندی خوارد بە خوا وتی: بێگومان ئەوەندەی پێدراوە کە پێی نەدرابوو، بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾ آل عمران[2]، **وە ئیبنو ئەبی ئەوفا ﷺ وتی:** (النَّاجِشُ[3]) **واتە: (وەك)سوو خۆر خیانەتکارە.**

٢٦٧٦- ٢٦٧٧- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ كَاذِبًا لِيَقْتَطِعَ

---

(١) بڕوانە: ٢٠٨٨.

(٢) واتە: بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا و سوێندەکانی خۆیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن.

(٣) النَّاجِشُ: ئەو کەسەیە بانگەشە دەکات بۆ ڕەواج دان بە کاڵایەک، خۆشی نایکڕێ.

مَالَ رَجُلٍ -أَوْ قَالَ: أَخِيهِ- لَقِيَ اللهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ". وَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ تَصْدِيقَ ذَلِكَ فِي القُرْآنِ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾ آل عمران. الآيَةَ. فَلَقِيَنِي الأَشْعَثُ فَقَالَ: مَا حَدَّثَكُمْ عَبْدُ اللهِ اليَوْمَ؟ قُلْتُ: كَذَا وَكَذَا. قَالَ: فِيَّ أُنْزِلَتْ[1].

**٢٦٧٦- ٢٦٧٧- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس سوێند بخوات بەدرۆ بۆ ئەوەی ماڵ و سامانی کەسێکی- یان فەرمووی براکەی- پێ ببچڕێت (بۆ خۆی)، کە دەگات بە خوا (لە ڕۆژی دواییدا) خوا زۆر لێی توڕەیە))، ئیتر خودای بەرز و بڵندیش ئەم ئایەتەی لە قورئاندا دابەزاند بۆ پشتگیری و ڕاستی فەرموودەکە: (بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا و سوێندەکانی خۆیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن)، تا کۆتایی ئایەتەکە. ئینجا ئەشعەس بەمن گەیشت و وتی: عەبدوڵلا ئەمڕۆ چی بۆ گێڕانەوە؟ منیش وتم: ئەوە و ئەوەی بۆ گێڕاینەوە، ئەشعەس وتی: ئەو ئایەتە دەربارەی من دابەزێنرا.**

## ٢٦ - بابٌ: كَيْفَ يُسْتَحْلَفُ؟

وَقَوْلُ اللهِ: ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ ﴿٦٢﴾ ﴾ التوبة، وقَول الله ﷻ: ﴿ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ إِحْسَـٰنًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾ ﴾ النساء، ﴿ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَـٰدَتُنَآ ﴿١٠٧﴾ ﴾ المائدة. يُقَالُ: بِاللهِ، وَتَاللهِ، وَوَاللهِ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "وَرَجُلٌ حَلَفَ بِاللهِ كَاذِبًا بَعْدَ العَصْرِ"[2]. ولايُحلَفُ بغيرِ الله.

---

(١) بڕوانە: ٢٣٥٦، ٢٣٥٧.

(٢) بڕوانە: ٢٣٥٨.

## ٢٦- باسێک: چۆن کەسێک سوێند دەدرێت[١]؟

**ئەم فەرمايشتەی خوا: (ناپاكان سوێندتان بۆ دەخۆن بەخوا)، وە ئەم فەرمايشتەی خوای بالأدەست و گەورە: (پاشان دێنەوە بۆ لات و سوێند دەخۆن بەخوا تەنها نیازی چاكە و يەك خستنەوەمان بووە)، ((ئینجا) هەردووكيان سوێند بخۆن بەخوا كە بەڕاستی شایەتییەكەی ئێمە)، (سوێند خواردن بەمانە دەبێت:) دەوترێت: (بِاللهِ، وَتَاللهِ، وَاللهِ)[٢]، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وە پیاوێك سوێند بەدرۆ بەخوا بخوات پاش بانگی عەسر))[٣]، وە نابێ جگە لەخوا سوێند بەهیچ شتێکی تر بخورێت.**

٢٦٧٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَمِّهِ أَبِي سُهَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ سَمِعَ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللهِ يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُهُ عَنِ الإِسْلَامِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي اليَوْمِ وَاللَّيْلَةِ". فَقَالَ هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: "لَا، إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ". فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "وَصِيَامُ رَمَضَانَ". قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قَالَ: "لَا، إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ". قَالَ: وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ الزَّكَاةَ. قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: "لَا، إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ". فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهْوَ يَقُولُ: وَاللهِ لَا أَزِيدُ عَلَى هَذَا وَلَا أَنْقُصُ. قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ"[٤].

**٢٦٧٨- ئەبو سوهەیل لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە، كە لە تەلحەی كوڕی عوبەیدوڵلای بیست دەیوت: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری ئیسلامی لە پێغەمبەر ﷺ دەكرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((پێنج نوێژە لە شەو و ڕۆژێكدا))، پیاوەكە وتی: جگە لەمانە نوێژی ترم لەسەرە؟ فەرمووی: ((نەخێر، مەگەر سوننەت و زیادە**

---

(١) لەلایەن قازی و دادوەرەوە.

(٢) هەریەک لە پیتەکانی (ب) و (ت) و (و) بۆ سوێند بەکاردێن، بە تایبەتی لەگەڵ وشەی (الله)ـدا.

(٣) یەکێکە لەو سێ کەسەی کە خوا لەقیامەتدا قسەیان لەگەڵ ناکات و سەیریان ناکات و پاکیان ناکاتەوە.

(٤) بڕوانە: ٤٦.

بکەیت))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان)) وتی: جگە لەمە هیچی تر (ڕۆژوو)ـم لەسەرە؟ فەرمووی: ((نەخێر، مەگەر سوننەت و زیادە بکەیت))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ باسی زەکاتی بۆ کرد. وتی: ئایا جگە لەمە هیچی تر (زەکات)م لەسەرە؟ فەرمووی: ((نەخێر، مەگەر سوننەت و زیادە بکەیت))، جا پیاوەکە پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت و دەیوت: وەڵڵاهی لەمە زیاد و کەمی لێ ناکەم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((سەرفراز و ڕزگار بوو ئەگەر ڕاست بکات)).

٢٦٧٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ قَالَ: ذَكَرَ نَافِعٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: "مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللهِ أَوْ لِيَصْمُتْ"[١].

٢٦٧٩- عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس سوێندی خوارد، با سوێند بەخوا بخوات یان بێدەنگ بێت)).

## ٢٧- بابُ مَنْ أقامَ البَيِّنَةَ بَعْدَ اليَمِينِ

وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "لَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَلْحَنُ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ"[٢]، وَقَالَ طَاوُسٌ وَإِبْرَاهِيمُ وَشُرَيْحٌ: البَيِّنَةُ العَادِلَةُ أَحَقُّ مِنَ اليَمِينِ الفَاجِرَةِ.

## ٢٧- باسی کەسێک شاهیدی هێنا (دوای ئەوەی داوالێکراو) سوێندی خوارد

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لەوانەیە هەندێکتان شارەزاتر بێت بەبەڵگەهێنانەوە لەهەندێکی تر)). وە تاووس و ئیبراهیم و شورەیح دەڵێن: شاهیدی ڕاست و دروست ڕاستترو لەپێشترە لەسوێند خواردنی بەدرۆ.

---

(١) بروانە: ٣٨٣٦، ٦١٠٨، ٦٦٤٦، ٦٦٤٧، ٦٦٤٨.

(٢) بروانە: ٢٤٥٨.

٢٦٨٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ زَيْنَبَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "إِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَلْحَنُ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا بِقَوْلِهِ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ، فَلاَ يَأْخُذْهَا"[1].

**٢٦٨٠- ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی ئێوە ناکۆکییەکانی نێوانتان دێننە لای من، وە لەوانەیە هەندێکتان چاکتر و لێزانتر بەڵگەکەی باس بکات لە هەندێکی تر، جا هەر کەس من بڕیاری هەرشتێکی براکەیم بۆ دا[2] بەهۆی قسەزانیەوە، ئەوە بێگومان پارچەیەك لەئاگری دۆزەخی بۆ دەبچڕم، کەواتە با وەری نەگرێت و نەیبات)).**

## ٢٨- بابُ مَنْ أَمَرَ بِإِنْجَازِ الوَعْدِ

وَفَعَلَهُ الحَسَنُ، وَذَكَرَ إِسْمَاعِيلَ: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلْوَعْدِ ﴿٥٤﴾﴾ مريم. وَقَضَى ابْنُ الأَشْوَعِ يعني: سعيد بن عمرو بن الأشوع- بالوَعد، وَذَكَرَ ذَلِكَ عَنْ سَمُرَةَ. وَقَالَ المِسْوَرُ بْنُ مَخْرَمَةَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ، وَذَكَرَ صِهْرًا لَهُ فقَالَ: "وَعَدَنِي فَوَفَى لِي"[3]. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: وَرَأَيْتُ إِسْحَاقَ بْنَ إِبْرَاهِيمَ يَحْتَجُّ بِحَدِيثِ ابْنِ أَشْوَعَ.

## ٢٨- باسی: ئەوەی فەرمانی کردووە بەبەجێهێنانی بەڵێن

**حەسەن فەرمانی بە (بەجێهێنانی) بەڵێن کردووە. (خوا) لە قورئاندا باسی ئیسماعیلی کردووە: (بێگومان ئەو لەپەیمان و بەڵێنەکانیدا ڕاستگۆ بوو). وە**

(١) بروانە: ٢٤٥٨.

(٢) کە لەڕاستیدا مافی ئەو نەبوو کە بڕیارم بۆ داوە، بەڵکو شارەزایی و لێزانییەکەی وایکرد بڕیاری بۆ بدرێت.

(٣) بروانە: ٣١١٠.

**ئیبنو ئەشوەع -مەبەستی: سەعیدی کوڕی عەمری کوڕی ئەشوەعە-[١] بڕیاری جێ بەجێکردنی بەڵێنی داوە، وە ئەوەشی لەسەموورەوە گێڕاوەتەوە. وە میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست باسی زاوایەکی[٢] خۆی کردو دەفەرمویّ: ((بەڵێنی پێدام و بەڵێنەکەی بردە سەر و بەجێی هێنا)). ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمم دی، کاری بەفەرموودەکەی ئیبنو ئەشوەع دەکرد.**

٢٦٨١- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ أَخْبَرَهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سُفْيَانَ، أَنَّ هِرَقْلَ قَالَ: سَأَلْتُكَ: مَاذَا يَأْمُرُكُمْ؟ فَزَعَمْتَ أَنَّهُ أَمَرَكُمْ بِالصَّلاَةِ، وَالصِّدْقِ، وَالعَفَافِ، وَالوَفَاءِ بِالعَهْدِ، وَأَدَاءِ الأَمَانَةِ. قَالَ: وَهَذِهِ صِفَةُ نَبِيٍّ[٣].

**٢٦٨١- عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ بۆی گێڕایەوەو وتی: ئەبو سوفیان بۆی گێڕامەوە کە هیرەقل وتی: پرسیارم لێ کردی فەرمانی چیتان پێدەکات؟ تۆش وتت: کە فەرمانتان پێدەکات بەنوێژکردن، ڕاستگۆیی، داوێن پاکی، بەجێ هێنانی بەڵێن، دانەوەی ئەمانەت، هیرەقل وتی: ئەمانە سیفەتی پێغەمبەرن.**

---

(١) ئیبنو ئەشوەع: ناوی سەعیدی کوڕی عەمری کوڕی ئەشوەعە، قازی کوفە بووە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خالیدی قەسری لەعێراقدا.

(٢) ناوی ئەبو عاصی کوڕی ڕەبیعە کە زاوای پێغەمبەر ﷺ بووە، مێردی زەینەب بووە، کە بت پەرست بوو بەدیل گیرا، پێغەمبەر ﷺ بەمەرجێک ئازادی کرد کە زەینەبی کچی بنێرێت بۆ مەدینە، ئەویش بەڵێنەکەی بەجێ هێناو ناردی بۆ مەدینە.

(٣) بڕوانە: ٧.

٢٦٨٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِي سُهَيْلٍ نَافِعِ بْنِ مَالِكِ بْنِ أَبِي عَامِرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "آيَةُ المُنَافِقِ ثَلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ"[١].

**٢٦٨٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((نیشانەی دووڕوو سیانن: کاتێك قسەی کرد درۆ دەکات، ئەگەر ئەمانەتی پێ بسپێردرێت خیانەتی لێ دەکات، کە بەڵێنی دا بەجێی ناهێنێ))[٢].**

٢٦٨٣- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا مَاتَ النَّبِيُّ ﷺ جَاءَ أَبَا بَكْرٍ مَالٌ مِنْ قِبَلِ العَلاَءِ بْنِ الحَضْرَمِيِّ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَنْ كَانَ لَهُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ دَيْنٌ، أَوْ كَانَتْ لَهُ قِبَلَهُ عِدَةٌ، فَلْيَأْتِنَا. قَالَ جَابِرٌ: فَقُلْتُ: وَعَدَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُعْطِيَنِي هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا، فَبَسَطَ يَدَيْهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، قَالَ جَابِرٌ: فَعَدَّ فِي يَدِي خَمْسَمِائَةٍ، ثُمَّ خَمْسَمِائَةٍ، ثُمَّ خَمْسَمِائَةٍ[٣].

**٢٦٨٣- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، سامان و ماڵی (بەحرەین) لەلایەن عەلائی کوڕی حەزرەمییەوە هات بۆ ئەبو بەکر ﷺ، ئینجا ئەبو بەکر ﷺ وتی: هەرکەسێك قەرزێك یان بەڵێنێکی هەیە لەلای پێغەمبەر ﷺ با بێت بۆ لامان، جابیر ﷺ دەڵێ: منیش وتم: پێغەمبەر ﷺ بەڵێنی پێدام ئەوەندە و ئەوەندە و ئەوەندەم پێبدات، جابیر سێ جار هەردوو دەستی کردەوە (واتە: سێ مشت)، جابیر دەڵێ: ئەوسا عومەر ﷺ پێنج سەدی**

---

(١) بڕوانە: ٣٣.

(٢) سەیری فەرموودەی: ٣٣ بکە.

(٣) بڕوانە: ٢٢٩٦.

**ژمارد و کردیه ناو هەردوو دەستم، پاشان پێنج سەدی تر، پاشان پێنج سەدی تر. (واتە: سێ جار پێنج سەدی کردە مشتیەوە).**

٢٦٨٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، أَخْبَرَنَا سَعِيدُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ شُجَاعٍ، عَنْ سَالِمٍ الأَفْطَسِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سَأَلَنِي يَهُودِيٌّ مِنْ أَهْلِ الحِيرَةِ: أَيَّ الأَجَلَيْنِ قَضَى مُوسَى؟ قُلْتُ: لَا أَدْرِي حَتَّى أَقْدَمَ عَلَى حَبْرِ العَرَبِ فَأَسْأَلَهُ، فَقَدِمْتُ فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَقَالَ: قَضَى أَكْثَرَهُمَا وَأَطْيَبَهُمَا، إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ إِذَا قَالَ فَعَلَ.

**٢٦٨٤- سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: جوولەکەیەکی خەڵکی حیرە[1] پرسیاری لێ کردم: مووسا ﷺ کام لە دوو ماوەکەی تەواو کرد و بەجێ هێنا؟ وتم: نازانم، هەتا نەچمە لای شارەزای عەرەب و پرسیاری لێ نەکەم، جا هاتم و پرسیارم لە ئیبنو عەبباس ﵄ کرد، ئەویش وتی: زۆرەکەیان و چاکەکەیانی بەجێ هێناو تەواوکرد، بێگومان مووسا ﷺ ( یان هەر پێغەمبەرێك بێت) ئەگەر قسەیەکی کرد بەجێی دێنێت.**

## ٢٩ - بابٌ: لَا يُسْأَلُ أَهْلُ الشِّرْكِ عَنِ الشَّهَادَةِ وَغَيْرِهَا

وَقَالَ الشَّعْبِيُّ: لَا تَجُوزُ شَهَادَةُ أَهْلِ المِلَلِ بَعْضِهِمْ عَلَى بَعْضٍ، لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ ﴿١٤﴾ ﴾ المائدة. وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: "لَا تُصَدِّقُوا أَهْلَ الكِتَابِ، وَلَا تُكَذِّبُوهُمْ، وَقُولُوا: ﴿ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ ﴿١٣٦﴾ ﴾ البقرة، الآية".

---

(١) سێ میل لە کوفەوە دوورە، شوێنی پاشاکانی عەرەب بووە.

## ٢٩- باسێک: لە خەڵکی هاوبەشدانەر پرسیاری شاهێدی دان و شتی تر ناکرێت

**شەعبی دەڵێ: شاهیدی دانی خاوەن ئایینەکان لەبەرانبەری یەکتریدا دروست نییە، بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (جا دوژمنایەتی و کینەبەریمان خستە نێوانیان). ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((باوەڕ بەخاوەن کتێبەکان مەکەن، بەدرۆزنیشیان مەزانن، وە بڵێن: (باوەڕمان هەیە بەخوا و ئەوەی بۆمان دابەزێنراوە). (تا کۆتایی) ئایەتەکە)).**

٢٦٨٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ، كَيْفَ تَسْأَلُونَ أَهْلَ الكِتَابِ، وَكِتَابُكُمُ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ أَحْدَثُ الأَخْبَارِ بِاللهِ، تَقْرَءُونَهُ لَمْ يُشَبْ؟! وَقَدْ حَدَّثَكُمُ اللهُ أَنَّ أَهْلَ الكِتَابِ بَدَّلُوا مَا كَتَبَ اللهُ وَغَيَّرُوا بِأَيْدِيهِمُ الكِتَابَ، فَقَالُوا: ﴿ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴿٧٩﴾ ﴾ البقرة. أَفَلاَ يَنْهَاكُمْ مَا جَاءَكُمْ مِنَ العِلْمِ عَنْ مُسَايَلَتِهِمْ، وَلَا وَاللهِ مَا رَأَيْنَا مِنْهُمْ رَجُلًا قَطُّ يَسْأَلُكُمْ عَنِ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَيْكُمْ[1].

**٢٦٨٥- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەی پێڕی مسوڵمانان! چۆن ئێوە پرسیار لە خاوەن کتێبەکان دەکەن، لەکاتێکدا ئەو کتێبەتان کە دابەزێنراوە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ تازەترین فەرمایشتی خوایە، ئێوە دەیخوێننەوە کە هیچی تێکەڵ نەکراوە؟! وە بێگومان خوای گەورە بۆتانی باس کردووە کە خاوەن**

## ٢٩- باسێک: لە خەڵکی هاوبەشدانەر پرسیاری شاهێدی دان و شتی تر ناکرێت

**شەعبی دەڵێ: شاهیدی دانی خاوەن ئایینەکان لەبەرانبەری یەکتریدا دروست نییە، بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (جا دوژمنایەتی و کینەبەریمان خستە نێوانیان). ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((باوەڕ بەخاوەن کتێبەکان مەکەن، بەدرۆزنیشیان مەزانن، وە بڵێن: (باوەڕمان هەیە بەخوا و ئەوەی بۆمان دابەزێنراوە). (تا کۆتایی) ئایەتەکە)).**

٢٦٨٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ، كَيْفَ تَسْأَلُونَ أَهْلَ الكِتَابِ، وَكِتَابُكُمُ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ أَحْدَثُ الأَخْبَارِ بِاللهِ، تَقْرَءُونَهُ لَمْ يُشَبْ؟! وَقَدْ حَدَّثَكُمُ اللهُ أَنَّ أَهْلَ الكِتَابِ بَدَّلُوا مَا كَتَبَ اللهُ وَغَيَّرُوا بِأَيْدِيهِمُ الكِتَابَ، فَقَالُوا: ﴿هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۝٧٩﴾ البقرة. أَفَلَا يَنْهَاكُمْ مَا جَاءَكُمْ مِنَ العِلْمِ عَنْ مُسَايَلَتِهِمْ، وَلَا وَاللهِ مَا رَأَيْنَا مِنْهُمْ رَجُلًا قَطُّ يَسْأَلُكُمْ عَنِ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَيْكُمْ[١].

**٢٦٨٥- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەی پێڕی مسوڵمانان! چۆن ئێوە پرسیار لە خاوەن کتێبەکان دەکەن، لەکاتێکدا ئەو کتێبەتان کە دابەزێنراوە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ تازەترین فەرمایشتی خوایە، ئێوە دەیخوێننەوە کە هیچی تێکەڵ نەکراوە؟! وە بێگومان خوای گەورە بۆتانی باس کردووە کە خاوەن**

---

(١) بڕوانە: ٧٣٦٣، ٧٥٢٢، ٧٥٢٣.

کتێبەکان ئەوەی خوا نووسیویەتی گۆڕیویانە و بەدەستی خۆیان کتێبەکەیان دەستکاری کردووە، گۆڕیویانە و وتوویانە: (ئەمە لەلایەن خواوە هاتووە بۆ ئەوە بەنرخێکی کەم بیفرۆشن و بیگۆڕنەوە)، دەی ئایا ئەو زانست و زانیارییەی کە بۆتان هاتووە ڕێگریتان ناکات لە پرسیارکردنتان لێیان، نا وەڵڵاهی یەك پیاومان لێ نەدیون هەرگیز پرسیار لەئێوە بکات دەربارەی ئەو کتێبەی بۆ ئێوە دابەزێنراوە.

## ٣٠- بابُ القُرْعَةِ فِي المُشْكِلَاتِ

وَقَوْلِهِ: ﴿ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ ﴿٤٤﴾ ﴾ آل عمران. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: اقْتَرَعُوا فَجَرَتِ الأَقْلَامُ مَعَ الجِرْيَةِ، وَعَالَ قَلَمُ زَكَرِيَّاءَ الجِرْيَةَ، فَكَفَلَهَا زَكَرِيَّاءُ. وَقَوْلِهِ: ﴿ فَسَاهَمَ ﴿١٤١﴾ ﴾ الصافات. أَقْرَعَ. ﴿ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ ﴾ الصافات، مِنَ المَسْهُومِينَ[1].

وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: عَرَضَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى قَوْمٍ
اليَمِينَ، فَأَسْرَعُوا، فَأَمَرَ أَنْ يُسْهِمَ بَيْنَهُمْ أَيُّهُمْ يَحْلِفُ.

## ٣٠- باسی (ڕەوایەتی) تیروپشککردن لە شتە کێشە لەسەرەکاندا

باسی ئەم فەرمایشتەی خوا: (کاتێك کە قەڵەمەکانیان هاوێشت کامیان دەستەبەرێتی مەریەمیان بەردەکەوێت). ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: تیروپشکیان کرد، جا قەڵەمەکانیان لەگەڵ ڕۆیشتنی ئاوەکەدا ڕۆیشت، بەڵام قەڵەمەکەی زەکەریا بەرز بوویەوە بەسەر ئاوەکەوە، ئیتر بۆیە زەکەریا دەسبەرێتی مەریەمی کرد. (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئەم فەرمایشتەی خوا ﴿ فَسَاهَمَ ﴿١٤١﴾ ﴾

(١) بڕوانە: ٢٦٧٤.

الصافات، تیروپشکی کرد[1] ﴿ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ ﴾ الصافات، ئەو لە دۆڕاوان بوو. ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سوێندخواردنی بۆ کەسانێك (کە کێشە هەبوو لە نێوانیاندا) پێشنیار کرد، ئەوانیش هەموویان پەلەیان کرد (بۆ سوێندخواردنەکە)، جا بۆیە فەرمانی کرد کە تیروپشك بکرێت لە نێوانیاندا، کە کامیان پێشتر سوێند بخۆن.

٢٦٨٦- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي الشَّعْبِيُّ أَنَّهُ سَمِعَ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مَثَلُ المُدْهِنِ فِي حُدُودِ اللهِ وَالوَاقِعِ فِيهَا مَثَلُ قَوْمٍ اسْتَهَمُوا سَفِينَةً، فَصَارَ بَعْضُهُمْ فِي أَسْفَلِهَا وَصَارَ بَعْضُهُمْ فِي أَعْلاَهَا، فَكَانَ الَّذِين فِي أَسْفَلِهَا يَمُرُّونَ بِالمَاءِ عَلَى الَّذِينَ فِي أَعْلاَهَا، فَتَأَذَّوْا بِهِ، فَأَخَذَ فَأْسًا، فَجَعَلَ يَنْقُرُ أَسْفَلَ السَّفِينَةِ، فَأَتَوْهُ فَقَالُوا: مَا لَكَ؟ قَالَ: تَأَذَّيْتُمْ بِي، وَلَا بُدَّ لِي مِنَ المَاءِ، فَإِنْ أَخَذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَنْجَوْهُ وَنَجَّوْا أَنْفُسَهُمْ، وَإِنْ تَرَكُوهُ أَهْلَكُوهُ وَأَهْلَكُوا أَنْفُسَهُمْ"[2].

٢٦٨٦- نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نموونەی ئەو کەسەی وەستاوە لەسەر سنوورەکانی خوا و ئەوکەسەی کەوتۆتە ناویەوە، وەك نموونەی کەسانێك وان کە لەسەر کەشتییەك تیروپشك بکەن، ئینجا هەندێکیان بکەونە بەشی خوارەوەی کەشتییەکە، هەندێکیشیان بکەونە بەشی سەرەوەی کەشتییەکە، جا ئەوانەی لە بەشی خوارەوەن بۆ ئاو خواردنەوە بەسەر ئەوانەدا دەڕۆن لەسەریەوەن، بەو کارە ناڕەحەت دەبن، بۆیە (کەسێکیان) تەورێك هەڵدەگرێت و دەست دەکات بەکونکردنی بەشی خوارەوەی کەشتییەکە، بۆیە ئەوانە(ی سەرەوە) دێن بۆ لای و پێی دەڵێن: ئەوە چییە بۆ وا دەکەیت؟ دەڵێ:

(١) قورعەکێشی کرد.

(٢) بڕوانە: ٢٤٩٣.

**ئێوه بەهۆی منەوە (دێم بەسەرتاندا) نارەحەت دەبن، منیش پێویستم بەئاوە، جا ئەگەر دەستی بگرن ئەو کەسەو خۆیشیان ڕزگار دەکەن، بەڵام ئەگەر لێی گەڕێن ئەو کەسەو خۆشیان لەناو دەبەن)).**

٢٦٨٧- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي خَارِجَةُ بْنُ زَيْدٍ الأَنْصَارِيُّ أَنَّ أُمَّ العَلاَءِ -امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِمْ قَدْ بَايَعَتِ النَّبِيَّ ﷺ أَخْبَرَتْهُ- أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ طَارَ لَهُ سَهْمُهُ فِي السُّكْنَى حِينَ أَقْرَعَتِ الأَنْصَارُ سُكْنَى المُهَاجِرِينَ. قَالَتْ أُمُّ العَلاَءِ: فَسَكَنَ عِنْدَنَا عُثْمَانُ بْنُ مَظْعُونٍ، فَاشْتَكَى، فَمَرَّضْنَاهُ، حَتَّى إِذَا تُوُفِّيَ وَجَعَلْنَاهُ فِي ثِيَابِهِ دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقُلْتُ: رَحْمَةُ اللهِ عَلَيْكَ أَبَا السَّائِبِ، فَشَهَادَتِي عَلَيْكَ لَقَدْ أَكْرَمَكَ اللهُ. فَقَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: "وَمَا يُدْرِيكِ أَنَّ اللهَ أَكْرَمَهُ؟ ". فَقُلْتُ: لَا أَدْرِى بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "أَمَّا عُثْمَانُ فَقَدْ جَاءَهُ -والله- اليَقِينُ وَإِنِّي لأَرْجُو لَهُ الخَيْرَ، والله مَا أَدْرِي وَأَنَا رَسُولُ اللهِ مَا يُفْعَلُ بِهِ". قَالَتْ: فَوَاللهِ لَا أُزَكِّي أَحَدًا بَعْدَهُ أَبَدًا، وَأَحْزَنَنِي ذَلِكَ. قَالَتْ: فَنِمْتُ فَأُرِيتُ لِعُثْمَانَ عَيْنًا تَجْرِي، فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: "ذَلِكَ عَمَلُهُ"[1].

**٢٦٨٧- زوهری دەڵێ: خاریجەی کوڕی زەیدی ئەنصاری بۆی گێڕامەوە کە ئوممو عەلا- کە ئافرەتێکە لەو ئافرەتانەیان کە بەیعەتی بەپێغەمبەر ﷺ دابوو هەواڵی پێدا- کە عوسمانی کوڕی مەزعون لە تیروپشکدا بۆ نیشتە جێکردن بەر ئەوان کەوت، کاتێك ئەنصارییەکان قورعەکێشیان کرد بۆ نیشتەجێکردنی کۆچەران، ئوممو عەلا دەڵێ: ئینجا عوسمانی کوڕی مەزعون لای ئێمە نیشتەجێ بوو، تووشی ئازار و نەخۆشییەك بوو، ئێمەش چارەسەرمان کرد، هەتا ئەوکاتەی وەفاتی کرد، وە بەجل و بەرگەکەی خۆیەوە پێچامانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ**

(١) بڕوانە: ١٢٤٣.

هات بۆ ماڵمان، منیش وتم: ڕەحمەتی خوات لێ بێ ئەبو سائیب، من شایەتیت بۆ دەدەم بەڕاستی خوا ڕێزی گرتوویت، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: ((تۆ چوزانیت کە خوا ڕێزی گرتووە؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! بەدایك و باوکەوە بەقوربانت بم نازانم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڵام عوسمان بێگومان و سوێند بەخوا- مردنی بەسەردا هات، وە بەڕاستی من ئومێدی چاکەی بۆ دەکەم (لای خوا)، وە سوێند بەخوا من (کە پێغەمبەری خوام) نازانم چیم لێ دەکرێت))، ئوممو عەلا وتی: جا سوێند بەخوا ئیتر دوای ئەوەی فەرموو کەس بەچاك ناژمێرم و باس ناکەم، ئەم باسە خەفەتباری کردم، دەڵێ: جا خەوتم و لەخەومدا کانیاوێکم نیشاندرا کە (ئاوی لەبەر) دەڕۆیشت هی عوسمان بوو، ئینجا هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و خەوەکەم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی ﷺ : ((ئەوە کردەوەی عوسمانە)).

٢٦٨٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ، وَكَانَ يَقْسِمُ لِكُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ يَوْمَهَا وَلَيْلَتَهَا، غَيْرَ أَنَّ سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا وَلَيْلَتَهَا لِعَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، تَبْتَغِي بِذَلِكَ رِضَا رَسُولِ اللهِ ﷺ[1].

٢٦٨٨- عورەوە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیویستبایە سەفەرێك بکات تیروپشکی دەکرد لە نێوان هاوسەرەکانیدا، جا هەرکامیان ناوی دەربچووایە لەگەڵ خۆی دەیبرد، وە بۆ هەر هاوسەرێك لەوان شەو و ڕۆژی خۆی بۆ دیاری کردبوو، جگە لەسەودەی کچی زەمعە کە شەوو ڕۆژەکەی خۆی بەخشی بوو بەعائیشەی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ، بەم کارەی

(١) بروانە: ٢٥٩٣.

**دەيويست ڕەزامەندی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆی بەدەست بێنێ (كە دەيزانی پێغەمبەر ﷺ عائيشەی زۆر خۆش دەوێ).**

٢٦٨٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ سُمَيٍّ -مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ- عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلَّا أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لَاسْتَهَمُوا، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لَاسْتَبَقُوا إِلَيْهِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي العَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا"[١].

**٢٦٨٩- ئەبو هورەيرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی: ((ئەگەر خەڵكی بيانزانيبايە لەبانگدان و ڕيزی يەكەمی نوێژدا چەند پاداشت هەيە، ئينجا تەنها بەتيروپشك نەبووايە دەستيان نەكەوتبايە، ئەوە تيروپشكيان دەكرد لەسەری، وە ئەگەر بيانزانيبايە چ پاداشتێك لەزوو هاتن بۆ نوێژدا هەيە، پێشبڕكێيان دەكرد بۆی، وە ئەگەر بيانزانيبايە چ پاداشتێك لە نوێژی عيشا و بەيانيدا هەيە، دەهاتن بۆ هەردووكيان ئەگەر بەگاگۆڵكێش بووايە)).**

---

(١) بڕوانە: ٦١٥.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٥٣- كِتَابُ الصُّلْحِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٥٣- پەڕاوی ڕێکەوتن [ئاشتەوایی] (١)

### ١- باب مَا جَاءَ فِي الإِصْلاَحِ بَيْنَ النَّاسِ

وَقَوْله تَعَالَى:﴿ ۞ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾ ﴾ النساء.وَخُرُوجِ الإِمَامِ إِلَى المَوَاضِعِ لِيُصْلِحَ بَيْنَ النَّاسِ بِأَصْحَابِهِ.

### ١- باسی ئەوەی دەربارەی چاککردنی نێوان خەڵکی هاتووە

**ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (هیچ چاکەیەك لەزۆربەی چپە و سرتەکردنەکانیاندا نییە، مەگەر یەکێك فەرمان بکات بە ماڵ بەخشین، یان چاکە، یان چاککردنی نێوان خەڵکی، جا هەرکەس ئەوە بکات بەنیازی ڕەزامەندی خوا، لە داهاتوودا پاداشتی زۆر گەورەی پێ دەبەخشرێت). وە دەرچوون و ڕۆیشتنی پێشەوا لەگەڵ هاوەڵانیدا بۆ جێگاکان، بۆ ئەوەی نێوانی خەڵکی چاك بکات.**

(١) ئاشتەوایی و سوڵحیشی پێ دەووترێت.

**٢٦٩٠-** حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّ أُنَاسًا مِنْ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ كَانَ بَيْنَهُمْ شَيْءٌ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمُ النَّبِيُّ ﷺ فِي أُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ يُصْلِحُ بَيْنَهُمْ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ، وَلَمْ يَأْتِ النَّبِيُّ ﷺ، فَجَاءَ بِلاَلٌ، فَأَذَّنَ بِلاَلٌ بِالصَّلاَةِ، وَلَمْ يَأْتِ النَّبِيُّ ﷺ، فَجَاءَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ فَقَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ حُبِسَ، وَقَدْ حَضَرَتِ الصَّلاَةُ، فَهَلْ لَكَ أَنْ تَؤُمَّ النَّاسَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ إِنْ شِئْتَ. فَأَقَامَ الصَّلاَةَ، فَتَقَدَّمَ أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ يَمْشِي فِي الصُّفُوفِ، حَتَّى قَامَ فِي الصَّفِّ الأَوَّلِ، فَأَخَذَ النَّاسُ بِالتَّصْفِيحِ حَتَّى أَكْثَرُوا، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ لَا يَكَادُ يَلْتَفِتُ فِي الصَّلاَةِ، فَالتَفَتَ، فَإِذَا هُوَ بِالنَّبِيِّ ﷺ وَرَاءَهُ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ بِيَدِهِ، فَأَمَرَهُ أَنْ يصلي كَمَا هُوَ، فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ يَدَهُ، فَحَمِدَ اللهَ، ثُمَّ رَجَعَ القَهْقَرى وَرَاءَهُ حَتَّى دَخَلَ فِي الصَّفِّ، وَتَقَدَّمَ النَّبِيُّ ﷺ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَلَمَّا فَرَغَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: "يَا أَيُّهَا النَّاسُ، مَا لَكُمْ إِذَا نَابَكُمْ شَيْءٌ فِي صَلَاتِكُمْ أَخَذْتمْ بِالتَّصْفِيحِ، إِنَّمَا التَّصْفِيحُ لِلنِّسَاءِ، مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلَاتِكُمْ فَلْيَقُل: سُبْحَانَ اللهِ. فَإِنَّهُ لا يَسْمَعُهُ أحد إِلَّا التَفَتَ، يَا أَبَا بَكْرٍ، مَا مَنَعَكَ حِينَ أَشَرْتُ إِلَيْكَ لَمْ تُصَلِّ بِالنَّاسِ؟ ". فَقَالَ: مَا كَانَ يَنْبَغِي لابنِ أَبِي قحَافَةَ أَنْ يُصَلِّيَ بَيْنَ يَدى النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٢٦٩٠- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە کە خەڵکانێك لە تیرەی عەمری کوڕی عەوف لە نێوانیاندا هەندێك ناکۆکی هەبوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەڵانیدا ڕۆیشت بۆ ناویان، تا نێوانیان چاك بكات، ئینجا کاتی نوێژ هاتە پێش و نوێژ بوو، پێغەمبەر ﷺ نەهات، بۆیە بیلال ﷺ هات، جا بانگی نوێژی دا، پێغەمبەر ﷺ نەهات، بیلال هات بۆ لای ئەبو بەکر و ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ گیردراوە و نوێژیش بووە، دەی پێشنوێژی دەکەیت بۆ خەڵکەکە؟ ئەبو بەکریش وتی: بەڵێ، ئەگەر پێت خۆشە، جا بیلال قامەتی کرد و ئەبو بەکر ڕۆیشتە پێشەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوەو بەناو**

(١) بڕوانە: ٦٨٤.

ڕیزەکاندا دەڕۆیشت، تا لەڕیزی یەکەمدا وەستا، خەڵکەکە (نوێژخوێنەکان) دەستیان کرد بە چەپڵەلێدان، زۆر چەپڵەیان لێدا، وە ئەبو بەکر ﷺ لە نوێژدا لای نەدەکردەوە، ئینجا لای کردەوەو پێغەمبەری ﷺ بینی لەدوایەوەیە، پێغەمبەریش ﷺ بەدەستی ئاماژەی بۆ کرد چۆن وەستاوە نوێژەکەی بکات، ئەبو بەکریش هەردوو دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و سوپاسی خوای کرد، پاشان پشتاو پشت گەڕایەوە بۆ دواوەی خۆی، هەتا ڕۆیشتە ناو ڕیزەکەوە، پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە پێشەوە و پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، جا کاتێك لێ بوویەوە، ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە! ئەوە چیتانە ئەگەر شتێك ڕوویدا لە نوێژەکەتاندا دەستتان کرد بەچەپڵەلێدان؟! بێگومان چەپڵەلێدان بۆ ئافرەتانە، هەرکەس لەناو نوێژەکەیدا شتێك لێی ڕوویدا با بڵێ: سوبحانەڵلا، چونە بێگومان هەرکەس بیبیستێ لا دەکاتەوە، ئەی ئەبو بەکر! چی ڕێگرت بوو کە پێشنوێژی بکەیت بۆ خەڵکەکە کاتێك من ئاماژەم بۆ کردی؟ ئەبو بەکریش وتی: بۆ کوڕی ئەبی قوحافە ڕەوا نییە لەپێش پێغەمبەرەوە نوێژ بکات.

٢٦٩١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي أَنَّ أَنَسًا ﷺ قَالَ: قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: لَوْ أَتَيْتَ عَبْدَ اللهِ بْنَ أُبَيٍّ، فَانْطَلَقَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ وَرَكِبَ حِمَارًا، فَانْطَلَقَ الْمُسْلِمُونَ يَمْشُونَ مَعَهُ -وَهْيَ أَرْضٌ سَبِخَةٌ- فَلَمَّا أَتَاهُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: إِلَيْكَ عَنِّي، وَاللهِ لَقَدْ آذَانِي نَتْنُ حِمَارِكَ. فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ مِنْهُمْ: وَاللهِ لَحِمَارُ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَطْيَبُ رِيحًا مِنْكَ. فَغَضِبَ لِعَبْدِ اللهِ رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ فَشَتَمَا، فَغَضِبَ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا أَصْحَابُهُ، فَكَانَ بَيْنَهُمَا ضَرْبٌ بِالجَرِيدِ وَالأَيْدِي وَالنِّعَالِ، فَبَلَغَنَا أَنَّهَا أُنْزِلَتْ: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۝٩ ﴾ الحجرات.

٢٦٩١- موعتەمیر دەڵێ: لە باوکم بیست دەیگێڕایەوە کە ئەنەس ﷺ وتی: بە پێغەمبەر ﷺ وترا: خۆزگە بڕۆیشتیتایە بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی،

پێغەمبەریش ﷺ سواری گوێدرێژێك بوو، ڕۆیشت بۆ لای، مسوڵمانانیش دەرچوون و لەگەڵیدا ڕۆیشتن -ئەو زەوییەی پێیدا ڕۆیشت زەوییەکی خوێیاوی کرێن بوو- جا کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە لای، عەبدوڵلا وتی: دوورکەوەرەوە لێم، سوێند بەخوا بۆنی ناخۆشی گوێدرێژەکەت نارەحەتی کردم، ئینجا پیاوێکی ئەنصاری لەوانەی لەوێدا بوو وتی: سوێند بەخوا بۆنی گوێدرێژەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبۆنی تۆ خۆ شترە، جا پیاوێك لە خزمانی عەبدوڵلا لەسەر عەبدوڵلا بەجواب هاتوو و توڕە بوو، ئینجا ئەو دوو پیاوە جنێویان بەیەکتری دا، وە خزمی هەریەکەیان لەسەریان هاتنە دەنگ و توڕە بوون، وە لە نێوانیاندا لێدان بە پەلی دارخورما و مست بەدەست و بەنەعل ڕوویدا، جا پێمان گەیشت کە ئەم ئایەتە بەهۆیەوە دابەزی: (ئەگەر دوو کۆمەڵ لەئیمانداران دژ بەیەکتر جەنگیان کرد، ئەوە لە نێوانیاندا ئاشتەوایی بکە).

## ٢- بابٌ: لَيْسَ الكَاذِبُ الذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ

٢٦٩٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ حُمَيْدَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أُمَّهُ أُمَّ كُلْثُومٍ بِنْتَ عُقْبَةَ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: "لَيْسَ الكَذَّابُ الذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ، فَيَنْمِي خَيْرًا، أَوْ يَقُولُ خَيْرًا".

## ٢- باسێک: ئەو کەسە درۆزن نییە کە ئاشتەوایی دەکات لە نێوان خەڵکیدا

٢٦٩٢- ئیبنو شیهاب دەڵێ: حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان هەواڵی پێدا کەدایکی کە ئوممو کولسومی کچی عوقبەیە هەواڵی پێداوە: کە ئەو لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((ئەو کەسە درۆزن نییە کە لە نێوان خەڵکیدا ئاشتەوایی دەکات، قسەی چاك دەگەیەنی و هاتووچۆی پێدەکات یان چاکە دەڵێت)).

## ٣- بابُ قَوْلِ الإِمَامِ لأَصْحَابِهِ: اذْهَبُوا بِنَا نُصْلِحُ

٢٦٩٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأُوَيْسِيُّ، وَإِسْحَاقُ بْنُ مُحَمَّدٍ الفَرْوِيُّ قَالَا: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ أَنَّ أَهْلَ قُبَاءٍ اقْتَتَلُوا حَتَّى تَرَامَوْا بِالحِجَارَةِ، فَأُخْبِرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِذَلِكَ فَقَالَ: "اذْهَبُوا بِنَا نُصْلِحُ بَيْنَهُمْ"[١].

## ٣- باسی پێشەوا بە هاوەڵانی بڵێ: با پێكەوە بڕۆین نێوانیان چاك بكەین

**٢٦٩٣- سەهلی كوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە كە خەڵكی قوبا لە نێوان خۆیاندا بەشەڕهاتبوون، هەتا بەردیان بۆ یەكتری هاویشتبوو، جا هەواڵی ئەو شەڕە بە پێغەمبەری خوا ﷺ درا، ئەویش فەرمووی: ((با بچین نێوانیان چاك بكەینەوە)).**

## ٤- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ ﴿١٢٨﴾﴾ النساء.

٢٦٩٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا ﴿١٢٨﴾﴾ النساء. قَالَتْ: هُوَ الرَّجُلُ يَرَى مِنِ امْرَأَتِهِ مَا لَا يُعْجِبُهُ، كِبَرًا أَوْ غَيْرَهُ، فَيُرِيدُ فِرَاقَهَا فَتَقُولُ: أَمْسِكْنِي، وَاقْسِمْ لِي مَا شِئْتَ. قَالَتْ فَلاَ بَأْسَ إِذَا تَرَاضَيَا[٢].

---

(١) بڕوانە: ٦٨٤.

(٢) بڕوانە: ٢٤٥٠.

## ٤- باسی ئەو فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (کە ئاشتەواییەکی چاک بکەن لە نێوان خۆیاندا هەر ئاشتەوایی و ڕێککەوتن چاکترە)

٢٦٩٤- عائیشە ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتە: (وە ئەگەر ئافرەتێك ترسا لەگوێ پێنەدانی یان پشت هەڵکردنی مێردەکەی)، دەڵێ: مەبەستی ئەم ئایەتە پیاوێکە دەبینێ خێزانەکەی پیرە یان شتێکی لە جۆرە، حەزی لێ ناکات و بەنیازە تەلاقی بدات، ئافرەتەکەش دەڵێ: تەلاقم مەدە، بمهێڵەوە بەویستی خۆت لام بمێنەرەوە، عائیشە وتی: ئەوە زیانی نییە ئەگەر هەردووکیان ڕازی بن.

## ٥ – بابٌ: إِذَا اصْطَلَحُوا عَلَى صُلْحِ جَوْرٍ فَهو مَرْدُودٌ

٢٦٩٥- ٢٦٩٦- حَدَّثَنَا آدَمُ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ ﷺ قَالَا: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، اقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ. فَقَامَ خَصْمُهُ فَقَالَ: صَدَقَ، اقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ. فَقَالَ الأَعْرَابِيُّ: إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا عَلَى هَذَا، فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، فَقَالُوا: لِي عَلَى ابْنِكَ الرَّجْمُ. فَفَدَيْتُ ابْنِي مِنْهُ بِمِائَةٍ مِنَ الغَنَمِ وَوَلِيدَةٍ، ثُمَّ سَأَلْتُ أَهْلَ العِلْمِ، فَقَالُوا إِنَّمَا عَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "لَأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللهِ، أَمَّا الوَلِيدَةُ وَالغَنَمُ فَرَدٌّ عَلَيْكَ، وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَأَمَّا أَنْتَ يَا أُنَيْسُ -لِرَجُلٍ- فَاغْدُ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا فَارْجُمْهَا". فَغَدَا عَلَيْهَا أُنَيْسٌ فَرَجَمَهَا[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٣١٤، ٢٣١٥.

## ٥- باسێک: ئەگەر ناکۆکەکان ڕێککەوتن لەسەر ڕێککەوتنێکی نادادگەرانە ئەوە ڕێککەوتنەکە دروست نییە

**٢٦٩٥- ٢٦٩٦- ئەبو هوڕەیرە و زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ هەردووکیان دەڵێن: دەشتەکییەك هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەکتێبەکەی خوا بڕیار بدە لە نێوانماندا، پیاوەکەی بەرانبەری هەستا و وتی: ڕاست دەکات بەکتێبەکەی خوا بڕیاربدە لە نێوانماندا، جا دەشتەکییەکە وتی: کوڕەکەی من کرێکار بووە لای ئەم پیاوە و زینای کردووە لەگەڵ خێزانەکەیدا، بەمنیان وت: کوڕەکەی تۆ بەردبارانکردنی لەسەرە، منیش سەد سەر مەڕ و کەنیزەکێك بریتیم دا (تا کوڕەکەم ڕەجم نەکرێ)، پاشان پرسیارم لەزانایان کرد، وتیان: بەراستی کوڕەکەت سەد شەلاق و یەك ساڵ دوورخستنەوەی لەسەرە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سوێند بێ بە کتێبەکەی خوا بڕیاردەدەم لە نێوانتاندا، جا کەنیزەك و سەد مەڕەکە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ تۆ، کوڕەکەشت سەد شەلاق و یەك ساڵ دوورخستنەوەی لەسەرە، جا تۆش ئونەیس-پیاوێك بوو لەوێدا بوو-، بڕۆ بۆ لای ژنی ئەم پیاوەو بەردبارانی بکە))، ئونەیسیش بەیانییەکەی ڕۆیشت بۆ لای ئافرەتەکە و بەردبارانی کرد.**

٢٦٩٧- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ". رَوَاهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ المَخْرَمِيُّ، وَعَبْدُ الوَاحِدِ بْنُ أَبِي عَوْنٍ عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ.

**٢٦٩٧- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکەسێك لەم ئایینەماندا شتێك دابێنێت کە لەئایینەکەماندا نییە، ئەوە بێگومان دەدرێتەوە بەسەریدا)). ئەم فەرموودەیە هەریەك لە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری**

مەخرەمیی و عەبدولواحیدی کوڕی ئەبو عەون لە سەعدی کوڕی ئیبراهیمەوە گێڕاویانەتەوە.

## ٦ - بابٌ: كَيْفَ يُكْتَبُ: هَذَا مَا صَالَحَ فُلَانُ بْنُ فُلَانٍ، وَفُلَانُ بْنُ فُلَانٍ، وَإِنْ لَمْ يَنْسُبْهُ إِلَى قَبِيلَتِهِ أَوْ نَسَبِهِ

٢٦٩٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ البَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا صَالَحَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَهْلَ الحُدَيْبِيَةِ كَتَبَ عَلِيٌّ بَيْنَهُمْ كِتَابًا، فَكَتَبَ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ ﷺ. فَقَالَ المُشْرِكُونَ: لَا تَكْتُبْ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ، لَوْ كُنْتَ رَسُولًا لَمْ نُقَاتِلْكَ. فَقَالَ لِعَلِيٍّ: "امْحُهُ". فَقَالَ عَلِيٌّ: مَا أَنَا بِالذِي أَمْحَاهُ. فَمَحَاهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِيَدِهِ، وَصَالَحَهُمْ عَلَى أَنْ يَدْخُلَ هُوَ وَأَصْحَابُهُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، وَلَا يَدْخُلُوهَا إِلَّا بِجُلُبَّانِ السِّلَاحِ، فَسَأَلُوهُ: مَا جُلُبَّانُ السِّلَاحِ؟ فَقَالَ: القِرَابُ بِمَا فِيهِ[1].

## ٦- باسێک: ڕێککەوتن چۆن دەنووسرێت: ئەمە ئەو ڕێککەوتنەیە کە فڵانەکەسی کوڕی فڵانەکەس، وە فڵانەکەسی کوڕی فڵانەکەس لەسەری ڕێککەوتن با ناوی هۆز و ڕەچەڵەکیشی نەهێنرێت

**٢٦٩٨- بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەو کافرانە لە حودەیبیە بوون ڕێککەوت، عەلی ڕێککەوتنەکەی نووسی لە نێوانیاندا، جا نووسی: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ)، جا بتپەرستەکان وتیان: مەنووسە: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ)! ئەگەر تۆ پێغەمبەر بوویتایە ئێمە جەنگمان لەگەڵت**

(١) بروانە: ١٧٨١.

**نەدەکرد! پێغەمبەریش ﷺ بەعەلی فەرموو: (( (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ) کە بسڕەوە))، عەلیش وتی: من نایسڕمەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی خۆی سڕییەوە، وە لەگەڵیاندا ڕێککەوت کە ئەو و هاوەڵانی سێ ڕۆژ بچنە مەککە، وە دەبێت کە دەچنە مەککەوە شمشێرەکان لە بەرگ و کێڵانەکانیاندا بن، جا پرسیاریان کرد: (جُلُبَّانِ السَّلاَحِ) چییە؟ (بەڕا) وتی: بەرگێکی چەرمە شمشێر و کێلانەکەی تێدایە هەمووی پێکەوە.**

**٢٦٩٩-** حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: اعْتَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، فَأَبَى أَهْلُ مَكَّةَ أَنْ يَدَعُوهُ يَدْخُلُ مَكَّةَ، حَتَّى قَاضَاهُمْ عَلَى أَنْ يُقِيمَ بِهَا ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَلَمَّا كَتَبُوا الْكِتَابَ كَتَبُوا: هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ ﷺ. فَقَالُوا: لَا نُقِرُّ بِهَا، فَلَوْ نَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُ اللهِ مَا مَنَعْنَاكَ، لَكِنْ أَنْتَ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ. قَالَ: "أَنَا رَسُولُ اللهِ، وَأَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ". ثُمَّ قَالَ لِعَلِيٍّ: "امْحُ رَسُولُ اللهِ". قَالَ: لَا، وَاللهِ لَا أَمْحُوكَ أَبَدًا، فَأَخَذَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْكِتَابَ، فَكَتَبَ: هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، لَا يَدْخُلُ مَكَّةَ سِلاَحٌ إِلَّا فِي الْقِرَابِ، وَأَنْ لَا يَخْرُجَ مِنْ أَهْلِهَا بِأَحَدٍ إِنْ أَرَادَ أَنْ يَتَّبِعَهُ، وَأَنْ لَا يَمْنَعَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِهِ أَرَادَ أَنْ يُقِيمَ بِهَا. فَلَمَّا دَخَلَهَا وَمَضَى الأَجَلُ أَتَوْا عَلِيًّا، فَقَالُوا: قُلْ لِصَاحِبِكَ اخْرُجْ عَنَّا فَقَدْ مَضَى الأَجَلُ. فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ، فَتَبِعَتْهُمُ ابْنَةُ حَمْزَةَ: يَا عَمِّ يَا عَمِّ. فَتَنَاوَلَهَا عَلِيٌّ فَأَخَذَ بِيَدِهَا وَقَالَ لِفَاطِمَةَ: عَلَيْهَا السَّلاَمُ: دُونَكِ ابْنَةَ عَمِّكِ، حَمَلَتْهَا. فَاخْتَصَمَ فِيهَا عَلِيٌّ وَزَيْدٌ وَجَعْفَرٌ، فَقَالَ عَلِيٌّ: أَنَا أَحَقُّ بِهَا وَهْيَ ابْنَةُ عَمِّي. وَقَالَ جَعْفَرٌ: ابْنَةُ عَمِّي وَخَالَتُهَا تَحْتِي. وَقَالَ زَيْدٌ: ابْنَةُ أَخِي. فَقَضَى بِهَا النَّبِيُّ ﷺ لِخَالَتِهَا. وَقَالَ: "الْخَالَةُ بِمَنْزِلَةِ الأُمِّ". وَقَالَ لِعَلِيٍّ: "أَنْتَ مِنِّي وَأَنَا مِنْكَ". وَقَالَ لِجَعْفَرٍ: "أَشْبَهْتَ خَلْقِي وَخُلُقِي". وَقَالَ لِزَيْدٍ: "أَنْتَ أَخُونَا وَمَوْلاَنَا"[1].

---

(١) بروانە: ١٧٨١.

٢٦٩٩- بەڕائى كوڕى عازيب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مانگى زيلقەعدەدا عومرەى كرد، بەڵام خەڵكى مەككە ڕازى نەبوون و ڕێگەيان نەدا بچێتە ناو شارى مەككەوە، تا لەگەڵياندا ڕێككەوت و پێكهاتن كە سێ ڕۆژ لە مەككەدا بمێنێتەوە، ئينجا كاتێك ڕێككەوتننامەكەيان نووسى، نووسييان: ئەمە ئەوەيە كە موحەممەدى پێغەمبەرى خوا ﷺ لەسەرى ڕێككەوت، كافرانيش وتيان: ئێمە دان بەم نووسراوەدا نانێين، چونكە بەڕاستى ئەگەر ئێمە بمانزانيبايە تۆ پێغەمبەرى خوايت، ڕێگريمان لێ نەدەكرديت، بەڵكو تۆ موحەممەدى كوڕى عەبدوڵڵاى، فەرمووى ﷺ: ((من پێغەمبەرى خوام، وە من موحەممەدى كوڕى عەبدوڵڵام))، پاشان بە عەلى فەرموو: ((پێغەمبەرى خواكە بسڕەرەوە))، عەلى وتى: نەسوێند بەخوا هەرگيز نايسڕمەوە، ئەوسا پێغەمبەرى خوا ﷺ نامەكەى لە عەلى وەرگرت (و سڕيەوە و نامەكەى دايەوە بە عەلى)، جا نووسى: ئەمە ئەوەيە كە موحەممەدى كوڕى عەبدوڵڵا لەسەرى ڕێككەوتووە، شمشێر ناباتە مەككە مەگەر لەبەرگ و كێلانەكەيدا بێت، وە نابێ كەس لە دانيشتوانى مەككە لەگەڵ خۆيدا بباتە دەرەوە ئەگەر ويستى شوێنى بكەوێت، وە نابێ ڕێگە لەهيچ كام لەهاوەڵانى بگرێت ئەگەر بيەوێ لە مەككە دانيشێت و بمێنێتەوە، جا كە چووە مەككەوەو ماوەكەى تەواو بوو كافران هاتن بۆ لاى عەلى، وتيان: بە هاوڕێكەت[1] بڵێ: لە شارەكەمان دەرچێت، چونكە ماوەكە تەواو بووە، ئەوسا پێغەمبەريش ﷺ دەرچوو، وە كچەكەى حەمزە بە مامە مامە شوێنيان كەوت، عەليش دەستى گرت و هێناى بە فاتيمەى ﷺ وت: كچەكەى مامت بگرە، جا هەڵيگرت، ئينجا عەلى و زەيد و جەعفەر لەسەرى بوو بەكێشەيان، عەلى وتى: من لەئێوە لەپێشترم پێى، چونكە كچى مامەمە، جەعفەر وتى: كچى مامەمە و

(١) مەبەستيان پێغەمبەر ﷺ بوو.

**پوریشی هاوسەرمە، زەیدیش وتی: برازامە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بڕیاری دا بۆ پوری (کە هاوسەری جەعفەر بوو)، وە فەرمووی: ((پوور لە جێگەی دایکە))، بە عەلی فەرموو: ((تۆ لە منی و منیش لە تۆم))، بە جەعفەریشی فەرموو: ((تۆ لە ڕووخسارو لە ڕەوشتیشدا لە من دەچی))، بەزەیدیشی فەرموو: ((تۆش برا و ئازادکراومانیت)).**

## ٧- بابُ الصُّلْحِ مَعَ المُشْرِكِينَ

فِيهِ: عَنْ أَبِي سُفْيَانَ. وَقَالَ عَوْفُ بْنُ مَالِك، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: "ثُمَّ تَكُونُ هُدْنَةٌ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ بَنِي الأَصْفَرِ". وَفِيهِ سَهْلُ بْنُ حُنَيْفٍ وَأَسْمَاءُ وَالمِسْوَرُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**٢٧٠٠**- وَقَالَ مُوسَى بْنُ مَسْعُودٍ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنهما قَالَ: صَالَحَ النَّبِيُّ ﷺ المُشْرِكِينَ يَوْمَ الحُدَيْبِيَةِ عَلَى ثَلاَثَةِ أَشْيَاءَ: عَلَى أَنَّ مَنْ أَتَاهُ مِنَ المُشْرِكِينَ رَدَّهُ إِلَيْهِمْ، وَمَنْ أَتَاهُمْ مِنَ المُسْلِمِينَ لَمْ يَرُدُّوهُ، وَعَلَى أَنْ يَدْخُلَهَا مِنْ قَابِلٍ وَيُقِيمَ بِهَا ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، وَلاَ يَدْخُلَهَا إِلَّا بِجُلُبَّانِ السِّلاَحِ: السَّيْفِ، وَالقَوْسِ، وَنَحْوِهِ. فَجَاءَ أَبُو جَنْدَلٍ يَحْجُلُ فِي قُيُودِهِ، فَرَدَّهُ إِلَيْهِمْ[١].

قَالَ: لَمْ يَذْكُرْ مُؤَمَّلٌ عَنْ سُفْيَانَ: أَبَا جَنْدَلٍ، وَقَالَ: إِلَّا بِجُلُبِّ السِّلاَحِ.

## ٧- باسی (حوکمی) ڕێککەوتن لەگەڵ هاوبەشدانەراندا

**لەو بارەیەوە فەرموودەکەی ئەبو سوفیان هاتووە[٢]. وە عەوفی کوڕی مالیك رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((پاشان لە نێوان ئێوەو ڕۆمدا ڕێککەوتن و ئاگربەستێك دەبێت)). هەر لەم باسەدا فەرموودەی سەهلی**

(١) بڕوانە: ١٧٨١.

(٢) کە فەرموودەی ژمارە (٧) حەوتە لە صەحیح بوخاریدا.

**کوڕی حونەیف و فەرموودەی ئەسما و فەرموودەی میسوەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ[(١)] هاتووە.**

**٢٧٠٠- بەرائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی حودەیبییەدا لەگەڵ بتپەرستەکان ڕێککەوت لەسەر سێ شت: لەسەر ئەوەی هەرکەس لە بتپەرستان هات بۆ لای (و مسوڵمان بوو)، بیگێڕێتەوە بۆ لای بتپەرستان، وە هەر کەس لە مسوڵمانان هات بۆ لای بتپەرستان نەیگێڕنەوە، وە لەسەر ئەوە ساڵی داهاتوو بچێتە ناو شاری مەککەوە و سێ ڕۆژ تێیدا بمێنێتەوە، وە چەکەکان دەبێ لەبەرگ و کێلاندابن، هەر شمشێرو تیروکەوان و ئەو جۆرانە بن، ئینجا ئەبو جەندەل هات و بەکۆت و زنجیرەکەیەوە بەهێواشی هەنگاوی دەنا، جا پێغەمبەر ﷺ ناردیەوە بۆ لای بتپەرستەکان. (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) موئەممەل کە لە سوفیانەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە باسی ئەبو جەندەلی نەکردووە، وە وتوویەتی: (إِلَّا بِجُلُبِّ السِّلَاحِ) لە جیاتی: (إِلَّا بِجُلُبَّانِ السِّلَاحِ).**

٢٧٠١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ، حَدَّثَنَا سُرَيْجُ بْنُ النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ مُعْتَمِرًا، فَحَالَ كُفَّارُ قُرَيْشٍ بَيْنَهُ وَبَيْنَ البَيْتِ، فَنَحَرَ هَدْيَهُ، وَحَلَقَ رَأْسَهُ بِالحُدَيْبِيَةِ، وَقَاضَاهُمْ عَلَى أَنْ يَعْتَمِرَ العَامَ المُقْبِلَ، وَلَا يَحْمِلَ سِلَاحًا عَلَيْهِمْ إِلَّا سُيُوفًا، وَلَا يُقِيمَ بِهَا إِلَّا مَا أَحَبُّوا، فَاعْتَمَرَ مِنَ العَامِ المُقْبِلِ فَدَخَلَهَا كَمَا كَانَ صَالَحَهُمْ، فَلَمَّا أَقَامَ بِهَا ثَلَاثًا أَمَرُوهُ أَنْ يَخْرُجَ، فَخَرَجَ[(٢)].

**٢٧٠١- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ (لە مەدینە) دەرچوو بە نیازی عومرەکردن، بەڵام کافرانی قوڕەیش ڕێگریان کرد**

---

(١) هەریەکەیان فەرموودەیەک لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ڕێککەوتن و سوڵحی تێدایە.

(٢) بڕوانە: ٤٢٥٢.

**لە نێوان ئەوو گەیشتن بەکەعبە، بۆیە ئاژەڵی هەدیەکەی سەربڕی و سەری تاشی لەحودەیبیە، وە لەگەڵیان ڕێککەوت لەسەر ئەوەی کە ساڵی داهاتوو عومرە بکات، جگە لە شمشێرەکان هیچ چەکێکی پێنەبێت لە دژیان، وە لە مەککەدا نەمێنێتەوە ئەوەندە نەبێ ئەوان پێیان خۆشە (سێ ڕۆژ)، ئیتر ساڵی داهاتوو پێغەمبەر ﷺ عومرەی کردو ڕۆیشتە ناو شاری مەککە بەو شێوەیەی لەگەڵیان ڕێککەوتبوو، جا کە سێ ڕۆژەکە لە مەککەدا مایەوە، فەرمانیان پێ کرد کە لە مەککە بڕواتە دەرەوە، ئەویش ڕۆیشتە دەرەوە.**

٢٧٠٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا بِشْرٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ قَالَ انْطَلَقَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَهْلٍ، وَمُحَيِّصَةُ بْنُ مَسْعُودِ بْنِ زَيْدٍ إِلَى خَيْبَرَ، وَهْيَ يَوْمَئِذٍ صُلْحٌ[١].

**٢٧٠٢- سەهلی کوڕی ئەبو حەسمە دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی سەهل و موحەییصەی کوڕی مەسعودی کوڕی زەید ڕۆیشتن بۆ خەیبەر، لەوکاتەدا ڕێککەوتن بوو (لە نێوان ئەوان و مسوڵمانان‌دا).**

## ٨- بابُ الصُّلْحِ فِي الدِّيَةِ

٢٧٠٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي حُمَيْدٌ، أَنَّ أَنَسًا، حَدَّثَهُمْ أَنَّ الرُّبَيِّعَ -وَهْيَ: ابْنَةُ النَّضْرِ- كَسَرَتْ ثَنِيَّةَ جَارِيَةٍ، فَطَلَبُوا الأَرْشَ وَطَلَبُوا العَفْوَ، فَأَبَوْا فَأَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ فَأَمَرَهُمْ بِالقِصَاصِ. فَقَالَ أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ: أَتُكْسَرُ ثَنِيَّةُ الرُّبَيِّعِ يَا رَسُولَ اللهِ؟! لَا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ لَا تُكْسَرُ ثَنِيَّتُهَا. فَقَالَ: "يَا أَنَسُ، كِتَابُ اللهِ القِصَاصُ". فَرَضِيَ القَوْمُ وَعَفَوْا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ". زَادَ الفَزَارِيُّ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ: فَرَضِيَ القَوْمُ، وَقَبِلُوا الأَرْشَ[٢].

---

(١) بڕوانە: ٣١٧٣، ٦١٤٢، ٦١٤٣، ٦٨٩٨، ٧١٩٢.

(٢) بڕوانە: ٢٨٠٦، ٤٤٩٩، ٤٥٠٠، ٤٦١١، ٦٨٩٤.

## ٨- باسی ڕێككەوتن لەسەر بژاردنی خوێن

٢٧٠٣- حومەید دەگێڕێتەوە كە ئەنەس ﷺ بۆی گێڕانەوە كە ڕوبەییع-كە كچی نەزر بوو- ددانێكی پێشەوەی كچێكی شكاند، (كەسی كچەكە) داوای خوێنی (ددانەكە)یان كرد، (بەرانبەرەكەش) داوای لێخۆشبوونیان كرد[١]، بەڵام ئەوان[٢] ڕازی نەبوون، بۆیە ڕۆیشتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمانی پێكردن بە تۆڵە لێسەندنەوە. ئینجا ئەنەسی كوڕی نەزر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ددانی پێشەوەی ڕوبەییع دەشكێنرێت؟ نا سوێند بەو زاتەی تۆی بەهەق ناردووە ددانی ڕوبەییع ناشكێنرێت، فەرمووی ﷺ: ((ئەی ئەنەس حوكمی قورئانەكەی خوا تۆڵەكردنەوەیە))، ئینجا كەس و كاری كچە ددان شكاوەكە ڕازی بوون و لە ڕوبەییع خۆش بوون، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی لەناو بەندەكانی خوادا كەسی وا هەیە سوێند بخوات لەسەر ئەوەی خوا كارێكی بۆ بكات خوا سوێندەكەی ناخات)). فەزار لە حومەیدەوە لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوەو فەرموودەكە ئەم زیادەی لەگەڵە:(جا كەسەكانی (كچەكە) ڕازی بوون[٣] و بژاردنی ددانەكەیان وەرگرت).

## ٩- باب قَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ لِلْحَسَنِ بْنِ عَلِي: "إن ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ اللهَ أنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ"وَقَوْلُهُ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا ﴿٩﴾﴾ الحجرات.

٢٧٠٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: سَمِعْتُ الحَسَنَ يَقُولُ: اسْتَقْبَلَ وَاللهِ الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ مُعَاوِيَةَ بِكَتَائِبَ أَمْثَالِ الجِبَالِ، فَقَالَ عَمْرُو بْنُ العَاصِ: إِنِّي لأَرَى كَتَائِبَ لَا تُوَلِّي حَتَّى تَقْتُلَ أَقْرَانَهَا. فَقَالَ لَهُ مُعَاوِيَةُ -وَكَانَ وَاللهِ خَيْرَ

---

(١) بۆ كچەكەیان و خوێنیان لێ سەنن.

(٢) كەس و كاری كچە ددان شكاوەكە.

(٣) تۆڵەی لێ نەكرێتەوە.

الرَّجُلَيْنِ-: أَيْ عَمْرُو، إِنْ قَتَلَ هَؤُلاَءِ هَؤُلاَءِ، وَهَؤُلاَءِ هَؤُلاَءِ، مَنْ لِي بِأُمُورِ النَّاسِ؟ مَنْ لِي بِنِسَائِهِمْ؟ مَنْ لِي بِضَيْعَتِهِمْ؟ فَبَعَثَ إِلَيْهِ رَجُلَيْنِ مِنْ قُرَيْشٍ مِنْ بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ: عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ عَامِرِ بْنِ كُرَيْزٍ، فَقَالَ: اذْهَبَا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فَاعْرِضَا عَلَيْهِ، وَقُولاَ لَهُ، وَاطْلُبَا إِلَيْهِ. فَأَتَيَاهُ، فَدَخَلاَ عَلَيْهِ فَتَكَلَّمَا، وَقَالاَ لَهُ، فَطَلَبَا إِلَيْهِ، فَقَالَ لَهُمَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ: إِنَّا بَنُو عَبْدِ المُطَّلِبِ، قَدْ أَصَبْنَا مِنْ هَذَا المَالِ، وَإِنَّ هَذِهِ الأُمَّةَ قَدْ عَاثَتْ فِي دِمَائِهَا. قَالاَ فَإِنَّهُ يَعْرِضُ عَلَيْكَ كَذَا وَكَذَا، وَيَطْلُبُ إِلَيْكَ وَيَسْأَلُكَ. قَالَ: فَمَنْ لِي بِهَذَا؟ قَالاَ: نَحْنُ لَكَ بِهِ. فَمَا سَأَلَهُمَا شَيْئًا إِلَّا قَالاَ: نَحْنُ لَكَ بِهِ. فَصَالَحَهُ. فَقَالَ الحَسَنُ: وَلَقَدْ سَمِعْتُ أَبَا بَكْرَةَ يَقُولُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى المِنْبَرِ، وَالحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ إِلَى جَنْبِهِ، وَهُوَ يُقْبِلُ عَلَى النَّاسِ مَرَّةً وَعَلَيْهِ أُخْرَى وَيَقُولُ: "إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ اللهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ مِنَ المُسْلِمِينَ". قَالَ لِي عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ: إِنَّمَا ثَبَتَ لَنَا سَمَاعُ الحَسَنِ مِنْ أَبِي بَكْرَةَ بِهَذَا الحَدِيثِ[١].

## ٩- باسی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ بە حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ: ((ئەم کوڕەی من سەید و گەورەیە، ئومێد وایە خوا بیکات بەهۆی ئاشتەوایی و ڕێککەوتنی نێوان دوو کۆمەڵی گەورە (لە مسوڵمانان) ))، وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەوە لە نێوانیاندا ئاشتەوایی بکە)

**٢٧٠٤- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: لە حەسەنم[٢] بیست دەیوت: سوێند بەخوا حەسەنی کوڕی عەلی چەند سوپایەکی (ڕێکخست) بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی موعاویە بەوێنەی چیاکان بوو[٣]، عەمری کوڕی عاصیش (بە موعاوییەی) وت:**

---

(١) بڕوانە: ٣٦٢٩، ٣٧٤٦، ٧١٠٩.

(٢) مەبەست پێی حەسەنی بەصرییە.

(٣) لەبەر زۆری ئەمسەر و ئەوسەری دیار نەبوو، وەک چۆن کەسێک ڕووبەڕووی شاخێک بێت ئەمسەر و ئەوسەری نابینێت.

بێگومان من سوپایانێك دەبینم پشت هەڵناكات هەتا هاوتاكەی نەكوژێت، موعاویەش بە عەمری وت: -كە سوێند بەخوا چاكترینی دوو پیاوەكە[1] بوو- ئەی عەمر ئەگەر ئا ئەمانە ئا ئەوانە بكوژن، وە ئا ئەوانە ئا ئەمانە بكوژن كێم دەمێنێ كاروباری خەڵك بەڕێوەبەرێت؟ كێم دەمێنێ خەم لەئافرەتانیان بخوات؟ كێم دەمێنێ سەرپەرشتی منداڵەكانیان بكات؟ جا دوو پیاوی قورەیشی لە بنەماڵەی عەبدوشەمسی نارد بۆ لای (حەسەنی كوڕی عەلی)، كە عەبدوڕەحمانی كوڕی سەمورەو عەبدوڵڵای كوڕی عامیری كوڕی كورەیز بوون، پێی وتن: بڕۆ بۆ لای ئەو پیاوە[2] پێشنیاری (ڕێككەوتنی) بۆ بكەن و قسەی لەگەڵدا بكەن و داوای لێ بكەن[3]، جا هەردووكیان هاتن بۆ لای، ڕۆیشتنەماڵەوە بۆ لای و قسەیان كرد و قسە و داوایان دایە دەستی، حەسەنی كوڕی عەلی بە هەردووكیانی وت: ئێمەی بنەماڵەی عەبدولوتتەلیب بێگومان (بەهۆی دەسەڵاتەوە) سامان و ماڵێكمان دەست كەوتووە[4]، وە ئەم ئوممەتەش كوشتن و خوێنڕێژی تێیدا بڵاوبووەتەوە[5]، هەردووكیان وتیان: موعاوییە ئەوەندە و ئەوەندە (ماڵ و سامان) پێشنیار دەكات بۆت، هەر داواو پرسیارێكت هەیە (لێی بەو جۆرە دەبێ تۆ دەتەوێ)، حەسەن وتی: كێ زامن دەبێ بۆم؟ هەردووكیان وتیان: ئێمە زامن دەبین بۆت، جا هەر داوایەكی دەكرد لێیان، هەردووكیان دەیان وت: ئێمە زامنی ئەوەین بۆت، ئیتر لەگەڵ موعاوییە ڕێككەوت. جا حەسەن وتی: بەڕاستی لە ئەبو بەكرم بیست دەیوت: پێغەمبەری خوام ﷺ لەسەر دوانگە بینی، حەسەنی

---

(١) موعاوییە كە لە عەمر چاكتر بوو.

(٢) حەسەنی كوڕی عەلی.

(٣) هەر داوایەكی هەیە لێی وەرگرن بەقسەی بكەن.

(٤) ئەگەر وازی لێ بێنین نامێنێ.

(٥) بەماڵ و سامان نەبێت وازی لێ ناهێنن.

كوڕی عەلیش لە تەنیشتیدا بوو، پێغەمبەر ﷺ جارێك ڕووی لەخەڵكەكە دەكردو جارەكەی تر ڕووی لە حەسەن دەكردو دەیفەرموو: ((بێگومان ئەم كوڕەی من سەیید و گەورەیە، ئومێد وایە خوا ئاشتەوایی نێوان دوو كۆمەڵی گەورەی لە مسوڵمانان پێ بكات)). ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: عەلی كوڕی عەبدوڵلا (ی مەدینی) وتی: بێگومان بە هۆی ئەم فەرموودەیەوە بیستنی حەسەن (ی بەصری) لە ئەبو بەكرەوە لای ئێمە سەلماوەو ڕاستە[1].

## ١٠ - بابٌ: هَلْ يُشِيرُ الإِمَامُ بِالصُّلْحِ؟

٢٧٠٥- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَخِي، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ يَحْيَى ابْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي الرِّجَالِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أُمَّهُ عَمْرَةَ بِنْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَتْ سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﵂ تَقُولُ: سَمِعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ صَوْتَ خُصُومٍ بِالبَابِ عَالِيَةٍ أَصْوَاتُهُمَا، وَإِذَا أَحَدُهُمَا يَسْتَوْضِعُ الآخَرَ، وَيَسْتَرْفِقُهُ فِي شَيْءٍ وَهْوَ يَقُولُ: وَاللهِ لَا أَفْعَلُ. فَخَرَجَ عَلَيْهِمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: "أَيْنَ المُتَأَلِّي عَلَى اللهِ لَا يَفْعَلُ المَعْرُوفَ؟ ". فَقَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللهِ، وَلَهُ أَيُّ ذَلِكَ أَحَبَّ.

## ١٠- باسێک: ئایا پێشەوا پێشنیاری ڕێککەوتن دەکات؟

٢٧٠٥- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە دەنگی دوو كەسی ناكۆك بوو لەبەر دەرگاكە، هەردووكیان دەنگیان لێ بەرز بوو بۆوە، یەكێكیان داوای لەوی تریان دەكرد لە قەرزەكەی كەم بكاتەوە (هەندێكی دابشكێنێ)، هاوكار و نەرم و نیان بێت لە وەرگرتنەوەیدا، ئەویتریش دەیوت: سوێند بەخوا نایكەم،

---

(١) چونكە بەڕاشكاوی حەسەن وتویەتی كە ئەم فەرموودەی لە ئەبو بەكر بیستووە.

**پێغەمبەری خواش ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لایان، فەرمووی: ((كوا ئەو كەسەی سوێندی لەسەر خوا دەخوارد كە چاكە نەكات؟))، كابراش وتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دەی با ئەو (قەرزدارەكە) چۆنی پێ خۆشە سەرپشك بێت.**

٢٧٠٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْث، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنِ الأعرَجِ قَالَ: حَدَّثَنِي عبد اللهِ بْن كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ كَانَ لَه عَلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي حَدْرَدٍ الأسلَمِيِّ مَالٌ، فَلَقِيَهُ فَلَزِمَهُ حَتَّى ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا، فَمَرَّ بِهِمَا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: "يَا كَعْبُ". فَأَشَارَ بِيَدِهِ كَأَنَّهُ يَقُولُ النِّصْفَ، فَأَخَذَ نِصْفَ مَا لَهُ عَلَيْهِ وَتَرَكَ نِصْفًا[١].

**٢٧٠٦- عەبدوڵلای كوڕی كەعبی كوڕی مالیك لە كەعبی كوڕی مالیكەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: كە كەعب قەرزێكی لای عەبدوڵلای كوڕی ئەبو حەدرەدی ئەسلەمی بوو، جا كەعب بەعەبدوڵلا گەیشت و پێیەوە نووسا (و پێكەوە قسەیان كرد لەسەر قەرزەكە)، هەتا هەردووكیان دەنگیان بەرز بوویەوە، پێغەمبەریش ﷺ بەلایاندا تێپەڕی و فەرمووی: ((ئەی كەعب!))، بەدەستی ئاماژەی كرد وەك بڵێ: نیوەی (قەرزەكە بشكێنە)، كەعبیش نیوەی ئەو قەرزەی لای عەبدوڵلا بوو لێی وەرگرت و نیوەكەی تری واز لێهێنا.**

## ١١- بابُ فَضْلِ الإِصْلَاحِ بَيْنَ النَّاسِ وَالعَدْلِ بَيْنَهُمْ

٢٧٠٧- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "كُلُّ سُلاَمَى مِنَ النَّاسِ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ، كُلَّ يَوْمٍ تَطْلُعُ فِيهِ الشَّمْسُ يَعْدِلُ بَيْنَ النَّاسِ صَدَقَةٌ"[٢].

(١) بڕوانە: ٤٥٧.

(٢) بڕوانە: ٢٨٩١، ٢٩٨٩.

## ١١- باسی گەورەیی ئاشتەوایی کردن لە نێوان خەڵک و دادگەربوون لە نێوانیاندا

**٢٧٠٧- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەموو جومگەیەك لە لاشەی مرۆڤ لەسەریەتی خێر و چاكەیەك بكات، هەموو ڕۆژێك كە خۆر هەڵدێت، (كەسێك لە ئێوە) دادگەری بكات لە نێوان خەڵكدا خێرو چاكەیەكە)).**

## ١٢- بابٌ: إِذَا أَشَارَ الإِمَامُ بِالصُّلْحِ فَأَبَى، حَكَمَ عَلَيْهِ بِالحُكْمِ البَيِّنِ

٢٧٠٨- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ الزُّبَيْرَ كَانَ يُحَدِّثُ أَنَّهُ خَاصَمَ رَجُلًا مِنَ الأَنْصَارِ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي شِرَاجٍ مِنَ الحَرَّةِ، كَانَا يَسْقِيَانِ بِهِ كِلاَهُمَا، فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ لِلزُّبَيْرِ "اسْقِ يَا زُبَيْرُ ثُمَّ أَرْسِلْ إِلَى جَارِكَ". فَغَضِبَ الأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، آنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ ﷺ ثُمَّ قَالَ: "اسْقِ ثُمَّ احْبِسْ حَتَّى يَبْلُغَ الجَدْرَ". فَاسْتَوْعَى رَسُولُ اللهِ ﷺ حِينَئِذٍ حَقَّهُ لِلزُّبَيْرِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَبْلَ ذَلِكَ أَشَارَ عَلَى الزُّبَيْرِ بِرَأْيٍ سَعَةٍ لَهُ وَلِلأَنْصَارِيِّ، فَلَمَّا أَحْفَظَ الأَنْصَارِيُّ رَسُولَ اللهِ ﷺ اسْتَوْعَى لِلزُّبَيْرِ حَقَّهُ فِي صَرِيحِ الحُكْمِ. قَالَ عُرْوَةُ: قَالَ الزُّبَيْرُ: وَاللهِ مَا أَحْسِبُ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ إِلَّا فِي ذَلِكَ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ﴿٦٥﴾ ﴾ النساء[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٣٦٠.

## ١٢- باسێک: ئەگەر پێشەوا ڕێککەوتنێکی پێشنیار کرد کەسەکە پێی ڕازی نەبوو بڕیاری ئاشکرای دا دەدات بەسەریدا

٢٧٠٨- عورِوەی کوڕی زوبەیر دەڵێ: بێگومان زوبەیر ﷺ دەیگێڕایەوە کە ئەو لەگەڵ پیاوێکی ئەنصاریدا کە بەشداری غەزای بەدری کردبوو لای پێغەمبەری خوادا ﷺ بۆیە ناکۆکیان لەسەر جۆگە ئاوی حەڕە[١]، کە هەردووکیان ئاو(ی باخی خورما)یان پێ دەدێرا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بەزوبەیری فەرموو: ((زوبەیر (باخەکەت) بدێرە، پاشان ئاوەکە بەرەڵا بکە بۆ دراوسێکەت))، ئەنصارییەکە توڕەبوو و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەوەی زوبەیر کوڕی پورتە (وا دەڵێیت)، ئینجا ڕەنگی دەموچاوی پێغەمبەری خوا ﷺ گۆڕا و تێکچوو، پاشان فەرمووی: ((زوبەیر ئاوی خۆت بدێرە، پاشان ئاوەکە بگرە تا ئاوەکە بگەڕێتەوە بۆ چاڵی بن دارخورماکان))، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا ئەوەی مافی زوبەیر بوو بەتەواوی پێیدا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ئەوە بۆچوونێکی پێشنیار کرد گونجاو بوو بۆ زوبەیرو بۆ ئەنصارییەکەش، بەڵام کە ئەنصارییەکە پێغەمبەری خوای ﷺ توڕەکرد، مافەکەی زوبەیری بەتەواوی دا بەبڕیاری ڕوون و ئاشکرا، عورِوە دەڵێ: زوبەیر وتی: سوێند بەخوا وا دەزانم و پێم وایە ئەم ئایەتە لەو بارەیەوە دابەزیوە: (نەخێر (وانییە کە خۆیان بەباوەڕدار نیشان دەدەن) سوێند بە پەروەردگارت باوەڕدار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوەو دووبەرەکییەکی نێوانیاندا).

## ١٣- بابُ الصُّلْحِ بَيْنَ الغُرَمَاءِ وَأَصْحَابِ المِيرَاثِ وَالمُجَازَفَةِ فِي ذَلِكَ

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَا بَأْسَ أَنْ يَتَخَارَجَ الشَّرِيكَانِ، فَيَأْخُذَ هَذَا دَيْنًا، وَهَذَا عَيْنًا، فَإِنْ تَوِيَ لأَحَدِهِمَا لَمْ يَرْجِعْ عَلَى صَاحِبِهِ.

---

(١) حەڕە: بەردەڵانێکی ڕەشە کە شوێنێکە لە مەدینە.(بڕوانە: إرشاد الساري:٦/١٧١).

## ١٣- باسی ڕێککەوتنی خاوەن قەرزەکان و میراتگران و گۆترەکاری تێیدا

**ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: زیانی نییە دوو هاوبەش هەر یەکەیان لە هەندێك لە بەشەکەی خۆی وازبێنێت، ئینجا ئەمەیان قەرزەکە ببات، ئەوی دیکەیان کاڵا ببات، ئەوسا ئەگەر ئەوەی بەر هەر یەکێکیان کەوتووە تیاچوو، بۆی نییە بگەڕێتەوە بۆ لای هاوبەشەکەی ترو ئەوەی وازی لێ هێنابوو وەری بگرێتەوە.**

٢٧٠٩- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ، عَنْ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: تُوُفِّيَ أَبِي وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، فَعَرَضْتُ عَلَى غُرَمَائِهِ أَنْ يَأْخُذُوا التَّمْرَ بِمَا عَلَيْهِ، فَأَبَوْا وَلَمْ يَرَوْا أَنَّ فِيهِ وَفَاءً، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: "إِذَا جَدَدْتَهُ فَوَضَعْتَهُ فِي المِرْبَدِ آذَنْتَ رَسُولَ اللهِ ﷺ". فَجَاءَ وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ فَجَلَسَ عَلَيْهِ، وَدَعَا بِالبَرَكَةِ، ثُمَّ قَالَ: "ادْعُ غُرَمَاءَكَ، فَأَوْفِهِمْ". فَمَا تَرَكْتُ أَحَدًا لَهُ عَلَى أَبِي دَيْنٌ إِلَّا قَضَيْتُهُ، وَفَضَلَ ثَلَاثَةَ عَشَرَ وَسْقًا: سَبْعَةٌ عَجْوَةٌ، وَسِتَّةٌ لَوْنٌ -أَوْ سِتَّةٌ عَجْوَةٌ وَسَبْعَةٌ لَوْنٌ- فَوَافَيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ المَغْرِبَ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَضَحِكَ، فَقَالَ: "ائْتِ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ فَأَخْبِرْهُمَا". فَقَالَا: لَقَدْ عَلِمْنَا إِذْ صَنَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَا صَنَعَ أَنْ سَيَكُونُ ذَلِكَ. وَقَالَ هِشَامٌ عَنْ وَهْبٍ، عَنْ جَابِرٍ: صَلَاةَ العَصْرِ. وَلَمْ يَذْكُرْ: أَبَا بَكْرٍ، وَلَا: ضَحِكَ، وَقَالَ: وَتَرَكَ أَبِي عَلَيْهِ ثَلَاثِينَ وَسْقًا دَيْنًا. وَقَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ وَهْبٍ، عَنْ جَابِرٍ: صَلَاةَ الظُّهْرِ[١].

**٢٧٠٩- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: باوکم مردو قەرزدار بوو، منیش پێشنیارم کرد بۆ خاوەن قەرزەکان: خورما(ی باخەکەمان) وەرگرن لەبەرانبەر ئەو قەرزەی لەسەر باوکمە، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون، پێیان وانە بوو دانەوەی**

(١) بڕوانە: ٢١٢٧.

**قەرزەکەیان تەواو بکات، منیش هاتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەم بۆ باس کرد، ئەویش فەرمووی ﷺ: ((کە خورماکەت لێکردەوە و لەشوێنی وشککردنەکەیدا دات نا، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار بکە)) جا پێغەمبەر ﷺ هات و ئەبو بەکر و عومەریشی لەگەڵدا بوو، جا لای خورماکە دانیشت و دوعا و نزای فەڕو بەرەکەتی کرد، پاشان فەرمووی ﷺ: ((خاوەن قەرزەکانت بانگ بکە و قەرزەکەیان بدەرەوە))، منیش هیچ کەسێکیانم نەهێشت کە قەرزی لەسەر باوکم بوو، ئیللا قەرزەکەم دایەوە، سیازدە وەسقیشی زیادە بوو: کە حەوتی عەجوە بوو، شەشیشی جۆری تر بوو (خراپ بوو) -یان شەشی عەجوە بوو، حەوتیشی جۆری تر بوو- بۆ نوێژی مەغریب بەپێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتم، وە ئەوەم بۆ گێڕایەوە ئەویش پێکەنی و فەرمووی: ((بڕۆ بۆ لای ئەبو بەکر و عومەر و بۆیان باس بکە))، ئەوانیش هەردووکیان وتیان: بێگومان ئێمە دەمانزانی کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەوەی کرد کە کردی (لەدوعا و نزا) ئاوادەبێت. هیشام دەگێڕێتەوە لە وەهبەوە لە جابیرەوە ﷺ لە جیاتی مەغریب دەڵێ: نوێژی عەسر (بەخزمەت پێغەمبەر ﷺ گەیشتم) وە ناوی ئەبو بەکر ناهێنێ و باسی پێکەنینی پێغەمبەر ﷺ ناکات، وە دەڵێ جابیر وتی: باوکم دوای خۆی سی وەسق قەرزی بەجێ هێشتبوو، ئیبنو ئیسحاق دەگێڕێتەوە لە وەهبەوە لە جابیرەوە دەڵێ: نوێژی نیوەڕۆ (جابیر بەپێغەمبەر ﷺ گەیشت).**

## ١٤- بابُ الصُّلْحِ بِالدَّيْنِ وَالعَيْنِ

٢٧١٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ كَعْبٍ، أَنَّ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْنًا كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي المَسْجِدِ، فَارْتَفَعَتْ

أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَهُوَ فِي بَيْتٍ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَيْهِمَا حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِهِ، فَنَادَى كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ: فَقَالَ: "يَا كَعْبُ". فَقَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ. فَأَشَارَ بِيَدِهِ أَنْ ضَعِ الشَّطْرَ. فَقَالَ كَعْبٌ: قَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "قُمْ فَاقْضِهِ"[(١)].

## ١٤- باسی ڕێککەوتن بە قەرز و بە کاڵا

**٢٧١٠- کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ قەرزێکی لای ئەبو حەدرەد بوو، داوای دانەوەی کرد لێی لە مزگەوتدا، جا دەنگیان بەرزبوویەوە بەڕاددەیەکی وا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵەوە گوێی لێ بوو، بۆیە هاتە دەرەوە بۆ لایان، هەتا بەشێکی پەردەی (دەلاقەی) ژوورەکەی لاداو بانگی کرد: ((کەعبی کوڕی مالیك!)) ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گوێڕایەڵتم، جا بەدەستی ئاماژەی کرد کە ((نیوەی قەرزەکەت دابشکێنە))، کەعبیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە دامشکاند، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (بەئەبی حەدرەد): ((هەستە تۆش قەرزەکەی بدەرەوە)).**

(١) بڕوانە: ٤٥٧.

## ١- بابُ مَا يَجُوزُ مِنَ الشُّرُوطِ فِي الإِسْلَامِ وَالأَحْكَامِ وَالمُبَايَعَةِ

٢٧١١ - ٢٧١٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّهُ سَمِعَ مَرْوَانَ، وَالمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ ﷺ يُخْبِرَانِ عَنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا كَاتَبَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو يَوْمَئِذٍ كَانَ فِيمَا اشْتَرَطَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو عَلَى النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ لَا يَأْتِيكَ مِنَّا أَحَدٌ وَإِنْ كَانَ عَلَى دِينِكَ إِلَّا رَدَدْتَهُ إِلَيْنَا، وَخَلَّيْتَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُ. فَكَرِهَ المُؤْمِنُونَ ذَلِكَ، وَامْتَعَضُوا مِنْهُ، وَأَبَى سُهَيْلٌ إِلَّا ذَلِكَ، فَكَاتَبَهُ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى ذَلِكَ، فَرَدَّ يَوْمَئِذٍ أَبَا جَنْدَلٍ عَلَى أَبِيهِ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو، وَلَمْ يَأْتِهِ أَحَدٌ مِنَ الرِّجَالِ إِلَّا رَدَّهُ فِي تِلْكَ المُدَّةِ، وَإِنْ كَانَ مُسْلِمًا، وَجَاءَ المُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ، وَكَانَتْ أُمُّ كُلْثُومٍ بِنْتُ عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ مِمَّنْ خَرَجَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ يَوْمَئِذٍ وَهْيَ عَاتِقٌ، فَجَاءَ أَهْلُهَا يَسْأَلُونَ النَّبِيَّ ﷺ أَنْ يَرْجِعَهَا إِلَيْهِمْ، فَلَمْ يَرْجِعْهَا إِلَيْهِمْ لِمَا أَنْزَلَ اللهُ فِيهِنَّ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ﴿١٠﴾ ﴾ الممتحنة[1].

---

(١) بروانه: ١٦٩٤، ١٦٩٥.

# ١- باسی ئەو مەرجانەی لە (هاتنە ناو) ئیسلام و مامەڵەكان و پەیماندا دروستن

٢٧١١- ٢٧١٢- عورِوەی كوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە كە لە مەڕوان و میسوەری كوڕی مەخرەمەی بیست، هەردووكیان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیانگێڕایەوە، دەڵێ: كە لەو ڕۆژەدا سوهەیلی كوڕی عەمر (لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕێككەوتنی) نووسی، یەكێك لەو شتانەی سوهەیل بەمەرجی گرت لەسەر پێغەمبەر ﷺ: هیچ كەسێك لای ئێمەوە نایەت بۆ لای تۆ، با لەسەر ئایینەكەی تۆش بێت، ئیللا دەیگێڕیتەوە بۆ لای ئێمەو ڕێگر نابیت لە نێوان ئێمەو ئەو كەسەدا، باوەڕداران ئەمەیان پێ ناخۆش بوو، تووڕە بوون لەو مەرجە، سوهەیل ڕازی نەبوو بەوە نەبێت، پێغەمبەریش ﷺ لەسەر ئەوە لەگەڵی ڕێككەوت، جا لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر ﷺ ئەبو جەندەلی گەڕاندەوە بۆ لای سوهەیلی كوڕی عەمری باوكی، وە هەر پیاوێك لەو ماوەیەدا بهاتبایە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕایەوە، بامسوڵمانیش بوایە، ئینجا ئافرەتە باوەڕدارە كۆچەرییەكان هاتن، ئوممو كولسومی كچی عوقبەی كوڕی ئەبو موعیت لەو ئافرەتانە بوو (كۆچی كرد)، هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ كە لەوكاتەدا كچێكی گەنج بوو، ئینجا كەس و كاری هاتن داوایان كرد لە پێغەمبەر ﷺ كە بیگێڕێتەوە بۆیان، بەڵام پێغەمبەر ﷺ نەیگەڕاندەوە بۆیان، كاتێك خوای گەورە دەربارەیان ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆ لاتان بەكۆچەری تاقیان بكەنەوە، خوا بەباوەڕی ئەوان زاناترە، ئینجا ئەگەر زانیتان ئەو (ئافرەتانە) باوەڕدارن، ئەوە مەیانگێڕنەوە بۆ لای (مێردە) بێ باوەڕەكانیان، نە ئەو ئافرەتانە حەڵاڵن بۆ ئەو مێردە بێ باوەڕانە، نە ئەو مێردانەش حەڵاڵن بۆ ئافرەتانە).

٢٧١٣- قَالَ عُرْوَةُ: فَأَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَمْتَحِنُهُنَّ بِهَذِهِ الآيَةِ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ﴿١٠﴾ ﴾ إِلَى ﴿ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾ الممتحنة. قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَنْ أَقَرَّ بِهَذَا الشَّرْطِ مِنْهُنَّ قَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: "قَدْ بَايَعْتُكِ". كَلاَمًا يُكَلِّمُهَا بِهِ، وَاللهِ مَا مَسَّتْ يَدُهُ يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ فِي الْمُبَايَعَةِ، وَمَا بَايَعَهُنَّ إِلَّا بِقَوْلِهِ[١].

**٢٧١٣- عوروە دەڵێ: عائیشە ﵂ بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەم ئایەتە ئافرەتانی (باوەڕداری) تاقی دەکردەوە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ئەگەر ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆ لاتان بەکۆچەری، تاقییان بکەنەوە) تا دەگاتە (لێخۆش بووی میهرەبانە). عوروە دەڵێ: عائیشە ﵂ دەڵێ: هەرکام لەئافرەتان دانی بەم مەرجەدا بنابایە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو پێی: ((بێگومان بەیعەتم لەگەڵ کردی))، بە قسەکردن قسەی لەگەڵ دەکرد، سوێند بەخوا دەستی پێغەمبەر ﷺ بەر دەستی هیچ ئافرەتێك نەکەوتووە لە بەیعەتداندا، وە تەنها بە فەرمایشتی بەیعەتی لەگەڵ ئافرەتاندا دەکرد.**

٢٧١٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ قَالَ: سَمِعْتُ جَرِيرًا ﵁ يَقُولُ بَايَعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَاشْتَرَطَ عَلَيَّ: "وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ"[٢].

**٢٧١٤- جەریر ﵁ دەڵێ: بەیعەتم دا بەپێغەمبەری خوا ﷺ، بەمەرجی دانا لەسەرم: ((ئامۆژگاری و دڵسۆزیم هەبێت بۆ هەموو مسوڵمانێك[٣])).**

(١) بڕوانە: ٢٧٣٣، ٤١٨٢، ٤٨٩١، ٧٢١٤.

(٢) بڕوانە: ٥٧.

(٣) بەم جۆرەش مانا بکرێت ڕاستە: ئامۆژگاری هەموو مسوڵمانێک بکەم.

٢٧١٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنِي قَيْسُ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ[1].

**٢٧١٥- جەریری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پەیمانم دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بەجێ هێنانی نوێژ، زەکات دان، وە دڵسۆزی و ئامۆژگاری کردنی هەموو مسوڵمانێك.**

## ٢ - بَابٌ: إِذَا بَاعَ نَخْلًا قَدْ أُبِّرَتْ

٢٧١٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "مَنْ بَاعَ نَخْلًا قَدْ أُبِّرَتْ فَثَمَرَتُهَا لِلْبَائِعِ إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ"[2].

## ٢- باسێک: ئەگەر کەسێک دارخورمایەکی فرۆشت کە موتوربە کرابوو

**٢٧١٦- عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس دارخورمایەکی فرۆشت کە موتوربە کرابوو، ئەوە بەری خورماکە بۆ فرۆشیارە، مەگەر کڕیار بەمەرجی گرتبێت[3])).**

## ٣- بَابُ الشُّرُوطِ فِي الْبَيْعِ

٢٧١٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ بَرِيرَةَ جَاءَتْ عَائِشَةَ تَسْتَعِينُهَا فِي كِتَابَتِهَا، وَلَمْ تَكُنْ قَضَتْ مِنْ كِتَابَتِهَا

(١) بڕوانە: ٥٧.

(٢) بڕوانە: ٢٢٠٣.

(٣) کە بۆ کڕیار بێت.

شَيْئًا، قَالَتْ لَهَا عَائِشَةُ ارْجِعِي إِلَى أَهْلِكِ، فَإِنْ أَحَبُّوا أَنْ أَقْضِيَ عَنْكِ كِتَابَتَكِ، وَيَكُونَ وَلاَؤُكِ لِي فَعَلْتُ. فَذَكَرَتْ ذَلِكَ بَرِيرَةُ إِلَى أَهْلِهَا فَأَبَوْا وَقَالُوا: إِنْ شَاءَتْ أَنْ تَحْتَسِبَ عَلَيْكِ فَلْتَفْعَلْ، وَيَكُونَ لَنَا وَلاَؤُكِ. فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ لَهَا: "ابْتَاعِي فَأَعْتِقِي، فَإِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ".

## ٣- باسی مەرجدانان لە مامەڵەی كڕین و فرۆشتندا

**٢٧١٧- عورِوه دەڵێ: عائیشه ﷺ پێی وت: كه بەریرە هات بۆ لای عائیشەو داوای هاوكاری لێ كرد لە نووسراوی ئازادبوونیدا، كه هێشتا هیچی نەدابوو بۆ نووسراوی ئازادكردنەكەی، عائیشەش پێی وت: بڕۆرەوە بۆ لای خاوەنەكەت، ئەگەر پێیان خۆشە من پارەی نووسراوی ئازادبوونەكەت لەجیاتی تۆ دەدەم، بەڵام هەقداریت (وەلائت) بۆ من بێت، ئەوە من ئەوكارە دەكەم، بەریرەش ئەوەی لای خاوەنەكانی باس كردبوو، بەڵام ڕازی نەبوون، وە وتبوویان: ئەگەر عائیشە دەیەوێ پارەكەی لەجیاتی تۆ بدات با وا بكات، بەڵام دەبێ هەقداریت (وەلائت) بۆ ئێمە بێت، عائیشەش ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس كردبوو، پێغەمبەریش بە عائیشەی فەرموو: ((بیكڕە و ئازادی بكە، چونكە بێگومان هەقداری (وەلائی) بۆ ئەو كەسەیە ئازادی دەكات)).**

## ٤- بَابٌ: إِذَا اشْتَرَطَ البَائِعُ ظَهْرَ الدَّابَّةِ إِلَى مَكَانٍ مُسَمًّى، جَازَ

٢٧١٨- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ قَالَ: سَمِعْتُ عَامِرًا يَقُولُ: حَدَّثَنِي جَابِرٌ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَسِيرُ عَلَى جَمَلٍ لَهُ قَدْ أَعْيَا، فَمَرَّ النَّبِيُّ ﷺ فَضَرَبَهُ، فَدَعَا لَهُ، فَسَارَ بِسَيْرٍ لَيْسَ يَسِيرُ مِثْلَهُ ثُمَّ قَالَ: "بِعْنِيهِ بِوَقِيَّةٍ". قُلْتُ: لَا. ثُمَّ قَالَ: "بِعْنِيهِ بِوَقِيَّةٍ". فَبِعْتُهُ، فَاسْتَثْنَيْتُ حُمْلاَنَهُ

إِلَى أَهْلِي، فَلَمَّا قَدِمْنَا أَتَيْتُهُ بِالجَمَلِ، وَنَقَدَنِي ثَمَنَهُ، ثُمَّ انْصَرَفْتُ، فَأَرْسَلَ عَلَى إِثْرِي، قَالَ: "مَا كُنْتُ لآخُذَ جَمَلَكَ، فَخُذْ جَمَلَكَ ذَلِكَ فَهْوَ مَالُكَ"(١).

قَالَ شُعْبَةُ، عَنْ مُغِيرَةَ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ جَابِرٍ: أَفْقَرَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ ظَهْرَهُ إِلَى المَدِينَةِ. وَقَالَ إِسْحَاقُ عَنْ جَرِيرٍ عَنْ مُغِيرَةَ: فَبِعْتُهُ عَلَى أَنَّ لِي فَقَارَ ظَهْرِهِ حَتَّى أَبْلُغَ المَدِينَةَ. وَقَالَ عَطَاءٌ وَغَيْرُهُ: "لَكَ ظَهْرُهُ إِلَى المَدِينَةِ"، وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ المُنْكَدِرِ عَنْ جَابِرٍ: شَرَطَ ظَهْرَهُ إِلَى المَدِينَةِ. وَقَالَ زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ، عَنْ جَابِرٍ: "وَلَكَ ظَهْرُهُ حَتَّى تَرْجِعَ". وَقَالَ أَبُو الزُّبَيْرِ عَنْ جَابِرٍ: "أَفْقَرْنَاكَ ظَهْرَهُ إِلَى المَدِينَةِ". وَقَالَ الأَعْمَشُ، عَنْ سَالِمٍ عَنْ جَابِرٍ: "تَبَلَّغْ عَلَيْهِ إِلَى أَهْلِكَ". وَقَالَ عُبَيْدُ اللهِ، وَابْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ وَهْبٍ عَنْ جَابِرٍ: اشْتَرَاهُ النَّبِيُّ ﷺ بِوَقِيَّةٍ. وَتَابَعَهُ زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ، عَنْ جَابِرٍ. وَقَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ وَغَيْرِهِ، عَنْ جَابِرٍ: "أَخَذْتُهُ بِأَرْبَعَةِ دَنَانِيرَ". وَهَذَا يَكُونُ وَقِيَّةً عَلَى حِسَابِ الدِّينَارِ بِعَشَرَةِ دَرَاهِمَ. وَلَمْ يُبَيِّنِ الثَّمَنَ مُغِيرَةُ عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرٍ، وَابْنُ المُنْكَدِرِ وَأَبُو الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ. وَقَالَ الأَعْمَشُ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ جَابِرٍ: وَقِيَّةُ ذَهَبٍ. وَقَالَ أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ جَابِرٍ: بِمِائَتَيْ دِرْهَمٍ. وَقَالَ دَاوُدُ بْنُ قَيْسٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ مِقْسَمٍ، عَنْ جَابِرٍ: اشْتَرَاهُ بِطَرِيقِ تَبُوكَ أَحْسِبُهُ قَالَ: بِأَرْبَعِ أَوَاقٍ- وَقَالَ أَبُو نَضْرَةَ، عَنْ جَابِرٍ: اشْتَرَاهُ بِعِشْرِينَ دِينَارًا.

وَقَوْلُ الشَّعْبِيِّ: بِوَقِيَّةٍ، أَكْثَرُ. الاِشْتِرَاطُ أَكْثَرُ وَأَصَحُّ عِنْدِي. قَالَهُ أَبُو عَبْدِ اللهِ(٢).

## ٤- باسێک: ئەگەر فرۆشیار سواربوونی وڵاخەکەی بەمەرج گرت تا شوێنێکی دیاریکراو دروستە

**٢٧١٨- عامیر دەڵێ: جابیر ﷺ بۆی گێڕامەوە کە ئەو بەسواری وشترێکی خۆی دەڕۆیشت کە ماندوو بوو بوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەلایدا ڕۆیشت، (گۆچانێکی) لە**

(١) بڕوانە: ٤٤٣.

(٢) بڕوانە: ٤٤٣.

وشترەکە دا و دوعا و نزای بۆ کرد، جا وشترەکە ڕۆیشتنێك ڕۆیشت وێنەی نەبوو، پاشان فەرمووی: ((بە ئۆقییەك پێم بفرۆشە))، وتم: نایفرۆشم، پاشان فەرمووی: ((بەئۆقییەك پێم بفرۆشە))، منیش پێم فرۆشت و سواربوونی تاماڵەوەمانم بەمەرج گرت، جا کە هاتینەوە (بۆ مەدینە) وشترەکەم بۆ برد، نرخەکەی بەحازر پێدام، پاشان گەڕامەوە، ناردی بەشوێنمدا و (ڕۆیشتمەوە)، فەرمووی: ((من وشترەکەی تۆ وەرناگرم، دەی ئەوە وشترەکەتە بیبە بۆ خۆت، ئەو وشترە ماڵی خۆتە)). شوعبە دەگێڕێتەوە لە موغیرەوە لە عامیرەوە لە جابیرەوە ﷺ گێڕایەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سواربوونی پشتی وشترەکەی تا مەدینە پێدام. ئیسحاق دەگێڕێتەوە لە جەریرەوە لە موغەیرەوە (جابیر) دەڵێ: جا وشترەکەم پێ فرۆشت بەمەرجێك سواربوونی پشتیم بۆ هەبێ هەتا دەگەمەوە مەدینە. وە عەتاو کەسانی تر دەڵێن: (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی): ((سواربوونی پشتی بۆ تۆ بێت تا مەدینە)). وە موحەممەدی کوڕی مونکەدیر لەجابیرەوە دەگێڕێتەوە: سواربوونی بەمەرج گرت تا مەدینە. وە زەیدی کوڕی ئەسلەم دەگێڕێتەوە لە جابیرەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سواربوونی بۆ تۆ بێت تا دەگەڕێیتەوە (بۆ ماڵەوە) )). ئەبو زوبەیر لە جابیرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((سواربوونی پشتیت پێ دەدەین تا دەگەیتەوە مەدینە)). وە ئەعمەش دەگێڕێتەوە لە سالیمەوە، ئەویش لە جابیرەوە کە فەرموویەتی: ((بە سواریەوە بگەڕێرەوە ماڵەوەتان)). عوبەیدوڵڵا و ئیبنو ئیسحاق لە وەهبەوە دەگێڕنەوە لە جابیرەوە: کە پێغەمبەر ﷺ وشترەکەی بەئۆقییەك کڕی. وە زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە جابیرەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی وەهبی کردووە. (لە باسکردنی ئۆقییەدا). وە ئیبنوجورەیج لەعەتاوکەسانی ترەوە گێڕاویەتیەوە لەجابیرەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((وشترەکەم بەچوار دینار وەرگرت و کڕی))، ئەمەش لە کاتێکدا وایە کە بەئۆقییەك

فرۆشراوە، كە دینارێك بە دە درهەم بێت. وە گێڕانەوەكەی موغیرە لە شەعبیەوە لە جابیرەوە نرخەكەی دیاری نەكردوە. هەروەها گێڕانەوەی ئیبنو مونكەدیر و ئەبو زوبەیر لە جابیرەوە نرخەكەی دیاری نەكردوە. وە ئەعمەش لە سالیمەوە لە جابیرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: بەئۆقییەكی ئاڵتون (فرۆشتی). ئەبو ئیسحاق دەگێڕێتەوە لە سالیمەوە لە جابیرەوە دەڵێ: بەدوو سەد درهەم (لێی كڕی). وە داودی كوڕی قەیس دەگێڕێتەوە لە عوبەیدوڵلای كوڕی میقسەم لە جابیرەوە دەڵێ: لەڕێگای تەبوك لێی كڕی، وابزانم وتی: بەچوار ئۆقییە. ئەبو نەزرە لە جابیرەوە دەگێڕێتەوە كە وتی: بەبیست دینار كڕی.

(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) وتەی شەعبی كە دەڵێ: ((بەئۆقییەك)) زۆرتر وایان گێڕاوەتەوە. وە مەرج گرتنەكە زۆرتری گێڕانەوەكان وا دەڵێن لای من ئەوە ڕاسترە. ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) وای وتووە.

## ٥- بابُ الشُّرُوطِ فِي المُعَامَلَةِ

٢٧١٩- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَتِ الأَنْصَارُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: اقْسِمْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ إِخْوَانِنَا النَّخِيلَ. قَالَ: "لَا". فَقَالَ: تَكْفُونَا المَئُونَةَ وَنُشْرِكُكُمْ فِي الثَّمَرَةِ. قَالُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا[1].

## ٥- باسی مەرج دانان لە مامەڵەدا[2]

٢٧١٩- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: ئەنصارییەكان بەپێغەمبەریان ﷺ وت: دارخورماكان بەش بكە لە نێوان ئێمە و برا كۆچەرییەكانماندا، فەرمووی ﷺ:

---

(١) بڕوانە: ٢٣٢٥.

(٢) زەوی و زار بەكرێدان بێت یان هەر شتێكی تر.

((نابێت))، ئینجا ئەنصارییەکان وتیان: ئێوە ئاودێری و خزمەتی بکەن، ئێمەش لە بەروبوومەکەیدا بەشدارتان دەکەین، وتیان: گوێڕایەڵ و فەرمان بەردارین.

٢٧٢٠- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ بْنُ أَسْمَاءَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: أَعْطَى رَسُولُ اللهِ ﷺ خَيْبَرَ اليَهُودَ أَنْ يَعْمَلُوهَا وَيَزْرَعُوهَا، وَلَهُمْ شَطْرُ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا[1].

**٢٧٢٠- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (زەوی و زاری) خەیبەری دا بە جوولەکەکانی (خەیبەر)، کە سەرپەرشتی باخەکانی بکەن (بەچاککردنی جۆگە و ئاودێرانیان)، زەوییەکانیشی بکەن بە کشتوکاڵ، نیوەی بەرهەمەکەی بۆ ئەوان بێت[2].**

## ٦- بابُ الشُّرُوطِ فِي المَهْرِ عِنْدَ عُقْدَةِ النِّكَاحِ

وَقَالَ عُمَرُ: إِنَّ مَقَاطِعَ الحُقُوقِ عِنْدَ الشُّرُوطِ، وَلَكَ مَا شَرَطْتَ. وَقَالَ المِسْوَرُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ ذَكَرَ صِهْرًا لَهُ فَأَثْنَى عَلَيْهِ فِي مُصَاهَرَتِهِ فَأَحْسَنَ، قَالَ: "حَدَّثَنِي وَصَدَقَنِي، وَوَعَدَنِي فَوَفَى لِي".

## ٦- باسی مەرجدانان لە مارەییدا کاتی مارەبڕین

**عومەر ﷺ دەڵێ: بێگومان وتەی یەکلاکەرەوەی مافەکان لەمەرجەکاندایە، وە ئەوەت بۆ هەیە کە بە مەرجت داناوە. وە میسوەر ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست باسی زاوایەکی کردو ستایشی کرد کە بەچاکی هەڵسوکەوتی کرد بەرانبەر زاوایەتییەکەی، فەرمووی: ((قسەی لەگەڵ کردم و ڕاستگۆ بوو لەگەڵم، بەڵێنیشی پێدام و بەڵێنەکەی بەجێهێنا بەرانبەرم)).**

(١) بڕوانە: ٢٢٨٥.

(٢) نیوەکەی تریشی بۆ موسڵمانان بێت.

**٢٧٢١**- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنُ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "أَحَقُّ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الفُرُوجَ"[١].

**٢٧٢١- عوقبەی كوڕی عامیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((شیاوترین مەرجەكان كە جێبەجێی بكەن و بیبەنە سەر ئەو مەرجانەن كە ئافرەتانی پێ حەڵاڵ دەكەن بۆ خۆتان[٢])).**

## ٧- بابُ الشُّرُوطِ فِي المُزَارَعَةِ

**٢٧٢٢**- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: سَمِعْتُ حَنْظَلَةَ الزُّرَقِيَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ ﷺ يَقُولُ: كُنَّا أَكْثَرَ الأَنْصَارِ حَقْلًا، فَكُنَّا نُكْرِي الأَرْضَ، فَرُبَّمَا أَخْرَجَتْ هَذِهِ وَلَمْ تُخْرِجْ ذِهِ، فَنُهِينَا عَنْ ذَلِكَ، وَلَمْ نُنْهَ عَنِ الوَرِقِ[٣].

## ٧- باسی مەرجەكان لە كشتیاریدا

**٢٧٢٢- ڕافیعی كوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: ئێمە لەناو ئەنصارییەكاندا زەوی و زارمان لە هەموویان زیاتر بوو، جا ئێمە زەویمان دەدا بە موڵكانە[٤]، جا هەندێك جار ئەمەیان بەروبوومی دەبوو، ئەویان بەروبوومی نەدەبوو، بۆیە ئەو بەكرێدانەمان لێ قەدەغە كرا، بەڵام بەكرێدانی زەوی و زار بە زیومان لێ قەدەغە نەكرا.**

(١) بڕوانە: ٥١٥١.

(٢) دروست بوونی سەرجێییان بۆ خۆتان حەڵاڵ دەكەن.

(٣) بڕوانە: ٢٢٨٦.

(٤) بەبەشێكی دیاری كراوی زەوییەكە بەرهەمەكەی بۆ خاوەن زەوییەكە (ئەوەكەشی بۆ وەرزێرەكە).

## ٨- بابُ مَا لَا يَجُوزُ مِنَ الشُّرُوطِ فِي النِّكَاحِ

٢٧٢٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "لَا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ، وَلَا تَنَاجَشُوا، وَلَا يَزِيدَنَّ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، وَلَا يَخْطُبَنَّ عَلَى خِطْبَتِهِ، وَلَا تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلَاقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَكْفِئَ إِنَاءَهَا"[١].

## ٨- باسی ئەو مەرجانەی لە مارەبڕیندا دروست نین

**٢٧٢٣- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((شارنشین شت نەفرۆشێت بۆ گوندنشین، وە زەمکاری مەکەن بەسەریەکتریدا بەفێڵ، کەس کڕین و فرۆشتن نەکات بەسەر کڕین و فرۆشتنی براکەیدا بە زیاتر، وە خوازبێنی ئافرەت نەکات بەسەر خوازبێنی براکەیدا، وە ئافرەت داوای تەڵاقدانی خوشکەکەی نەکات تا ئەوەی لە دەفرەکەیدایە بیڕێژێ و دەفرەکەی سەرەونخون بکاتەوە[٢])).**

## ٩- بابُ الشُّرُوطِ الَّتِي لَا تَحِلُّ فِي الْحُدُودِ

٢٧٢٤- ٢٧٢٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ أَنَّهُمَا قَالَا: إِنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَعْرَابِ أَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنْشُدُكَ اللهَ إِلَّا قَضَيْتَ لِي بِكِتَابِ اللهِ. فَقَالَ الْخَصْمُ الْآخَرُ -وَهُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ- نَعَمْ فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ، وَائْذَنْ لِي. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "قُلْ". قَالَ إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا عَلَى هَذَا، فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، وَإِنِّي أُخْبِرْتُ أَنَّ

---

(١) بڕوانە: ٢١٤٠.

عَلَى ابْنِي الرَّجْمَ، فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَوَلِيدَةٍ، فَسَأَلْتُ أَهْلَ العِلْمِ فَأَخْبَرُونِي أَنَّمَا عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ، وَتَغْرِيبُ عَامٍ وَأَنَّ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا الرَّجْمَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللهِ، الوَلِيدَةُ وَالغَنَمُ رَدٌّ، وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، اغْدُ يَا أُنَيْسُ إِلَى امْرَأَةِ هَذَا فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا". قَالَ: فَغَدَا عَلَيْهَا فَاعْتَرَفَتْ، فَأَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللهِ - ﷺ فَرُجِمَتْ[1].

## ٩- باسی ئەو مەرجانە کە لە (جێ بەجێکردنی) سنوورەکاندا دروست نین

**٢٧٢٤- ٢٧٢٥- ئەبو هورەیرە و زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ هەردووکیان دەڵێن: پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوانماندا بەکتێبەکەی خوا بڕیار بدە، وە پیاوەکەی بەرانبەری-کە لەو تێگەشتووتر بوو- وتی: بەڵێ لە نێوانماندا بەکتێبەکەی خوا بڕیاربدە، وە مۆڵەتی من بدە (قسە بکەم)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((قسە بکە))، وتی: بێگومان کوڕەکەی من کرێکار بووە لای ئەم پیاوەو زینای کردووە لەگەڵ خێزانەکەیدا، وە من پێم وترا، کە بە دڵنیاییەوە کوڕەکەی من بەردبارانکردنی لەسەرە، منیش سەد سەر مەڕ و کەنیزەکێك بریتیم دا پێی (تا کوڕەکەم ڕەجم نەکرێ)، پاشان پرسیارم لە زانایان کرد و پێیان وتم: کە کوڕەکەم سەد شەلاق و یەك ساڵ دوورخستنەوەی لەسەرە، وە ژنی ئەم پیاوەش بەردبارانکردنی لەسەرە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە بەکتێبەکەی خوا بڕیاردەدەم لە نێوانتاندا، جا کەنیزەك و سەد مەڕەکە ئەوە دەگەڕێتەوە (بۆ تۆ)، کوڕەکەشت سەد شەلاق و یەك ساڵ**

---

(١) بڕوانە: ٢٣١٤، ٢٣١٥.

**دوورخستنەوەی لەسەرە، ئینجا تۆش ئونەیس برۆ بۆ لای ژنی ئەم پیاوە و ئەگەر دانی نا بە زیناکەیدا، ئەوە بەردبارانی بکە))، جا ئەنەسیش بەیانییەکەی ڕۆیشت بۆ لای ئافرەتەکەو دانی بە زیناکەیدا نا، ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بۆ دەرکرد و بەردباران کرا.**

## ١٠- بابُ مَا يَجُوزُ مِنْ شُرُوطِ المُكَاتَبِ إِذَا رَضِيَ بِالبَيْعِ عَلَى أَنْ يُعْتَقَ

٢٧٢٦- حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ بْنُ أَيْمَنَ المَكِّيُّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلَتْ عَلَيَّ بَرِيرَةُ وَهْيَ مُكَاتَبَةٌ، فَقَالَتْ يَا أُمَّ المُؤْمِنِينَ اشْتَرِينِي فَإِنَّ أَهْلِي يَبِيعُونِي فَأَعْتِقِينِي. قَالَتْ نَعَمْ. قَالَتْ: إِنَّ أَهْلِي لَا يَبِيعُونِي حَتَّى يَشْتَرِطُوا وَلاَئِي. قَالَتْ لَا حَاجَةَ لِي فِيكِ. فَسَمِعَ ذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ أَوْ بَلَغَهُ، فَقَالَ: "مَا شَأْنُ بَرِيرَةَ؟ " فَقَالَ: "اشْتَرِيهَا فَأَعْتِقِيهَا وَلْيَشْتَرِطُوا مَا شَاءُوا". قَالَتْ: فَاشْتَرَيْتُهَا فَأَعْتَقْتُهَا، وَاشْتَرَطَ أَهْلُهَا وَلاَءَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ، وَإِنِ اشْتَرَطُوا مِائَةَ شَرْطٍ"[١].

## ١٠- باسی ئەوەی کە دروستە لە مەرجەکانی نووسراو لەگەڵداکراو ئەگەر ڕازی بوو بەفرۆشتنی لەپێناو ئازادکردنیدا

**٢٧٢٦- عەبدولواحیدی کوڕی ئەیمەنی مەکی لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای عائیشە ﵂ وتی: بەریرە هات بۆ لام کە نووسراوی ئازادکردنی لەگەڵ نووسرابوو، وتی: ئەی دایکی باوەڕداران! بمکڕەوە، چونکە بەدڵنیاییەوە خاوەنەکانم دەمفرۆشن و ئازادم بکە، عائیشەش وتی: بەڵێ باشە، بەریرە وتی: بێگومان خاوەنەکانم نامفرۆشن هەتا بەمەرجی نەگرن هەقداری (وەلائی) من**

---

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

بۆ ئەوان نەبێ، عائیشە وتی: من پێویستیم بە (کڕینی) تۆ نییە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ گوێی لەم باسە بوو یان پێی گەیشت، بۆیە فەرمووی: ((کاری بەریرە چییە؟))، جا فەرمووی: ((بیکڕەو ئازادی بکە با هەر مەرجێك دەیانەوێ دایبنێن))، عائیشە وتی: منیش کڕیم و ئازادم کرد، خاوەنەکەشی هەقداریان (وەلائیان) بەمەرج گرت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەقداری (وەلائی) بۆ ئەو کەسەیە ئازادی دەکات، با سەد مەرجیش دانێن)).

## ١١- بابُ الشُّرُوطِ فِي الطَّلاَقِ

وَقَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ وَالحَسَنُ وَعَطَاءٌ: إِنْ بَدَأَ بِالطَّلاَقِ أَوْ أَخَّرَ فَهُوَ أَحَقُّ بِشَرْطِهِ.

## ١١- باسی مەرج دانان لە تەڵاق داندا

ئیبنو موسەییەب و حەسەن و عەتا دەڵێن: ئەگەر پیاوێك تەڵاقەکە پێشبخات (لەمەرجەکە) یان دوای بخات[1] لەمەرجەکە، ئەوە ئەو کەسە خۆی شیاوترە بەمەرجەکەی.

٢٧٢٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ التَّلَقِّي، وَأَنْ يَبْتَاعَ المُهَاجِرُ لِلأَعْرَابِيِّ، وَأَنْ تَشْتَرِطَ المَرْأَةُ طَلاَقَ أُخْتِهَا، وَأَنْ يَسْتَامَ الرَّجُلُ عَلَى سَوْمِ أَخِيهِ، وَنَهَى عَنِ النَّجْشِ، وَعَنِ التَّصْرِيَةِ. تَابَعَهُ مُعَاذٌ وَعَبْدُ الصَّمَدِ عَنْ شُعْبَةَ. وَقَالَ غُنْدَرٌ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ: نُهِيَ. وَقَالَ آدَمُ: نُهِينَا. وَقَالَ النَّضْرُ، وَحَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ: نَهَى[2].

(١) تەڵاقەکە پێشخات بڵێ بەخێزانی: تەڵاقت کەوتبێت ئەگەر بڕۆیتە ژوورەوە، یان تەڵاقەکەی دوابخات بڵێ: ئەگەر بڕۆیتە ژوورەوە تەڵاقت کەوتبێ.

(٢) بڕوانە: ٢١٤٠.

**٢٧٢٧- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لەبەپیرەوە چوون(ی کاروان)، وە شارنشین کاڵا بفرۆشێت بۆ گوندنشین، وە ئافرەت (بۆ شووکردنی) مەرجی تەڵاقدانی خوشکەکەی دانێت، وە پیاو مامەڵە بکات بەسەر مامەڵەی براکەیدا، وە ڕێگری کرد لە زەمکاری بەسەر یەکتردا بەفێڵ، وە ڕێگری کرد لەگوان بەستنی ئاژەڵ[1]. موعاز و عەبدوصەمەد لە شوعبەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوەو پاڵپشتی گێڕانەوەکەی موحەممەدی کوڕی عەرعەریان کردووە (لەوەدا کە بەڕوون و ئاشکرا ئەم فەرموودەی داوەتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ). وە غوندەر و عەبدوڕەحمان بەم جۆرە گێڕاویانەتەوە: (نُهِيَ) واتە: ڕێگری کراوە[2]. وە ئادەم دەڵێ: (نُهِينَا) ڕێگریمان لێکراوە[3]. وە نەزر و حەججاجی کوڕی مینهال دەڵێن: (نَهَى)، واتە: ڕێگری کرد.**

## ١٢- بابُ الشُّرُوطِ مَعَ النَّاسِ بِالقَوْلِ

**٢٧٢٨-** حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي يَعْلَى بْنُ مُسْلِمٍ، وَعَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ -يَزِيدُ أَحَدُهُمَا عَلَى صَاحِبِهِ، وَغَيْرُهُمَا قَدْ سَمِعْتُهُ يُحَدِّثُهُ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ- قَالَ: إِنَّا لَعِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: حَدَّثَنِي أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مُوسَى رَسُولُ اللهِ" فَذَكَرَ الحَدِيثَ. ﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ ﴾ الكهف، كَانَتِ الأُولَى نِسْيَانًا، وَالوُسْطَى شَرْطًا، وَالثَّالِثَةُ عَمْدًا ﴿ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴿٧٣﴾ ﴾ الكهف. ﴿ لَقِيَا غُلَامًا فَقَتَلَهُۥ ﴿٧٤﴾ ﴾ الكهف. ﴿ فَٱنطَلَقَا ...... فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ ﴿٧٧﴾ ﴾ الكهف. قَرَأَهَا ابْنُ عَبَّاسٍ: ﴿ أَمَامَهُمْ مَلِكٌ ﴾[4].

---

(١) چەند ڕۆژێک نایدۆشن بۆ ئەوەی خەڵکی پێ بخەڵەتێنن کە گوایە شیری زۆرە.

(٢) بەئاشکرا نەیداوەتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ.

(٣) بەئاشکرا نەیداوەتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ.

(٤) بروانە: ٧٤.

## ١٢- باسی مەرجدانان لەگەڵ خەڵكدا تەنها بەقسە

**٢٧٢٨- سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێ: من لای عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسدا بووم وتی: ئوبەی كوڕی كەعب بۆی گێڕامەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مووسا ﷺ پێغەمبەری خوایە))، جا فەرموودەكەی باسكرد، فەرمووی: (من نەموت تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا دان بەخۆتدا بگری)، یەكەمجار لەبیرچوون بوو، ناوەندیەكەیان مەرج بوو، سێیەمەكەیان بەئەنقەست بوو، (بۆ یەكەمەكەیان) (وتی: لێم ببورە، لەبەرئەوەی لەبیرم چوو، وە ئەم زانیاری فێربوونەم لەسەر قورس مەكە)، (گەیشتن بەتازە لاوێك، یەكسەر كوشتی)، (ئینجا هەردووكیان ڕۆیشتن...... بینیان دیوارێك نزیك بوو بكەوێت، (بەندە چاكەكە) دیوارەكەی چاك كردەوە)، ئیبنو عەبباس (لە جیاتی: ﴿وَرَآءَهُم مَّلِكٌ ﴾) بە ﴿ أَمَامَهُمْ مَلِكٌ ﴾ خوێندوویەتیەوە[١].**

## ١٣- بَابُ الشُّرُوطِ فِي الوَلاَءِ

**٢٧٢٩-** حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ جَاءَتْنِي بَرِيرَةُ فَقَالَتْ: كَاتَبْتُ أَهْلِي عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ، فِي كُلِّ عَامٍ أُوقِيَّةٌ، فَأَعِينِينِي. فَقَالَتْ: إِنْ أَحَبُّوا أَنْ أَعُدَّهَا لَهُمْ، وَيَكُونَ وَلاَؤُكِ لِي فَعَلْتُ. فَذَهَبَتْ بَرِيرَةُ إِلَى أَهْلِهَا، فَقَالَتْ لَهُمْ، فَأَبَوْا عَلَيْهَا، فَجَاءَتْ مِنْ عِنْدِهِمْ وَرَسُولُ اللهِ ﷺ جَالِسٌ، فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ عَرَضْتُ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ فَأَبَوْا إِلَّا أَنْ يَكُونَ الوَلاَءُ لَهُمْ. فَسَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ فَأَخْبَرَتْ عَائِشَةُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: "خُذِيهَا وَاشْتَرِطِي لَهُمُ الوَلاَءَ، فَإِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ". فَفَعَلَتْ عَائِشَةُ، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي النَّاسِ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: "مَا بَالُ رِجَالٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي

---

(١) واتە: وشەی {وَرَآءَهُم} بە {أَمَامَهُمْ} خوێندۆتەوە، بەمانای لەپێشیانەوە پاشایەک هەبوو.

كِتَابِ اللهِ؟! مَا كَانَ مِنْ شَرْطٍ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ فَهْوَ بَاطِلٌ، وَإِنْ كَانَ مِائَةَ شَرْطٍ، قَضَاءُ اللهِ أَحَقُّ، وَشَرْطُ اللهِ أَوْثَقُ، وَإِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ" [1].

## ١٣- باسی مەرجەكان لەهەقداریدا

**٢٧٢٩- عائیشە ﵂ دەڵێ: بەریرە هات بۆ لام وتی: نووسراوی ئازادبوونم لەگەڵ خاوەنەكەمدا نوسیووە لەسەر نۆ ئوقییە[2]، لەهەر ساڵێكدا ئوقییەك بدەم، جا تۆش هاوكاریم بكە، عائیشەش ﵂ وتی: ئەگەر خاوەنەكانت پێیان خۆشە من ئەو نۆ ئوقێیەیان پێ دەدەم، لەبەرانبەردا هەقداریت (وەلائت) بۆ من بێت، ئەوە من ئەم كارە دەكەم، بەریرەش ڕۆیشت بۆ لای خاوەنەكەی، وتەكەی عائیشەی ﵂ پێ وتبوون، پێی ڕازی نەبوون، جا لای ئەوانەوە هاتەوە (بۆ لای من) و پێغەمبەری خواش ﷺ دانیشتبوو، بەریرە وتی: من ئەوەی وتت خستمە بەردەمیان، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون، تەنها بەوە نەبێت كە هەقداریم (وەلائم) بۆ ئەوان بێت، پێغەمبەریش ﷺ گوێی لێ بوو، عائیشەش هەواڵەكەی بەپێغەمبەر ﷺ دا، ئەویش فەرمووی: ((وەریگرە و بیكڕە، مەرجی هەقداریش دانێ بۆ ئەوان، چونكە بێگومان هەقداری بۆ ئەو كەسەیە كە ئازادی دەكات)). (عورِوە دەڵێ:) عائیشە بەو جۆرەی كرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو خەڵكەكەدا هەستایە سەرپێ و سوپاس و ستایشی خوای كرد، پاشان فەرمووی: ((ئەوە كەسانێك چییانە هەندێ مەرج دادەنێن كە لەكتێبی خوادا نییە؟ هەر مەرجێك لە كتێبی خوادا نەبێت دروست نییە، با سەد مەرجیش دانێت، بڕیاری خوا ڕاسترە، وە مەرجی خوا بەهێزترە، وە بێگومان هەقداری بۆ ئەو كەسەیە (كۆیلە یان كەنیزەكەكە) ئازاد دەكات)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

(٢) ئوقییەک چل درهەمە.

## ١٤ - بابٌ: إِذَا اشْتَرَطَ فِي الْمُزَارَعَةِ: إِذَا شِئْتُ أَخْرَجْتُكَ

٢٧٣٠- حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى أَبُو غَسَّانَ الكِنَانِيُّ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: لَمَّا فَدَعَ أَهْلُ خَيْبَرَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، قَامَ عُمَرُ خَطِيبًا فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ عَامَلَ يَهُودَ خَيْبَرَ عَلَى أَمْوَالِهِمْ، وَقَالَ: "نُقِرُّكُمْ مَا أَقَرَّكُمُ اللهُ". وَإِنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ خَرَجَ إِلَى مَالِهِ هُنَاكَ فَعُدِيَ عَلَيْهِ مِنَ اللَّيْلِ، فَفُدِعَتْ يَدَاهُ وَرِجْلَاهُ، وَلَيْسَ لَنَا هُنَاكَ عَدُوٌّ غَيْرُهُمْ، هُمْ عَدُوُّنَا وَتُهَمَتُنَا، وَقَدْ رَأَيْتُ إِجْلَاءَهُمْ، فَلَمَّا أَجْمَعَ عُمَرُ عَلَى ذَلِكَ أَتَاهُ أَحَدُ بَنِي أَبِي الحُقَيْقِ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ، أَتُخْرِجُنَا وَقَدْ أَقَرَّنَا مُحَمَّدٌ ﷺ وَعَامَلَنَا عَلَى الأَمْوَالِ، وَشَرَطَ ذَلِكَ لَنَا؟! فَقَالَ عُمَرُ: أَظَنَنْتَ أَنِّي نَسِيتُ قَوْلَ رَسُولِ اللهِ ﷺ: "كَيْفَ بِكَ إِذَا أُخْرِجْتَ مِنْ خَيْبَرَ تَعْدُو بِكَ قَلُوصُكَ، لَيْلَةً بَعْدَ لَيْلَةٍ"؟!. فَقَالَ: كَانَتْ هَذِهِ هُزَيْلَةً مِنْ أَبِي القَاسِمِ. قَالَ: كَذَبْتَ يَا عَدُوَّ اللهِ. فَأَجْلَاهُمْ عُمَرُ، وَأَعْطَاهُمْ قِيمَةَ مَا كَانَ لَهُمْ مِنَ الثَّمَرِ مَالًا وَإِبِلًا وَعُرُوضًا، مِنْ أَقْتَابٍ وَحِبَالٍ وَغَيْرِ ذَلِكَ.

رَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ عُبَيْدِ، اللهِ أَحْسِبُهُ عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ اخْتَصَرَهُ.

## ١٤- باسێک: ئەگەر (خاوەن زەوییەکە) لە کشتیاریدا مەرجی وابوو: هەرکات ویستم دەردەکەم[1]

**٢٧٣٠- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: کاتێک جوولەکەکانی خەیبەر لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەریان دا و دەست و قاچیان لەجێ برد، عومەر ڕۆیشتە سەر دوانگەو وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ جوولەکەکانی خەیبەر ڕێککەوتبوو لەسەر (نیوەی) بەرهەمی زەوی و باخەکانیان، فەرمووبووی:**

---

(١) واتە: زەوییەکەت لێ دەسەنمەوە و لەم جێگایەش دەرتدەکەم، ئەمە ڕێککەوتنی پێغەمبەر بوو لەگەڵ جوولەکەکانی خەیبەردا.

((ئەوەندە دەتانهێڵمەوە کە خوا دەتانهێڵێتەوە))، وە بەڕاستی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕۆیشتووە بۆ سەر زەوی خۆی لەخەیبەر، کەچی لەشەودا هەڵیان کوتاوەتە سەری و هەردوو دەستی و هەردوو قاچیان لەجێ بردووە، وە لەخەیبەریش هیچ کەس دوژمنی ئێمە نییە جگە لەوان، هەر ئەوان دوژمنمانن و گومانمان لەوانە، وە بەڕاستی ڕام وایە جوولەکەکان لەخەیبەر دەربکەین، جا کاتێك عومەر یەکلابووەوە لەسەر ئەو بڕیارە، یەکێك لەکوڕەکانی بنەماڵەی ئەبو حوقەیق هات بۆ لای و وتی: ئەی پێشەوای بڕواداران! ئایا تۆ دەرمان دەکەیت لەکاتێکدا موحەممەد بڕیاری وابوو بمێنینەوە، وە لەسەر موڵکانەی زەوی و باخەکانمان لەگەڵمان ڕێککەوتووە ئەمەی بەمەرج بۆ داناوین؟ عومەریش وتی: تۆ وادەزانیت من ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوام ﷺ لەبیرچووەتەوە کە (بەئێوەی) فەرمووو: ((حاڵت چۆنە کاتێك لەخەیبەر دەردەکرێیت شەو لەدوای شەو[1] وشترە پشوودرێژەکانت بەخێرایی دەتبەن (دوورت دەخەنەوە لە حیجاز) ))، کوڕەکەی ئەبو حوقەیقیش وتی: ئەوە ئەبو قاسیم[2] بەگاڵتەوە وای وتووە، عومەر وتی: درۆت کرد ئەی دوژمنی خوا! ئینجا عومەر وەدەری نان و پێی چۆڵ کردن، نرخی هەرچیان هەبوو لە بەروبووم و موڵك و سامان و وشتر کەلوپەل و کورتانی وشتر و گوریس و شتی تر پێیدان و بۆی بژاردن. حەممادی کوڕی سەلەم ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە عەبدوڵڵاوە، وابزانم ئەویش لە نافیعەوە لە ئیبنو عومەرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، حەمماد کورتی کردۆتەوە.

---

(١) واتە: شەوانێکی زۆر دوور و درێژ بەسواریان دوور دەخرێتەوە لە خەیبەر.

(٢) مەبەستی پێغەمبەرە ﷺ، چونکە کونیەی ئەبو قاسم بووە.

## ١٥- بابُ الشُّرُوطِ فِي الجِهَادِ وَالمُصَالَحَةِ مَعَ أَهْلِ الحَرْبِ وَكِتَابَةِ الشُّرُوطِ

٢٧٣١- ٢٧٣٢- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ قَالَ: أَخْبَرَنِي الزُّهْرِيُّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، عَنِ المِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، وَمَرْوَانَ يُصَدِّقُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا حَدِيثَ صَاحِبِهِ- قَالَا: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زَمَنَ الحُدَيْبِيَةِ، حَتَّى كَانُوا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّ خَالِدَ بْنَ الوَلِيدِ بِالغَمِيمِ فِي خَيْلٍ لِقُرَيْشٍ طَلِيعَةً فَخُذُوا ذَاتَ اليَمِينِ". فَوَاللهِ مَا شَعَرَ بِهِمْ خَالِدٌ حَتَّى إِذَا هُمْ بِقَتَرَةِ الجَيْشِ، فَانْطَلَقَ يَرْكُضُ نَذِيرًا لِقُرَيْشٍ، وَسَارَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى إِذَا كَانَ بِالثَّنِيَّةِ التِي يُهْبَطُ عَلَيْهِمْ مِنْهَا، بَرَكَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ. فَقَالَ النَّاسُ: حَلْ حَلْ. فَأَلَحَّتْ، فَقَالُوا: خَلَأَتِ القَصْوَاءُ، خَلَأَتِ القَصْوَاءُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مَا خَلَأَتِ القَصْوَاءُ، وَمَا ذَاكَ لَهَا بِخُلُقٍ، وَلَكِنْ حَبَسَهَا حَابِسُ الفِيلِ" ثُمَّ قَالَ: "وَالذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يَسْأَلُونِي خُطَّةً يُعَظِّمُونَ فِيهَا حُرُمَاتِ اللهِ إِلَّا أَعْطَيْتُهُمْ إِيَّاهَا". ثُمَّ زَجَرَهَا فَوَثَبَتْ، قَالَ: فَعَدَلَ عَنْهُمْ حَتَّى نَزَلَ بِأَقْصَى الحُدَيْبِيَةِ عَلَى ثَمَدٍ قَلِيلِ المَاءِ يَتَبَرَّضُهُ النَّاسُ تَبَرُّضًا، فَلَمْ يُلَبِّثْهُ النَّاسُ حَتَّى نَزَحُوهُ، وَشُكِيَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ العَطَشُ، فَانْتَزَعَ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِهِ، ثُمَّ أَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهُ فِيهِ، فَوَاللهِ مَا زَالَ يَجِيشُ لَهُمْ بِالرِّيِّ حَتَّى صَدَرُوا عَنْهُ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ، إِذْ جَاءَ بُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاءَ الخُزَاعِيُّ فِي نَفَرٍ مِنْ قَوْمِهِ مِنْ خُزَاعَةَ -وَكَانُوا عَيْبَةَ نُصْحِ رَسُولِ اللهِ ﷺ مِنْ أَهْلِ تِهَامَةَ- فَقَالَ: إِنِّي تَرَكْتُ كَعْبَ بْنَ لُؤَيٍّ وَعَامِرَ بْنَ لُؤَيٍّ نَزَلُوا أَعْدَادَ مِيَاهِ الحُدَيْبِيَةِ، وَمَعَهُمُ العُوذُ المَطَافِيلُ، وَهُمْ مُقَاتِلُوكَ وَصَادُّوكَ عَنِ البَيْتِ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "إِنَّا لَمْ نَجِئْ لِقِتَالِ أَحَدٍ، وَلَكِنَّا جِئْنَا مُعْتَمِرِينَ، وَإِنَّ قُرَيْشًا قَدْ نَهِكَتْهُمُ الحَرْبُ، وَأَضَرَّتْ بِهِمْ، فَإِنْ شَاءُوا مَادَدْتُهُمْ مُدَّةً، وَيُخَلُّوا بَيْنِي وَبَيْنَ النَّاسِ، فَإِنْ أَظْهَرْ فَإِنْ شَاءُوا أَنْ يَدْخُلُوا فِيمَا دَخَلَ فِيهِ النَّاسُ فَعَلُوا، وَإِلَّا فَقَدْ جَمُّوا، وَإِنْ هُمْ أَبَوْا، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَأُقَاتِلَنَّهُمْ عَلَى أَمْرِي هَذَا حَتَّى تَنْفَرِدَ سَالِفَتِي، وَلَيُنْفِذَنَّ اللهُ أَمْرَهُ". فَقَالَ بُدَيْلٌ: سَأُبَلِّغُهُمْ مَا تَقُولُ. قَالَ: فَانْطَلَقَ حَتَّى أَتَى قُرَيْشًا قَالَ: إِنَّا قَدْ جِئْنَاكُمْ مِنْ هَذَا الرَّجُلِ، وَسَمِعْنَاهُ يَقُولُ قَوْلًا، فَإِنْ شِئْتُمْ أَنْ نَعْرِضَهُ عَلَيْكُمْ فَعَلْنَا، فَقَالَ سُفَهَاؤُهُمْ: لَا حَاجَةَ لَنَا أَنْ تُخْبِرَنَا

عَنْهُ بِشَيْءٍ. وَقَالَ ذَوُو الرَّأْيِ مِنْهُمْ: هَاتِ مَا سَمِعْتَهُ يَقُولُ. قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ كَذَا وَكَذَا، فَحَدَّثَهُمْ بِمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَامَ عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ فَقَالَ: أَيْ قَوْمِ، أَلَسْتُمْ بِالوَالِدِ؟ قَالُوا: بَلَى. قَالَ: أَوَلَسْتُ بِالوَلَدِ؟ قَالُوا: بَلَى. قَالَ: فَهَلْ تَتَّهِمُونِي؟. قَالُوا: لَا. قَالَ: أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنِّي اسْتَنْفَرْتُ أَهْلَ عُكَاظٍ، فَلَمَّا بَلَّحُوا عَلَيَّ جِئْتُكُمْ بِأَهْلِي وَوَلَدِي وَمَنْ أَطَاعَنِي؟ قَالُوا: بَلَى. قَالَ: فَإِنَّ هَذَا قَدْ عَرَضَ لَكُمْ خُطَّةَ رُشْدٍ، اقْبَلُوهَا وَدَعُونِي آتِهِ. قَالُوا: ائْتِهِ. فَأَتَاهُ، فَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ نَحْوًا مِنْ قَوْلِهِ لِبُدَيْلٍ، فَقَالَ عُرْوَةُ عِنْدَ ذَلِكَ: أَيْ مُحَمَّدُ، أَرَأَيْتَ إِنِ اسْتَأْصَلْتَ أَمْرَ قَوْمِكَ؟ هَلْ سَمِعْتَ بِأَحَدٍ مِنَ العَرَبِ اجْتَاحَ أَهْلَهُ قَبْلَكَ وَإِنْ تَكُنِ الأُخْرَى؟ فَإِنِّي وَاللهِ لأَرَى وُجُوهًا، وَإِنِّي لأَرَى أَوْشَابًا مِنَ النَّاسِ خَلِيقًا أَنْ يَفِرُّوا وَيَدَعُوكَ. فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ: امْصُصْ بِبَظْرِ اللاَّتِ، أَنَحْنُ نَفِرُّ عَنْهُ وَنَدَعُهُ؟! فَقَالَ: مَنْ ذَا قَالُوا: أَبُو بَكْرٍ. قَالَ: أَمَا وَالذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْلاَ يَدٌ كَانَتْ لَكَ عِنْدِي لَمْ أَجْزِكَ بِهَا لأَجَبْتُكَ. قَالَ: وَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ ﷺ، فَكُلَّمَا تَكَلَّمَ أَخَذَ بِلِحْيَتِهِ، وَالمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِ النَّبِيِّ ﷺ وَمَعَهُ السَّيْفُ وَعَلَيْهِ المِغْفَرُ، فَكُلَّمَا أَهْوَى عُرْوَةُ بِيَدِهِ إِلَى لِحْيَةِ النَّبِيِّ ﷺ ضَرَبَ يَدَهُ بِنَعْلِ السَّيْفِ، وَقَالَ لَهُ: أَخِّرْ يَدَكَ عَنْ لِحْيَةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ. فَرَفَعَ عُرْوَةُ رَأْسَهُ فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: المُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ. فَقَالَ: أَيْ غُدَرُ، أَلَسْتُ أَسْعَى فِي غَدْرَتِكَ؟ وَكَانَ المُغِيرَةُ صَحِبَ قَوْمًا فِي الجَاهِلِيَّةِ، فَقَتَلَهُمْ، وَأَخَذَ أَمْوَالَهُمْ، ثُمَّ جَاءَ فَأَسْلَمَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "أَمَّا الإِسْلاَمَ فَأَقْبَلُ، وَأَمَّا المَالَ فَلَسْتُ مِنْهُ فِي شَيْءٍ". ثُمَّ إِنَّ عُرْوَةَ جَعَلَ يَرْمُقُ أَصْحَابَ النَّبِيِّ ﷺ بِعَيْنَيْهِ. قَالَ: فَوَاللهِ مَا تَنَخَّمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ نُخَامَةً إِلَّا وَقَعَتْ فِي كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ، فَدَلَكَ بِهَا وَجْهَهُ وَجِلْدَهُ، وَإِذَا أَمَرَهُمُ ابْتَدَرُوا أَمْرَهُ، وَإِذَا تَوَضَّأَ كَادُوا يَقْتَتِلُونَ عَلَى وَضُوئِهِ، وَإِذَا تَكَلَّمَ خَفَضُوا أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَهُ، وَمَا يُحِدُّونَ إِلَيْهِ النَّظَرَ تَعْظِيمًا لَهُ، فَرَجَعَ عُرْوَةُ إِلَى أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: أَيْ قَوْمِ، وَاللهِ لَقَدْ وَفَدْتُ عَلَى المُلُوكِ، وَوَفَدْتُ عَلَى قَيْصَرَ وَكِسْرَى وَالنَّجَاشِيِّ، وَاللهِ إِنْ رَأَيْتُ مَلِكًا قَطُّ يُعَظِّمُهُ أَصْحَابُهُ مَا يُعَظِّمُ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ ﷺ مُحَمَّدًا، وَاللهِ إِنْ تَنَخَّمَ نُخَامَةً إِلَّا وَقَعَتْ فِي كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ، فَدَلَكَ بِهَا وَجْهَهُ وَجِلْدَهُ، وَإِذَا أَمَرَهُمُ

ابْتَدَرُوا أَمْرَهُ، وَإِذَا تَوَضَّأَ كَادُوا يَقْتَتِلُونَ عَلَى وَضُوئِهِ، وَإِذَا تَكَلَّمَ خَفَضُوا أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَهُ، وَمَا يُحِدُّونَ إِلَيْهِ النَّظَرَ تَعْظِيمًا لَهُ، وَإِنَّهُ قَدْ عَرَضَ عَلَيْكُمْ خُطَّةَ رُشْدٍ، فَاقْبَلُوهَا. فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي كِنَانَةَ: دَعُونِي آتِهِ. فَقَالُوا: ائْتِهِ. فَلَمَّا أَشْرَفَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَأَصْحَابِهِ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "هَذَا فُلَانٌ، وَهْوَ مِنْ قَوْمٍ يُعَظِّمُونَ الْبُدْنَ فَابْعَثُوهَا لَهُ". فَبُعِثَتْ لَهُ وَاسْتَقْبَلَهُ النَّاسُ يُلَبُّونَ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ! مَا يَنْبَغِي لِهَؤُلَاءِ أَنْ يُصَدُّوا عَنِ البَيْتِ، فَلَمَّا رَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ قَالَ: رَأَيْتُ البُدْنَ قَدْ قُلِّدَتْ وَأُشْعِرَتْ، فَمَا أَرَى أَنْ يُصَدُّوا عَنِ البَيْتِ. فَقَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ يُقَالُ لَهُ: مِكْرَزُ بْنُ حَفْصٍ. فَقَالَ: دَعُونِي آتِهِ. فَقَالُوا: ائْتِهِ. فَلَمَّا أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "هَذَا مِكْرَزٌ، وَهْوَ رَجُلٌ فَاجِرٌ". فَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ ﷺ، فَبَيْنَمَا هُوَ يُكَلِّمُهُ إِذْ جَاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو. قَالَ مَعْمَرٌ: فَأَخْبَرَنِي أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، أَنَّهُ لَمَّا جَاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "لَقَدْ سَهُلَ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ". قَالَ مَعْمَرٌ: قَالَ الزُّهْرِيُّ فِي حَدِيثِهِ: فَجَاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو فَقَالَ: هَاتِ، اكْتُبْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كِتَابًا، فَدَعَا النَّبِيُّ ﷺ الكَاتِبَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ". قَالَ سُهَيْلٌ: أَمَّا الرَّحْمَنُ فَوَاللهِ مَا أَدْرِي مَا هُوَ وَلَكِنِ اكْتُبْ: بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ. كَمَا كُنْتَ تَكْتُبُ. فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ: وَاللهِ لَا نَكْتُبُهَا إِلَّا: بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "اكْتُبْ بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ". ثُمَّ قَالَ: "هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ". فَقَالَ سُهَيْلٌ: وَاللهِ لَوْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُ اللهِ مَا صَدَدْنَاكَ عَنِ البَيْتِ وَلَا قَاتَلْنَاكَ، وَلَكِنِ اكْتُبْ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "وَاللهِ إِنِّي لَرَسُولُ اللهِ وَإِنْ كَذَّبْتُمُونِي، اكْتُبْ: مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ". قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَذَلِكَ لِقَوْلِهِ "لَا يَسْأَلُونِي خُطَّةً يُعَظِّمُونَ فِيهَا حُرُمَاتِ اللهِ إِلَّا أَعْطَيْتُهُمْ إِيَّاهَا". فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: "عَلَى أَنْ تُخَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ البَيْتِ فَنَطُوفَ بِهِ". فَقَالَ سُهَيْلٌ: وَاللهِ لَا تَتَحَدَّثُ العَرَبُ أَنَّا أُخِذْنَا ضُغْطَةً، وَلَكِنْ ذَلِكَ مِنَ العَامِ الْمُقْبِلِ. فَكَتَبَ، فَقَالَ سُهَيْلٌ: وَعَلَى أَنَّهُ لَا يَأْتِيكَ مِنَّا رَجُلٌ، وَإِنْ كَانَ عَلَى دِينِكَ إِلَّا رَدَدْتَهُ إِلَيْنَا. قَالَ الْمُسْلِمُونَ: سُبْحَانَ اللهِ! كَيْفَ يُرَدُّ إِلَى الْمُشْرِكِينَ وَقَدْ جَاءَ مُسْلِمًا؟! فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ دَخَلَ أَبُو جَنْدَلِ بْنُ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو يَرْسُفُ فِي قُيُودِهِ، وَقَدْ

خَرَجَ مِنْ أَسْفَلِ مَكَّةَ، حَتَّى رَمَى بِنَفْسِهِ بَيْنَ أَظْهُرِ المُسْلِمِينَ. فَقَالَ سُهَيْلٌ: هَذَا يَا مُحَمَّدُ أَوَّلُ مَا أُقَاضِيكَ عَلَيْهِ أَنْ تَرُدَّهُ إِلَيَّ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّا لَمْ نَقْضِ الكِتَابَ بَعْدُ". قَالَ: فَوَاللهِ إِذًا لَمْ أُصَالِحْكَ عَلَى شَيْءٍ أَبَدًا. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "فَأَجِزْهُ لِي". قَالَ: مَا أَنَا بِمُجِيزِهِ لَكَ. قَالَ: "بَلَى، فَافْعَلْ". قَالَ: مَا أَنَا بِفَاعِلٍ. قَالَ مِكْرَزٌ: بَلْ قَدْ أَجَزْنَاهُ لَكَ. قَالَ أَبُو جَنْدَلٍ: أَيْ مَعْشَرَ المُسْلِمِينَ، أُرَدُّ إِلَى المُشْرِكِينَ وَقَدْ جِئْتُ مُسْلِمًا؟! أَلاَ تَرَوْنَ مَا قَدْ لَقِيتُ؟! وَكَانَ قَدْ عُذِّبَ عَذَابًا شَدِيدًا فِي اللهِ. قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: فَأَتَيْتُ نَبِيَّ اللهِ ﷺ فَقُلْتُ: أَلَسْتَ نَبِيَّ اللهِ حَقًّا؟ قَالَ: "بَلَى". قُلْتُ: أَلَسْنَا عَلَى الحَقِّ وَعَدُوُّنَا عَلَى البَاطِلِ؟ قَالَ: "بَلَى". قُلْتُ: فَلِمَ نُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنَا إِذًا؟ قَالَ: "إِنِّي رَسُولُ اللهِ، وَلَسْتُ أَعْصِيهِ وَهْوَ نَاصِرِي". قُلْتُ: أَوَلَيْسَ كُنْتَ تُحَدِّثُنَا أَنَّا سَنَأْتِي البَيْتَ فَنَطُوفُ بِهِ؟ قَالَ: "بَلَى، فَأَخْبَرْتُكَ أَنَّا نَأْتِيهِ العَامَ؟ ". قَالَ: قُلْتُ: لَا. قَالَ: "فَإِنَّكَ آتِيهِ وَمُطَّوِّفٌ بِهِ". قَالَ: فَأَتَيْتُ أَبَا بَكْرٍ فَقُلْتُ: يَا أَبَا بَكْرٍ، أَلَيْسَ هَذَا نَبِيَّ اللهِ حَقًّا؟ قَالَ: بَلَى. قُلْتُ: أَلَسْنَا عَلَى الحَقِّ وَعَدُوُّنَا عَلَى البَاطِلِ؟ قَالَ: بَلَى. قُلْتُ: فَلِمَ نُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنَا إِذًا؟ قَالَ: أَيُّهَا الرَّجُلُ، إِنَّهُ لَرَسُولُ اللهِ ﷺ وَلَيْسَ يَعْصِي رَبَّهُ وَهْوَ نَاصِرُهُ، فَاسْتَمْسِكْ بِغَرْزِهِ، فَوَاللهِ إِنَّهُ عَلَى الحَقِّ. قُلْتُ: أَلَيْسَ كَانَ يُحَدِّثُنَا أَنَّا سَنَأْتِي البَيْتَ وَنَطُوفُ بِهِ؟ قَالَ: بَلَى، أَفَأَخْبَرَكَ أَنَّكَ تَأْتِيهِ العَامَ قُلْتُ: لَا. قَالَ: فَإِنَّكَ آتِيهِ وَمُطَّوِّفٌ بِهِ. قَالَ الزُّهْرِيِّ: قَالَ عُمَرُ: فَعَمِلْتُ لِذَلِكَ أَعْمَالًا. قَالَ: فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قَضِيَّةِ الكِتَابِ قَالَ رَسُولُ اللهِ -ﷺ- لِأَصْحَابِهِ: "قُومُوا فَانْحَرُوا، ثُمَّ احْلِقُوا". قَالَ: فَوَاللهِ مَا قَامَ مِنْهُمْ رَجُلٌ حَتَّى قَالَ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا لَمْ يَقُمْ مِنْهُمْ أَحَدٌ دَخَلَ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ، فَذَكَرَ لَهَا مَا لَقِيَ مِنَ النَّاسِ. فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، أَتُحِبُّ ذَلِكَ؟ اخْرُجْ ثُمَّ لَا تُكَلِّمْ أَحَدًا مِنْهُمْ كَلِمَةً حَتَّى تَنْحَرَ بُدْنَكَ، وَتَدْعُوَ حَالِقَكَ فَيَحْلِقَكَ. فَخَرَجَ فَلَمْ يُكَلِّمْ أَحَدًا مِنْهُمْ، حَتَّى فَعَلَ ذَلِكَ، نَحَرَ بُدْنَهُ، وَدَعَا حَالِقَهُ فَحَلَقَهُ. فَلَمَّا رَأَوْا ذَلِكَ، قَامُوا فَنَحَرُوا، وَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَحْلِقُ بَعْضًا، حَتَّى كَادَ بَعْضُهُمْ يَقْتُلُ بَعْضًا غَمًّا، ثُمَّ جَاءَهُ نِسْوَةٌ مُؤْمِنَاتٌ فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتُ مُهَـٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَـٰنِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ

مُؤْمِنَـٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُوا۟ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُوا۟ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ ﴿١٠﴾ ﴾ الممتحنة، فَطَلَّقَ عُمَرُ يَوْمَئِذٍ امْرَأَتَيْنِ كَانَتَا لَهُ فِي الشِّرْكِ، فَتَزَوَّجَ إِحْدَاهُمَا مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ، وَالأُخْرَى صَفْوَانُ بْنُ أُمَيَّةَ، ثُمَّ رَجَعَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى المَدِينَةِ، فَجَاءَهُ أَبُو بَصِيرٍ -رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ- وَهُوَ مُسْلِمٌ، فَأَرْسَلُوا فِي طَلَبِهِ رَجُلَيْنِ، فَقَالُوا: العَهْدَ الَّذِي جَعَلْتَ لَنَا. فَدَفَعَهُ إِلَى الرَّجُلَيْنِ، فَخَرَجَا بِهِ حَتَّى بَلَغَا ذَا الحُلَيْفَةِ، فَنَزَلُوا يَأْكُلُونَ مِنْ تَمْرٍ لَهُمْ، فَقَالَ أَبُو بَصِيرٍ لأَحَدِ الرَّجُلَيْنِ: وَاللهِ إِنِّي لأَرَى سَيْفَكَ هَذَا يَا فُلَانُ جَيِّدًا. فَاسْتَلَّهُ الآخَرُ فَقَالَ: أَجَلْ، وَاللهِ إِنَّهُ لَجَيِّدٌ، لَقَدْ جَرَّبْتُ بِهِ ثُمَّ جَرَّبْتُ. فَقَالَ أَبُو بَصِيرٍ: أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْهِ، فَأَمْكَنَهُ مِنْهُ، فَضَرَبَهُ حَتَّى بَرَدَ، وَفَرَّ الآخَرُ، حَتَّى أَتَى المَدِينَةَ، فَدَخَلَ المَسْجِدَ يَعْدُو. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حِينَ رَآهُ: "لَقَدْ رَأَى هَذَا ذُعْرًا". فَلَمَّا انْتَهَى إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قُتِلَ وَاللهِ صَاحِبِي وَإِنِّي لَمَقْتُولٌ، فَجَاءَ أَبُو بَصِيرٍ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، قَدْ وَاللهِ أَوْفَى اللهُ ذِمَّتَكَ، قَدْ رَدَدْتَنِي إِلَيْهِمْ ثُمَّ أَنْجَانِي اللهُ مِنْهُمْ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "وَيْلُ أُمِّهِ مِسْعَرَ حَرْبٍ، لَوْ كَانَ لَهُ أَحَدٌ". فَلَمَّا سَمِعَ ذَلِكَ عَرَفَ أَنَّهُ سَيَرُدُّهُ إِلَيْهِمْ، فَخَرَجَ حَتَّى أَتَى سِيفَ البَحْرِ. قَالَ: وَيَنْفَلِتُ مِنْهُمْ أَبُو جَنْدَلِ بْنُ سُهَيْلٍ، فَلَحِقَ بِأَبِي بَصِيرٍ، فَجَعَلَ لَا يَخْرُجُ مِنْ قُرَيْشٍ رَجُلٌ قَدْ أَسْلَمَ إِلَّا لَحِقَ بِأَبِي بَصِيرٍ، حَتَّى اجْتَمَعَتْ مِنْهُمْ عِصَابَةٌ، فَوَاللهِ مَا يَسْمَعُونَ بِعِيرٍ خَرَجَتْ لِقُرَيْشٍ إِلَى الشَّأْمِ إِلَّا اعْتَرَضُوا لَهَا، فَقَتَلُوهُمْ، وَأَخَذُوا أَمْوَالَهُمْ، فَأَرْسَلَتْ قُرَيْشٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ تُنَاشِدُهُ بِاللهِ وَالرَّحِمِ لَمَّا أَرْسَلَ، فَمَنْ أَتَاهُ فَهُوَ آمِنٌ، فَأَرْسَلَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَيْهِمْ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَـٰتٌ

لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍۖ لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ لَوْ تَزَيَّلُوا۟ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٢٦﴾ ﴾ الفتح. وَكَانَتْ حَمِيَّتُهُمْ أَنَّهُمْ لَمْ يُقِرُّوا أَنَّهُ نَبِيُّ اللهِ، وَلَمْ يُقِرُّوا بِبِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، وَحَالُوا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ البَيْتِ[1].

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: ﴿ مَّعَرَّةٌ ﴿٢٥﴾ ﴾ الفتح، العُرُّ الجَرَبُ. ﴿ لَوْ تَزَيَّلُوا۟ ﴿٢٥﴾ ﴾ الفتح. انمازوا وَحمَيْتُ القَومَ: مَنَعْتُهُمْ حِمَايَةً، وَأَحْمَيْتُ الحِمَى: جَعَلْتُهُ حِمى لا يُدْخَلُ وأَحْمَيْتُ الرَّجُلَ إِذَا أَغْضَبْتَهُ إحمَاءً.

## ١٥- باسی (ڕوونکردنەوەی) مەرجەکانی جیهاد و ڕێککەوتن لەگەڵ ئەوانەی دەجەنگن لە دژی مسوڵمانان و نووسینی مەرجەکان

**٢٧٣١- ٢٧٣٢- عورِوەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە لەمیسوەری کوڕی مەخرەمە و مـەروانی کـوڕی حەکەمـەوە -هەریەکـەیان قـسەکانیان ڕاسـتی قـسەکانی ئـەوی تریانی دەسەلماند-، هەردووکیان وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی حودەیبییەدا دەرچوو بۆ سەفەر، ڕۆیشتن هەتا هەنـدێك لـەڕێگاكانی بـڕی بـوو، پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خالیدی کوڕی وەلید لە غەمیم[2] لەگەڵ چەند سوارێك لە قورەیش پێشەکی سوپاکەی قورەیشن، کەواتە ئێوە لای ڕاست بگرن))، جا سوێند**

(١) بڕوانە: ١٦٩٤، ١٦٩٥.

(٢) غەمیم: شوێنێکە نزیک مەککە لە نێوان ڕابیغ و جوحفەدایە.(بڕوانە: إرشاد الساري: ٢٠٢/٦).

بەخوا خالید هەستی پێنەکردن هەتا تەپوتۆزی سوپاکەیانی دی، ئیتر خالید بەپەلە وشترەکەی غارداو قورەیشی ئاگادار کرد، پێغەمبەریش ﷺ ڕۆیشت تا گەیشتە ئەو ملەی کە لێیەوە بەسەر ئەواندا شۆڕدەبنەوە، وشترەکەی چۆکی دادا و نەڕۆیشت، خەڵکەکە وتیان: هەچە هەچەو تێیان خوڕی، وشترەکە نەجوڵا، جا خەڵکەکە وتیان: قەصوا مانی گرتووە، قەصوا مانی گرتووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((قەصوا مانی نەگرتووەو ئەو خووی وا نەبوو، بەڵکو ئەوەی بەری فیلەکانی گرت هەر ئەوە بەری قەصوای گرتووە))، پاشان فەرمووی: ((وە سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە (قورەیش) داوای شتێکم لێ بکەن کە ڕێزو حورمەتگرتنی ماڵی خوای تێدا بێت دەیان دەمێ))، پاشان خوڕییە وشترەکەو ئەویش ڕاپەڕی، وتی: ئینجا لەسوپاکە لایداو ڕۆیشت هەتا گەیشتنە ئەوپەڕی حودەیبییە، لایدا و باروبنەیان خست لەسەر کوێرەکانییەکی کەم ئاو، خەڵکی بەمشت لێیان هەڵدەگۆزا، وازیان لێ نەهێنا تا چۆڕیان لێ بڕی، خەڵکەکە سکاڵای تینوێتیان بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش تیرێکی لەتیردانەکەی دەرکێشا، پاشان فەرمانی پێکردن کە بیخەنە کوێرەکانییەکەوە، سا سوێند بەخوا بەردەوام ئاوەکەی هەڵدەقوڵاندو ئاوی دەدان و لێیان دەخواردەوە، هەتا گشتیان تێرئاو بوون و گەڕانە دواوە، جا لەکاتێکدا ئەوان لەو حاڵەتەدا بوون، لەپڕ بودەیلی کوڕی وەرقای خوزاعی لەگەڵ چەند کەسێکی هۆزەکەی کە خوزاعە بوون هاتن -کە ئەمیندار و دڵسۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون لە خەڵکی تیهامە-، (بودەیل) وتی: من کەعبی کوڕی لوئەی و عامیری کوڕی لوئەیم بەجێهێشت لای کانیاوەکانی حودەیبیە، بارگەو بنەیان خستبوو، وشتری تازە زاوی بەچکە بەبەرەوەیان پێیە[1]، بەنیازن جەنگت لەگەڵ بکەن و ڕێگریت

---

(١) یان مەبەستیان (العوذ المطافيل) ئافرەتانی منداڵی شیرەخۆر بەبەریان پێیە.

بكەن لەڕۆیشتن بۆ ماڵی خوا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی ئێمە نەهاتووین جەنگ لەگەڵ كەس بكەین، بەڵكو هاتووین عومرە بكەین، وە بێگومان قورەیشیش جەنگ شەكەتی كردوون و زیانی پێ گەیاندوون، جا ئەگەر بیانەوێ ماوەیەكیان پێ دەدەم جەنگی نێوانمان ڕاگرین و وازبێنن لە نێوان من و خەڵكی تردا (ئازاد بم بانگیان بكەم بۆ ئیسلام)، ئینجا ئەگەر خوا منی سەرخست، ئەوسا ئەگەر ویستیان بێنە ناو ئەو (ئیسلامە)ی كە خەڵكی هاتوونەتە ناوی با بیكەن، ئەگەر نا ئەوە وچان و پشوویەكیان داوە، وە ئەگەر ڕازی نابن ئەوە سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە دڵنیا بن لەسەر ئەم ئایینە لەدژیان دەجەنگم هەتا دەدرێت لەگەردنم (و دەمرم)، بەراستی خوا فەرمانی خۆی بەجێ دێنێ: (ئایینەكەی سەر دەخات) ))، جا بودەیل وتی: دڵنیابە ئەوەی دەیڵێیت پێیان دەگەیەنم، دەڵێ: بودەیل ڕۆیشت هەتا گەیشتە لای قورەیش و وتی: بێگومان ئێمە لای ئەو پیاوەوە (موحەممەد ﷺ) هاتووین بۆ لای ئێوە، وە قسەیەكمان لێ بیستووە، جا ئەگەر دەتانەوێ قسەكەیتان بۆ بخەینە ڕوو ئەوە وادەكەین، وە نەفام و هەرزەكانیان وتیان: ئێمە پێویستمان بەوە نییە كە ئێوە هیچ شتێكی ئەومان بۆ باس بكەن، بەڵام هۆشمەندو عاقڵەكانیان وتیان: ئەوەی لێت بیستووە بیڵێ پێمان، بودەیل وتی: گوێم لێ بوو ئاواو ئاوای دەوت، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ وتبووی بۆی گێڕانەوە، ئینجا عوروەی كوڕی مەسعوود هەستا و وتی: ئەی خزمان ئایا ئێوە باوك نین؟ وتیان: بەڵێ وایە، وتی: منیش كوڕتان نیم؟ وتیان: بەڵێ وایە، وتی: دەی ئێوە هیچ گومانتان لە (دڵسۆزی) من هەیە؟ وتیان: نەخێر، وتی: ئایا ئەوە دەزانن و بیرتانە كە من داوام لەخەڵكی عوكاز كرد كە دەربچن (بۆ یارمەتیدانتان لە جەنگدا)، جا كە بەگوێیان نەكردم، خۆم و كوڕو كەس و كارم ئەوەی بەگوێی كردم نەهاتم (بۆ یارمەتی دانتان بۆ جەنگ)؟ وتیان: بەڵێ وایە، وتی: دەی بێگومان ئەم پیاوە

پرۆژەیەکەی چاك و دروستی بۆ پێشنیار کردوون، دەی وەری بگرن و پێی ڕازی بن، ڕێگەم بدەن بچم بۆ لای، وتیان: بڕۆ بۆ لای، عورووەش ڕۆیشت بۆ لای و دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ هاوشێوەی ئەو قسەی بە بودەیلی وت بەمنیشی وت، جا لەوکاتەدا عورووە وتی: ئەی موحەممەد ﷺ پێم بڵێ ئەگەر تۆ گەلەکەت قەلاچۆ بکەیت و لەڕەگ و ڕیشەوە دەریان بێنی، ئایا بیستووتە کەس لەعەرەب پێش تۆ کەس و کارەکەی بنبڕ کردبێت؟! خۆ ئەگەر دیوەکەی تری بێت (قورەیش زاڵ بێت)، جا بێگومان وەڵڵاهی من چەند ناودارێك نابینم (لەسوپاکەی تۆدا)، وە کۆمەڵێك خەڵکی هەرچی و پەرچی دەبینم تێکەڵ و پێکەڵن، شایانی ئەوەن کە هەڵبێن و بەجێت بێڵن، ئەبو بەکریش وتی: بڕۆ قیتکەی لات بمژە، ئێمە لێی هەڵدێن و بەجێی دێڵین؟ عورووە وتی: ئەمە کێیە؟ وتیان: ئەبو بەکرە، عورووە وتی: دەی سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر لەبەر چاکەیەك نەبووایە کە هەتە بەسەرمەوە و پاداشتم نەداویتەوە لەسەری، وەڵامم دەدایتەوە. دەڵێ: دەستی کرد بەقسەکردن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، جا کە قسەکەی دەکرد دەستی دەبرد بۆ ریشی پێغەمبەر ﷺ، موغیرەی کوڕی شوعبەش بەسەر سەری پێغەمبەرەوە ﷺ بوو، شمشێرێکی بەدەستەوە بوو، خودەیەکی بەسەرەوە بوو، جا هەر کاتێك عورووە دەستی دەبرد بۆ ڕیشی پێغەمبەر ﷺ بەدەسکی شمشێرەکە دەیدا لە دەستی عورووە و پێی دەوت دەستت دوورخەرەوە لەڕیشی پێغەمبەری خوا ﷺ. عورووەش سەری بەرزکردەوە و وتی: ئەمە کێیە؟ وتی: موغیرەی کوڕی شوعبە، وتی: ئەی بێ وەفا ئایا من هەوڵم بۆ چارەسەری کەتن و خیانەتکارییەکەی تۆ نەدا؟ -موغیرە لە سەردەمی نەفامیدا هاوڕێی چەند کەسێك بوو (لە سەفەرێکدا)، بەڵام ئەو کەسانەی کوشتبوو، ماڵ و سامانەکەشیانی بردبوو، پاشان هات و مسوڵمان بوو، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ((سەبارەت بە

مسولمان بوونەكەت ئەوە قەبوولی دەكەم، بەلام مال و سامانەكە ئەوە من هیچ پەیوەندیم پێوەی نییە))- پاشان عوروە بەچاوەكانی دەستی كرد بەسەرنجدانی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، عوروە دەڵێ: جا سوێند بەخوا پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بەڵغەمێكی فڕێ دەدا، دەكەوتە دەستی پیاوێكیان دەیهێنا و بەڕووخسارو پێستیدا، وە ئەگەر فەرمانێكی پێ بكردنایە، دەست بەجێ جێبەجێیان دەكرد، وە ئەگەر دەست نوێژی بگرتبایە، لەسەر ئاوی دەستنوێژەكەی خەریك بوو دەیان كرد بەشەڕ، ئەگەر قسەیان بكردایە لە خزمەتیدا دەنگیان نزم دەكردەوە، وە چاویان تێنەدەبڕی لەبەر ڕێز و بەگەورە زانینی، ئینجا عوروە گەڕایەوە بۆ لای هاوڕێكانی و وتی: ئەی خزمینە! سوێند بەخوا من بەنوێنەری ڕۆیشتوومەتە لای پادشایان، وە بەنوێنەری ڕۆیشتوومەتە لای قەیصەر و كیسرا و نەجاشی، (جارێكی تر) سوێند بێ هەرگیز هیچ پادشایەكم نەدیوە، دەست و پەیوەندییەكانی ئەوەندە بەڕێز و گەورە سەیری بكەن وەك ئەوەی هاوڕێكانی موحەممەد ﷺ بەڕێزو گەورە سەیری موحەممەدیان ﷺ دەكرد، وە سوێند بەخوا ئەگەر بەڵغەمێكی فڕێ بدایە دەكەوتە دەستی پیاوێكیان و دەیهێنا بەڕووخسار و پێستیدا، وە كاتێك فەرمانێكی پێ بكردنایە یەكسەر فەرمانەكەیان جێ بەجێ دەكرد، وە ئەگەر دەستنوێژی بگرتبایە خەریك بوو لەسەر ئاوی دەستنوێژەكەی دەیان كردە شەڕ، وە ئەگەر قسەی بفەرمووایە لە خزمەتیدا دەنگیان نزم دەكردەوە، بەزەقی تەماشیان نەدەكرد لەبەر گەورەیی و ڕێزی لایان، وە بێگومان ئەو پیاوە پێشنیاری نەخشەیەكی ڕاست و چاكی بۆ كردوون، ئێوەش پێی ڕازی بن. ئینجا پیاوێك لە تیرەی كینانە وتی: مۆڵەتی من بدەن بچم بۆ لای، وتیان: بچۆ بۆ لای، جا كاتێك لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی نزیك بوویەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەمە فلانە كەسە، لەو هۆزەیە كە ڕێزی دیاری بەیت دەگرن، دەی ئەو دیارییانەی بەیت هەڵبسێننەوە بۆی و با

بیان بینێت))، ئیتر ئاژەڵە دیارییەکانیان بۆ هەڵساندەوە و خەڵکەکە بە (لَبیك اللَّهُمَّ لَبیك) پێشوازیان لێ کرد، جا ئەو پیاوەش کە ئەوەی بینی وتی: (سُبْحَانَ اللهِ!) پاك و بێگەردی بۆ خوا، نابێ کەسانی وەك ئا ئەمانە ڕێگریان لێ بکرێ لە ماڵی خوا، جا کە گەڕایەوە بۆ لای هاوڕێکانی وتی: بەچاوی خۆم وشترە دیارییەکانی بەیتم بینی، گوڵەنگ کرابوویە ملیان، سەرپشتیان بریندار کرابوو[1]، بۆیە پێم باش نییە ڕێگری بکرێن لە ماڵی خوا. ئینجا پیاوێکی تریان هەستا کە پێی دەوترا: میکرەزی کوڕی حەفص و وتی: ڕێگەم بدەن من بڕۆم بۆ لای، وتیان: بڕۆ بۆ لای، جا کە نزیك بوویەوە لێیان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەمە میکرەزە کە پیاوێکی خراپە))، جا دەستی کرد بەقسەکردن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، ئینجا لەکاتێکدا کە میکرەز قسەی دەکرد لەگەڵیدا، لەو کاتەدا سوهەیلی کوڕی عەمر هات. مەعمەر وتی: ئەییوب بۆی گێڕامەوە لەعیکریمەوە دەڵێ: کاتێك سوهەیلی کوڕی عەمر هات پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان کارەکەتان بۆ ئاسان بوو))، مەعمەر دەڵێ: زوهری لە فەرموودەکەیدا (کە گێڕاویەتییەوە) دەڵێ: جا سوهەیلی کوڕی عەمر هات و وتی: نووسراوێك بنووسە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا، پێغەمبەریش نووسەرێکی بانگ کرد، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بنووسە)): ((بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)) سوهەیل وتی: وشەی (رحمن) سوێند بەخوا من نازانم چیە، بەڵکو بنووسە: (بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ)، وەك پێشتر چۆنت دەنووسی، ئینجا مسوڵمانان وتیان: سوێند بەخوا جگە لە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) نانووسین، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بنووسە: بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ))، پاشان فەرمووی: ((ئەمە ئەوەیە کە موحەممەد پێغەمبەری خوا لەسەری ڕێککەووت))، سوهەیل وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئێمە

---

(١) ئەو دوو نیشانەیە واتە: ئەو وشترانە دیاری بەیتن و خەڵکەکە بۆ عومرە هاتوون نەک جەنگ.

بەدڵنیاییەوە بمانزانیبایە كە تۆ پێغەمبەری خوایت، ڕێگریمان نەدەكردی لە ماڵی خوا و جەنگیشمان لە دژت نەدەكرد، بەڵكو بنووسە: موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەخوا بەدڵنیاییەوە من پێغەمبەری خوام با ئێوەش باوەڕم پێ نەكەن، بنووسە: موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلا)). زوهری دەڵێ: ئەوەش لەبەر ئەوەی كە فەرمووی: ((هەر نەخشەیەكم لێ داوا بكەن كە ڕێز و حورمەتی ماڵی خوای تێدا بێت و بەگەورەی بگرن دەیاندەمێ))، جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((بەمەرجێك نێوانی ئێمە و بەیت چۆڵ بكەن تا تەوافی كەعبە بكەین))، سوهەیلیش وتی: سوێند بەخوا نابێ، ئەگینا عەرەب (توانجمان لێ دەدەن)، دەڵێن كە ئێمە بەزیوین و شكستمان هێناوە، بەڵام ئەوە لە ساڵی داهاتوودا (ئەنجام بدرێت)، ئەویش نووسی. جا سوهەیل وتی: بەو مەرجەی هەر پیاوێك لای ئێمەوە هات بۆ لای تۆ، با لەسەر ئایینەكەی تۆش بێت دەبێ بیگێڕیتەوە بۆمان، مسوڵمانەكان وتیان: (سبحان الله) پاك و بێگەردی بۆ خوا، چۆن دەگەڕێنرێتەوە بۆ لای بتپەرستان لەكاتێكدا بەمسوڵمانی هاتووە؟! جا لەكاتێكدا لەم حاڵەدا بوون، ئەبو جەندەلی كوڕی سوهەیلی كوڕی عەمر بەكۆت و زنجیركراوی بەهێواشی هات (بۆ ناو مسوڵمانان)، لەخوارووی مەككەوە هاتبوو (پێیان نەزانیبوو) هەتا خۆی فڕێ دایە ناو مسوڵمانەكان، جا سوهەیل وتی: ئەی موحەممەد ﷺ ئەمە یەكەم كەسە كە (بەم بڕگەیە) داوای دەكەم لێت كە بیگەڕێنیتەوە بۆم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئێمە هێشتا ڕێككەوتن نامەكەمان تەواو نەكردووە))، سوهەیل وتی: كەوابوو سوێند بەخوا هەرگیز لەسەر هیچ شتێك لەگەڵت ڕێك ناكەوم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دە لەبەر من بیكە)) وتی: نەخێر، لەبەر تۆ نایكەم و ڕێگەی نادەم! فەرمووی: ((با وابكە))، وتی: نەخێر، وا ناكەم، میكرەز وتی: باشە ئەوە ڕێگەمان دا لەبەر تۆ، ئەبو

جەنـدەل وتـی: ئـەی مـسوڵمانینە چـۆن بگەڕێنرێمـەوە بـۆ لای بتپەرسـتەکان لەکاتێکدا بەمـسوڵمانی هاتووم؟! ئایا نـابینن چیم بەسـەر هـاتووە؟! لەڕاستیدا لەپێناو خوادا سزا درابوو بە سزادانێکی سەخت، دەڵێ: عومەری کوڕی خـەتتاب دەڵێ: مـن ڕۆیـشتمە خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا و پـێم وت: ئایـا تـۆ بەڕاسـتی پێغەمبەری خوا نیت؟ فەرمووی: ((بـەڵێ پێغەمبـەرم))، وتم: ئایـا ئێمـە لەسـەر هەق نین و دوژمنەکانمان لەسەر ناهەق نین؟ فـەرمووی: ((بـەڵێ)) وتم: کەواتـە بۆچـی ڕازی بـبین بەسەرشـۆڕی لـە دینەکەمانـدا؟! فـەرمووی: ((بێگومـان مـن پێغەمبـەری خـوام و سەرپێـچی فـەرمانی ناکـەم، ئـەو یارمـەتیم دەدا و سـەرم دەخـات))، وتم: ئـەی تـۆ بەئێمـەت نەفـەرموو دڵنیـابن دەچینە بـەیت و تـەواف دەکـەین بەدەوریـدا؟ فـەرمووی: ((بـەڵێ، ئایـا پـێم وتیـت ئـەم سـاڵ دەچـینە بەیت؟)) دەڵێ وتم: نەخێر (نەتوت ئەم ساڵ)، فەرمووی: ((دە بێگومان دەچیتە بەیت و تەوافیش دەکەیت بەدەوریدا))، عومەر دەڵێ: جا ڕۆیـشتم بـۆ لای ئـەبو بەکر و وتم: ئەی ئەبو بەکر ئایا ئەم موحەممەدە ﷺ بەڕاستی پێغەمبەری خـوا نییە؟ وتی: با، وتم: ئایا ئێمە لەسـەر هـەق نـین و دوژمنـەکانمان لەسـەر ناهـەق نین؟ وتی: با، وتم: دەی کەواتە بۆچی ڕازی بین بەسەرشۆڕی لـە دینەکەمانـدا؟! وتـی: ئـەی پیـاوی ڕاسـتەقینە! بێگومـان ئـەو پێغەمبـەری خوایـە و سەرپێـچی پەروەردگاری ناکات و یارمەتی دەدات، کەواتە دەست بگرە بەکەمەندیـەوە[1]، سـا سوێند بەخوا گومانت نەبێ پێغەمبەر ﷺ لەسەر هەقە، وتم: ئایا پێغەمبـەر ﷺ بەئێمەی نەفەرموو کە بێگومان دەچینە بەیت و تەواف دەکەین؟ وتـی: بـا، ئایـا پێی وتـی کـە تـۆ ئەمـساڵ دەچیـت؟ وتم: نـا، وتـی: دەی دڵنیابـە هـەر دەچیـت و تەوافیش دەکەیت. زوهری دەڵێ: عومەر وتی: لەبەر ئەم کـارەی کـردم چـەندین

---

(١) واتە: دەست بگرە بەفەرمانی پێغەمبەرەوە ﷺ بەقاییمی.

کاری چاکەم کرد (تا خوا لێم خۆش بێت)، دەڵێ: جا کاتێك نووسینەوەی ڕێککەوتنەکە تەواو بوو و کۆتایی هات، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: ((دە هەستن، قوربانییەکان سەربڕن، پاشان سەرتان بتاشن))، دەڵێ: جا سوێند بەخوا یەك پیاویان هەڵنەستا، هەتا سێ جار ئەو وتەی دووبارەکردەوە، جا کە کەسیان هەڵنەستا، ڕۆیشتە ژوورەوە (بۆ چادرەکەی)، ئوممو سەلەمە باسی ئەوەی بۆ کرد لەلایەن هاوەڵانەوە چی بەرانبەر کراوە، ئوممو سەلەمەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەت پێ خۆشە (فەرمانەکەت بەجێ بێنن)؟ بڕۆ دەرەوە وشەیەك لەگەڵ کەس مەڵێ، هەتا وشترە قوربانییەکەت سەردەبڕی، وە بانگی سەرتاشەکەت بکە با سەرت بتاشێت. پێغەمبەریش (لەچادرەکە) ڕۆیشتە دەرەوە و قسەی لەگەڵ کەسیاندا نەکرد، هەتا ئەوەی کرد، وشتری قوربانییەکەی سەربڕی و سەرتاشەکەی بانگ کرد و سەری تاشی، جا کاتێك هاوەڵان ئەوەیان بینی، هەستان وشتری قوربانییەکانیان سەربڕی، وە هەندێکیان دەستیان کرد بەسەرتاشینی هەندێکیان، هەتا خەریك بوو لەمەراقا یەکتری بکوژن (لەبەر فەرمبالغی). پاشان ئافرەتانی باوەڕدار هاتن بۆ خزمەتی و خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ئەگەر ئافرەتانی باوەڕدار هاتن بۆ لاتان بەکۆچەری، تاقییان بکەنەوە) هەتا گەیشتە (ژنە کافرە(بێ نامە)کان لای خۆتان ڕا مەگرن)، ئەوسا عومەر دوو ژنی تەڵاق دا، کە لەکاتی بتپەرستیدا خێزانی بوون، جا یەکێکیان موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان مارەی کرد، ئەوی دیکەشیان صەفوانی کوڕی ئومەییە مارەی کرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە، ئەبو بەصیر کە پیاوێکی قوڕەیشی بوو هات بۆ خزمەتی کە مسوڵمان بوو، جا قوڕەیش دوو پیاویان نارد بەشوێنیدا، وتیان: ئەو پەیمانەی داوتە بەئێمە (جێبەجێی بکە)، پێغەمبەریش ئەبو بەصیری دایە دەست دوو پیاوەکە، ئینجا هەردووکیان لەگەڵ خۆیان بردیان هەتا گەیشتنە

ذولحولەیفە، لەوێ لایاندا، لەخورمایەك كە پێیان بوو دەیان خوارد، ئەبو بەصیر وتی: بەیەكێك لە دوو پیاوەكە: وەڵڵاهی فلانە كەس من ئەم شمشێرەی تۆ بەشمشێرێكی چاك دەزانم، ئەویش شمشێرەكەی لەكێلانەكەی دەرهێنا و وتی: بەڵێ سوێند بەخوا شمشێری چاكە، چەند جار تاقیم كردۆتەوە، ئەبو بەصیریش وتی: ئادەی با سەیرێكی بكەم، ئیتر لەدەستی دەسەنێت و شمشێرێكی لێ دەدات (و دەمرێت و) سارد دەبێتەوە، پیاوەكەی دیكەیان ڕا دەكات هەتا دەگاتەوە مەدینە، بەڕاكردن دەڕواتە ژوورەوە بۆ مزگەوت، جا كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەیبینێ دەفەرموێ: ((بێگومان ئەم پیاوە مەترسی گەورەی بینیوە و تۆقاوە))، جا كاتێك ئەو پیاوە گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: سوێند بەخوا هاوڕێكەم كوژراوە، منیش دەكوژرێم. ئینجا ئەبو بەصیر هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڕاستی خوا پەیمانەكەی تۆی بردە سەر، تۆ منت گێڕایەوە بۆ لای ئەوان، پاشان خوا لەدەستیان ڕزگاری كردم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەمە دایك داماو دەكات، چی شەڕ هەڵگیرسێنێكە ئەگەر كەسی تری لەگەڵدا بێت))، جا كاتێك ئەبو بەصیر ئەوەی بیست زانی كە بێگومان پێغەمبەر دەیگێڕێتەوە بۆ قوڕەیش، ئیتر ئەویش لەمەدینە دەرچوو هەتا گەیشتە سیفەلبەحر[1]، دەڵێ: ئەبو جەندەلی كوڕی سوهەیلیش لەدەستیان بەربوو گەیشت بەئەبو بەصیر، ئیتر وای لێ هات هەر پیاوێك لەلای قوڕەیش دەرچووبایە و مسوڵمان ببوایە، پەیوەندی دەكرد بەئەبو بەصیرەوە، هەتا وای لێ هات كۆمەڵێكی بەهێزیان لێ دروست بوو، جا سوێند بەخوا هەواڵی هەر كاروانێكی قوڕەیشیان ببیستبایە كە ڕۆیشتووە بۆ شام، ڕێگەیان لێ دەگرت و ئەیان كوشتن و ماڵەكەشیان دەبردن، بۆیە قوڕەیش جوابی نارد بۆ پێغەمبەر

(١) واتە: كەنار دەریا.

ﷺ، لێی دەپاڕایەوە لەبەر خوا و لەبەر خزمایەتی بنێرە بەشوێنیاندا (با بێنەوە بـۆ مەدینـە)، هەركـەس هـات بـۆ لات بەمـسوڵمانی ئـەوە ئـەمین بێـت، ئـیتر پێغەمبـەریش ﷺ نـاردی بەشـوێنیاندا، خـوای گـەورەش ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد: (خوا ئەو زاتەیە كە دەستی ئەوانی (كافران) لە ئێوە كۆتا كرد، دەسـتی ئێوەشـی لـەوان (كۆتـا كـرد بەرێككـەوتنی حودەیبیـە)، لـەناو جەرگـەی مەككـەدا لـەپاش ئەوەی ئێوەی بەسەر ئەوانـدا زاڵ كـرد)، هـەتا گەیـشتە (دەمـارگیری(یـان خـستە دڵیانەوە) كە دەمارگیری نەفامییـە)، وە دەمارگیرییەكـەیان ئـەوە بـوو كـە ئـەوان دانیان بەوەدا نەدەنا كە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە دانیان بـە وشـەی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)ـدا نەدەنا، وە ڕێگر بوون لە نێوان مسوڵمانان و گەیشتن بە ماڵی خوا.

ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ﴿مَعَرَّةٌ﴾، واتە: گەڕی، ﴿لَوْ تَزَيَّلُوا﴾: لەیەكتری جیاببوونایەتەوە، (حَمَيْتُ القَومَ) واتە: پاراستمن بەهۆی دەمارگیری و خزمایەتی، (أَحْمَيْتُ الحِمَى) كردمە قاغە كە كەسی تێنەچێت. (وأحمَيتُ الحَديدَ في النارِ): ئاسنەكەم سوور كردەوە لەناو ئاگردا، (أَحْمَيْتُ الرَّجُلَ): ئەوەیە كە كەسێك توڕەی بكەیت بەهۆی دەمارگیرییەوە.

٢٧٣٣- وَقَالَ عُقَيْلٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: قَالَ عُرْوَةُ: فَأَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَمْتَحِنُهُنَّ، وَبَلَغَنَا أَنَّهُ لَمَّا أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى أَنْ يَرُدُّوا إِلَى المُشْرِكِينَ مَا أَنْفَقُوا عَلَى مَنْ هَاجَرَ مِنْ أَزْوَاجِهِمْ، وَحَكَمَ عَلَى المُسْلِمِينَ، أَنْ لَا يُمَسِّكُوا بِعِصَمِ الكَوَافِرِ، أَنَّ عُمَرَ طَلَّقَ امْرَأَتَيْنِ: قَرِيبَةَ بِنْتَ أَبِي أُمَيَّةَ، وَابْنَةَ جَرْوَلٍ الخُزَاعِيِّ، فَتَزَوَّجَ قَرِيبَةَ مُعَاوِيَةُ، وَتَزَوَّجَ الأُخْرَى أَبُو جَهْمٍ، فَلَمَّا أَبَى الكُفَّارُ أَنْ يُقِرُّوا بِأَدَاءِ مَا أَنْفَقَ المُسْلِمُونَ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ، أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَإِن فَاتَكُمْ شَيْءٌ مِّنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ ﴿١١﴾﴾ الممتحنة، وَالعَقِبُ مَا يُؤَدِّي المُسْلِمُونَ

إِلَى مَنْ هَاجَرَتِ امْرَأَتُهُ مِنَ الكُفَّارِ، فَأَمَرَ أَنْ يُعْطَى مَنْ ذَهَبَ لَهُ زَوْجٌ مِنَ المُسْلِمِينَ مَا أَنْفَقَ مِنْ صَدَاقِ نِسَاءِ الكُفَّارِ اللاَّئِي هَاجَرْنَ، وَمَا نَعْلَمُ أَحَدًا مِنَ المُهَاجِرَاتِ ارْتَدَّتْ بَعْدَ إِيمَانِهَا. وَبَلَغَنَا أَنَّ أَبَا بَصِيرِ بْنَ أَسِيدٍ الثَّقَفِيَّ قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ مُؤْمِنًا مُهَاجِرًا فِي المُدَّةِ، فَكَتَبَ الأَخْنَسُ بْنُ شَرِيقٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَسْأَلُهُ أَبَا بَصِيرٍ، فَذَكَرَ الحَدِيثَ[1].

**٢٧٣٣- عائیشه ﷺ دەڵێ: كه پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتانی كۆچەری (بەسوێند و هەندێك شتی تر) تاقی دەكردنەوە و هەڵسەنگاندنی بۆ دەكردن. (زوهری دەڵێ:) پێمان گەیشتووە كه كاتێك خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە، كه ئەو پارە و مارەییەی بتپەرستان خەرجیان كردوە بۆ هاوسەرەكانیان كه كۆچیان كردوە بۆیان بگەڕێننەوە، وە بڕیاری دا بۆ پیاوە مسوڵمانەكان كه ئافرەتە كافرە بێ ئایینەكان نەهێڵنەوە لای خۆیان، عومەر دوو ئافرەتی تەڵاق دا كه قەریبەی كچی ئومەییە و كچی جەروەڵی خوزاعی بوون، جا موعاویە قەریبەی مارەكرد، ئەوی دیكەشیان ئەبو جەهم مارەی كرد، ئینجا كاتێك كافران نكوڵیان دەكرد لەوەی ئەو خەرجییەی مسوڵمانە پیاوەكان لە هاوسەرە كافرەكانیاندا كردوویانە بۆیان بگێڕنەوە و بیاندەنەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ئەگەر یەكێك لەخێزانەكانتان (بەچوونیان) بۆ لای بێ باوەڕان لەدەستتان چوو، ئێوەش تۆڵەتان لێ سەندن (و غەنیمەتتان گرت)[2]، (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) وشەی: (العَقِبُ)[3])، ئەو ماڵەیە كه مسوڵمانان دەیدەن بەو پیاوەی خێزانەكەی كۆچی كردووە لەدەستی كافران، جا خوا فەرمانی كردووە پارە بدرێت بەو پیاوەی ژنە مسوڵمانەكەی ڕۆیشتووە بۆ لای كافرەكان (پاشگەز بۆتەوە)، بەقەدەر ئەو**

(١) بڕوانه: ٢٧١٣.

(٢) ئەوە لەو غەنیمەتە بدەن بەوانەی ژنەكانیان ڕۆیشتووە بەئەندازەی ئەوەی كه خەرجیان كردووە لە مارەیی و پێویستی ژنەكانیاندا.

(٣) كه لە ئایەتەكەدا بە (فعل) هاتووە (فعاقبتم)، مەبەستی ئەوەیە مانای دەكات.

پارەیەی لەمارەیی ژنە کافراندا خەرجی کردووە، کە کۆچیان کردووە (و مسوڵمان بوون)، وە ئێمە پێ نازانین هیچ ئافرەتێك لەوانەی کۆچیان کردووە پاشگەز بووبێتەوە دوای باوەڕهێنانی. (زوهری دەڵێ:) پێمان گەیشتووە کە ئەبو بەصیری کوڕی ئەسیدی سەقەفی هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە ماوەی ڕێککەوتنەکەدا بەباوەڕداری و کۆچکردوویی، جا ئەخنەسی کوڕی شەریق نامەیەکی نووسی بۆ پێغەمبەر ﷺ، پرسیاری ئەبو بەصیری لێ دەکرد، ئیتر فەرموودەکە تا کۆتایی دەگێڕێتەوە. ................................

## ١٦- بَاب الشُّرُوطِ فِي الْقَرْضِ

٢٧٣٤- وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي جَعْفَرُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ هُرْمُزَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ ذَكَرَ رَجُلًا سَأَلَ بَعْضَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يُسْلِفَهُ أَلْفَ دِينَارٍ، فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى[1].

وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ وَعَطَاءٌ: إِذَا أَجَّلَهُ فِي الْقَرْضِ جَازَ.

## ١٦- باسی مەرج دانان لە قەرزداندا

٢٧٣٤- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە باسی پیاوێکی کرد داوای کرد لە کەسێکی بەنی ئیسرائیل کە هەزار دیناری بە قەرز پێ بدات، ئەویش پێیدا بۆ ماوەیەکی دیاری کراو. ئیبنو عومەر و ﷺ عەتا دەڵێن: ئەگەر ماوەیەکی دیاری کرد بۆ قەرز دروستە.

(١) بڕوانە: ١٤٩٨.

## ١٧- بابُ المُكَاتَبِ، وَمَا لا يَحِلُّ مِنَ الشُّرُوطِ التي تُخَالِفُ كِتَابَ اللهِ

وَقَالَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ ﷺ فِي المُكَاتَبِ: شُرُوطُهُمْ بَيْنَهُمْ. وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ -أَوْ عُمَرُ-: كُلُّ شَرْطٍ خَالَفَ كِتَابَ اللهِ فَهْوَ بَاطِلٌ، وَإِنِ اشْتَرَطَ مِائَةَ شَرْطٍ. وَقَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: يُقَالُ عَنْ كِلَيْهِمَا، عَنْ عُمَرَ وَابْنِ عُمَرَ.

## ١٧- باسی (حوکمی) کۆیلەی نووسراو لەگەڵدا کراو، ئەو مەرجانە دروست نین کە پێچەوانەی قورئانن

**جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: دەربارەی کۆیلەی نووسراو لەگەڵداکراو مەرجەکانی ئەوان و خاوەنەکانیان (کاریان پێ دەکرێ). وە ئیبنو عومەر-یان عومەر- وتی: هەر مەرجێك پێچەوانەی قورئانەکەی خوا بێت ئەوە دروست نییە، با سەد مەرجیش دانێت. ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئەم وتەیە لە هەردووکیانەوە باس دەکرێ: لە عومەر و لە ئیبنو عومەریشەوە.**

٢٧٣٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: أَتَتْهَا بَرِيرَةُ تَسْأَلُهَا فِي كِتَابَتِهَا، فَقَالَتْ: إِنْ شِئْتِ أَعْطَيْتُ أَهْلَكِ وَيَكُونُ الوَلاَءُ لِي. فَلَمَّا جَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ذَكَّرْتُهُ، ذَلِكَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "ابْتَاعِيهَا فَأَعْتِقِيهَا، فَإِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ". ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى المِنْبَرِ فَقَالَ: "مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللهِ؟! مَنِ اشْتَرَطَ شَرْطًا لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ فَلَيْسَ لَهُ، وَإِنِ اشْتَرَطَ مِائَةَ شَرْطٍ"[١].

**٢٧٣٥- عائیشە ﷺ دەڵێ: بەریرە هات بۆ لای، داوای یارمەتی لێ کرد دەربارەی نووسراوی ئازادکردنەکەی، عائیشەش وتی: ئەگەر بتەوێ من پارەکەت دەدەم**

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

بەخاوەنەکەت و هەقدارییەکە (وەلائەکە) بۆ من بێت، جا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هات ئەو باسەم بۆ باس کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: ((بیکڕە و ئازادی بکە، چونکە بێگومان هەقداری بۆ ئەو کەسەیە (کەنیزەکەکە) ئازاد دەکات))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتە سەر دوانگە و فەرمووی: ((خەڵکانێك چییانە چەند مەرجێك بەمەرج دەگرن کە لەقورئانەکەی خوادا نییە؟ هەرکەسێك مەرجێك دابنێ کە لەقورئانەکەی خوادا نەبێت، ئەو مەرجە مافی ئەو نییە، با سەد مەرجیش دابنێت)).

## ١٨- بابُ مَا يَجُوزُ مِنَ الاشْتِرَاطِ وَالثُّنْيَا فِي الإِقْرَارِوَالشُّرُوطِ الَّتِي يَتَعَارَفُهَا النَّاسُ بَيْنَهُمْ، وَإِذَا قَالَ: مِائَةٌ إِلَّا وَاحِدَةً أَوْ ثِنْتَيْنِ.

وَقَالَ ابْنُ عَوْنٍ عَنِ ابْنِ سِيرِينَ: قَالَ رَجُلٌ لِكَرِيِّهِ: أَدْخِلْ رِكَابَكَ، فَإِنْ لَمْ أَرْحَلْ مَعَكَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا، فَلَكَ مِائَةُ دِرْهَمٍ. فَلَمْ يَخْرُجْ، فَقَالَ شُرَيْحٌ مَنْ شَرَطَ عَلَى نَفْسِهِ طَائِعًا غَيْرَ مُكْرَهٍ فَهْوَ عَلَيْهِ. وَقَالَ أَيُّوبُ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ: إِنَّ رَجُلًا بَاعَ طَعَامًا وَقَالَ: إِنْ لَمْ آتِكَ الأَرْبِعَاءَ فَلَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بَيْعٌ. فَلَمْ يَجِئْ، فَقَالَ شُرَيْحٌ لِلْمُشْتَرِي: أَنْتَ أَخْلَفْتَ. فَقَضَى عَلَيْهِ.

## ١٨-باسی (ڕوونکردنەوەی) ئەوەی دروستە لە مەرجدانان و هەڵاواردن لەدان پێدانانداء وە (ڕوونکردنەوەی) ئەو مەرجانەی کە باو و زانراوە لە نێوان خەڵکیدا، وە ئەگەر کەسێک وتی: (فڵانەکەس) سەدی لامە جگە لە یەک یان دوو

ئیبنو عەون لە ئیبنو سیرینەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێك بڵێ بەو کەسەی بەکرێی گرتووە: وڵاخەکەت بێنە ژوورەوە (بۆ حەوشەکەیان)، جا ئەگەر ڕۆژی ئەوە و ئەوە سەفەرم نەکرد لەگەڵت، ئەوە لەمنەوە سەد درهەم بۆ تۆ، جا

**ئەگەر لەو ڕۆژەدا (دیاری کردووە) نەڕۆیشت بۆ سەفەر ئەوە شورەیح دەڵێ: هەر کەس بەویستی خۆی مەرج لەسەر خۆی دابنێ بێ زۆر لێکردن، ئەوە ئەو مەرجە دەکەوێتە سەری. وە ئەییوب لە ئیبنو سیرینەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پیاوێك خۆراکێك بفرۆشێت بەکەسێك و بڵێ: ئەگەر چوار شەممە نەهاتم بۆ لات، ئەوە لە نێوان من و تۆدا هیچ کڕین و فرۆشتنێك نییە، ئینجا ڕۆژی چوار شەممە کڕیارەکە نەهات، ئەوە شورەیح بە کڕیارەکە دەڵێ: تۆ پێچەوانەت کردووە (لە بەڵێنەکەتدا)، بۆیە بڕیاری دا لە دژی. (کە مامەڵەکە دانەمەزرا).**

**٢٧٣٦-** حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "إِنَّ للهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا، مِائَةً إِلَّا وَاحِدًا، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الجَنَّةَ"[1].

**٢٧٣٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوا نەوەد و نۆ ناوی هەیە، سەد یەك (ناو) نەبێت، هەرکەس بیانژمێرێ[2] دەچێتە بەهەشتەوە))**

## ١٩- بابُ الشُّرُوطِ فِي الوَقْفِ

**٢٧٣٧-** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ، حَدَّثَنَا ابْنُ عَوْنٍ قَالَ: أَنْبَأَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ أَصَابَ أَرْضًا بِخَيْبَرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ يَسْتَأْمِرُهُ فِيهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَصَبْتُ أَرْضًا بِخَيْبَرَ، لَمْ أُصِبْ مَالًا قَطُّ أَنْفَسَ عِنْدِي مِنْهُ، فَمَا تَأْمُرُ بِهِ؟ قَالَ: "إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا، وَتَصَدَّقْتَ بِهَا". قَالَ: فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ

---

(١) بڕوانە: ٦٤١٠، ٧٣٩٢.

(٢) واتە: زانیاری دەربارەیان هەبێ و باوەڕی پتەوی پێیان هەبێت و کار بە ماناکانیان بکات.(بڕوانە: إرشاد الساري:٦/٢١٩).

أَنَّهُ لَا يُبَاعُ وَلَا يُوهَبُ وَلَا يُورَثُ، وَتَصَدَّقَ بِهَا فِي الفُقَرَاءِ وَفِي القُرْبَى، وَفِي الرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللهِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالضَّيْفِ، لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالمَعْرُوفِ، وَيُطْعِمَ غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ. قَالَ: فَحَدَّثْتُ بِهِ ابْنَ سِيرِينَ فَقَالَ غَيْرَ مُتَأَثِّلٍ مَالًا[1].

## ١٩- باسی مەرج دانان لە وەقفدا

**٢٧٣٧- عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە عومەری كوڕی خەتتاب زەوییەكی لە خەیبەر بەركەوت، جا هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی پێ بكات دەربارەی، جا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان من زەوییەكم لە خەیبەر بەركەوتووە، هیچماڵێكم دەست نەكەوتووە لەوە بەنرختربێت لام، دەی جەنابت لەبارەیەوە چ فەرمانێكم پێ دەكەیت؟ فەرمووی ﷺ : ((ئەگەر بتەوێ زەوییەكە بكە بەوەقف (و بەرهەمەكەی) بكە بەخێر))، عومەریش كردی بەخێر، بە مەرجێك (ئەو زەوییە) نەفرۆشرێت و نەبەخشرێت و نەبێتە میرات، وە كردی بەخێر بۆ هەژاران و خزمانی و ئازادكردنی كۆیلە و جیهاد لەڕێی خوا و ڕێبواران و میواندا، ئەو كەسەی سەرپەرشتی كرد گوناهی ناگات بەپێی پێویست لێی بخوات و دەرخواردی خەڵكی بدات، كۆی نەكاتەوە و بیكات بە دەستمایەیە بۆ خۆی. ئیبنو سیرین ئەم فەرموودەی گێڕایەوە و وتی: پاشەكەوتی نەكات و نەیكاتە ماڵی خۆی.**

(١) بڕوانە: ٢٣١٣.

## ١- بابُ الوَصَايَا

وَقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: "وَصِيَّةُ الرَّجُلِ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ"، وَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعْدَ مَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثْمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٨١﴾ فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨٢﴾ ﴾ البقرة. ﴿ جَنَفًا ﴾: مَيْلًا، ﴿ مُتَجَانِفٍ ﴿٣﴾ ﴾ المائدة: مَائِلٌ.

## ١- باسی (حوكمی) وەسیەت كردن

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ كە فەرموویەتی: ((هەركەس (پێویستە) وەسیەتی بەنووسراوی لای خۆی بێت)). وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (كاتێك یەكێكتان لەسەرەمەرگدا بوو، پێویست كراوە لە سەرتان ئەگەر ماڵی لەپاش بەجێما، وەسیەتكردن بەباشی بۆ دایك و باوك و خزمان(ێك كە میراتیان بەرنەكەوێ)، بەجوانی و ڕێك و پێكی، ئەمە پێویست كراوە لەسەر پارێزكاران، ئینجا هەركەسێك وەسیەتەكەی گۆڕی دوای بیستنی، ئەوە گوناهی هەر لەملی ئەو كەسانەدایە كە دەیگۆڕن، بێگومان خواش بیسەری**

**زانایە، ئینجا هەر کەسێك ترسا لە وەسیەتکار کە نادادگەری[1] یان گوناهێك بکات، جا (ئەو کەسە) میراتگرانی پێك بێنێ، ئەوە هیچ گوناهێکی لەسەر نییە، بەڕاستی خودا لێخۆشبووی بەبەزەییە). (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ﴿ جَنَفًا ﴾ واتە: لادان و نادادگەری، ﴿ مُتَجَانِفٍ ﴿٣﴾ ﴾ المائدة. ویست و مەبەستی هەبێت.**

**٢٧٣٨-** حَدَّثَنَا عبد اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "مَا حَقُّ آمْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُوصِي فِيهِ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ، إِلَّا وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ".
تَابَعَهُ محَمَّدُ بْن مُسْلِمٍ، عَنْ عَمْرٍو، عَنِ ابن عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**٢٧٣٨- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مافی هیچ مسوڵمانێك نییە کە شتێکی هەبێت پێویستی بەوەسێت بێت، شەوێك یان دوو شەو سەربنێتەوە، مەگەر وەسێتەکەی نووسرابێت لەلای)). موحەممەدی کوڕی موسلیم ئەم فەرموودەی لە عەمرەوە لە ئیبنو عومەرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە، وە پاڵپشتی مالیکی کردووە لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەدا.**

**٢٧٣٩-** حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الحَارِثِ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ مُعَاوِيَةَ الجُعْفِيُّ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، خَتَنِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَخِي جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ الحَارِثِ قَالَ: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عِنْدَ مَوْتِهِ دِرْهَمًا وَلَا دِينَارًا وَلَا عَبْدًا وَلَا أَمَةً وَلَا شَيْئًا، إِلَّا بَغْلَتَهُ البَيْضَاءَ وَسِلَاحَهُ وَأَرْضًا جَعَلَهَا صَدَقَةً[2].

(١) یان مەیی هەبێت بە لایەکدا.

(٢) بڕوانە: ٢٨٧٣، ٢٩١٢، ٣٠٩٨، ٤٤٦١.

**٢٧٣٩- ئەبو ئیسحاق دەگێڕێتەوە لە عەمڕی كوڕی حاریسەوە كە خەزوری پێغەمبەری خوایە ﷺ و برای جوەیرییەی كچی حاریسەیە[1]، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتی مردنیدا هیچی بەجێ نەهێڵا، نە دینار و نە درهەم، نە كۆیلەو نە كەنیزەك، نە هیچ شتێك جگە لەهێسترە سپییەكەی و چەكەكەی و زەوییەك كە كردبووی بەخێر.**

**٢٧٤٠-** حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، حَدَّثَنَا طَلْحَةُ بْنُ مُصَرِّفٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ هَلْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَوْصَى؟ فَقَالَ: لَا. فَقُلْتُ: كَيْفَ كُتِبَ عَلَى النَّاسِ الوَصِيَّةُ أَوْ أُمِرُوا بِالوَصِيَّةِ؟ قَالَ: أَوْصَى بِكِتَابِ اللهِ[2].

**٢٧٤٠- تەڵحەی كوڕی موصەرریف دەڵێ: پرسیارم لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ كرد: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتی كردووە؟ ئەویش وتی: نەخێر، منیش وتم: ئەی وەسیەت كردن چۆن لەسەر خەڵك پێویست كراوە -یان چۆن فەرمانیان پێ كراوە بە وەسیەت كردن؟- وتی: وەسیەتی كردووە بە دەستگرتن بە قورئانەكەی خواوە.**

**٢٧٤١-** حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ زُرَارَةَ، أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ عَنِ الأَسْوَدِ قَالَ: ذَكَرُوا عِنْدَ عَائِشَةَ أَنَّ عَلِيًّا ﷺ كَانَ وَصِيًّا. فَقَالَتْ: مَتَى أَوْصَى إِلَيْهِ وَقَدْ كُنْتُ مُسْنِدَتَهُ إِلَى صَدْرِي -أَوْ قَالَتْ: حَجْرِي- فَدَعَا بِالطَّسْتِ، فَلَقَدِ انْخَنَثَ فِي حَجْرِي، فَمَا شَعَرْتُ أَنَّهُ قَدْ مَاتَ، فَمَتَى أَوْصَى إِلَيْهِ؟[3].

---

(١) سەرنج: جوەیرییەی كچی حاریسە ﷺ یەكێك بووە لە خێزانەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ..(بڕوانە: إرشاد الساري:٦/٢٢٤).

(٢) بڕوانە: ٤٤٦٠، ٥٠٢٢.

(٣) بڕوانە: ٤٤٥٩.

**٢٧٤١- ئەسوەد دەڵێ: کەسانێك لای عائیشه ﵂ باسیان کرد کە عەلی ﵁ وەسیەتی بۆ کراوە (لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ)، عائیشەش وتی: کەی وەسیەتی بۆ کرد لەکاتێکدا من (سەری) پێغەمبەرم ﷺ نابوو بە سنگمەوە - یان وتی: (سەری پێغەمبەرم ﷺ) خستبوویە کۆشمەوە- ئینجا داوای تەشتێکی کرد، سا سوێند بێت لە کۆشمدا جەستەی خاو بۆیەوە، وە هەستم پێ نەکرد وەفاتی کرد، کەواتە کەی وەسیەتی بۆ کرد[1].**

## ٢ - بابٌ: أَنْ يَتْرُكَ وَرَثَتَهُ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَتَكَفَّفُوا النَّاسَ

٢٧٤٢- حدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﵁ قَالَ: جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُنِي وَأَنَا بِمَكَّةَ، وَهْوَ يَكْرَهُ أَنْ يَمُوتَ بِالأَرْضِ الَّتِي هَاجَرَ مِنْهَا قَالَ: "يَرْحَمُ اللهُ ابْنَ عَفْرَاءَ". قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ: "لَا". قُلْتُ: فَالشَّطْرُ؟ قَالَ: "لَا". قُلْتُ: الثُّلُثُ؟ قَالَ: "فَالثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَدَعَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَدَعَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ فِي أَيْدِيهِمْ، وَإِنَّكَ مَهْمَا أَنْفَقْتَ مِنْ نَفَقَةٍ فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ، حَتَّى اللُّقْمَةُ الَّتِي تَرْفَعُهَا إِلَى فِي امْرَأَتِكَ، وَعَسَى اللهُ أَنْ يَرْفَعَكَ فَيَنْتَفِعَ بِكَ نَاسٌ وَيُضَرَّ بِكَ آخَرُونَ". وَلَمْ يَكُنْ لَهُ يَوْمَئِذٍ إِلَّا ابْنَةٌ[2].

## ٢- باسێک: کە میراتگرەکانی بەدەوڵەمەندی بەجێ بێڵێت باشترە لەوەی کە دەست پان بکەنەوە لە خەڵکی و سواڵ بکەن

**٢٧٤٢- عامیری کوڕی سەعید دەگێڕێتەوە لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصەوە ﵁ دەڵێ: من لە مەککە (نەخۆش) بووم، پێغەمبەر ﷺ هات سەردانی کردم، پێی**

---

(١) کە لە کۆشی مندا گیانی دەرچوو، ئەی ئیتر کەی وەسیەتی کرد بۆ عەلی؟!

(٢) بڕوانە: ٥٦.

ناخۆش بوو کە لەو وڵاتە بمرێت کە لێیەوە کۆچی کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوا ڕەحم بە ئیبنو عەفرا بکات))، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەت بکەم بە هەموو ماڵ و سامانەکەم؟ فەرمووی: ((نەخێر))، وتم: ئەی بە نیوەی؟ فەرمووی: ((نەخێر))، وتم: بەسێ یەکی؟ فەرمووی: ((سێ یەك (بەسە) سێ یەکیش زۆرە، بێگومان تۆ ئەگەر منداڵەکانت بەدەوڵەمەندی بەجێ بهێڵیت، باشترە لەوەی بە هەژاری بەجێیان بێڵیت دەست لە خەڵکی پان بکەنەوە (داوا بکەن پارەیەك) بخرێتە دەستیان، وە بێگومان تۆ هەر خێر و چاکەیەك بکەی، ئەوە بەڕاستی بەچاکە دەنووسرێت، هەتا ئەو پارووەش بەرزی دەکەیتەوە بۆ دەمی هاوسەرەکەت، وە ئومێد دەکەم خوا پلەت بەرز بکاتەوە، جا خەڵکانێك بەهۆی تۆوە سوودمەند ببن، وە خەڵکانێکی تر بەهۆتەوە تووشی زیان ببن))، وە سەعد لەو ڕۆژگارەدا تەنها کچێکی هەبوو.

## ٣- بَابُ الوَصِيَّةِ بِالثُّلُثِ

وَقَالَ الحَسَنُ: لَا يَجُوزُ لِلذِّمِّيِّ وَصِيَّةٌ إِلَّا الثُّلُثُ. وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴿٤٩﴾ ﴾ المائدة.

٢٧٤٣- حدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ لَوْ غَضَّ النَّاسُ إِلَى الرُّبْعِ؛ لأَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ" أَوْ "كَبِيرٌ".

## ٣- باسی وەسیەت کردن بە سێ یەک(دروستە)

حەسەن دەڵێ: دروست نییە بۆ پەیمان لەگەڵکراو وەسیەتێك بکات جگە لە سێ یەك، وە خوای بەرزو بڵند دەفەرموێ: (وە (فەرمانمان پێکردی) لە نێوانیاندا حوکم بکە بەوەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە).

**٢٧٤٣- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: خۆزگە خەڵکی (وەسێتیان) کەم بکردایەتەوە بۆ چوار یەك، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سێ یەك، سێ یەکەکەش زۆرە)) یان ((گەورەیە)).**

٢٧٤٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ بْنُ عَدِيٍّ، حَدَّثَنَا مَرْوَانُ، عَنْ هَاشِمِ بْنِ هَاشِمٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: مَرِضْتُ فَعَادَنِي النَّبِيُّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ لَا يَرُدَّنِي عَلَى عَقِبِي. قَالَ: "لَعَلَّ اللهَ يَرْفَعُكَ وَيَنْفَعُ بِكَ نَاسًا". قُلْتُ: أُرِيدُ أَنْ أُوصِيَ، وَإِنَّمَا لِي ابْنَةٌ. قُلْتُ: أُوصِي بِالنِّصْفِ قَالَ: "النِّصْفُ كَثِيرٌ". قُلْتُ: فَالثُّلُثِ؟. قَالَ: "الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ" أَوْ "كَبِيرٌ". قَالَ: فَأَوْصَى النَّاسُ بِالثُّلُثِ، وَجَازَ ذَلِكَ لَهُمْ[1].

**٢٧٤٤- عامیری کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە (کە سەعدە) ﷺ دەڵێ: نەخۆش کەوتم و پێغەمبەر ﷺ سەردانی کردم، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لای خوا نزام بۆ بکە کە نەمگێڕێتەوە بۆ ئەو وڵاتەی (شارەی) لێی کۆچم کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئومێد وایە خوا پلەت بەرز بکاتەوە، خەڵکانێك سوودت لێ ببینن)) وتم: دەمەوێت وەسیەت بکەم، وە بێگومان تەنها کچێکم هەیە، وتم: وەسیەت بکەم بەنیوەی ماڵەکەم؟ فەرمووی: ((نیوە زۆرە))، وتم: دەی سێ یەك؟ فەرمووی: ((سێ یەك باشە، سێ یەکەکەش زۆرە)) یان ((گەورەیە))، سەعد وتی: ئیتر خەڵکی بەسێ یەك وەسیەتیان کردو ئەوە دروستە بۆیان.**

---

(١) بڕوانە: ٥٦.

## ٤- بابُ قَوْلِ المُوصِي لِوَصِيِّهِ: تَعَاهَدْ وَلَدِي. وَمَا يَجُوزُ لِلْوَصِيِّ مِنَ الدَّعْوَى

٢٧٤٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ- أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ عُتْبَةُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ عَهِدَ إِلَى أَخِيهِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ أَنَّ ابْنَ وَلِيدَةِ زَمْعَةَ مِنِّي، فَاقْبِضْهُ إِلَيْكَ. فَلَمَّا كَانَ عَامُ الفَتْحِ أَخَذَهُ سَعْدٌ فَقَالَ: ابْنُ أَخِي، قَدْ كَانَ عَهِدَ إِلَيَّ فِيهِ. فَقَامَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ فَقَالَ: أَخِي، وَابْنُ أَمَةِ أَبِي، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِهِ. فَتَسَاوَقَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، ابْنُ أَخِي، كَانَ عَهِدَ إِلَيَّ فِيهِ. فَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: أَخِي وَابْنُ وَلِيدَةِ أَبِي. وَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ ابْنَ زَمْعَةَ، الوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الحَجَرُ". ثُمَّ قَالَ لِسَوْدَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ: "احْتَجِبِي مِنْهُ". لِمَا رَأَى مِنْ شَبَهِهِ بِعُتْبَةَ، فَمَا رَآهَا حَتَّى لَقِيَ اللهَ[١].

## ٤- باسی وەسیەتکار بە وەسیەت بۆ کراو بڵێ: ئاگاداری کوڕەکەم بە[٢]، وە ئەو داوایەی بۆ وەسێت بۆ کراو دروستە

**٢٧٤٥- عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: عوتبەی کوڕی ئەبی وەققاص وەسیەتی کرد بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وققاص: کە (عەبدوڕەحمانی) کوڕی کەنیزەکەی زەمعە لە منە و لێی وەرگرەوە، ئینجا ئەو ساڵەی مەککە ئازاد کرا، سەعد ئەو کوڕەی گرتە لای خۆی و وتی: برازامە براکەم وەسیەتی بۆ کردووم دەربارەی (بیهێنمە لای خۆم)، ئینجا عەبدی کوڕی زەمعەش هەستا و وتی: ئەمە برامە کوڕی کەنیزەکی باوکمە، ئەو کەنیزەکە هی باوکم بووە کاتێك ئەم کوڕەی بووە[٣]، جا هەردووکیان یەکتریان بەپاڵنان برد بۆ خزمەتی**

(١) بروانە: ٢٠٥٣.

(٢) سەرپەرشتی بکە و بیهێنە لای خۆت.

(٣) واتە: ئەو کەنیزەکە کاتێک عەبدوڕەحمان بووە ئەبو زەمعە خاوەن و گەورەی بووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ، ئینجا سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە برازامە، براكەم پێی وتووم بیگرمە لای خۆم، عەبدی كوڕی زەمعەش وتی: ئەمە برامە كوڕی كەنیزەكی باوكمە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەی عەبدی كوڕی زەمعە ئەم كوڕە هی تۆیە، منداڵ هی ئەو كەسەیە خاوەنی ژنەكە بێت، ئەوەش زینای لەگەڵدا كردووە بێ بەشی بۆ هەیە))، پاشان بە سەودەی كچی زەمعەی فەرموو: ((خۆتی لێ داپۆشە و با نەتبینێ))، كاتێك بینی عەبدوڕەحمان لە عوتبە دەچێ، ئیتر عەبدوڕەحمان سەودەی نەبینی تا مرد.

## ٥ - بابٌ: إِذَا أَوْمَأَ المَرِيضُ بِرَأْسِهِ إِشَارَةً بَيِّنَةً جَازَتْ

٢٧٤٦- حَدَّثَنَا حَسَّانُ بْنُ أَبِي عَبَّادٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ يَهُودِيًّا رَضَّ رَأْسَ جَارِيَةٍ بَيْنَ حَجَرَيْنِ، فَقِيلَ لَهَا: مَنْ فَعَلَ بِكِ؟ أَفُلاَنٌ أَوْ فُلاَنٌ؟ حَتَّى سُمِّيَ اليَهُودِيُّ، فَأَوْمَأَتْ بِرَأْسِهَا، فَجِيءَ بِهِ، فَلَمْ يَزَلْ حَتَّى اعْتَرَفَ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ فَرُضَّ رَأْسُهُ بِالحِجَارَةِ[١].

## ٥- باسێك: ئەگەر نەخۆش بەسەری ئاماژەیەكی ڕوون و دیاری كرد دروستە

٢٧٤٦- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پیاوێكی جوولەكە سەری كەنیزەكێكی لەنیوان دوو بەردا تێكشكاند، بەكەنیزەكەكە وترا: كێ وای لێكردوویت؟ ئایا فلاّن كەس بوو؟ ئایا فلاّن كەس بوو؟ هەتا ناوی پیاوە جوولەكەكە هێنرا، ئەویش بەسەری ئاماژەی كرد (بەڵێ ئەو بووە)، ئینجا پیاوە جوولەكەكە هێنرا، بەردەوام هەوڵیان لەگەڵیدا دا تا دانی بە تاوانەكەیدا نا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی كرد (وەك كەنیزەكەكەی لێ بكرێ)، ئەوسا سەری لە نێوان دوو بەردا تێكشكێنرا.

(١) بڕوانە: ٢٤١٣.

## ٦ - بابٌ: لَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ

**٢٧٤٧-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ وَرْقَاءَ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ المَالُ لِلْوَلَدِ، وَكَانَتِ الوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ، فَنَسَخَ اللهُ مِنْ ذَلِكَ مَا أَحَبَّ، فَجَعَلَ لِلذَّكَرِ مِثْلَ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، وَجَعَلَ لِلأَبَوَيْنِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسَ، وَجَعَلَ لِلْمَرْأَةِ الثُّمُنَ وَالرُّبْعَ، وَلِلزَّوْجِ الشَّطْرَ وَالرُّبُعَ[1].

## ٦- باسێک: وەسیەت کردن بۆ میراتگر دروست نییە

**٢٧٤٧- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: لە ڕابردوودا ماڵی میرات بۆ کوڕ (ی مردووەکە) دەبوو، وەسیەتیش بۆ دایك و باوك دەکرا، ئینجا خوا لەوە ئەوەی پێی باشە بوو گۆڕی، جا بەشی کوڕی دوو ئەوەندەی بەشی کچ دانا، وە بۆ هەریەك لەدایك و باوك شەش یەکی داناوە، بۆ ئافرەت (ژنی پیاوەکە) هەشت یەك[2] و چوار یەکی[3] دانا، وە بۆ مێرد نیوە و چوار یەکی[4] دانا.**

## ٧- بابُ الصَّدَقَةِ عِنْدَ المَوْتِ

**٢٧٤٨-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عُمَارَةَ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ ﷺ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: "أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ حَرِيصٌ، تَأْمُلُ الغِنَى، وَتَخْشَى الفَقْرَ، وَلَا تُمْهِلْ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الحُلْقُومَ قُلْتَ: لِفُلَانٍ كَذَا، وَلِفُلَانٍ كَذَا، وَقَدْ كَانَ لِفُلَانٍ"[5].

---

(١) بڕوانە: ٤٥٧٨، ٦٧٣٩.

(٢) هەشت یەک ئەگەر مێردەکەی منداڵی هەبوو.

(٣) چوار یەک ئەگەر مێردەکەی منداڵی نەبوو.

(٤) نیوە بۆ مێردی ئافرەتەکە ئەگەر ژنەکەی منداڵی نەبوو، وە چوار یەک ئەگەر منداڵی هەبوو.

(٥) بڕوانە: ١٤١٩.

## ٧- باسی (گەورەیی) ماڵ بەخشین لە سەرەمەرگدا

**٢٧٤٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام ماڵ بەخشینە پاداشتی گەورەترە؟ فەرمووی: ((ئەوە کە تۆ ماڵێك ببەخشی لەکاتێکدا لەشت ساغە و دڵت نایە (ڕژدە دەبیت)، وە هیوای دەوڵەمەندبوونت هەیە و لە هەژاری دەترسی، وە دوای مەخە تا ئەو کاتەی گیان دەگاتە گەرووت، ئینجا دەڵێیت: ئەوە بۆ فلانە کەس و فیسارە کەس، ئەوەش کاتی خۆی داومە بە فلانەکەس)).**

## ٨- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ ﴿١١﴾ ﴾ النساء.

وَيُذْكَرُ أَنَّ شُرَيْحًا وَعُمَرَ بْنَ عَبْدِ العَزِيزِ وَطَاوُسًا وَعَطَاءً وَابْنَ أُذَيْنَةَ أَجَازُوا إِقْرَارَ المَرِيضِ بِدَيْنٍ. وَقَالَ الحَسَنُ: أَحَقُّ مَا تَصَدَّقَ بِهِ الرَّجُلُ آخِرَ يَوْمٍ مِنَ الدُّنْيَا وَأَوَّلَ يَوْمٍ مِنَ الآخِرَةِ. وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ وَالحَكَمُ: إِذَا أَبْرَأَ الوَارِثَ مِنَ الدَّيْنِ بَرِئَ. وَأَوْصَى رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ أَنْ لَا تُكْشَفَ امْرَأَتُهُ الفَزَارِيَّةُ عَمَّا أُغْلِقَ عَلَيْهِ بَابُهَا. وَقَالَ الحَسَنُ: إِذَا قَالَ لِمَمْلُوكِهِ عِنْدَ المَوْتِ: كُنْتُ أَعْتَقْتُكَ. جَازَ. وَقَالَ الشَّعْبِيُّ: إِذَا قَالَتِ المَرْأَةُ عِنْدَ مَوْتِهَا إِنَّ زَوْجِي قَضَانِي وَقَبَضْتُ مِنْهُ. جَازَ. وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: لَا يَجُوزُ إِقْرَارُهُ لِسُوءِ الظَّنِّ بِهِ لِلْوَرَثَةِ، ثُمَّ اسْتَحْسَنَ فَقَالَ: يَجُوزُ إِقْرَارُهُ بِالوَدِيعَةِ وَالبِضَاعَةِ وَالمُضَارَبَةِ. وَقَدْ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الحَدِيثِ"[1]. وَلَا يَحِلُّ مَالُ المُسْلِمِينَ بِالظَّنِّ لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: "آيَةُ المُنَافِقِ إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ". وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء. فَلَمْ يَخُصَّ وَارِثًا وَلَا غَيْرَهُ. فِيهِ: عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

---

(١) بڕوانە: ٥١٤٣.

(٢) بڕوانە: ٣٤.

## ٨- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند:

## (لەپاش دەرکردنی وەسیەتێک وەسێتی پێ کرابێ (لەلایەن مردووەکەوە) یان دانەوەی قەرزێک (کە لەسەری بێت))

وە دەگێڕدرێتەوە لەشورەیح و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز و تاووس و عەتا و ئیبنو ئوزینەوە کە دان پێدانانی نەخۆشییان بەدروست و ڕەوا داناوە بەقەرزێك کە لەسەری بێت. وە حەسەن دەڵێ: شیاوترین بەخشین ماڵێکە مرۆڤ لە کۆتایی ڕۆژی (ژیانی) دونیا و یەکەم ڕۆژی قیامەت بیبەخشێت. ئیبراهیم و حەکەم دەڵێن: ئەگەر نەخۆش (لە سەرەمەرگدا) میراتگر لەقەرز ببەخشێت و ئازادی بکات، قەرزەکەی لا نامێنێت. ڕافیعی کوڕی خەدیج وەسیەتی کردووە ئەوەی لەماڵی ژنە فەزارییەکەیدایە هەرچی دەرگای لەسەر داخراوە ئاشکرا نەکرێت. وە حەسەن دەڵێ: ئەگەر کەسێك لە سەرەمەرگدا بڵێ بە کۆیلەکە: من کاتی خۆی تۆم ئازاد کردووە، دروستە. وە شەعبی دەڵێ: ئەگەر ئافرەت لە سەرەمەرگیدا بڵێ: مێردەکەم ئەوەی هەمبووە لای پێیداوم و لێم وەرگرتووە، دروستە. وە هەندێك لە زانایان دەڵێن: دان پێدانانی نەخۆش بۆ هەندێك لە میراتگرانی دروست نییە، چونکە گومانی خراپی پێ دەبرێ، پاشان بەچاکیان داناوە (ئەمەیان کە) دەڵێ: دانپێدانانی بەوەی سپاردەیە و شتومەك و پارەی قازانج بەشەریکی لایە دروست و ڕەوایە. وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئاگاتان لە خۆتان بێت گومانی خراپ مەبەن، چونکە بەڕاستی گومانی خراپ بردن گەورەترین درۆیە)). وە خواردنی ماڵ و سامانی مسوڵمانان (کە سەلماوە هی میراتگرانە) حەڵاڵ نییە، بەبەڵگەی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((نیشانەی دووڕوو ئەوەیە ئەگەر کرا بەئەمانەتدار بەسەر شتێکەوە، خیانەتی لێ دەکات)). وە خوای گەورە دەفەرموێ: (بەڕاستی خوا فەرمانتان پێ دەکات

بەدانەوەی گشت سپاردەکان بۆ خاوەنەکانیان)، (خوا) تايبەتی نەکردووە بە میراتگر و هیچ کەسێکی تریشەوە. لەم باسەدا فەرموودەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ هەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتییەوە[١].

٢٧٤٩- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ أَبُو الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا نَافِعُ بْنُ مَالِكِ بْنِ أَبِي عَامِرٍ أَبُو سُهَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ"[٢].

٢٧٤٩- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ((نیشانەکانی ناپاك و دووڕوو سیانن: هەر کات قسەی کرد درۆ دەکات، ئەگەر شتێکی پێ سپێردرا خیانەتی لێ دەکات، هەروەها هەر بەڵێنێکی دا نایباتە سەر)).

## ٩- بابُ تَأْوِيلِ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ ﴿١١﴾ ﴾ النساء.

وَيُذْكَرُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى بِالدَّيْنِ قَبْلَ الوَصِيَّةِ. وَقَوْلِهِ: ﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء. فَأَدَاءُ الأَمَانَةِ أَحَقُّ مِنْ تَطَوُّعِ الوَصِيَّةِ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "لَا صَدَقَةَ إِلَّا عَنْ ظَهْرِ غِنًى". وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَا يُوصِي العَبْدُ إِلَّا بِإِذْنِ أَهْلِهِ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "العَبْدُ رَاعٍ فِي مَالِ سَيِّدِهِ"[٣].

---

(١) کە دەفەرموێ: (أربع من كن فيه كان منافق خالصا).

(٢) بڕوانە: ٣٣.

(٣) بڕوانە: ١٤٢٦، ١٤٢٧.

# ٩- باسی مانای[1] ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (لەپاش (دەرکردنی) وەسیەتێک کە کردبێتتان یان دانەوەی قەرزێک (کە لەسەرتان بێت))

وە گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بڕیاری دانەوەی قەرزی داوە پێش جێبەجێکردنی وەسیەت، وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوا: (بەڕاستی خوا فەرمانتان پێ دەکات بەدانەوەی گشت سپاردەکان بۆ خاوەنەکانیان)، کەواتە دانەوەی سپاردە لە پێشترە لە وەسیەتی سوننەت. وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((خێر و ماڵ بەخشین (ی تەواو) نییە، مەگەر لەسەر دەوڵەمەندی بێت)). وە ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: نابێ کۆیلە وەسیەت بکات، مەگەر بەمۆڵەتی خاوەنەکەی. وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((کۆیلە لە ماڵی گەورەکەیدا شوان و پاسەوانە)).

٢٧٥٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، وَعُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ رضي الله عنه قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ قَالَ لِي: "يَا حَكِيمُ، إِنَّ هَذَا المَالَ خَضِرٌ حُلْوٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِسَخَاوَةِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلَا يَشْبَعُ، وَاليَدُ العُلْيَا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلَى". قَالَ حَكِيمٌ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَالذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ لَا أَرْزَأُ أَحَدًا بَعْدَكَ شَيْئًا حَتَّى أُفَارِقَ الدُّنْيَا. فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يَدْعُو حَكِيمًا لِيُعْطِيَهُ العَطَاءَ فَيَأْبَى أَنْ يَقْبَلَ مِنْهُ شَيْئًا، ثُمَّ إِنَّ عُمَرَ دَعَاهُ لِيُعْطِيَهُ فَيَأْبَى أَنْ يَقْبَلَهُ فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ المُسْلِمِينَ، إِنِّي أَعْرِضُ عَلَيْهِ حَقَّهُ الذِي قَسَمَ اللهُ لَهُ مِنْ هَذَا الفَيْءِ فَيَأْبَى أَنْ يَأْخُذَهُ. فَلَمْ يَرْزَأْ حَكِيمٌ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ بَعْدَ النَّبِيِّ ﷺ حَتَّى تُوُفِّيَ رَحِمَهُ اللهُ[2].

---

(١) کە مەبەست لە پێشخستنی وەسیەت لە قەرز لە کاتێکدا قەرز لە پێشترە بدرێتەوە.

(٢) بڕوانە: ١٧٤٢.

**٢٧٥٠- حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ دەڵێ: داوای (ماڵ و سامانم) لە پێغەمبەری خوا کرد ﷺ، ئەویش پێی دام، پاشان جارێکی تر داوام کرد، ئەویش پێی دام، پاشان داوام کرد، پێی دام، پاشان فەرمووی: ((ئەی حەکیم! بێگومان ئەم ماڵ و سامانە وەك میوەیەکی سەوز و شیرین وایە، جا هەرکەس بەبێ داواکردن و چاوتێبڕین وەری بگرێت، ئەوە فەڕ و بەرەکەتی تێدەکەوێ بۆی، هەرکەسیش بەتەمای بوون و چاوتێبڕین وەری بگرێت، بەرەکەت و فەڕی تێ ناکەوێ بۆی، وەك کەسێك وایە هەر بخوات و تێر نەبێ، دەستی سەرەوە چاکترە لەدەستی ژێرەوە)). حەکیم دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەو زاتەی تۆی بەڕاستی ڕەوانە کردووە دوای تۆ داوای هیچ شتێك لەکەس ناکەم، هەتا لە دونیا دەردەچم و دەمرم. جا ئەبو بەکر ﷺ حەکیمی بانگ دەکرد بەشەکەی خۆی پێ بدات (لە بەیتولمال)، کەچی حەکیم وەری نەدەگرت لێی، پاشان عومەر ﷺ بانگی کرد تا ماڵ و سامانی بداتێ، کەچی هیچی لێ وەرنەدەگرت، بۆیە عومەر وتی: مسوڵمانینە ئاگادار بن (حەکیم) بەشەکەی خۆی لەم دەستکەوتە پێ دەدەم، کەچی ئەو وەری ناگرێ، حەکیم شتی لەکەس وەرنەدەگرت دوای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەتا مرد و لە دونیا دەرچوو).**

**٢٧٥١-** حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ السَّخْتِيَانِيُّ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمٌ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: "كُلُّكُمْ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالإِمَامُ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِهِ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالمَرْأَةُ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا رَاعِيَةٌ وَمَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا، وَالخَادِمُ فِي مَالِ سَيِّدِهِ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ". قَالَ: وَحَسِبْتُ أَنْ قَدْ قَالَ: "وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي مَالِ أَبِيهِ"[1].

---

(١) بڕوانە: ٨٩٣.

**٢٧٥١- زوهری دەڵێ: سالیم لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ بۆی گێڕامەوە دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەمووتان شوان و بەرپرسن، وە هەمووتان بەرپرسیارن لە شوانییەکەتان، پێشەوا بەرپرسە، وە بەرپرسیارە لەبەرپرسیاریەتییەکەی، وە پیاو شوانە لەناو ماڵ و منداڵیدا و بەرپرسیارە لەشوانیەتییەکەی، وە ئافرەت لەماڵی مێردەکەیدا شوانە و بەرپرسیارە لەشوانیەتییەکەی، بەردەست و خزمەتکار شوانە لەماڵی گەورەکەیدا، وە بەرپرسە لەشوانیەتییەکەی))، وا گومان دەبەم کە فەرمووی: ((وە پیاو شوان و بەرپرسە لە ماڵی باوکیدا)).**

## ١٠- بَابٌ: إِذَا وَقَفَ أَوْ أَوْصَى لِأَقَارِبِهِ، وَمَنِ الأَقَارِبُ؟

وَقَالَ ثَابِتٌ عَنْ أَنَسٍ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لأَبِي طَلْحَةَ: "اجْعَلْهَا لِفُقَرَاءِ أَقَارِبِكَ". فَجَعَلَهَا لِحَسَّانَ وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ.

وَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ ثُمَامَةَ، عَنْ أَنَسٍ مِثْلَ حَدِيثِ ثَابِتٍ قَالَ: "اجْعَلْهَا لِفُقَرَاءِ قَرَابَتِكَ". قَالَ أَنَسٌ: فَجَعَلَهَا لِحَسَّانَ وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَكَانَا أَقْرَبَ إِلَيْهِ مِنِّي، وَكَانَ قَرَابَةُ حَسَّانَ وَأُبَيٍّ مِنْ أَبِي طَلْحَةَ وَاسْمُهُ زَيْدُ بْنُ سَهْلِ بْنِ الأَسْوَدِ بْنِ حَرَامِ بْنِ عَمْرِو بْنِ زَيْدِ مَنَاةَ بْنِ عَدِيِّ بْنِ عَمْرِو بْنِ مَالِكِ بْنِ النَّجَّارِ، وَحَسَّانُ بْنُ ثَابِتِ بْنِ الْمُنْذِرِ بْنِ حَرَامٍ فَيَجْتَمِعَانِ إِلَى حَرَامٍ، وَهْوَ الأَبُ الثَّالِثُ، وَحَرَامُ بْنُ عَمْرِو بْنِ زَيْدِ مَنَاةَ بْنِ عَدِيِّ بْنِ عَمْرِو بْنِ مَالِكِ بْنِ النَّجَّارِ، فَهْوَ يُجَامِعُ حَسَّانُ أَبَا طَلْحَةَ وَأُبَيٌّ إِلَى سِتَّةِ آبَاءٍ إِلَى عَمْرِو بْنِ مَالِكٍ، وَهْوَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبِ بْنِ قَيْسِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ مُعَاوِيَةَ بْنِ عَمْرِو بْنِ مَالِكِ بْنِ النَّجَّارِ، فَعَمْرُو بْنُ مَالِكٍ يَجْمَعُ حَسَّانَ وَأَبَا طَلْحَةَ وَأُبَيًّا. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا أَوْصَى لِقَرَابَتِهِ فَهْوَ إِلَى آبَائِهِ فِي الإِسْلاَمِ.

## ١٠- باسێک: ئەگەر کەسێک وەقفێک یان وەسیەتی کرد بۆ خزمەکانی، وە خزمان کێن؟

سابیت لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو تەڵحەی فەرمووو: (( (زەوی بەیرِوحا) بکە بە وەقف بۆ خزمە هەژارەکانت))، ئەویش کردی بەوەقف بۆ حەسسان و ئوبەی کوڕی کەعب. وە (موحەممەد کوڕی عەبدوڵلای) ئەنصاری دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە لە سومامەوە لە ئەنەسەوە، هاوشێوەی فەرموودەکەی سابیت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بیکە بەوەقف بۆ خزمە هەژارەکانت))، ئەنەس دەڵێ: ئەویش کردیە وەقف بۆ حەسسان و ئوبەی کوڕی کەعب، کە هەردووکیان (لە خزمایەتیدا) لە من نزیکتربوون لە ئەبو تەڵحەوە، وە خزمایەتی حەسسان و ئوبەی لە ئەبو تەڵحەوە بوو، کە ناوی زەیدی کوڕی سەهلی کوڕی ئەسوەدی کوڕی حەرامی کوڕی عەمرِی کوڕی زەیدی مەناتی کوڕی عەدی کوڕی عەمری کوڕی مالیکی کوڕی نەجارە. حەسسانیش کوڕی سابیتی کوڕی مونزیری کوڕی حەرامە، کەواتە لە حەرامدا دەگەنەوە بەیەکتری، کە باوکی سێیەمە. وە حەرامی کوڕی عەمرِی کوڕی زەیدی مەناتی کوڕی عەدیی کوڕی عەمرِی کوڕی مالیکی کوڕی نەجارە، کەواتە (حەرامی کوڕی عەمرِی کوڕی مالیك) حەسسان و ئەبو تەڵحە کۆدەکاتەوە. وە ئوبەی (لەگەڵ حەسسان و ئەبو تەڵحە کۆ دەبێتەوە) تا شەش باپیرە، تا دەگاتە عەمرِی کوڕی مالیك، (بەم جۆرە) کە ئەو ئوبەی کوڕی کەعبی کوڕی قەیسی کوڕی عوبەیدی کوڕی زەیدی کوڕی موعاویەی کوڕی عەمرِی کوڕی مالیکی کوڕی نەجارە، کەواتە: عەمرِی کوڕی مالیك هەریەك لە حەسسان و ئەبو تەڵحە و ئوبەی کۆدەکاتەوە. وە هەندێکیان[1] دەڵێن: ئەگەر وەسیەتی کرد بۆ خزمەکانی، ئەوە تا ئەو باپیرانەی دەگرێتەوە کە مسوڵمانن.

---

(١) مەبەستی ئەبو یوسوف هاوڕێی ئەبو حەنیفەیە.(بڕوانە: إرشاد الساري:٦/٢٤٠).

**٢٧٥٢-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسًا ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لأَبِي طَلْحَةَ: "أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأَقْرَبِينَ". قَالَ أَبُو طَلْحَةَ: أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَسَمَهَا أَبُو طَلْحَةَ فِي أَقَارِبِهِ وَبَنِي عَمِّهِ[١]. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ الشعراء. جَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يُنَادِي: "يَا بَنِي فِهْرٍ، يَا بَنِي عَدِيٍّ". لِبُطُونِ قُرَيْشٍ[٢]. وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: لَمَا نَزَلَتْ: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ الشعراء. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ"[٣].

**٢٧٥٢- عەبدوڵلای کوڕی ئەبو تەڵحە دەگێڕێتەوە کە لە ئەنەسی ﷺ بیست وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە ئەبو تەڵحە: ((ڕام وایە (باخە دارخورماکانی بەیرۆحا) وەقف بکەیت بۆ خزمە نزیکەکانت))، ئەبو تەڵحە وتی: وای لێدەکەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا ئەبو تەڵحە دابەشیکرد لە نێوان خزم و ئامۆزاکانیدا، ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ الشعراء[٤] دابەزی، پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە بانگکردن و فەرمووی: ((ئەی بەنی فیهر! ئەی بەنی عەدیی!)) بە بنەماڵە و تیرەکانی قورەیش. ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتەی: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ الشعراء، دابەزاند، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و فەرمووی: ((ئەی کۆمەڵی قورەیش!)).**

---

(١) بڕوانە: ١٤٦١.

(٢) بڕوانە: ٣٥٢٥.

(٣) بڕوانە: ٢٧٥٣.

(٤) واتە: خزم و کەسە نزیکەکانت بترسێنە.

## ١١ - بابٌ: هَلْ يَدْخُلُ النِّسَاءُ وَالوَلَدُ فِي الأَقَارِبِ؟

٢٧٥٣- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ المُسَيَّبِ، وَأَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ أَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ:

﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ الشعراء. قَالَ: "يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ -أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا- اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ، لَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ لَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ المُطَّلِبِ لَا أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، وَيَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللَّهِ لَا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، وَيَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَلِينِي مَا شِئْتِ مِنْ مَالِي لَا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا". تَابَعَهُ أَصْبَغُ، عَنِ ابْنِ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ[1].

## ١١- باسێک: ئایا ئافرەتان و منداڵان خزمان دەیانگرێتەوە؟

**٢٧٥٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێک خوای زاڵی پایەدار ئەم ئایەتەی: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ الشعراء، دابەزاند، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و فەرمووی: ((ئەی کۆمەڵی قورەیش! -یان وشەیەکی لەوشێوە- خۆتان بکڕنەوە[2]، من لە بەرانبەر خوادا هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنم، ئەی بنەماڵەی عەبدولمەناف! من لە بەرانبەر خوادا ناتوانم هیچ سوودێکتان پێ بگەیەنم، ئەی عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەلیب! من لە بەرانبەر خوادا هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنم، ئەی صەفیەی پوری پێغەمبەری خوا ﷺ! من لە بەرانبەر خوادا هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنم، وە ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد ﷺ! ئەوەی دەتەوێ لە سامان داوای بکە لێم، بەڵام لە بەرانبەر خوادا هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنم)). ئەصبەغ ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە ئیبنو وەهبەوە لە یونسەوە لە ئیبنو شیهابەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئەبو لیەمان دەکات.**

---

(١) بڕوانە: ٣٥٢٧، ٤٧٧١.

(٢) خۆتان ڕزگار بکەن.

## ١٢ - بابٌ: هَلْ يَنْتَفِعُ الوَاقِفُ بِوَقْفِهِ؟

وَقَدِ اشْتَرَطَ عُمَرُ ﷺ لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهُ أَنْ يَأْكُلَ. وَقَدْ يَلِي الوَاقِفُ وَغَيْرُهُ. وَكَذَلِكَ مَنْ جَعَلَ بَدَنَةً أَوْ شَيْئًا للهِ ﷻ فَلَهُ أَنْ يَنْتَفِعَ بِهَا كَمَا يَنْتَفِعُ غَيْرُهُ وَإِنْ لَمْ يَشْتَرِطْ[١].

## ١٢- باسێک: ئایا وەقفكار دروستە خۆی سوود لە وەقفەكەی وەربگرێت؟

**وە بێگومان عومەر ﷺ مەرجی داناوە[٢] كە: ئەو كەسەی سەرپەرشتی دەكات گوناهی لەسەر نییە لێی بخوات، وە هەندێك جار وەقفكارەكە سەرپەرشتی (وەقفەكە) دەكات لەگەڵ كەسی تردا. هەروەها كەسێك وشترێك یان هەر شتێك بكاتە خێر لەڕێی خوادا، ئەوە بۆ كەسەكە دروستە سوودی لێ ببینێ، هەروەك چۆن خەڵكی تر سوودی لێ دەبینن با بەمەرجیشی نەگرتبێ.**

٢٧٥٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى رَجُلًا يَسُوقُ بَدَنَةً، فَقَالَ لَهُ: "ارْكَبْهَا". فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا بَدَنَةٌ. قَالَ فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ: "ارْكَبْهَا، وَيْلَكَ" أَوْ "وَيْحَكَ"[٣].

**٢٧٥٤- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێكی دی وشترێكی دیاری داوەتە بەر و لێی دەخوڕێ، فەرمووی: ((سواری بە))، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وشتری قوربانییە، لە جاری سێیەم یان چوارەمدا فەرمووی ﷺ: ((سواری بە هاوار بۆ تۆ)) یان ((داماوی بۆ تۆ)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٣١٣.

(٢) بۆ ئەو زەوییەی وەقفی كردبوو لە خەیبەر.

(٣) بڕوانە: ١٦٩٠.

٢٧٥٥- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى رَجُلًا يَسُوقُ بَدَنَةً، فَقَالَ: "ارْكَبْهَا". قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا بَدَنَةٌ. قَالَ: "ارْكَبْهَا، وَيْلَكَ". فِي الثَّانِيَةِ أَوْ فِي الثَّالِثَةِ[1].

**٢٧٥٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی دی وشترێکی دیاری داوەتە بەر و لێی دەخوڕێ، فەرمووی: ((سواری بە))، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وشتری قوربانییە، لە جاری سێیەم یان چوارەمدا فەرمووی: ((سواری بە هاوار بۆ تۆ)).**

## ١٣ - بابٌ: إِذَا وَقَفَ شَيْئًا فَلَمْ يَدْفَعْهُ إِلَى غَيْرِهِ، فَهُوَ جَائِزٌ

لِأَنَّ عُمَرَ أَوْقَفَ وَقَالَ: لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهُ أَنْ يَأْكُلَ، وَلَمْ يَخُصَّ إِنْ وَلِيَهُ عُمَرُ أَوْ غَيْرُهُ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِأَبِي طَلْحَةَ "أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأَقْرَبِينَ". فَقَالَ: أَفْعَلُ. فَقَسَمَهَا فِي أَقَارِبِهِ وَبَنِي عَمِّهِ.

## ١٣- باسێک: ئەگەر کەسێک شتێکی وەقف کرد و نەیدایە کەسێکی تر جگە لە خۆی ئەوە ئەو وەقفە دروستە

**چونکە عومەر (زەوییەکی) وەقف کرد و وتی: ئەوەی سەرپەرشتی دەکات گوناهی ناگات کە لێی بخوات، وە تایبەتی نەکرد کە عومەر یان جگە لە عومەر سەرپەرشتی بکات. وە پێغەمبەر ﷺ بەئەبو تەڵحەی فەرموو: ((ڕام وایە کە وەقفی بکەیت لەسەر خزمە نزیکەکانت))، ئەبو تەڵحەش وتی: وای لێ دەکەم، جا دابەشی کرد لە نێوان خزم و ئامۆزاکانیدا.**

---

(١) بڕوانە: ١٦٨٩.

## ١٤ - بابٌ: إِذَا قَالَ:دَارِي صَدَقَةٌ لله، وَلَمْ يُبَيِّنْ لِلْفُقَرَاءِ أَوْ غَيْرِهِمْ. فَهُوَ جَائِزٌ، وَيَضَعُهَا فِي الأَقْرَبِينَ أَوْ حَيْثُ أَرَادَ

قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لأَبِي طَلْحَةَ، حِينَ قَالَ: أَحَبُّ أَمْوَالِي إِلَيَّ بَيْرَحَاءَ، وَإِنَّهَا صَدَقَةٌ لله، فَأَجَازَ النَّبِيُّ ﷺ ذَلِكَ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا يَجُوزُ حَتَّى يُبَيِّنَ لِمَنْ. وَالأَوَّلُ أَصَحُّ.

## ١٤- باسێک: ئەگەر کەسێک وتی: خانووەکەم خێر بێ لەڕێی خوادا، ڕوونی نەکردەوە بۆ هەژاران بێ یان خەڵکانی تر ئەوە دروستە، بیکاتە وەقف بۆ خزمە نزیکەکانی بۆ هەر کەس و چینێ خۆی بیەوێ

پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو تەڵحەی فەرموو کاتێك ئەبو تەڵحە وتی: خۆشەویستترین ماڵ و سامانم بەلای خۆمەوە (دارخورماکانی) بەیرِوحایە، وە بێگومان ئەوە خێربێ لەڕێی خوادا، ئینجا پێغەمبەریش ﷺ ئەو کارەی ڕێگەپێدا. وە هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەو وەقفە دروست نییە هەتا دیاری نەکات بۆ کێی وەقف دەکات. (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) وتەی یەکەم ڕاسترە.

## ١٥ - بابٌ: إِذَا قَالَ أَرْضِي أَوْ بُسْتَانِي صَدَقَةٌ عَنْ أُمِّي. فَهُوَ جَائِزٌ، وَإِنْ لَمْ يُبَيِّنْ لِمَنْ ذَلِكَ

٢٧٥٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا مَخْلَدُ بْنُ يَزِيدَ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يَعْلَى أَنَّهُ سَمِعَ عِكْرِمَةَ يَقُولُ أَنْبَأَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ ﷺ تُوُفِّيَتْ أُمُّهُ وَهْوَ غَائِبٌ عَنْهَا،

فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمِّي تُوُفِّيَتْ وَأَنَا غَائِبٌ عَنْهَا، أَيَنْفَعُهَا شَيْءٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَنْهَا؟ قَالَ: "نَعَمْ". قَالَ: فَإِنِّي أُشْهِدُكَ أَنَّ حَائِطِي المِخْرَافَ صَدَقَةٌ عَلَيْهَا[1].

## ١٥- باسێک: ئەگەر کەسێک وتی: زەوییەکەم یان باخەکەم خێربێت بۆ دایکم ئەوە دروستە، با دیاریشی نەکات ئەو وەقف کردنە بۆ کێیە

**٢٧٥٦- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ دایکی مرد، لە کاتێکدا سەعد ئامادەی مردنەکەی نەبوو، جا سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان دایکم مرد و منیش ئامادەی مردنەکەی نەبووم، ئایا ئەگەر خێرێکی بۆ بکەم هیچ سوودی پێ دەگەیەنێت؟ فەرمووی: ((بەڵێ))، سەعد وتی: دە تۆ دەکەم بەشایەت کە باخە پڕ بەروبوومەکەم خێربێت بۆ ئەو (دایکم).**

## ١٦ - بابٌ: إِذَا تَصَدَّقَ أَوْ أَوْقَفَ بَعْضَ مَالِه، أَوْ بَعْضَ رَقِيقِه أَوْ دَوَابِّه، فَهُوَ جَائِزٌ

**٢٧٥٧-** حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبٍ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ كَعْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللهِ وَإِلَى رَسُولِهِ ﷺ، قَالَ: "أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ". قُلْتُ: فَإِنِّي أُمْسِكُ سَهْمِي الذِي بِخَيْبَرَ[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٧٦٢، ٢٧٧٠.

(٢) بـــڕوانە: ٢٩٤٧، ٢٩٤٨، ٢٩٤٩، ٢٩٥٠، ٣٠٨٨، ٣٥٥٦، ٣٨٨٩، ٣٩٥١، ٤٤١٨، ٤٦٧٣، ٤٦٧٦، ٤٦٧٧، ٤٦٧٨، ٦٢٥٥، ٦٦٩٠، ٧٢٢٥.

## ١٦- باسێک: ئەگەر کەسێک ماڵێکی کرد بەخێر یان هەندێک لە سامانەکەی کرد بە وەقف، یان هەندێک لە کۆیلەکانی یان وڵاخەکانی، ئەوە دروستە

**٢٧٥٧- کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی من لە تەوبەکردنەکەمدا (دەمەوێت) هەموو سامانەکەم بکەم بەخێر لەڕێی خواو پێغەمبەرەکەی دا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەندێك لەماڵەکەت بهێڵەوە بۆ خۆت، ئەوە بۆ تۆ باشترە))، منیش وتم: بێگومان ئەو بەشەی لەخەیبەر هەمە دەیهێڵمەوە بۆ خۆم.**

## ١٧- بابُ مَنْ تَصَدَّقَ إِلى وَكِيلِهِ ثُمَّ رَدَّ الوَكِيلُ إِلَيْهِ

٢٧٥٨- وَقَالَ إِسْمَاعِيلُ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، لَا أَعْلَمُهُ إِلَّا عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾﴾ آل عمران. جَاءَ أَبُو طَلْحَةَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، يَقُولُ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي كِتَابِهِ: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾﴾ آل عمران. وَإِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالِي إِلَيَّ بِيرُحَاءَ -قَالَ: وَكَانَتْ حَدِيقَةً كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدْخُلُهَا وَيَسْتَظِلُّ بِهَا وَيَشْرَبُ مِنْ مَائِهَا- فَهِيَ إِلَى اللهِ ﷻ وَإِلَى رَسُولِهِ ﷺ، أَرْجُو بِرَّهُ وَذُخْرَهُ، فَضَعْهَا- أَيْ رَسُولَ اللهِ- حَيْثُ أَرَاكَ اللهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "بَخْ يَا أَبَا طَلْحَةَ، ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، قَبِلْنَاهُ مِنْكَ وَرَدَدْنَاهُ عَلَيْكَ، فَاجْعَلْهُ فِي الأَقْرَبِينَ". فَتَصَدَّقَ بِهِ أَبُو طَلْحَةَ عَلَى ذَوِي رَحِمِهِ، قَالَ: وَكَانَ مِنْهُمْ أُبَيٌّ وَحَسَّانُ، قَالَ: وَبَاعَ حَسَّانُ حِصَّتَهُ مِنْهُ مِنْ مُعَاوِيَةَ، فَقِيلَ لَهُ: تَبِيعُ صَدَقَةَ أَبِي

طَلْحَةَ؟! فَقَالَ: أَلاَ أَبِيعُ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ بِصَاعٍ مِنْ دَرَاهِمَ؟ قَالَ: وَكَانَتْ تِلْكَ الحَدِيقَةُ فِي مَوْضِعِ قَصْرِ بَنِي حُدَيْلَةَ الذِي بَنَاهُ مُعَاوِيَةُ[1].

## ١٧- باسی کەسێک خێرکردنەکەی بداتە دەستی بریکارەکەی، پاشان بریکارەکەش خێرەکە بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی

**٢٧٥٨- ئەنەس ﷺ دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە:** ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۝٩٢﴾ آل عمران.[2] **دابەزی، ئەبو تەڵحە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! خوای پاك و بەرز و بڵند لەقورئانەکەیدا دەفەرموێ:** ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۝٩٢﴾ آل عمران. **وە بێگومان خۆشەویستترین ماڵ و سامانی من بەلای خۆمەوە بیرۆحایە -دەڵێ: باخێك بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەرۆیشتە ناوی و دەچوویە ژێر سێبەری درەختەکانی، وە لە ئاوەکەی دەخواردەوە-، ئەوە خێر بێ بۆ خوای گەورەو بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، بەئومێدی ئەوەم ببێتە چاکە و توێشوو بۆم، جا تۆ -پێغەمبەری خوا ﷺ- لە هەر شوێنێکدا خوا پێی خۆشە بەکاری بێنە و دایبنێ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئافەرین! ئەی ئەبو تەڵحە ئەوە ماڵێکە قازانجی کردووە، لێمان وەرگرتی و دامانەوە پێت، وە بیکەرە خێر بۆ خزمە نزیکەکانت))، ئەبو تەڵحەش کردی بەخێر بەسەر خزمەکانیدا، ئەنەس دەڵێ: لەو خزمانەی ئوبەی و حەسسانیان تێدابوو، حەسسان بەشەکەی خۆی لەو زەوییە فرۆشت بە موعاوییە، پێی وترا: خێرەکەی ئەبو تەڵحە دەفرۆشیت؟ حەسسان وتی: من مەنێ خورما نەفرۆشم بە مەنێ درهەم؟ ئەنەس دەڵێ: ئەو باخە لەشوێنی کۆشکی بەنی جەدیلەدا بوو کە موعاوییە دروستی کرد.**

---

(١) بڕوانە: ١٤٦١.

(٢) واتە: ئێوە هەرگیز بەخێر و چاکە ناگەن تا هەندێک لەو داراییەی کە خۆشتان دەوێت بەختی نەکەن.

**١٨- باب قَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ ﴿٨﴾﴾ النساء.**

٢٧٥٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الفَضْلِ أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: إِنَّ نَاسًا يَزْعُمُونَ أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ نُسِخَتْ، وَلَا وَاللهِ مَا نُسِخَتْ، وَلَكِنَّهَا مِمَّا تَهَاوَنَ النَّاسُ، هُمَا وَالِيَانِ وَالٍ يَرِثُ، وَذَاكَ الَّذِي يَرْزُقُ، وَوَالٍ لَا يَرِثُ، فَذَاكَ الَّذِي يَقُولُ بِالمَعْرُوفِ، يَقُولُ: لَا أَمْلِكُ لَكَ أَنْ أُعْطِيَكَ[1].

## ١٨- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (جا ئەگەر کاتی دابەشکردنی (میراتەکە) خزمە نزیکەکان (کە میرات ناگرن لە مردوو) و هەتیو و هەژارە (بێگانە)کان ئامادەبوون ئەوە لەو میراتییە بەشیان بدەن).

**٢٧٥٩- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: بەڕاستی خەڵکانێك دەڵێن: ئەم ئایەتە حوکمەکەی سڕاوەتەوە، نا سوێند بەخوا نەسڕاوەتەوە، بەڵکو لەو ئایەتانەیە کە خەڵکی سستی دەکەن (لە کارپێکردنی)، دوو سەرپەرشتیارن: سەرپەرشتیارێك میراتی دەبات، ئەو سەرپەرشتیارە بەشی (خزم و هەژار و هەتیو) دەدات، سەرپەرشتیارێك میراتی نابات[2]، ئەوە ئەو سەرپەرشتیارەیە قسەی چاك دەكات و دەڵێ: من هیچم بەدەست نییە بۆت تا بەشت بدەم.**

**١٩- بابُ مَا يُسْتَحَبُّ لِمَنْ يُتَوَفَّى فَجْأَةً أَنْ يَتَصَدَّقُوا عَنْهُ، وَقَضَاءِ النُّذُورِ عَنِ المَيِّتِ**

٢٧٦٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ هِشَامٍ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسَهَا، وَأُرَاهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ، أَفَأَتَصَدَّقُ عَنْهَا؟ قَالَ: "نَعَمْ، تَصَدَّقْ عَنْهَا"[3].

---

(١) بڕوانە: ٤٥٧٦.

(٢) وەک سەرپەرشتیاری هەتیو هیچ کەلەپور نابات ناتوانێ بەشی خزم و هەژار بدات.

(٣) بڕوانە: ١٣٨٨.

## ١٩- باسی بۆ کەسێک کوت و پڕ بمرێت چی سوننەتە کە بکرێتە خێر بۆی، وە جێ بەجێکردنی نەزر لە جیاتی مردوو(سوننەتە)

**٢٧٦٠- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: کە پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ وت: دایکم لەپڕ گیانی دەرچوو، گومان وابوو ئەگەر قسەی بکردایە ماڵ و سامانی دەکرد بەخێر، (جا ئایا پاداشتی دەگات ئەگەر من) سامانی بۆ بکەم بەخێر؟ فەرمووی: ((بەڵێ، خێری بۆی بکە)).**

**٢٧٦١-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، بْنِ عَبْدِ اللهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ ﵁ اسْتَفْتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا نَذْرٌ. فَقَالَ: "اقْضِهِ عَنْهَا"[1].

**٢٧٦١- ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە کە سەعدی کوڕی عوبادە ﵁ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و وتی: بێگومان دایکم مرد و نەزری لەسەر بوو، فەرمووی: ((تۆ لەجیاتی دایکت بیکە (بیگێڕەوە) )).**

## ٢٠- بَابُ الإِشْهَادِ فِي الوَقْفِ وَالصَّدَقَةِ

**٢٧٦٢-** حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ: أَخْبَرَنِي يَعْلَى أَنَّهُ سَمِعَ عِكْرِمَةَ -مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ- يَقُولُ: أَنْبَأَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ ﵁ -أَخَا بَنِي سَاعِدَةَ- تُوُفِّيَتْ أُمُّهُ وَهْوَ غَائِبٌ [عَنْهَا] فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أُمِّي تُوُفِّيَتْ وَأَنَا غَائِبٌ عَنْهَا، فَهَلْ يَنْفَعُهَا شَيْءٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَنْهَا؟ قَالَ: "نَعَمْ". قَالَ: فَإِنِّي أُشْهِدُكَ أَنَّ حَائِطِي المِخْرَافَ صَدَقَةٌ عَلَيْهَا[2].

---

(١) بڕوانە: ٦٦٩٨، ٦٩٥٩.

(٢) بڕوانە: ٢٧٥٦.

## ٢٠- باسی شایەت گرتن لە وەقف و ماڵ بەخشین دا

**٢٧٦٢- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ دایکی مرد، لە کاتێکدا سەعد ئامادەی مردنەکەی نەبوو، جا سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان دایکم مرد و منیش ئامادەی مردنەکەی نەبووم، ئایا ئەگەر خێرێکی بۆ بکەم هیچ سوودی پێ دەگەیەنێ؟ فەرمووی: ((بەڵێ))، سەعد وتی: دە تۆ شایەت بە باخە پڕ بەروبوومەکەم خێر بێت بۆ ئەو (دایکم).**

**٢١- باب قَوْلِ الله تَعالى:** ﴿ وَءَاتُوا الْيَتَامَىٰ أَمْوَالَهُمْ ۖ وَلَا تَتَبَدَّلُوا الْخَبِيثَ بِالطَّيِّبِ ۖ وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَهُمْ إِلَىٰ أَمْوَالِكُمْ ۚ إِنَّهُ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا ﴿٢﴾ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ ﴿٣﴾ ﴾ النساء.

**٢٧٦٣-** حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: كَانَ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ يُحَدِّثُ أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﷺ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ ﴿٣﴾ ﴾ النساء، قَالَتْ: هِيَ اليَتِيمَةُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا، فَيَرْغَبُ فِي جَمَالِهَا وَمَالِهَا، وَيُرِيدُ أَنْ يَتَزَوَّجَهَا بِأَدْنَى مِنْ سُنَّةِ نِسَائِهَا، فَنُهُوا عَنْ نِكَاحِهِنَّ، إِلَّا أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ فِي إِكْمَالِ الصَّدَاقِ، وَأُمِرُوا بِنِكَاحِ مَنْ سِوَاهُنَّ مِنَ النِّسَاءِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: ثُمَّ اسْتَفْتَى النَّاسُ رَسُولَ اللهِ ﷺ بَعْدُ، فَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ ۖ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ ﴿١٢٧﴾ ﴾ النساء، قَالَتْ: فَبَيَّنَ اللهُ فِي هَذِهِ أَنَّ اليَتِيمَةَ إِذَا كَانَتْ ذَاتَ جَمَالٍ وَمَالٍ رَغِبُوا فِي نِكَاحِهَا، وَلَمْ يُلْحِقُوهَا بِسُنَّتِهَا بِإِكْمَالِ الصَّدَاقِ، فَإِذَا كَانَتْ مَرْغُوبَةً عَنْهَا فِي قِلَّةِ المَالِ وَالجَمَالِ تَرَكُوهَا وَالتَمَسُوا غَيْرَهَا مِنَ النِّسَاءِ، قَالَ: فَكَمَا يَتْرُكُونَهَا حِينَ يَرْغَبُونَ عَنْهَا فَلَيْسَ لَهُمْ أَنْ يَنْكِحُوهَا إِذَا رَغِبُوا فِيهَا، إِلَّا أَنْ يُقْسِطُوا لَهَا الأَوْفَى مِنَ الصَّدَاقِ وَيُعْطُوهَا حَقَّهَا[1].

---

(١) بروانه: ٢٤٩٤.

## ٢١-باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند:

(وە ماڵ و سامانی هەتیوان (دوای باڵغ بوونیان) بدەنەوە پێیان، وە پیس (لە ماڵی خۆتان) مەگۆڕنەوە بە پاك (لە ماڵی ئەوان)، وە ماڵەکانیان مەخۆن لەگەڵ ماڵەکانی خۆتان، بێگومان ئەو خواردنە گوناهێکی گەورەیە، وە ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن لە (مارەیی) ئەو ئافرەتە بێ باوکانەدا (مارەیان مەکەن)، ئەوە مارە بکەن لەو ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆتان).

٢٧٦٣- عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە ئەو پرسیاری لە عائیشە ﵂ کرد دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن لە (مارەیی) ئەو ئافرەتە بێ باوکانەدا (مارەیان مەکەن)، ئەوە مارەبکەن لەو ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆتان)، عائیشەش وتی: ئەو کچە هەتیوەیە لای سەرپەرشتیارەکەیەتی، وە سەرپەرشتیارەکە حەزی لە سامان و جوانی کچە هەتیوەکەیە، دەیەوێ مارەی بکات لە خۆی بەکەمتر لە مارەیی ئافرەتی هاوشێوەی خۆی، لەبەر ئەوە ڕێگریان لێکرا ئەو کچە هەتیوانە مارە بکەن، مەگەر دادگەر بن بەرانبەریان و تەواوی ڕێژەی مارەییان پێ بدەن، وە فەرمانیان پێکرا بە مارەکردنی ئافرەتانی تر جگە لەوان، (عورووە دەڵێ:) عائیشە وتی: پاشان خەڵکی پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دوای دابەزینی ئەو ئایەتە، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: (وە (ئەی موحەممەد ﷺ) پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ئافرەتان بڵێ: خوا وەڵامتان دەداتەوە) عائیشە دەڵێ: خوا لەم ئایەتەدا ڕوونی کردەوە ئەو کچە هەتیوانە ئەگەر خاوەن جوانی و سامان بوون، حەز دەکەن مارەی بکەن، وە ئەو ئەندازە مارەییە تەواوەیان پێنادەن کە بە هاوشێوەکانیان دەدرێت، بەڵام نەویستڕێن لەبەر کەمی سامان و جوانیان، وازیان لێ دێنن و بەدوای ئافرەتی تردا دەگەڕێن، عورووە دەڵێ:

هەروەك چۆن وازی لێ دێنن كاتێك حەزیان لێی نەبێت، كەواتە بۆیان نییە مارەی بكەن كاتێك حەزیان لێیەتی، مەگەر دادگەرانە و بەتەواوی مارەیی خۆیانیان پێ بدەن، وە مافی خۆی بەتەواوی پێ بدەن.

## ٢٢- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى:

﴿ وَٱبْتَلُوا۟ ٱلْيَتَـٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُوا۟ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَأْكُلُوهَآ إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُوا۟ ۚ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ ۖ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ فَأَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٦﴾ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ ۚ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ ﴾ النساء.

## ٢٢- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند:

(هەتیوان تاقی بكەنەوە هەر كاتێك گەیشتنە (تەمەنی) ژن هێنان و شووكردن، ئینجا ئەگەر هەستان كرد لەواندا ژیری (و پێگەیشتن) هەیە، ئەوە سامان و ماڵەكانیان پێ بدەنەوە ماڵەكانیان، مەخۆن بەزیادەڕۆیی و بەپەلە نەوەك گەورە ببن (لێتان وەرگرنەوە)، وە هەركەس لە سەرپەرشتیاری هەتیوان دەوڵەمەند بوو باخۆی بگرێتەوە لە (خواردنی ماڵیان)، وە هەركەس لەوان هەژاربوو با (لێی) بخوات بە ئەندازەی پێویست، ئینجا هەركات ماڵی هەتیوەكانتان دایەوە پێیان، ئەوە شایەتیان لەسەر بگرن، بەسە خوا بۆ لێپرسینەوە (بەسەرتانەوە). بۆ پیاوان هەیە بەشێك لەو (میراتەی) دایك و باوك و خزمە نزیكەكان بەجێی دێڵن، وە بۆ ئافرەتانیش هەیە بەشێك لەو (میراتەی) دایك و باوك و خزمە نزیكەكان لەوەی (بەجێی دێڵن)، كەم بێت یان زۆر بەبەشێكی بڕیاردراو) النساء.

## بابٌ: وَمَا لِلْوَصِيِّ أَنْ يَعْمَلَ فِي مَالِ الْيَتِيمِ، وَمَا يَأْكُلُ مِنْهُ بِقَدْرِ عُمَالَتِهِ

٢٧٦٤- حَدَّثَنَا هَارُونُ، حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ -مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ- حَدَّثَنَا صَخْرُ بْنُ جُوَيْرِيَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ عُمَرَ تَصَدَّقَ بِمَالٍ لَهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَكَانَ يُقَالُ لَهُ ثَمْغٌ، وَكَانَ نَخْلًا، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي اسْتَفَدْتُ مَالًا وَهُوَ عِنْدِي نَفِيسٌ فَأَرَدْتُ أَنْ أَتَصَدَّقَ بِهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "تَصَدَّقْ بِأَصْلِهِ، لَا يُبَاعُ وَلَا يُوهَبُ وَلَا يُورَثُ، وَلَكِنْ يُنْفَقُ ثَمَرُهُ". فَتَصَدَّقَ بِهِ عُمَرُ، فَصَدَقَتُهُ ذَلِكَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَفِي الرِّقَابِ وَالْمَسَاكِينِ وَالضَّيْفِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَلِذِي الْقُرْبَى، وَلَاجُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهُ أَنْ يَأْكُلَ مِنْهُ بِالْمَعْرُوفِ، أَوْ يُوكِلَ صَدِيقَهُ غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ بِهِ[١].

## باسێک[٢]: سەرپەرشتیار چی بۆ هەیە لە ماڵ و سامانی هەتیودا بیکات، وە دە بێ چەندێک لە ماڵی هەتیوەکە بخوات، بە ئەندازەی کۆشش و ماندووبوونی (بخوات)

**٢٧٦٤- ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: عومەر ماڵێکی هەبوو لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ کردی بەخێر، ئەو (ماڵە) زەوییەك بوو پێی دەوترا سەمغ کە باخی خورما بوو، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ماڵێکم دەست کەوتووە بەلای خۆمەوە ماڵێکی بەنرخە، بۆیە دەمەوێت بیکەم بەخێر، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خودی زەوییەکە بکە بەخێر، نابێ بفرۆشرێت و ببەخشرێت و بەمیرات ببرێت، بەڵکو بەروبوومەکەی دەبەخشرێت))، عومەر کردی بەخێر، ئینجا ئەو خێرە بۆ خەباتە لەرێی خوا و ئازادکردنی کۆیلە و هەژار و میوان و رێبوار، وە بۆ خزمان بوو، وە ئەو کەسەی**

---

(١) بروانە: ٢٣١٣.

(٢) لە هەندێک چاپی بوخاریدا ئەم سەرباسە نییە و لە هەندێکیاندا هەیە.(بروانە: إرشاد الساري:٦/٢٥٤).

**سەرپەرشتی دەکات گوناهی ناگات بەپێی پێویست لێی بخوات یان دەرخواردی هاوڕێیەکی بدات، وە نەیکات بە موڵکی خۆی)).**

٢٧٦٥- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂: ﴿ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ ﴿٦﴾ ﴾ النساء. قَالَتْ: أُنْزِلَتْ فِي وَالِي اليَتِيمِ أَنْ يُصِيبَ مِنْ مَالِهِ إِذَا كَانَ مُحْتَاجًا بِقَدْرِ مَالِهِ بِالمَعْرُوفِ[1].

**٢٧٦٥- عائیشە ﵂ دەربارەی ئەم ئایەتە: (وە هەرکەس لە سەرپەرشتیاری هەتیوان دەوڵەمەند بوو، با خۆی بگرێتەوە (لە خواردنی ماڵیان)، وە هەر کەس لەوان هەژار بوو، با (لێی) بخوات بەئەندازەی پێویست) دەڵێ: دەربارەی سەرپەرشتیاری هەتیو دابەزی: کە لە ماڵی هەتیوەکە بخوات ئەگەر هەژار بوو بە ئەندازەی پێویست (بەڕەچاوکردنی ماڵی هەتیوەکە).**

## ٢٣- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾ ﴾ النساء.

٢٧٦٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ بِلاَلٍ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ المَدَنِيِّ، عَنْ أَبِي الغَيْثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "اجْتَنِبُوا السَّبْعَ المُوبِقَاتِ". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: "الشِّرْكُ بِاللهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إِلَّا بِالحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ اليَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ المُحْصَنَاتِ المُؤْمِنَاتِ الغَافِلاَتِ"[2].

(١) بڕوانە: ٢٢١٢.

(٢) بڕوانە: ٥٧٦٤، ٦٨٥٧.

## ٢٣- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بەڕاستی ئەو کەسانەی کە ماڵی هەتیوەکان دەخۆن بەستەم و ناڕەوا، بەڕاستی ئەوانە بەس لە سکی خۆیان ئاگر دەخۆن، وە لەمەوپاش دەچنە ئاگرێکی بەتین و هەڵگیرساوەوە)

**٢٧٦٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((لە حەوت تاوانە لەناوبەرەکە خۆتان بەدووربگرن))، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو تاوانانە کامانەن؟ فەرمووی: ((هاوبەش دانان بۆ خوا، جادووکردن، کوشتنی ئەو کەسەی کە خوا قەدەغەی کردووە مەگەر بەهەق بکوژرێت، سووخۆری و خواردنی ماڵی هەتیو، هەڵهاتن لە ڕۆژی جەنگدا، بوهتانکردن بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی باوەڕداری بێ ئاگا (کە زینای کردووە) )).**

## ٢٤- باب قَوْلِ اللهِ تَعَالَى:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٠﴾ ﴾ البقرة. ﴿ لَأَعْنَتَكُمْ ﴿٢٢٠﴾ ﴾ البقرة، لأَحْرَجَكُمْ وَضَيَّقَ عَلَيْكُمْ: ﴿ وَعَنَتِ ﴿١١١﴾ ﴾ طه، خَضَعَتْ.

**٢٧٦٧-** وَقَالَ لَنَا سُلَيْمَانُ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ: مَا رَدَّ ابْنُ عُمَرَ عَلَى أَحَدٍ وَصِيَّةً. وَكَانَ ابْنُ سِيرِينَ أَحَبَّ الأَشْيَاءِ إِلَيْهِ فِي مَالِ الْيَتِيمِ أَنْ يَجْتَمِعَ إِلَيْهِ نُصَحَاؤُهُ وَأَوْلِيَاؤُهُ فَيَنْظُرُوا الذي هُوَ خَيْرٌ لَهُ.

وَكَانَ طَاوُسٌ إِذَا سُئِلَ عَنْ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْيَتَامَى قَرَأَ: ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ ﴿٢٢٠﴾ ﴾ البقرة.

وَقَالَ عَطَاءٌ فِي يَتَامَى الصَّغِيرُ وَالكَبِيرُ: يُنْفِقُ الوَلِيُّ عَلَى كُلِّ إِنْسَانٍ بِقَدْرِهِ مِنْ حِصَّتِهِ.

## ٢٤- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند:

(وە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی هەتیوان (کە چۆن بن لەگەڵیاندا)، بڵێ چاك کردار لە سامانی ئەواندا زۆر چاکە، وە ئەگەر (لە ماڵ و ساماندا) تێکەڵ ببن لەگەڵیاندا (قەیناکات چونکە) براتانن، وە خوا دەزانێ کێ خراپەکار و کێ چاکەکارە (لەگەڵ هەتیوان)، ئەگەر خوا بیویستایە دووچاری ڕەنجی دەکردن، بەڕاستی خوا زاڵی کاردروستە). (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ﴿ لَأَعْنَتَكُمْ ﴿٢٢٠﴾ ﴾ البقرة، نارەحەتی دەکردن و تەنگی دەکرد (لە سەرتان). ﴿ وَعَنَتِ ﴿١١١﴾ ﴾ طه: گەردن کەچ بوو.

٢٧٦٧- نافیع دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ وەسیەتی هیچ کەسێکی ڕەت نەکردۆتەوە[1] (بۆی کردبێت). وە خۆشەویستترین و باشترین شت لای ئیبنو سیرین دەربارەی سامانی هەتیو ئەوەیە: کە دڵسۆزان و کەس و کاری هەتیوەکە کۆ ببنەوە، ئینجا سەرنج بدەن کام شتە بۆ هەتیوەکە چاکە ئەوە بکەن. تاووس کە پرسیاری هەرشتێکی کاروباری هەتیوانی لێ بکرایە، ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: (وە خوا دەزانێ کێ خراپەکار و کێ چاکەکارە (لەگەڵ هەتیواندا) عەتا دەڵێ: دەربارەی هەتیوانی بچووك و گەورە سەرپەرشتیار خەرجی بۆ هەرکەسێکیان دەکات بەئەندازەی بەشەکەی لە سامانەکە.

---

(١) کەواتە عەبدوڵڵا وەسیەتەکەی قەبوڵ کردووە کە بۆی کراوە.

## ٢٥- بابُ اسْتِخْدَامِ اليَتِيمِ فِي السَّفَرِ وَالحَضَرِ، إِذَا كَانَ صَلَاحًا لَهُ، وَنَظَرِ الأُمِّ وَزَوْجِهَا لِلْيَتِيمِ

٢٧٦٨- حَدَّثَنَا يَعْقوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ كَثِيرٍ، حَدَّثَنَا ابن عُلَيَّةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الَمدِينَةَ لَيْسَ لَه خَادِمٌ، فَأَخَذَ أَبُو طَلْحَةَ بِيَدِي، فَانْطَلَقَ بِي إِلَى رَسُولِ الله ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَنَسًا غُلَام كَيِّسٌ، فَلْيَخْدُمْكَ. قَالَ: فَخَدَمْتهُ فِي السَّفَرِ وَالَحْضَرِ، مَا قَالَ لِي لِشَيء صَنَعْتُهُ: لِمَ صَنَعْتَ هذا هَكَذَا؟ وَلَا لِشَيء لَمْ أَصْنَعْهُ: لِمَ لَمْ تَصْنَعْ هذا هَكَذَا؟[1].

## ٢٥- باسی (حوکمی) ئیش پێکردنی هەتیو لە سەفەر و لە شار و ماڵەوەدا، ئەگەر ئەو کارە بۆ هەتیوەکە گونجاو بێ، وە (حوکمی) سەیرکردنی دایک و مێردەکەی بۆ هەتیوەکە

**٢٧٦٨- عەبدولعەزیز وتی: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە و هیچ خزمەتکارێکی نەبوو، بۆیە ئەبو تەڵحە دەستی گرتم و بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان ئەنەس لاوێکی زیرکەلەیە با خزمەتت بکات[2]، ئەنەس دەڵێ: منیش خزمەتی پێغەمبەرم ﷺ کرد لە سەفەر و لە شار و لە ماڵەوەشدا، هەر شتێکم کرد بێ پێی نەوتووم بۆ ئەو شتەت ئاوەها کرد؟ وە هەر شتێکیشم نەکردبێت پێی نەوتووم بۆ ئەو شتەت ئاوەها نەکرد؟**

---

(١) بڕوانە: ٦٠٣٨، ٦٩١١.

(٢) وە ببێتە خزمەتکارت.

## ٢٦- بابٌ: إِذَا وَقَفَ أَرْضًا وَلَمْ يُبَيِّنِ الحُدُودَ فَهْوَ جَائِزٌ، وَكَذَلِكَ الصَّدَقَةُ

**٢٧٦٩-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَكْثَرَ أَنْصَارِيٍّ بِالمَدِينَةِ مَالًا مِنْ نَخْلٍ، وَكَانَ أَحَبُّ مَالِهِ إِلَيْهِ بَيْرَحَاءَ مُسْتَقْبِلَةَ المَسْجِدِ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْخُلُهَا وَيَشْرَبُ مِنْ مَاءٍ فِيهَا طَيِّبٍ. قَالَ أَنَسٌ: فَلَمَّا نَزَلَتْ: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾﴾ آل عمران، قَامَ أَبُو طَلْحَةَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ اللهَ يَقُولُ: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾﴾ آل عمران، وَإِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالِي إِلَيَّ بِيرُحَاءَ، وَإِنَّهَا صَدَقَةٌ للهِ أَرْجُو بِرَّهَا وَذُخْرَهَا عِنْدَ اللهِ، فَضَعْهَا حَيْثُ أَرَاكَ اللهُ. فَقَالَ: "بَخْ، ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ -أَوْ رَايِحٌ شَكَّ ابْنُ مَسْلَمَةَ- وَقَدْ سَمِعْتُ مَا قُلْتَ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأَقْرَبِينَ". قَالَ أَبُو طَلْحَةَ: أَفْعَلُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللهِ. فَقَسَمَهَا أَبُو طَلْحَةَ فِي أَقَارِبِهِ وَفِي بَنِي عَمِّهِ. وَقَالَ إِسْمَاعِيلُ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ وَيَحْيَى بْنُ يَحْيَى عَنْ مَالِكٍ: "رَايِحٌ"[1].

## ٢٦- باسێک: ئەگەر کەسێک زەوییەکی وەقف کرد و سنوورەکانی دیاری نەکرد ئەوە دروستە، بەهەمان شێوە ماڵ بەخشینیش

**٢٧٦٩- ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: ئەبو تەڵحە لەناو ئەنصارییەکاندا لە مەدینە لەهەمووان باخی دارخورمای زیاتر بوو، وە باخی بەیروحا لەهەموو ماڵەکانی لای خۆشەویستتر بوو، کە بەرانبەر مزگەوت بوو، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە دەڕۆیشتە ناویەوە، لەو ئاوە شیرین و سازگارەی تێیدا بوو**

---

(١) بڕوانە: ١٤٦١.

**دەیخواردەوە، ئەنەس دەڵێ: جا کاتێك ئەم ئایەت دابەزی: (ئێوە چاکەی تەواو بەدەست ناهێنن تا هەندێك لەو ماڵ و سامانەی کە خۆشتان دەوێ بەختی نەکەن)، ئەبو تەڵحە هەستا و ڕۆیشت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان خوای گەورە دەفەرموێ: (ئێوە چاکەی تەواو بەدەست ناهێنن تا هەندێك لەو ماڵەی خۆشتان دەوێ نەیبەخشن)، وە بەڕاستی خۆشەویسترین ماڵی من بەلامەوە بەیرحایە، ئەوە خێر بێ لەڕێی خوادا، هیوای چاکەو پاداشتی لای خوای لێ دەکەم، جا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ خۆت خوا چۆنت پێ دەڵێ لەوێدا داینێ، ئەنەس: دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئافەرین! ئەوە ماڵێکی پڕ قازانج و خێرە - ئەوە (ماڵێکی) بەسودە ئیبن مەسلەمە ئەو گومانەی برجوە- بێگومان ئەوەی وتت بیستم، بەڕاستی من ڕام وایە بیکەیتە خێر و چاکە بۆ خزمەکانت))، ئەبو تەڵحەش وتی: دەی وای لێ دەکەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا ئەبو تەڵحە لە نێوان خزم و ئامۆزاکانیدا بەشی کرد. وە ئیسماعیل و عەبدوڵڵای کوڕی یوسف و یەحیای کوڕی یەحیا لە مالیکەوە بە: ((رَايِحٌ[1])) گێڕاویانەتەوە لەجیاتی: ((رَابِحٌ)).**

**٢٧٧٠-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، أَخْبَرَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ بْنُ إِسْحَاقَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: إِنَّ أُمَّهُ تُوُفِّيَتْ، أَيَنْفَعُهَا إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا؟ قَالَ: "نَعَمْ". قَالَ: فَإِنَّ لِي مِخْرَافًا، وَأُشْهِدُكَ أَنِّي قَدْ تَصَدَّقْتُ به عَنْهَا[2].

---

(١) (رَايِحٌ) واتە: سودێکی خێرای هەیە کە دەگاتە خاوەنەکەی بێ ماندوبوون یان بەیانیان و ئێواران پاداشتی هەیە.(بڕوانە: إرشاد الساري:٣/٥٨٨).

(٢) بڕوانە: ٢٧٥٦.

**٢٧٧٠- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پیاوێك بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: كە دایكی مردووە، ئایا ئەگەر خێر و چاكەی بۆ بكات سوودی پێ دەگەیەنێت؟ فەرمووی: ((بەڵێ))، وتی: بەڕاستی من باخێكی پڕ بەروبوومم هەیە، تۆ شایەت بە كە من كردمە خێر بۆ دایكم.**

## ٢٧ - بابٌ: إِذَا أَوْقَفَ جَمَاعَةٌ أَرْضًا مُشَاعًا فَهُوَ جَائِزٌ

**٢٧٧١**- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِبِنَاءِ المَسْجِدِ فَقَالَ: "يَا بَنِي النَّجَّارِ، ثَامِنُونِي بِحَائِطِكُمْ هَذَا". قَالُوا: لَا. وَاللهِ لَا نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلَّا إِلَى اللهِ[1].

## ٢٧- باسێک: ئەگەر چەند کەسێک زەوییەکی هاوبەش وەقف بکەن ئەوە ئەو وەقفە دروستە

**٢٧٧١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد بە دروستكردنی مزگەوتەكە و فەرمووی: ((ئەی نەوەكانی نەجار! ئەم باخەتانم بە پارە پێ بفرۆشن))، وتیان: نە بە خوا بەپارەی نایفرۆشین، نرخەكەیمان تەنها لای خوا دەوێت.**

## ٢٨- بابُ الوَقْفِ وكَيْفَ يُكْتَبُ؟

**٢٧٧٢**- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عَوْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: أَصَابَ عُمَرُ بِخَيْبَرَ أَرْضًا فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: أَصَبْتُ أَرْضًا لَمْ أُصِبْ مَالًا قَطُّ أَنْفَسَ مِنْهُ، فَكَيْفَ تَأْمُرُنِي بِهِ؟ قَالَ: "إِنْ شِئْتَ حَبَّسْتَ أَصْلَهَا، وَتَصَدَّقْتَ بِهَا". فَتَصَدَّقَ

---

(١) بڕوانە: ٢٣٤.

عُمَرُ أَنَّهُ لَا يُبَاعُ أَصْلُهَا وَلَا يُوهَبُ وَلَا يُورَثُ، فِي الفُقَرَاءِ وَالقُرْبَى وَالرِّقَابِ وَفِي سَبِيلِ اللهِ وَالضَّيْفِ وَابْنِ السَّبِيلِ، وَلَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالمَعْرُوفِ، أَوْ يُطْعِمَ صَدِيقًا غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ فِيهِ[1].

## ٢٨- باسی وەقف وچۆن دەنووسرێت؟

**٢٧٧٢- عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب زەوییەکی لە خەیبەر بەرکەوت، جا هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من زەوییەکم لە خەیبەر بەرکەوتووە، هیچماڵێکم دەست نەکەوتووە لەوە بە نرختر بێت، جا جەنابت لەبارەیەوە چ فەرمانێکم پێ دەکەیت؟ فەرمووی: ((ئەگەر بتەوێ زەوییەکە دەکەیت بە وەقف و (بەرهەمەکەی) بکە بەخێر))، عومەریش کردی بەخێر بە مەرجێك خودی زەوییەکە نەفرۆشرێت و نەبەخشرێت و بەمیرات نەبرێت، وە کردی بەخێر بۆ هەژاران و خزمانی و ئازادکردنی کۆیلە و جیهاد و غەزا لەڕێی خوا و میوان و ڕێبواران، وە ئەو کەسەی سەرپەرشتی کرد گوناهی ناگات بەپێی پێویست لێی بخوات یان دەرخواردی هاوڕێیەکی بدات، بەڵام نەیکاتە بە موڵکی خۆی.**

## ٢٩- بابُ الوَقْفِ لِلْغَنِيِّ وَالفَقِيرِ وَالضَّيْفِ

**٢٧٧٣-** حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عَوْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ عُمَرَ ﷺ وَجَدَ مَالًا بِخَيْبَرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ، قَالَ: "إِنْ شِئْتَ تَصَدَّقْتَ بِهَا". فَتَصَدَّقَ بِهَا فِي الفُقَرَاءِ وَالمَسَاكِينِ وَذِي القُرْبَى وَالضَّيْفِ[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٣١٣.

(٢) بڕوانە: ٢٣١٣.

## ٢٩- باسی وەقف کردن بۆ دەوڵەمەند و هەژار و میوان (دروستە)

٢٧٧٣- ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە عومەر زەوییەکی لە خەیبەر دەستکەوت، جا هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی وت، ئەویش فەرمووی: ((ئەگەر بتەوێ دەیکەیت بەخێر))، جا عومەریش کردی بەخێر (بەوەقف) بۆ هەژاران و نەداران و خزمان و میوان.

## ٣٠- بَابُ وَقْفِ الأَرْضِ لِلْمَسْجِدِ

٢٧٧٤- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي، حَدَّثَنَا أَبُو التَّيَّاحِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ -ﷺ-: - لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ المَدِينَةَ أَمَرَ بِالْمَسْجِدِ وَقَالَ: "يَا بَنِي النَّجَّارِ ثَامِنُونِي بِحَائِطِكُمْ هَذَا". قَالُوا: لاَ وَاللهِ، لاَ نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلاَّ إِلَى اللهِ[1].

## ٣٠- باسی وەقف کردنی زەوی بۆ مزگەوت[2]

٢٧٧٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە، فەرمانی کرد بەدروست کردنی مزگەوت و فەرمووی: ((ئەی نەوەی نەجار! ئەم باخەتانم بەپارە پێ بفرۆشن))، وتیان: نە بەخوا بەپارە نایفرۆشین، نرخەکەیمان تەنها لای خوا دەوێت.

## ٣١- بَابُ وَقْفِ الدَّوَابِّ وَالْكُرَاعِ وَالْعُرُوضِ وَالصَّامِتِ

قَالَ الزُّهْرِيُّ فِيمَنْ جَعَلَ أَلْفَ دِينَارٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَدَفَعَهَا إِلَى غُلاَمٍ لَهُ تَاجِرٍ يَتْجُرُ بِهَا، وَجَعَلَ رِبْحَهُ صَدَقَةً لِلْمَسَاكِينِ وَالأَقْرَبِينَ، هَلْ لِلرَّجُلِ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ رِبْحِ تِلْكَ الأَلْفِ شَيْئًا، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ جَعَلَ رِبْحَهَا صَدَقَةً فِي الْمَسَاكِينِ؟ قَالَ: لَيْسَ لَهُ أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا.

---

(١) بڕوانە: ٢٣٤.

(٢) مەبەستی ئەوە بوو مزگەوتی لەسەر دروست بکرێت.

٢٧٧٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّ عُمَرَ حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ لَهُ فِي سَبِيلِ اللهِ أَعْطَاهَا رَسُولَ اللهِ ﷺ لِيَحْمِلَ عَلَيْهَا رَجُلاً، فَأُخْبِرَ عُمَرُ أَنَّهُ قَدْ وَقَفَهَا يَبِيعُهَا، فَسَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنْ يَبْتَاعَهَا، فَقَالَ: "لاَ تَبْتَعْهَا، وَلاَ تَرْجِعَنَّ فِي صَدَقَتِكَ"[1].

## ٣١- باسی وەقفی وڵاخ و ئەسپ و ماین و کاڵا و ئاڵتون و زیو

**زوهری دەربارەی کەسێك دەڵێ: کە هەزار دینار وەقف بکات لەڕێی خوادا، بیداتە خزکەتکارێکی بازرگانی تا بازرگانی پێوە بکات، وە قازانجەکەی بکاتە خێر بۆ هەژاران و خزمانی، ئایا بۆ ئەو پیاوە(ی پارەکەی داوە) ڕەوایە لە قازانجی ئەو هەزار دینارە هیچ شتێك بخوات، با قازانجەکەشی نەکردبێ بەخێر بۆ هەژاران؟ زوهری دەڵێ: بۆی نییە لە قازانجی ئەو هەزارە بخوات.**

**٢٧٧٥- ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە کە عومەر ئەسپێکی (دا بە پیاوێك) تا لە ڕێی خوا جیهادی پێ بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ دابووی بە عومەر تا (بیداتە) پیاوێك سواری بێت[2]، جا هەواڵ درا بە عومەر کە ئەو پیاوە ئەسپەکەی وەستاندوە[3] و دەیفرۆشێت، عومەریش پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە بیکڕێتەوە؟ ئەویش فەرمووی: ((مەیکرە و لە بەخشین و خێرەکەت پاشگەزمەبەوە)).**

## ٣٢- بابُ نَفَقَةِ الْقَيِّمِ لِلْوَقْفِ

٢٧٧٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: " لاَ يَقْتَسِمْ وَرَثَتِي دِينَارًا، مَا تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِي وَمَئُونَةِ عَامِلِي فَهْوَ صَدَقَةٌ"[4].

---

(١) بروانە: ١٤٨٩.

(٢) جیهادی پێ بکات لە ڕێی خوادا.

(٣) لە مەیدان و جێگای حەیوان فرۆشتندا دەیەوێت بیفرۆشێت.

(٤) بروانە: ٣٠٩٦، ٦٧٢٩.

٢٧٧٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ عُمَرَ اشْتَرَطَ فِي وَقْفِهِ أَنْ يَأْكُلَ مَنْ وَلِيَهُ، وَيُوكِلَ صَدِيقَهُ غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ مَالاً[1].

## ٣٢- باسی خەرجی سەرپەرشتیاری وەقف

**٢٧٧٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((میراتگرەکانم دینارێك دابەش نەکەن، لە پاش خەرجی خێزانەکانم و خەرجی سەرکارەکەم ئەوەی لێم بەجێما، ئەوە خێرە (لەڕێی خوادا) )).**

**٢٧٧٧- ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە عومەر بەمەرجی گرتبوو لە (زەوییە) وەقفەکەیدا کە ئەوەی سەرپەرشتی دەکات لێی بخوات و دەرخواردی هاوڕێکەشی بدات، بەڵام نەیکات بەسەرمایە خۆی.**

## ٣٣- بابٌ: إِذَا وَقَفَ أَرْضًا أَوْ بِئْرًا وَاشْتَرَطَ لِنَفْسِهِ مِثْلَ دِلاَءِ الْمُسْلِمِينَ

وَأَوْقَفَ أَنَسٌ دَارًا فَكَانَ إِذَا قَدِمَهَا نَزَلَهَا. وَتَصَدَّقَ الزُّبَيْرُ بِدُورِهِ، وَقَالَ لِلْمَرْدُودَةِ مِنْ بَنَاتِهِ أَنْ تَسْكُنَ غَيْرَ مُضِرَّةٍ وَلاَ مُضَرٍّ بِهَا، فَإِنِ اسْتَغْنَتْ بِزَوْجٍ فَلَيْسَ لَهَا حَقٌّ. وَجَعَلَ ابْنُ عُمَرَ نَصِيبَهُ مِنْ دَارِ عُمَرَ سُكْنَى لِذَوِي الحَاجَةِ مِنْ آلِ عَبْدِ اللهِ.

## ٣٣- باسێک: ئەگەر کەسێک زەوییەک یان بیرێکی وەقف کرد و بە مەرجی گرت کە خۆشی وەکو موسڵمانان ئاوهەڵگۆستنی بۆ هەبێ

**ئەنەس ﷺ خانوویەکی[1] وەقف کرد جاهەر کاتێك بهاتایە بۆمەدینە لەوخانووەدا دادەبەزی (دەمایەوە). زوبەیر خانوەکانی وەقف کردبوو، وەدەیوت**

---

(١) بڕوانە: ٢٣١٣.

**بە ژنی تەڵاقدراو لەکچەکانی کە تیایدا دانیشن بێ ئەوە زیان بگەیەنێت وبێ ئەو زیانی پێ بگەیەنرێت، جا ئەگەر بەمێردی بێ نیاز بوو[٢] ئەوە مافی نییە (لەو خانوەدا بمێنێتەوە). ئیبنو عومەر ﷺ بەشەکەی خۆی لە خانوی عومەر کردە جێگای مانەوە بۆئەوانەی پێویستیانە لە خانەوادەی عەبدوڵا.**

٢٧٧٨- وَقَالَ عَبْدَانُ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّ عُثْمَانَ ﷺ حَيْثُ حُوصِرَ أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ وَقَالَ: أَنْشُدُكُمْ اللهَ وَلاَ أَنْشُدُ إِلاَّ أَصْحَابَ النَّبِيِّ ﷺ، أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "مَنْ حَفَرَ رُومَةَ فَلَهُ الجَنَّةُ". فَحَفَرْتُهَا؟ أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنَّهُ قَالَ: "مَنْ جَهَّزَ جَيْشَ العُسْرَةِ فَلَهُ الجَنَّةُ". فَجَهَّزْتُهُمْ؟ قَالَ: فَصَدَّقُوهُ بِمَا قَالَ. وَقَالَ عُمَرُ فِي وَقْفِهِ لاَ جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهُ أَنْ يَأْكُلَ. وَقَدْ يَلِيهِ الوَاقِفُ وَغَيْرُهُ فَهْوَ وَاسِعٌ لِكُلٍّ.

**٢٧٧٨- ئەبو عەبدورەحمان دەگێڕێتەوە کە عوسمان کاتێك چواردەورە درا[٣]، لە بەرزییەکەوە سەیری کردن و وتی: سوێندتان دەدەم بە خوا[٤]، وە کەس سوێند نادەم تەنها هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ نەبێت، ئایا دەزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەرکەس (بیری) ڕۆمە هەڵکەنێت ئەوە بەهەشت بۆ ئەوە))، جا من هەڵم کەند؟ ئایا دەزانن کە فەرموویەتی: ((هەرکەس سوپای عوسرە بخاتە ڕێ (چەك و ئازوقەی بۆ دابین بکات)، ئەوە بەهەشت بۆ ئەوە))، جا من ڕێکم خست؟ (ئەبو عەبدورەحمان) دەڵێ: لە هەموو ئەو شتانەی وتی پشتیوانیان**

---

(١) لە مەدینە وەقف کرد.

(٢) واتە: ئەگەر مێردی هەبوو.

(٣) لە ماڵەکەی خۆیدا لەلایەن خەڵکی میصرەوە ، کە دەیانویست عوسمان ﷺ واز بێنێ لە خیلافەت و عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح بە خەلیفە لە جێی عوسمان دانێن. بڕوانە: إرشاد الساری: ٢٦٩/٦.

(٤) یان پرسیارتان لێ دەکەم بە خوا، بەم جۆرەش دروستە مانا بکرێ.

لێکرد و بەڕاستیان دانا، وە عومەر دەربارەی ئەوەی وەقفی کردبوو وتی: ئەو کەسەی سەرپەرشتی دەکات گوناهی ناگات کە لێی بخوات، وە هەندێك جار وەقفکارو خەڵکی تریش سەرپەرشتیاری دەکەن، کەواتە ئەوە بۆ هەمووان دەگونجێ.

## ٣٤ - بابٌ: إِذَا قَالَ الوَاقِفُ: لاَ نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلاَّ إِلَى اللهِ. فَهُوَ جَائِزٌ

٢٧٧٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "يَا بَنِي النَّجَّارِ، ثَامِنُونِي بِحَائِطِكُمْ". قَالُوا: لاَ نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلاَّ إِلَى اللهِ[1].

## ٣٤- باسێك: ئەگەر وەقفكار وتی: ئێمە داوای نرخەكەی تەنها لە خوا دەكەین ئەوە ئەو وەقف كردنە دروستە

٢٧٧٩- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی نەوەی نەجاڕ! باخەکەتانم پێ بفرۆشن))، وتیان: ئێمە داوای نرخەکەی تەنها لای خوا دەکەین.

## ٣٥- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ حِينَ ٱلْوَصِيَّةِ ٱثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ ءَاخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَأَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةُ ٱلْمَوْتِ ۚ تَحْبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعْدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ لَا نَشْتَرِى بِهِۦ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۙ وَلَا نَكْتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْءَاثِمِينَ ﴿١٠٦﴾ فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَٰنِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَٰدَتُنَآ

(١) بڕوانە: ٢٣٤.

أَحَقُّ مِن شَهَٰدَتِهِمَا وَمَا ٱعْتَدَيْنَآ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٧﴾ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِٱلشَّهَٰدَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَآ أَوْ يَخَافُوٓا۟ أَن تُرَدَّ أَيْمَٰنٌۢ بَعْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْمَعُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ المائدة.

## ٣٥- باسی (هۆی دابەزینی) ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند:

(ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە! شایەتی بدەن لە نێوانتاندا کاتێك کە مردنی هەر کامتان نزیك بوویەوە، لەکاتی وەسیەت کردنتاندا دوو کەسی دادپەروەر لە خۆتان (مسوڵمان بن)، یان دوو کەسی تر جگە لەخۆتان (کافر بن)، ئەگەر ئێوە بەسەفەر ڕۆیشتبوون بە وڵاتدا و بەڵای مردنتان تووش هات، (دوو شایەتەکە) ڕاگرن لە پاش نوێژ (ی عەسر)، دەبێ سوێند بخۆن بە خوا ئەگەر گومانتان بوو (لە ڕاستی و پاکییان) ئێمە (سوێند خواردنمان) بەخوا ناگۆڕینەوە بە هیچ نرخێك، با شایەتی بۆ دراوەکە خزم و نزیکیش بێت، وە شایەتی (دان بۆ) خوا ناشارینەوە، بێگومان (ئەگەر شایەتیەکەمان شاردەوە)، کەواتە بەڕاستی لە گوناهباران دەبین ﴿١٠٦﴾ ئینجا ئەگەر زانرا (پاش سوێند خواردنیان) بەوەی کە ئەو دوو شایەتە درۆیان کردووە و خۆیان تاوان بار کردووە، ئەوە دوو کەسی تر لە شوێنی ئەواندا هەڵدەستن (بەسوێند خواردن) لەوانەی کە شیاو و نزیکتر بن (لە مردووەکە) لەو دووانە، ئینجا هەردووکیان سوێند بخۆن بەخوا کە بەڕاستی شایەتیەکەی ئێمە ڕاستترە لە شایەتیەکەی ئەو دووانەی پێشوو، وە لە ڕاستی لامان نەداوە (لە سوێندخواردنەکەماندا)، بێگومان (ئەگەر لابدەین) ئەو کاتە ئێمە لە ستەمکاران دەبین ﴿١٠٧﴾ ئەو (جۆرە شایەتیدانە) نزیکترە کە شایەتەکان هەڵسن بە شایەتیەکەیان بەشێوە ڕاستەکەی، یان بترسن لە ڕەدکردنەوەی سوێندەکان (بۆ خزمی نزیکی مردووەکە) دوای سوێندخواردنی ئەمان (واتە: بەدرۆ بخرێنەوە)، بترسن لە خواو خۆتان بپارێزن و گوێڕایەڵی فەرمانی خوابن، خوا ڕێنموونی کۆمەڵی لەسنوور دەرچوو ناکات ﴿١٠٨﴾) المائدة.

٢٧٨٠- وَقَالَ لِي عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي الْقَاسِمِ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَهْمٍ مَعَ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ وَعَدِيِّ بْنِ بَدَّاءٍ فَمَاتَ السَّهْمِيُّ بِأَرْضٍ لَيْسَ بِهَا مُسْلِمٌ، فَلَمَّا قَدِمَا بِتَرِكَتِهِ فَقَدُوا جَامًا مِنْ فِضَّةٍ مُخَوَّصًا مِنْ ذَهَبٍ، فَأَحْلَفَهُمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، ثُمَّ وُجِدَ الْجَامُ بِمَكَّةَ فَقَالُوا: ابْتَعْنَاهُ مِنْ تَمِيمٍ وَعَدِيٍّ. فَقَامَ رَجُلَانِ مِنْ أَوْلِيَائِهِ، فَحَلَفَا: لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِنْ شَهَادَتِهِمَا، وَإِنَّ الْجَامَ لِصَاحِبِهِمْ. وَفِيهِمْ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ ﴿١٠٦﴾ ﴾ المائدة.

**٢٧٨٠- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پیاوێك لە نەوەی سەهم لەگەڵ تەمیمی داری و عەدیی کوڕی بەددائدا (لەمەدینە بەرەو شام) دەرچوون، ئینجا پیاوە سەهمییەکە لە وڵاتێکدا کە مسوڵمانی تێدانەبوو مرد، ئینجا کە هەردووکیان میراتەکەیان هێنایەوە جامێکی زیوی بەئاڵتون نەخشێنراوی تێدا نەبوو (دیار نەمابوو)[1]، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هەردووکیانی سوێند دا، پاشان جامەکە لەمەککە دۆزرایەوە، (ئەوانەی کڕیبوویان) وتیان: ئێمە لەتەمیم و عەدییمان کڕیوە، ئیتر دوو کەس[2] لە کەسوکاری مردووەکە سوێندیان خوارد، (وتیان:) شایەتیدانەکەی ئێمە ڕاسترە لەشایەتیدانەکەی ئەو دووانە[3]، وە بێگومان جامەکە هی هاوڕێ (مردووە)کەیانە، (ئیبنو عەبباس دەڵێ): جا لەواندا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ ﴿١٠٦﴾ ﴾ المائدة[4].**

---

(١) تەمیم و عەدیی بۆ خۆیان هەڵیان گرتبوو و فرۆشتبوویان، وە لە گێڕانەوەیەکی تری بوخاریدا هاتووە.(بڕوانە: فتح الباري:٥/٥١٦).

(٢) کە عەمری کوڕی عاص و موتەلیبی کوڕی وەداعە بوون.(إرشاد الساري:٦/٢٧٣).

(٣) تەمیم و عەدیی.

(٤) پێشتر ئەم ئایەتەمان تەفسیر و مانا کرد لەپێش ئەم فەرموودەیەوە.

## ٣٦- بابُ قضَاءِ الوَصِيِّ دُيُونَ المَيِّتِ بِغَيْرِ مَحْضَرٍ مِنَ الوَرَثَةِ

٢٧٨١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَابِقٍ، أَوِ الْفَضْلُ بْنُ يَعْقُوبَ عَنْهُ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ أَبُو مُعَاوِيَةَ عَنْ فِرَاسٍ قَالَ: قَالَ الشَّعْبِيُّ: حَدَّثَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ ﷺ أَنَّ أَبَاهُ اسْتُشْهِدَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَتَرَكَ سِتَّ بَنَاتٍ، وَتَرَكَ عَلَيْهِ دَيْنًا، فَلَمَّا حَضَرَ جِدَادُ النَّخْلِ أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ قَدْ عَلِمْتَ أَنَّ وَالِدِي اسْتُشْهِدَ يَوْمَ أُحُدٍ وَتَرَكَ عَلَيْهِ دَيْنًا كَثِيرًا، وَإِنِّي أُحِبُّ أَنْ يَرَاكَ الْغُرَمَاءُ قَالَ: "اذْهَبْ فَبَيْدِرْ كُلَّ تَمْرٍ عَلَى نَاحِيَتِهِ". فَفَعَلْتُ ثُمَّ دَعَوْتُهُ، فَلَمَّا نَظَرُوا إِلَيْهِ أُغْرُوا بِي تِلْكَ السَّاعَةَ، فَلَمَّا رَأَى مَا يَصْنَعُونَ أَطَافَ حَوْلَ أَعْظَمِهَا بَيْدَرًا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ جَلَسَ عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: "ادْعُ أَصْحَابَكَ". فَمَا زَالَ يَكِيلُ لَهُمْ حَتَّى أَدَّى اللهُ أَمَانَةَ وَالِدِي، وَأَنَا وَاللهِ رَاضٍ أَنْ يُؤَدِّيَ اللهُ أَمَانَةَ وَالِدِي، وَلاَ أَرْجِعَ إِلَى أَخَوَاتِي بِتَمْرَةٍ، فَسَلِمَ وَاللهِ البَيَادِرُ كُلُّهَا، حَتَّى أَنِّي أَنْظُرُ إِلَى البَيْدَرِ الذِي عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ كَأَنَّهُ لَمْ يَنْقُصْ تَمْرَةً وَاحِدَةً. قَالَ أَبُو عبْدِ اللهِ: أُغرُوا بِي: هَيجُوا بِي. ﴿فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ ﴿١٤﴾﴾ المائدة[1].

## ٣٦- باسی دانەوەی قەرزەکانی مردوو لە لایەن سەرپەرشتیارەوە بەبێ ئامادەبوونی میراتگران (دروستە)

**٢٧٨١- شەعبی دەڵێ: جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری ﷺ بۆی گێڕامەوە کە باوکی لەڕۆژی غەزای ئوحوددا شەهید بوو، وە شەش کچی لەپاش خۆی بەجێهێشت، وە قەرزێکی (زۆری) لابوو، جا کاتێك وەختی لێکردنەوەی بەروبوومی خورما هات، ڕۆیشتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان جەنابت دەزانی کە باوکم لەڕۆژی غەزای ئوحوددا شەهید بوو، وە قەرزێکی زۆری دوای خۆی بەجێ هێشتووە، وە**

---

(١) بڕوانە: ٢١٢٧.

بەڕاستی من پێم خۆشە کە خاوەنی قەرزەکان جەنابت ببینن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بڕۆ هەر جۆرە خورمایەك لەشوێنی تایبەت بەخۆی دانێ))، (جابیر دەڵێ:) منیش بەو جۆرەم لێ کرد، پاشان پێغەمبەرم ﷺ بانگ کرد، جا کە (خاوەن قەرزەکان) پێغەمبەریان ﷺ بینی، ڕقیان لێم هەستا و پێداگیری بەهێزیان کرد (لەسەر وەرگرتنەوەی قەرزەکەیان) لێم لەو سات و کاتەدا، جا کە پێغەمبەر ﷺ دی چی دەکەن، سێ جار سووڕایەوە بەدەوری گەورەترین کۆمای خورماکاندا، پاشان لایدا دانیشت، پاشان فەرمووی: ((هاوڕێکانت[1] بانگ بکە))، ئیتر بەردەوام خورمای بۆ دەپێوان هەتا خوا قەرزەکەی باوکمی دایەوە، وە منیش سوێند بەخوا ڕازی بووم کە خوا قەرزەکەی باوکم بداتەوە، وە یەك دەنك خورما نەبەمەوە بۆ خوشکەکانم، جا سوێند بەخوا ئەو جێگایانەی خورماکانی لێ دانرابوو هیچیان لێی کەم نەبوو بوویەوە، هەتا من سەیری ئەو کۆمایەم دەکرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ لایدابوو، دەتوت یەك دەنك خورمای کەم نەکردووە. ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: (أُغرُوا بِي) واتە: ڕقیان لێم هەستاو توڕەبوون. (وەك لە ئایەتەدا دەفەرموێ): (ڕق و کینەمان خستە نێوانیانەوە).

---

(١) خاوەن قەرزەکانت.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٥٦- كِتابُ الجِهادِ والسِّيَر

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٥٦- پەڕاوی خەبات و تێکۆشان و ژیاننامەی تێکۆشەران

### ١- بابُ فَضْلُ الْجِهادِ وَالسِّيَرِ

وَقَوْلُ اللهِ ﷻ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ ۚ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ ۖ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ وَٱلْقُرْءَانِ ۚ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ ۚ فَٱسْتَبْشِرُوا۟ بِبَيْعِكُمُ ٱلَّذِى بَايَعْتُم بِهِۦ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١١١﴾ ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلْعَٰبِدُونَ ٱلْحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلْءَامِرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱلْحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾ ﴾ التوبة. قَالَ ابن عباس الحدود: الطاعة.

### ١- باسی فەزڵ و گەورەیی جیهاد و تێکۆشەران

**باسی ئەم فەرمایشتەی خوای زاڵی پایەدار: (بەڕاستی خوا گیان و ماڵی لە باوەڕداران کڕیوە بەوەی کە بەهەشتیان دەداتێ، (ئەو باوەڕدارانە) جەنگ دەکەن لەڕێی خوادا، ئینجا (بێ باوەڕان) دەکوژن و (خۆشیان) دەکوژرێن، ئەمە بەڵێنێکی ڕاستە (و خوا بڕیاری داوە) لەسەر خۆی لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا، جا کێ بەبەڵێن و پەیمانی خۆی وەفادارترە لەخوا؟! کەواتە**

**مژدەبەخش و شادمان بن بەو فرۆشتنەتان کە مامەڵەتان پێ کرد، (بەڕاستی) هەر ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی زۆر گەورە ﴿١١١﴾ (موجاهیدان ئەمانە سیفاتیانە) تۆبەکارن، خواپەرستن، سوپاسگوزارن، گەشتیارن[1]، کۆچەرن، کڕنوش و سوژدەبەرن (نوێژخوێنن)، فەرمان دەرن بە چاکە، بەرگری کەرن لەخراپە، پارێزەرن بۆ سنوورەکانی خودا، جا (ئەی موحەممەد ﷺ) موژدە بدە بەو باوەڕدارانەی (ئەو سیفەتانەیان تێدایە) ﴿١١٢﴾). ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ:** (الحدود)، **واتە: گوێڕایەڵی.**

**٢٧٨٢-** حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَابِقٍ، حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ مِغْوَلٍ قَالَ: سَمِعْتُ الْوَلِيدَ بْنَ الْعَيْزَارِ ذَكَرَ، عَنْ أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﵁: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ العَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: "الصَّلاَةُ عَلَى مِيقَاتِهَا". قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: "ثُمَّ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ". قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: "الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ". فَسَكَتُّ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَلَوِ اسْتَزَدْتُهُ لَزَادَنِي[2].

**٢٧٨٢- عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﵁ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام کردەوە (لای خوا) چاکترینە؟ فەرمووی: ((نوێژکردن لەسەرەتای کاتەکەیەوە))، وتم: پاشان چ کردەوەیەکی تر؟ فەرمووی: ((پاشان چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا))، وتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی: ((جیهاد و تێکۆشان لە پێناو ئایینی خوادا))، (عەبدوڵڵا وتی): ئیتر بێ دەنگ بووم (و پرسیارم نەکرد) لە پێغەمبەری خوا ﷺ، وە ئەگەر پرسیاری زیاترم بکردایە وەڵامی زیاتری دەدامەوە.**

(١) دەگەڕێن بەسەر زەویدا بۆ بەدەست هێنانی زانست و جیهاد و خەبات بۆ بازرگانی.

(٢) بڕوانە: ٥٢٧.

٢٧٨٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْصُورٌ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "لاَ هِجْرَةَ بَعْدَ الفَتْحِ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا"(١).

**٢٧٨٣- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دوای ئازادکردنی مەککە کۆچکردن(ی واجب بۆ خەڵکی مەککە) نەما، بەڵام خەبات و تێکۆشان و نییەتی (چاکەکردن) هەر دەمێنێ، وە هەر کات داوای دەرچوون بۆ خەبات و تێکۆشانتان لێ کرا هەموو دەرچن)).**

٢٧٨٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، حَدَّثَنَا حَبِيبُ بْنُ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، نُرَى الْجِهَادَ أَفْضَلَ الْعَمَلِ، أَفَلاَ نُجَاهِدُ؟ قَالَ: "لَكِنَّ أَفْضَلَ الجِهَادِ حَجٌّ مَبْرُورٌ"(٢).

**٢٧٨٤- عائیشەی دایکی ئیمانداران ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە خەبات و تێکۆشان بەچاکترین و گەورەترین کردەوە دەزانین، دەی ئێمەی ئافرەتانیش بەشداری خەبات و تێکۆشان نەکەین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نەخێر، بەڵکو چاکترین خەبات و تێکۆشان بۆ ئێوەی ژنان حەجی چاك و وەرگیراوە)).**

٢٧٨٥- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، أَخْبَرَنَا عَفَّانُ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جُحَادَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو حَصِينٍ، أَنَّ ذَكْوَانَ حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ حَدَّثَهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يَعْدِلُ الْجِهَادَ. قَالَ: "لاَ أَجِدُهُ" قَالَ: "هَلْ تَسْتَطِيعُ

---

(١) بروانە: ١٣٤٩.

(٢) بروانە: ١٥٢٠.

إِذَا خَرَجَ الْمُجَاهِدُ أَنْ تَدْخُلَ مَسْجِدَكَ فَتَقُومَ وَلاَ تَفْتُرَ وَتَصُومَ وَلاَ تُفْطِرَ؟ ". قَالَ: وَمَنْ يَسْتَطِيعُ ذَلِكَ؟ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: إِنَّ فَرَسَ الْمُجَاهِدِ لَيَسْتَنُّ فِي طِوَلِهِ فَيُكْتَبُ لَهُ حَسَنَاتٍ.

**٢٧٨٥- ئەبو حەصین دەڵێ: زەكوان بۆی گێڕایەوە، ئەویش دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﵁ بۆی گێڕاوەتەوە و وتی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: كردەوەیەكم نیشان بدە هاوتای جیهاد بێت، فەرمووی: ((دەستم ناكەوێت))، فەرمووی: ((ئایا دەتوانیت كاتێك جەنگاوەر دەرچوو (بۆ جیهاد)، تۆش بچیتە نوێژگەكەت و نوێژ و شەونوێژ بكەیت بەبەردەوامی و بێ پچڕان، وە ڕۆژوو بگریت و نەیشكێنیت؟)) پیاوەكە وتی: كێ ئەوە دەتوانێت؟ ئەبو هورەیرە وتی: بێگومان ئەسپی جەنگاوەر ڕمبازی و غار دەكات بەدرێژی ئەو گوریسەی پێی بەستراوەتەوە، جا ئەوەش بە چاكە بۆ (خاوەنە جەنگاوەرەكە) دەنووسرێت.**

## ٢ - بابٌ: أَفْضَلُ النَّاسِ مُؤْمِنٌ يُجَاهِدُ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ

وَقَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿١٠﴾ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ ﴾ الصف.

## ٢- باسێك: باشترین كەس باوەڕدارێكە بەگیان و ماڵی لەڕێی خوای زاڵی پایەداردا تێبكۆشێت

**باسی ئەو فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە! ئایا بازرگانییەكتان نیشان بدەم كە ڕزگارتان بكات لەسزایەكی پڕ لە ئازار؟ (بازرگانییەكەش ئەمەیە:) باوەڕبێنن بەخوا و پێغەمبەرەكەی، وە تێبكۆشن لەڕێی خوادا بەسامان و گیانی خۆتان، ئەمەتان باشترە بۆ خۆتان ئەگەر ئێوە**

**بزانن، ئەوسا خوا لەگوناهەكانتان خۆش دەبێت، وە (لەڕۆژی دواییدا) دەتانخاتە باخاتێكەوە كە جۆگەی ئاوی زۆر بەژێریاندا دەڕوات، (وە دەتانخاتە) خانوو و كۆشكی زۆر پاك و خۆشەوە لە بەهەشتانی هەتاهەتاییدا، ئەمەیە سەركەوتنی گەورە).**

**٢٧٨٦**- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي عَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ اللَّيْثِيُّ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ حَدَّثَهُ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مُؤْمِنٌ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللهِ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ". قَالُوا: ثُمَّ مَنْ قَالَ: "مُؤْمِنٌ فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ يَتَّقِي اللهَ، وَيَدَعُ النَّاسَ مِنْ شَرِّهِ"[١].

**٢٧٨٦- عەتائی كوڕی یەزیدی لەیسی دەڵێ: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ بۆی گێڕایەوە و وتی، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ كەسێك لەهەمووان گەورەتر و بەڕێزترە؟ ئەویش فەرمووی: ((باوەڕدارێك بە گیان و سامانی خۆی لەڕێی خوادا تێبكۆشێت))، وتیان: پاشان كێی تر؟ فەرمووی: ((باوەڕدارێكە لە شیوێك لە شیوەكاندا بەندایەتی و تەقوای خوا بكات، خەڵكیش دوور بن لە زیان و خراپەی)).**

**٢٧٨٧**- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: "مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ - وَاللهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِهِ - كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ، وَتَوَكَّلَ اللهُ لِلْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِهِ بِأَنْ يَتَوَفَّاهُ أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، أَوْ يَرْجِعَهُ سَالِمًا مَعَ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ"[٢].

---

(١) بڕوانە: ٦٤٩٤.

(٢) بڕوانە: ٣٦.

**٢٧٨٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((نموونەی جەنگاوەر لەڕێی خوادا (خوا بۆ خۆی دەزانێ كێ لەڕێی خوادا تێدەكۆشێت) وەك ڕۆژووەوانێكی شەونوێژكار (ی بەردەوام) وایە، وە خوای گەورە زەمانەتی ئەو موجاهیدەی كردووە كە لە پێناویدا دەجەنگێ، ئەگەر مراندی ئەوە بیخاتە بەهەشتەوە، یان بەساغ و سەلیمی بیگێڕێتەوە لەگەڵ پاداشتی جیهادەكەیدا، یان بە دەستكەوتەوە)).**

## ٣- بابُ الدُّعَاءِ بِالْجِهَادِ وَالشَّهَادَةِ لِلرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ

وَقَالَ عُمَرُ ﷺ: ارْزُقْنِي شَهَادَةً فِي سبيلك.

**٢٧٨٨- ٢٧٨٩-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يدخلُ على أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ، فَتُطْعِمُهُ، وَكَانَتْ أُمُّ حَرَامٍ تَحْتَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَطْعَمَتْهُ وَجَعَلَتْ تَفْلِي رَأْسَهُ، فَنَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ. قَالَتْ: فَقُلْتُ: وَمَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: "نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ، غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللهِ، يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْرِ، مُلُوكًا عَلَى الأَسِرَّةِ"، أَوْ: "مِثْلُ الْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ". شَكَّ إِسْحَاقُ. قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَدَعَا لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ ثُمَّ وَضَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ فَقُلْتُ وَمَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ: "نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ، غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللهِ". كَمَا قَالَ فِي الأَوَّلِ. قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. قَالَ: "أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ". فَرَكِبَتِ البَحْرَ فِي زَمَانِ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، فَصُرِعَتْ عَنْ دَابَّتِهَا حِينَ خَرَجَتْ مِنَ الْبَحْرِ، فَهَلَكَتْ[1].

(١) الحديث ٢٧٨٨: (٢٣٠٢٢٧٩٩، ٢٨٧٧، ٢٨٩٤، ٦٢٨٢، ٧٠٠١).

## ٣- باسی نزای چوونە ڕیزی جەنگاوەران و شەهیدان بۆ پیاوان و ئافرەتان

عومەر ﷺ دەڵێ: خوایە شەهیدیم پێ ببەخشی لە پێناو ڕێبازەکەی خۆتدا (لە شاری پێغەمبەرەکەتدا ﷺ).

٢٧٨٨- ٢٧٨٩- ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو تەڵحە دەڵێ: کە ئەو لە ئەنەسی کوڕی مالیکی ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕۆیشت بۆ ماڵی ئوممو حەڕامی کچی میلحان و خواردنی دەدا بە پێغەمبەر ﷺ، وە ئوممو حەڕام خێزانی عوبادەی کوڕی صامیت بوو، جا جارێکیان پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە ماڵیان، ئوممو حەڕامیش چێشت و خواردنی دا بە پێغەمبەر ﷺ، دەستی کرد بە بژنینی سەری پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ خەوی لێ کەوت، پاشان لەخەو هەستاو پێدەکەنی، وتی: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هۆی پێکەنینەکەت چی بوو؟ فەرمووی: ((کەسانێك لە ئومەتەکەمم نیشاندرا کە جەنگاوەر بوون لەڕێی خوادا سواری (کەشتی دەبن)، لە ناوەڕاستی دەریادا (دەڵێی) پادشان لەسەر تەختەکەیان دانیشتوون))، یان ((وەك پادشا وان لەسەر تەختەکەیان دانیشتوون))، ئیسحاق گومانی هەبووە (لەنێوان ئەو دوو ڕستەیەدا)، ئوممو حەڕام وتی: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نزام بۆ بکە لای خوا کە من لەو جەنگاوەرانە بم، پێغەمبەریش ﷺ نزای بۆ کرد، پاشان سەری خستەوە سەر پشتییەکە و (خەوت)، پاشان خەبەری بوویەوە و پێدەکەنی منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هۆی چییە پێدەکەنیت؟ فەرمووی: ((کەسانێك لە ئومەتەکەمم نیشان درا جەنگاوەربوون لە ڕێی خوادا)) وەك گێڕانەوەکەی یەکەمی گێڕایەوە، وتی: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نزام بۆ بکە لای خوا کە لەو جەنگاوەرانە بم، فەرمووی:

---

الحدیث ٢٧٨٩: (٢٨٠٠، ٢٨٧٨، ٢٨٩٥، ٦٢٨٣، ٧٠٠٢).

((تۆ لە یەکەمینەکانیت))، ئەنەس دەڵێ: لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیاندا ئوممو حەڕام سواری کەشتی بوو لەدەریادا (بۆ خەبات لەڕێی خوادا)، جا کاتێك لە دەریا هاتە دەر (بۆ وشکانی)، لە وڵاخەکەی کەوتە خوارەوە و مرد.

## ٤- بابُ دَرَجَاتِ الْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِ اللهِ

يُقَالُ: هَذِهِ سَبِيلِي، وهذا سَبِيلِي.

﴿ غُزًّى ﴾ آل عمران، وَاحِدُهَا غازٍ. ﴿ هُمْ دَرَجَٰتٌ ﴾ آل عمران: لَهُمْ دَرَجَاتٌ.

٢٧٩٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَبِرَسُولِهِ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ وَصَامَ رَمَضَانَ، كَانَ حَقًّا عَلَى اللهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ جَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَوْ جَلَسَ فِي أَرْضِهِ الَّتِي وُلِدَ فِيهَا". فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَلاَ نُبَشِّرُ النَّاسَ؟. قَالَ: "إِنَّ فِي الجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِ اللهِ، مَا بَيْنَ الدَّرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللهَ فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الجَنَّةِ وَأَعْلَى الجَنَّةِ -أُرَاهُ: فَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ- وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الجَنَّةِ". قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ فُلَيْحٍ عَنْ أَبِيهِ: "وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ"[1].

## ٤- باسی پلە و پایەی جەنگاوەرانی ڕێی خوا

دەوترێت: (هَذِهِ سَبِيلِي)[2]، وە دەوترێ: (وهذا سَبِيلِي)[3]، (وە ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ﴿ غُزًّى ﴾ کۆیە و تاکەکەی (غازٍ)، واتە: جەنگاوەر، وە دەڵێ: ﴿ هُمْ دَرَجَٰتٌ ﴾ بە مانای: (لَهُمْ دَرَجَاتٌ)، واتە: (هُمْ) لە ڕستەی یەکەمدا بە واتای: (لَهُم) دێت، (واتە: ئەو پلە و پایەی بۆ جەنگاوەرانە).

(١) بڕوانە: ٧٤٢٣.

(٢) ئەمەیان بۆ ئەوەیە کە وشەی (سبیل) (مؤنث) بێت.

(٣) ئەمەیان (سبیل) (مذکر) بێت.

٢٧٩٠- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەرکەس باوەڕی هەبێت بە خوا و بەپێغەمبەرەکەی، وە نوێژ بکات، ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت، ئەوە پێویستە لەسەر خوا[1] بیخاتە بەهەشتەوە، خەبات و تێکۆشان بکات لەڕێی خوادا، یان هەر لەو وڵاتەی تێیدا لەدایك بووە دانیشێت[2]))، جا هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا موژدە بدەین بەخەڵکی؟ فەرمووی ﷺ : ((بێگومان لەبەهەشتدا سەد پلە هەیە، خوا بۆ خەباتگێڕانی ڕێی خوای ئامادەکردووە، نێوان دوو پلەیان بە ئەندازەی نێوان ئاسمان و زەوییە، جا ئەگەر داواتان لەخوا کرد، ئەوە داوای فیردەوس بکەن، چونکە بێگومان فیردەوس ناوەڕاستی[3] بەهەشتە، وە بەرزترین جێگای بەهەشتە، -وابزانم فەرمووی:- لەسەرووی فیردەوسەوە عەرشی خوای بەبەزەییە، وە لەوێشەوە ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن)). (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) موحەممەدی کوڕی فولەیح لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە بەم جۆرە: (وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ) بەبێ گومان دەیگێڕێتەوە[4].

٢٧٩١- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ، عَنْ سَمُرَةَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ رَجُلَيْنِ أَتَيَانِي فَصَعِدَا بِي الشَّجَرَةَ، فَأَدْخَلاَنِي دَارًا هِيَ أَحْسَنُ وَأَفْضَلُ، لَمْ أَرَ قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهَا قَالاَ: أَمَّا هَذِهِ الدَّارُ فَدَارُ الشُّهَدَاءِ"[5].

---

(١) لە ڕووی فەزڵ وکەرەمەوە، نەک فەرز و واجب بێت لەسەر خوا. بڕوانە: إرشاد الساري: ٢٨٥/٦.

(٢) خەبات و تێکۆشان نەکات.

(٣)چاکترین شەێنی بەهەشتە.

(٤) بەلام پێشتر یەحیای کوڕی ساڵح کە مامۆستای بوخارییە بەگومانی گێڕایەوە، وتی: وابزانم فەرموویەتی، بەڵام گێڕانەوەکەی موحەممەدی کوڕی فولەیح بەبێ گومان گێڕاویەتیەوە.

(٥) بڕوانە: ٨٤٥.

٢٧٩١- سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەمشەو (لە خەومدا) دوو پیاوم[1] بینی هاتن بۆ لام، جا بەرزیان كردمەوە بۆ لای درەختێكی گەورە، ئیجا بردمیانە ناو خانوویەكی خۆشەوە كە ئەو خانوویە جوانتر و چاكتر بوو (لە خانووەكەی پێشوو)، خانووی لەوە جوانترم هەرگیز نەدیوە، ئینجا هەردوو پیاوەكە پێیان وتم: جا ئەم خانووە خانووی (كۆشكی) شەهیدەكانە)).

## ٥- بابُ الغَدْوَةِ وَالرَّوْحَةِ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَقَابُ قَوْسِ أَحَدِكُمْ مِنَ الجَنَّةِ

٢٧٩٢- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "لَغَدْوَةٌ فِي سَبِيلِ اللهِ أَوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا"[2].

## ٥- باسی ڕۆیشتن بۆ خەبات لەڕێی خوادا لە بەرەبەیان و ئێواراندا، وە ئەندازە كەوانێك شوێن و جێگا هی كەسێكتان بێت لە بەهەشتدا

٢٧٩٢- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((سەر لە بەیانییەك دەرچوون یان سەر لە ئێوارەیەك دەرچوون لە پێناو خوادا، لە دونیاو ئەوەی تێدایە چاكترە)).

٢٧٩٣- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ المُنْذِرِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُلَيْحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ هِلَالِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "لَقَابُ قَوْسٍ

(١) دوو فریشتە بوون كە جیبریل و میكائیل بوون، وە لە فەرموودەی: ١٣٨٦ـی بوخاریدا هاتووە، كە فەرموودەیەكی درێژە.

(٢) بڕوانە: ٢٧٩٦، ٦٥٦٨.

فِي الجَنَّةِ خَيْرٌ مِمَّا تَطْلُعُ عَلَيْهِ الشَّمْسُ وَتَغْرُبُ". وَقَالَ: "لَغَدْوَةٌ أَوْ رَوْحَةٌ فِي سَبِيلِ اللهِ خَيْرٌ مِمَّا تَطْلُعُ عَلَيْهِ الشَّمْسُ وَتَغْرُبُ"[1].

**٢٧٩٣- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بە ئەندازەی کەوانێك لە بەهەشتدا چاکترە لەهەموو ئەوەی کە خۆری لێ هەڵدێت و لێی ئاوا دەبێت))، وە فەرموویەتی: ((سەر لە بەیانییەك دەرچوون یان سەر لە ئێوارەیەك دەرچوون لەپێناو خوادا، چاکترە لە هەموو ئەوەی کە خۆری لێ هەڵدێت و لێی ئاوا دەبێت)).**

**٢٧٩٤-** حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "الرَّوْحَةُ وَالْغَدْوَةُ فِي سَبِيلِ اللهِ أَفْضَلُ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا"[2].

**٢٧٩٤- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((چوون بۆ خەبات و جیهاد سەر لە ئێوارەیەك یاخود سەر لە بەیانییەك، لە دونیا و ئەوەی تێیدایە چاکترە)).**

## ٦- بابُ الحُورُ الْعِينُ وَصِفَتُهُنَّ

يَحَارُ فِيهَا الطَّرْفُ شَدِيدَةُ سَوَادِ العَيْنِ شَدِيدَةُ بَيَاضِ العَيْنِ. ﴿وَزَوَّجْنَاهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾﴾ الدخان. أَنْكَحْنَاهُمْ.

## ٦- باسی ڕوونکردنەوەی (حُور العين) و ڕوونکردنەوەی نیشانەکانیان

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) چاو سەرسام دەبێت (لە جوانیان)، زۆر ڕەشێتی گلێنەی چاو، زۆر سپێتی سپیایی چاو، ﴿وَزَوَّجْنَاهُم﴾ واتە: کردومانەتە هاوسەر و خێزانیان.**

---

(١) بڕوانە: ٣٢٥٣.

(٢) بڕوانە: ٢٨٩٢، ٣٢٥٠، ٦٤١٥.

٢٧٩٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مَا مِنْ عَبْدٍ يَمُوتُ، لَهُ عِنْدَ اللهِ خَيْرٌ، يَسُرُّهُ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا، وَأَنَّ لَهُ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، إِلاَّ الشَّهِيدَ؛ لِمَا يَرَى مِنْ فَضْلِ الشَّهَادَةِ، فَإِنَّهُ يَسُرُّهُ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا فَيُقْتَلَ مَرَّةً أُخْرَى"[١].

**٢٧٩٥- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ: ((هیچ بەندەیەکی (باوەڕدار) نییە بمرێت و لای خوا پاداشتی چاکەی هەبێت، پێی خۆش بێت کە بگەڕێتەوە بۆ دونیا، جا دونیا و ئەوەی تێیدایە بۆ ئەو بێت، جگە لە شەهید لەبەر ئەوەی کە دەزانێ پلەو پایەی شەهید چەند بەرز و گەورەیە، بۆیە بەڕاستی پێی خۆشە کە بگەڕێتەوە بۆ دونیا و جارێکی تر بکوژرێت (شەهید بێتەوە) )).**

٢٧٩٦ - وَسَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: "لَرَوْحَةٌ فِي سَبِيلِ اللهِ أَوْ غَدْوَةٌ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، وَلَقَابُ قَوْسِ أَحَدِكُمْ مِنَ الجَنَّةِ أَوْ مَوْضِعُ قِيدٍ -يَعْنِي: سَوْطَهُ- خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، وَلَوْ أَنَّ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ اطَّلَعَتْ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ لأَضَاءَتْ مَا بَيْنَهُمَا وَلَمَلأَتْهُ رِيحًا، وَلَنَصِيفُهَا عَلَى رَأْسِهَا خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا"[٢].

**٢٧٩٦- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ((سەر لە بەیانییەك دەرچوون یان سەر لە ئێوارەیەك دەرچوون لە پێناو خوادا، لە دونیا و هەموو ئەوەی تێیدایە چاکترە، وە بە ئەندازەی کەوانی (جێگای) کەسێکتان لە بەهەشتدا یان بەقەدەر شوێنی قەمچییەك -(قِید) واتە: قەمچی- لە دونیا و هەموو ئەوەی تێیدایە چاکترە، وە ئەگەر ئافرەتێکی**

(١) بڕوانە: ٢٨١٧.

(٢) بڕوانە: ٢٧٩٢.

بەهەشتی[1] خۆی نیشانی خەڵکی سەر زەوی بدات، بێگومان نێوانی ئاسمان و زەوی ڕووناك دەكردەوە و پڕی دەكرد لەبۆنی خۆش، وە سەرپۆشەكەی بەسەریەوەتی، لە دونیاو هەرچی تیایەتی چاكترە)).

## ٧- بابُ تَمَنِّي الشَّهَادَةِ

٢٧٩٧- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: "وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْلاَ أَنَّ رِجَالاً مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لاَ تَطِيبُ أَنْفُسُهُمْ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِّي، وَلاَ أَجِدُ مَا أَحْمِلُهُمْ عَلَيْهِ، مَا تَخَلَّفْتُ عَنْ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللهِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللهِ ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ"[2].

## ٧- باسی ئاوات خواستنی شەهیدبوون

٢٧٩٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، لەبەر ئەوە نەبووایە كە پیاوانێك لە باوەڕداران دەروونیان ئاسوودە نابێت لە من دوا بكەون (لەگەڵم نایەن)، وە وڵاخ نییە پێیان بدەم سواری بن، لە هیچ لە شكریەك دوانەدەكەوتم كە لەپێناو خوادا غەزای كردبایە، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئاواتە خوازبووم لەڕێی خوادا بكوژرێم، پاشان زیندوو بكرێمەوە، پاشان بكوژرێمەوە، پاشان زیندوو بكرێمەوە، پاشان بكوژرێمەوە، پاشان زیندووبكرێمەوە، پاشان بكوژرێمەوە)).

---

(١) لەو ئافرەتانەی ئامادەکراوە بۆ پیاوە بەهەشتییەکان کاتێک دەچنە بەهەشتەوە.

(٢) بڕوانە: ٣٦.

٢٧٩٨- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ الصَّفَّارُ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلاَلٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: خَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: "أَخَذَ الرَّايَةَ زَيْدٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا جَعْفَرٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا عَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ عَنْ غَيْرِ إِمْرَةٍ فَفُتِحَ لَهُ" وَقَالَ: "مَا يَسُرُّنَا أَنَّهُمْ عِنْدَنَا". قَالَ أَيُّوبُ أَوْ قَالَ: "مَا يَسُرُّهُمْ أَنَّهُمْ عِنْدَنَا". وَعَيْنَاهُ تَذْرِفَانِ(١).

**٢٧٩٨- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وتاری داو فەرمووی: ((زەید ئاڵاكەی گرت بەدەستەوە و كوژرا (شەهید بوو)، پاشان جەعفەر ئاڵاكەی هەڵگرت و كوژرا، پاشان عەبدوڵلای كوڕی ڕەواحە ئاڵاكەی هەڵگرت و كوژرا، پاشان خالیدی كوڕی وەلید ئاڵاكەی هەڵگرت بێ ئەوەی كەس كردبێتی بە ئەمیر و لێپرسراو و سەرخرا (زاڵ بوو بەسەر دوژمندا)) )، وە فەرمووی: ((پێمان خۆش نییە ئەو شەهیدانە ئێستا (زیندوو بوونایەو) لای ئێمە بوونایە (٢)))، ئەیووب دەڵێ: یان فەرمووی: ((ئەو شەهیدانە پێیان خۆش نییە كە لای ئێمە بوونایە (٣)))، (ئەیووب دەڵێ:) وە چاوەكانی فرمێسكیان دەڕشت.**

## ٨- بابُ فَضْلِ مَنْ يُصْرَعُ فِي سَبِيلِ اللهِ فَمَاتَ فَهُوَ مِنْهُمْ

وَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ ۞ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ ﴿١٠٠﴾ ﴾ النساء. ﴿ وَقَعَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ النساء: وَجَبَ.

---

(١) بڕوانە: ١٢٤٦.

(٢) لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەزانێت بە چ پلەیەكی بەرز و گەورە گەیشتوون.

(٣) چونكە شەهیدان دڵنیان ئەو پلە بەرزەی دەستیان كەوتووە و پێی گەیشتوون، زۆر چاكترە لەم ژیانی دونیایەی بە جێیان هێشتوە.

٢٧٩٩- ٢٨٠٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ خَالَتِهِ أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ قَالَتْ: نَامَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمًا قَرِيبًا مِنِّي، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ يَتَبَسَّمُ. فَقُلْتُ: مَا أَضْحَكَكَ؟ قَالَ: "أُنَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ يَرْكَبُونَ هَذَا البَحْرَ الأَخْضَرَ، كَالْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ ". قَالَتْ: فَادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَدَعَا لَهَا، ثُمَّ نَامَ الثَّانِيَةَ، فَفَعَلَ مِثْلَهَا، فَقَالَتْ مِثْلَ قَوْلِهَا، فَأَجَابَهَا مِثْلَهَا، فَقَالَتِ: ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَقَالَ: "أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ". فَخَرَجَتْ مَعَ زَوْجِهَا عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ غَازِيًا أَوَّلَ مَا رَكِبَ المُسْلِمُونَ البَحْرَ مَعَ مُعَاوِيَةَ، فَلَمَّا انْصَرَفُوا مِنْ غَزْوِهِمْ قَافِلِينَ فَنَزَلُوا الشَّأْمَ، فَقُرِّبَتْ إِلَيْهَا دَابَّةٌ لِتَرْكَبَهَا فَصَرَعَتْهَا فَمَاتَتْ[1].

## ٨- باسی گەورەیی كەسێك لە خەبات لەڕێی خوادا وڵاخەكەی بیخاتە خوارەوە[2] و بمرێت ئەوە لە جەنگاوەرانە

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە هەركەسێك لە ماڵی خۆی دەرچێت، وە كۆچ بكات بۆ لای خوا و پێغەمبەرەكەی، پاشان مردن پێی بگات، ئەوە بێگومان پاداشتی ئەو كەسە كەوتۆتە سەر خوا)، (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ﴿وَقَعَ﴾ واتە: پێویست بووە.**

**٢٧٩٩- ٢٨٠٠- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە لە ئوممو حەڕامی كچی میلحانی پوریەوە كە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك لە نزیك منەوە خەوت، پاشان لە خەو هەستا زەردەخەنەی دەكرد، منیش وتم: هۆی چییە پێدەكەنیت؟ فەرمووی: ((كەسانێكم نیشاندرا لە ئوممەتم سواری (كەشتی دەبن لە) ئەم دەریا**

(١) بڕوانە: ٢٧٨٨، ٢٧٨٩.

(٢) ئەگەر مانای دەقاودەقی بكەین دەبێ بڵێین: لە وڵاخ بخرێتە خوارەوە.

**سەوزەدا وەك پادشای سەر تەخت وابوون))، ئوممو حەڕام وتی: دەی نزام بۆ بكە لای خوا كەمن لەو كەسانە بم، پێغەمبەریش ﷺ نزای بۆ كرد، پاشان جاری دووەم خەوتەوە وەك جارەكەی پێشووی كرد، ئوممو حەڕامیش وتەكەی پێشووی دووبارە كردەوە، ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە، جا وتی: نزام بۆ بكە لای خوا كە لەو كەسانە بم، فەرمووی: ((تۆ لە یەكەمینەكانیت))، ئینجا ئوممو حەڕام لەگەڵ عوبادەی كوڕی صامیتی مێردیدا كە یەكەمجار بوو مسوڵمانان سواری كەشتی بوون لە دەریادا، لەگەڵ موعاویەدا ڕۆیشت بۆ غەزا، جا كاتێك تەواو بوون و گەڕانەوە لەغەزاكەیان، لە شام دابەزین و لایاندا، وڵاخێكیان بۆ نزیك كردەوە تا سواری بێت، وڵاخەكە خستیە خوارەوەو مرد.**

## ٩- بابُ مَنْ يُنْكَبُ[١] فِي سَبِيلِ اللهِ

٢٨٠١- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ الحَوْضِيُّ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ عَنْ إِسْحَاقَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ أَقْوَامًا مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ إِلَى بَنِي عَامِرٍ فِي سَبْعِينَ، فَلَمَّا قَدِمُوا، قَالَ لَهُمْ خَالِي: أَتَقَدَّمُكُمْ، فَإِنْ أَمَّنُونِي حَتَّى أُبَلِّغَهُمْ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَإِلاَّ كُنْتُمْ مِنِّي قَرِيبًا. فَتَقَدَّمَ، فَأَمَّنُوهُ، فَبَيْنَمَا يُحَدِّثُهُمْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ أَوْمَئُوا إِلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ، فَطَعَنَهُ فَأَنْفَذَهُ فَقَالَ: اللهُ أَكْبَرُ، فُزْتُ وَرَبِّ الكَعْبَةِ. ثُمَّ مَالُوا عَلَى بَقِيَّةِ أَصْحَابِهِ فَقَتَلُوهُمْ، إِلاَّ رَجُلاً أَعْرَجَ صَعِدَ الْجَبَلَ. قَالَ هَمَّامٌ: فَأُرَاهُ آخَرَ مَعَهُ، فَأَخْبَرَ جِبْرِيلُ -عَلَيْهِ السَّلاَمُ- النَّبِيَّ ﷺ أَنَّهُمْ قَدْ لَقُوا رَبَّهُمْ، فَرَضِيَ عَنْهُمْ وَأَرْضَاهُمْ، فَكُنَّا نَقْرَأُ: أَنْ بَلِّغُوا قَوْمَنَا أَنْ قَدْ لَقِينَا رَبَّنَا فَرَضِيَ عَنَّا وَأَرْضَانَا. ثُمَّ نُسِخَ بَعْدُ، فَدَعَا عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ وَبَنِي لِحْيَانَ وَبَنِي عُصَيَّةَ الَّذِينَ عَصَوُا اللهَ وَرَسُولَهُ ﷺ[٢].

---

(١) (يُنْكَبُ) واتە: ئەندامێكی لاشەی خوێنی لێ هێنرا، یان لاشەی خوێنی لێ هێنرا.(إرشاد الساري:٦/٢٩٤).

(٢) بڕوانە: ١٠٠١.

## ٩- باسى پلەو گەورەيى ئەو كەسەى لەپێناوى خوادا كارەساتى بەسەردا دێت

٢٨٠١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كۆمەڵە كەسێكى لەبەنى سولەيم نارد كە حەفتا كەس بوون بۆ لاى بەنى عامير، جا كاتێك هاتن (لە بيرى مەعونە) خاڵم (حەرامى كوڕى ميلحان) پێى وتن: من پێش ئێوە دەچم، جا ئەگەر بەڵێنيان دا بمپارێزن هەتا پەيامى پێغەمبەرى خوايان ﷺ پێ ڕابگەيەنم باشە، ئەگەر نا ئێوە لەمنەوە نزيكن، جا حەرام پێشكەوت و بەڵێنى پارێزگاريان پێدا، ئينجا لەكاتێكدا فەرموودەى پێغەمبەرى ﷺ بۆ باس دەكردن، ئاماژەيان كرد بۆ پياوێك لە خۆيان، ئەويش ڕمێكى لە حەرام دا و لەو سەرەوە لە لاشەى دەرچوو، حەرام وتى: (اللّٰه أَكْبَرُ) سوێند بەپەروەردگارى كەعبە سەركەوتم[1]، پاشان پەلاماريان هێنا بۆ هاوڕێكانى ترى حەرام و هەموويانيان كوشت، جگە لە پياوێكى شەل سەركەوتبووە شاخەكە - هومام دەڵێ: وابزانم كەسێكى ديكەى لەگەڵ بوو - جا جيبريل ﷺ هەواڵى (ڕووداوەكەى) دا بەپێغەمبەر ﷺ، كە هەموويان بەخزمەت پەروەردگاريان گەيشتن و لێيان ڕازى بوو، وە ڕازى كردن، ئەنەس دەڵێ: ئێمە ئەم ئايەتەمان دەخوێندەوە: (بەهۆزەكەمان ڕا بگەيەنن كە ئێمە گەيشتينە خزمەت پەروەردگارمان و لێمان ڕازى بوو، وە ڕازى كردين)، پاشان دواتر سڕايەوە، پێغەمبەريش ﷺ چل بەيانى دوعاى لێيان دەكرد: (لە قنوتى نوێژى بەيانياندا) لە ريعل و زەكوان و بەنى ليحيان و بەنى عوصەييە ئەوانەى سەرپێچى خوا و پێغەمبەرەكەيان ﷺ كرد.

---

(١) واتە: شەهيديم بەدەست هێنا.

٢٨٠٢- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ جُنْدُبِ بْنِ سُفْيَانَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ فِي بَعْضِ المَشَاهِدِ وَقَدْ دَمِيَتْ إِصْبَعُهُ، فَقَالَ: "هَلْ أَنْتِ إِلاَّ إِصْبَعٌ دَمِيتِ ... وَفِي سَبِيلِ اللهِ مَا لَقِيتِ"[١].

**٢٨٠٢-جوندوبی كوڕی سوفیان دەگێڕێتەوە كەپێغەمبەری خوا ﷺ لەیەكێك لە جەنگەكاندا پەنجەیەكی برینداربوو خوێنی لێ هات پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئایا تۆ تەنها پەنجەیەك نیت خوێنت لێهات... لەپێناوی خوادا ئەومت بەسەر هات)) .**

## ١٠- بابُ مَنْ يُجْرَحُ فِي سَبِيلِ اللهِ ﷻ

٢٨٠٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يُكْلَمُ أَحَدٌ فِي سَبِيلِ اللهِ -وَاللهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِهِ- إِلاَّ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَاللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ وَالرِّيحُ رِيحُ المِسْكِ"[٢].

## ١٠- باسی (گەورەیی) ئەو كەسەی لەڕێی خوای زاڵی پایەداردا بریندار بكرێت

**٢٨٠٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((سوێند بێت بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، هەركەسێك لەپێناوی خوادا بریندار بكرێت -خوا خۆی زاناترە كێ لەپێناو ئەودا برینداركراوە-، بێگومان ڕۆژی دوایی ئەو كەسە دێت (و برینەكەی خوێنی لێ دێ)، ڕەنگەكەی ڕەنگی خوێنەو بۆنەكەشی وەك بۆنی میسكە)).**

(١) بڕوانە: ٦١٤٦.

(٢) بڕوانە: ٢٣٧.

## ١١- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ﴿٥٢﴾﴾ التوبة وَالْحَرْبُ سِجَالٌ

٢٨٠٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ هِرَقْلَ قَالَ لَهُ سَأَلْتُكَ كَيْفَ كَانَ قِتَالُكُمْ إِيَّاه؟ فَزَعَمْتَ أَنَّ الْحَرْبَ سِجَالٌ وَدُوَلٌ، فَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْتَلَى ثُمَّ تَكُونُ لَهُمُ العَاقِبَةُ[1].

## ١١- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئایا چاوەڕوانی چی دەکەن بۆ ئێمە بێجگە لە یەکێک لە دوو شتە زۆر چاکەکە (سەرکەوتن یان شەهیدبوون))، وە جەنگ کردن بە نۆرەیە[2]

**٢٨٠٤- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەبو سوفیان بۆی گێڕایەوە کە هیرەقڵ پێی وتووە: پرسیارم لێ کردیت جەنگ کردنی ئێوە لەگەڵیدا چۆنە؟ تۆش بەقسەی خۆت دەڵێی: جەنگمان بەنۆرەیە و هەرجارەی لایەکمان سەردەکەوین، پێغەمبەرانیش کاریان ئا بەو جۆرەیە و تاقی دەکرێنەوە، پاشان سەرەنجام بۆ ئەوانە.**

(١) بڕوانە: ٧.

(٢) واتە: جارێک تۆ سەردەکەویت، جارێک دوژمنەکەت.

## ١٢- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الأحزاب.

## ١٢- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند:

**(لە ناو باوەڕداراندا پیاوانێك هەن ڕاستیان کرد لەو پەیمانەی کە دابوویان بەخوا، ئینجا هەندێکیان نەزر و بەڵێنی خۆی بەجێ هێنا (شەهید بوو)، هەندێکیشیان چاوەڕوانن، هیچ گۆڕانێکیان (لە بەڵێنی خۆیاندا) نەکردووە).**

٢٨٠٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَعِيدٍ الخُزَاعِيُّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسًا. حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ زُرَارَةَ، حَدَّثَنَا زِيَادٌ قَالَ: حَدَّثَنِي حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: غَابَ عَمِّي أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ عَنْ قِتَالِ بَدْرٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، غِبْتُ عَنْ أَوَّلِ قِتَالٍ قَاتَلْتَ المُشْرِكِينَ، لَئِنِ اللهُ أَشْهَدَنِي قِتَالَ الْمُشْرِكِينَ لَيَرَيَنَّ اللهُ مَا أَصْنَعُ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ وَانْكَشَفَ الْمُسْلِمُونَ قَالَ: "اللَّهُمَّ إِنِّي أَعْتَذِرُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ هَؤُلاَءِ-يَعْنِي: أَصْحَابَهُ - وَأَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ هَؤُلاَءِ -يَعْنِي: الْمُشْرِكِينَ- ثُمَّ تَقَدَّمَ، فَاسْتَقْبَلَهُ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ، فَقَالَ: يَا سَعْدُ بْنَ مُعَاذٍ، الجَنَّةَ، وَرَبِّ النَّضْرِ إِنِّي أَجِدُ رِيحَهَا مِنْ دُونِ أُحُدٍ. قَالَ: سَعْدٌ فَمَا اسْتَطَعْتُ يَا رَسُولَ اللهِ مَا صَنَعَ. قَالَ أَنَسٌ: فَوَجَدْنَا بِهِ بِضْعًا وَثَمَانِينَ ضَرْبَةً بِالسَّيْفِ أَوْ طَعْنَةً بِرُمْحٍ أَوْ رَمْيَةً بِسَهْمٍ، وَوَجَدْنَاهُ قَدْ قُتِلَ وَقَدْ مَثَّلَ بِهِ الْمُشْرِكُونَ، فَمَا عَرَفَهُ أَحَدٌ إِلاَّ أُخْتُهُ بِبَنَانِهِ. قَالَ أَنَسٌ: كُنَّا نَرَى أَوْ نَظُنُّ أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِيهِ وَفِي أَشْبَاهِهِ: ﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الأحزاب[1].

---

(١) بڕوانە: ٤٥٤٨، ٤٧٨٣.

٢٨٠٥- حومەیدی تەویل لە ئەنەسەوە[١] ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەنەسی کوڕی نەزری مامم لەجەنگی بەدردا ئامادە نەبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! لەیەکەم جەنگدا کە جەنگت کرد لەدژی بتپەرستان من ئامادە نەبووم، دڵنیابە ئەگەر خوا بڕیاری وا بوو بۆ جارێکی تر بەشداری جەنگی بتپەرستان بووم، مەگەر خوا بزانێ چی دەکەم[٢]، جا کاتێك جەنگی ئوحود ڕوویداو مسوڵمانان شکان، ئەنەس وتی: خوایە من داوای چاوپۆشیت لێ دەکەم لەوەی ئا ئەمانە کردیان -مەبەستی هاوەڵان بوو-[٣]، وە بەریشم لەوەی ئا ئەوانە کردیان -مەبەستی بتپەرستەکان بوو-، پاشان ڕۆیشتە پێشەوە، جا سەعدی کوڕی موعاز بەرەو ڕووی ئەنەس هات[٤]، ئەنەس وتی: ئەی سەعدی کوڕی موعاز! بەهەشتم دەوێ، سوێند بە پەروەردگاری نەزر[٥] بۆنی بەهەشت دێت بەسەرمدا لای ئوحودەوە، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی ئەو (ئەنەسی کوڕی نەزر) کردی، من نەمدەتوانی بیکەم، ئەنەسی کوڕی مالیك وتی: (دوای شەهیدبوونی) بینیمان هەشتا و ئەوەندە شوێنی لێدانی شمشێر و شوێنی نێزە و جێگەتیری پێوە بوو، کە دۆزیمانەوە کوژرابوو، بتپەرستان لاشەکەیان شێواندبوو، بۆیە کەس نەیناسییەوە، خوشکێکی نەبێ بەسەرپەنجەکانیدا ناسییەوە، ئەنەس دەڵێ: ئێمە پێمان وابوو یان گومانمان دەبرد ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو و هاوشێوەکانی دابەزیوە: (لەناو باوەڕداراندا پیاوانێك هەن ڕاستیان کرد لەو پەیمانەی کە دابوویان بەخوا، ئینجا هەندێکیان نەزر و بەڵێنی

---

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاری بەدوو ڕێگا و سەنەد هێناویەتی.

(٢) بەم جۆرەش ڕاستە مانا بکرێت : خوا دەمبینێ چی دەکەم، هەردوو ماناکە دەگونجێت.

(٣) مەبەستی ئەوەیە کە هەندێک لەهاوەڵان لەفەرمانی پێغەمبەر ﷺ دەرچوون، هەر ئەمەش وایکرد جەنگەکە بدۆڕێنن.

(٤) سەعد لە جەنگەکەدا شکابوو و بۆ دواوە دەگەڕایەوە.

(٥) نەزری باوکی یان نەزری کوڕی خۆی.

**خۆی بەجێ هێنا (شەهید بوو)، هەندێکیشیان چاوەڕوانن، هیچ گۆڕانێکیان (لە بەڵێنی خۆیاندا) نەکردووە)** الأحزاب.

٢٨٠٦ - وَقَالَ: إِنَّ أُخْتَهُ -وَهْيَ تُسَمَّى الرُّبَيِّعَ- كَسَرَتْ ثَنِيَّةَ امْرَأَةٍ فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْقِصَاصِ، فَقَالَ أَنَسٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لاَ تُكْسَرُ ثَنِيَّتُهَا. فَرَضُوا بِالأَرْشِ وَتَرَكُوا الْقِصَاصَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ"[1].

**٢٨٠٦- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: خوشکی ئەو (ئەنەسی کوڕی نەزر) - کە ناوی ڕوبەییع بوو- ددانی پێشەوەی ئافرەتێکی شکاند، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد بەتۆڵەسەندنەوە (لێی)، جا ئەنەس(ی کوڕی نەزر) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! سوێند بەو خوایەی تۆی بەهەق ناردووە ددانی (لە تۆڵەدا) ناشکێندرێتەوە، ئینجا ڕازی بوون[2] بەخوێنی ددانە شکاوەکەو وازیان لەتۆڵەسەندنەوە هێنا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان لەناو بەندەکانی خوادا کەسی وا هەیە، ئەگەر سوێند بخوات بە خوا (شتێك ببێت یان نەبێت)، خوا سوێندەکەی ناخات[3])).**

٢٨٠٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَخِي، عَنْ سُلَيْمَانَ، أُرَاهُ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي عَتِيقٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدٍ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: نَسَخْتُ الصُّحُفَ فِي الْمَصَاحِفِ، فَفَقَدْتُ آيَةً مِنْ سُورَةِ الأَحْزَابِ، كُنْتُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقْرَأُ بِهَا، فَلَمْ أَجِدْهَا إِلاَّ مَعَ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيِّ الَّذِي

---

(١) بڕوانە: ٢٧٠٣.

(٢) واتە: کەس و کاری ئافرەتە ددان شکێندراوەکە ڕازی بوون خوێنی ددانە شکاوەکە وەرگرن و تۆڵە لە خوشکەکەی ئەنەس نەکەنەوە.

(٣) لەبەر ئەوەی ئەو کەسە متمانەی بەخوا هەیە کە ئەو کارەی بۆ دەکات.

جَعَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ شَهَادَتَهُ شَهَادَةَ رَجُلَيْنِ، وَهْوَ قَوْلُهُ: ﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ (٢٣) ﴾ الأحزاب[1].

**٢٨٠٧- خاریجەی کوڕی زەید دەگێڕێتەوە کە زەیدی کوڕی سابیت ﷺ وتی: (لە نووسینەوەی) قورئانەکاندا چەند دانەیەکم نووسیەوە، وە لە سووڕەتی (الأَحْزَاب) ئایەتێکم لێ وون بوو، کە پێشتر لە پێغەمبەری خوام ﷺ دەبیست دەیخوێندوە، جا لای کەس نەمدۆزییەوە لای خوزەیمەی کوڕی سابیتی ئەنصاری نەبێت، کە پێغەمبەری خوا ﷺ شایەتیدانی ئەوی بە شایەتی دوو پیاو دادەنا، وە ئەوەش ئەم ئایەتە بوو: (لە ناو باوەڕداراندا پیاوانێك هەن ڕاستیان کرد لەو پەیمانەی کە دابوویان بەخوا).**

## ١٣ – بابٌ: عَمَلٌ صَالِحٌ قَبْلَ الْقِتَالِ

وَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: إِنَّمَا تُقَاتِلُونَ بِأَعْمَالِكُمْ. وَقَوْلُهُ تعالى: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ (٢) كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ (٣) إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَـٰنٌ مَّرْصُوصٌ (٤) ﴾ الصف.

## ١٣- باسێک: کردەوەی چاک لەپێش جەنگدا

**ئەبو دەردا ﷺ دەڵێ: بێگومان ئێوە بە (پشتیوانی) کردەوە چاکەکانتان دەجەنگن. وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە! بۆچی ئەوەی دەیڵێن ئەنجامی نادەن؟ (٢) زۆر مایەی ڕق و**

(١) بڕوانە: ٤٠٤٩، ٤٦٧٩، ٤٧٨٤، ٤٩٨٦، ٤٩٨٨، ٤٩٨٩، ٧١٩١، ٧٤٢٥.

**تورەییە لای خوا کە قسەیەك بڵێن کردەوەی پێ نەکەن ﴿٣﴾ بەڕاستی خوا کەسانێکی خۆش دەوێ کە بەیەك ڕیز دەجەنگن لەڕێی خوادا، هەر دەڵێی کۆشکێکی قایمی چەسپیون﴿٤﴾)** الصف.

٢٨٠٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، حَدَّثَنَا شَبَابَةُ بْنُ سَوَّارٍ الفَزَارِيُّ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ البَرَاءَ ﷺ يَقُولُ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ مُقَنَّعٌ بِالْحَدِيدِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ أُقَاتِلُ وَأُسْلِمُ؟ قَالَ: "أَسْلِمْ ثُمَّ قَاتِلْ". فَأَسْلَمَ ثُمَّ قَاتَلَ، فَقُتِلَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "عَمِلَ قَلِيلاً وَأُجِرَ كَثِيراً".

**٢٨٠٨- بەڕا ﷺ دەڵێ: پیاوێك کە بە زرێ ڕووخساری داپۆشیبوو هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! بجەنگم یان مسوڵمان ببم؟ فەرمووی: ((مسوڵمان بە، پاشان بجەنگە))، ئەویش مسوڵمان بوو، پاشان دەستی بەجەنگ کرد و کوژرا، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کردەوەی کەمی کردو پاداشتی زۆری درایەوە)).**

## ١٤- بابُ مَنْ أتاهُ سَهْمٌ غَرْبٌ فقتَلَهُ

٢٨٠٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ أَبُو أَحْمَدَ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ قَتَادَةَ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، أَنَّ أُمَّ الرُّبَيِّعِ بِنْتَ البَرَاءِ -وَهْيَ أُمُّ حَارِثَةَ بْنِ سُرَاقَةَ- أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللهِ، أَلاَ تُحَدِّثُنِي عَنْ حَارِثَةَ -وَكَانَ قُتِلَ يَوْمَ بَدْرٍ أَصَابَهُ سَهْمٌ غَرْبٌ، فَإِنْ كَانَ فِي الجَنَّةِ صَبَرْتُ، وَإِنْ كَانَ غَيْرَ ذَلِكَ اجْتَهَدْتُ عَلَيْهِ فِي الْبُكَاءِ؟ قَالَ: "يَا أُمَّ حَارِثَةَ، إِنَّهَا جِنَانٌ فِي الجَنَّةِ، وَإِنَّ ابْنَكِ أَصَابَ الْفِرْدَوْسَ الأَعْلَى"[1].

---

(١) بڕوانە: ٣٩٨٢، ٦٥٥٠، ٦٥٦٧.

## ١٤- باسی کەسێک تیرێکی وێڵی بۆ هاتبێت و کوشتبێتی

٢٨٠٩- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئوممو ڕوبەییعی کچی بەڕا[1] - کە دایکی حاریسەی کوڕی سوراقەیە - هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا باسی حاریسەم بۆ ناکەیت؟ -کە لەجەنگی بەدردا تیرێکی وێڵ لێی داو شەهید بوو-، جا ئەگەر لەبەهەشتدایە ئارام دەگرم. خۆ ئەگەر وانەبێت ئەوەندەی بتوانم بۆی دەگریم[2]، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی دایکی حاریسە! بێگومان لەبەهەشتدا چەندین پلە هەیە، وە دڵنیابە کوڕەکەت فیردەوسی هەرەبەرزی بەرکەوتووە)).

## ١٥- بابُ مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللهِ هِيَ العُلْيَا

٢٨١٠- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: الرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِلْمَغْنَمِ، وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِلذِّكْرِ، وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ، فَمَنْ فِي سَبِيلِ اللهِ؟ قَالَ: "مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ"[3].

## ١٥- باسی گەورەیی ئەو کەسەی جەنگابێت تا وشەی خوا بەرزتر بێت

٢٨١٠- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: پیاو هەیە بۆ دەستکەوت دەجەنگێت، پیاو هەیە بۆ ئەوەی باسی بکرێت دەجەنگێت،

(١) ئیبنو حەجەر دەڵێ: هەڵەیە روبەییعی کچی نەضرە کە دەبێتە پوری ئەنەسی کوڕی مالیک.(بڕوانە: فتح الباري:٣٢/٧).

(٢) یان خۆم ماندوو دەکەم لە گریان بۆی.

(٣) بڕوانە: ١٢٣.

وە پیاو هەیە بۆ ئەوەی شوێنی دیار بێ (و بڵێن ئازایە) دەجەنگێت، جا كام لەمانە لەپێناوی خوادایە؟ فەرمووی: ((ئەو كەسەی جەنگابێت تا وشەی خوا بەرزتر بێت (بەسەر هەموو وشەیەكی تردا)، هەر ئەوە لەپێناوی خوادایە)).

## ١٦- بابُ مَنِ اغْبَرَّتْ قَدَمَاهُ فِي سَبِيلِ اللهِ

وَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَٰلِحٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ ﴾ التوبة.

## ١٦- باسی گەورەیی ئەو كەسەی پێیەكانی لە جەنگ لەپێناوی خوادا تۆزاوی بووبن

هەروەها باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (نەدەبوو خەڵكی مەدینە و دەشتەكییەكانی دەوروبەری لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێ بمێنن و دوابكەون، وە گیانی خۆیان لە گیانی پێغەمبەر ﷺ خۆشتر بوێ، ئەوە لەبەر ئەوەیە كە بێگومان هیچ تینوویەتی و ماندووبوون و برسێتییەكیان لەڕێی خوادا تووش نابێ، هەروەها پێ ناخەنە هیچ شوێنێك (لە خاكی كافران) كە ڕقی كافرانی پێ هەڵسێ و تووڕەیان بكات، وە هیچ زیانێك لەدوژمن نادەن، ئیللا بەم كردەوانە كردەوەیەكی چاكیان بۆ دەنووسرێت، بێگومان خوای گەورە پاداشتی چاكەكاران ون ناكات).

٢٨١١- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُبَارَكِ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَمْزَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، أَخْبَرَنَا عَبَايَةُ بْنُ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو عَبْسٍ هُوَ -عَبْدُ

الرَّحْمَنِ بْنُ جَبْرٍ- أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "مَا اغْبَرَّتْ قَدَمَا عَبْدٍ فِي سَبِيلِ اللهِ فَتَمَسَّهُ النَّارُ"(١).

**٢٨١١- ئەبو عەبس -كە عەبدوڕەحمانی کوڕی جەبرە- ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هیچ کەسێك نییە پێیەکانی لەجەنگ لەڕێی خوادا تۆزاوی ببێت و دۆزەخی بەر بکەوێت)).**

## ١٧- بابُ مَسْحِ الغُبَارِ عَنِ الرَّأْسِ فِي السَّبِيلِ

٢٨١٢- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ قَالَ لَهُ وَلِعَلِيِّ بْنِ عَبْدِ اللهِ: ائْتِيَا أَبَا سَعِيدٍ فَاسْمَعَا مِنْ حَدِيثِهِ. فَأَتَيْنَاهُ وَهُوَ وَأَخُوهُ فِي حَائِطٍ لَهُمَا يَسْقِيَانِهِ، فَلَمَّا رَآنَا جَاءَ فَاحْتَبَى وَجَلَسَ فَقَالَ: كُنَّا نَنْقُلُ لَبِنَ المَسْجِدِ لَبِنَةً لَبِنَةً، وَكَانَ عَمَّارٌ يَنْقُلُ لَبِنَتَيْنِ لَبِنَتَيْنِ، فَمَرَّ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ وَمَسَحَ عَنْ رَأْسِهِ الْغُبَارَ وَقَالَ: "وَيْحَ عَمَّارٍ، تَقْتُلُهُ الفِئَةُ البَاغِيَةُ، عَمَّارٌ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللهِ وَيَدْعُونَهُ إِلَى النَّارِ"(٢).

## ١٧- باسی سڕین و لابردنی تەپوتۆزی ڕێی خوا بەسەرەوە (ناپەسەند نییە)

**٢٨١٢- عیکریمە دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﷺ بە ئەو و عەلی کوڕی عەبدوڵڵای وت: بڕۆ بۆ لای ئەبو سەعید و هەردووکتان گوێ لەفەرموودەکانی بگرن، ئێمەش ڕۆیشتین بۆ لای خۆی و برایەکی لە باخێکی خۆیاندا بوون، ئاویان دەدێرا، ئینجا کە ئەبو سەعید ئێمەی بینی، هات بۆ لامان دانیشت و ئەژنۆکانی هەڵدا، دەستی دایە بەر ئەژنۆی و دانیشت، وتی: ئێمە یەك یەك خشتی مزگەوتمان**

(١) بڕوانە: ٩٠٧.

(٢) بڕوانە: ٤٤٧.

دەگواستەوە (هەڵمان دەگرت)، بەڵام عەممارِ دوو دوو خشتی دەگواستەوە، پێغەمبەریش ﷺ بەلای عەممارِدا ڕۆیشت، تەپوتۆزی سەری سڕی و لایبرد و فەرمووی: ((هاوار بۆ عەممارِ دەستە ستەمکارەکە دەیکوژن، عەممارِ ئەوان بانگ دەکات بۆ لای خوا، ئەوان عەممارِ بانگ دەکەن بۆ ئاگری دۆزەخ)).

## ١٨- بَابُ الغَسْلِ بَعْدَ الحَرْبِ وَالْغُبَارِ

٢٨١٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَمَّا رَجَعَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَوَضَعَ السِّلاَحَ وَاغْتَسَلَ، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ وَقَدْ عَصَبَ رَأْسَهُ الغُبَارُ فَقَالَ: وَضَعْتَ السِّلاَحَ، فَوَاللهِ مَا وَضَعْتُهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "فَأَيْنَ". قَالَ هَا هُنَا. وَأَوْمَأَ إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ. قَالَتْ: فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ[١].

## ١٨- باسی خۆشۆردن دوای جەنگ و تەپوتۆزاوی بوون (دروستە)

٢٨١٣- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك لەغەزای خەندەق گەڕایەوە، چەکەکەی دانا و خۆی شۆرد، جا جیبریل ﵇ هاتە خزمەتی کە تەپوتۆز (وەك سەرپێچ) لەسەری نیشتبوو، وتی: چەکەکەت دانا؟ سا بە خوا من چەکەکەم دانەناوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دەی بۆ کوێ بڕۆم))، جیبریل ﵇ فەرمووی: ئا ئەوێ و ئاماژەی کرد بۆ بەنی قوڕەیزە، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ سەریان.

(١) بڕوانە: ٤٦٣.

١٩- بابُ فَضْلِ قَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ ۞ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٧١﴾ ﴾ آل عمران.

## ١٩- باسی فەزڵ و گەورەیی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (هەرگیز وا گومان مەبەن ئەوانەی لەڕێی خوادا کوژران مردوون، (نەخێر وانییە) بەڵکو ئەوانە زیندوون لای پەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن شادمان و دڵخۆشن بەوەی خوا پێی بەخشیون لەبەهرەو فەزڵی خۆی، شادمانن بەوانەی (برا تێکۆشەرەکانیان) کە هێشتا نەگەیشتوون پێیان لە دوای (شەهیدبوونی)، ئەمان نە هیچ ترسێکیان لەسەرە و نە ئەوانە هیچ غەم و خەفەتێک دەخۆن شادمان و دڵخۆشن بەو بەهرەو زیادە فەزڵەی لەلایەن خواوە (پێیان دراوە)، وە بەڕاستی خوا پاداشتی بڕواداران ون ناکات) آل عمران.

٢٨١٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: دَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى الَّذِينَ قَتَلُوا أَصْحَابَ بِئْرِ مَعُونَةَ ثَلَاثِينَ غَدَاةً، عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ وَعُصَيَّةَ عَصَتِ اللهَ وَرَسُولَهُ، قَالَ أَنَسٌ: أُنْزِلَ فِي الَّذِينَ قُتِلُوا بِبِئْرِ مَعُونَةَ قُرْآنٌ قَرَأْنَاهُ ثُمَّ نُسِخَ بَعْدُ: بَلِّغُوا قَوْمَنَا أَنْ قَدْ لَقِينَا رَبَّنَا فَرَضِيَ عَنَّا وَرَضِينَا عَنْهُ.

**٢٨١٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سی نوێژی بەیانیدا دوعای دەکرد لەو (کافر)انەی کە هاوەڵانیان لە بیری مەعونەدا شەهید**

**کرد، کە بریتی بوون لە: ریعل و زەکوان و عوصەییە، کە سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەیان کرد، ئەنەس دەڵێ: دەربارەی ئەوانەی لەبیری مەعونە کوژران (شەهید بوون) قورئان دابەزێنراو دەمان خوێندەوە، پاشان دواتر سڕایەوە (کە ئەمەبوو:) بە قەومەکەمان ڕابگەیەنن کە بێگومان ئێمە بەخزمەت پەروەردگارمان گەیشتین و لێمان ڕازی بوو، ئێمەش لەو ڕازی بووین.**

٢٨١٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ يَقُولُ: اصْطَبَحَ نَاسٌ الخَمْرَ يَوْمَ أُحُدٍ، ثُمَّ قُتِلُوا شُهَدَاءَ. فَقِيلَ لِسُفْيَانَ مِنْ آخِرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ؟ قَالَ لَيْسَ هَذَا فِيهِ[١].

**٢٨١٥- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: کەسانێك سەر لەبەیانی ئەو ڕۆژەی غەزای بەدر ڕوویدا عارەقیان خواردەوە، پاشان کوژران و شەهید بوون، جا بەسوفیانیان[٢] وت: لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا (کوژران)؟ سوفیان وتی: فەرموودەکە ئەوەی تێدا نییە.**

## ٢٠- بابُ ظِلِّ الْمَلَائِكَةِ عَلَى الشَّهِيدِ

٢٨١٦- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الفَضْلِ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ قَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ الْمُنْكَدِرِ أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرًا يَقُولُ: جِيءَ بِأَبِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَقَدْ مُثِّلَ بِهِ وَوُضِعَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَذَهَبْتُ أَكْشِفُ عَنْ وَجْهِهِ، فَنَهَانِي قَوْمِي، فَسَمِعَ صَوْتَ صَائِحَةٍ فَقِيلَ: ابْنَةُ عَمْرٍو، أَوْ أُخْتُ عَمْرٍو. فَقَالَ: "لِمَ تَبْكِي -أَوْ: لاَ تَبْكِي- مَا زَالَتِ المَلاَئِكَةُ تُظِلُّهُ بِأَجْنِحَتِهَا". قُلْتُ لِصَدَقَةَ: أَفِيهِ "حَتَّى رُفِعَ؟ " قَالَ: رُبَّمَا قَالَهُ[٣].

---

(١) بڕوانە: ٤٠٤٤، ٤٦١٨.

(٢) کە یەکێکە لەوانەی ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

(٣) بڕوانە: ١٢٤٤.

## ٢٠- باسی سێبەرکردنی فریشتەکان لەسەر (لاشەی) شەهید

٢٨١٦- جابیر ﷺ دەڵێ: تەرمی باوکم هێنرایە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ کە شێوێنرابوو، وە لەبەردەمیدا دانرا، منیش ڕۆیشتم ئەو قوماشەی بەسەر ڕووخساریەوەیە لایبدەم، بەڵام خزمەکانم نەیانهێشت، جا (پێغەمبەر ﷺ) گوێی لە شین و شەپۆڕی ئافرەتێك بوو، وترا: کچی عەمرە یان خوشکی عەمرە، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بۆچی دەگریت -یان مەگری-، بەردەوام فریشتەکان بەباڵەکانیان سێبەری بۆ دەکەن)). (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) بەصەدەقەم وت: ئایا لەم فەرموودەیەدا ئەمەشی تیایە: ((هەتا تەرمەکەی هەڵگیرا؟ [١])) صەدەقە وتی: لەوانەیە (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووبێتی.

## ٢١- بَابُ تَمَنِّي الْمُجَاهِدِ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا

٢٨١٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: سَمِعْتُ قَتَادَةَ قَالَ سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مَا أَحَدٌ يدخلُ الجَنَّةَ يُحِبُّ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا وَلَهُ مَا عَلَى الأَرْضِ مِنْ شَيءٍ، إِلاَّ الشَّهِيدُ، يَتَمَنَّى أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا فَيُقْتَلَ عَشْرَ مَرَّاتٍ؛ لِمَا يَرَى مِنَ الكَرَامَةِ"[٢].

## ٢١- باسی ئاوات خواستنی جەنگاوەر (ی شەهید بوو) کە جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ دونیا (شەهید بێتەوە)

٢٨١٧- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((کەس نییە بڕواتە بەهەشتەوە و حەزبکات بگەڕێتەوە بۆ دونیا، وە هەرچی لەدونیادایە هی

(١) لەلایەن هاوەڵانەوە بردیان ناشتیان.

(٢) بڕوانە: ٢٧٩٥.

ئەو بێت، جگە لە شەهید کە ئاوات دەخوازێت بگەڕێتەوە بۆ دونیاو دە جاری تر بکوژرێت (شەهید بێت)، لەبەر ئەو ڕێزو پلەیەی دەیبینێ کە شەهید هەیەتی)).

## ٢٢ - بابٌ: الجَنَّةُ تَحْتَ بَارِقَةِ السُّيُوفِ

وَقَالَ المُغِيرَةُ: بْنُ شُعْبَةَ أَخْبَرَنَا نَبِيُّنَا ﷺ عَنْ رِسَالَةِ رَبِّنَا: "مَنْ قُتِلَ مِنَّا صَارَ إِلَى الجَنَّةِ". وَقَالَ عُمَرُ ﷺ لِلنَّبِيِّ ﷺ أَلَيْسَ قَتْلاَنَا فِي الجَنَّةِ وَقَتْلاَهُمْ فِي النَّارِ؟ قَالَ: "بَلَى".

## ٢٢- باسێک: بەهەشت لەژێر شەوقدانەوەی شمشێرەکاندایە

موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرەکەمان ﷺ لە ڕێگەی پەیامەکەی پەروەردگارمانەوە هەواڵی پێداوین: ((هەرکەس لە ئێمە (لە پێناو خوادا) بکوژرێت، دەچێتە بەهەشتەوە)). وە عومەر ﷺ بەپێغەمبەری ﷺ وت: ئایا کوژراوەکانی ئێمە لەبەهەشتدا نین، وە کوژراوەکانی ئەوان (کافران) لە دۆزەخدا نین؟ فەرمووی: ((بەڵێ وایە)).

٢٨١٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمٍ أَبِي النَّضْرِ -مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، وَكَانَ كَاتِبَهُ- قَالَ: كَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "وَاعْلَمُوا أَنَّ الجَنَّةَ تَحْتَ ظِلاَلِ السُّيُوفِ". تَابَعَهُ الأُوَيْسِيُّ عَنِ ابْنِ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ[1].

٢٨١٨- مووسای کوڕی عوقبە دەگێڕێتەوە لە سالیمی ناسراو بە ئەبو نەزر- ئازادکراوی عومەری کوڕی عوبەیدوڵڵا کە سالیم نووسەری ئەو بوو- دەڵێ:

---

(١) بڕوانە: ٢٨٣٣، ٢٩٣٣، ٢٩٦٥، ٢٩٦٦، ٣٠٢٥، ٣٠٢٥، ٤١١٥، ٦٣٩٢، ٧٢٣٧، ٧٤٨٩.

عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ بۆی نووسی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((وە چاك بزانن کە بێگومان بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکاندایە)). ئوەیسی لە ئیبنو ئەبو زینادەوە لە مووسای کوڕی عوقبەوە ئەو فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی فەرموودەکەی پێشوو دەکات، کە موعاویەی کوڕی عەمرٍ گێڕاویەتیەوە.

## ٢٣- بابُ مَنْ طَلَبَ الْوَلَدَ لِلْجِهَادِ

٢٨١٩- وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي جَعْفَرُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ هُرْمُزَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: "قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ - عَلَيْهِمَا السَّلَامُ - لَأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى مِائَةِ امْرَأَةٍ -أَوْ تِسْعٍ وَتِسْعِينَ- كُلُّهُنَّ يَأْتِي بِفَارِسٍ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَقَالَ لَهُ صَاحِبُهُ: إِنْ شَاءَ اللهُ. فَلَمْ يَقُلْ: إِنْ شَاءَ اللهُ، فَلَمْ يَحْمِلْ مِنْهُنَّ إِلاَّ امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ، جَاءَتْ بِشِقِّ رَجُلٍ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْ قَالَ: إِنْ شَاءَ اللهُ، لَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللهِ فُرْسَانًا أَجْمَعُونَ"[1].

## ٢٣- باسی ئەو کەسەی داوا (لەخوا) کردبێت منداڵی ببێ بۆ ئەوەی جیهاد بکات لەڕێی خوادا

٢٨١٩- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((سولەیمانی کوڕی داوود (سەلامی خوایان لێ بێ) فەرمووی: سوێند بێ ئەمشەو بگەڕێم بەسەر سەد -یان نەوەدو نۆ - ئافرەتدا (سەرجێییان لەگەڵ بکەم، کە هەموویان حەڵاڵی خۆی بوون)، هەر هەموویان یەکی ئەسپ سوارێکیان ببێت لەڕێی خوادا جیهاد بکات، جا فریشتەکەی هاوڕێی پێی وت: بڵێ: ئەگەر خوا

(١) بروانە: ٣٤٢٤، ٥٣٤٢، ٦٦٣٩، ٦٧٢٠، ٧٤٦٩.

ویستی، بەڵام ئەو نەیوت ئەگەر خوا ویستی، بۆیە هیچ ئافرەتێکیان سکی پڕ نەبوو جگە لەدانەیەکیان، ئەویش نیوە کوڕێکی بوو، جا سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئەگەر بیوتایە ئەگەر خوا ویستی، هەموویان (دەبوون و) وەك سوارچاك لەڕێی خوادا جیهادیان دەکرد)).

## ٢٤- بابُ الشَّجَاعَةِ فِي الحَرْبِ وَالْجُبْنِ

٢٨٢٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدِ المَلِكِ بْنِ وَاقِدٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَحْسَنَ النَّاسِ، وَأَشْجَعَ النَّاسِ، وَأَجْوَدَ النَّاسِ، وَلَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ سَبَقَهُمْ عَلَى فَرَسٍ، وَقَالَ: "وَجَدْنَاهُ بَحْرًا"[1].

## ٢٤- باسی ئازایەتی و ترسنۆکی لە جەنگدا

**٢٨٢٠- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چاکترین کەس بوو، ئازاترین کەس بوو، بەخشندەترین کەس بوو، بێگومان خەڵکی مەدینە ڕۆژێکیان ترسێکیان بۆ دروست بوو، جا پێغەمبەر ﷺ بەسوار ئەسپێکەوە پێش هەموویان کەوت[2]، (کە گەڕایەوە) فەرمووی: ((ئەم ئەسپە زۆر خێراو بەهەڵمەتە)).**

٢٨٢١- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُمَرُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ جُبَيْرٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي جُبَيْرُ بْنُ مُطْعِمٍ، أَنَّهُ بَيْنَمَا هُوَ يَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَمَعَهُ النَّاسُ، مَقْفَلَهُ مِنْ حُنَيْنٍ، فَعَلِقَهُ النَّاسُ يَسْأَلُونَهُ حَتَّى اضْطَرُّوهُ إِلَى

---

(١) بڕوانە: ٢٦٢٧.

(٢) لە ڕۆیشتن بۆ جێگای مەترسییەکە و هەواڵ زانینی لە دەوروبەری مەدینە.

سَمُرَةٍ، فَخَطِفَتْ رِدَاءَهُ، فَوَقَفَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: " أَعْطُونِي رِدَائِي، لَوْ كَانَ لِي عَدَدُ هَذِهِ العِضَاهِ نَعَمًا لَقَسَمْتُهُ بَيْنَكُمْ، ثُمَّ لاَ تَجِدُونِي بَخِيلاً وَلاَ كَذُوبًا وَلاَ جَبَانًا"[1].

**٢٨٢١- موحەممەدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ هەواڵی پێدام لەکاتێکدا ئەو لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دەڕۆیشت، هاوەڵانیشی لەگەڵدا بوو، لەحونەین[2] دەگەڕایەوە، خەڵکی بەرۆکیان گرت و داوایان لێ دەکرد تا پێچایانە پاڵ درەختێکی سەمورە[3]، ئینجا عاباکەی (لێی ئاڵسکاو) ڕاکێشا[4]، پێغەمبەریش ﷺ وەستاو فەرمووی: ((عاباکەم بدەنەوە، ئەگەر بەئەندازەی ژمارەی ئەو درەختانە ئاژەڵم هەبوایە دابەشم دەکرد لە نێوانتاندا، پاشان منتان نەدەدی نەبەرژدەیی و چروکی، نە بە درۆزنی و نە بەترسنۆکی)).**

## ٢٥- بابُ مَا يُتَعَوَّذُ مِنَ الجُبْنِ

**٢٨٢٢-** حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ المَلِكِ بْنُ عُمَيْرٍ، سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ مَيْمُونٍ الأَوْدِيَّ قَالَ: كَانَ سَعْدٌ يُعَلِّمُ بَنِيهِ هَؤُلاَءِ الكَلِمَاتِ كَمَا يُعَلِّمُ المُعَلِّمُ الغِلْمَانَ الكِتَابَةَ، وَيَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ مِنْهُنَّ دُبُرَ الصَّلاَةِ: "اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ العُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ". فَحَدَّثْتُ بِهِ مُصْعَبًا فَصَدَّقَهُ[5].

---

(١) بڕوانە: ٣١٤٨.

(٢) حونەین شیوێکە لە نێوان مەککە و تائیفدایە.

(٣) درەختێکی دڕکاوییە لە بیاباندا دەڕوێ.

(٤) یان دەشتەکییەکان عاباکەیان برد. بڕوانە: إرشاد الساری: ٣١٦/٦.

(٥) بڕوانە: ٦٣٦٥، ٦٣٧٠، ٦٣٧٤، ٦٣٩٠.

## ٢٥- باسی ئەوەی پەنای پێدەگیرێ لە ترسنۆکی

٢٨٢٢- عەمرِی کوڕی مەیموونی ئەودیی دەڵێ: سەعد منداڵەکانی فێری ئەم چەند وشەیە دەکرد، وەك چۆن مامۆستا نەوجەوان فێری نووسین و خوێندن دەکات، وە دەیوت: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت بە خوا لێیان لەپاش نوێژە فەرزەکان: ((خوایە! من پەنات پێ دەگرم لەترسنۆکی، وە پەنات پێ دەگرم کە بکەومە تەمەنی پەککەوتەیی، وە پەنات پێ دەگرم لەئاشووبی دونیا، وە پەنات پێ دەگرم لەسزای ناوگۆڕ))، (عەبدولمەلیکی کوڕی عومەیر دەڵێ:) ئینجا ئەم فەرموودەیەم بۆ موصعەب[1] گێڕایەوە و ئەویش پشت ڕاستی کردەوە.

٢٨٢٣ - حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ - ﵁ - قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: "اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ العَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْجُبْنِ وَالْهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ المَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ"[2].

٢٨٢٣- ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە دەیفەرموو: ((خوایە! پەنات پێ دەگرم لە تەمەڵی و سستی و ترسنۆکی و پیری، وە پەنات پێ دەگرم لە ئاشووب و تاقیکردنەوەی ژیان و مردن، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای (ناو) گۆڕ)).

## ٢٦- بابُ مَنْ حَدَّثَ بِمَشَاهِدِهِ فِي الحَرْبِ

قَالَهُ أَبُو عُثْمَانَ، عَنْ سَعْدٍ.

٢٨٢٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا حَاتِمٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يُوسُفَ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: صَحِبْتُ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللهِ وَسَعْدًا وَالْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ

---

(١) کە کوڕی سەعدە کە فەرموودەکەی لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە.

(٢) بڕوانە: ٤٧٠٧، ٦٣٦٧، ٦٣٧١.

عَوْفٍ ﵃ فَمَا سَمِعْتُ أَحَدًا مِنْهُمْ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، إِلاَّ أَنِّي سَمِعْتُ طَلْحَةَ يُحَدِّثُ عَنْ يَوْمِ أُحُدٍ(١).

## ٢٦- باسی کەسێک باسی بەشدارییەکانی خۆی بکات لە جەنگەکاندا

**ئەبو عوسمان لە سەعدەوە فەرموودەیەکی لەو جۆرە دەگێڕێتەوە(٢).**

**٢٨٢٤- سائیبی کوڕی یەزید دەڵێ: هاوڕێیەتی هەریەك لە تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا و سەعد و میقدادی کوڕی ئەسوەد و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفم ﵃ کردووە، لە هیچیانم نەبیستووە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بگێڕێتەوە، تەنها ئەوە نەبێت لە تەلحەم بیست باسی ڕۆژی (غەزای) ئوحودی دەکرد.**

## ٢٧- بابُ وُجُوبِ النَّفِيرِ وَمَا يَجِبُ مِنَ الجِهَادِ وَالنِّيَّةِ

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَـٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّٱتَّبَعُوكَ وَلَـٰكِنۢ بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ ٱلشُّقَّةُ ۚ وَسَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ ﴿٤٢﴾﴾ التوبة، وَقَوْلِهِ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴿٣٨﴾﴾ التوبة، إِلى قَوْلِهِ: ﴿عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾ التوبة. يُذْكَرُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿فَٱنفِرُوا۟ ثُبَاتٍ ﴿٧١﴾﴾ النساء: سَرَايَا مُتَفَرِّقِينَ، يُقَالُ: أَحَدُ الثُّبَاتِ: ثُبَةٌ.

---

(١) بڕوانە: ٤٠٦٢.

(٢) سەیری فەرموودەکانی (٣٧٢٢، ٣٧٢٣، ٤٣٢٦، ٤٣٢٧) بکە.

٢٨٢٥- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْصُورٌ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ يَوْمَ الْفَتْحِ: "لاَ هِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتْحِ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا"(١).

## ٢٧- باسی پێویستبوونی دەرچوون بۆ جیهاد، وە باسی ئەو ئەندازەی پێویستە لە جیهاد و نییەت بوون لە بارەیەوە

**هەروەها باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بڕۆن و دەرچن (بۆ جیهاد) چ سووك بن (لەش ساغ و دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار بن)، چ قورس وگران بن (نەخۆش و هەژاربن)، تێبکۆشن بەماڵ و گیانتان لەڕێگای خوادا، ئەوەتان چاکترە بۆتان ئەگەر بزانن ئەگەر دەستکەوتێکی نزیك و سەفەرێکی ئاسان بوایە ئەوا شوێنت دەکەوتن (دەردەچوون لەگەڵتان)، بەڵام (بڕینی) ڕێگەی دوور و دژوار(ی جەنگی تەبووك) بۆ ئەوان نارەحەتە، وە بێگومان (پاش گەڕانەوەتان لە تەبووك) سوێند دەخۆن بەخوا ئەگەر بمانتوانیبایە لەگەڵتان دەردەچووین (بۆ جیهاد)، ئەوانە خۆیان دەفەوتێنن، وە خوا دەزانێ بەڕاستی ئەوانە درۆزنن). وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوا: (ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە! ئێوە چیتانە کاتێك پێتان بوترێ دەربچن (بۆ جیهاد) لەڕێی خوادا، لەشوێنی خۆتان ناجوڵێن (خۆتان دوا دەخەن)؟! ئایا ئێوە ڕازین بەم ژیانی دونیا لە جیاتی پاشەڕۆژ؟!) تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە (بە توانایە بەسەر هەموو شتێکدا). وە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتوویەتی: ﴿ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ ﴾ النساء، واتە: دەربچن بۆ جیهاد بە چەند لە شکریەکی پرژ و بلاو، وە دەوترێت: تاکی (الثُّبَاتِ) بریتیە لە: (ثُبَةٌ).**

(١) بڕوانە: ١٣٤٩.

**٢٨٢٥- ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە فەرمووی: ((دوای ئازادکردنی مەککە کۆچکردنی (واجب) نییە، بەڵام جیهاد و نییەتی جیهاد بەردەوامە، وە ئەگەر داوای دەرچوونتان لێ کرا (بۆ جیهاد)، ئەوا دەربچن)).**

## ٢٨- بابُ الكَافِرِ يَقْتُلُ المُسْلِمَ ثُمَّ يُسْلِمُ فَيُسَدِّدُ بَعْدُ وَيُقْتَلُ

٢٨٢٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "يَضْحَكُ الله إِلَى رَجُلَيْنِ يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ يَدْخُلاَنِ الجَنَّةَ، يُقَاتِلُ هَذَا فِي سَبِيلِ اللهِ فَيُقْتَلُ، ثُمَّ يَتُوبُ الله عَلَى الْقَاتِلِ فَيُسْتَشْهَدُ".

## ٢٨- باسی (حوکمی) کافرێک مسوڵمانێک بکوژێت، پاشان مسوڵمان ببێت، دواتر بەڕێک و پێکی لەسەری بڕوات و بکوژرێت (شەهید ببێت)

**٢٨٢٦- ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: ((خوا پێدەکەنێت بەهۆی دوو پیاوەوە، یەکێکیان ئەوی تریان دەکوژێت و هەردووکیان دەڕۆنە بەهەشتەوە، ئەم (مسوڵمانە)یان لەڕێی خوادا دەجەنگێت و دەکوژرێت[1]، پاشان خوا تەوبە لەبکوژەکە گیرا دەکات (و دەجەنگێت) و شەهید دەبێت)).**

٢٨٢٧- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَنْبَسَةُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَهُوَ بِخَيْبَرَ بَعْدَ مَا افْتَتَحُوهَا، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَسْهِمْ لِي. فَقَالَ بَعْضُ بَنِي سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ: لاَ تُسْهِمْ لَهُ يَا رَسُولَ اللهِ. فَقَالَ أَبُو

---

(١) بەدەستی کافرەکەیان دەکوژرێت.

هُرَيْرَةَ: هَذَا قَاتِلُ ابْنِ قَوْقَلٍ. فَقَالَ ابْنُ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ: وَاعَجَبًا لِوَبْرٍ تَدَلَّى عَلَيْنَا مِنْ قَدُومِ ضَأْنٍ، يَنْعَى عَلَيَّ قَتْلَ رَجُلٍ مُسْلِمٍ أَكْرَمَهُ الله عَلَى يَدَيَّ وَلَمْ يُهِنِّي عَلَى يَدَيْهِ. قَالَ: فَلاَ أَدْرِي أَسْهَمَ لَهُ أَمْ لَمْ يُسْهِمْ لَهُ[1].

**٢٨٢٧- عەنبەسەی کوڕی سەعید لە ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك لە خەیبەر بوو، دوای ئەوەی ئازادیان کردبوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (لە دەستکەوتەکان) بەشم بدە، کەسێك[2] لە بەنی سەعیدی کوڕی عاص وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی مەدە، ئەبو هوڕەیرەش وتی: ئەمە (ئەبان) بکوژی ئیبنو[3] قەوقەلە، ئەبانی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصیش وتی: سەرم سووڕ دەمێنێ لەم چالەکەیە[4] لە (قَدُومِ ضَأْنٍ)[5]ـەوە داباریوە بەسەرماندا، تانە لەمن دەدا بەکوشتنی پیاوێکی مسوڵمان، کە خوا ڕێزداری کردوە (بە کوشتنی) بە دەستی من، وە منی بێ ڕێز نەکرد بەکوشتنم بەدەستی ئەو[6]، (عەنبەسە) وتی: جا نازانم پێغەمبەر ﷺ بەشی ئەبو هوڕەیرەی دا یان بەشی نەدا.**

## ٢٩- بابُ مَنِ اخْتَارَ الغَزْوَ عَلَى الصَّوْمِ

**٢٨٢٨-** حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا ثَابِتٌ البُنَانِي قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ أَبُو طَلْحَةَ لاَ يَصُومُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ أَجْلِ الْغَزْوِ، فَلَمَّا قُبِضَ النَّبِيُّ ﷺ لَمْ أَرَهُ مُفْطِرًا إِلاَّ يَوْمَ فِطْرٍ أَوْ أَضْحَى.

---

(١) بڕوانە: ٤٢٣٧، ٤٢٣٨، ٤٢٣٩.

(٢) کە ناوی ئەبانی کوڕی سەعیدە.

(٣) ناوی نوعمانە.

(٤) چالەک: گیاندارێکی قەڵەوی پانکەڵەی چوارپێیە، گۆشتی دەخورێ. فەرهەنگی خاڵ: ١٦٥.

(٥) ناوی شوێنێکە وڵاتی دەوس کە هۆزەکەی ئەبو هوڕەیرەیە.

(٦) ئەگەر بەدەستی ئەو بکوژرابمایە بەکافری دەمردم.

## ٢٩- باسی کەسێک غەزا هەڵبژێرێ لە بەرانبەر ڕۆژووگرتندا

**٢٨٢٨- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئەبو تەڵحە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بەڕۆژوو نەدەبوو لەپێناو بەشداری غەزاکاندا، جا کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، نەمدیوە بەڕۆژوو نەبێت جگە لە جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان.**

## ٣٠- بَابٌ: الشَّهَادَةُ سَبْعٌ سِوَى القَتْلِ

٢٨٢٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ: المَطْعُونُ، وَالْمَبْطُونُ، وَالْغَرِقُ، وَصَاحِبُ الْهَدْمِ، وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللهِ"[1].

## ٣٠- باسێک:(جۆرەکانی) شەهیدبوون حەوتە جگە لە کوژران لەڕێی خوادا

**٢٨٢٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((شەهیدەکان پێنجن[2]: بەتاعوون مردوو، بەسك ئێشە مردن، خنکاو، شت بەسەردا ڕوخاو، شەهید لەڕێی خوادا)).**

٢٨٣٠- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا عَاصِمٌ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "الطَّاعُونُ شَهَادَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ"[3].

**٢٨٣٠- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (( (مردن) بەتاعوون شەهیدیە بۆ هەموو مسوڵمانێك)).**

---

(١) بڕوانە: ٦٥٣.

(٢) ئیمام مالیك لەمۆتەئدا بەم جۆرە گێراویەتیەوە:( الشَّهَادَةُ سَبْعَةٌ سِوَى الْقَتْلِ فِي سَبِيلِ اللهِ) واتە: شەهیدەکان حەوتن جگە لە شەهیدی ڕێگەی خودا.(إرشاد الساري:٦/٣٢٤).

(٣) بڕوانە: ٥٧٣٢.

٣١- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالى: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةًۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَٰتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةًۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾﴾ النساء.

٢٨٣١- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ البَرَاءَ ﷺ يَقُولُ لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٥﴾﴾ النساء. دَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ زَيْدًا، فَجَاءَ بِكَتِفٍ فَكَتَبَهَا، وَشَكَا ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ ضَرَارَتَهُ فَنَزَلَتْ: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴿٩٥﴾﴾ النساء[1].

## ٣١- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (یەكسان نین دانیشتووان (لە جیهادی ڕێی خوادا) لە باوەڕداران، جگە لە خاوەن عوزرەكان لەگەڵ تێكۆشەرانی ڕێگەی خوادا بەماڵ و گیانیان، خوا باوی تێكۆشەران بە ماڵ و گیانیانی داوە بەسەر دانیشتووان (لە جیهاد)ـدا بەپلەیەك، وە هەریەك لەو دوو تاقمە خوا بەڵێنی پاداشتی زۆر چاكی پێ داون (كە بەهەشتە)، وە خوا ڕێزی تێكۆشەرانی داوە بەسەر دانیشتووەكاندا بە پاداشتێكی گەورە لەلای (خوا) وە پلەی زۆر و لێخۆشبوون و میهرەبانیان بۆ هەیە، وە خوا هەمیشە لێبوردەی میهرەبانە).

٢٨٣١- ئەبو ئیسحاق دەڵێ: لە بەڕائم ﷺ بیست دەیوت: كاتێك ئەم ئایەتە: (یەكسان نین دانیشتووان (لە جیهادی ڕێی خوادا) لە باوەڕداران) دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ زەیدی بانگ كرد و (ئێسكێكی) دەفەی شانی هێنا و ئایەتەكەی نووسییەوە، وە ئیبنو ئوممی مەكتوم سكاڵای نابینایی لای پێغەمبەر

(١) بڕوانە: ٤٥٩٣، ٤٥٩٤، ٤٩٩٠.

**ﷺ كرد، بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە: (یەكسان نین دانیشتووان (لە جیهادی ڕێی خوادا) لە باوەڕداران جگە لە خاوەن عوزرەكان (نەخۆش، كوێر، شەل)) دابەزی.**

٢٨٣٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ الزُّهْرِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي صَالِحُ بْنُ كَيْسَانَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ جَالِسًا فِي الْمَسْجِدِ، فَأَقْبَلْتُ حَتَّى جَلَسْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَأَخْبَرَنَا أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمْلَى عَلَيْهِ: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٥﴾﴾ النساء. ﴿وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٩٥﴾﴾ النساء. قَالَ: فَجَاءَهُ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهُوَ يُمِلُّهَا عَلَيَّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ أَسْتَطِيعُ الْجِهَادَ لَجَاهَدْتُ. وَكَانَ رَجُلاً أَعْمَى، فَأَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَلَى رَسُولِهِ ﷺ وَفَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي، فَثَقُلَتْ عَلَيَّ حَتَّى خِفْتُ أَنْ تَرُضَّ فَخِذِي، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ: ﴿غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ ﴿٩٥﴾﴾ النساء[1].

**٢٨٣٢- سەهلی كوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: مەڕوانی كوڕی حەكەمم بینی لە مزگەوت(ی مەدینە) دانیشتبوو، منیش هاتم لە تەنیشتیەوە دانیشتم، جا بۆی گێڕاینەوە كە زەیدی كوڕی سابیت بۆی گێڕاوەتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٥﴾﴾، ﴿وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٩٥﴾﴾[2]. وتی: ئینجا ئیبنو ئوممی مەكتوم هاتە خزمەتی لە كاتێكدا ئایەتەكەی بۆمن دەخوێندەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر توانای جیهادم هەبوایە جیهادم دەكرد، ئەو پیاوێكی نابینا بوو، ئەوسا خوای تاك و بڵند قورئانی بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ دابەزاند، لەوكاتەدا ڕانی**

(١) بروانە: ٤٥٢٩.

(٢) پێشتر مانای ئەم ئایەتەمان كرد.

بەسەر ڕانمەوە بوو، زۆر قورس بوو بەسەر ڕانمەوە، بەجۆرێك هەتا ترسام ڕانم ورد و خاش بێت، پاشان ئەو قورساییە لەسەری نەما، خوا ﷻ ئەم (بەشە) ئایەتەی بۆ دابەزاند: ﴿ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴿٩٥﴾ ﴾ النساء[1]، واتە: جگە لە خاوەن عوزرەکان (وەك نەخۆش و کوێر و شەل).

## ٣٢- بابُ الصَّبْرِ عِنْدَ القِتَالِ

٢٨٣٣- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمٍ أَبِي النَّضْرِ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى كَتَبَ، فَقَرَأْتُهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "إِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا"[2].

## ٣٢- باسی فەزڵی دان بەخۆداگرتن لە جەنگ و جیهاددا

٢٨٣٣- سالیمی ئەبو نەزر دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ نامەیەکی نووسی (بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر)، منیش خوێندمەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر بەکافران گەیشتن (لە جەنگدا) ئەوە ئارام گربن و دان بەخۆتاندا بگرن)).

## ٣٣- بابُ التَّحْرِيضِ عَلَى القِتَالِ وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ﴿٦٥﴾ ﴾ الأنفال.

٢٨٣٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ يَقُولُ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى الخَنْدَقِ فَإِذَا المُهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ يَحْفِرُونَ فِي غَدَاةٍ بَارِدَةٍ، فَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ عَبِيدٌ يَعْمَلُونَ ذَلِكَ لَهُمْ، فَلَمَّا رَأَى مَا بِهِمْ مِنَ النَّصَبِ وَالْجُوعِ قَالَ:

"اللَّهُمَّ إِنَّ الْعَيْشَ عَيْشُ الآخِرَهْ ... فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ"

---

(١) واتە: جگە لە خاوەن عوزرەکان: (نەخۆش، کوێر، شەل).

(٢) بڕوانە: ٢٨١٨.

فَقَالُوا مُجِيبِينَ لَهُ: نَحْنُ الذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدًا ... عَلَى الجِهَادِ مَا بَقِينَا أَبَدًا[1].

## ٣٣- باسی هاندان لەسەر جەنگ و جیهاد و باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هانی بڕواداران بدە لەسەر جەنگ کردن (لەگەڵ دوژمناندا)

**٢٨٣٤- حومەید دەڵێ: لە ئەنەسم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ (لە مەدینە) دەرچوو بۆ خەندەق، دەبینێ بەو بەیانییە ساردە ئەنصارییەکان و یاردەدەران (خەندەق) هەڵدەکەنن، کەسیان کۆیلەیان نەبوو ئەو کارەیان بۆ بکات، جا کاتێك کە بینی چەند ماندوو و برسین، فەرمووی:**

**((خوایە! بەڕاستی ژیان هەر ژیانی دواڕۆژە، دەی کەوابوو لە ئەنصارییەکان و کۆچەران خۆشبە)).**

**ئەوانیش وەڵامیان دایەوە و وتیان:**

**ئێمە ئەوانەین پەیمانمان بە موحەممەد داوە لەسەر جیهاد هەتا ماوین.**

## ٣٤- بابُ حَفْرِ الخَنْدَقِ

**٢٨٣٥-** حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: جَعَلَ الْمُهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ يَحْفِرُونَ الْخَنْدَقَ حَوْلَ الْمَدِينَةِ، وَيَنْقُلُونَ التُّرَابَ عَلَى مُتُونِهِمْ وَيَقُولُونَ: نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدًا ... عَلَى الجِهَادِ مَا بَقِينَا أَبَدًا

وَالنَّبِيُّ ﷺ يُجِيبُهُمْ وَيَقُولُ:

"اللَّهُمَّ إِنَّهُ لاَ خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُ الآخِرَهْ ... فَبَارِكْ فِي الأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ"[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٨٣٥، ٢٩٦١، ٣٧٩٥، ٣٧٩٦، ٤١٠٠، ٦٤١٣، ٧٢٠١.

(٢) بڕوانە: ٢٨٣٤.

## ٣٤- باسی هەڵکەندنی خەندەق (بەدەوری مەدینەدا)

**٢٨٣٥- ئەنەس ﷺ دەڵێ: کۆچەران و ئەنصارییەکان دەستیان بەهەڵکەندنی خەندەق کرد بەدەوری مەدینەدا، گڵەکەیان بەکۆڵ دەگواستەوە و دەیانوت: ئێمە ئەوانەین پەیمانمان بەموحەممەد دا لەسەر ئیسلام هەتا ماوین، پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دەدانەوە و دەیفەرموو: ((خوایە بەڕاستی خێرو خۆشی تەنها لەو دونیایە (دواڕۆژ)، دەی کەواتە فەڕو بەرەکەت بڕێژی بەسەر ئەنصارییەکان و کۆچەراندا)) .**

**٢٨٣٦-** حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، سَمِعْتُ البَرَاءَ ﷺ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَنْقُلُ وَيَقُولُ: "لَوْلاَ أَنْتَ مَا اهْتَدَيْنَا"(١).

**٢٨٣٦- ئەبو ئیسحاق دەڵێ: گوێم لە بەڕا ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ گڵەکەی دەگواستەوەو دەیفەرموو: ((خوایە ئەگەر تۆ نەبوویتایە لەسەر ڕێی ڕاست نەدەبووین)).**

**٢٨٣٧-** حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَوْمَ الأَحْزَابِ يَنْقُلُ التُّرَابَ - وَقَدْ وَارَى التُّرَابُ بَيَاضَ بَطْنِهِ -وَهُوَ يَقُولُ:

"لَوْلاَ أَنْتَ مَا اهْتَدَيْنَا ... وَلاَ تَصَدَّقْنَا وَلاَ صَلَّيْنَا

فَأَنْزِلِ السَّكِينَةَ عَلَيْنَا ... وَثَبِّتِ الأَقْدَامَ إِنْ لاَقَيْنَا

إِنَّ الأُلَى قَدْ بَغَوْا عَلَيْنَا ... إِذَا أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا"(٢).

(١) بروانە: ٢٨٣٧، ٣٠٣٤، ٤١٠٤، ٤١٠٦، ٦٦٢٠، ٧٢٣٦.

(٢) بروانە: ٢٨٣٦.

٢٨٣٧- ئەبو ئیسحاق لە بەرائەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لەڕۆژی غەزای ئەحزابدا پێغەمبەری خوا ﷺ گڵی (خەندەقەکەی) دەگواستەوە، گڵەکە سپیایی سکی داپۆشیبوو، جا دەیفەرموو:

((خوایە گەر تۆ نەبوویتایە ڕێنموون نەدەبووین .... و زەکاتمان نەدەداو نوێژمان نەدەکرد

دەی کەواتە ئارامی و دڵنیایی داباڕێنە بەسەرماندا .... پێیەکانیشمان دامەزراو بکە کاتێك بەرەنگاریان بووینەوە

ئەو (بێ بڕوا)یانە دەستدرێژی دەکەنە سەرمان ..... ئەگەر ئەوانە بیانەوێ فیتنەو ئاشووب بنێنەوە ئێمە ڕێگە نادەین و ناهێڵین))

## ٣٥- باب مَنْ حَبَسَهُ العُذْرُ عَنِ الغَزْوِ

٢٨٣٨- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ، أَنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُمْ قَالَ رَجَعْنَا مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ[1].

## ٣٥- باسی ئەو کەسەی عوزر و بەهانەیەک ڕێگری بێت لە بەشداری غەزاکردن

٢٨٣٨- حومەید دەگێڕێتەوە کە ئەنەس ﷺ بۆی گێڕانەوە و وتی: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ لە غەزای تەبووك گەڕاینەوە.

٢٨٣٩- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ -هُوَ ابْنُ زَيْدٍ- عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ فِي غَزَاةٍ فَقَالَ: "إِنَّ أَقْوَامًا بِالْمَدِينَةِ خَلْفَنَا، مَا سَلَكْنَا شِعْبًا وَلاَ وَادِيًا إِلاَّ وَهُمْ مَعَنَا فِيهِ، حَبَسَهُمُ العُذْرُ"[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٨٣٩، ٤٤٢٣.

٢٨٣٩- حومەید دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ لە غەزایەکدا بوو فەرمووی: ((بێگومان لە مەدینە کەسانێك لەئێمە بەجێماوون (نەهاتوون بۆ غەزا)، بەهەر شیو و دۆڵێکدا ڕۆیشتووین ئەوانمان لەگەڵ بووە (لە پاداشتتدا)، عوزرێکی ڕەوا[٢] ڕێگریان بووە)).

## ٣٦- بابُ فَضْلِ الصَّوْمِ فِي سَبِيلِ اللهِ

٢٨٤٠- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ وَسُهَيْلُ بْنُ أَبِي صَالِحٍ أَنَّهُمَا سَمِعَا النُّعْمَانَ بْنَ أَبِي عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: "مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللهِ بَعَّدَ اللهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا".

## ٣٦- باسی گەورەیی ڕۆژووگرتن (لەکاتی جیهاد) لەڕێی خوادا

٢٨٤٠- ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەر کەسێك ڕۆژێك بەڕۆژوو بێت لە ڕێی خوادا، خوای گەورە ڕووخساری حەفتا پایز لە دۆزەخ دوور دەخاتەوە)).

## ٣٧- بابُ فَضْلِ النَّفَقَةِ فِي سَبِيلِ اللهِ

٢٨٤١- حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللهِ دَعَاهُ خَزَنَةُ الجَنَّةِ، كُلُّ خَزَنَةِ بَابٍ: أَيْ فُلُ، هَلُمَّ". قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللهِ، ذَاكَ الذِي لاَ تَوَى عَلَيْهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنِّي لأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ"[٣].

---

(١) بروانە: ٢٨٣٨.

(٢) وەک فەقیری و نەخۆشی... هتد.

(٣) بروانە: ١٨٩٧.

# ٣٧- باسی گەورەیی ماڵی بەخشین لەڕێی خوادا

**٢٨٤١- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەسێك دووان (لەهەر ماڵێك) ببەخشێت لەڕێی خوادا، هەموو گەنجینەدارەکانی بەهەشت بانگی دەکەن، هەر گەنجینەدارێکی لەدەرگاکەی خۆیەوە بانگی دەکات: ئەی فلانکەس وەرە!))، ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بەخشینە (خاوەنەکەی) هیچی لەسەر نییە (لەهەر دەرگایەکەوە بڕواتە ژوورەوە )، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((من ئومێد دەکەم تۆ لەو کەسانە بیت)).**

٢٨٤٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، حَدَّثَنَا هِلاَلٌ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: "إِنَّمَا أَخْشَى عَلَيْكُمْ مِنْ بَعْدِي مَا يُفْتَحُ عَلَيْكُمْ مِنْ بَرَكَاتِ الأَرْضِ". ثُمَّ ذَكَرَ زَهْرَةَ الدُّنْيَا، فَبَدَأَ بِإِحْدَاهُمَا وَثَنَّى بِالأُخْرَى، فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَوَ يَأْتِي الخَيْرُ بِالشَّرِّ؟ فَسَكَتَ عَنْهُ النَّبِيُّ ﷺ قُلْنَا يُوحَى إِلَيْهِ. وَسَكَتَ النَّاسُ كَأَنَّ عَلَى رُءُوسِهِمِ الطَّيْرَ، ثُمَّ إِنَّهُ مَسَحَ عَنْ وَجْهِهِ الرُّحَضَاءَ، فَقَالَ: " أَيْنَ السَّائِلُ آنِفًا أَوَخَيْرٌ هُوَ؟ -ثَلاَثًا- إِنَّ الخَيْرَ لاَ يَأْتِي إِلاَّ بِالْخَيْرِ، وَإِنَّهُ كُلُّ مَا يُنْبِتُ الرَّبِيعُ مَا يَقْتُلُ حَبَطًا أَوْ يُلِمُّ كُلَّمَا أَكَلَتْ، حَتَّى إِذَا امْتَلأَتْ خَاصِرَتَاهَا اسْتَقْبَلَتِ الشَّمْسَ، فَثَلَطَتْ وَبَالَتْ ثُمَّ رَتَعَتْ، وَإِنَّ هَذَا المَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، وَنِعْمَ صَاحِبُ الْمُسْلِمِ لِمَنْ أَخَذَهُ بِحَقِّهِ، فَجَعَلَهُ فِي سَبِيلِ اللهِ وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ، وَمَنْ لَمْ يَأْخُذْهُ بِحَقِّهِ فَهْوَ كَالآكِلِ الذِي لاَ يَشْبَعُ، وَيَكُونُ عَلَيْهِ شَهِيدًا يَوْمَ القِيَامَةِ"[١].

**٢٨٤٢- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر دوانگە وەستا و فەرمووی: ((بێگومان ئەوەی لەدوای (مردنی) خۆم دەترسم**

(١) بڕوانە: ٩٢١.

تووشتان بێت، ئەو دەروازانەیە لێتان دەکرێتەوە لەفەڕ و بەرەکەتی زەوی))، پاشان باسی ڕازاوەیی دونیای کرد، جا بەیەکێکیان دەستی پێکرد (کەفەڕ و بەرەکەتی زەوییە)، وە دووهەمیشیانی (ڕازاوەیی دونیایە) بەدوایدا باسکرد، ئینجا پیاوێك هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا چاکە خراپە بەشوێن خۆیدا دێنێت؟ پێغەمبەر ﷺ لێی بێدەنگ بوو، وتمان: نیگای بۆ دێت، خەڵکەکەش بێدەنگ بوون وەك ئەوەی باڵندە بەسەر سەریانەوە نیشتبێتەوە، پاشان ئەو عەرەقە زۆرەی سڕی بەڕووخساریەوە بوو[1]، ئینجا فەرمووی: ((کوا ئەو کەسەی ئێستا پرسیاری کرد؟ ئایا ئەوەی (دەستتان دەکەوێت)[2] خێر و چاکە - سێ جار دووبارەی کردەوە- بێگومان خێر هەر خێر و چاکە دێنێ، بەڕاستی لەو سەوزی و جوانییەی بەهار دەیڕوێنێ، (ئەو ئاژەڵەی دەیخوات) دەیکوژێت بەباکردنی ورگی یان نزیکە بیکوژێت، - مەگەر گژ و گیای سەوز- بخوات هەتا هەردوو کەلەکەی پڕ ببێت (تێر بخوات)، ئەوسا خۆی بداتە بەرخۆر، ئینجا بتورێنێ (پیسایی) و میز بکات، پاشان بلەوەڕێ، وە بەڕاستی ئەم ماڵ و سامانە سەوزو شیرینە، ئای چەند چاکە (ئەو ماڵەی) هی مسوڵمانێك بێت، بۆ ئەو کەسەی بەحەڵاڵ و هەقی خۆی پەیدای کردبێت، ئینجا خەرجی کردبێ لەڕێی خوا و هەتیوان و هەژاراندا، ئەو کەسەش بەحەڵاڵ و هەقی خۆی پەیدای نەکردبێت، ئەوە بێگومان وەك ئەو بخۆرە وایە کە تێر نابێت، لە ڕۆژی قیامەتیشدا دەبێتە شایەت لەسەری)).

---

(١) بەهۆی قورسی نیگاکەوە بەسەریدا هاتبوو.

(٢) لە سامان و ڕازاوەیی دونیا.

## ٣٨- بابُ فَضْلِ مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا أَوْ خَلَفَهُ بِخَيْرٍ

٢٨٤٣- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى قَالَ حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي بُسْرُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي زَيْدُ بْنُ خَالِدٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللهِ فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللهِ بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا".

## ٣٨- باسی فەزڵ و گەورەیی ئامادەكردنی پێویستییەكان بۆ جەنگاوەرێک یان بەچاكی لەشوێنی جەنگاوەرەكە بەجێ بمێنێت (كاروبارەكانی ئەنجام بدات)

**٢٨٤٣- زەیدی كوڕی خالید ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر كەسێك پێویستییەكانی جەنگاوەرێكی ڕێی خوا ئامادە بكات، ئەوە وەك ئەوە وایە غەزای كردبێت، وە هەركەس بەجێ بمێنێت لە جێی جەنگاوەرێك لەڕێی خوادا بەچاكی (چاودێری خانەوادەكەی بكات)، وەك ئەوە وایە غەزای كردبێت)).**

٢٨٤٤- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَكُنْ يدخلُ بَيْتًا بِالْمَدِينَةِ غَيْرَ بَيْتِ أُمِّ سُلَيْمٍ، إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِ، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ: "إِنِّي أَرْحَمُهَا، قُتِلَ أَخُوهَا مَعِي".

**٢٨٤٤- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەدا (زۆر) نەدەچووە هیچ ماڵێك ماڵی ئوممو سولەیم نەبێت، بێجگە ماڵی خێزانەكانی، پێی وترا: (بۆ زۆر دەڕۆی بۆ ماڵیان)، ئەویش فەرمووی: ((بەڕاستی من بەزەییم پێیدا دێتەوە، براكەی لەگەڵ مندا كوژراوە)).**

## ٣٩- بابُ التَّحَنُّطِ عِنْدَ القِتَالِ

٢٨٤٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، حَدَّثَنَا ابْنُ عَوْنٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ أَنَسٍ -قَالَ وَذَكَرَ يَوْمَ اليَمَامَةِ- قَالَ: أَتَى أَنَسٌ ثَابِتَ بْنَ قَيْسٍ وَقَدْ حَسَرَ عَنْ فَخِذَيْهِ وَهْوَ يَتَحَنَّطُ فَقَالَ: يَا عَمِّ مَا يَحْبِسُكَ أَنْ لاَ تَجِيءَ؟ قَالَ: الآنَ يَا ابْنَ أَخِي. وَجَعَلَ يَتَحَنَّطُ -يَعْنِي: مِنَ الحَنُوطِ- ثُمَّ جَاءَ فَجَلَسَ، فَذَكَرَ فِي الحَدِيثِ انْكِشَافًا مِنَ النَّاسِ، فَقَالَ هَكَذَا عَنْ وُجُوهِنَا حَتَّى نُضَارِبَ الْقَوْمَ، مَا هَكَذَا كُنَّا نَفْعَلُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، بِئْسَ مَا عَوَّدْتُمْ أَقْرَانَكُمْ. رَوَاهُ حَمَّادٌ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ.

## ٣٩- باسی بۆنی خۆش لەخۆدان لەکاتی جەنگدا

**٢٨٤٥- ئیبنو عەون لە مووسای کوڕی ئەنەس گێڕایەوە -کاتێك باسی جەنگی ڕۆژی یەمامەی کرد و وتی: ئەنەس ڕۆیشت بۆ لای سابیتی کوڕی قەیس لەکاتێکدا هەردوو ڕانی هەڵماڵی بوو بۆنی خۆشی لەخۆی دەدا، جا وتی: مامە چ شتێك ڕێگرت بوو کە نەیەیت؟ وتی: ئا ئێستە دێم برازای خۆم، وە دەستی کرد بە بۆنی خۆش لەخۆدان، (يَتَحَنَّطُ) -واتە: لە (الحَنُوطِ)ـەوە هاتووە[1]-، پاشان هات و دانیشت، جا ئەنەس لە باسەکەیدا باسی شکانی خەڵکەکەی کرد (لە جەنگەکەدا)، ئینجا ئاوەها وتی: ڕێگەمان بدەن هەتا لەگەڵ بەرانبەرەکانمان بەجەنگ بێین، ئێمەش لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوەهامان نەدەکرد، کارێکی زۆر خراپە بەرانبەرەکانتان لەسەری ڕاهێناوە (لە ڕاکردن لە دوژمنەکانتان). ئەم فەرموودەیە حەمماد گێڕاویەتییەوە لە سابیتەوە، ئەویش لە ئەنەسەوە[2].**

---

(١) (يَتَحَنَّطُ) کە فیعلی تێنەپەڕیوە لە (الحَنُوطِ)ـەوە هاتووە، بەمانای بۆنی خۆشە، وە (يَتَحَنَّطُ)ـش بەمانای بۆنی خۆش لەخۆی دەدات.

(٢) ئەمە ڕێگە و سەنەدێکی ترە جگە لە سەنەدەکەی یەکەم.

## ٤٠- بابُ فَضْلِ الطَّلِيعَةِ

٢٨٤٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مَنْ يَأْتِينِي بِخَبَرِ الْقَوْمِ يَوْمَ الأَحْزَابِ؟ ". قَالَ الزُّبَيْرُ: أَنَا. ثُمَّ قَالَ: "مَنْ يَأْتِينِي بِخَبَرِ الْقَوْمِ؟ ". قَالَ الزُّبَيْرُ: أَنَا. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّا، وَحَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ"[1].

## ٤٠- باسی گەورەیی (پاداشتی) سوسەکردن[2]

**٢٨٤٦- جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کێ هەواڵی ئەم خەڵکەم[3] بۆ دێنێ؟)) لە ڕۆژی (غەزای) ئەحزابدا، زوبەیر وتی: من، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کێ هەواڵی ئەو خەڵکەم بۆ دێنێ؟)) زوبەیر وتی: من، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان هەموو پێغەمبەرێك پشتیوانی و دۆستێکی گیانی بەگیانی هەبووە، پشتیوان و دۆستی گیانی بەگیانی منیش زوبەیرە)).**

## ٤١ - بابٌ: هَلْ يُبْعَثُ الطَّلِيعَةُ وَحْدَهُ؟

٢٨٤٧- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُنْكَدِرِ، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: نَدَبَ النَّبِيُّ ﷺ النَّاسَ -قَالَ صَدَقَةُ: أَظُنُّهُ- يَوْمَ الْخَنْدَقِ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَ النَّاسَ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّا، وَإِنَّ حَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ بْنُ الْعَوَّامِ"[4].

---

(١) بڕوانە: ٢٨٤٧، ٢٩٩٧، ٣٧١٩، ٤١١٣، ٧٢٦١.

(٢) سوسەکردن: وەرگرتنی هەواڵ و دەنگ و باسە بەشێوەیەکی نهێنی.(فەرهەنگی خاڵ:٣٣٢).

(٣) مەبەستی هەواڵی بەنی قورەیزە بوو.

(٤) بڕوانە: ٢٨٤٦.

## ٤١- باسێک: ئایا سوسەکار بەتەنها دەنێردرێت؟

**٢٨٤٧- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ داوای لەخەڵك (هاوەڵان) کرد هەواڵی (بەنو قورەیزەی) بۆ بێنن، صەدەقە وتی: وابزانم - ڕۆژی غەزای خەندەق بوو، زوبەیر ئامادەیی دەربڕی، پاشان پێغەمبەر ﷺ داوای کردەوە، جا زوبەیر ئامادەیی دەربڕی، پاشان داوای لە خەڵکەکە کرد هەواڵی بۆ بێنن، ئینجا هەر زوبەیر ئامادەبوو، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی هەموو پێغەمبەرێك دڵسۆز و پشتیوانی تایبەتی هەیە، وە بێگومان دڵسۆز و پشتیوانی تایبەتی منیش زوبەیری کوڕی عەووامە)).**

## ٤٢- بابُ سَفَرِ الاِثْنَيْنِ

٢٨٤٨- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا أَبُو شِهَابٍ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ مَالِكِ بْنِ الحُوَيْرِثِ قَالَ: انْصَرَفْتُ مِنْ عِنْدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لَنَا أَنَا وَصَاحِبٌ لِي "أَذِّنَا وَأَقِيمَا، وَلْيَؤُمَّكُمَا أَكْبَرُكُمَا"[١].

## ٤٢- باسی دوو کەس پێکەوە سەفەر بکەن (دروستە)

**٢٨٤٨- مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ گەڕامەوە، جا پێغەمبەر ﷺ بەمن و هاوڕێیەکمی فەرموو: ((هەردووکتان بانگ بدەن و قامەت بکەن[٢]، وە با ئەوەتان پێشنوێژی بکات کە گەورەترە لە تەمەندا)).**

---

(١) بڕوانە: ٦٢٨.

(٢) واتە: یەکێکتان بانگ بدات و ئەویتر وەڵامی بداتەوە، یا کامتان پێی خۆشە بانگ بدات.(بڕوانە: إرشاد الساري:٦/٣٤٢).

## ٤٣ - بابٌ: الخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الخَيْرُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ

٢٨٤٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "الْخَيْلُ فِي نَوَاصِيهَا الخَيْرُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ".

## ٤٣- باسێک: خێر لە ناوچاوانی ئەسپ و ماییندا گرێدراوە تا ڕۆژی دوایی

**٢٨٤٩- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەسپ و ماین خێر لەناو چاوانیان گرێدراوە تا ڕۆژی قیامەت)).**

٢٨٥٠- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ حُصَيْنٍ وَابْنِ أَبِي السَّفَرِ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الجَعْدِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الخَيْرُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ". قَالَ سُلَيْمَانُ، عَنْ شُعْبَةَ عَنْ عُرْوَةَ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ[1].

تَابَعَهُ مُسَدَّدٌ، عَنْ هُشَيْمٍ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عروَةَ بْنِ أَبِي الجَعْدِ[2].

**٢٨٥٠- عورِوەی کوڕی جەعد دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((خێر و چاکە لەناو چاوانی ئەسپ و ماییندا گرێدراوە تا ڕۆژی دوایی)). ئەم فەرموودەیە سولەیمان گێڕاویەتیەوە لە شوعبەوە، لە عورِوەی کوڕی ئەبو جەعدەوە.**

**موسەدەد لە هوشەیمەوە، لە حوصەینەوە، لە شەعبییەوە، لە عورِوەی کوڕی ئەبو جەعدەوە، ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی سولەیمانی کردووە کە دەڵێ:** (عرْوَةَ بْنِ أَبِي الجَعْدِ[1]).

---

(١) بڕوانە: ٣٦٤٤.

(٢) بڕوانە: ٢٨٥٣، ٣١١٩، ٣٦٣٤.

٢٨٥١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "الْبَرَكَةُ فِي نَوَاصِي الخَيْلِ"[٢].

**٢٨٥١- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فەڕ و بەرەكەت لەناوچاوانی ئەسپ و مایینداﻳە)).**

## ٤٤ - بابٌ : الجِهَادُ مَاضٍ مَعَ الْبَرِّ وَالْفَاجِرِ

لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: "الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ".

٢٨٥٢- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ، عَنْ عَامِرٍ، حَدَّثَنَا عُرْوَةُ البَارِقِيُّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: "الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الأَجْرُ وَالْمَغْنَمُ"[٣].

## ٤٤- باسێك: جیهادكردن بەردەوامە لەگەڵ (سەركردەی) چاك و خراپدا

**بەبەڵگەی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((خێر و خۆشی لەناوچاوانی مایینداﻳە گرێدراوە تا ڕۆژی قیامەت)).**

**٢٨٥٢- عوروەی باریقی ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((خێر لەناوچاوانی مایینداﻳە گرێدراوە تا ڕۆژی قیامەت، كە بریتییە لە: پاداشت[٤] و دەستكەوت[٥])).**

---

(١) وشەی (أَبِي) لە نێوان (بن و الجعد)دا زیادكراوە، پاڵپشتییەكە لەهێنانی تەنها ئەو وشەی (أَبِي)داﻳە.

(٢) بڕوانە: ٣٦٤٥.

(٣) بڕوانە: ٢٨٥٠.

(٤) پاداشت لە ڕۆژی دواییدا.

(٥) دەستكەوت لە دونیادا.

## ٤٥- بابُ مَنِ احْتَبَسَ فَرَسًا فِي سَبِيلِ اللهِ لِقَوْلِهِ تَعَالَى:

﴿ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ ﴿٦٠﴾ ﴾ الأنفال.

٢٨٥٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ المُبَارَكِ، أَخْبَرَنَا طَلْحَةُ بْنُ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدًا المَقْبُرِيَّ يُحَدِّثُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مَنِ احْتَبَسَ فَرَسًا فِي سَبِيلِ اللهِ إِيمَانًا بِاللهِ وَتَصْدِيقًا بِوَعْدِهِ، فَإِنَّ شِبَعَهُ وَرِيَّهُ وَرَوْثَهُ وَبَوْلَهُ فِي مِيزَانِهِ يَوْمَ القِيَامَةِ".

## ٤٥- باسی فەزڵی ئەو کەسەی ئەسپێک دابەستێت (بۆ جیهادکردن لەڕێی خوادا) بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە لە ئەسپی دابەستراودا).

**٢٨٥٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەرکەس ئەسپێك لەڕێی خوادا دابەسێت بەباوەڕبوون بەخواو بەبەڵێنەکەی ئەوە بێگومان خواردن و خواردنەوەو تەرس ومیزەکەی لە ترازوی (چاکەی خاوەنەکەیدا) دادەنرێت لە ڕۆژی قیامەت دا)).**

## ٤٦- بابُ اسْمِ الفَرَسِ وَالْحِمَارِ

٢٨٥٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ خَرَجَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَتَخَلَّفَ أَبُو قَتَادَةَ مَعَ بَعْضِ أَصْحَابِهِ وَهُمْ مُحْرِمُونَ وَهُوَ غَيْرُ مُحْرِمٍ، فَرَأَوْا حِمَارًا وَحْشِيًّا قَبْلَ أَنْ يَرَاهُ، فَلَمَّا رَأَوْهُ تَرَكُوهُ حَتَّى رَآهُ أَبُو قَتَادَةَ، فَرَكِبَ فَرَسًا لَهُ يُقَالُ لَهُ الْجَرَادَةُ، فَسَأَلَهُمْ أَنْ يُنَاوِلُوهُ سَوْطَهُ فَأَبَوْا، فَتَنَاوَلَهُ فَحَمَلَ فَعَقَرَهُ، ثُمَّ أَكَلَ فَأَكَلُوا، فَنَدِمُوا فَلَمَّا أَدْرَكُوهُ قَالَ: "هَلْ مَعَكُمْ مِنْهُ شَيْءٌ؟ ". قَالَ: مَعَنَا رِجْلُهُ، فَأَخَذَهَا النَّبِيُّ ﷺ فَأَكَلَهَا[1] .

---

(١) بروانە: ١٨٢١.

## ٤٦- باسی ناو لێنانی ئەسپ و گوێدرێژ

**٢٨٥٤- عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو قەتادە لە قەتادەی باوكیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە ئەو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ (لە مەدینە) دەرچوون، جا ئەبو قەتادە لەگەڵ چەند هاوەڵێكدا بەجێمان، ئەوان ئیحرامیان بەستبوو، بەڵام ئەبو قەتادە نەیبەستبوو، هاوڕێكانی كەرە كێوییەكیان بینی پێش ئەوەی ئەبو قەتادە بی بینێ، جا كاتێك بینیان وازیان لێ هێنا هەتا ئەبو قەتادە بینی، ئینجا ئەبو قەتادە سواری ئەسپەكەی خۆی بوو كە پێیان دەوت (الْجَرَادَةُ)، ئەبو قەتادە داوای لە هاوڕێكانی كرد كە قامچیەكەی بدەن بەدەستیەوە، بەڵام ئەوان پێیان نەدا، بۆیە خۆی قامچیەكەی هەڵگرتەوە و هێرشی برد بۆ (كەرە كێوییەكە و كوشتی) و سەری بڕی، پاشان ئەبو قەتادە لەگۆشتەكەی خوارد، ئەوانیش خواردیان و ئینجا پەشیمان بوونەوە، جا كاتێك گەیشتن بەپێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا هیچێكتان لێی لەگەڵ خۆتان هێناوە؟))، وتی: (بەڵێ) ڕانێكمان پێیە، پێغەمبەریش ﷺ وەری گرت و خواردی.**

٢٨٥٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا مَعْنُ بْنُ عِيسَى، حَدَّثَنَا أُبَيُّ بْنُ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: كَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فِي حَائِطِنَا فَرَسٌ يُقَالُ لَهُ اللُّحَيْفُ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: وَقَالَ بَعْضُهُم: اللُّخَيْفُ.

**٢٨٥٥- ئوبەی كوڕی عەبباسی كوڕی سەهل دەگێڕێتەوە لە باوكیەوە لە باپیریەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەباخەكەی ئێمەدا ئەسپێكی هەبوو پێیان دەوت: لوحەیف. ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: هەندێك دەڵێن: (اللُّخَيْفُ) لوخەیف (بەهۆی درێژی كلكیەوە).**

**٢٨٥٦**- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، سَمِعَ يَحْيَى بْنَ آدَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ مُعَاذٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ ﷺ على حِمَارٍ يُقَالُ لَهُ: عُفَيْرٌ، فَقَالَ: "يَا مُعَاذُ، هَلْ تَدْرِي حَقَّ اللهِ عَلَى عِبَادِهِ وَمَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللهِ؟ ". قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: "فَإِنَّ حَقَّ اللهِ عَلَى العِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَحَقَّ العِبَادِ عَلَى اللهِ أَنْ لاَ يُعَذِّبَ مَنْ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا". فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَلاَ أُبَشِّرُ بِهِ النَّاسَ؟ قَالَ: "لاَ تُبَشِّرْهُمْ فَيَتَّكِلُوا"[١].

**٢٨٥٦- موعاز ﷺ دەڵێ: من لە پاشکۆی پێغەمبەردا ﷺ بەسواری گوێدرێژێکەوە بووم کە پێی دەوترا: عوفەیر، جا فەرمووی: ((ئەی موعاز! ئایا دەزانی مافی خوا چییە بەسەر بەندەکانیەوە، وە مافی بەندەکان چییە بەسەر خواوە؟))، وتم: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: ((بەڕاستی مافی خوا لەسەر بەندەکان ئەوەیە کە بیپەرستن و هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی، وە مافی بەندەکانیش لەسەر خوا ئەوەیە کە سزای ئەو کەسە نەدات کە هیچ شتێکی نەکردوّتە هاوبەشی خوا))، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! دەی ئایا مژدە نەدەم بەخەڵکی؟ فەرمووی: ((مژدەیان پێ مەدە (بەشێوەیەك) ئیتر پشت بەم مژدەیە ببەستن (و کار ناکەن) )).**

**٢٨٥٧**- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، سَمِعْتُ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ كَانَ فَزَعٌ بِالْمَدِينَةِ، فَاسْتَعَارَ النَّبِيُّ ﷺ فَرَسًا لَنَا يُقَالُ لَهُ: مَنْدُوبٌ. فَقَالَ: "مَا رَأَيْنَا مِنْ فَزَعٍ، وَإِنْ وَجَدْنَاهُ لَبَحْرًا"[٢].

**٢٨٥٧- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لەمەدینەدا ترس و دڵەڕاوکێیەك (لەشەودا) هەبوو، جا ئێمە ئەسپێکمان هەبوو کە پێی دەوترا: مەندووب، پێغەمبەر ﷺ**

(١) بروانە: ٥٩٦٧، ٦٢٦٧، ٦٥٠٠، ٧٣٧٣.

(٢) بروانە: ٢٦٢٧.

خواستی، جا (پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ سۆراغی ئەم ترسە، دوای ئەوەی گەڕایەوە) فەرمووی: ((هیچمان نەدی مایەی ترس بێت، بەڵام ئەم ئەسپە زۆر خێراو بەهەڵمەتە)).

## ٤٧- بابُ مَا يُذْكَرُ مِنْ شُؤْمِ الفَرَسِ

٢٨٥٨- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: "إِنَّمَا الشُّؤْمُ فِي ثَلاَثَةٍ: فِي الفَرَسِ، وَالْمَرْأَةِ، وَالدَّارِ"[1].

## ٤٧- باسی ئەوەی (لە فەرموودەدا) دەربارەی شومی ئەسپ باس دەکرێت

٢٨٥٨- عەبدوڵلای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بێگومان شوومی لە سێ شتدایە: لە ئەسپ و لە ئافرەت و لە خانوودا)).

٢٨٥٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي حَازِمِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ فَفِي المَرْأَةِ وَالْفَرَسِ وَالْمَسْكَنِ"[2].

٢٨٥٩- سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر (شوومی) لەشتێکدا هەبێت، ئەوە لە ئافرەت و ئەسپ و خانوودایە)).

---

(١) بڕوانە: ٢٠٩٩.

(٢) بڕوانە: ٥٠٩٥.

## ٤٨- بابٌ: الخَيْلُ لِثَلاثَةٍ

وَقَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً ﴿٨﴾ ﴾ النحل.

٢٨٦٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "الْخَيْلُ لِثَلاَثَةٍ: لِرَجُلٍ أَجْرٌ، وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَعَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ، فَأَمَّا الذِي لَهُ أَجْرٌ فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللهِ، فَأَطَالَ فِي مَرْجٍ أَوْ رَوْضَةٍ، فَمَا أَصَابَتْ فِي طِيَلِهَا ذَلِكَ مِنَ المَرْجِ أَوِ الرَّوْضَةِ كَانَتْ لَهُ حَسَنَاتٍ، وَلَوْ أَنَّهَا قَطَعَتْ طِيَلَهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ كَانَتْ أَرْوَاثُهَا وَآثَارُهَا حَسَنَاتٍ لَهُ، وَلَوْ أَنَّهَا مَرَّتْ بِنَهَرٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ وَلَمْ يُرِدْ أَنْ يَسْقِيَهَا كَانَ ذَلِكَ حَسَنَاتٍ لَهُ، وَرَجُلٌ رَبَطَهَا فَخْرًا وَرِئَاءً وَنِوَاءً لأَهْلِ الإِسْلاَمِ فَهْيَ وِزْرٌ عَلَى ذَلِكَ". وَسُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الحُمُرِ، فَقَالَ: "مَا أُنْزِلَ عَلَيَّ فِيهَا إِلاَّ هَذِهِ الآيَةُ الجَامِعَةُ الْفَاذَّةُ: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾ الزلزلة[1].

## ٤٨- باسێک: ئەسپ و مایین بۆ سێ جۆر کەسن

**هەروەها باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە ئەسپ و مایین و ئێستر و گوێدرێژ (ی بۆ دروست کردوون) لەبەر ئەوەی سواریان بن و هۆی ڕازاندنەوەش بن بۆ ئێوە).**

**٢٨٦٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ڕاگرتنی ئەسپ بۆ سێ مەبەستە[2]: بۆ پیاوێك پاداشتە، بۆ پیاوێکیش**

---

(١) بروانە: ٢٣٧١.

(٢) سەرنج : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ڕاگرتنی ئەسپ بۆ سێ مەبەستە، بەڵام بۆچی دووانیانی بۆ باس کردین؟ ڕاڤەکارانی صەحیحی بوخاری دەڵێن: لێرەدا لەم ریوایەتەدا کورتکراوەتەوە، لە پەڕاوی (المساقاه)

داپۆشەر(ی کەموکوڕییەکان)ـە، بۆ پیاوێکیش تاوان و گوناهە، جا ئەوەیان پاداشتە بۆی ئەوە پیاوێکە دایبەستوە بۆ غەزا و خەبات لەڕێی خوادا، ئینجا پەتی بۆ درێژ دەکات لە لەوەڕگا -یان سەوزایی و مێرگێکدا-، جا لەو پەت بۆ درێژکردنەدا چەند بلەوەڕێ لەو لەوەڕگا -یان مێرگ و سەوزاییەدا -، ئەوە هەمووی بۆی دەبێتە چاکە و پاداشت، خۆ ئەگەر پەتەکەی بپچڕێت و سەرێك یان دووسەر غاربکات، ئەوە تەرس و میزەکەی و شوێن سمەکانی دەبێتە چاکە بۆی، وە ئەگەر ئەسپەکە بەلای ڕووبارێکدا بڕوات و لێی بخواتەوە، با خاوەنەکەشی نەیەوێت ئاوی بدات، ئەوە ئەو ئاوخواردنەوەش بە چاکە بۆی دەنووسرێت، پیاوێکیش دایبەستووە بەمەستی شانازی و ڕوپامایی و دوژمنایەتی کردنی خەڵکی مسوڵمان، جا لەبەر ئەوە تاوانە و گوناهە بۆ خاوەنی، وە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا دەربارەی گوێدرێژ، ئەویش فەرمووی ﷺ: ((دەربارەی گوێدرێژ هیچ شتێکم بۆ دانەبەزیوە، جگە لەم ئایەتە گشگیرە کەم وێنەیە: (ئینجا هەر کەسێك بەئەندازەی گەردیلەیەك چاکەی کردبێت دەیبینێتەوە ﴿٧﴾ وە هەرکەسێك بە ئەندازەی گەردیلەیەك خراپەی کردبێت دەیبینێتەوە ﴿٨﴾)).

## ٤٩- بابُ مَنْ ضَرَبَ دَابَّةَ غَيْرِهِ فِي الغَزْوِ

٢٨٦١- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا أَبُو عَقِيلٍ، حَدَّثَنَا أَبُو الْمُتَوَكِّلِ النَّاجِيُّ قَالَ: أَتَيْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيَّ، فَقُلْتُ لَهُ: حَدِّثْنِي بِمَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: سَافَرْتُ مَعَهُ فِي

---

فەرمــودەی ژمــارە (٢٣٧١)، وە لە پەڕاوی (المناقــب) فەرمــوودەی ژمــارە (٣٦٤٦)، وە لە پەڕاوی (التفــسیر) فەرموودەی ژمارە (٤٩٦٢)، وە لە پەڕاوی (الاعتصام بالكتاب والسنة) فەرموودەی ژمـارە (٧٣٥٦)، لە هەمـوو ئەم شوێنانەدا هاتووە کە دووەم مەبەست بوونی ئەسپ بۆی داپۆشەرە، ئەوە ئەو کەسەیە ئەسپی ڕاگرتـووە و ئیـشی پێی نیە، بەڵام مافی خودا دەدات لێیان و هاوکاری خەڵک دەکات پێیان.

بَعْضِ أَسْفَارِهِ -قَالَ أَبُو عَقِيلٍ: لاَ أَدْرِي غَزْوَةً أَوْ عُمْرَةً- فَلَمَّا أَنْ أَقْبَلْنَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَتَعَجَّلَ إِلَى أَهْلِهِ فَلْيُعَجِّلْ". قَالَ جَابِرٌ: فَأَقْبَلْنَا وَأَنَا عَلَى جَمَلٍ لِي أَرْمَكَ لَيْسَ فِيهِ شِيَةٌ، وَالنَّاسُ خَلْفِي، فَبَيْنَا أَنَا كَذَلِكَ إِذْ قَامَ عَلَيَّ، فَقَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: "يَا جَابِرُ اسْتَمْسِكْ". فَضَرَبَهُ بِسَوْطِهِ ضَرْبَةً، فَوَثَبَ البَعِيرُ مَكَانَهُ، فَقَالَ: "أَتَبِيعُ الجَمَلَ". قُلْتُ نَعَمْ. فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ وَدَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ المَسْجِدَ فِي طَوَائِفِ أَصْحَابِهِ، فَدَخَلْتُ إِلَيْهِ، وَعَقَلْتُ الْجَمَلَ فِي نَاحِيَةِ الْبَلاَطِ. فَقُلْتُ لَهُ هَذَا جَمَلُكَ. فَخَرَجَ، فَجَعَلَ يُطِيفُ بِالْجَمَلِ وَيَقُولُ: "الْجَمَلُ جَمَلُنَا". فَبَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ أَوَاقٍ مِنْ ذَهَبٍ فَقَالَ: "أَعْطُوهَا جَابِرًا". ثُمَّ قَالَ: "اسْتَوْفَيْتَ الثَّمَنَ". قُلْتُ نَعَمْ. قَالَ: "الثَّمَنُ وَالْجَمَلُ لَكَ"[1].

## ٤٩- باسی ئەو کەسەی لە غەزادا لە وڵاخی کەسێکی تر بدات

**٢٨٦١- ئەبو موتەوەککیلی ناجی دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری ﵄ و پێم وت: ئەو فەرموودانەم بۆ بگێڕەوە کە لە پێغەمبەری خوات ﷺ بیستووە، ئەویش وتی: لە سەفەرێك لە سەفەرەکانیدا سەفەرم لە خزمەتیدا کرد -ئەبو عەقیل دەڵێ: نازانم وتی: غەزایەك یان عومرەیەك-، جا کاتێك کە گەڕاینەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس حەز دەکات پەلە بکات لە گەڕانەوە بۆماڵەوە با پەلە بکات))، جابیر دەڵێ: جا هاتین من بەسواری وشترێکی سوری مەیلە و ڕەش بووم، پەڵەی تیا نەبوو لەڕەنگی تر، خەڵکەکە لەدوامەوە بوون، جا کاتێك من لەم حاڵەتەدا بووم، لەپڕ کەسێك لەپاڵمدا وەستا (کە پێغەمبەر ﷺ بوو)، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: ((جابیر خۆت بگرە))، بەقامچییەکەی یەك دانەی لێدا، وشترەکە لە جێگای خۆی ڕاپەری و هەستایەوە، ئینجا فەرمووی: ((وشترەکە دەفرۆشیت؟))، وتم: بەڵێ. جا کە گەیشتینە**

(١) بڕوانە: ٤٤٣.

مەدینە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ كۆمەڵێك لەهاوەڵانیدا ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ مزگەوت، منیش ڕۆیشتمە ژوورەوە بۆ مزگەوت، وە وشترەكەم لای بەردەكانی (نزیك دەرگاكەی مزگەوت) بەستەوە و وتم بە پێغەمبەر ﷺ: ئەوە وشترەكەتە، ئەویش هاتە دەرەوە، بەدەوری وشترەكەدا دەسووڕایەوە و دەیفەرموو: ((وشترەكە وشتری خۆمانە))، ئینجا پێغەمبەر ﷺ چەند ئۆقیێیەك ئاڵتونی نارد و فەرمووی: (( بیدەن بە جابیر))، پاشان فەرمووی: ((نرخەكەیت وەرگرت؟))، وتم: بەڵێ، فەرمووی ﷺ: ((نرخەكەی و وشترەكەش بۆ خۆت)).

## ٥٠- بابُ الرُّكُوبِ عَلَى الدَّابَّةِ الصَّعْبَةِ وَالْفُحُولَةِ مِنَ الخَيْلِ

وَقَالَ رَاشِدُ بْنُ سَعْدٍ: كَانَ السَّلَفُ يَسْتَحِبُّونَ الْفُحُولَةَ مِنَ الخَيْلِ لأَنَّهَا أَجْرَى وَأَجْسَرُ.

٢٨٦٢- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ بِالْمَدِينَةِ فَزَعٌ، فَاسْتَعَارَ النَّبِيُّ ﷺ فَرَسًا لأَبِي طَلْحَةَ، يُقَالُ لَهُ: مَنْدُوبٌ، فَرَكِبَهُ، وَقَالَ: "مَا رَأَيْنَا مِنْ فَزَعٍ، وَإِنْ وَجَدْنَاهُ لَبَحْرًا".

## ٥٠- باسی سواربوونی وڵاخی بەهێز و ئەسپ

ڕاشیدی كوڕی سەعد دەڵێ: پێشینان حەزیان لە سواری ئەسپ بوو (لە جیهاددا)، چونكە خێراتر و بوێرترە (لە مایین).

٢٨٦٢- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە مەدینەدا ترس و دڵەڕاوكێیەك (لە شەودا) هەبوو، پێغەمبەریش ﷺ ئەسپێكی ئەبو تەڵحەی خواست، كە پێی دەوترا: مەندووب، جا سواری بوو (دوای ئەوەی گەڕایەوە)، فەرمووی: ((هیچمان نەدی مایەی ترس بێت، بەڵام ئەم ئەسپە زۆر خێرا و بەهەڵمەتە)).

## ٥١- بابُ سِهَامِ الفَرَسِ

٢٨٦٣- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ أَبِي أُسَامَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ جَعَلَ لِلْفَرَسِ سَهْمَيْنِ وَلِصَاحِبِهِ سَهْمًا. وَقَالَ مَالِكٌ: يُسْهَمُ لِلْخَيْلِ وَالْبَرَاذِينِ مِنْهَا؛ لِقَوْلِهِ: ﴿ وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا ﴿٨﴾ ﴾ النحل. وَلَايُسْهَمُ لأَكْثَرَ مِنْ فَرَسٍ[١].

## ٥١- باسی پشكەكانی ئەسپ (لە جیهاددا)

**٢٨٦٣- ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ (لە دەستكەوتەكانی جیهاددا) دوو پشكی بۆ ئەسپ دادەنا، یەك پشكیش بۆ خاوەن ئەسپەكە، وە مالیك(ی كوڕی ئەنەس) دەڵێ: پشك دەدرێت بەئەسپ، ئێستریش جۆرێكە لە ئەسپ و مایین بە بەڵگەی ئەم ئایەتە: (وە ئەسپ و مایین و ئێستر و گوێدرێژ (ی بۆ دروست كردوون) تا سواریان بن)، وە پشك بەزیاتر لە یەك ئەسپ نادرێت[٢].**

## ٥٢- بابُ مَنْ قَادَ دَابَّةَ غَيْرِهِ فِي الحَرْبِ

٢٨٦٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا سَهْلُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ رَجُلٌ لِلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ: أَفَرَرْتُمْ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ؟ قَالَ: لَكِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَمْ يَفِرَّ، إِنَّ هَوَازِنَ كَانُوا قَوْمًا رُمَاةً، وَإِنَّا لَمَّا لَقِينَاهُمْ حَمَلْنَا عَلَيْهِمْ فَانْهَزَمُوا، فَأَقْبَلَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى الْغَنَائِمِ، وَاسْتَقْبَلُونَا بِالسِّهَامِ، فَأَمَّا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَلَمْ يَفِرَّ، فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ وَإِنَّهُ لَعَلَى بَغْلَتِهِ الْبَيْضَاءِ وَإِنَّ أَبَا سُفْيَانَ آخِذٌ بِلِجَامِهَا، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ:
"أَنَا النَّبِيُّ لاَ كَذِبْ ... أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ"[٣].

---

(١) بڕوانە: ٤٢٢٨.

(٢) واتە: ئەگەر كەسێك چەند ئەسپێكی لە جیهاددا بەشداربوون، تەنها پشكی یەك ئەسپی پێ دەدرێت.

(٣) بڕوانە: ٢٨٧٤، ٢٩٣٠، ٣٠٤٢، ٤٣١٥، ٤٣١٦، ٤٣١٧.

## ٥٢- باسی کەسێک لە جەنگدا ڕەشمەی وڵاخی کەسێکی تر ڕاکێشێت

٢٨٦٤- ئەبو ئیسحاق دەڵێ: پیاوێك بە بەرائی کوڕی عازیبی ﷺ وت: ئایا لە غەزای حونەیندا هەڵهاتن و پێغەمبەرتان ﷺ بەجێهێشت؟ بەڕا وتی: بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵنەهات، بەڕاستی هۆزی هەوازین کەسانێکی تیرهاوێژ بوون، وە ئێمە کە بەوان گەیشتین، هێرشمان بۆ بردن و شکان، ئینجا مسوڵمانان پەلاماری دەستکەوتەکانیان دا، هەوازینیش بەتیر هاوێشتن ڕووبەڕوومان بوونەوە، (مسوڵمانان شکان و هەڵهاتن)، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵنەهات و ڕای نەکرد، بێگومان پێغەمبەرم ﷺ دی بەسوار ئێسترە سپییەکەیەوە بوو، ئەبو سوفیانیش ڕەشمەی گرتبوو، پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: ((من پێغەمبەرم نەك درۆزن، من کوڕ(زا)ی عەبدولموتتەلیبم)).

## ٥٣- بَابُ الرِّكَابِ وَالْغَرْزِ لِلدَّابَّةِ

٢٨٦٥- حَدَّثَنِي عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ أَبِي أُسَامَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا أَدْخَلَ رِجْلَهُ فِي الغَرْزِ وَاسْتَوَتْ بِهِ نَاقَتُهُ قَائِمَةً، أَهَلَّ مِنْ عِنْدِ مَسْجِدِ ذِي الحُلَيْفَةِ[1].

## ٥٣- باسی ئاوزەنگی[2] بۆ وڵاخ

٢٨٦٥- ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە ئەو (پێغەمبەر ﷺ) کاتێك پێی دەخستە ئاوزەنگەکەوە و (سواری وشترەکەی دەبوو)، وشترەکەی

---

(١) بڕوانە: ١٦٦.

(٢) ووشەی (الرّکاب) و (الغَرْز) بەم جۆرانە مانایان لێکدراوەتەوە: (الرّکاب) ئاوزەنگە کە لە ئاسن و تەختە دروست کرابێ. (الغَرْز) تەنها لە پێست دروست دەکرێت، (الرّکاب والغَرْز) هەردووکیان یەک مانایان هەیە کە هاوزەنگە بەکوردی کە دوو ئاسنە بەراست و چەپی زینی ماینەوە ئەوەی سواری دەبێت پێی تێدەخات. مانایەکی تریان: (الرّکاب) بەهاوزەنگی ئەسپ و ماین دەوترێ و (الغَرْز)ـیش بەهاوزەنگی وشتر دەوترێت.(بڕوانە: إرشاد الساري:٣٥٨/٦)

هەڵدەستایەوەو ڕاست دەبوویەوە، لای مزگەوتی زولحولەیفە بەدەنگی بەرز تەلبیەی دەكرد (لبيك اللهم لبيك...).

## ٥٤- بابُ رُكُوبِ الفَرَسِ العُرْيِ

٢٨٦٦- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ: اسْتَقْبَلَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى فَرَسٍ عُرْيٍ، مَا عَلَيْهِ سَرْجٌ، فِي عُنُقِهِ سَيْفٌ[١].

## ٥٤- باسی سواربوونی ئەسپ بەپشتی ڕووتی

٢٨٦٦- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەرەو ڕوویان هات بەسوار ئەسپێكی ڕووت، زینی پێوە نەبوو، پێغەمبەر ﷺ (قایشی) شمشێرەكەی لە ملدابوو.

## ٥٥- بابُ الفَرَسِ القَطُوفِ

٢٨٦٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ أَهْلَ الْمَدِينَةِ فَزِعُوا مَرَّةً، فَرَكِبَ النَّبِيُّ ﷺ فَرَسًا لأَبِي طَلْحَةَ كَانَ يَقْطِفُ -أَوْ كَانَ فِيهِ قِطَافٌ- فَلَمَّا رَجَعَ قَالَ: "وَجَدْنَا فَرَسَكُمْ هَذَا بَحْرًا". فَكَانَ بَعْدَ ذَلِكَ لاَ يُجَارَى[٢].

## ٥٥- باسی ئەسپی هێواش لە غار و ڕۆیشتندا

٢٨٦٧- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە كە خەڵكی مەدینە جارێك ترسێكیان بۆ دروست بوو، پێغەمبەریش ﷺ سواری ئەسپێكی ئەبو تەڵحە بوو

(١) بڕوانە: ٢٦٢٧.

(٢) بڕوانە: ٢٦٢٧.

**كە هێواش غاری دەكرد -یان خێرا نەبوو لە غاركردندا-، (پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بەدەم دەنگ و باسی ترسەكەوە)، كە گەڕایەوە فەرمووی: ((ئەسپەكەتان خێرا و تیژە لە غاردا))، جا ئیتر بەوە بەدواوە هیچ ئەسپێك پێشی نەدەدایەوە (بەهۆی فەڕ و بەرەكەتی پێغەمبەرەوە ﷺ كە سواری بوو بوو).**

## ٥٦- بَابُ السَّبْقِ بَيْنَ الخَيْلِ

٢٨٦٨- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: أَجْرَى النَّبِيُّ ﷺ مَا ضُمِّرَ مِنَ الخَيْلِ مِنَ الحَفْيَاءِ إِلَى ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ، وَأَجْرَى مَا لَمْ يُضَمَّرْ مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ. قَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَكُنْتُ فِيمَنْ أَجْرَى. قَالَ عَبْدُ اللهِ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللهِ. قَالَ سُفْيَانُ: بَيْنَ الْحَفْيَاءِ إِلَى ثَنِيَّةِ الوَدَاعِ خَمْسَةُ أَمْيَالٍ أَوْ سِتَّةٌ، وَبَيْنَ ثَنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ مِيلٌ[١].

## ٥٦- باسی (ڕەوایەتی) پێشبڕكێ لە نێوان چەند ئەسپێكدا

**٢٨٦٨- نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێشبركێی سازدا لە حەیفائەوە تا (ثَنِيَّةِ الوَدَاعِ) لە نێوان ئەو ئەسپانەی لەڕو لاواز كرابوون، وە پێشبڕكێی سازدا لە (ثَنِيَّةِ الوَدَاعِ)ـەوە تا مزگەوتی بەنی زوڕەیق لە نێوان ئەو ئەسپانەی لەڕ نەكرابوون، ئیبنو عومەر وتی: من لەو كەسانە بووم بەشداری ئەو پێشبڕكێیەم كرد. عەبدوڵڵا دەڵێ: سوفیان بۆی گێڕاینەوە وتی: عوبەیدوڵڵا بۆی گێڕامەوە. سوفیان وتی:[٢] نێوانی حەیفاو (ثَنِيَّةِ الوَدَاعِ) پێنج یان شەش میل دەبێت، وە نێوان (ثَنِيَّةِ الوَدَاعِ) و مزگەوتی بەنی زوڕەیق یەك میلە.**

---

(١) بڕوانە: ٤٢٠.

(٢) مەبەستی بوخاری لە هێنانی ئەم سەنەدە ئەوەیە كە ڕوونی بكاتەوە كە سوفیان لە عەبدوڵڵای بیستووە بەڕوون و ڕاشكاوی (قال سوفيان حدثني عبدالله)، بەڵام لە گێڕانەوەكەی یەكەم دەڵێ: لە عەبدوڵڵاوە (عن عبدالله).

## ٥٧- بابُ إِضْمَارِ الخَيْلِ لِلسَّبْقِ

٢٨٦٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَابَقَ بَيْنَ الخَيْلِ الَّتِي لَمْ تُضَمَّرْ، وَكَانَ أَمَدُهَا مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ. وَأَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ سَابَقَ بِهَا. قَال أَبُو عَبْد اللهِ: أَمَدًا: غَايَةً ﴿فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ ﴿١٦﴾﴾ الحديد[1].

## ٥٧- باسی ئەسپی لەڕو لاوازکراو[2] بۆ پێشبڕکێ

**٢٨٦٩- نافیع دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشبڕکێیەکی سازدا لە نێوان ئەو ئەسپانەی لەڕنەکرابوون، ماوەکەی لە (ثَنِيَّةِ الوَدَاعِ)ـەوە تا مزگەوتی بەنی زوڕەیق بوو. (نافیع دەڵێ:) وە عەبدوڵڵا لەو کەسانەبوو کە بەشداری ئەو پێشبڕکێیەی کرد. ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: (أَمَدًا) ماوە و نێوانە وەك ئەم ئایەتە: ﴿فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ ﴿١٦﴾﴾ الحديد. واتە: ماوەیەکی دوور و درێژیان بەسەردا تێپەڕی.**

## ٥٨- بابُ غَايَةِ السَّبْقِ لِلْخَيْلِ الْمُضَمَّرَةِ

٢٨٧٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَابَقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ الخَيْلِ الَّتِي قَدْ أُضْمِرَتْ فَأَرْسَلَهَا مِنَ الْحَفْيَاءِ، وَكَانَ أَمَدُهَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ -فَقُلْتُ لِمُوسَى: فَكَمْ كَانَ بَيْنَ ذَلِكَ؟ قَالَ سِتَّةُ أَمْيَالٍ أَوْ سَبْعَةٌ- وَسَابَقَ بَيْنَ الخَيْلِ الَّتِي لَمْ تُضَمَّرْ، فَأَرْسَلَهَا مِنْ ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ، وَكَانَ أَمَدُهَا مَسْجِدَ بَنِي زُرَيْقٍ، قُلْتُ: فَكَمْ بَيْنَ ذَلِكَ؟ قَالَ: مِيلٌ أَوْ نَحْوُهُ. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ مِمَّنْ سَابَقَ فِيهَا[3].

---

(١) بڕوانە: ٤٢٠.

(٢) لە پەراوێزی فەرموودەی (٤٢٠)ـدا (ضَمر وإضمار)مان ڕوون کردۆتەوە.

(٣) بڕوانە: ٤٢٠.

## ٥٨- باسی پێشبڕکێی ئەسپە لەڕکراوەکان تا کوێ بوو

**٢٨٧٠- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێشبڕکێی سازدا لە نێوان ئەو ئەسپانەی لەڕکرابوون، جا لە حەفیائەوە ڕێگەی دان و بەڕەڵای کردن (غاردەن)، کۆتاییەکەی (ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ) بوو، (ئەبو ئیسحاق دەڵێ:) -بە مووسام وت: نێوانیان چەند بوو؟ وتی: شەش یان حەوت میل بوو-، وە پێغەمبەر ﷺ پێشبڕکێی سازدا لە نێوان ئەو ئەسپانەی لەڕ نەکرابوون لە (ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ)ەوە بەڕەڵای کردن (غاردەن)، ماوەکەی تا مزگەوتی بەنی زورەیق بوو، ( ئەبو ئیسحاق دەڵێ:) وتم: ئەی نێوانی ئەوە چەند بوو؟ (مووسا) وتی: میلێك یان نزیك بەمیلێك بوو، (نافیع دەڵێ:) وە ئیبنوعومەر لەو کەسانە بوو لەو پێشبڕکێیەدا بەشداری کرد.**

## ٥٩- بابُ نَاقَةِ النَّبِيِّ ﷺ

قَالَ ابْنُ عُمَرَ أَرْدَفَ النَّبِيُّ ﷺ أُسَامَةَ عَلَى الْقَصْوَاءِ. وَقَالَ الْمِسْوَرُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مَا خَلأَتِ الْقَصْوَاءُ".

**٢٨٧١-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ يَقُولُ: كَانَتْ نَاقَةُ النَّبِيِّ ﷺ يُقَالُ لَهَا: العَضْبَاءُ[1].

## ٥٩- باسی وشترە مێینەکەی پێغەمبەر ﷺ

**ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئوسامەی لە پاشکۆی خۆیدا سواری قەصوا[1] کرد. میسوەر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قەصوا (لە خۆیەوە) نەوەستاوە لە ڕۆیشتن)). (واتە: دیارە فەرمانی پێکراوە).**

---

(١) بڕوانە: ٢٨٧٢.

**٢٨٧١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وشترە مێینەیەکی هەبوو پێی دەوترا: (العَضْبَاءُ).**

٢٨٧٢- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ نَاقَةٌ تُسَمَّى الْعَضْبَاءَ لاَ تُسْبَقُ -قَالَ حُمَيْدٌ: أَوْ لاَ تَكَادُ تُسْبَقُ- فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ عَلَى قَعُودٍ فَسَبَقَهَا، فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، حَتَّى عَرَفَهُ، فَقَالَ: "حَقٌّ عَلَى اللهِ أَنْ لاَ يَرْتَفِعَ شَيْءٌ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ وَضَعَهُ". طَوَّلَهُ مُوسَى عَنْ حَمَّادٍ عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[٢].

**٢٨٧٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وشترە مێینەیەکی هەبوو ناوی (العَضْبَاءُ) بوو، هیچ وشترێك پێشی نەدەکەوت، -حومەید دەڵێ: یان وڵاخ نەبوو پێشی بکەوێ-، ئینجا دەشتەکییەك بەسواری وشترێکی چالاك هات و پێشی (العَضْبَاء)ی دایەوە، ئەو پێشکەوتنە لەسەر دڵی مسوڵمانان گران بوو، بەجۆرێك بوو هەتا پێغەمبەر ﷺ زانی و هەستی پێ کرد و فەرمووی: ((ڕەوایە و بەڵێنە لەسەر خوا هەر شتێك لەم دونیایە بەرز بێتەوە، خوا نزمی دەکاتەوە)). مووسا لە حەممادەوە لە سابیتەوە لە ئەنەسەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم فەرموودەی بەدرێژتر هێناوە.**

## ٦٠- بابُ الغَزْوِ عَلَى الحَمِيرِ

## ٦١- بابُ بَغْلَةِ النَّبِيِّ ﷺ البَيْضَاءِ قالَهُ أنَسٌ

وَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: أَهْدَى مَلِكُ أَيْلَةَ إِلى النبِي ﷺ بَغْلَةً بَيْضَاءَ.

٢٨٧٣- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ الحَارِثِ قَالَ: مَا تَرَكَ النَّبِيُّ ﷺ إِلاَّ بَغْلَتَهُ الْبَيْضَاءَ وَسِلاَحَهُ وَأَرْضًا تَرَكَهَا صَدَقَةً[٣].

---

(١) قەصوا: ناوی وشترێکی مێینەی پێغەمبەرە ﷺ.

(٢) بڕوانە: ٢٨٧١.

(٣) بڕوانە: ٢٧٣٩.

## ٦٠- باسی غەزاكردن بەسواری گوێدرێژ[1]

## ٦١- باسی ئێستره ماچەی سپییەكەی پێغەمبەر ﷺ كە ئەنەس وای وتوە[2]

**ئەبو حومەید دەڵێ: پادشای ئەیلە ئێسترێكی ماچەی سپی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ.**

**٢٨٧٣- عەمری كوڕی حاریس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەدوای خۆی هیچ كە لە پورێكی لێ بەجێ نەما، جگە لە ئێسترێكی ماچەی سپی و شمشێرەكەی، وە زەوییەكی لێ بەجێما كە كردی بەخێر.**

٢٨٧٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا أَبَا عُمَارَةَ، وَلَّيْتُمْ يَوْمَ حُنَيْنٍ؟ قَالَ: لاَ، وَاللهِ مَا وَلَّى النَّبِيُّ ﷺ وَلَكِنْ وَلَّى سَرَعَانُ النَّاسِ، فَلَقِيَهُمْ هَوَازِنُ بِالنَّبْلِ وَالنَّبِيُّ ﷺ عَلَى بَغْلَتِهِ الْبَيْضَاءِ، وَأَبُو سُفْيَانَ بْنُ الحَارِثِ آخِذٌ بِلِجَامِهَا، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: "أَنَا النَّبِيُّ لاَ كَذِبْ، أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ"[3].

**٢٨٧٤- ئەبو ئیسحاق دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێك بە بەرائی كوڕی عازیبی وت: ئەی ئەبو عومارە! ڕۆژی (غەزای) حونەین پشتتان هەڵكرد و هەڵهاتن؟ بەرا وتی: نا سوێند بەخوا پێغەمبەر ﷺ هەڵنەهات، بەڵكو ئەو كەسانە هەڵهاتن كە پەلەی جەنگیان بوو، جا هۆزی هەوازین بەتیر هاویشتن ڕووبەڕوویان بوونەوە، پێغەمبەریش ﷺ بەسواری ئێستره ماچە سپییەكەیەوە بوو، ئەبو سوفیانی كوڕی حاریسیش ڕەشمەی ئێسترەكەی گرتبوو، پێغەمبەریش دەیفەرموو: ((من پێغەمبەرم نەك درۆزن، من كوڕ(ەزا)ی عەبدولموتتەلیبم)).**

---

(١) بوخاری هیچ فەرموودەیەكی نەهێناوە لەوانەوە بیستبێتی، فەرموودەكەی موعاز: ٢٨٥٦ ئەم فەرموودە بەسەنەدێكی كە بهێنێت.

(٢) لە فەرموودەیەكی درێژدا لەباسی غەزای حونەیندا دەیگێڕێتەوە.

(٣) بڕوانە: ٢٨٦٤.

## ٦٢- بابُ جِهَادِ النِّسَاءِ

٢٨٧٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂ قَالَتِ: اسْتَأْذَنْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي الجِهَادِ. فَقَالَ: "جِهَادُكُنَّ الْحَجُّ". وَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الوَلِيدِ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بِهَذَا[1].

## ٦٢- باسی خەباتی ئافرەتان

**٢٨٧٥- عائیشەی دایکی باوەڕداران ﵂ دەڵێ: داوای مۆڵەتم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی خەباتکردن (ی ئافرەتان)، فەرمووی: ((خەباتکردنی ئێوە حەجکردنە)). عەبدوڵلای کوڕی وەلید دەڵێ: سوفیان لە موعاوییەوە[2] ئەم فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە.**

٢٨٧٦- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بِهَذَا. وَعَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ سَأَلَهُ نِسَاؤُهُ عَنِ الجِهَادِ فَقَالَ: "نِعْمَ الْجِهَادُ الْحَجُّ"[3].

**٢٨٧٦- عائیشەی دایکی باوەڕداران ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە خێزانەکانی دەربارەی جیهاد(ی ئافرەتان) پرسیاریان لێ کرد، ئەویش فەرمووی: ((حەجکردن چاکترین جیهاد و خەباتە (بۆ ئافرەتان) )).**

---

(١) بڕوانە: ١٥٢٠.

(٢) بەم سەنەدەش فەرموودەکە گێڕدراوەتەوە.

(٣) بڕوانە: ١٥٢٠.

## ٦٣- بابُ غَزْوِ المَرْأَةِ فِي البَحْرِ

٢٨٧٧- ٢٨٧٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ يَقُولُ: دَخَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى ابْنَةِ مِلْحَانَ فَاتَّكَأَ عِنْدَهَا، ثُمَّ ضَحِكَ فَقَالَتْ: لِمَ تَضْحَكُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ: "نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي يَرْكَبُونَ البَحْرَ الأَخْضَرَ فِي سَبِيلِ اللهِ، مَثَلُهُمْ مَثَلُ الْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ". فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. قَالَ: "اللَّهُمَّ اجْعَلْهَا مِنْهُمْ". ثُمَّ عَادَ فَضَحِكَ، فَقَالَتْ لَهُ: مِثْلَ -أَوْ مِمَّ- ذَلِكَ، فَقَالَ لَهَا: مِثْلَ ذَلِكَ، فَقَالَتِ: ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. قَالَ: "أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ، وَلَسْتِ مِنَ الآخِرِينَ". قَالَ: قَالَ أَنَسٌ فَتَزَوَّجَتْ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ، فَرَكِبَتِ البَحْرَ مَعَ بِنْتِ قَرَظَةَ، فَلَمَّا قَفَلَتْ رَكِبَتْ دَابَّتَهَا فَوَقَصَتْ بِهَا، فَسَقَطَتْ عَنْهَا فَمَاتَتْ[1].

## ٦٣- باسی غەزاکردنی ئافرەت لە دەریادا

**٢٨٧٧- ٢٨٧٨- عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕەحمانی ئەنصاری دەڵێ: لە ئەنەسم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ ماڵی کچی میلحان، جا پێغەمبەر ﷺ لە لایدا پاڵیدایەوە، پاشان (خەوت، لە خەو هەستا و) پێدەکەنی، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ پێدەکەنیت؟ فەرمووی: ((کەسانێك لەئوممەتەکەمم (نیشاندرا) سواری (کەشتی دەبن) لەدەریای سەوزدا، لەڕێی خوادا خەبات دەکەن، نموونەیان دەڵێی پادشان لەسەر تەختی پادشایی دانیشتوون))، ئوممو حەڕام وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! نزام بۆ بکە لای خوا کە من لەو خەباتکارانە بم، پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: ((خوایە بیکە بەیەکێك لەو خەباتکارانە)). پاشان (خەوتن و خەبەربوونەوەکەی) دووبارەکردەوە و پێکەنی،**

---

(١) بڕوانە: ٢٧٨٨، ٢٧٨٩.

ئوممو حەڕامیش وێنەی وتەکەی پێشووی عەرز کرد -یان وتی: ئەوە لەبەر چی بوو؟- پێغەمبەریش ﷺ وێنەی فەرمایشتەکەی پێشووی فەرموو پێی، ئوممو حەڕام وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! نزام بۆ بکە لای خوا کە من لەو خەباتکارانە بم، فەرمووی: ((تۆ لەیەکەمینەکانیت، نەك کۆتاهەمینەکان))، عەبدوڵڵا وتی: ئەنەس وتی: جا (ئوممو حەڕامی کچی میلحان) شووی کرد بەعوبادەی کوڕی صامیت، ئینجا لەگەڵ کچی قەرەزەدا سواری کەشتی بوو لە دەریادا (بۆ خەباتکردن لەڕێی خوادا)، جا کاتێك گەڕایەوە، سواری ولاخەکەی بوو خستیە خوارەوە، ملی شکاند و مرد.

## ٦٤- بابُ حَمْلِ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ فِي الْغَزْوِ دُونَ بَعْضِ نِسَائِه

٢٨٧٩- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ النُّمَيْرِيُّ، حَدَّثَنَا يُونُسُ قَالَ: سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ قَالَ: سَمِعْتُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَسَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَعَلْقَمَةَ بْنَ وَقَّاصٍ، وَعُبَيْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ اللهِ عَنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ، كُلٌّ حَدَّثَنِي طَائِفَةً مِنَ الحَدِيثِ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ يَخْرُجُ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ، فَأَقْرَعَ بَيْنَنَا فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا، فَخَرَجَ فِيهَا سَهْمِي، فَخَرَجْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بَعْدَ مَا أُنْزِلَ الحِجَابُ[1].

## ٦٤- باسی پیاو لە غەزادا هاوسەرێکی لەگەڵ خۆیدا ببات جگە لە هاوسەرەکانی تری

٢٨٧٩- زوهری دەڵێ: فەرموودەکەی عائیشەم ﵂ بیست لەهەریەك لە: عورووەی کوڕی زوبەیر، سەعیدی کوڕی موسەییەب، عەلقەمەی کوڕی وەققاص،

(١) بڕوانە: ٢٥٩٣.

عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلاوە هەریەکەیان بەشێك لەفەرموودەکەیان بۆ گێڕامەوە، عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیویستایە دەربچێ (بۆ غەزا) تیروپشکی دەکرد لە نێوان هاوسەرەکانیدا، جا تیروپشکەکە بۆ هەرکامیان دەربچوایە، پێغەمبەر ﷺ ئەوەیانی لەگەڵ خۆی دەبرد، ئینجا لە غەزایەکدا کە کردی تیروپشکی کرد لە نێوانماندا، تیروپشکەکە بۆ من دەرچوو، منیش لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ڕۆیشتم، پاش ئەوەی ئایەتی حیجاب دابەزیبوو.

## ٦٥- بابُ غَزْوِ النِّسَاءِ وَقِتَالِهِنَّ مَعَ الرِّجَالِ

٢٨٨٠- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ انْهَزَمَ النَّاسُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: وَلَقَدْ رَأَيْتُ عَائِشَةَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ وَأُمَّ سُلَيْمٍ وَإِنَّهُمَا لَمُشَمِّرَتَانِ أَرَى خَدَمَ سُوقِهِمَا، تَنْقُزَانِ الْقِرَبَ -وَقَالَ غَيْرُهُ: تَنْقُلاَنِ القِرَبَ- عَلَى مُتُونِهِمَا، ثُمَّ تُفْرِغَانِهِ فِي أَفْوَاهِ الْقَوْمِ، ثُمَّ تَرْجِعَانِ فَتَمْلآنِهَا، ثُمَّ تَجِيئَانِ فَتُفْرِغَانِهَا فِي أَفْوَاهِ القَوْمِ[1].

## ٦٥- باسی غەزاکردنی ئافرەتان و جەنگکردنیان لەگەڵ پیاواندا[2]

٢٨٨٠- ئەنەس دەڵێ: لە کاتی ڕۆژی جەنگی ئوحوددا مسوڵمانان شکان و پێغەمبەریان ﷺ بەجێهێشت، ئەنەس دەڵێ: بێگومان عائیشەی کچی ئەبو بەکر و ئوممو سولەیمم دی خۆیان هەڵکردبوو پاوانەکانی لەپێیاندا بوو، دەمبینی بەپەلە کوندەی ئاویان دەهێناو دەبرد بەکۆڵیانەوە، پاشان کوندەکانیان خاڵی دەکرد بەدانی بەدەم پیاوەکانەوە (بیخۆنەوە)، پاشان دەگەڕانەوە کوندەکانیان پڕدەکردەوە، پاشان دەهاتنەوە و خاڵیان دەکردنەوە بەدانی بەدەم پیاوەکانەوە (بیخۆنەوە).

(١) بڕوانە: ٢٩٠٢، ٣٨١١، ٤٠٦٤.

(٢) واتە: ئافرەتان بەشداربوون لە غەزادا و هاوکاری پیاوانی موسڵمان بوون لە جەنگەکەدا.

## ٦٦- بابُ حَمْلِ النِّسَاءِ القِرَبَ إلى النَّاسِ في الغَزْوِ

٢٨٨١- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ ثَعْلَبَةُ بْنُ أَبِي مَالِكٍ: إِنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَسَمَ مُرُوطًا بَيْنَ نِسَاءٍ مِنْ نِسَاءِ الْمَدِينَةِ، فَبَقِيَ مِرْطٌ جَيِّدٌ فَقَالَ لَهُ بَعْضُ مَنْ عِنْدَهُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَعْطِ هَذَا ابْنَةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ التِي عِنْدَكَ. يُرِيدُونَ أُمَّ كُلْثُومٍ بِنْتَ عَلِيٍّ. فَقَالَ عُمَرُ: أُمُّ سَلِيطٍ أَحَقُّ. وَأُمُّ سَلِيطٍ مِنْ نِسَاءِ الأَنْصَارِ، مِمَّنْ بَايَعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ. قَالَ عُمَرُ: فَإِنَّهَا كَانَتْ تَزْفِرُ لَنَا الْقِرَبَ يَوْمَ أُحُدٍ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: تَزْفِرُ: تَخِيطُ[1].

## ٦٦- باسی كوندەی ئاوهەڵگرتنی ئافرەتان لە غەزادا و بردنی بۆ خەڵك (بیخۆنەوە)

**٢٨٨١- سەعلەبەی كوڕی ئەبو مالیك دەگێڕێتەوە كە عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ چەند شاڵینەیەكی دابەشكرد لە نێوان ئافرەتانی (شاری) مەدینەدا، (لە كۆتاییدا) شاڵینەیەكی[2] چاكیان مابۆوە، كەسێك كە لای عومەردا بوو بەعومەری وت: ئەی پێشەوای باوەڕداران! ئەم شاڵینەیان بدە بەو كچە(مزا)یەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە خێزانی خۆتە (مەبەستی ئوممو كەلسومی كچی عەلی بوو)، عومەریش وتی: ئوممو سەلیت شایستەترە، ئوممو سەلیت لەو ئافرەتانەی ئەنصاری بوو كە پەیمانی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا، عومەر وتی: بێگومان ئوممو سەلیت كوندەی ئاوی بۆمان دەدوری[3] لە ڕۆژی (غەزای) ئوحوددا. ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: (تَزْفِرُ) واتە: دەیدووری.**

---

(١) بڕوانە: ٤٠٧١.

(٢) شاڵینە: چەپاڵێكی چوارگۆشەی خورییە، قوماشێكی چوارگۆشەیە لە خوری. بڕوانە : فەرهەنگی خاڵ :٣٦٠، هەنبانە بۆرینەی هەژار موكریانی: ٤٦٥.

(٣) تزفرَ: بوخاری بەدوورینی كوندەی مانا كردووە، بەمانای هەڵگرتنی كوندەی ئاو بۆ خەباتگێڕانیش ماناكراوە، ئەم مانای دووەمیان گونجاوترە، بەڵام ئێمە لەبەر وتەكەی بوخاری مانای یەكەممان بۆ كردووە.

## ٦٧- بابُ مُدَاوَاةِ النِّسَاءِ الجَرْحَى فِي الغَزْوِ

٢٨٨٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ ذَكْوَانَ، عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ قَالَتْ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ نَسْقِي وَنُدَاوِي الجَرْحَى، وَنَرُدُّ القَتْلَى إِلَى المَدِينَةِ[1].

## ٦٧- باسی ئافرەتان و تیمارکردنی برینداران لە غەزادا

**٢٨٨٢- ڕوبەیعی کچی موعەوویز ﵂ دەڵێ: ئێمە (ی ئافرەتان) لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ (دەرۆیشتین بۆ غەزا) ئاومان دەدا بەخەباتگێڕەکان، تیماری بریندارەکانمان دەکردو شەهیدەکانمان دەبردەوە بۆ مەدینە.**

## ٦٨- بابُ رَدِّ النِّسَاءِ الجَرْحَى وَالْقَتْلَى

٢٨٨٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ المُفَضَّلِ، عَنْ خَالِدِ بْنِ ذَكْوَانَ، عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ قَالَتْ: كُنَّا نَغْزُو مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَنَسْقِي الْقَوْمَ وَنَخْدُمُهُمْ، وَنَرُدُّ الجَرْحَى وَالْقَتْلَى إِلَى المَدِينَةِ[2].

## ٦٨- باسی بردنەوەی بریندار و شەهیدەکان لەلایەن ئافرەتانەوە (بۆ مەدینە)

**٢٨٨٣- ڕوبەیعی کچی موعەوویز ﵂ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ غەزامان دەکردو ئاومان دەدا بەخەڵکەکەو خزمەتمان دەکردن، وە بریندار و شەهیدەکانمان دەبردەوە بۆ مەدینە.**

---

(١) بڕوانە: ٢٨٨٣، ٥٦٧٩.

(٢) بڕوانە: ٢٨٨٢.

## ٦٩- بابُ نَزْعِ السَّهْمِ مِنَ البَدَنِ

٢٨٨٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه قَالَ: رُمِيَ أَبُو عَامِرٍ فِي رُكْبَتِهِ، فَانْتَهَيْتُ إِلَيْهِ، قَالَ: انْزِعْ هَذَا السَّهْمَ. فَنَزَعْتُهُ، فَنَزَا مِنْهُ الْمَاءُ، فَدَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: "اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعُبَيْدٍ أَبِي عَامِرٍ"[1].

## ٦٩- باسی دەرهێنانی تیر لەلاشە و بەدەن (دروستە)

**٢٨٨٤- ئەبو مووسا رضي الله عنه دەڵێ: ئەبو عامیر تیرێك دابووی لە ئەژنۆی، منیش گەیشتمە لای، وتی: ئەو تیرە دەربێنە، منیش دەرم هێنا، جا ئاوی لێهات، منیش چوومە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەم پێدا، ئەویش فەرمووی: ((خوایە! لە عوبەید (واتە:) ئەبو عامیر خۆشبە)).**

## ٧٠- بابُ الحِرَاسَةِ فِي الغَزْوِ فِي سَبِيلِ اللهِ

٢٨٨٥- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ خَلِيلٍ، أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ رضي الله عنها تَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ سَهِرَ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ قَالَ: "لَيْتَ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِي صَالِحًا يَحْرُسُنِي اللَّيْلَةَ". إِذْ سَمِعْنَا صَوْتَ سِلاَحٍ فَقَالَ: "مَنْ هَذَا؟ ". فَقَالَ: أَنَا سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، جِئْتُ لأَحْرُسَكَ. وَنَامَ النَّبِيُّ ﷺ[2].

---

(١) بڕوانە: ٤٣٢٣، ٦٣٨٣.

(٢) بڕوانە: ٧٢٣١.

## ٧٠- باسی (گەورەیی) ئێشکگرتن لە غەزا لەپێناوی خوادا

**٢٨٨٥- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شەو نەدەخەوت، جا کاتێك کۆچی کرد بۆ مەدینە فەرمووی: ((خۆزگە ئەمشەو پیاوێکی چاك لە هاوەڵانم ئێشکی بگرتایە بۆ پارێزگاریم))، لەپڕ گوێمان لە دەنگی چەك بوو، فەرمووی: ((تۆ کێیت؟)) وتی: من سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصم، هاتووم ئێشکی تۆ بگرم، ئیتر پێغەمبەر ﷺ خەوت.**

٢٨٨٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا أَبُو بَكْرٍ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ وَالْقَطِيفَةِ وَالْخَمِيصَةِ، إِنْ أُعْطِيَ رَضِيَ، وَإِنْ لَمْ يُعْطَ لَمْ يَرْضَ". لَمْ يَرْفَعْهُ إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ[١].

**٢٨٨٦- ئەبو هوڕەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((سەرشۆڕ و بەد بەخت بێ بەندەی دینار و درهەم و قەدیفە و قوماش[٢]، ئەگەر پێیدرا ڕازی دەبێت، وە ئەگەر پێینەدرا ڕازی نابێت)). ئیسرائیل لە ئەبو حوصەینەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و نەیبردۆتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ.**

٢٨٨٧- وَزَادَنَا عَمْرٌو قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ وَعَبْدُ الدِّرْهَمِ وَعَبْدُ الْخَمِيصَةِ، إِنْ أُعْطِيَ رَضِيَ، وَإِنْ لَمْ يُعْطَ سَخِطَ، تَعِسَ وَانْتَكَسَ، وَإِذَا شِيكَ فَلاَ انْتَقَشَ، طُوبَى لِعَبْدٍ آخِذٍ بِعِنَانِ فَرَسِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَشْعَثَ رَأْسُهُ، مُغْبَرَّةٍ قَدَمَاهُ، إِنْ كَانَ فِي الحِرَاسَةِ كَانَ فِي الحِرَاسَةِ، وَإِنْ كَانَ فِي السَّاقَةِ كَانَ فِي السَّاقَةِ، إِنِ اسْتَأْذَنَ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ،

(١) بروانە: ٢٨٨٧، ٦٤٣٥.

(٢) الخميصة: قوماشێکی خوری ڕەشی خەتخەتی چوارگۆشەیە وەک کۆڵەوانەی ئافرەتان.

وَإِنْ شَفَعَ لَمْ يُشَفَّعْ". قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ لَمْ يَرْفَعْهُ إِسْرَائِيلُ وَمُحَمَّدُ بْنُ جُحَادَةَ عَنْ أَبِي حَصِينٍ وَقَالَ تَعْسًا. كَأَنَّهُ يَقُولُ فَأَتْعَسَهُمُ اللهُ. طُوبَى: فُعْلَى مِنْ كُلِّ شَيْءٍ طَيِّبٍ، وَهْيَ يَاءٌ حُوِّلَتْ إِلَى الوَاوِ، وَهْيَ مِنْ يَطِيبُ[1].

**٢٨٨٧- عەمرٍ ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە بۆمان بەدرێژتر و زیادەوە دەڵێ: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی دینار بۆی گێڕاینەوە لە باوکیەوە، لە ئەبو صالیحەوە، لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((سەرشۆڕو چارەڕەش بێ بەندەی دینار و بەندەی درهەم و بەندەی پەڕۆوپاڵ، ئەگەر بەشی درا ڕازی دەبێ، ئەگەر بەشی نەدرا ڕازی نابێت و ڕقی هەڵدەسێت، لەناوچێت و دەردەدار بێت، گەر دڕکێکی پیاچوو بە مووکێشیش دەرنەیەتەوە، خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی جڵەوی ئەسپەکەی دەگرێ لە جیهاد لە پێناوی خوادا، قژی سەری ئاڵۆسکاوە، پێیەکانی تۆزاوی بوون، ئەگەر لە پاسەوانیدا بوو ئەوە پاسەوانی دەگرێ، وە ئەگەر لەدوای لەشکرەوە بوو ئەوە لەدواوە دەبێت (و کارێك کە پێی سپێردراوە ئەنجامی دەدات)، ئەگەر داوای مۆڵەت بکات مۆڵەتی نادرێت، وە ئەگەر تکا بکات تکای وەرناگیرێت)). ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: لە ئیسرائیل و موحەممەدی کوڕی جوحادەوە لە ئەبو حەصینەوە نەیانبردۆتە سەر پێغەمبەر ﷺ. هەروەها وتویەتی: (تَعْسًا) وەك ئەوەی بڵێ خوا سەرشۆڕی کردوون. وە (طُوبَى) لەسەر وەزنی (فُعْلَى)یە، لە هەموو شتێکدا بەچاك و باشەی دەوترێت، واوی (طُوبَى) یا بووە و گۆڕاوە بۆ واو، ئەسڵی (طُوبَى) (طَاب يَطِيبُ) بووە.**

---

(١) بڕوانە: ٢٨٨٦.

## ٧١- بابُ فَضْلِ الخِدْمَةِ فِي الغَزْوِ

٢٨٨٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ يُونُسَ بْنِ عُبَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ البُنَانِي، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: صَحِبْتُ جَرِيرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، فَكَانَ يَخْدُمُنِي. وَهْوَ أَكْبَرُ مِنْ أَنَسٍ، قَالَ جَرِيرٌ: إِنِّي رَأَيْتُ الأَنْصَارَ يَصْنَعُونَ شَيْئًا لاَ أَجِدُ أَحَدًا مِنْهُمْ إِلاَّ أَكْرَمْتُهُ.

## ٧١- باسی گەورەیی خزمەتكردن لە غەزا و تێكۆشاندا

**٢٨٨٨- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: (لە سەفەردا) هاوڕێیەتی جەریری كوڕی عەبدوڵلام كردووە، ئەو خزمەتی منی دەكرد كە لە ئەنەسیش بەتەمەنتر بوو، جەریر دەڵێ: بەڕاستی من ئەنصارییەكانم دەبینی كارێكیان دەكرد (لە ڕێزگرتنی پێغەمبەردا ﷺ) بۆیە هەركامیانم ببینیبێ ڕێزم گرتوە.**

٢٨٨٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو -مَوْلَى الْمُطَّلِبِ بْنِ حَنْطَبٍ - أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِلَى خَيْبَرَ أَخْدُمُهُ، فَلَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ رَاجِعًا، وَبَدَا لَهُ أُحُدٌ قَالَ: "هَذَا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ". ثُمَّ أَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ قَالَ: "اللَّهُمَّ إِنِّي أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا كَتَحْرِيمِ إِبْرَاهِيمَ مَكَّةَ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا وَمُدِّنَا"[١].

**٢٨٨٩- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچووین بۆ (غەزای) خەیبەر خزمەتیم دەكرد، جا كاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتەوە، لە گەڕانەوەدا كێوی ئوحودی لێوە دەركەوت، فەرمووی: ((ئەوە شاخێكە ئێمەی خۆش دەوێ و ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ))، پاشان بەدەستی ئاماژەی**

(١) بڕوانە: ٣٧١.

**کرد بۆ (شاری) مەدینە و فەرمووی: خودایە! من نێوانی هەردوو بەردەڵانە ڕەشەکە(ی مەدینە) حەڕام و یاساغ دەکەم، وەك حەڕام کردنی ئیبراهیم ﷺ بۆ مەککە، خوایە فەڕ و بەرەکەت بخەیتە مەن و مشتمانەوە[1])).**

٢٨٩٠- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ أَبُو الرَّبِيعِ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ زَكَرِيَّاءَ، حَدَّثَنَا عَاصِمٌ، عَنْ مُوَرِّقٍ العِجْلِيِّ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ أَكْثَرُنَا ظِلاًّ الذِي يَسْتَظِلُّ بِكِسَائِهِ، وَأَمَّا الَّذِينَ صَامُوا فَلَمْ يَعْمَلُوا شَيْئًا، وَأَمَّا الَّذِينَ أَفْطَرُوا فَبَعَثُوا الرِّكَابَ وَامْتَهَنُوا وَعَالَجُوا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ اليَوْمَ بِالأَجْرِ".

**٢٨٩٠- ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئێمە (لە سەفەرێکدا) لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، ئەوەمان سێبەری زۆری هەبوو ئەوە بوو کە عەباکەی کردبوو بەسێبەر، جا ئەوانەی بەڕۆژووبوون هیچیان نەکرد، بەڵام ئەوانەی بەڕۆژوو نەبوون وشترەکانیان برد بۆ ئاودان و لەوەڕاندن، وە ئیش و کاریان دەکرد و خزمەتیان دەکرد، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەمڕۆ بەڕۆژوونەبوان پاداشتی تەواویان برد بۆ خۆیان)).**

## ٧٢- بابُ فَضْلِ مَنْ حَمَلَ مَتَاعَ صَاحِبِهِ فِي السَّفَرِ

٢٨٩١- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "كُلُّ سُلاَمَى عَلَيْهِ صَدَقَةٌ كُلَّ يَوْمٍ، يُعِينُ الرَّجُلَ فِي دَابَّتِهِ يُحَامِلُهُ عَلَيْهَا أَوْ يَرْفَعُ عَلَيْهَا مَتَاعَهُ صَدَقَةٌ، وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ، وَكُلُّ خَطْوَةٍ يَمْشِيهَا إِلَى الصَّلاَةِ صَدَقَةٌ، وَدَلُّ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ"[2].

---

(١) صاع و مُدّ: واتە: مەن و مشت، کە دوو ئەندازەی ڕزق و ڕۆزی پێوانن، مەبەستی لەم بەشەی فەرموودەکە داواکردنی بەرەکەتی ڕزق و ڕۆزییە بۆ خەڵکی مەدینە.

(٢) بڕوانە: ٢٧٠٧.

## ٧٢- باسی گەورەیی پاداشتی ئەو کەسەی لە سەفەردا کەل و پەلی هاوڕێکەی هەڵگرتووە

٢٨٩١- ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەموو جومگەکان(ی مرۆڤ) هەموو ڕۆژێك لەسەریەتی خێر و چاکەیەك بکات: یارمەتی کەسێك بدات سواری وڵاخەکەی بکات، یان کەل و پەلەکەی بەرزبکاتەوە و بیخاتە سەر پشتی وڵاخەکەی خێر و چاکەیە، قسەی جوان و شیرین (لەگەڵ خەڵکیدا) خێر و چاکەیە، هەر هەنگاوێك دەینێت لە ڕۆیشتن بۆ نوێژ (بۆ مزگەوت) خێرو چاکەیە، ڕێگا نیشاندان (بۆ کەسێك ڕێگاکە نازانێت) خێر و چاکەیە)).

## ٧٣- بابُ فَضْلِ رِبَاطِ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ

وَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ ﴿٢٠٠﴾ ﴾ آل عمران.

٢٨٩٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُنِيرٍ، سَمِعَ أَبَا النَّضْرِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا، وَمَوْضِعُ سَوْطِ أَحَدِكُمْ مِنَ الجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا، وَالرَّوْحَةُ يَرُوحُهَا الْعَبْدُ فِي سَبِيلِ اللهِ أَوِ الْغَدْوَةُ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا"[١].

## ٧٣- باسی فەزڵ و گەورەیی ئێشکگرتن ڕۆژێک لە خەبات لەڕێی خوادا

هەروەها باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆگربن، لە خۆگری دوژمن خۆگرتر بن، وە لە سەنگەردا ئێشك بگرن).

---

(١) بڕوانە: ٢٧٩٤.

**٢٨٩٢- سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئێشکگرتنی یەك ڕۆژ لە پێناو خوادا (لە سنوورەکانی وڵاتی ئیسلامیدا)، لە دونیا و هەموو ئەوەی لە دونیادا هەیە چاکترە، وە جێگای قامچی کەسێکتان لە بەهەشتدا لە دونیا و هەموو ئەوەی لە دونیادایە چاکترە، وە دەرچوونێکی سەر لە ئێواران بۆ تێکۆشان لەڕێی خوا یان دەرچوونێکی بەیانیان لەڕێی خوادا لە دونیاو هەمووی ئەوەی تێیدایە چاکترە)).**

## ٧٤- بابُ مَنْ غَزَا بِصَبِي لِلْخِدْمَةِ

٢٨٩٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لأَبِي طَلْحَةَ: "الْتَمِسْ غُلاَمًا مِنْ غِلْمَانِكُمْ يَخْدُمُنِي حَتَّى أَخْرُجَ إِلَى خَيْبَرَ". فَخَرَجَ بِي أَبُو طَلْحَةَ مُرْدِفِي، وَأَنَا غُلاَمٌ رَاهَقْتُ الحُلُمَ، فَكُنْتُ أَخْدُمُ رَسُولَ اللهِ ﷺ إِذَا نَزَلَ، فَكُنْتُ أَسْمَعُهُ كَثِيرًا يَقُولُ: "اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الهَمِّ وَالْحَزَنِ وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ وَضَلَعِ الدَّيْنِ وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ". ثُمَّ قَدِمْنَا خَيْبَرَ، فَلَمَّا فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِ الحِصْنَ ذُكِرَ لَهُ جَمَالُ صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيِّ بْنِ أَخْطَبَ، وَقَدْ قُتِلَ زَوْجُهَا وَكَانَتْ عَرُوسًا، فَاصْطَفَاهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ لِنَفْسِهِ، فَخَرَجَ بِهَا حَتَّى بَلَغْنَا سَدَّ الصَّهْبَاءِ حَلَّتْ، فَبَنَى بِهَا، ثُمَّ صَنَعَ حَيْسًا فِي نِطَعٍ صَغِيرٍ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "آذِنْ مَنْ حَوْلَكَ". فَكَانَتْ تِلْكَ وَلِيمَةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَلَى صَفِيَّةَ. ثُمَّ خَرَجْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ قَالَ: فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُحَوِّي لَهَا وَرَاءَهُ بِعَبَاءَةٍ، ثُمَّ يَجْلِسُ عِنْدَ بَعِيرِهِ فَيَضَعُ رُكْبَتَهُ، فَتَضَعُ صَفِيَّةُ رِجْلَهَا عَلَى رُكْبَتِهِ حَتَّى تَرْكَبَ، فَسِرْنَا حَتَّى إِذَا أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ نَظَرَ إِلَى أُحُدٍ فَقَالَ: "هَذَا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ". ثُمَّ نَظَرَ إِلَى الْمَدِينَةِ فَقَالَ: "اللَّهُمَّ إِنِّي أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا بِمِثْلِ مَا حَرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي مُدِّهِمْ وَصَاعِهِمْ"[١].

---

(١) بڕوانە: ٣٧١.

# ٧٤- باسی کەسێک منداڵ ببات بۆ غەزا بۆ خزمەت کردن

**٢٨٩٣- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو تەڵحەی فەرموو: بگەڕێ مێرمنداڵێکم لەناو مێردمنداڵەکانتاندا بۆ پەیدا بکە خزمەتم بکات، هەتا دەچم بۆ (غەزای) خەیبەر))، جا بۆیە ئەبو تەڵحەش لەپاشکۆی خۆیدا سواری کردم و بردمی، کە لەو کاتەدا من مێردمنداڵێك بووم نزیك باڵغ بوون بوو بوومەوە، جا من خزمەتی پێغەمبەری خوام ﷺ دەکرد کاتێك دابەزیبایە و لایبدایە، وە من زۆرجار گوێم لێ بوو دەیفەرموو: ((خوایە من پەنات پێ دەگرم لەخەم و خەفەت، دەستە پاچەیی، تەمبەڵی، ڕژدەیی، ترسنۆکی، قورسایی قەرزداری، وە ژێردەستەی کەسانی تر بم))، پاشان هاتینە خەیبەر، جا کاتێك خوای گەورە قەڵای خەیبەری لەسەر دەستیدا ئازاد کرد، باسی جوانی صەفییەی کچی حویەی کوڕی ئەختەبی بۆ کرا (مێردەکەی کوژرا بوو)، کە صەفیە تازە بووك بوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ صەفییەی بۆ خۆی هەڵبژارد و لەگەڵ خۆی برد تا گەیشتینە (سَدَّ الصَّهْبَاءِ)[1]، صەفییە لە حەیز پاك بوویەوە، پێغەمبەر ﷺ گواستیەوە، پاشان خواردنێکی دروست کرد لە خورما و کەشك و ڕۆن خرایە سەر سفرەیەکی چەرمی بچووك، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (بە ئەنەس): ((جاڕ بە بەناو ئەو خەڵکانەی لە دەوروبەرتن))، ئیتر ئا ئەوە بوو نانی زەماوەندەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ گواستنەوەی صەفییە، پاشان دەرچووین بەرەو مەدینە، جا پێغەمبەری خوام ﷺ دەبینی لە پشت خۆیەوە عاباکەی کردە پەردە بۆی (تا نەبینرێ)، پاشان پێغەمبەر ﷺ لای وشترەکەیدا دادەنیشت و ئەژنۆی دادەنا، صەفییەش پێی دەخستە سەر ئەژنۆی پێغەمبەر ﷺ، هەتا سواری وشترەکە دەبوو، ئینجا ڕۆیشتین هەتا نزیك بووینەوە**

---

(١) جێگایەکە لە نێوان خەیبەر و مەدینەدا.

لە مەدینە، پێغەمبەر ﷺ سەیری كێوی ئوحودی كردو فەرمووی: ((ئەوە كێوێكە ئێمەی خۆش دەوێ، ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ))، پاشان سەیری مەدینەشی كرد و فەرمووی: ((خوایە! من لەمسەر بۆ ئەوسەری مەدینە حەڕام و یاساغ دەكەم، وەك حەڕامكردنی ئیبراهیم ﷺ بۆ مەككە، خوایە فەڕ و بەرەكەت بخەرە مەدد و صاعیانەوە)).

## ٧٥- بابُ رُكُوبِ البَحْرِ

٢٨٩٤- ٢٨٩٥- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: حَدَّثَتْنِي أُمُّ حَرَامٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ يَوْمًا فِي بَيْتِهَا، فَاسْتَيْقَظَ وَهْوَ يَضْحَكُ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا يُضْحِكُكَ؟ قَالَ: "عَجِبْتُ مِنْ قَوْمٍ مِنْ أُمَّتِي يَرْكَبُونَ الْبَحْرَ، كَالْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ". فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَقَالَ: "أَنْتِ مَعَهُمْ". ثُمَّ نَامَ، فَاسْتَيْقَظَ وَهْوَ يَضْحَكُ فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَيَقُولُ: "أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ" فَتَزَوَّجَ بِهَا عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ، فَخَرَجَ بِهَا إِلَى الغَزْوِ، فَلَمَّا رَجَعَتْ قُرِّبَتْ دَابَّةٌ لِتَرْكَبَهَا، فَوَقَعَتْ فَانْدَقَّتْ عُنُقُهَا[1].

## ٧٥- باسی سواربوونی (كەشتی لە) دەریادا[2]

٢٨٩٤- ٢٨٩٥- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئوممو حەڕام بۆی گێڕامەوە كە ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵیان بوو لەخەو هەستا و پێدەكەنی، ئوممو حەڕام وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ پێدەكەنیت؟ فەرمووی: ((سەرم سوڕماوە لە كەسانێك لە ئوممەتەكەمم سواری (كەشتی دەبن) لە دەریادا، دەڵێی

(١) بڕوانە: ٢٧٨٨، ٢٧٨٩.

(٢) بۆ جیهاد و تێكۆشان لە ڕێی خوادا.

**پادشان لەسەر تەختی پادشایی دانیشتوون))، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بپاڕێرەوە بۆم لەخوا کە من لەو خەباتکارانە بم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((تۆ لەوانیت))، پاشان خەوتەوە و خەبەری بوویەوە و پێدەکەنی، جا دوو یان سێجار هاوشێوەی فەرمایشتەکەی دووبارە کردەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بپاڕێرەوە بۆم لەخوا کە من لەو خەباتکارانە بم، جا فەرمووی: ((تۆ لە یەکەمینەکانیت))، ئینجا شووی کرد بەعوبادەی کوڕی صامیت، وە لەگەڵ خۆی بردی بۆ غەزا، جا کاتێك ئوممو حەڕام گەڕایەوە، وڵاخێکی لێ نزیك کرایەوە سواری بێت، لێی کەوتە خوارەوە و ملی شکا و مرد.**

## ٧٦- بابُ مَنِ اسْتَعَانَ بِالضُّعَفَاءِ وَالصَّالِحِينَ فِي الحَرْبِ

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَخْبَرَنِي أَبُو سُفْيَانَ قَالَ: لِي قَيْصَرُ: سَأَلْتُكَ أَشْرَافُ النَّاسِ اتَّبَعُوهُ أَمْ ضُعَفَاؤُهُمْ؟ فَزَعَمْتَ ضُعَفَاؤُهُمْ، وَهُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ.

٢٨٩٦- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ طَلْحَةَ، عَنْ طَلْحَةَ، عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: رَأَى سَعْدٌ ﷺ أَنَّ لَهُ فَضْلاً عَلَى مَنْ دُونَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "هَلْ تُنْصَرُونَ وَتُرْزَقُونَ إِلاَّ بِضُعَفَائِكُمْ؟ ".

## ٧٦- باسی ئەو کەسەی داوای یارمەتی وپشتیوانی[١] لە زەبوون و پیاوچاکەکان[٢] کردووە لە جەنگدا

**ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەبو سوفیان بۆی گێڕامەوە وتی: قەیصەر(ی ڕۆم) پێی وتم: پرسیارم لێ کردیت ئایا کەسە ناودار و گەورەکان شوێنی کەوتوون یان**

(١) بەم جۆرەش مانا بکرێت ڕاستە: باسی ئەو کەسەی پشتی بەستووە بە زەبوون و پیاوچاکان لەجەنگدا.

(٢) بەهۆی دوعا و نزاکانیانەوە خوا سەرکەوتن بنێرێت.

لاواز و زەبوونەکان؟ تۆش وتت: لاواز و زەبوونەکان شوێنی کەوتوون، هەر ئەوانەن شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانن (سەلامی خوایان لێ بێ).

٢٨٩٦- موصعەبی کوڕی سەعد وتی: سەعد ﷺ وای دەزانی کە فەزڵی هەیە بەسەر ئەوانەی لەو نزمترن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا ئێوە سەردەخرێن و ڕۆزی دەدرێن بەهۆی لاواز و زەبوونەکانتانەوە نەبێت؟)).

٢٨٩٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، سَمِعَ جَابِرًا، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "يَأْتِي زَمَانٌ يَغْزُو فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ، فَيُقَالُ فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ النَّبِيَّ ﷺ؟ فَيُقَالُ نَعَمْ. فَيُفْتَحُ عَلَيْهِ، ثُمَّ يَأْتِي زَمَانٌ فَيُقَالُ: فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ أَصْحَابَ النَّبِيِّ ﷺ؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ. فَيُفْتَحُ، ثُمَّ يَأْتِي زَمَانٌ فَيُقَالُ: فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ صَاحِبَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ. فَيُفْتَحُ "[1].

٢٨٩٧- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((زەمانێك دێ کۆمەڵێك لە خەڵکی غەزا دەکەن و پێیان دەوترێت کەستان تێدایە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بوو بێ؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، جا سەردەخرێن، پاشان زەمانێك دێت و دەوترێت: کەستان تێدایە هاوڕێیەتی هاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ کردبێت؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، جا سەردەخرێن، پاشان زەمانێکی تر دێت و دەوترێت: ئایا کەستان تێدایە هاوڕێیەتی کەسێکی کردبێ کە هاوەڵی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بوو بێ؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، جا سەردەخرێن)).

(١) بڕوانە: ٣٥٩٤، ٣٦٤٩.

## ٧٧ - بابٌ: لَا يَقُولُ فُلَانٌ شَهِيدٌ

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: "الله أَعْلَمُ بِمَنْ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِهِ، الله أَعْلَمُ بِمَنْ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِهِ".

٢٨٩٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ الْتَقَى هُوَ وَالْمُشْرِكُونَ فَاقْتَتَلُوا، فَلَمَّا مَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى عَسْكَرِهِ، وَمَالَ الآخَرُونَ إِلَى عَسْكَرِهِمْ، وَفِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ رَجُلٌ لاَ يَدَعُ لَهُمْ شَاذَّةً وَلاَ فَاذَّةً إِلاَّ اتَّبَعَهَا يَضْرِبُهَا بِسَيْفِهِ، فَقَالَ: مَا أَجْزَأَ مِنَّا الْيَوْمَ أَحَدٌ كَمَا أَجْزَأَ فُلاَنٌ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "أَمَا إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ". فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ أَنَا صَاحِبُهُ. قَالَ: فَخَرَجَ مَعَهُ كُلَّمَا وَقَفَ وَقَفَ مَعَهُ، وَإِذَا أَسْرَعَ أَسْرَعَ مَعَهُ قَالَ: فَجُرِحَ الرَّجُلُ جُرْحًا شَدِيدًا، فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ، فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ بِالأَرْضِ وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ، ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَى سَيْفِهِ، فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللهِ. قَالَ: "وَمَا ذَاكَ؟". قَالَ: الرَّجُلُ الذِي ذَكَرْتَ آنِفًا أَنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَأَعْظَمَ النَّاسُ ذَلِكَ. فَقُلْتُ: أَنَا لَكُمْ بِهِ. فَخَرَجْتُ فِي طَلَبِهِ، ثُمَّ جُرِحَ جُرْحًا شَدِيدًا، فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ، فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ فِي الأَرْضِ وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ، ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَيْهِ، فَقَتَلَ نَفْسَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ: "إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الجَنَّةِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهْوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهْوَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ"[1].

## ٧٧- باسێک: نابێ کەس بڵێ فڵانەکەس شەهیدە

**ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوا زاناترە بەو کەسەی لەڕێی خوادا تێدەکۆشێت))، ((خوا زاناترە بەو کەسەی لەپێناوی خوادا بریندار دەبێت)).**

(١) بڕوانە: ٤٢٠٢، ٦٤٩٣، ٤٢٠٧، ٦٦٠٧.

٢٨٩٨- سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ بتپەرستاندا بەیەك گەیشتن و جەنگ لە نێوانیاندا بەرپا بوو، جا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ (دوای جەنگەکە) گەڕایەوە بۆ لای لەشکرەکەی، وە بتپەرستانیش گەڕانەوە بۆ لای لەشکرەکەیان، لەناو هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا پیاوێکی تێدابوو کۆڵی نەدەدا لەهەر کەسێك لەوان (بتپەرستەکان) جیابووبایەوە، یان بەتەنها بووایە بواری نەدەدا و شوێنی دەکەوت، وە بە شمشێرەکەی لێی دەدا (و دەیکوشت)، جا کەسێك (لە مسوڵمانان) وتی: ئەمڕۆ کەسمان سوود و قازانجی نەگەیاند ئەوەندەی فلانە کەس قازانجی گەیاند و سوودی هەبوو (بۆمان لەدژی کافران)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەو پیاوە دۆزەخییە))، ئینجا پیاوێك لەناو خەڵکەکەدا وتی: من (بەدزییەوە) شوێنی دەکەوم[1]، (سەهل دەڵێ:) ئیتر لەگەڵ ئەو پیاوە دەرچوو ڕۆیشت، هەرکاتێك بوەستایە ئەمیش لەگەڵیدا دەوەستا، وە ئەگەر پەلەی بکردایە ئەمیش پەلەی دەکرد لەگەڵیدا، دەڵێ: جا پیاوەکە بریندار بوو بەبریندابوونێکی سەخت، دەستبەجێ خۆی کوشت، دەسکی شمشێرەکەی لەسەر زەوییەکە داناو نوکەکەی خستە نێوان هەردوو مەمکی، پاشان خۆی دا بەسەر شمشێرەکەیداو خۆی کوشت، ئینجا پیاوەکە (ی شوێنی کەوتبوو) ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت، فەرمووی ﷺ: ((بۆ چی بووە؟))، وتی: ئەو پیاوەی ئێستا فەرمووت دۆزەخییە، خەڵکەکە ئەو فەرموودەی تۆیان لا قورس بوو، بۆیە وتم: من هەواڵی ئەوتان پێدەگەیەنم، ئیتر ڕۆیشتم بەدوایدا، پاشان برینداربوو بە برینداربوونێکی سەخت، بۆیە پەلەی کرد لە کوشتنی خۆیدا، دەسکی شمشێرەکەی خستە زەوی و نوکی

(١) تا بزانم دۆزەخییە.

شمشێرەكەی خستە نێوان هەردوو مەمكی، پاشان بەهەموو توانای خۆی دا بەسەر شمشێرەكەیدا و خۆی كوشت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان كەسی وا هەیە كردەوە دەكات بەكردەوەی خەڵكی بەهەشتی ئەوەندەی لە خەڵكەوە دیارە، بەڵام لەڕاستیدا ئەو كەسە دۆزەخییە، وە بێگومان كەسی واش هەیە كردەوە دەكات بەكردەوەی خەڵكی دۆزەخی ئەوەندەی لە خەڵكەوە دیارە، بەڵام ئەو كەسە بەهەشتییە)).

## ٧٨- بابُ التَّحْرِيضِ عَلَى الرَّمْيِ

وَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى ﷻ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ ﴿٦٠﴾﴾ الأنفال.

٢٨٩٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَلَمَةَ بْنَ الأَكْوَعِ ﷺ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى نَفَرٍ مِنْ أَسْلَمَ يَنْتَضِلُونَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "ارْمُوا بَنِي إِسْمَاعِيلَ، فَإِنَّ أَبَاكُمْ كَانَ رَامِيًا، ارْمُوا وَأَنَا مَعَ بَنِي فُلاَنٍ". قَالَ: فَأَمْسَكَ أَحَدُ الْفَرِيقَيْنِ بِأَيْدِيهِمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مَا لَكُمْ لاَ تَرْمُونَ؟ ". قَالُوا: كَيْفَ نَرْمِي وَأَنْتَ مَعَهُمْ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "ارْمُوا فَأَنَا مَعَكُمْ كُلِّكُمْ"[1].

## ٧٨- باسی هاندان لەسەر تیرهاوێشتن

هەروەها باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئامادە بكەن بۆیان (كافران) ئەوەی لەتواناتاندا هەیە لە هێز و لە ئەسپی دابەستراو، تا دوژمنی خواو دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن).

(١) بڕوانە: ٣٣٧٣، ٣٥٠٧.

٢٨٩٩- سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای چەند کەسێك لەهۆزی ئەسلەم تیریان دەهاوێشت[1]، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی نەوەی ئیسماعیل تیر بهاوێژن، چونکە بێگومان ئیسماعیلی باوکتان تیرهاوێژ بووە، تیر بهاوێژن منیش لەگەڵ بەنی فلانم))، سەلەمە دەڵێ: جا یەکێك لە دوو دەستەکە تیرەکانیان لە دەستیاندا ڕاگرت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بۆچی تیر ناهاوێژن؟)) وتیان: چۆن تیر بهاوێژین کە تۆ لەگەڵ ئەوانیت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تیر بهاوێژن من لەگەڵ هەمووتانم)).

٢٩٠٠- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الغَسِيلِ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ أَبِي أُسَيْدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ بَدْرٍ حِينَ صَفَفْنَا لِقُرَيْشٍ وَصَفُّوا لَنَا: "إِذَا أَكْثَبُوكُمْ فَعَلَيْكُمْ بِالنَّبْلِ"[2].

٢٩٠٠- حەمزەی کوڕی ئەبو ئوسەید لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی (غەزای) بەدردا کاتێك ئێمە ڕیزبووین بۆ جەنگ لە دژی قوڕەیش، ئەوانیش ڕیزبوون بۆ جەنگ لە دژی ئێمە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر نزیك بوونەوە لێتان، ئەوە بەتیر لێیان بدەن)).

## ٧٩- بابُ اللَّهْوِ بِالْحِرَابِ وَنَحْوِهَا

٢٩٠١- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَا الْحَبَشَةُ يَلْعَبُونَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ بِحِرَابِهِمْ دَخَلَ عُمَرُ،

---

(١) پێشبرکێ یان دەکرد لە تیرهاوێشتندا.

(٢) بڕوانە: ٣٩٨٤، ٣١٨٥.

فَأَهْوَى إِلَى الْحَصَى فَحَصَبَهُمْ بِهَا. فَقَالَ: "دَعْهُمْ يَا عُمَرُ". وَزَادَ عَلِيٌّ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ: فِي الْمَسْجِدِ.

## ٧٩- باسی یاری کردن بەنێزە و شتی لەوجۆرە

**٢٩٠١- ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی: لەکاتێکدا کەسانێکی تایفەی حەبەشە لای پێغەمبەردا ﷺ یارییان دەکرد بەنێزەکانیان، عومەر ﷺ هاتە ژوورەوە دانەوییەوە بۆ وردە بەردەکان و ئەو وردە بەردانەی تێگرتن، پێغەمبەری ﷺ فەرمووی: ((وازیان لێ بێنە ئەی عومەر)). لە گێڕانەوەکەی عەلی (کوڕی مەدینی)دا دەڵێ: عەبدوڕەزاق بۆی گێڕاینەوە وتی: مەعمەر بۆی گێڕاینەوە (ئەبو هوڕەیرە وتی: ئەو یارییانە) لە مزگەوتدا بوو.**

## ٨٠- بابُ المِجَنِّ وَمَنْ يَتَتَرَّسُ بِتُرْسِ صَاحِبِهِ

٢٩٠٢- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا الأَوْزَاعِيُّ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ أَبُو طَلْحَةَ يَتَتَرَّسُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِتُرْسٍ وَاحِدٍ، وَكَانَ أَبُو طَلْحَةَ حَسَنَ الرَّمْيِ، فَكَانَ إِذَا رَمَى تَشَرَّفَ النَّبِيُّ ﷺ فَيَنْظُرُ إِلَى مَوْضِعِ نَبْلِهِ[1].

## ٨٠- باسی قەڵغان، وە کەسێک بە قەڵغانی هاوڕێکەی خۆی بپارێزێت

**٢٩٠٢- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئەبو تەڵحە ﷺ خۆی و پێغەمبەری ﷺ بەیەك قەڵغان دەپاراست، ئەبو تەڵحە تیرهاوێژێکی چاك بوو، جا کاتێك تیری**

---

(١) بڕوانە: ٢٨٨٠.

**بهاوێشتبایه، پێغەمبەر ﷺ سەری بەرزدەكردەوە و سەیری دەكرد بزانێ تیرەكەی بەر كوێ دەكەوێت.**

٢٩٠٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلٍ قَالَ: لَمَّا كُسِرَتْ بَيْضَةُ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى رَأْسِهِ وَأُدْمِيَ وَجْهُهُ، وَكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ، وَكَانَ عَلِيٌّ يَخْتَلِفُ بِالْمَاءِ فِي المِجَنِّ، وَكَانَتْ فَاطِمَةُ تَغْسِلُهُ، فَلَمَّا رَأَتِ الدَّمَ يَزِيدُ عَلَى الْمَاءِ كَثْرَةً عَمَدَتْ إِلَى حَصِيرٍ، فَأَحْرَقَتْهَا وَأَلْصَقَتْهَا عَلَى جُرْحِهِ، فَرَقَأَ الدَّمُ[١].

**٢٩٠٣- سەهل ﷺ دەڵێ: كاتێك ئەو كڵاوە ئاسنەی لەسەری پێغەمبەردا ﷺ بوو شكێنرا و ڕووخساری خوێناوی بوو، ددانی پێشەوەی شكێنرا، وە عەلی لە قەڵغانەكەدا دەهات و دەچوو ئاوی دەهێنا و فاتیمەش خوێنەكەی دەشۆری، جا كە بینی بەئاوەكە خوێنەكە زۆرتر دەبێت، ڕۆیشت حەسیرێكی هێناو سووتاندی و خستیە سەر برینەكەی پێغەمبەر ﷺ، ئیتر خوێنەكە وەستایەوە.**

٢٩٠٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسِ بْنِ الْحَدَثَانِ، عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَتْ أَمْوَالُ بَنِي النَّضِيرِ مِمَّا أَفَاءَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ مِمَّا لَمْ يُوجِفِ الْمُسْلِمُونَ عَلَيْهِ بِخَيْلٍ وَلاَ رِكَابٍ، فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ خَاصَّةً، وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةَ سَنَتِهِ، ثُمَّ يَجْعَلُ مَا بَقِيَ فِي السِّلاَحِ وَالْكُرَاعِ، عُدَّةً فِي سَبِيلِ اللهِ.

**٢٩٠٤- عومەر ﷺ دەڵێ: ئەو ماڵ و سامانەی هۆزی بەنی نەزیر لەو دەستكەوتانە بوو خوا دەستی پێغەمبەری ﷺ خستبوو، لەو دەستكەوتانە بوو كە مسوڵمانان هیچ ئەسپ و وشترێكیان تاونەدا بوو (بۆ بەدەستهێنانی)، ئەو سامانانە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بەتایبەتی، پێغەمبەریش خەرجی ساڵێكی**

(١) بڕوانە: ٢٤٣.

خێزانەکانی لێ دادەنا، پاشان ئەوەی دەمایەوە دەیدا بە چەك و ئەسپ بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ خەبات لەڕێی خوادا.

٢٩٠٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي سَعْدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَدَّادٍ، عَنْ عَلِيٍّ حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ شَدَّادٍ: قَالَ سَمِعْتُ عَلِيًّا ﷺ يَقُولُ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُفَدِّي رَجُلاً بَعْدَ سَعْدٍ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: "ارْمِ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي"[١].

**٢٩٠٥- عەلی ﷺ دەڵێ: لەدوای سەعد هەرگیز پێغەمبەرم ﷺ نەبینیوە خۆی بکات بە قوربان و فیدای هیچ کەسێك، گوێم لێ بوو دەیفەرموو (بە سەعد): ((بیهاوێژە دایك و باوکم بەفیدات بێ)).**

## ٨١- بابُ الدَّرَقِ

٢٩٠٦- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، قَالَ عَمْرٌو: حَدَّثَنِي أَبُو الأَسْوَدِ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ - ﷺ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ تُغَنِّيَانِ بِغِنَاءِ بُعَاثَ، فَاضْطَجَعَ عَلَى الْفِرَاشِ وَحَوَّلَ وَجْهَهُ، فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَانْتَهَرَنِي وَقَالَ: مِزْمَارَةُ الشَّيْطَانِ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟. فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: "دَعْهُمَا". فَلَمَّا غَفَلَ غَمَزْتُهُمَا فَخَرَجَتَا[٢].

## ٨١- باسی قەڵغانی چەرم

**٢٩٠٦- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ ماڵی من، لەوکاتەدا دوو کەنیزەکم لابوو ئەو گۆرانییەیان دەوت (کە ئەنصارییەکان دەیانوت) بەهۆی ڕووداوی ڕۆژی بوعاسەوە، پێغەمبەریش لەسەر نوێنەکەی**

---

(١) بڕوانە: ٤٠٥٨، ٤٠٥٩، ٦١٨٤.

(٢) بڕوانە: ٩٤٩.

ڕاکشابوو و ڕووی وەرگێڕابوو، جا ئەبو بەکر هاتە ژوورەوە و لێم تووڕە بوو، وتی: چۆن دەبێ گۆرانی و دەنگی شەیتان لە ماڵی پێغەمبەری خوادا ﷺ بێت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ ڕووی تێکرد و فەرمووی: ((وازیان لێ بێنە))، جا کاتێك پێغەمبەر ﷺ خەریکی کارێك بوو، (بەچاو یان بەدەست) ئاماژەیەکم کرد بۆ کەنیزەکەکان، ڕۆیشتنە دەرەوە.

٢٩٠٧- قَالَتْ: وَكَانَ يَوْمُ عِيدٍ يَلْعَبُ السُّودَانُ بِالدَّرَقِ وَالْحِرَابِ، فَإِمَّا سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَإِمَّا قَالَ: "تَشْتَهِينَ تَنْظُرِينَ". فَقَالَتْ: نَعَمْ. فَأَقَامَنِي وَرَاءَهُ خَدِّي عَلَى خَدِّهِ وَيَقُولُ: "دُونَكُمْ بَنِي أَرْفِدَةَ". حَتَّى إِذَا مَلِلْتُ قَالَ: "حَسْبُكِ؟ ". قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: "فَاذْهَبِي".قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: قَالَ أَحْمَدُ، عَنِ ابْنِ وَهْبٍ، فَلَمَّا غَفَلَ[1].

٢٩٠٧- عائیشە ﵂ دەڵێ: ڕۆژێکی جەژن بوو، کەسانێکی (هۆزی حەبەشە کە) ڕەشپێست بوون یاریان دەکرد بەقەڵغان و نێزەکەکانیان، جا یان پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد یان خۆی فەرمووی: ((حەزدەکەی سەیربکەیت؟)) عائیشەش وتی: بەڵێ، جا لە دوای خۆیەوە وەستاندمی، کوڵمم بەسەر کوڵمیەوە بوو، وە دەیفەرموو: ((یارییەکەتان بکەن نەوەی ئەڕفیدە[2]))، تا خۆم بێ تاقەت بووم، فەرمووی: ((ئەوەندەت بەسە؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((ئیتر بڕۆ))، ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) وتی: ئەحمەد لە وەهبەوە گێڕایەوە وتی: جا کاتێك ئاگای لێ نەبوو.

---

(١) بڕوانە: ٤٥٤.

(٢) ئەڕفیدە: باپیرە گەورەی هۆزی حەبەشەیە.

## ٨٢- بابُ الحَمَائِلِ وَتَعْلِيقِ السَّيْفِ بِالْعُنُقِ

٢٩٠٨- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَحْسَنَ النَّاسِ وَأَشْجَعَ النَّاسِ، وَلَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ المَدِينَةِ لَيْلَةً فَخَرَجُوا نَحْوَ الصَّوْتِ، فَاسْتَقْبَلَهُم النَّبِيُّ ﷺ وَقَدِ اسْتَبْرَأَ الخَبَرَ، وَهْوَ عَلَى فَرَسٍ لأبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ وَفِي عُنُقِهِ السَّيْفُ وَهْوَ يَقُولُ: "لَمْ تُرَاعُوا لَمْ تُرَاعُوا". ثُمَّ قَالَ: "وَجَدْنَاهُ بَحْرًا". أَوْ قَالَ: "إِنَّهُ لَبَحْرٌ"[1].

## ٨٢- باسی قایشی شمشێر و شمشێر کردنە مل[2] (دروستە)

**٢٩٠٨- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ جوانترین کەس بوو، وە ئازاترین کەس بوو، شەوێك خەڵكی مەدینە ترسان، بۆیە ڕوو بەدەنگەكە دەرچوون، پێغەمبەریش ﷺ ڕووبەڕوویان هات بەدوای دەنگ و باسەكەدا ڕۆیشتبوو، لەوكاتەدا بەسواری ئەسپێكی ئەبو تەڵحەوە بوو بەپشتی ڕووتی و شمشێرەكەشی كردبوویە ملی ودەیفەرموو: ((مەترسن، مەترسن))، پاشان فەرمووی: ((ئەسپێكی خێرایە))، یان فەرمووی: ((دەڵێی دەریایە)).**

## ٨٣- بابُ حِلْيَةِ السُّيُوفِ

٢٩٠٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا الأوزَاعِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ سُلَيْمَانَ بْنَ حَبِيبٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ يَقُولُ: لَقَدْ فَتَحَ الفُتُوحَ قَوْمٌ مَا كَانَتْ حِلْيَةَ سُيُوفِهِمِ الذَّهَبَ وَلا الفِضَّةَ، إِنَّمَا كَانَتْ حِلْيَتُهُمُ العَلاَبِيَّ وَالآنُكَ وَالَحْدِيدَ.

---

(١) بڕوانە: ٢٦٢٧.

(٢) مەبەستی قایشی شمشێر كردنەملە، چونكە شمشێر بە تەنها ناكرێتە مل ئەگەر قایشی پێوە نەبێت.

## ٨٣- باسی ڕووكەشی كردنی شمشێر بە ئاڵتون و زیو

٢٩٠٩- ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: بەڕاستی كەسانێك (لە هاوەڵان) دەستیان بەسەر زۆر شار و وڵاتدا گرت و ئازادیان كردووە، ڕووكەش و جوانكاری شمشێرەكانیان ئاڵتون و زیو نەبوو، بەڵكو ڕووكەشی شمشێرەكانیان پێستی خۆشنەكراو و قورقوشم و ئاسن بوو.

## ٨٤- بابُ مَن عَلَّقَ سَيفَهُ بِالشَّجَرِ فِي السَّفَرِ عِندَ القَائِلَةِ

٢٩١٠- حَدَّثَنَا أبو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيبُ، عَنِ الزهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي سِنَانُ بْنُ أَبِي سِنَانٍ الدُّؤَلِيُّ وَأَبُو سَلَمَةَ بْن عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ أَخْبَرَ أَنَّهُ غَزَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ قِبَلَ نَجْدٍ، فَلَمَّا قَفَلَ رَسُول اللهِ ﷺ قَفَلَ مَعَهُ، فَأَدْرَكَتْهُمُ القَائِلَةُ فِي وَادٍ كَثِيرِ العِضَاهِ، فَنَزَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَتَفَرَّقَ النَّاسُ يَسْتَظِلُّونَ بِالشَّجَرِ، فَنَزَلَ رَسُول اللهِ ﷺ تَحْتَ سَمُرَةٍ وَعَلَّقَ بِهَا سَيْفَهُ، وَنِمْنَا نَوْمَةً، فَإِذَا رَسُول اللهِ ﷺ يَدْعُونَا وَإِذَا عنده أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: "إِنَّ هذا اخْتَرَطَ عَلَيَّ سَيْفِي وَأَنَا نَائِمٌ، فَاسْتَيْقَظْتُ وَهْوَ فِي يَدِهِ صَلْتًا، فَقَالَ: مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ فَقُلْتُ: اللهُ"، ثَلاَثًا؛ وَلَمْ يعَاقِبْهُ وَجَلَسَ[1].

## ٨٤- باسی كەسێک شمشێرەكەی لە سەفەردا هەڵبواسێت بە درەختێكدا لەكاتی خەوتنی پێش نیوەڕۆدا

٢٩١٠- جابیری كوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە كە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ غەزایەك ڕوو بە نەجد، جا كە پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە، جابیریش لەگەڵیدا گەڕایەوە، جا لە گەرمای نیوەڕۆ گەیشتنە شیوێك درەختی

(١) بڕوانە: ٢٩١٣، ٤١٣٤، ٤١٣٥، ٤١٣٦.

دڕکاوی زۆر بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی و لای دا، خەڵکەکە بڵاوەیان کرد بەدوای سێبەری درەختدا دەگەڕان، پێغەمبەری خواش ﷺ لەژێر درەختێکی دڕکاویدا دانیشت، شمشێرەکەی بەدرەختەکەدا هەڵواسی، جا سەرخەوێکی شکاند، لە پڕ گوێمان لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بانگمان دەکات، وە دەشتەکییەکی لەلایە، فەرمووی: ((ئەم کابرایە لەکاتێکدا لەخەودا بووم، شمشێرەکەمی لە کێلانەکەی دەرهێناوە، کە خەبەرم بوویەوە دەبینم شمشێرەکەی بەڕووتی (بێ کێلان) بەدەستەوەیە))، وتی: کێ دەتپارێزێ لەمن؟ منیش وتم: خوا))، سێ جار ئەم وتەی دوبارە کردەوە جا پێغەمبەر ﷺ (دوای ئەوەی شمشێرەکەی لێ دەسێنێت) هیچ سزایەکی کابرای نەدا و کابرا دانیشتبوو.

## ٨٥- بابُ لُبْس البَيْضَة

٢٩١١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْن مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَهْلٍ ﷺ أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ جُرْحِ النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ، فَقَالَ: جُرِحَ وَجْهُ النَّبِيِّ ﷺ، وَكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ، وَهُشِمَتِ البَيْضَةُ عَلَى رَأْسِهِ، فَكَانَتْ فَاطِمَةُ - عَلَيْهَا السَّلَامُ - تَغْسِلُ الدَّمَ وَعَلِيٌّ يُمْسِكُ، فَلَمَّا رَأَتْ أَنَّ الدَّمَ لَا يَزِيدُ إِلَّا كَثْرَةً أَخَذَتْ حَصِيرًا فَأَحْرَقَتْهُ حَتَّى صَارَ رَمَادًا ثُمَّ أَلْزَقَتْهُ، فَاسْتَمْسَكَ الدَّمُ[١].

## ٨٥- باسی لەسەرکردنی کڵاوی ئاسن (لە جەنگدا دروستە)

٢٩١١- عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبو حازیم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە لە سەهلەوە ﷺ کە پرسیاری لێ کرا دەربارەی برینەکەی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی (غەزای) ئوحوددا، سەهل وتی: ڕووخساری پێغەمبەر ﷺ بریندار بوو، وە ددانی پێشەوەی

(١) بڕوانە: ٢٤٣.

شكێنرا، كڵاوەكەی شكێنرا و ورد بوو بەسەر سەریدا، جا فاتیمە ﷺ خوێنەكەی دەشت و عەلیش پێغەمبەری ﷺ گرتبوو، ئینجا فاتیمە كە بینی خوێن ڕۆیشتنەكەی زۆر دەبێ و ناوەستێتەوە، حەسیرێكی هێنا و سووتاندی هەتا بوویە خۆڵەمێش، پاشان نووساندی بەبرینەكەوە، ئیتر خوێنەكە وەستایەوە.

## ٨٦- بابُ مَن لَمْ يَرَ كَسْرَ السِّلَاحِ عِنْدَ المَوْتِ

٢٩١٢- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْن عَبَّاسٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أبي إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحارِثِ قَالَ: مَا تَرَكَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَّا سِلَاحَهُ وَبَغْلَةً بَيْضَاءَ وَأَرْضًا جَعَلَهَا صَدَقَةً[1].

## ٨٦- باسی ئەو كەسەی ڕای وا نەبووە لەكاتی مردندا چەك بشكێندرێت

**٢٩١٢- عەمری كوڕی حاریس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (لە دوای مردنی) هیچی بەجێ نەهێشت، جگە لە شمشێرەكەی و ئێسترێكی ماچەی سپی، وە زەوییەك كە كردبووی بەخێر.**

## ٨٧- بابُ تَفَرُّقِ النَّاسِ عَنِ الإِمَامِ عِنْدَ القَائِلَةِ

٢٩١٣- حَدَّثَنَا أبو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنَا سِنَانُ بْنُ أَبِي سِنَانٍ، وَأَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ جَابِرًا أَخْبَرَهُ.

حَدَّثَنَا مُوسَى بْن إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْن سَعْدٍ، أَخْبَرَنَا ابن شِهَابٍ، عَنْ سِنَانِ بْنِ أبي سِنَانٍ الدُّؤَلِيِّ، أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ غَزَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَدْرَكَتْهُمُ القَائِلَةُ فِي وَادٍ كَثِيرِ

(١) بڕوانە: ٢٧٣٩.

العِضَاهِ، فَتَفَرَّقَ النَّاس فِي العِضَاهِ يَسْتَظِلُّونَ بِالشَّجَرِ، فَنَزَلَ النَّبِيُّ ﷺ تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَعَلَّقَ بِهَا سَيْفَهُ ثمَّ نَامَ، فَاسْتَيْقَظَ وَعِنْدَهُ رَجُلٌ وَهْوَ لَا يَشْعُرُ بِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّ هذا اخْتَرَطَ سَيْفِي فَقَالَ: مَن يَمْنَعُكَ؟ قُلْتُ: اللهُ. فَشَامَ السَّيْفَ، فَهَا هُوَ ذَا جَالِسٌ". ثُمَّ لم يُعَاقِبْهُ[1].

## ٨٧- باسی بڵاوەکردنی خەڵکەکە لەدەوری پێشەوا لەکاتی گەرمی نیوەڕۆدا و گەڕان بەدوای سێبەردا (بۆ خەوتن) لەژێریدا

**٢٩١٣- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ غەزایەکی کرد، لە کاتی نیوەڕۆدا گەیشتنە دۆڵێکی دار و درەختاوی، جا خەڵکەکە بەناو درەختەکاندا بڵاوەیان کرد بەشوێن سێبەری درەختدا دەگەڕان، پێغەمبەریش ﷺ لەژێر درەختێکدا دانیشت و شمشێرەکەی پێدا هەڵواسی، پاشان خەوت، کە خەبەری بوویەوە دەبینێت پیاوێکی لایە و بێ ئەوەی هەستی پێ بکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەم کابرایە شمشێرەکەمی لە کێلانەکەی دەرهێناوە و وتی: جا کێ دەتپارێزێت؟ وتم: خوا، ئیتر شمشێرەکەی خستەوە کێلانەکەی، ئا ئەوەتا دانیشتووە))، پاشان پێغەمبەر ﷺ سزای کابرای نەدا.**

## ٨٨- بابُ مَا قِيلَ فِي الرِّمَاحِ

وُيذْكَرُ عَنِ ابن عُمَرَ، عَنِ النَّبِيُّ ﷺ: "جُعِلَ رِزْقِي تَحْتَ ظِلِّ رُمْحِي، وَجُعِلَ الذِّلَّةُ وَالصَّغَارُ عَلَى مَنْ خَالَفَ أَمْرِي".

**٢٩١٤-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْن يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِك، عَنْ أَب النَّضْرِ -مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ- عَنْ نَافِعٍ -مَوْلَى أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِبَعْضِ طَرِيقِ مَكَّةَ تَخَلَّفَ مَعَ أَصْحَابٍ لَهُ مُحْرِمِينَ وَهْوَ غَيْرُ مُحْرِمٍ، فَرَأَى حِمَارًا

---

(١) بڕوانە: ٢٩١٠.

وَحْشِيًّا، فَاسْتَوى عَلَى فَرَسِهِ، فَسَأَلَ أَصْحَابَهُ أَنْ يُنَاوِلُوهُ سَوْطَهُ فَأَبَوْا، فَسَأَلهمْ رُمْحَهُ فَأَبَوْا، فَأَخَذَهُ ثُمَّ شَدَّ عَلَى الحِمَارِ فَقَتَلَهُ، فَأَكَلَ مِنْهُ بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَأَبَى بَعْضٌ، فَلَمَّا أَدْرَكُوا رَسُولَ اللهِ ﷺ سَأَلُوهُ عَنْ ذَلِكَ، قَالَ: "إِنَّمَا هِيَ طُعْمَةٌ أَطْعَمَكُمُوهَا اللهُ". وَعَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ: فِي الحِمَارِ الوَحْشِيِّ، مِثْلُ حَدِيثِ أَبِي النَّضْرِ قَالَ: "هَلْ مَعَكُمْ مِنْ لَحْمِهِ شَيْء"[1].

## ٨٨- باسی ئەوەی وتراوە دەربارەی هەبوونی ڕم (و بەکارهێنانی)

**لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەگێڕدرێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ڕزق و ڕۆزی من لەژێر سێبەری ڕمەکەمدا دانراوە، وە سەرشۆڕی و ڕیسوایی بڕیاری لێ دراوە بۆ ئەو کەسەی سەرپێچی فەرمانی من بکات)).**

**٢٩١٤- نافیع -کە ئازادکراوی ئەبو قەتادەی ئەنصاری بوو- لە ئەبو قەتادەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە ئەو لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو (لە سەفەرێکدا)، هەتا لەشوێنێکدا لە ڕێگای مەککەدا ئەبو قەتادە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا کە لە ئیحرامدا بوون بەجێمان، بەڵام ئەبو قەتادە ئیحرامی نەبەستبوو، جا ئەبو قەتادە کەرەکێوییەکی بینی، یەکسەر سواری ئەسپەکەی بوو، داوای کرد لە هاوڕێکانی قامچییەکەی بدەن بەدەستەوە، بەڵام پێیان نەدا، وە داوای ڕمەکەی لێکردن، ئەویشیان پێ نەدا، جا خۆی هەڵی گرت، پاشان هێرشی برد بۆ کەرەکێوییەکە و کوشتی، جا هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە گۆشتەکەیان خوارد و هەندێکیان نەیان خوارد، جا کاتێك گەیشتنەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەیەوە پرسیاریان لێ کرد، فەرمووی: ((بێگومان ئەوە خۆراکێکە کە خوا دەرخواردی ئێوەی داوە)). زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە لە**

---

(١) بڕوانە: ١٨٢١.

**عەتائی کوڕی یەسارەوە، لە ئەبو قەتادەوە دەربارەی کەرەکێوی وەك فەرموودەکەی ئەبو نەزر دەیگێڕێتەوە، بەڵام دەڵێ: فەرموویی: ((ئایا هیچێك لە گۆشتەکەیتان پێیە؟)).**

## ٨٩- بابُ مَا قِيلَ فِي دِرْعِ النَّبِيِّ ﷺ وَالْقَمِيصِ فِي الحَرْبِ

وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "أَمَّا خَالِد فَقَدِ احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ فِي سَبِيلِ اللهِ".

**٢١١٥-** حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى، حَدَّثَنَا عبد الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ وَهْوَ فِي قُبَّةٍ: "اللَّهُمَّ إِنِّي أَنْشُدُكَ عَهْدَكَ وَوَعْدَكَ، اللَّهُمَّ إِنْ شِئْتَ لَمْ تُعْبَدْ بَعْدَ اليَوْمِ". فَأَخَذَ أبو بَكْرٍ بِيَدِهِ فَقَالَ: حَسْبُكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَدْ أَلْحَحْتَ عَلَى رَبِّكَ. وَهْوَ فِي الدِّرْعِ، فَخَرَجَ وَهْوَ يَقول: ﴿ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ ﴾ القمر.

وَقَالَ وُهَيْبٌ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ: يَوْمَ بَدْرٍ[1].

## ٨٩- باسی ئەوەی وتراوە دەربارەی زرێیەکەی[2] پێغەمبەر ﷺ (لەچی دروست کرابوو)، وە باسی حوکمی کراس و پۆشاک لە جەنگدا

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((بەڵام خالید بێگومان زرێیەکانی کرد بەخێر بۆ جیهاد لەڕێی خوادا)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٩٥٣، ٤٨٧٥، ٤٨٧٧.

(٢) زرێ: کاڵایەکی جەنگییە لە زریزەی ئاسن دەتەندرێ و لە جەنگدا لەبەردەکرێ بۆ ئەوەی شیر و تیر نەیبڕێ.

**٢٩١٥- ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە چادرێكی وەك گومەزدابوو، فەرمووی: ((ئەی خوایە! بەڕاستی من داوای بەجێهێنانی پەیمان و بەڵێنەكەت لێ دەكەم (كە سەركەوتنمە بەسەر كافراندا)، خوایە! ئەگەر بتەوێ (باوەڕداران لەناو بچن) لە ئەمڕۆ بەدواوە ناپەرسترێیت))، جا ئەبو بەكر ﵁ دەستی پێغەمبەری ﷺ گرت و وتی: ئیتر بەسە ئەی پێغەمبەری خوا! بەڕاستی تۆ زۆر پاڕایتەوە لە پەروەردگارت، لەو كاتەدا زرێی پۆشیبوو، جا (لە چادرەكە) هاتە دەرەوە و دەیفەرموو: ((بێگومان كۆمەڵەكەیان دەشكێنرێ و هەڵدێن، بەڵكو بەڵێنیان ڕۆژی دواییە، وە (سزای) ئەو ڕۆژە زۆر سەختتر و تاڵترە)). وهەیب دەڵێ: خالید بۆی گێڕاینەوە (باسی ئەم فەرموودە) لە ڕۆژی (غەزای) بەدردا بوو[1].**

٢٩١٦ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأعمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَدِرْعُهُ مَرْهُونَةٌ عِنْدَ يَهُودِيٍّ بِثَلَاثِينَ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ. وَقَالَ يَعْلَى: حَدَّثَنَا الأعمش: دِرعٌ مِنْ حَدِيدٍ. وَقَالَ مُعَلًّى: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ، حَدَّثَنَا الأعمَشُ وَقَالَ: رَهَنَهُ دِرْعًا مِنْ حَدِيدٍ[2].

**٢٩١٦- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی كرد، كراسە زرێیەكەی لای جولەكەیەك ڕەهن بوو لەبری سی مەن جۆ (بەقەرز لێی وەرگرتبوو)، لە گێڕانەوەكەی یەعلادا كە لە ئەعمەشەوە گێڕاویەتیەوە دەڵێ: زرێیەكی ئاسن بوو. وە موعەللا دەڵێ: عەبدولواحید بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەعمەش بۆی گێڕاینەوە وتی: زرێیەكی ئاسنی بەڕەهن لا دانا.**

---

(١) واتە: لەم گێڕانەوەی وهەیبدا ئەم بەشە لە فەرموودەكە (لە ڕۆژی بەدردا بوو) هاتووە، كە لەوەی پێشوودا نەهاتبوو.(إرشاد الساري:٦/٤٠٣).

(٢) بڕوانە: ٢٠٦٨.

٢٩١٧- حَدَّثَنَا مُوسَى بْن إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْب، حَدَّثَنَا ابن طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هريرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مَثَلُ البَخِيلِ وَالْمُتَصَدِّقِ مَثَلُ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا جُبّتانِ مِنْ حَدِيدٍ قَدِ اضْطَرَّتْ أَيْدِيَهُمَا إِلَى تَرَاقِيهِمَا، فَكُلَّمَا هَمَّ المُتَصَدِّقُ بصَدَقَتِهِ اتَّسَعَتْ عَلَيْهِ حَتَّى تُعَفِّيَ أَثَرَهُ، وَكلَّمَا هَمَّ البَخِيلُ بِالصَّدَقَةِ انْقَبَضَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ إِلَى صَاحِبَتِهَا وَتَقَلَّصَتْ عَلَيْهِ وَانْضَمَّتْ يَدَاهُ إِلَى تَرَاقِيهِ". فَسَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: "فَيَجْتَهِدُ أَنْ يُوَسِّعَهَا فَلَا تَتَّسِعُ"[1].

**٢٩١٧- ئەبو هوڕەیره ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كه فەرموويەتی: ((نموونەی ڕەزیل (كه نابەخشێت) و بەخشەر وەك دوو پیاو وان زرێیەكی ئاسنیان لەبەردابێت، هەردوو دەستیان بەناچاری بردبێتە لای شان و ملیان، جا هەركاتێك بەخشەرەكە بەنیاز بوو ماڵەكەی ببەخشێت فراوان دەبێت لەبەریدا، هەتا (وای لێدێت) دەخشێ بەدوایدا و شوێن پێیەكانی دەسڕێتەوە[2]، وە هەركاتێك ڕەزیل و ڕژدەكە بەنیاز بێت ماڵێك ببەخشێت، (ڕژدیەكەی ڕێگەی نادات) هەر ئەڵقەیەكی زرێیەكە نزیك دەبێتەوە لەوەی پاڵی، زرێیەكە دەچێتە یەك و بچووك دەبێتەوە و هەردوو دەستی دەنووسێت بەلاملەكانیەوە)). جا ئەبو هوڕەیره ﷺ گوێی له پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ((ئینجا زۆر هەوڵ دەدات زرێیەكه فراوان بكات، بەڵام فراوان نابێت)).**

## ٩٠- بابُ الجُبَّةِ فِي السَّفَرِ وَالْحَرْبِ

٢٩١٨- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ عَنْ أَبِي الضُّحَى مُسْلِمٍ -هُوَ ابْنُ صُبَيْحٍ- عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ حَدَّثَنِي المُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ قَالَ انْطَلَقَ رَسُولُ اللهِ

---

(١) بروانه: ١٤٤٣.

(٢) مەبەستی ئەوەیە هەتا ببەخشێت پۆشاكە زرێیەكە زیاتر لاشەی دادەپۆشێت و گەورە دەبێت، بەجۆرێك گەورە و شۆڕ دەبێ كە زرێكە لە زەوی دەخشێت و شوێن پێیەكانی لەناو خۆڵەكەدا دەسڕێتەوە.

ﷺ لِحَاجَتِهِ ثُمَّ أَقْبَلَ، فَلَقِيتُهُ بِمَاءٍ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ شَأْمِيَّةٌ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ، فَذَهَبَ يُخْرِجُ يَدَيْهِ مِنْ كُمَّيْهِ فَكَانَا ضَيِّقَيْنِ، فَأَخْرَجَهُمَا مِنْ تَحْتُ، فَغَسَلَهُمَا وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ وَعَلَى خُفَّيْهِ(١).

## ٩٠- باسی (لەبەرکردنی) جبە لە سەفەر و لە جەنگدا

**٢٩١٨- موغەیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت دەست بەئاو بگەیەنێت، پاشان هاتەوە، منیش چوومە خزمەتی بەهەندێك ئاوەوە، وەجبەیەکی شامی لەبەردا بوو، جا ئاوی لە دەم و لوتی ڕادا و دەم و چاوی شۆری، ئینجا ویستی دەستەکانی لە قۆڵەکانییەوە دەربێنێ، بەڵام قۆڵەکانی تەسك بوون، بۆیە لەژێرەوە دەستەکانی دەرهێنا، جا شۆردنی و دەستی تەڕی هێنا بەسەریدا و بەسەر هەردوو خوفەکەیدا.**

## ٩١- بابُ الحَرِيرِ فِي الحَرْبِ

**٢٩١٩-** حَدَّثَنَا أَحْمَد بْنُ المِقْدَامِ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، أَنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُمْ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَخَّصَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَالزُّبَيْرِ فِي قَمِيصٍ مِنْ حَرِيرٍ، مِنْ حِكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا(٢).

## ٩١- لە جەنگدا ئاوریشم (پۆشین دروستە)

**٢٩١٩- قەتادە دەڵێ: ئەنەس ﷺ بۆی گێڕاینەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی دا بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیر (بە لەبەرکردنی) کراسێکی ئاوریشم لەبەر خوران، کە هەردووکیان هەیان بوو.**

---

(١) بڕوانە: ١٨٢.

(٢) بڕوانە: ٢٩٢، ٢٩٢١، ٢٩٢٢، ٥٨٣٩.

٢٩٢٠- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ حَدَّثَنَا هَمَّامٌ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ حَدَّثَنَا هَمَّامٌ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ وَالزُّبَيْرَ شَكَوَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَعْنِي الْقَمْلَ- فَأَرْخَصَ لَهُمَا فِي الحَرِيرِ، فَرَأَيْتُهُ عَلَيْهِمَا فِي غَزَاةٍ[1].

**٢٩٢٠- قەتادە لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف و زوبەیر سكاڵایان بۆ لای پێغەمبەر ﷺ برد -واتە: لەبەر ئەسپێ-، پێغەمبەریش ﷺ مۆڵەتی دان ئاوریشم بپۆشن، منیش هەردووكیانم دی لە غەزایەكدا ئاوریشمیان لەبەردا بوو.**

٢٩٢١ - حَدَّثَنَا مسَدَّدُ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، أَخْبَرَنِى قَتَادَةُ، أَنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُمْ قَالَ: رَخَّصَ النَّبِيُّ ﷺ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَالزَّبَيْرِ بْنِ العَوَّامِ فِي حَرِيرٍ[2].

**٢٩٢١- قەتادە دەڵێ: ئەنەس ﷺ بۆی گێڕاینەوە و وتی: پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی دا عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف و زوبەیر ئاوریشم بپۆشن.**

٢٩٢٢- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غنْدَرُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، سَمِعْتُ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ: رَخَّصَ -أَوْ رُخِّصَ- لِحِكَّةٍ بِهِمَا[3].

**٢٩٢٢- قەتادە دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ) ڕێگەی دا -یان ڕێگە درا- (پێیان بەپۆشینی ئاوریشم) لەبەر خورانێك كە بەهەردووكیانەوە بوو.**

---

(١) بڕوانە: ٢٩١٩.

(٢) بڕوانە: ٢٩١٩.

(٣) بڕوانە: ٢٩١٩.

## ٩٢- بابُ مَا يُذْكَرُ فِي السِّكِّين

٢٩٢٣ - حَدَّثنَا عبد العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْن سَعْدٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ "يَأْكُل مِنْ كَتِفٍ مَجْتَزُّ مِنْهَا، ثُمَّ دُعِيَ إِلَى الصَّلَاةِ فَصَلَّى وَلم يَتَوَضَّأْ.

حَدَّثَنَا أبو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، وَزَادَ: فَأَلْقَى السِّكِّينَ[١].

## ٩٢- باسی ئەوەی دەوترێت دەربارەی چەقۆ

**٢٩٢٣- جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەییە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی (بەچەقۆ لەگۆشتی) دەستی مەڕێکی دەبڕی و دەیخوارد، پاشان بانگی نوێژکردن درا، پێغەمبەریش ﷺ نوێژی کرد و دەست نوێژی نەگرت (واتە: دەستنوێژی هەبوو و نەیگرتەوە). (ئیمامی بوخاری دەڵێ:)[٢] ئەبو یەمان بۆی گێڕاینەوە وتی: شوعەیب بۆی گێڕاینەوە لە زوهرییەوە ئەمەی زیاد کرد: جا چەقۆکەی فڕێدا.**

## ٩٣- بابُ مَا قِيلَ فِي قِتَالِ الرُّوم

٢٩٢٤- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْن يَزِيدَ الدِّمَشْقِيُّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَمْزَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي ثَوْرُ بْنُ يَزِيدَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، أَنَّ عُمَيْرَ بْنَ الأَسْوَدِ العَنْسِيَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ أَتَى عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ وَهُوَ نَازِلٌ فِي سَاحِلِ حِمْصَ، وَهُوَ فِي بِنَاءٍ لَه وَمَعَهُ أُمُّ حَرَامٍ، قَالَ عمَيْرٌ: فَحَدَّثَتْنَا أُمُّ حَرَامٍ أَنهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: "أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ البَحْرَ قَدْ أَوْجَبُوا". قَالَتْ أُمُّ حَرَامٍ: قلْت: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَا فِيهِمْ؟ قَالَ: "أَنْتِ فِيهِمْ". ثمَّ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ مَدِينَةَ قَيْصَرَ مَغْفُورٌ لَهُمْ". فَقُلْتُ: أَنَا فِيهِمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: "لاَ".

---

(١) بڕوانە: ٢٠٨.

(٢) ئەم فەرموودە بە دوو ڕێگەی جیاواز ئیمامی بوخاری گێڕاویەتیەوە ئەمە دووەمیانە کە باسی چەقۆی تیایە.

## ٩٣- باسی ئەوەی وتراوە دەربارەی جەنگکردن دژی ڕۆمەکان

٢٩٢٤- خالیدی کوڕی مەعدان دەگێڕێتەوە کە عومەیری کوڕی ئەسوەدی عەنسی بۆی گێڕایەوە، کە ڕۆیشت بۆ لای عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ لە کەناری دەریا لەشاری حیمص لە خانوویەکی خۆیدا بوو، ئوممو حەڕام(ی خێزانی) لەگەڵدا بوو، عومەیر دەڵێ: ئینجا ئوممو حەڕام بۆی گێڕاینەوە کە لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((یەکەم لەشکرییەك لە ئوممەتم لە دەریادا غەزا دەکەن، بێگومان (لێخۆشبوونیان) بۆ خۆیان مسۆگەر کردووە))، ئوممو حەڕام دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من لەناویاندام؟ فەرمووی: ((تۆ لەناویاندایت))، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((یەکەم لەشکرییەك لە ئوممەتم جەنگی شارەکەی قەیصەر(ی ڕۆم کە قوستەنتینیەیە) دەکەن لێبوردراون))، منیش وتم: من لەناویاندام ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((نەخێر)).

## ٩٤- بابُ قِتَالِ اليَهُودِ

٢٩٢٥- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُحَمَّدٍ الفَرْوِيُّ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: "تُقَاتِلُونَ اليَهُودَ حَتَّى يَخْتَبِيَ أَحَدُهُمْ وَرَاءَ الحَجَرِ، فَيَقُولُ: يَا عَبْدَ اللهِ، هذا يَهُودِيٌّ وَرَائِي فَاقْتُلْهُ"[١].

## ٩٤- باسی جەنگکردن لە دژی جولەکە

٢٩٢٥- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئێوە دەجەنگن دژی جوولەکە[٢]، هەتا یەکێکیان لەپشت بەردێکەوە خۆی دەشارێتەوە، جا بەردەکە دەڵێ: ئەی بەندەی خوا! ئەمە جوولەکەیەکە لەپشتمەوە، دەی بیکوژە)).

(١) بڕوانە: ٣٥٩٣.

(٢) لە کاتی دابەزینی عیسا ﷺ لە کۆتایی دونیادا.

٢٩٢٦- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا جَرِيرٌ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ القَعْقَاعِ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: "لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا اليَهُودَ، حَتَّى يَقُولَ الحَجَرُ وَرَاءَهُ اليَهُودِيُّ: يَا مُسْلِمُ، هذا يَهُودِيٌّ وَرَائِي فَاقْتُلْهُ".

**٢٩٢٦- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت، هەتا دژی جوولەکە دەجەنگن، هەتا ئەو بەردەی جوولەکە لەپشتیەوەیە (خۆی حەشارداوە) دەڵێ: ئەی مسوڵمان! ئەمە جوولەکەیەکە لە پشتمەوە، وەرە بیکوژە)).**

## ٩٥- بابُ قِتَالِ التُّرْكِ

٢٩٢٧- حَدَّثَنَا أبو النّعْمَانِ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ الحَسَنَ يَقُولُ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْن تَغْلِبَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ تُقَاتِلُوا قَوْمًا يَنْتَعِلُونَ نِعَالَ الشَّعَرِ، وَإِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ تُقَاتِلُوا قَوْمًا عِرَاضَ الوُجُوهِ، كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ المَجَانُّ المُطْرَقَةُ"[١].

## ٩٥- باسی جەنگکردن دژی تورک

**٢٩٢٧- عەمری کوڕی تەغلیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان یەکێك لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە لەدژی گەلێك دەجەنگن، پێڵاوی (دروستکراو لە) موو لەپێ دەکەن، وە بێگومان یەکێك لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە دەجەنگن لەدژی گەلێك ڕووخساریان پانە، ڕووخساریان دەڵێی قەڵغانی بەسیرمە[٢] داپۆشراوە [٣])).**

(١) بڕوانە: ٣٥٩٢.

(٢) سیرمە: چەرمی خاوە.

(٣) واتە: ڕووخساریان پان و خڕ و قەڵەوە.

٢٩٢٨- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ الأعرَجِ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ رَسُول اللهِ ﷺ: "لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا التُّرْكَ صِغَارَ الأَعْيُنِ، حُمْرَ الوُجُوهِ، ذُلْفَ الأُنُوفِ، كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ المَجَانُّ المُطْرَقَةُ، وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ"[1].

**٢٩٢٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت هەتا دەجەنگن لەدژی تورك كە چاویان بچووكە، ڕووخساریان سور و سپییە، لووت كورتی لووت داتەپیون، ڕووخساریان وەك قەڵغانی بەسیرمەی زۆر دەورگیراو وایە، وە ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت هەتا دەجەنگن دژی هۆزێك پێڵاوەكانیان لە مووە)).**

## ٩٦- بابُ قِتَالِ الذِينَ يَنْتَعِلُونَ الشَّعَرَ

٢٩٢٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ الزُّهْرِيُّ: عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ، وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ المَجَانُّ الْمُطَرَقَةُ». قَالَ سُفْيَانُ: وَزَادَ فِيهِ أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، رِوَايَةً «صِغَارَ الأَعْيُنِ، ذُلْفَ الأُنُوفِ، كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ»[2].

## ٩٦- باسی جەنگ كردن لەدژی ئەوانەی پێڵاوی موو لەپێ دەكەن

**٢٩٢٩- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت هەتا دەجەنگن لە دژی هۆزێك پێڵاوەكانیان لە مووە، وە**

---

(١) بڕوانە: ٢٩٢٩، ٣٥٨٧، ٣٥٩٠، ٣٥٩١.

(٢) بڕوانە: ٢٩٢٨.

ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت هەتا دەجەنگن لە دژی هۆزێك ڕووخساریان دەڵێی بە سیرمە داپۆشراوە)). سوفیان دەڵێ: ئەبو زیناد لە ئەعرەجەوە لە ئەبو هورەیرەوە ئەم زیادەی گێڕاوەتەوە: ((چاویان بچكۆلەیە، لوتیان كورت و داتەپیوە، ڕووخساریان وەك قەڵغانی بەسیرمە داپۆشراو وایە)).

## ٩٧- بابُ مَنْ صَفَّ أَصْحَابَهُ عِنْدَ الهَزِيمَةِ وَنَزَلَ عَنْ دَابَّتِهِ، وَاسْتَنْصَرَ

٢٩٣٠- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ البَرَاءَ، وَسَأَلَهُ رَجُلٌ: أَكُنْتُمْ فَرَرْتُمْ يَا أَبَا عُمَارَةَ يَوْمَ حُنَيْنٍ؟ قَالَ: لَا، واللهِ مَا وَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَلَكِنَّهُ خَرَجَ شُبَّانُ أَصْحَابِهِ وَأَخِفَّاؤُهُمْ حُسَّرًا لَيْسَ بِسِلَاحٍ، فَأَتَوْا قَوْمًا رُمَاةً جَمْعَ هَوَازِنَ وَبَنِي نَصْرٍ، مَا يَكَادُ يَسْقُطُ لَهُمْ سَهْمٌ، فَرَشَقُوهُمْ رَشْقًا مَا يَكَادُونَ يُخْطِئُونَ، فَأَقْبَلُوا هُنَالِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ عَلَى بَغْلَتِهِ البَيْضَاءِ، وَابْنُ عَمِّهِ أَبُو سُفْيَانَ بْنُ الحَارِثِ بْنِ عَبْدِ المُطَّلِبِ يَقُودُ بِهِ، فَنَزَلَ وَاسْتَنْصَرَ ثُمَّ قَالَ:

"أَنَا النَّبِيُّ لَاكَذِبْ ... أَنَا ابن عَبْدِ المُطَّلِبْ"

ثُمَّ صَفَّ أَصْحَابَهُ[1].

## ٩٧- باسی ئەو كەسەی لەكاتی شكاندا هاوەڵانی ڕێك خستەوە و لە وڵاخەكەی دابەزی و داوای یارمەتی (لە خوا) دەكات

٢٩٣٠- ئەبو ئیسحاق دەڵێ : لە بەڕائم بیست لەكاتێكدا پیاوێك پرسیاری لێكرد: ئەی باوكی عومارە ئێوە لە ڕۆژی جەنگی حونەیندا هەڵهاتن؟ وتی: نە بەخوا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵنەهات، بەڵكو هەندێك لە هاوەڵە

---

(١) بڕوانە: ٢٨٦٤.

گەنجەكانی و پەلەكەرەكان هاتبوون (بۆ جەنگەكە) بەڕووتی، زرێ و پۆشاكی جەنگیان لەبەردانەبوو، هاتبوونە بەرانبەر هۆزێكی شارەزا لەتیرهاوێشتندا كە هۆزی هەوازین و بەنی نەصر بوون، مەگەر چۆن ئەگەر نا تیریان نەدەكەوتە زەوییەوە، جا هاوەڵانیان تیرباران كرد چۆن تیربارانێك زۆر بەكەمی نەبێ هەڵەیان نەدەكرد (لە تیر هاوێشتنەكەیاندا)، بۆیە هاوەڵان لەوێدا ڕوو بە پێغەمبەر ﷺ هاتن، ئەویش بەسواری ئێسترە ماچە سپییەكەیەوە بوو، ئەبو سوفیانی كوڕی حاریسی كوڕی عەبدولموتتەلیبی ئامۆزای هەوساری ئێسترەكەی ڕادەكێشا، جا پێغەمبەر ﷺ لەئێسترەكە دابەزی و داوای یارمەتی و سەركەوتنی كرد (لە خوا)، پاشان فەرمووی: ((بەڕاستی من پێغەمبەرم نەك درۆزن، بێگومان من كوڕ(ەزا)ی عەبدولموتتەلیبم))، پاشان هاوەڵەكانی ڕێكخستەوە و ڕیزی كردن.

## ٩٨- بابُ الدُّعَاءِ عَلَى الْمُشْرِكِينَ بِالْهَزِيمَةِ وَالزَّلْزَلَةِ

٢٩٣١- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا عِيسَى، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ الأحزَابِ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "مَلأَ اللهُ بُيُوتَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا، شَغَلُونَا عَنِ الصَّلَاةِ الوُسْطَى حِينَ غَابَتِ الشَّمْسُ"[١].

---

(١) بڕوانە: ٤١١١، ٤٥٣٣، ٦٣٩٦.

## ٩٨- باسی دوعاکردن (ی پێشەوا) لە هاوبەشدانەران بەتێکشکان و هێنانە لەرزە

**٢٩٣١- عەلی ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی جەنگی ئەحزابدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا ماڵ و گۆڕەکانیان (کافران) پڕبکات لەئاگر، سەرقاڵیان کردین لە (ئەنجام دانی) نوێژی عەسر هەتا خۆرئاوا بوو)) (نوێژی عەسرمان چوو).**

٢٩٣٢- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابن ذَكْوَانَ، عَنِ الأعرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْعو فِي القُنُوتِ: "اللَّهُمَّ أَنْجِ سَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، اللَّهُمَّ أَنجِ الوَلِيدَ بْنَ الوَلِيدِ، اللَّهُمَّ أَنْجِ عَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ، اللَّهُمَّ أَنْجِ المُسْتَضْعَفِينَ مِنَ المُؤْمِنِينَ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطاتكَ عَلَى مُضَرَ، اللَّهُمَّ سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ»[١].

**٢٩٣٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوعای قونوت(ی بەیانییاندا) دەیفەرموو: ((خوایە! سەلەمەی کوڕی هیشام ڕزگار بکەیت، خوایە! وەلیدی کوڕی وەلید ڕزگار بکەیت، خوایە! عەییاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعە ڕزگار بکەیت، خوایە! باوەڕدارە لاوازەکان ڕزگار بکەیت، خوایە! تۆڵە و سزای سەختی خۆت بێنە بەسەر موزەڕدا، خوایە! گرانی و قات و قڕی وەك گرانی و قات و قڕی سەردەمی یوسف بێنە بەسەریاندا)).**

٢٩٣٣- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي خَالِدٍ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ يَقُولُ: دَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ يَوْمَ الأَحْزَابِ عَلَى المُشْرِكِينَ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ سَرِيعَ الْحِسَابِ، اللَّهُمَّ اهْزِمِ الأَحْزَابَ، اللَّهُمَّ اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ»[٢].

---

(١) بڕوانە: ٨٠٤.

(٢) بڕوانە: ٢٨١٨، ٢٩٦٥، ٣٠٢٥، ٤١١٥، ٦٣٩٢، ٧٤٨٩.

**٢٩٣٣- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەنگی ئەحزابدا ئەم دوعایەی لە بتپەرستان کرد و فەرمووی: ((ئەی خوای دابەزێنەری قورئان کە لێپرسینەوەت خێرایە، خوایە! ئەم تاقم و کۆمەڵانە تێك بشکێنە، خوایە! بیان شکێنە و ترس و بیم بخەرە ناویانەوە[1])).**

٢٩٣٤- حَدَّثنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ عَوْنٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي فِي ظِلِّ الكَعْبَةِ، فَقَالَ أبو جَهْلٍ وَنَاسٌ مِنْ قرَيْشٍ، وَنُحِرَتْ جَزوز بِنَاحِيَةِ مَكَّةَ، فَأَرْسَلُوا فَجَاءُوا مِنْ سَلَاهَا وَطَرَحُوة عَلَيْهِ، فَجَاءَتْ فَاطِمَةُ فَأَلقَتْهُ عَنْه، فَقَالَ: "اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ، اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ، اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ". لأَبِي جَهْلِ بْنِ هِشَامٍ، وَعُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَشَيْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَالْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ، وَأُبَيِّ بْنِ خَلَفٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ أبي مُعَيْطٍ، قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَلَقَدْ رَأَيْتُهُمْ فِي قَلِيبِ بَدْرٍ قَتْلَى قَالَ أبو إِسْحَاقَ: وَنَسِيتُ السَّابعَ. وَقَالَ يُوسُفُ بْنُ إِسْحَاقَ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ: أُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ. وَقَالَ شعْبَةُ: أَمَيَّهُ أَوْ أُبَيُّ. وَالصَّحِيحُ: أُمَيَّةُ[2].

**٢٩٣٤- عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە سێبەری کەعبەدا نوێژی دەکرد، ئەبو جەهل و کەسانێك لە قوڕەیش وتیان: (ئەو ورگ و ڕیخۆڵەیە بێنن) لە هی ئەو وشترەی لە جێگایەکی مەککەدا سەربڕابوو، ئینجا کەسێکیان نارد و هەندێك لە ورگ و ڕیخۆڵەی هێنا، خستیانە سەرملی پێغەمبەر ﷺ (کاتێك لە سوژدەدا بوو)، جا فاتیمە (ی کچی) هات و لایبرد بەسەریەوە، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوایە قوڕەیش لەناوبەریت، خوایە قوڕەیش لەناوبەریت، خوایە قوڕەیش لەناوبەریت))، (ئەم دوعایەی کرد) لە ئەبو جەهلی کوڕی هیشام و عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شەیبەی کوڕی ڕەبیعە و وەلیدی کوڕی عوتبە و ئوبەی کوڕی خەلەف و عوقبەی کوڕی ئەبو موعیت، عەبدوڵڵا (ی**

---

(١) بیان هێنە لەرزە، لەترساندا پێیەکانیان خۆی نەگرێت لە زەویدا.

(٢) بڕوانە: ٢٤٠.

کوڕی مەسعوود) دەڵێ: جا سوێند بەخوا هەموو ئەمانەم لەبیرێکی بەدردا بەکوژراوی بینی. ئەبو ئیسحاق دەڵێ: ناوی حەوتەمم[١] لەبیرچوو. یوسوفی کوڕی ئیسحاق لە ئەبو ئیسحاقەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: کە ئومەیەی کوڕی خەلەفە، بەڵام شوعبە دەڵێ: ئومەییەیە یان ئوبەیە، (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئەوەیان ڕاستە کە دەڵێ: ئومەییەیە.

٢٩٣٥- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنِ ابن أَبِي ملَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ اليَهودَ دَخَلوا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكَ. فَلَعَنْتهُمْ. فَقَالَ: "مَا لَكِ؟ ". قُلْتُ: أَوَلَم تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ: "فَلَمْ تَسْمَعِي مَا قُلْتُ: وَعَلَيْكُمْ؟"[٢].

٢٩٣٥- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە جوولەکەکان دەرۆیشتنە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ دەیان وت: (السَّامُ عَلَيْكَ)، واتە: مردن بۆ تۆ، منیش نەفرینم لێ کردن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوە چیتە؟ [٣]))، وتم: ئەی تۆ گوێت لێیە ئەوان چی دەڵێن؟ فەرمووی: ((ئەی تۆ گوێت لێ نەبوو من چیم وت؟ وتم: (وَعَلَيْكُمْ)، (مردن) لەسەر خۆتان بێت؟[٤])).

## ٩٩ - بابٌ: هَلْ يُرْشِدُ المُسْلِمُ أَهْلَ الكِتَابِ أَوْ يُعَلِّمُهُمُ الكِتَابَ؟

٢٩٣٦- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا يَعْقُوبُ بْن إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا ابن أَخِي ابن شِهَابٍ، عَنْ عَمِّهِ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﵄ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى قَيْصَرَ، وَقَالَ: "فَإِنْ تَوَلَّيْتَ فَإِنَّ عَلَيْكَ إِثْمَ الأَرِيسِيِّينَ"[٥].

---

(١) لەناو بتپەرستانی قورەیش شەشیانی ناو هێنا، بەڵام حەوتەمم لەبیرنەبووە.

(٢) بڕوانە: ٦٠٢٤، ٦٠٣٠، ٦٢٥٦، ٦٣٩٥، ٦٤٠١، ٦٩٢٧.

(٣) بۆ وایان پێ دەڵێیت؟

(٤) ئەمە دوعا لێکردنیانە.

(٥) بڕوانە: ٢٩٤٠.

## ٩٩- باسێک: ئایا مسوڵمان ڕێنموونی خاوەن کتێبەکان دەکات یان فێری قورئانیان دەکات؟

**٢٩٣٦- عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی نووسی بۆ قەیصەر، تیایدا فەرمووی: ((جا ئەگەر پشت هەڵبکەیت (لە ئیسلام)، ئەوە بێگومان گوناه و تاوانی جوتییارەکانیشت لەسەرە)).**

## ١٠٠- بَابُ الدُّعَاءِ لِلْمُشْرِكِينَ بِالْهُدَى لِيَتَأَلَّفَهُمْ

**٢٣٧-** حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبُ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: قَدِمَ طُفَيْل بْن عَمْرٍو الدَّوْسِيُّ وَأَصْحَابُهُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ دَوْسًا عَصَتْ وَأَبَتْ، فَادْعُ الله عَلَيْهَا. فَقِيلَ هَلَكَتْ دَوْسٌ. قَالَ: "اللَّهُمَّ اهْدِ دَوْسًا وَأْتِ بِهِمْ"[1].

## ١٠٠- باسی دوعای مسوڵمان بوون بۆ بتپەرستان تا دڵەکانیان کەمەند کێش بکات

**٢٩٣٧- ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: توفەیلی کوڕی عەمری دەوسی و هاوڕێیەکانی هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی هۆزی دەوس سەرپێچی خوایان کرد، نایانەوێت (ڕاستی ببیستن)، بۆیە دوعایان لێ بکە (خوا لەناویان بەرێت)، جا وترا: دەوس لەناوچوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوایە! هیدایەتی دەوس بدەیت (بۆ ئیسلام) بە مسوڵمانی بیانهێنە (بۆئێرە) )).**

---

(١) بڕوانە: ٤٣٩٢، ٦٣٩٧.

## ١٠١- بابُ دَعْوَةِ اليَهُودِ والنَّصارى، وَعَلى ما يُقاتَلُونَ عَلَيهِ؟ وَما كَتَبَ النَّبِيُّ ﷺ إِلى كِسْرى وَقَيْصَرَ، وَالدَّعوَةِ قَبْلَ القِتَالِ

٢٩٣٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الجَعْدِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ يَقُولُ: لَمَّا أَرَادَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى الرُّومِ، قِيلَ لَهُ: إِنَّهُمْ لاَ يَقْرَءُونَ كِتَابًا إِلاَّ أَنْ يَكُونَ مَخْتُومًا. فَاتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ، فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِهِ فِي يَدِهِ، وَنَقَشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ[١].

## ١٠١- باسی بانگکردنی جوو و نەصرانییەکان (بۆ مسوڵمان بوون)، وە لەسەر چ شتێک جەنگ لەدژیان دەکرێت؟ وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ (لە نامەکانیدا) نووسی بۆ کیسرا و قەیصەر، وە بانگکردن (بۆ هاتنە ناو ئیسلام) پێش جەنگ کردنە

**٢٩٣٨- قەتادە دەڵێ: گوێم لە ئەنەس ﷺ بوو دەیوت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ ویستی نامە بنووسێت بۆ ڕۆمەکان، پێی وترا: بەڕاستی ئەوان نامەیەك ناخوێننەوە مەگەر مۆر کرابێت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد مۆرێکیان لە زیو بۆ دروست کرد، جا دەڵێی سەیری سپییەتی مۆرەکە دەکەم لەپەنجەی دەستیدا نەخشی: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ)ی لە مۆرەکە هەڵکەند بوو.**

٢٩٣٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ بَعَثَ بِكِتَابِهِ إِلَى كِسْرَى، فَأَمَرَهُ أَنْ يَدْفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ البَحْرَيْنِ، يَدْفَعُهُ عَظِيمُ الْبَحْرَيْنِ إِلَى كِسْرَى، فَلَمَّا قَرَأَهُ كِسْرَى خَرَّقَهُ، فَحَسِبْتُ أَنَّ سَعِيدَ بْنَ المُسَيَّبِ قَالَ فَدَعَا عَلَيْهِمُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُمَزَّقُوا كُلَّ مُمَزَّقٍ[٢].

---

(١) بڕوانە: ٦٥.

(٢) بڕوانە: ٦٤.

**٢٩٣٩- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نامەکەی بەکەسێکدا نارد بۆ کیسرا (پادشای فارس)، فەرمانی پێکرد کە نامەکە بدات بەگەورە و سەرۆکی بەحرەین[1]، ئینجا گەورەی بەحرەین بیدات بەکیسرا، جا کاتێك کیسرا نامەکەی خوێندەوە دڕاندی. (ئیبنو شیهاب دەڵێ) : وابزانم کە سەعیدی کوڕی موسەییەب وتی: پێغەمبەریش ﷺ دوعای لێ کردن کە لەت و پەت ببن بەخراپترین شێوەی لەت و پەت بوون.**

## ١٠٢- بابُ دُعَاءِ النَّبِيِّ ﷺ النَّاسَ إِلَى الإِسْلَامِ وَالنُّبُوَّةِ، وَأَنْ لَا يَتَّخِذَ بَعْضُهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللهِ

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ﴿٧٩﴾ ﴾ آل عمران. الآيَةَ.

**٢٩٤٠-** حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى قَيْصَرَ يَدْعُوهُ إِلَى الإِسْلَامِ، وَبَعَثَ بِكِتَابِهِ إِلَيْهِ مَعَ دِحْيَةَ الْكَلْبِيِّ، وَأَمَرَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يَدْفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ بُصْرَى لِيَدْفَعَهُ إِلَى قَيْصَرَ، وَكَانَ قَيْصَرُ لَمَّا كَشَفَ اللهُ عَنْهُ جُنُودَ فَارِسَ مَشَى مِنْ حِمْصَ إِلَى إِيلِيَاءَ، شُكْرًا لِمَا أَبْلَاهُ اللهُ، فَلَمَّا جَاءَ قَيْصَرَ كِتَابُ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ حِينَ قَرَأَهُ الْتَمِسُوا لِي هَا هُنَا أَحَدًا مِنْ قَوْمِهِ لأَسْأَلَهُمْ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ[2].

---

(١) کە ناوی مونزیری کوڕی ساوایە.

(٢) بڕوانە: ٢٩٣٦.

## ١٠٢- باسی بانگکردنی خەڵکی لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ باوەڕهێنان بە ئیسلام و پێغەمبەرایەتی، وە جگە لەخوا هەندێکیان هەندێکی تریان نەکەنە پەروەردگاری خۆیان

هەروەها باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (نابێ بۆ هیچ ئادەمییەك کە خوا نامە و شەریعەت و پێغەمبەرێتی دابێتێ) تا کۆتایی ئایەتەکە.

٢٩٤٠- عەبدوڵلای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی نووسی بۆ قەیصەر (پادشای ڕۆم)، بانگی دەکات بۆ هاتنە ناو ئیسلام، نامەکەشی بە دیحیەی کەلبیدا بۆ نارد، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەدیحیە کرد کە نامەکە بدات بەگەورەی بوصرا، تا ئەویش نامەکە بدات بەقەیصەر، وە کاتێك (لەشکری ڕۆمەکان) سەرکەوتن بەسەر لەشکری فارسەکاندا، قەیصەر بەپێ لەحیمصەوە ڕۆیشت بۆ ئیلیا (قودس) وەك سوپاسگوزاری بۆ خوا لەو بەلا و تاقی کردنەوە[1] (ڕزگاری کردن)، جا کاتێك نامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ قەیصەر، کە خوێندیەوە وتی: بڕۆن لێرە کەسێکم لە گەلەکەی خۆی[2] بۆ بێنن تا پرسیاریان لێ بکەم دەربارەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٢٩٤١- قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَأَخْبَرَنِي أَبُو سُفْيَانَ أَنَّهُ كَانَ بِالشَّأْمِ فِي رِجَالٍ مِنْ قُرَيْشٍ، قَدِمُوا تِجَارًا فِي الْمُدَّةِ الَّتِي كَانَتْ بَيْنَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَبَيْنَ كُفَّارِ قُرَيْشٍ، قَالَ أَبُو سُفْيَانَ: فَوَجَدَنَا رَسُولُ قَيْصَرَ بِبَعْضِ الشَّأْمِ، فَانْطَلَقَ بِي وَبِأَصْحَابِي حَتَّى قَدِمْنَا إِيلِيَاءَ، فَأُدْخِلْنَا عَلَيْهِ، فَإِذَا هُوَ جَالِسٌ فِي مَجْلِسِ مُلْكِهِ وَعَلَيْهِ التَّاجُ، وَإِذَا حَوْلَهُ عُظَمَاءُ الرُّومِ، فَقَالَ لِتَرْجُمَانِهِ: سَلْهُمْ: أَيُّهُمْ

---

(١) کە پەلاماری لەشکری فارس بوو بۆ ڕۆمەکان.

(٢) پێغەمبەری خوا ﷺ.

أَقْرَبُ نَسَبًا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ الذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ؟ قَالَ أَبُو سُفْيَانَ: فَقُلْتُ: أَنَا أَقْرَبُهُمْ إِلَيْهِ نَسَبًا. قَالَ: مَا قَرَابَةُ مَا بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ؟ فَقُلْتُ هُوَ ابْنُ عَمِّي، وَلَيْسَ فِي الرَّكْبِ يَوْمَئِذٍ أَحَدٌ مِنْ بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ غَيْرِي. فَقَالَ قَيْصَرُ: أَدْنُوهُ. وَأَمَرَ بِأَصْحَابِي فَجُعِلُوا خَلْفَ ظَهْرِي عِنْدَ كَتِفِي، ثُمَّ قَالَ لِتُرْجُمَانِهِ: قُلْ لأَصْحَابِهِ: إِنِّي سَائِلٌ هَذَا الرَّجُلَ عَنِ الذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ، فَإِنْ كَذَبَ فَكَذِّبُوهُ. قَالَ أَبُو سُفْيَانَ: وَاللهِ لَوْلاَ الحَيَاءُ يَوْمَئِذٍ مِنْ أَنْ يَأْثُرَ أَصْحَابِي عَنِّي الكَذِبَ لَكَذَبْتُهُ حِينَ سَأَلَنِي عَنْهُ، وَلَكِنِّي اسْتَحْيَيْتُ أَنْ يَأْثُرُوا الْكَذِبَ عَنِّي فَصَدَقْتُهُ، ثُمَّ قَالَ لِتُرْجُمَانِهِ: قُلْ لَهُ كَيْفَ نَسَبُ هَذَاالرَّجُلِ فِيكُمْ؟ قُلْتُ: هُوَ فِينَا ذُو نَسَبٍ. قَالَ فَهَلْ قَالَ: هَذَا القَوْلَ أَحَدٌ مِنْكُمْ قَبْلَهُ؟ قُلْتُ: لاَ. فَقَالَ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ عَلَى الكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ مَا قَالَ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: فَهَلْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مِنْ مَلِكٍ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: فَأَشْرَافُ النَّاسِ يَتَّبِعُونَهُ أَمْ ضُعَفَاؤُهُمْ؟ قُلْتُ: بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ. قَالَ: فَيَزِيدُونَ أَوْ يَنْقُصُونَ؟ قُلْتُ: بَلْ يَزِيدُونَ. قَالَ: فَهَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ سَخْطَةً لِدِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ فَهَلْ يَغْدِرُ؟ قُلْتُ: لاَ، وَنَحْنُ الآنَ مِنْهُ فِي مُدَّةٍ، نَحْنُ نَخَافُ أَنْ يَغْدِرَ. قَالَ أَبُو سُفْيَانَ: وَلَمْ يُمْكِنِّي كَلِمَةٌ أُدْخِلُ فِيهَا شَيْئًا أَنْتَقِصُهُ بِهِ؛ لاَ أَخَافُ أَنْ تُؤْثَرَ عَنِّي غَيْرُهَا. قَالَ: فَهَلْ قَاتَلْتُمُوهُ أَوْ قَاتَلَكُمْ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: فَكَيْفَ كَانَتْ حَرْبُهُ وَحَرْبُكُمْ؟ قُلْتُ: كَانَتْ دُوَلاً وَسِجَالاً، يُدَالُ عَلَيْنَا المَرَّةَ وَنُدَالُ عَلَيْهِ الأُخْرَى. قَالَ: فَمَاذَا يَأْمُرُكُمْ؟ قَالَ: يَأْمُرُنَا أَنْ نَعْبُدَ اللهَ وَحْدَهُ لاَ نُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَيَنْهَانَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا، وَيَأْمُرُنَا بِالصَّلاَةِ وَالصَّدَقَةِ وَالعَفَافِ وَالْوَفَاءِ بِالْعَهْدِ وَأَدَاءِ الأَمَانَةِ. فَقَالَ لِتُرْجُمَانِهِ حِينَ قُلْتُ ذَلِكَ لَهُ: قُلْ لَهُ: إِنِّي سَأَلْتُكَ عَنْ نَسَبِهِ فِيكُمْ، فَزَعَمْتَ أَنَّهُ ذُو نَسَبٍ، وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْعَثُ فِي نَسَبِ قَوْمِهَا، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ قَالَ أَحَدٌ مِنْكُمْ هَذَا الْقَوْلَ قَبْلَهُ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَقُلْتُ: لَوْ كَانَ أَحَدٌ مِنْكُمْ قَالَ هَذَا الْقَوْلَ قَبْلَهُ قُلْتُ: رَجُلٌ يَأْتَمُّ بِقَوْلٍ قَدْ قِيلَ قَبْلَهُ. وَسَأَلْتُكَ: هَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ مَا قَالَ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيَدَعَ الْكَذِبَ عَلَى النَّاسِ وَيَكْذِبَ عَلَى اللهِ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مِنْ مَلِكٍ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَقُلْتُ: لَوْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مَلِكٌ قُلْتُ: يَطْلُبُ مُلْكَ آبَائِهِ. وَسَأَلْتُكَ: أَشْرَافُ النَّاسِ يَتَّبِعُونَهُ أَمْ ضُعَفَاؤُهُمْ؟ فَزَعَمْتَ أَنَّ ضُعَفَاءَهُمُ اتَّبَعُوهُ، وَهُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ يَزِيدُونَ أَوْ

يَنْقُصُونَ؟ فَزَعَمْتَ أَنَّهُمْ يَزِيدُونَ، وَكَذَلِكَ الإِيمَانُ حَتَّى يَتِمَّ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ سَخْطَةً لِدِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَكَذَلِكَ الإِيمَانُ حِينَ تَخْلِطُ بَشَاشَتُهُ الْقُلُوبَ لاَ يَسْخَطُهُ أَحَدٌ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ يَغْدِرُ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ لاَ يَغْدِرُونَ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ قَاتَلْتُمُوهُ وَقَاتَلَكُمْ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ قَدْ فَعَلَ، وَأَنَّ حَرْبَكُمْ وَحَرْبَهُ تَكُونُ دُوَلاً، وَيُدَالُ عَلَيْكُمُ الْمَرَّةَ وَتُدَالُونَ عَلَيْهِ الأُخْرَى، وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْتَلَى، وَتَكُونُ لَهَاالعَاقِبَةُ، وَسَأَلْتُكَ: بِمَاذَا يَأْمُرُكُمْ؟ فَزَعَمْتَ أَنَّهُ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَعْبُدُوا اللهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَيَنْهَاكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُكُمْ، وَيَأْمُرُكُمْ بِالصَّلاَةِ وَالصِّدْقِ وَالْعَفَافِ وَالْوَفَاءِ بِالْعَهْدِ، وَأَدَاءِ الأَمَانَةِ، قَالَ وَهَذِهِ صِفَةُ النَّبِيِّ، قَدْ كُنْتُ أَعْلَمُ أَنَّهُ خَارِجٌ، وَلَكِنْ لَمْ أَظُنَّ أَنَّهُ مِنْكُمْ، وَإِنْ يَكُ مَا قُلْتَ حَقًّا، فَيُوشِكُ أَنْ يَمْلِكَ مَوْضِعَ قَدَمَيَّ هَاتَيْنِ، وَلَوْ أَرْجُو أَنْ أَخْلُصَ إِلَيْهِ لَتَجَشَّمْتُ لُقِيَّهُ، وَلَوْ كُنْتُ عِنْدَهُ لَغَسَلْتُ قَدَمَيْهِ. قَالَ أَبُو سُفْيَانَ: ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقُرِئَ، فَإِذَا فِيهِ .بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مِنْ مُحَمَّدٍ عَبْدِ اللهِ وَرَسُولِهِ، إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ، سَلاَمٌ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى، أَمَّا بَعْدُ فَإِنِّي أَدْعُوكَ بِدِعَايَةِ الإِسْلاَمِ، أَسْلِمْ تَسْلَمْ، وَأَسْلِمْ يُؤْتِكَ اللهُ أَجْرَكَ مَرَّتَيْنِ، فَإِنْ تَوَلَّيْتَ فَعَلَيْكَ إِثْمُ الأَرِيسِيِّينَ وَ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ٦٤ ﴾ آل عمران". قَالَ أَبُو سُفْيَانَ: فَلَمَّا أَنْ قَضَى مَقَالَتَهُ عَلَتْ أَصْوَاتُ الَّذِينَ حَوْلَهُ مِنْ عُظَمَاءِ الرُّومِ، وَكَثُرَ لَغَطُهُمْ، فَلاَ أَدْرِي مَاذَا قَالُوا، وَأُمِرَ بِنَا فَأُخْرِجْنَا، فَلَمَّا أَنْ خَرَجْتُ مَعَ أَصْحَابِي وَخَلَوْتُ بِهِمْ قُلْتُ لَهُمْ: لَقَدْ أَمِرَ أَمْرُ ابْنِ أَبِي كَبْشَةَ، هَذَا مَلِكُ بَنِي الأَصْفَرِ يَخَافُهُ، قَالَ أَبُو سُفْيَانَ: وَاللهِ مَا زِلْتُ ذَلِيلاً مُسْتَيْقِنًا بِأَنَّ أَمْرَهُ سَيَظْهَرُ، حَتَّى أَدْخَلَ اللهُ قَلْبِي الإِسْلاَمَ وَأَنَا كَارِهٌ[1].

---

(١) بڕوانه: ٧.

٢٩٤١- عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەبو سوفیان ﷺ بۆی گێڕامەوە کە ئەو لەگەڵ چەند پیاوێکی قورەیشدا لەشام بوون، بە بازرگانی ڕۆیشتبوون لەو ماوەی (ڕێککەوتنی حودەیبییە)دا بوو، کە لە نێوان پێغەمبەری خوا و ﷺ کافرانی قورەیشدا کرا بوو، ئەبو سوفیان وتی: جا نێردراوی قەیسەر ئێمەی بینی لە شوێنێکی شامدا، ئینجا من و هاوڕێکانمی برد هەتا ڕۆیشتینە ئیلیا، ئینجا براینە ژوورەوە بۆ لای قەیسەر، جا بینیمان قەیسەر لە کۆڕی تایبەتی پادشایەتیدا دانیشتووە و تاجەکەی لەسەردایە، هەموو گەورە پیاوانی ڕۆم لە دەوری بوون، ئینجا بە وەرگێڕەکەی وت: پرسیاریان لێ بکە کامیان لە پشت و خزمایەتیدا نزیکترن لەو پیاوەی کە بەقسەی خۆی دەڵێ پێغەمبەرە؟ ئەبو سوفیان وتی: وتم: من لە هەموویان نزیکترم لەو پیاوە بەخزمایەتی، وتی: خزمایەتی نێوان تۆ و ئەو چییە؟ وتم: ئەو کوڕی ماممە و ئامۆزامە، لەو ڕۆژەدا لەو کاروانەدا جگە لەمن کەسی لەبەنی عەبدی مەناف تێدا نەبوو، قەیسەر وتی: نزیکی بکەنەوە لێم، فەرمانیشی کرد بەهاوڕێکانم خرانە پشتمەوە لای شانمەوە، پاشان بەوەرگێڕەکەی وت: بەهاوڕێکانی (ئەبو سوفیان) بڵێ: من پرسیار لەم پیاوە (ئەبو سوفیان) دەکەم دەربارەی ئەو پیاوە (موحەممەد ﷺ)، کە بەقسەی خۆی دەڵێ پێغەمبەرە! جا ئەگەر درۆی کرد، ئەوە بەدرۆی بخەنەوە، ئەبو سوفیان دەڵێ: سوێند بەخوا ئەگەر لەبەر شەرم و حەیای ئەوە نەبوایە (هاوڕێیەکانم) درۆکەم بگێڕنەوە، درۆم دەکرد کاتێك دەربارەی موحەممەد ﷺ پرسیاری لێ کردم، بەڵام شەرمم کرد درۆم لێ بگێڕنەوە، بۆیە ڕاستم کرد لەگەڵی، پاشان بەوەرگێڕەکەی وت: پێی بڵێ: ڕەچەڵەکی ئەو پیاوە (موحەممەد ﷺ) چۆنە لەناوتاندا؟ وتم: ئەوە (موحەممەد ﷺ) لە بنەماڵەیەکی دیار و ناودارە لەناوماندا، هیرەقل وتی: ئایا کەسێکی تر لەناوتاندا پێش ئەم موحەممەدە ﷺ ئەم قسەیەی ئەوی کردوە؟ وتم: نەخێر، وتی: ئایا ئێوە پێشتر

تۆمەتی درۆتان دەدایە پاڵی پێش ئەوی ئەم باسەی دەیڵێ بیڵێ؟ وتم : نەخێر، وتی: ئایا هیچ کام لە با وو باپیرانی پادشا بوون؟ وتم: نەخێر، وتی: خەڵکی دیار و گەورە شوێنی دەکەون یان لاواز و هەژارەکانیان؟ وتم: دیارەکان شوێنی ناکەون، بەڵکو هەژار و لاوازەکان شوێنی دەکەون، وتی: شوێنکەوتووانی زیاد دەبن یان کەم دەبنەوە؟ وتم: کەم ناکەن، بەڵکو زیاد دەکەن، وتی: ئایا کەسیان بەهۆی ڕق هەستانی لە ئایینەکەی پاشگەز دەبێتەوە لێی دوای چوونە ناویەوە و باوەڕ هێنانی؟ وتم: نەخێر، وتی: غەدر و خیانەت دەکات؟ وتم: نەخێر، بەڵام ئێمە لەگەڵیدا لە ئاگربەست داین، ئێمە دەترسین غەدر بکات، ئەبو سوفیان وتی: نەمتوانی هیچ وشەیەك بخەمە نێو قسەکانم کە موحەممەدی ﷺ پێ ناشیرین و لەکەدار بکەم، جگە لەو وشەیە -کە نەترسم بیگێڕنەوە لێمەوە- هیرەقل وتی: ئێوە لەدژی جەنگاون یان ئەو لە دژتان جەنگاوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: جەنگی ئەو لەدژی ئێوە یان جەنگی ئێوە لەدژی ئەو چۆن بووە؟ وتم: جەنگی نێوانمان جار بە جارە، جارێك ئەو سەردەکەوێ بەسەرماندا، جارێکی تر ئێمە سەردەکەوین بەسەر ئەودا، وتی: فەرمانتان بە چ شتێك پێ دەکات؟ وتم: فەرمانمان پێ دەکات خوا بەتەنها بپەرستین و هیچ شتێك نەکەینە هاوبەشی، وە ڕێگریمان لێ دەکات لەوەی جاران باو و باپیرانتان دەیانپەرست، وە فەرمانمان پێ دەکات بەنوێژ و ماڵ بەخشین و داوێن پاکی و پارێزگاری پەیمان و بەڵێن و پاراستن و بەجێ هێنانی ڕاسپاردە، (ئەبو سوفیان وتی:) کاتێك من ئەو وەڵامانەم بەو وت، هیرەقڵ بە وەرگێڕەکەی وت: پێی بڵێ: بێگومان پرسیارم لێ کردی دەربارەی ڕەچەڵەکی لەناوتاندا، بە قسەی خۆت وتت: لەبنەماڵەیەکی دیارە، پێغەمبەرانیش لە بنەماڵەی دیاری گەلەکەیان ڕەوانە دەکرێن و دەکرێنە پێغەمبەر، وە پرسیارم لێ کردی کەسی تر لە ئێوە ئەم قسەیەی کردوە پێش ئەو، بە قسەی خۆت وتت: نەخێر، بۆیە دەڵێم: ئەگەر کەسێکی ترتان ئەم

قسەیەی بكردایە پێش ئەو، (ئەوكات) دەموت: ئەم كابرایە بەدوای لاسایی قسەی كەسێك دەكاتەوە كە پێشتر وتراوە، وە پرسیارم لێ كردیت ئایا ئێوە درۆتان داوەتە پاڵی پێش ئەوەی ئەم باسەی ئێستا دەیلێ بیلێ، بە قسەی خۆت وتت: نەخێر، بەوەدا زانیم بێگومان ناگونجێ كەسێك بەدەم خەڵكەوە درۆ نەكات، بەدەم خواوە درۆ بكات! وە پرسیارم لێ كردیت ئایا لە باو و باپیرانیدا كەسیان پادشا بووە؟ بەقسەی خۆت وتت: كە نەخێر، بۆیە دەڵێم: ئەگەر لە باو و باپیرانیدا كەسێك پادشا بووایە دەموت: ئەو كابرایە داوای پادشایەتی باو و باپیرانی دەكات، وە پرسیارم لێ كردیت خەڵكانی دیار و ناودار شوێنی دەكەون، یان لاواز و هەژارەكانیان، بەقسەی خۆت وتت: لاواز و هەژارەكانیان شوێنی دەكەون، دەی هەر ئەوانەن شوێنكەوتووانی پێغەمبەران ﷺ، هەروەها پرسیارم لێ كردیت شوێنكەوتووانی زیاد دەكەن یان كەم دەكەن؟ بەقسەی خۆت وتت: زیاد دەبن، باوەڕ و ئیمان هەر بەو جۆرەیە هەتا كامڵ دەبێ، وە پرسیارم لێ كردی ئایا كەسیان پاشگەز دەبێتەوە لەئایینەكەی بەهۆی ڕق هەستانی لە ئایینەكەی، دوای ئەوەی ئیمانی هێناوە و چووەتە ناویەوە؟ بەقسەی خۆت وتت: كە نەخێر، دەی باوەڕ و ئیمان بەو جۆرەیە كاتێك ڕووناكی و شیرینی تێكەڵ بەدڵ و دەروون بوو، كەس ڕقی لێی نابێتەوە. وە پرسیارم لێ كردیت: ئایا غەدر دەكات؟ بەقسەی خۆت وتت: كە نەخێر، بەهەمان شێوە پێغەمبەران غەدر و خیانەت ناكەن، وە پرسیارم لێ كردیت ئێوە لەدژی جەنگاون و ئەو لە دژتان جەنگاوە؟ بەقسەی خۆت وتت: بەڵێ، بێگومان جەنگی لەدژی ئێمە كردووە، وە جەنگی ئێوە و ئەو هەر جارە لایەكتان سەركەوتوون، نێوانتان جار بەجارە، جارێك ئەو سەردەكەوێ بەسەرتاندا، جارێكی تر ئێوە سەردەكەون بەسەر ئەودا، پێغەمبەرانیش بە هەمان شێوە تاقی دەكرێنەوە، بەڵام سەر ئەنجام بۆ پێغەمبەرانە، وە پرسیارم لێ كردیت بە چ شتێك فەرمانتان پێ دەكات، بەقسەی

خۆت وتت: فەرمانتان پێ دەكات كە خوا بپەرستن و هیچ شتێك نەكەنە هاوبەشی، ڕێگریتان لێ دەكات لە پەرستنی ئەوەی باووباپیرتان پەرستوویانە، وە فەرمانتان پێ دەكات بە نوێژ و ڕاستگۆیی و داوێن پاكی، وە بەجێهێنانی بەڵێن و پارێزگاری سپارد، هیرەقل وتی: ئەمانە ڕەوشتی پێغەمبەرن، بەڕاستی من دەمزانی ئەم پێغەمبەرە پەیدا دەبێت، بەڵام گومانم وا نەبوو لە ئێوە دەبێت، جا ئەگەر ئەوەی تۆ وتت (ئەبو سوفیان دەربارەی موحەممەد ﷺ ) ڕاست بێت، ئەوە نزیكە دەسەڵاتی ئەو بگاتە شوێنی ئەو دوو پێیەی من (كە قودسە)، جا ئەگەر بمزانیبایە دەگەمە لای، گوێم بە سەختی و ناڕەحەتی نەدەدا بۆ گەیشتن بە خزمەتی، وە ئەگەر من لە خزمەتیدا بوومایە پێیەكانیم دەشۆرد. ئەبو سوفیان وتی: پاشان داوای كرد نامەكەی پێغەمبەر ﷺ بێنن، جا خوێندرایەوە كە ئەمەی تێدا بوو: (بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، لە موحەممەدەوە كە بەندەی خوا و پێغەمبەری خوایە بۆ هیرەقلی گەورەی ڕۆم، سڵاو لەو كەسە بێ كە شوێن ڕاستی و ڕێنمایی دەكەوێ، لەپاش ئەوە، جا بەڕاستی من بانگت دەكەم كە شایەتومان بێنیت و مسوڵمان ببی، مسوڵمان ببە پارێزراو دەبیت (لە دونیا و دوارۆژدا)، خوای گەورە دوو قات پاداشتت دەداتەوە، خۆ ئەگەر مسوڵمان نەبیت و پشت هەڵبكەیت، ئەوا گوناهی ئەوانەی لەژێر دەستی تۆدان لە ئەستۆی تۆدایە، (واتە: خەڵكی ئەو وڵاتە بەگشتی، چونكە ئەو پادشا و گەورەیانە)، وە (ئەی خاوەن نامەكان! وەرن بۆ لای وتەیەكی ڕاست (یەكسان) لە نێوان ئێمە و ئێوەدا، كە جگە لە خوا نەپەرستین و هیچ شتێك نەكەین بە هاوبەشی خوا، هەندێكمان هەندێكی ترمان نەكەین بە پەرستراو، جا ئەگەر پشتیان هەڵكرد ئێوەش بڵێن: ئێوە شاهید بن كە ئێمە مسوڵمانین)، ئەبو سوفیان وتی: كاتێك هیرەقڵ ئەو قسانەی كرد، وە پیاوە گەورەكانی ڕۆم كە لە دەوری بوون دەنگیان بەرز كردەوە، لە نێو خۆیاندا قاڵەقاڵێكی زۆریان بوو، ئیتر نازانم چییان وت،

**فەرمان درا ئێمە کراینە دەرەوە، جا کە من لەگەڵ هاوڕێکانم ڕۆیشتمە دەرەوە بەتەنها خۆم بووم لەگەڵیان، پێم وتن: بەڕاستی کاری کوڕی ئەبو کەبشە[1] گەورە بووە، ئەوەتا پادشای ڕۆم لێی دەترسێ! ئەبو سوفیان وتی: سوێند بەخوا من باوەڕم بوو دڵنیا بووم کە کاری پێغەمبەر ﷺ سەردەکەوێ، تا خوا ئیسلامەتی خستە دڵمەوە و لەو کاتەدا حەزم نەدەکرد.**

**٢٩٤٢-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ القَعْنَبِيُّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ يَوْمَ خَيْبَرَ: «لأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ رَجُلاً يَفْتَحُ الله عَلَى يَدَيْهِ». فَقَامُوا يَرْجُونَ لِذَلِكَ أَيُّهُمْ يُعْطَى، فَغَدَوْا وَكُلُّهُمْ يَرْجُو أَنْ يُعْطَى فَقَالَ: «أَيْنَ عَلِيٌّ؟». فَقِيلَ: يَشْتَكِي عَيْنَيْهِ، فَأَمَرَ فَدُعِيَ لَهُ، فَبَصَقَ فِي عَيْنَيْهِ، فَبَرَأَ مَكَانَهُ حَتَّى كَأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ بِهِ شَيْءٌ، فَقَالَ: نُقَاتِلُهُمْ حَتَّى يَكُونُوا مِثْلَنَا. فَقَالَ «عَلَى رِسْلِكَ حَتَّى تَنْزِلَ بِسَاحَتِهِمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ، وَأَخْبِرْهُمْ بِمَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ، فَوَاللهِ لأَنْ يُهْدَى بِكَ رَجُلٌ وَاحِدٌ خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ»[2].

**٢٩٤٢- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو لە ڕۆژی (غەزای) خەیبەردا دەیفەرموو: ((بێگومان ئاڵاکە دەدەمە دەست پیاوێك لەسەر دەستی ئەودا خوا خەیبەر ئازاد دەکات))، بۆیە هاوەڵان هەموو هەستان بەئومێدی ئەوەی بەکامیان دەدرێت، ئینجا بەیانی هەموو هاتن هەریەکەی بەتەمابوو بەو بدرێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((عەلی لەکوێیە؟))، وترا: چاوەکانی دێشێت،**

---

(١) واتە: پێغەمبەر ﷺ، ئەبو کەبشە یەکێکە لە باپیرەکانی پێغەمبەر و هەندێ دەڵێن: ئەبو کەبشە باوکی شیری پێغەمبەرە ﷺ، واتە: خێزانی ئەو شیری داوە بە پێغەمبەر ﷺ، وەهەندێ دەڵێن: ئەبو کەبشە ناوی پیاوێك بووە لە خوزاعە بتپەرست تەبووە وەك قورەیشیەکان ئەستێرەی گەلاوێژی دەپەرست بەوهەۆیەوە پێغەمبەریان ﷺ پاڵداوەتە لای ئەو چونکە هەردووکیان بت ناپەرستن.(بڕوانە: إرشاد الساري:٤٢٦/٦).

(٢) بڕوانە: ٣٠٠٩، ٣٧٠١، ٤٢١٠.

ئەویش فەرمانی كردو بانگیان كرد بۆ خزمەتی، پێغەمبەریش ﷺ تفی كردە چاوەكانی و هەر لەوێدا چاك بوونەوە هەر وەك هیچ ئازارێكی نەبووبێ، عەلی ﷺ وتی: لە دژیان دەجەنگین هەتا وەك ئێمەیان لێ دێت[1]، فەرمووی ﷺ: ((لەسەرخۆبە و پەلە مەكە هەتا دەچیتە گۆڕەپانەكەیان، پاشان بانگیان بكە بۆ ئیسلام و پێیان بڵێ: چ شتێك پێویست دەبێت لەسەریان، سا سوێند بەخوا ئەگەر بەهۆی تۆوە كەسێك ڕێنمونی بكرێ لە ڕەوگە وشتری سوور[2] چاكترە بۆ تۆ)).

٢٩٤٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا غَزَا قَوْمًا لَمْ يُغِرْ حَتَّى يُصْبِحَ، فَإِنْ سَمِعَ أَذَانًا أَمْسَكَ، وَإِنْ لَمْ يَسْمَعْ أَذَانًا أَغَارَ بَعْدَ مَا يُصْبِحُ، فَنَزَلْنَا خَيْبَرَ لَيْلاً[3].

٢٩٤٣- حومەید دەڵێ: لە ئەنەسم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە كە جەنگی لەدژی هۆزێك بكردبایە، نەیدەدا بەسەریاندا هەتا ڕۆژ دەبۆوە، جا ئەگەر گوێی لەبانگ بوایە هێرشی نەدەكرد، بەڵام ئەگەر گوێی لەبانگ نەبوایە، دەیدا بەسەریاندا دوای ئەوەی ڕۆژ دەبۆوە، ئینجا شەو ڕۆیشتینە خەیبەر.

٢٩٤٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا غَزَا بِنَا[4].

٢٩٤٤- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) قوتەیبە بۆی گێڕاینەوە وتی: ئیسماعیلی كوڕی جەعفەر بۆی گێڕاینەوە لە حومەیدەوە، ئەویش لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕایەوە كە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە كە غەزای پێ دەكردین...[1].

---

(١) واتە: ببنە موسڵمان وەک ئێمە.

(٢) ڕەوگە وشتری سوور لەوكاتەدا لە هەموو شت بەنرختر بووە.

(٣) بڕوانە: ٣٧١.

(٤) بڕوانە: ٣٧١.

٢٩٤٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ إِلَى خَيْبَرَ فَجَاءَهَا لَيْلاً، وَكَانَ إِذَا جَاءَ قَوْمًا بِلَيْلٍ لاَ يُغِيرُ عَلَيْهِمْ حَتَّى يُصْبِحَ، فَلَمَّا أَصْبَحَ خَرَجَتْ يَهُودُ بِمَسَاحِيهِمْ وَمَكَاتِلِهِمْ، فَلَمَّا رَأَوْهُ قَالُوا: مُحَمَّدٌ وَاللهِ، مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «اللهُ أَكْبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ»[٢].

**٢٩٤٥- حومەید دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ (لە مەدینە) دەرچوو بۆ خەیبەر و شەو هاتە خەیبەر، پێغەمبەر ﷺ هەمیشە ئەگەر بڕۆیشتبایە سەر گەلێك، گەر شەو بووایە نەیدەدا بەسەریاندا هەتا ڕۆژ دەبۆوە، جا کاتێك ڕۆژ بۆوە جوولەکەکان بەبێڵ و خاکەنازو سەبەتەکانیانەوە (لە قەڵاکانیان) هاتنە دەرەوە، ئینجا کە پێغەمبەر ﷺ (و لەشکرەکە)یان بینی وتیان: سوێند بەخوا ئەوە موحەممەدە ﷺ، ئەوە موحەممەد و سوپاکەیەتی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەڵلاهو ئەکبەر خەیبەر وێران بوو[٣]، بەڕاستی هەرکات ئێمە بڕۆینە گۆڕەپانی هەر گەلێکەوە ئای چەند خراپە ڕۆژی بێدارکراوەکان)).**

٢٩٤٦- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. فَمَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي نَفْسَهُ وَمَالَهُ، إِلاَّ بِحَقِّهِ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللهِ». رَوَاهُ عُمَرُ وَابْنُ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[٤].

---

(١) ئەمە ڕێگەیەکی ترە کە ئیمامی بوخاری هەمان فەرموودەکەی پێشووی پێ گێڕاوەتەوە، کەواتە فەرموودەکە بەدوو سەنەد هاتووە.

(٢) بڕوانە: ٣٧١.

(٣) واتە: بێگومان وێران دەبێ.

(٤) بڕوانە: ٢٥، ١٣٩٩.

٢٩٤٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فەرمانم پێکراوە لەدژی خەڵك بجەنگم هەتا دەڵێن: هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا، جا هەر کەس وتی: هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا، ئەوە بێگومان گیان و ماڵی لەلایەن منەوە پارێزراوە مەگەر بەهەقی خۆی[1]، لێپرسینەوەشی لەسەر خوایە)). هەریەك لە عومەر و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ ئەم فەرموودەیان لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

## ١٠٣- بابُ مَنْ أَرَادَ غَزْوَةً فَوَرَّى بِغَيْرِهَا، وَمَنْ أَحَبَّ الْخُرُوجَ يَوْمَ الْخَمِيس

٢٩٤٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ كَعْبٍ ﷺوَكَانَ قَائِدَ كَعْبٍ مِنْ بَنِيهِ- قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ: وَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُرِيدُ غَزْوَةً إِلاَّ وَرَّى بِغَيْرِهَا[2].

## ١٠٣- باسی ئەو کەسەی مەبەستی لە غەزاکەی بشارێتەوە و وا پیشان بدات بۆ شوێنێکی تر دەڕوات، وە کەسێک حەزبکات ڕۆژی پێنج شەممە دەربچێت (بۆ سەفەر)

٢٩٤٧- عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە: کە عەبدوڵڵای کوڕی کەعب کە ئەو دەستی کەعبی باوکی دەگرت لەناو کوڕەکانیدا[3]، عەبدوڵڵا دەڵێ: لە کەعبی کوڕی مالیکم ﷺ بیست کاتێك لە

---

(١) تاوانێکی کردبێت لە هەقیدا بکوژرێتەوە، یان ماڵ و سامانێکی لابێت لێی بسەندرێتەوە.

(٢) بڕوانە: ٢٧٥٧.

(٣) کاتێک کەعب کوێر بوو بوو.

**پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێمابوو(لە غەزای تەبوكدا)، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بیویستایە هەر غەزایەك بكات ئەو جێگایەی بۆی دەڕۆیشت دەیشاردەوە، وای نیشان دەدا بۆ جێگایەكی تر دەڕوات (بۆ ئەوەی دوژمن هەستی پێنەكات).**

٢٩٤٨- وَحَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَلَّمَا يُرِيدُ غَزْوَةً يَغْزُوهَا إِلاَّ وَرَّى بِغَيْرِهَا، حَتَّى كَانَتْ غَزْوَةُ تَبُوكَ، فَغَزَاهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي حَرٍّ شَدِيدٍ، وَاسْتَقْبَلَ سَفَرًا بَعِيدًا وَمَفَازًا، وَاسْتَقْبَلَ غَزْوَ عَدُوٍّ كَثِيرٍ، فَجَلَّى لِلْمُسْلِمِينَ أَمْرَهُمْ لِيَتَأَهَّبُوا أُهْبَةَ عَدُوِّهِمْ، وَأَخْبَرَهُمْ بِوَجْهِهِ الذِي يُرِيدُ[١].

**٢٩٤٨- كەعبی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كەم وابوو ویستبێتی بڕوات بۆ غەزایەك، ئیللا وای نیشانداوە بۆ جێگایەكی تر دەڕوات، هەتا غەزای تەبوك پێشهات، كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو غەزایەی كرد لەكاتی گەرمایەكی زۆر بەتیندا بوو، وە ڕووبەڕووی سەفەرێكی درێژ و سەحرا و چۆڵەوانی بوویەوە، وە ڕووبەڕووی جەنگی دوژمنێكی یەكجار زۆر بوویەوە، بۆیە بۆ مسوڵمانانی ڕوونكردنەوە كارەكەیان (چیەو چۆنە) تا ئامادەكاری خۆیان بكەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنەكەیان، وە پێی وتن ئەو شوێنەی دەیەوێ بۆی دەچێ كوێیە.**

٢٩٤٩- وَعَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ كَانَ يَقُولُ لَقَلَّمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَخْرُجُ إِذَا خَرَجَ فِي سَفَرٍ إِلاَّ يَوْمَ الخَمِيسِ[٢].

---

(١) بڕوانە: ٢٧٥٧.

(٢) بڕوانە: ٢٧٥٧.

**٢٩٤٩- کەعبی کوڕی مالیك ﷛ دەڵێ: کەم وابوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕۆیشتبایە بۆ سەفەرێك ڕۆژی پێنج شەممە نەبێت.**

٢٩٥٠- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷛ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ يَوْمَ الخَمِيسِ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، وَكَانَ يُحِبُّ أَنْ يَخْرُجَ يَوْمَ الخَمِيسِ(١).

**٢٩٥٠- عەبدوڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە لە کەعبی باوکیەوە ﷛ کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی پێنج شەممە دەرچوو بۆ غەزای تەبوك، وە هەمیشە پێی خۆش بوو لە ڕۆژانی پێنج شەممەدا دەربچێت (بۆ سەفەر).**

## ١٠٤- بابُ الخُرُوجِ بَعْدَ الظُّهْرِ

٢٩٥١- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷛ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِالْمَدِينَةِ الظُّهْرَ أَرْبَعًا، وَالْعَصْرَ بِذِي الحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، وَسَمِعْتُهُمْ يَصْرُخُونَ بِهِمَا جَمِيعًا(٢).

## ١٠٤- باسی دەرچوون بۆ سەفەر پاش نیوەڕۆ

**٢٩٥١- ئەنەس ﷛ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەمەدینە چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆی کرد، عەسریشی لە زولحەلیفە بەدوو ڕکات کرد، وە گوێم لێ بوو هەموویان بە دەنگی بەرز ئیحرامیان بە حەج و عومرە بەست.**

---

(١) بڕوانە: ٢٧٥٧.

(٢) بڕوانە: ١٠٨٩.

## ١٠٥- بابُ الخُرُوجِ آخِرَ الشَّهرِ

وَقَالَ كُرَيْبٌ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ: انْطَلَقَ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ المَدِينَةِ لِخَمْسٍ بَقِينَ مِنْ ذِي القَعْدَةِ، وَقَدِمَ مَكَّةَ لأَرْبَعِ لَيَالٍ خَلَوْنَ مِنْ ذِي الحِجَّةِ.

**٢١٥٢-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ ﵂ تَقُولُ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ لِخَمْسِ لَيَالٍ بَقِينَ مِنْ ذِي الْقَعْدَةِ، وَلاَ نُرَى إِلاَّ الحَجَّ، فَلَمَّا دَنَوْنَا مِنْ مَكَّةَ أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ إِذَا طَافَ بِالْبَيْتِ وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ أَنْ يَحِلَّ. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَدُخِلَ عَلَيْنَا يَوْمَ النَّحْرِ بِلَحْمِ بَقَرٍ، فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟ فَقَالَ نَحَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ أَزْوَاجِهِ.

## ١٠٥- باسی دەرچوون بۆ سەفەر لە كۆتایی مانگدا (دروستە)

**ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: مانگی زولقەعیدە پێنج ڕۆژی مابوو پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە دەرچوو، وە گەیشتە مەككە لەچواری مانگی زولحیجەدا.**

**٢٩٥٢- عائیشە ﵂ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ كە پێنج شەوی مانگی زولقەعیدە مابوو (لە مەدینە) دەرچووین، نیازمان تەنها حەجكردن بوو، جا كاتێك نزیك بووینەوە لە مەككە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كرد بەوانەی هەدیان پێ نییە، كە تەوافی بەیت و هاتوچۆی نێوان صەفاو مەڕوەیان كرد ئیحرامەكەیان بشكێنن، ئینجا لەڕۆژی جەژنی قوربانددا گۆشتی مانگایان بۆ هێناین، وتم: ئەمە چییە؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەبری خێزانەكانی قوربانی كردووە.**

**٢١٥٢ /م-** قَالَ يَحْيَى: فَذَكَرْتُ هَذَا الحَدِيثَ لِلْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، فَقَالَ أَتَتْكَ وَاللهِ بِالْحَدِيثِ عَلَى وَجْهِهِ[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٩٤.

٢٩٥٢- یەحیا دەڵێ: ئەم فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆ قاسیمی کوڕی موحەممەد، ئەویش وتی: سوێند بەخوا (عەمرەی کچی عەبدوڕەحمان) فەرموودەکەی بۆ هێناوی وەك خۆی (بێ زیاد و کەم).

## ١٠٦- بابُ الخُرُوجِ فِي رَمَضَانَ

٢٩٥٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي الزُّهْرِيُّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ فِي رَمَضَانَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ الكَدِيدَ أَفْطَرَ. قَالَ سُفْيَانُ: قَالَ الزُّهْرِيُّ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. وَسَاقَ الحَدِيثَ[1].

## ١٠٦- باسی دەرچوون بۆ سەفەر لە ڕەمەزاندا (دروستە)

٢٩٥٣- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەڕەمەزاندا دەرچوو (ڕوو بەمەککە) و بەڕۆژوو بوو، هەتا گەیشتە کەدید ڕۆژووەکەی شکاند. سوفیان دەڵێ: زوهری دەڵێ: عوبەیدوڵڵا لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ بۆی گێڕاومەتەوە، ئینجا فەرموودەکەی گێڕایەوە و هێنای[2].

## ١٠٧- باب التَّوْدِيعِ

٢٩٥٤- وَقَالَ ابْنُ وَهْبٍ: أَخْبَرَنِي عَمْرٌو، عَنْ بُكَيْرٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي بَعْثٍ، وَقَالَ لَنَا: "إِنْ لَقِيتُمْ فُلَانًا وَفُلَانًا- لِرَجُلَيْنِ مِنْ قُرَيْشٍ سَمَّاهُمَا- فَحَرِّقُوهُمَا بِالنَّارِ". قَالَ: ثُمَّ أَتَيْنَاهُ نُوَدِّعُهُ حِينَ أَرَدْنَا الْخُرُوجَ فَقَالَ: «إِنِّي

(١) بڕوانە: ١٩٤٤.

(٢) وەک فەرموودەکەی پێشوو.

كُنْتُ أَمَرْتُكُمْ أَنْ تُحَرِّقُوا فُلاَنًا وَفُلاَنًا بِالنَّارِ، وَإِنَّ النَّارَ لاَ يُعَذِّبُ بِهَا إِلاَّ الله، فَإِنْ أَخَذْتُمُوهُمَا فَاقْتُلُوهُمَا»[1].

## ١٠٧- باسی خواحافیزی کردن(دروسته)

**٢٩٥٤- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ یەکێك لە هێزەکاندا ئێمەی نارد و فەرمووی پێمان: ((ئەگەر بەفلاّن کەس و فلاّن کەس گەیشتن - بەدوو پیاوی فەرموو لەقوڕەیش کە ناویانی هێنا-، ئەوە هەردووکیان بەئاگر بسووتێنن))، ئەبو هوڕەیرە دەڵێ: پاشان هاتینەوە خزمەتی کاتێك ویستمان دەربچین خوا حافیزی لێ بکەین، فەرمووی: ((من فەرمانم پێ کردن کە فلاّنە کەس و فلاّنە کەس بسووتێنن بەئاگر، وە بێگومان تەنها خوا بەئاگر سزا(ی خەڵك) دەدات، بۆیە ئەگەر دەستگیرتان کردن بیانکوژن)).**

## ١٠٨- بابُ السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ لِلإِمَامِ ما لم يأمر بمعصية

**٢٩٥٥-** حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ زَكَرِيَّاءَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ حَقٌّ، مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِالْمَعْصِيَةِ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٣٠١٦.

(٢) بڕوانە: ٧١٤٤.

## ١٠٨- باسی گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ پێشەوا بەمەرجێک فەرمان نەکات بە گوناهو تاوان

٢٩٥٥- ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((گوێڕایەڵی و ملکەچی هەق پێویستە (لەسەر هەموو باوەڕدارێك بۆ فەرمانڕەوا)، بە مەرجێك فەرمانی پێ نەکریٚ بە گوناهو تاوان، خۆ ئەگەر فەرمانی پێکرا بەگوناهو تاوان، ئەوە گوێڕایەڵی و ملکەچی دروست نییە)).

## ١٠٩ - بابٌ: الإمام يُقاتلُ من وَراءَ وَيُتَّقى بِهِ

٢٩٥٦- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، أَنَّ الأَعْرَجَ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ»[١].

## ١٠٩- باسێک: لەدوای پێشەواوە جەنگ دەکرێت و پشت و پەناش دەبێت

٢٩٥٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((ئێمەین کۆتاهەمینی (لە دونیادا) پێشکەوتووان (لە دوارۆژدا) )).

٢٩٥٧ - وَبِهَذَا الإِسْنَادِ «مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللهَ، وَمَنْ يُطِعِ الأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ الأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي، وَإِنَّمَا الإِمَامُ جُنَّةٌ يُقَاتَلُ مِنْ وَرَائِهِ وَيُتَّقَى بِهِ، فَإِنْ أَمَرَ بِتَقْوَى اللهِ وَعَدَلَ، فَإِنَّ لَهُ بِذَلِكَ أَجْرًا، وَإِنْ قَالَ بِغَيْرِهِ، فَإِنَّ عَلَيْهِ مِنْهُ»[٢].

---

(١) بڕوانە: ٢٣٨.

(٢) بڕوانە: ٧١٣٧.

**٢٩٥٧- ئەبو هورەیرە[1] ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((هەرکەس فەرمانبەری من بکات ئەوە بێگومان فەرمانبەری خوای کردووە، هەرکەسیش سەرپێچی من بکات ئەوە بەڕاستی سەرپێچی خوای کردووە، وە هەرکەس فەرمانبەری فەرمانڕەواکەی بکات ئەوە بەڕاستی فەرمانبەری منی کردووە، هەرکەسیش سەرپێچی فەرمانڕەواکەی بکات، ئەوە بەڕاستی سەرپێچی منی کردووە، وە بێگومان پێشەوا قەڵغانە، لە پشتیەوە[2] جەنگ دەکرێت و بەو خۆدەپارێزێ (لە دوژمن)، جا ئەگەر فەرمانی کرد بەپارێزگاری و دادگەری بەرپاکرد، ئەوە بێگومان بەوە پاداشتی بۆ هەیە، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەی (پارێزگاری و دادگەری) فەرمانی کرد، ئەوە بەڕاستی تاوانبار دەبێت[3])).**

## ١١٠- بابُ البَيْعَةِ فِي الحَرْبِ أَنْ لَا يَفِرُّوا

وَقَالَ بَعْضُهُمْ: عَلَى المَوْتِ، لِقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ ﴿١٨﴾ ﴾ الفتح.

**٢٩٥٨-** حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما: رَجَعْنَا مِنَ العَامِ المُقْبِلِ، فَمَا اجْتَمَعَ مِنَّا اثْنَانِ عَلَى الشَّجَرَةِ الَّتِي بَايَعْنَا تَحْتَهَا، كَانَتْ رَحْمَةً مِنَ اللهِ. فَسَأَلْتُ نَافِعًا: عَلَى أَيِّ شَيْءٍ بَايَعَهُمْ؟ عَلَى المَوْتِ؟ قَالَ: لَا، بَايَعَهُمْ عَلَى الصَّبْرِ.

---

(١) بەهەمان ڕێگە و ڕشتەی فەرموودەی: ٢٩٥٦.

(٢) دەگونجێ مەبەست لە (وراء) پێشەوە بێت، یان هەر لایەکی تر. فتح الباري: ١٤٤/٧ ارشاد و ساري: ١١٩/٥.

(٣) یان تاوانەکەی لەسەر ئەوە دەبێت.

# ١١٠- باسی پەیماندان کە هەڵنەیەن لە جەنگدا

وە هەندێکیان دەڵێن: پەیماندان لەسەر مردن[١] بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بێگومان خوا ڕازی بووە لەو باوەڕدارانەی کە پەیمانیان پێ دایت لەژێر درەختەکەدا (لە حودەیبییە)[٢])).

٢٩٥٨- نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر ﷺ وتی: لەساڵی داهاتوودا[٣] گەڕاینەوە و دوو کەسمان یەك دەنگ نەبووین لەسەر ئەو درەختەی کە لەژێریدا پەیمانمان (بە پێغەمبەر ﷺ)دا، ئەوەش لە بەزەیی خواوە بوو[٤]، جوەیرییە دەڵێ پرسیارم لە نافیع کرد: (پێغەمبەر ﷺ) لەسەر چ شتێك پەیمانی لێ وەرگرتن؟ لەسەر مردن بوو؟ وتی: نەخێر، بەڵکو پەیمانی لێ وەرگرتن لە سەر خۆڕاگری و هەڵنەهاتن.

٢٩٥٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ يَحْيَى، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا كَانَ زَمَنَ الحَرَّةِ أَتَاهُ آتٍ فَقَالَ لَهُ: إِنَّ ابْنَ حَنْظَلَةَ يُبَايِعُ النَّاسَ عَلَى الْمَوْتِ. فَقَالَ: لاَ أُبَايِعُ عَلَى هَذَا أَحَدًا بَعْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ[٥].

٢٩٥٩- عەبدوڵڵای کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: لە ڕووداوی حەڕڕەدا[٦] کەسێك هات بۆ لای و پێی وت: بێگومان عەبدوڵڵای کوڕی حەنزەلە پەیمان لە خەڵکی

---

(١) واتە: هەڵنەیەن یا بشمرن.

(٢) سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ کە یەکێکە لەوانەی بەشداری ئەو بەیعەتە بووە دەڵێ: بەیعەتی لێ وەرگرتین لەسەر مردن.

(٣) پاش ئەو ساڵەی ڕێککەوتنی حودەیبیە کرا.

(٤) کە دیار نەما یان لێمان ڕوون نەبوو، تا خەڵکی نەزان دواتر وەک شتێکی پیرۆز سەیری نەکەن و ببێتە هۆی سەرلێشێوان و گومڕا بوون (إرشاد الساری ١٢٠/٥).

(٥) بڕوانە: ٤١٦٧.

(٦) لە سەردەمی یەزیدی کوڕی مەعاویەدا ﷺ مەدینە بە لەشکری شامی دەورەدرا و شەڕ و کوشتارێک لە دەرەوەی مەدینە ڕوویدا، کە پێی دەڵێن: حەڕڕە.(بڕوانە: إرشاد الساري: ٤٣٨/٦).

**وەردەگرێ لەسەر مردن، (عەبدوڵڵای کوڕی زەید) وتی: لە پاش پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەمە (مردن) پەیمان بە کەسی تر نادەم.**

**٢٩٦٠-** حَدَّثَنَا الْمَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ سَلَمَةَ ﷺ قَالَ: بَايَعْتُ النَّبِيَّ ﷺ ثُمَّ عَدَلْتُ إِلَى ظِلِّ الشَّجَرَةِ، فَلَمَّا خَفَّ النَّاسُ قَالَ «يَا ابْنَ الأَكْوَعِ، أَلاَ تُبَايِعُ؟». قَالَ قُلْتُ قَدْ بَايَعْتُ يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ: «وَأَيْضًا». فَبَايَعْتُهُ الثَّانِيَةَ. فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا مُسْلِمٍ، عَلَى أَيِّ شَيْءٍ كُنْتُمْ تُبَايِعُونَ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: عَلَى الْمَوْتِ[1].

**٢٩٦٠- سەلەمە ﷺ دەڵێ: پەیمانم بەپێغەمبەر ﷺ دا، پاشان ڕۆیشتمە سێبەری درەختەکە، جا کە خەڵکەکە کەم بوون (قەرەباڵغییەکە نەما) فەرمووی: ((ئەی کوڕی ئەکوەع پەیمانم پێ نادەیت؟))، سەلەمە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانم پێدایت، فەرمووی: ((جارێکی دیکەش پەیمانم پێ بدە))، ئینجا بۆ دووەمجار پەیمانم پێدا (یەزیدی کوڕی ئەبو عوبەید دەڵێ:) منیش وتم: ئەی ئەبو موسلیم لەو ڕۆژەدا ئێوە لەسەر چ شتێك پەیمانتان دەدا؟ وتی: لەسەر مردن.**

**٢٩٦١-** حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ يَقُولُ كَانَتِ الأَنْصَارُ يَوْمَ الخَنْدَقِ تَقُولُ:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدَا عَلَى ... الْجِهَادِ مَا حَيِينَا أَبَدَا

فَأَجَابَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ:

اللَّهُمَّ لاَ عَيْشَ إِلاَّ عَيْشُ الآخِرَهْ ... فَأَكْرِمِ الأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَهْ[2].

---

(١) بڕوانە: ٤١٦٩، ٧٢٠٦، ٧٢٠٨.

(٢) بڕوانە: ٢٨٣٤.

٢٩٦١- حومەید دەڵێ: لە ئەنەسم ﷺ بیست دەیوت: ئەنصارییەکان لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا دەیانوت:

ئێمە ئەوانەین پەیمانمان دا بە موحەممەد ..... لەسەر جیهاد بمێنین هەتا ئەبەد

ئینجا پێغەمبەری خواش وەڵامی دەدانەوە و دەیفەرموو:

((خوایە خێرو خۆشی هی جیهانی دوا ڕۆژە ..... دەخۆش ببە لەو پشتیوان ص کۆچبەرانە))[1].

٢٩٦٢- ٢٩٦٣- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، سَمِعَ مُحَمَّدَ بْنَ فُضَيْلٍ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ مُجَاشِعٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَنَا وَأَخِي، فَقُلْتُ: بَايِعْنَا على الْهِجْرَةِ. فَقَالَ: «مَضَتِ الْهِجْرَةُ لأَهْلِهَا». فَقُلْتُ: عَلاَمَ تُبَايِعُنَا قَالَ: «عَلَى الإِسْلاَمِ وَالْجِهَادِ»[2].

٢٩٦٢- ٢٩٦٣- عاصیم لە ئەبو عوسمانەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لە موجاشیعەوە ﷺ دەڵێ: من و براکەم (موجالید) ڕۆیشتینە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ عەرزم کرد: لەسەر کۆچکردن پەیمانمان لێ وەربگرە، ئەویش فەرمووی: ((کۆچکردن تەواو بوو و بەسەرچوو بۆ خاوەنەکانی))، وتم: ئەی لەسەر چی پەیمانمان لێ وەردەگرێت؟ فەرمووی: ((لەسەر ئیسلام و جیهادکردن)).

---

(١) ئەم هۆنراوانە سەرچاوەکەی: فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم لە وەرگێڕانی حەمەکریم عەبدوڵڵا: ٣٠٩، ٣١٠.

(٢) الحديث ٢٩٦٢: (٣٠٧٨، ٤٣٠٥، ٤٣٠٧).

الحديث ٢٢٠٢: (٣٠٧٩، ٤٣٠٦، ٤٣٠٨).

## ١١١- بَابُ عَزْمِ الإِمَامِ عَلَى النَّاسِ فِيمَا يُطِيقُونَ

٢٩٦٤- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ لَقَدْ أَتَانِي اليَوْمَ رَجُلٌ، فَسَأَلَنِي عَنْ أَمْرٍ مَا دَرَيْتُ مَا أَرُدُّ عَلَيْهِ، فَقَالَ أَرَأَيْتَ رَجُلاً مُؤْدِيًا نَشِيطًا، يَخْرُجُ مَعَ أُمَرَائِنَا فِي المَغَازِي، فَيَعْزِمُ عَلَيْنَا فِي أَشْيَاءَ لاَ نُحْصِيهَا؟ فَقُلْتُ لَهُ: وَاللهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لَكَ، إِلاَّ أَنَّا كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَعَسَى أَنْ لاَ يَعْزِمَ عَلَيْنَا فِي أَمْرٍ إِلاَّ مَرَّةً حَتَّى نَفْعَلَهُ، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَنْ يَزَالَ بِخَيْرٍ مَا اتَّقَى اللهَ، وَإِذَا شَكَّ فِي نَفْسِهِ شَيْءٌ سَأَلَ رَجُلاً فَشَفَاهُ مِنْهُ، وَأَوْشَكَ أَنْ لاَ تَجِدُوهُ، وَالَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ مَا أَذْكُرُ مَا غَبَرَ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ كَالثَّغْبِ، شُرِبَ صَفْوُهُ وَبَقِيَ كَدَرُهُ.

## ١١١- باسی فەرمانبەری پێشەوا لەسەر خەڵک پێویستە لەوەدا لە توانایاندا بێت

**٢٩٦٤- عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ دەڵێ: ئەمرۆ پیاوێك هات بۆ لام و پرسیاری شتێکی لێ کردم، نەمزانی چی وەڵام بدەمەوە، وتی: پێم بڵێ کەسێکمان بەهێز و گورج و گۆڵ بوو (لە جەنگدا)، لەگەڵ فەرماندەکانمدا دەڕوات بۆ غەزا، داوای خۆڕاگریمان لێدەکات لەشتانێکدا ناتوانین بیکەین[١]؟ منیش پێم وت: وەڵڵاهی نازانم چیت پێ بڵێم، بەڵام کاتی خۆی کە ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، وا دەبوو یەکجار کارێکی قورس و گرانی لێ داوا دەکردین کە بیکەن، وە هەرکەس لە ئێوە بەردەوام لەچاکەدایە تا تەقوای خوا بکات، وە ئەگەر لە دڵیدا گومانی لەشتێك هەبوو پرسیار لەپیاوێك(ی زانا) بکات لەو گومانە ڕزگاری دەکات، وە لەوانەشە ئەو کەسەت دەست نەکەوێت[٢]، جا**

---

(١) یان [لا نحصیها] مانایەکی دیکەشی هەیە: نازانین چاکەیە یان خراپە.

(٢) پرسیارەکەی لێ بکەیت.

سوێند بەو زاتەی هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە جگە لەو، ئەوەی من بیرم بێ و تێبگەم ئەوەی لەدونیا بەسەرچووە، (بەچاو ئەوەی كە ماوە) وەك چالاوێك وایە ئاوە ڕوون و پاكەكەی خورابێتەوە، لیل و خەوشاوێكەی مابێتەوە.

## ١١٢ - بابٌ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا لَمْ يُقَاتِلْ أَوَّلَ النَّهَارِ أَخَّرَ القِتَالَ حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ

٢٩٦٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمٍ أَبِي النَّضْرِ -مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، وَكَانَ كَاتِبًا لَهُ- قَالَ: كَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى ﷺ فَقَرَأْتُهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ فِي بَعْضِ أَيَّامِهِ التِي لَقِيَ فِيهَا انْتَظَرَ حَتَّى مَالَتِ الشَّمْسُ[١].

## ١١٢- باسێک: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لەسەرەتای ڕۆژەوە جەنگی نەکردایە، جەنگەکەی دوادەخست هەتا خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدەدا[٢]

٢٩٦٥- سالیمی ئەبو نەزر -كە كۆیلەی ئازادكراوی عومەری كوڕی عوبەیدوڵڵا بوو كە نووسەری عومەریش بوو- دەڵێ: عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ نامەیەكی نووسی بۆ عومەر، منیش خوێندمەوە، (نووسیبووی:) پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەندێك لەڕۆژەكانی (جەنگكردنیدا) كە ڕووبەڕووی دوژمن دەبۆوە، تیایدا چاوەڕوانی دەكرد هەتا خۆر لایدەدا (لەناوەڕاستی ئاسمان).

---

(١) بڕوانە: ٢٨١٨.

(٢) واتە: پاش نیوەڕۆ، چونكە لەوكاتەدا خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لا دەدات.

**٢٩٦٦-** ثُمَّ قَامَ فِي النَّاسِ قَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ، لاَ تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، وَسَلُوا اللهَ العَافِيَةَ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ الجَنَّةَ تَحْتَ ظِلاَلِ السُّيُوفِ، ثُمَّ قَالَ اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الكِتَابِ وَمُجْرِيَ السَّحَابِ وَهَازِمَ الأَحْزَابِ، اهْزِمْهُمْ وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ»[1].

**٢٩٦٦- پاشان هەڵسا و لەناو خەڵکەکەدا فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە! خۆزگە بەگەیشتن و بەرەنگاربوونەوەی دوژمن مەخوازن، داوای سەلامەتی و بێوەیی لە خوا بکەن، بەڵام کە بەرانبەریان بوونەوە خۆگر بن، وە بەدڵنیاییەوە بزانن (لەوکاتەدا) بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکاندایە))، پاشان فەرمووی: ((ئەی خوایە! دابەزێنەری قورئان، هێنەری هەورەکان، تێکشکێنەری تاقمی بێ باوەڕەکان، تێکیان بشکێنە و سەرمان بخە بەسەریاندا)).**

## ١١٣- بابُ اسْتِئْذَانِ الرَّجُلِ الإِمَامَ

لِقَوْلِهِ تعالى: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ ﴿٦٢﴾﴾ النور، الآيَةَ.

**٢٩٦٧-** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا جَرِيرٌ، عَنِ المُغِيرَةِ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: فَتَلاَحَقَ بِي النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا عَلَى نَاضِحٍ لَنَا قَدْ أَعْيَا فَلاَ يَكَادُ يَسِيرُ فَقَالَ لِي: «مَا لِبَعِيرِكَ؟». قَالَ: قُلْتُ: عَيِيَ. قَالَ فَتَخَلَّفَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَزَجَرَهُ وَدَعَا لَهُ، فَمَا زَالَ بَيْنَ يَدَيِ الإِبِلِ قُدَّامَهَا يَسِيرُ. فَقَالَ لِي «كَيْفَ تَرَى بَعِيرَكَ». قَالَ

(١) بڕوانە: ٢٨١٨، ٢٩٣٣.

قُلْتُ بِخَيْرٍ قَدْ أَصَابَتْهُ بَرَكَتُكَ. قَالَ: «أَفَتَبِيعُنِيهِ؟». قَالَ: فَاسْتَحْيَيْتُ، وَلَمْ يَكُنْ لَنَا نَاضِحٌ غَيْرَهُ، قَالَ: فَقُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «فَبِعْنِيهِ». فَبِعْتُهُ إِيَّاهُ عَلَى أَنَّ لِي فَقَارَ ظَهْرِهِ حَتَّى أَبْلُغَ الْمَدِينَةَ. قَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي عَرُوسٌ، فَاسْتَأْذَنْتُهُ فَأَذِنَ لِي، فَتَقَدَّمْتُ النَّاسَ إِلَى الْمَدِينَةِ حَتَّى أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ، فَلَقِيَنِي خَالِي فَسَأَلَنِي عَنِ الْبَعِيرِ، فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا صَنَعْتُ فِيهِ فَلاَمَنِي، قَالَ وَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَالَ لِي حِينَ اسْتَأْذَنْتُهُ: «هَلْ تَزَوَّجْتَ بِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا؟». فَقُلْتُ: تَزَوَّجْتُ ثَيِّبًا. فَقَالَ: «هَلاَّ تَزَوَّجْتَ بِكْرًا تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ تُوُفِّيَ وَالِدِي -أَوِ اسْتُشْهِدَ- وَلِي أَخَوَاتٌ صِغَارٌ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَتَزَوَّجَ مِثْلَهُنَّ، فَلاَ تُؤَدِّبُهُنَّ، وَلاَ تَقُومُ عَلَيْهِنَّ، فَتَزَوَّجْتُ ثَيِّبًا لِتَقُومَ عَلَيْهِنَّ وَتُؤَدِّبَهُنَّ. قَالَ: فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمَدِينَةَ غَدَوْتُ عَلَيْهِ بِالْبَعِيرِ، فَأَعْطَانِي ثَمَنَهُ، وَرَدَّهُ عَلَيَّ. قَالَ الْمُغِيرَةُ: هَذَا فِي قَضَائِنَا حَسَنٌ لاَ نَرَى بِهِ بَأْسًا[1].

## ١١٣- باسی داوای مۆڵەت[2] کردنی کەسێك لە پێشەوە

**بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بەڕاستی ئیمانداران تەنها ئەوانەن کە بڕوایان بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە، وە هەرکاتێك لەگەڵ ئەو (پێغەمبەر ﷺ)دا بن لەکارێکی گرنگدا کە کۆیان دەکاتەوە (وەك: غەزا و جومعە و جەژن ....)، ناڕۆن بەهیچ لایەکدا هەتا مۆڵەت لە پێغەمبەر ﷺ وەرنەگرن، بێگومان ئەوانەی مۆڵەتت لێ وەردەگرن ...) تا کۆتایی ئایەتەکە.**

**٢٩٦٧- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆیشتم بۆ غەزا، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەمن گەیشت، لەوکاتەدا من بەسواری**

---

(١) بږوانە: ٤٤٣.

(٢) مۆڵەتی گەڕانەوە لە جەنگەکە یان نەڕۆیشتن بۆ جەنگەکە.

وشترێکی ئاوکێشی خۆمانەوە بووم، زۆر ماندوو بوو بوو و نەدەڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ بەمنی فەرموو: ((وشترەکەت چییەتی؟)) دەڵێ: وتم: زۆر ماندوو بووە، جابیر دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دواخست، جا تێیخوڕی و دوعای بۆ کرد، ئیتر بەردەوام (وشترەکەم) لە پێشەوەی وشترەکانەوە دەڕۆیشت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: ((وشترەکەت چۆن دەبینی؟[1]))، دەڵێ: وتم: باشە، بەڕاستی فەڕ و بەرەکەتی تۆی بەرکەوتووە، فەرمووی: ((پێم دەفرۆشیت؟)) جابیر وتی: منیش شەرمم کرد (لە پێغەمبەر ﷺ)، چونکە تەنها ئەو وشترەمان هەبوو ئاوی پێ بێنین، دەڵێ: وتم: بەڵێ (دەیفرۆشم)، فەرمووی: ((دەی پێم بفرۆشە))، منیش پێم فرۆشت بەو مەرجەی سواری بم هەتا دەگەمەوە مەدینە، دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من تازە زاوام، بۆیە مۆڵەتم لێ خواست، ئەویش مۆڵەتی دام، ئینجا پێشی خەڵکەکە کەوتم (بۆ ڕۆیشتنەوە) بۆ مەدینە هەتا گەیشتمە مەدینە، جا خاڵم پێم گەیشت و پرسیاری وشترەکەی لێ کردم، منیش پێم وت چیم لێ کردووە، خاڵم لۆمەی کردم، جابیر دەڵێ: کاتێك داوای مۆڵەتم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد فەرمووی پێم: ((ئایا کچت هێناوە یان بێوەژن؟)) وتم: بێوەژنم هێناوە، فەرمووی: ((بۆچی کچێکت نەهێنا یاری لەگەڵ بکەیت و یاریت لەگەڵدا بکات؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکم مرد -یان شەهیدبوو- چەند خوشکێکی بچووکم هەیە، بۆیە پێم خۆش نەبوو کچێکی لە تەمەنی خۆیاندا مارە بکەم کە نەتوانێ پەروەردەیان بکات و سەرپەرشتیان بکات، لەبەرئەوە بێوەژنێکم هێنا تا سەرپەرشتیان بکات و ئەدەبیان دابدات. جابیر دەڵێ: جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە بۆ مەدینە، بەیانی زوو بەوشترەکەوە ڕۆیشتم بۆ لای، ئەویش نرخەکەی پێدام و وشترەکەشی دایەوە

---

(١) یان چۆنە بەلاتەوە.

پێم (بۆ خۆم). موغیره[1] دەڵێ: ئەم (مامەڵە بەو مەرجە) لە حوکم و بڕیارەکانی ئێمەدا دروستە وجوانە، هیچ خراپەیەکی تێدا نابینین.

## ١١٤- بابُ مَنْ غَزَا وَهُوَ حَدِيثُ عَهْدٍ بِعُرْسِه

فِيهِ جَابر، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

## ١١٤- باسی کەسێك غەزا بکات تازە هاوسەرگیری کردبێ

لەم باسەدا فەرموودەکەی جابیر ﷺ هەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە.

## ١١٥- بابُ مَنِ اخْتَارَ الغَزْوَ بَعْدَ البِنَاءِ

فيه: أبو هُرَيرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

## ١١٥- باسی کەسێک غەزاکردن هەڵبژێرێت پاش ئەوەی سەرجێیی کردبێت لەگەڵ خێزانە تازەکەیدا

لەم باسەدا فەرموودەی ئەبو هورەیرە ﷺ هەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە[2].

## ١١٦- بابُ مُبَادَرَةِ الإِمَامِ عِنْدَ الفَزَعِ

٢٩٦٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، حَدَّثَنِي قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ بِالْمَدِينَةِ فَزَعٌ، فَرَكِبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَرَسًا لأَبِي طَلْحَةَ، فَقَالَ: .مَا رَأَيْنَا مِنْ شَيءٍ، وَإِنْ وَجَدْنَاهُ لَبَحْرًا.[1].

---

(١) موغیرەی کوڕی موقسیم کە یەکێکە لە شەرعزانەکانی کوفە (فتح الباري: ٦/١٢٢)، کە یەکێکیشە لە ڕاویەکانی ئەم فەرموودەیە.

(٢) کە لە باسی (كتاب فرض الخمس)ـدا دێت بەژمارە: ٣١٢٤.

## ١١٦- باسی پەلەكردن (لە سواربوونی وڵاخ و) بەدەمەوەچوونی پێشەوا لەكاتی (ڕوودانی) ترسدا

**٢٩٦٨- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە مەدینەدا ترس و دڵەڕاوكێیەك (لە شەودا) هەبوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ سواری ئەسپێكی ئەبو تەڵحە بوو فەرمووی: ((هیچمان نەدی مایەی ترس بێت، بەڵام ئەم ئەسپە زۆر خێرا و بەهەڵمەتە)).**

## ١١٧- بابُ السُّرْعَةِ وَالرَّكْضِ فِي الفَزَعِ

٢٩٦٩- حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ سَهْلٍ، حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: فَزِعَ النَّاسُ، فَرَكِبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَرَسًا لأَبِي طَلْحَةَ بَطِيئًا، ثُمَّ خَرَجَ يَرْكُضُ وَحْدَهُ، فَرَكِبَ النَّاسُ يَرْكُضُونَ خَلْفَهُ، فَقَالَ: «لَمْ تُرَاعُوا، إِنَّهُ لَبَحْرٌ». فَمَا سُبِقَ بَعْدَ ذَلِكَ الْيَوْمِ[٢].

## ١١٧- باسی دەست و برد كردن و غاردان لەكاتی (ڕوودانی) ترسدا

**٢٩٦٩- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ وتی: خەڵكی مەدینە ترسان[٣]، پێغەمبەری خواش ﷺ سواری ئەسپێكی تەمبەڵی ئەبو تەڵحە بوو، پاشان لە مەدینە دەرچوو بەتەنها بەغاردان، ئەوسا خەڵكیش سواری وڵاخەكانیان بوون بەغاردان بەشوێنیدا ڕۆیشتن، (پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە و) فەرمووی: ((مەترسن، بەڕاستی ئەم ئەسپە دەڵێی بەحرە لەخێراییدا))، جا دوای ئەو ڕۆژە هیچ وڵاخێك پێشی ئەو ئەسپەی نەدەدایەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٢٦٢٧.

(٢) بڕوانە: ٢٦٢٧.

(٣) لەوەی دوژمن دێنە سەر مەدینە یان شتێ لەوجۆرە.

## ١١٨- بابُ الخُرُوجِ فِي الفَزَعِ وَحْدَهُ

## ١١٩- بابُ الجَعَائِلِ وَالْحُمْلَانِ فِي السَّبِيلِ

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: قُلْتُ لابْنِ عُمَرَ: أريد الغَزْوَ. قَالَ: إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أُعِينَكَ بِطَائِفَةٍ مِنْ مَالِي. قُلْتُ: أَوْسَعَ اللهُ عَلَيَّ. قَالَ: إِنَّ غِنَاكَ لَكَ، وَإِنِّي أُحِبُّ أَنْ يَكُونَ مِنْ مَالِي فِي هذا الوَجْهِ. وَقَالَ عُمَرُ إِنَّ نَاسًا يَأْخُذُونَ مِنْ هذا المَالِ لِيُجَاهِدُوا ثُمَّ لَا يُجَاهِدُونَ، فَمَنْ فَعَلَهُ فَنَحْنُ أَحَقُّ بِمَالِهِ حَتَّى نَأْخُذَ مِنْهُ مَا أَخَذَ.

وَقَالَ طَاوُسٌ وَمُجَاهِدٌ: إِذَا دُفِعَ إِلَيْكَ شَيْءٌ تَخْرُجُ بِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ فَاصْنَعْ بِهِ مَا شِئْتَ، وَضَعْهُ عِنْدَ أَهْلِكَ.

## ١١٨- باسی دەرچوون بەتەنها لەکاتی ڕوودانی ترسدا[1]

## ١١٩- باسی پارەدان بەکەسێک جیهادی پێ بکات یان وڵاخی سواری ببەخشێت جیهادی پێ بکرێت لەڕێی خوادا

**موجاهید دەڵێ: بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم ﷺ وت: (دەمەوێت) غەزا بکەم، وتی: من پێم خۆشە بەهەندێك لە سامانەکەم هاوکاریت بکەم (بۆ غەزاکردنەکەت)، وتم: خوا سامانی زۆری پێداوم، وتی: دەوڵەمەندییەکەت بۆ خۆتە، بەڵام من پێم خۆشە سامانەکەم (کە دەتدەمێ) ئا لەم ڕێگەدا خەرج بکرێت. عومەر ﷺ دەڵێ: بەڕاستی کەسانێك لەم ماڵ و سامانە(ی مسوڵمانان) وەردەگرن تا جیهادی پێ بکەن، پاشان جیهادیشی پێ ناکەن، جا هەرکەس وای کرد ئەوە ئێمە بەسامانەکەی (کە وەریگرتووە) لەپێشترین هەتا ئەوەی وەریگرتووە، وەری دەگرینەوە لێی.**

---

(١) لە هەنـدێک نوسـخەی بوخاریـدا ئەم باسـە نیـیە و لە هەندێکیانـدا هەیە، هـیچ فەرمـوودەیەکی بـۆی نەهێناوە.(بڕوانە: فتح الباري:٦/١٥٢).

**تاووس و موجاهید دەڵێن: ئەگەر هەرشتێکیان پێدایت بڕۆیت جیهادی پێ بکەیت لەڕێی خوادا، هەرچی لێ دەکەیت بیکە بەویستی خۆت، (هەتا ئەگەر دانانی بێت بۆ ماڵ و منداڵت دروستە.**

٢٩٧٠- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: سَمِعْتُ مَالِكَ بْنَ أَنَسٍ سَأَلَ زَيْدَ بْنَ أَسْلَمَ، فَقَالَ زَيْدٌ سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ حَمَلْتُ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَرَأَيْتُهُ يُبَاعُ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ: آشْتَرِيهِ؟ فَقَالَ: «لاَ تَشْتَرِهِ، وَلاَ تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ»[(١)].

**٢٩٧٠- سوفیان دەڵێ: لە مالیکی کوڕی ئەنەسم بیست پرسیاری لە زەیدی کوڕی ئەسلەم کرد، زەیدیش وتی: لە باوکمم بیست دەیوت: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: ئەسپێکم بەخشی لەڕێی خوادا بەجەنگاوەرێك سواری بێ، ئینجا ئەسپەکەم دی دەفرۆشرێت، پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد ئایا بیکڕم؟ ئەویش فەرمووی: ((مەیکڕە، بەخشینەکەت (بەپارە) مەگێڕەوە بۆ خۆت)).**

٢٩٧١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِك، عَنْ نَافِع، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَوَجَدَهُ يُبَاعُ، فَأَرَادَ أَنْ يَبْتَاعَهُ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: "لَا تَبْتَعْهُ، وَلَا تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ"[(٢)].

**٢٩٧١- عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ئەسپێکی بەخشی لەڕێی خوادا (بەجەنگاوەرێك سواری بێت)، پاشان عومەر ئەسپەکەی دی دەفرۆشرێت، جا ویستی بیکڕێتەوە، بۆیە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد (ئایا بیکڕم؟)، ئەویش فەرمووی: ((مەیکڕەوە، بەخشینەکەت (بەپارە) مەگێڕەوە بۆ خۆت)).**

---

(١) بڕوانە: ١٤٩٠.

(٢) بڕوانە: ١٤٨١.

**٢٩٧٢**- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي أبو صَالِحٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي مَا تَخَلَّفْتُ عَنْ سَرِيَّةٍ، ولكن لَا أَجِدُ حَمُولَةً، وَلَا أَجِدُ مَا أَحْمِلُهُمْ عَلَيْهِ، وَيَشُقُّ عَلَيَّ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِّي، وَلَوَدِدْتُ أَنِّي قَاتَلْتُ فِي سَبِيلِ اللهِ فَقُتِلْتُ، ثُمَّ أُحْيِيتُ ثُمَّ قُتِلْتُ، ثُمَّ أُحْيِيتُ"[1].

**٢٩٧٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر لەسەر ئوممەتم قورس نەبوایە لەهیچ هێزێك بەجێ نەدەمام، بەڵام وشتری سواریم نییە، وە وڵاخم نییە بیدەم بەو خەڵکە سواری بن، بەلاشمەوە قورسە ئەو خەڵکە بەجێ بمێنن لێم، وە ئاواتەخواز بووم کە بجەنگم لە ڕێی خوادا و بکوژرێم، پاشان زیندوو بکرێمەوە، پاشان جارێکی تر بکوژرێم، پاشان زیندوو بکرێمەوە)).**

## ١٢٠- بابُ الأجِير

وَقَالَ الحَسَنُ وَابْنُ سِيرِينَ: يُقْسَمُ لِلأَجِيرِ مِنَ المَغْنَمِ. وَأَخَذَ عَطِيَّةُ بْنُ قَيْسٍ فَرَسًا عَلَى النِّصْفِ، فَبَلَغَ سَهْمُ الفَرَسِ أَرْبَعَمِائَةِ دِينَارٍ، فَأَخَذَ مِائَتَيْنِ وَأَعْطَى صَاحِبَهُ مِائَتَيْنِ.

**٢٩٧٣**- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ غَزْوَةَ تَبُوكَ، فَحَمَلْتُ عَلَى بَكْرٍ، فَهْوَ أَوْثَقُ أَعْمَالِي فِي نَفْسِي، فَاسْتَأْجَرْتُ أَجِيرًا، فَقَاتَلَ رَجُلًا، فَعَضَّ أَحَدُهُمَا الآخَرَ فَانْتَزَعَ يَدَهُ مِنْ فِيهِ، وَنَزَعَ ثَنِيَّتَهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَأَهْدَرَهَا فَقَالَ «أَيَدْفَعُ يَدَهُ إِلَيْكَ فَتَقْضَمُهَا كَمَا يَقْضَمُ الفَحْلُ؟!»[2].

---

(١) بڕوانە: ٣٦.

(٢) بڕوانە: ١٨٤٨.

## ١٢٠- باسی کرێکار[١]

حەسەن(ی بەصری) و ئیبنو سیرین دەڵێن: لە دەستکەوتی جەنگ بەشی کرێکار دەدرێت (ئەگەر بەشداری جەنگ بکات). عەتییەی کوڕی قەیس ئەسپێکی وەرگرت (لە کەسێك) بەنیوە[٢]، ئینجا بەشی ئەسپەکە گەیشتە چوار سەد دینار (لە دەستکەوتی جەنگ)، ئەوسا عەتییە دوو سەد دیناری برد و دوو سەد دیناریشی دا بەخاوەنی ئەسپەکە.

٢٩٧٣- صەفوانی کوڕی یەعلا لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداری غەزای تەبووکم کرد، سواری جوانە وشترێك بووم، جا لەدڵی خۆمدا بەهێزترین و باشترین کارەکانم بوو (بۆ دوارۆژ)، کرێکارێکم بەکرێ گرتبوو، لەگەڵ کەسێکدا بوو بەشەڕی، جا یەکێکیان گازی گرت لەپەنجەی ئەوی تریان، کابراکەش بەتوندی پەنجەی ڕاکێشا و دەری هێنا لەدەمی، ددانێکی پێشەوەی (گازگرەکەی) دەرهێنا، جا ددان کەوتووەکە ڕۆیشت بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، بەڵام هیچ بژاردنێکی بۆ دانەنا و فەرمووی: ((ئایا وازبێنێ پەنجەی ورد و خاش بکات و بیخوا، وەك چۆن وشترەنێر شتێك بە ددانەکان ورد دەکات و دەیخوات؟!)).

## ١٢١- بابُ مَا قِيلَ فِي لِوَاءِ النَّبِيِّ ﷺ

٢٩٧٤- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي ثَعْلَبَةُ بْنُ أَبِي مَالِكٍ القُرَظِيُّ، أَنَّ قَيْسَ بْنَ سَعْدٍ الأَنْصَارِيَّ ﷺ وَكَانَ صَاحِبَ لِوَاءِ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَرَادَ الحَجَّ فَرَجَّلَ.

---

(١) کەسێکە بەکرێ دەگیرێ لە جیهاددا یان بۆ خزمەتکردن، یان بۆ جەنگ کردن لەبەرانبەر پارەیەکدا کە پێی دەدرێت. (بڕوانە: فتح الباري:١٥٥/٦).

(٢) ئەوەی دەستی کەوت لە غەزادا نیوەی بۆ ئەم نیوەی خاوەن ئەسپەکەیە.

## ١٢١- باسی ئەوەی وتراوە دەربارەی بەیداخی[1] پێغەمبەر ﷺ

**٢٩٧٤- سەعلەبەی کوڕی ئەبو مالیکی قوڕەزی دەگێڕێتەوە کە قەیسی کوڕی سەعدی ئەنصاری ﷺ، کە هەڵگری بەیداخی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بەنیازی حەجکردن بوو، قژی سەری شانەکرد و جوان دایهێنا.**

٢٩٧٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ ﷺ قَالَ: كَانَ عَلِيٌّ ﷺ تَخَلَّفَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي خَيْبَرَ، وَكَانَ بِهِ رَمَدٌ، فَقَالَ: أَنَا أَتَخَلَّفُ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَخَرَجَ عَلِيٌّ فَلَحِقَ بِالنَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَّا كَانَ مَسَاءُ اللَّيْلَةِ الَّتِي فَتَحَهَا فِي صَبَاحِهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «لأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ -أَوْ قَالَ لَيَأْخُذَنَّ- غَدًا رَجُلٌ يُحِبُّهُ اللهُ وَرَسُولُهُ -أَوْ قَالَ يُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ- يَفْتَحُ اللهُ عَلَيْهِ». فَإِذَا نَحْنُ بِعَلِيٍّ، وَمَا نَرْجُوهُ، فَقَالُوا هَذَا عَلِيٌّ، فَأَعْطَاهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَفَتَحَ اللهُ عَلَيْهِ[2].

**٢٩٧٥- سەلەمی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێ: عەلی ﷺ لە جەنگی خەیبەردا لە پێغەمبەر ﷺ بەجێما، چاوی دەئێشا، عەلی وتی: چۆن من لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێ بمێنم؟ جا عەلی دەرچوو و گەیشت بە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، جا ئێوارەی ئەو شەوەی کە بەیانییەکەی پێغەمبەر ﷺ خەیبەری ئازادکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوکاتەدا فەرمووی: ((سوێند بەخوا بەیداخەکە دەدەم -یان فەرمووی: سبەینێ کەسێك بەیداخەکە دەگرێ بەدەستەوە، خوا و پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێت- یان فەرمووی: ئەو خواو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت- خوا سەرکەوتنی (خەیبەری) پێ دەبەخشێت))، لەپڕ عەلیمان بینی کە**

---

(١) ئاڵاشی پێ دەوترێت. بڕوانە بۆ: (فەرهەنگی خاڵ: ٨).

(٢) بڕوانە: ٣٧٠٢، ٤٢٠٩.

**بەتەمای نەبووین[١]، وتیان: ئەوە عەلییە، پێغەمبەری خواش ﷺ بەیداخەکەی پێدا و خوا ئازادکردنی (خەیبەری) لەسەر دەستیدا بەئەنجام گەیاند.**

٢٩٧٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّد بْنُ العَلَاءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ نَافِع بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ العَبَّاسَ يَقول لِلزُّبَيْرِ ﷺ: هَا هُنَا أَمَرَكَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تَرْكُزَ الرَّايَةَ؟.

**٢٩٧٦- نافیعی کوڕی جوبەیر دەڵێ: لە عەبباسم ﷺ بیست دەیوت بە زوبەیر ﷺ: ئا لێرەدا (لە حەجون) پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردی بەیداخەکە بچەقێنیت؟**

## ١٢٢- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: "نُصِرتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ"

وَقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ ﴿١٥١﴾ ﴾ آل عمران. قَالَه جَابِرٌ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[٢].

٢٩٧٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «بُعِثْتُ بِجَوَامِعِ الكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، فَبَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِمَفَاتِيحِ خَزَائِنِ الأَرْضِ، فَوُضِعَتْ فِي يَدِي».

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَقَدْ ذَهَبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَنْتُمْ تَنْتَثِلُونَهَا[٣].

---

(١) لەو کاتەدا بێت چونکە چاوەکانی دەئێشان.

(٢) بڕوانە: سسسسسس.

(٣) بڕوانە: ٦٩٩٨، ٧٠١٣، ٧٢٧٣.

## ١٢٢- باسی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ: ((بە ترس و بیمی بەتین بەسەر دوژمندا ماوەی یەک مانگ ڕێگا سەرخراوم))

**هەروەها باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (ترس و بیمی بەتین دەخەینە دڵی ئەوانەی بێ بڕوان بە هۆی ئەوەی کردبوویان بە هاوبەشی خوا). جابیر ﵁ دەڵێ و دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ[١].**

**٢٩٧٧- سەعیدی کوڕی موسەییەب لە ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بەپێغەمبەرێتی نێردراوم بەوتەی کورتی پڕ ماناوە[٢]، وە بەترس و بیمی بەتین سەرخراوم، جا لەکاتێکدا کە لەخەودا بووم کلیلی گەنجینەکانی زەویم پێدرا و خرایە ناو دەستم))، ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت و وەفاتی کرد، ئێوەش ئەو گەنجینانە دەردەهێنن.**

٢٩٧٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ هِرَقْلَ أَرْسَلَ إِلَيْهِ وَهُمْ بِإِيلِيَاءَ، ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَةِ الْكِتَابِ كَثُرَ عِنْدَهُ الصَّخَبُ، فَارْتَفَعَتِ الأَصْوَاتُ، وَأُخْرِجْنَا، فَقُلْتُ لأَصْحَابِي حِينَ أُخْرِجْنَا لَقَدْ أَمِرَ أَمْرُ ابْنِ أَبِي كَبْشَةَ، إِنَّهُ يَخَافُهُ مَلِكُ بَنِي الأَصْفَرِ[٣].

**٢٩٧٨- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە کە ئەبو سوفیان پێی وت: کە هیرەقل ناردی بەشوێنیدا کاتێك ئەوان لە ئیلیا[٤] بوون، پاشان داوای کرد و**

---

(١) فەرموودەکەی جابیر ڕابورد لە ژمارە: ٣٣٥دا.

(٢) بریتییە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ.(بڕوانە: إرشاد الساري:٦/٤٥٤).

(٣) بڕوانە: ٧.

(٤) ئیلیا: ناوە بۆ شاری قودس.

نامەکەی پێغەمبەری خوایان ﷺ هێنان جا کاتێك لە خوێندنەوەی نامەکە بوویەوە، لەلای هیرەقل قاڵەقاڵ زۆر بوو، ئینجا دەنگیان بەرز بوویەوە و ئێمەیان کردە دەرەوە، منیش کاتێك دەرکراین بەهاوڕێکانم وت: سوێند بەخوا کارەکەی کوڕی ئەبو کەبشە[1] گەورە بوو، بەڕاستی پادشای ڕۆم لێی دەترسێت.

## ١٢٣- بابُ حَمْلِ الزَّادِ فِي الغَزْوِ

وَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ﴿١٩٧﴾ ﴾ البقرة.

٢٩٧٩- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي وَحَدَّثَتْنِي أَيْضًا فَاطِمَةُ، عَنْ أَسْمَاءَ ﵄ قَالَتْ: صَنَعْتُ سُفْرَةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ حِينَ أَرَادَ أَنْ يُهَاجِرَ إِلَى المَدِينَةِ، قَالَتْ: فَلَمْ نَجِدْ لِسُفْرَتِهِ وَلاَ لِسِقَائِهِ مَا نَرْبِطُهُمَا بِهِ، فَقُلْتُ لأَبِي بَكْرٍ وَاللهِ مَا أَجِدُ شَيْئًا أَرْبِطُ بِهِ إِلاَّ نِطَاقِي. قَالَ فَشُقِّيهِ بِاثْنَيْنِ، فَارْبِطِيهِ بِوَاحِدٍ السِّقَاءَ وَبِالآخَرِ السُّفْرَةَ. فَفَعَلْتُ، فَلِذَلِكَ سُمِّيَتْ ذَاتَ النِّطَاقَيْنِ[2].

## ١٢٣- باسی هەڵگرتنی توێشوو[3] لەکاتی غەزادا

هەروەها باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە توێشوو هەڵبگرن، بێگومان باشترین توێشوو لەخوا ترسانە).

٢٩٧٩- ئەسما ﵄ دەڵێ: من خۆم توێشەبەرەکەی پێغەمبەر خوام ﷺ لە ماڵی ئەبو بەکردا سازکرد کاتێك ویستی کۆچ بکات بۆ مەدینە، ئەسما دەڵێ: هیچ

---

(١) واتە: پێغەمبەر ﷺ، ئەبو کەبشە یەکێکە لە باپیرەکانی پێغەمبەر ﷺ، وە هەندێک دەڵێن: باوکی شیری پێغەمبەرە ﷺ.

(٢) بڕوانە: ٣٩٠٧، ٥٣٨٨.

(٣) توێشوو: خواردەمەنییەکە کەسێک سەفەر بکات لەگەڵ خۆیدا بیبا بۆ ڕێگا (فەرهەنگی خاڵ: ١٢٩).

شتێکمان دەست نەکەوت توێشەبەر و جەوەنەی ئاوەکەی پێغەمبەری ﷺ پێ ببەستین، بەئەبو بەکرم وت: سوێند بەخوا هیچم دەست ناکەوێ پێی ببەستم جگە لەپشتوێنەکەم، ئەبو بەکر وتی: پشتوێنەکەت بکە بەدوو لەتەوە، بەیەکێکیان جەوەنەکە ببەستە و بەوی تریان توێشەبەرەکە ببەستە، منیش وام کرد، جا بەو هۆیەوە ناونرا خاوەنی دوو پشتوێنەکە[1].

٢٩٨٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَتَزَوَّدُ لُحُومَ الأَضَاحِيِّ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى المَدِينَةِ[2].

**٢٩٨٠- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ گۆشتی قوربانیمان لەگەڵ خۆمان (لە مەککەوە) دەهێنایەوە بۆ مەدینە.**

٢٩٨١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ قَالَ: سَمِعْتُ يَحْيَى قَالَ: أَخْبَرَنِي بُشَيْرُ بْنُ يَسَارٍ، أَنَّ سُوَيْدَ بْنَ النُّعْمَانِ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ خَرَجَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ عَامَ خَيْبَرَ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالصَّهْبَاءِ - وَهْيَ مِنْ خَيْبَرَ وَهْيَ أَدْنَى خَيْبَرَ- فَصَلَّوُا العَصْرَ، فَدَعَا النَّبِيُّ ﷺ بِالأَطْعِمَةِ، فَلَمْ يُؤْتَ النَّبِيُّ ﷺ إِلاَّ بِسَوِيقٍ، فَلُكْنَا فَأَكَلْنَا وَشَرِبْنَا، ثُمَّ قَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَمَضْمَضَ وَمَضْمَضْنَا، وَصَلَّيْنَا[3].

**٢٩٨١- بوشەیری کوڕی یەسار دەڵێ: سوەیدی کوڕی نوعمان ﷺ بۆی دەگێڕایەوە: کە ساڵی جەنگی خەیبەر ئەو لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕۆیشت، هەتا گەیشتنە صەهبا -کە بەشێکە لە خەیبەر و بەشی خوارەوەی خەیبەرە-، جا نوێژی عەسریان کرد و پێغەمبەر ﷺ داوای کرد خۆراکەکان بێنن، بەڵام تەنها**

---

(١) ئەمە وتەی گێڕەرەوەکەیە لە ئەسمائەوە کە فاتیمە و عوروەن، مەبەست برگەی کۆتاییە (جا بەو هۆیەوە...).

(٢) بڕوانە: ١٧١٩.

(٣) بڕوانە: ٢٠٩.

**قاووتی هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئێمەش کردمانە ناو دەممانەوە و خواردمان و ئاومان خواردەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ هەستا ئاوی لە دەمی ڕادا، ئێمەش ئاومان لە دەممان ڕادا و نوێژمان کرد.**

٢٩٨٢- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مَرْحُومٍ، حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ سَلَمَةَ ﷺ قَالَ: خَفَّتْ أَزْوَادُ النَّاسِ وَأَمْلَقُوا، فَأَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ فِي نَحْرِ إِبِلِهِمْ، فَأَذِنَ لَهُمْ، فَلَقِيَهُمْ عُمَرُ فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: مَا بَقَاؤُكُمْ بَعْدَ إِبِلِكُمْ؟! فَدَخَلَ عُمَرُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا بَقَاؤُهُمْ بَعْدَ إِبِلِهِمْ؟! قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ «نَادِ فِي النَّاسِ يَأْتُونَ بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ». فَدَعَا وَبَرَّكَ عَلَيْهِ، ثُمَّ دَعَاهُمْ بِأَوْعِيَتِهِمْ، فَاحْتَثَى النَّاسُ حَتَّى فَرَغُوا، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ».[1].

**٢٩٨٢- یەزیدی کوڕی ئەبی عوبەید لە سەلەمەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: خەڵکی ئازووقە و توێشوویان کەمبوویەوە و هەژار کەوتن، بۆیە هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ (بۆ ڕێگە پێدانیان) بۆ سەربڕینی وشترەکانیان، پێغەمبەریش ﷺ مۆڵەتی دان، ئینجا عومەر پێیان گەیشت و ئەو هەواڵەیان پێدا، عومەریش وتی: ئێوە لەدوای (سەربڕینی) وشترکانتان چۆن دەمێنن و بەردەوام دەبن؟! بۆیە عومەر ڕۆیشتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ! ئەم خەڵکە دوای (سەبڕینی) وشترەکانیان چۆن دەمێنن؟! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((جاڕ بدە بەناو خەڵکیدا با توێشووە زیادەکانیان بێنن))، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوا پاڕایەوە و نزای پیت و فەڕی کرد، پاشان داوای کرد خەڵکەکە هۆڕ و هەگبەکانیان بێنن، ئیتر خەڵکەکە بە مشت تێیان دەکرد هەتا تەواو بوون،**

(١) بڕوانە: ٢٤٨٤.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا، وە شایەتیش دەدەم کە من نێردراو پێغەمبەری ﷺ خوام)).

## ١٢٤- بابُ حَمْلِ الزَّادِ عَلَى الرِّقَابِ

٢٩٨٣- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الفَضْلِ، أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا وَنَحْنُ ثَلاَثُمِائَةٍ نَحْمِلُ زَادَنَا عَلَى رِقَابِنَا، فَفَنِيَ زَادُنَا، حَتَّى كَانَ الرَّجُلُ مِنَّا يَأْكُلُ فِي كُلِّ يَوْمٍ تَمْرَةً. قَالَ رَجُلٌ: يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ، وَأَيْنَ كَانَتِ التَّمْرَةُ تَقَعُ مِنَ الرَّجُلِ قَالَ لَقَدْ وَجَدْنَا فَقْدَهَا حِينَ فَقَدْنَاهَا، حَتَّى أَتَيْنَا البَحْرَ فَإِذَا حُوتٌ قَدْ قَذَفَهُ البَحْرُ، فَأَكَلْنَا مِنْهَا ثَمَانِيَةَ عَشَرَ يَوْمًا مَا أَحْبَبْنَا[١].

## ١٢٤- باسی هەڵگرتنی توێشوو بەسەر مل(و شانەوە)

٢٩٨٣- جابیر ﷺ دەڵێ: ئێمە سێ سەد کەس بووین ڕۆیشتین (بەرەو کەناری دەریا) توێشووەکانمان بەسەر ملمانەوە هەڵدەگرت، جا توێشووەکەمان (خەریك بوو) تەواو دەبوو، هەتا هەرکەسێکمان لەهەموو ڕۆژەکەدا یەك دەنك خورمای دەخوارد، پیاوێك وتی: ئەی ئەبو عەبدوڵلا[٢]! دەنکێك خورما چ جێیەك دەگرێ بۆ پیاو؟! (جابیر) وتی: ئێمە (ناڕەحەت بووین) کە پێمان نەماوە دەمانزانی بێ خواردنی چەند سەختە، (بەو جۆرە بردما نەسەر) تا گەیشتینە کەناری دەریا، جا لەوێدا نەهەنگێکمان بینی (شەپۆلی) دەریا فڕێی دابووە (کەنار دەریاکەوە)، جا هەژدە ڕۆژ بەدڵی خۆمان لێمان خوارد.

---

(١) بڕوانە: ٢٤٨٣.

(٢) ئەو نازناوی جابیرە، عەرەب بەناوی منداڵەکەیەوە پیاو بانگ دەکەن.

## ١٢٥- بابُ إِرْدَافِ الْمَرْأَةِ خَلْفَ أَخِيهَا

٢٩٨٤- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ الأَسْوَدِ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، يَرْجِعُ أَصْحَابُكَ بِأَجْرِ حَجٍّ وَعُمْرَةٍ، وَلَمْ أَزِدْ عَلَى الْحَجِّ. فَقَالَ لَهَا: «اذْهَبِي وَلْيُرْدِفْكِ عَبْدُ الرَّحْمَنِ». فَأَمَرَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ أَنْ يُعْمِرَهَا مِنَ التَّنْعِيمِ، فَانْتَظَرَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ بِأَعْلَى مَكَّةَ حَتَّى جَاءَتْ[1].

## ١٢٥- باسی سوارکردنی ئافرەت لە پاشکۆی براکەیدا(٢)

**٢٩٨٤- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵەکانت بە پاداشتی حەج و عومرەوە دەگەڕێنەوە، بەڵام من لەپاداشتی حەج زیاترم نییە؟ پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ((بڕۆ با عەبدوڕەحمان لە پاشکۆی خۆیدا سوارت بکات))، جا فەرمانی کرد بەعەبدوڕەحمان لە تەنعیمەوە (ئیحرامی) عومرەی پێ ببەستێت، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەڕوانی عائیشەی کرد لە سەرووی مەککە هەتا هات (و گەیشت پێیان).**

٢٩٨٥- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ، حَدَّثَنَا ابن عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَوْسٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﵄ قَالَ: أَمَرَنِي النَّبِيُّ ﷺ أَنْ أُرْدِفَ عَائِشَةَ وَأُعْمِرَهَا مِنَ التَّنْعِيمِ[3].

**٢٩٨٥- عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری صدیق ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردم عائیشە لە پاشکۆی خۆمدا سوار بکەم لە تەنعیمەوە ئیحرامی پێ ببەستم بەعومرە.**

---

(١) بڕوانە: ٢٩٤.

(٢) واتە: براکەی سواری وڵاخێکە ئافرەتێکی خوشکی لە پاشکۆی خۆیدا سوار وڵاخەکەی دەکات.

(٣) بڕوانە: ١٧٨٤.

## ١٢٦- بابُ الارْتِدَافِ فِي الغَزْوِ وَالْحَجِّ

٢٩٨٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ رَدِيفَ أَبِي طَلْحَةَ، وَإِنَّهُمْ لَيَصْرُخُونَ بِهِمَا جَمِيعًا: الحَجِّ وَالْعُمْرَةِ[1].

## ١٢٦- باسی لە پاشكۆ سواركردن لە ( سەفەری) غەزا و حەجدا

**٢٩٨٦- ئەنەس ﷺ دەڵێ: من لەپاشكۆی ئەبو تەڵحەدا سواربوو بووم، وە ئەوان (پێغەمبەر ﷺو هاوەڵان) بەدەنگی بەرز دەیانقیڕاند بەئیحرام بەستنیان بەحەج و عومرە پێكەوە.**

## ١٢٧- بابُ الرِّدْفِ عَلَى الحِمَارِ

٢٩٨٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو صَفْوَانَ، عَنْ يُونُسَ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَكِبَ عَلَى حِمَارٍ، عَلَى إِكَافٍ عَلَيْهِ قَطِيفَةٌ، وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ وَرَاءَهُ[2].

## ١٢٧- باسی لەپاشكۆ سواربوونی كەسێك بەسواری گوێدرێژەوە

**٢٩٨٧- ئوسامەی كوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ سواری گوێدرێژێك بوو بەسەر كورتانێكەوە كە قەدیفەیەكی بەسەرەوە بوو، ئوسامەشی خستە پاشكۆی خۆیەوە.**

---

(١) بڕوانە: ١٠٨٩.

(٢) بڕوانە: ٤٥٦٦، ٥٦٦٣، ٥٩٦٤، ٦٢٠٧، ٦٢٥٤.

٢٩٨٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، قَالَ يُونُسُ: أَخْبَرَنِي نَافِعٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَقْبَلَ يَوْمَ الفَتْحِ مِنْ أَعْلَى مَكَّةَ عَلَى رَاحِلَتِهِ، مُرْدِفًا أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ وَمَعَهُ بِلاَلٌ وَمَعَهُ عُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ مِنَ الحَجَبَةِ، حَتَّى أَنَاخَ فِي المَسْجِدِ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَأْتِيَ بِمِفْتَاحِ البَيْتِ، فَفَتَحَ وَدَخَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَمَعَهُ أُسَامَةُ وَبِلاَلٌ وَعُثْمَانُ، فَمَكَثَ فِيهَا نَهَارًا طَوِيلاً ثُمَّ خَرَجَ، فَاسْتَبَقَ النَّاسُ، وَكَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ أَوَّلَ مَنْ دَخَلَ، فَوَجَدَ بِلاَلاً وَرَاءَ البَابِ قَائِمًا، فَسَأَلَهُ أَيْنَ صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَشَارَ لَهُ إِلَى المَكَانِ الذِي صَلَّى فِيهِ، قَالَ عَبْدُ اللهِ فَنَسِيتُ أَنْ أَسْأَلَهُ كَمْ صَلَّى مِنْ سَجْدَةٍ[١].

**٢٩٨٨- نافیع دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵڵا (ی كوڕی عومەر) ﷺ كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادكردنی مەككەدا بەسواری وشترەكەیەوە لە سەروو مەككەوە هات، ئوسامەی كوڕی زەیدی لە پاشكۆیدا سوار كردبوو، بیلالیشی لەگەڵدابوو، هەروەها عوسمانی كوڕی تەڵحە كە لە دەرگاوانانی كەعبە بوو، (هات) هەتا وشترەكەی لە (نزیك) مزگەوتی حەرام یەخ دا، جا فەرمانی كرد بە عوسمان كە كلیلی (دەرگای) كەعبە بێنێت، ئینجا عوسمان دەرگاكەی كردەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتە ژوورەوە لەگەڵ ئوسامە و بیلال و عوسماندا، جا بەشێكی زۆر لە ڕۆژەكە مایەوە لەبەیتدا، پاشان هاتە دەرەوە و خەڵكیش بەپەلە چوونە ژوورەوە، عەبدوڵڵای كوڕی عومەر یەكەم كەس بوو ڕۆیشتە ژوورەوە، جا بیلالی بینی لە پشت دەرگاكەوە ڕاوەستاوە، پرسیاری لێ كرد: پێغەمبەری خوا ﷺ لە كوێدا نوێژی كرد؟ بیلالیش ئاماژەی كرد بۆ ئەو شوێنەی پێغەمبەر ﷺ نوێژی تێدا كرد، عەبدوڵڵا دەڵێ: لە بیرم چوو كە پرسیاری لێ بكەم چەند ڕكات نوێژی كرد.**

---

(١) بڕوانە: ٣٩٧.

## ١٢٨- بابُ مَنْ أَخَذَ بِالرِّكَابِ وَنَحْوِهِ

٢٩٨٩- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «كُلُّ سُلاَمَى مِنَ النَّاسِ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ كُلَّ يَوْمٍ تَطْلُعُ فِيهِ الشَّمْسُ، يَعْدِلُ بَيْنَ الاثْنَيْنِ صَدَقَةٌ، وَيُعِينُ الرَّجُلَ عَلَى دَابَّتِهِ، فَيَحْمِلُ عَلَيْهَا، أَوْ يَرْفَعُ عَلَيْهَا مَتَاعَهُ صَدَقَةٌ، وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ خَطْوَةٍ يَخْطُوهَا إِلَى الصَّلاَةِ صَدَقَةٌ، وَيُمِيطُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ»[١].

## ١٢٨- باسی کەسێك هاوزەنگ و شتی لەوجۆرە گرتبێت(تا خاوەنەکەی سوار وڵاخەکەی بێت)

**٢٩٨٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەموو جومگەکانی مرۆڤ خێر و چاکەیەکی لەسەرە بیکات، هەموو ڕۆژێك کە خۆری تێدا هەڵدێت، کەسێك لە ئێوە نێوانی دوو کەس چاك بکات بەدادگەری ئەوە چاکەکەیەکە، یارمەتی کەسێك بدات و سواری وڵاخەکەی بکات، یان کەلوپەلەکەی هەڵبگرێت و بیخاتە سەرپشتی وڵاخەکەی خێر و چاکەیەکە، وە وتەی شیرین (بەکارهێنانی لەگەڵ خەڵکدا) خێر و چاکەیەکە، وە هەموو هەنگاوێك بۆ (ڕۆیشتن و گەڕانەوە بۆ) نوێژ خێر و چاکەیەکە، وە هەر شتێك زیانی هەبێت لەسەر ڕێگا لای ببات خێر و چاکەیەکە)).**

(١) بڕوانە: ٢٧٠٧.

## ١٢٩- بابُ السَّفَرِ بِالْمَصَاحِفِ إِلَى أَرْضِ العَدُوِّ

وَكَذَلِكَ يُرْوى عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ بِشْرٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابن عُمَرَ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

وَتَابَعَهُ ابن إِسْحَاقَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابن عُمَرَ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَقَدْ سَافَرَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ فِي أَرْضِ العَدُوِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ القُرْآنَ.

## ١٢٩- باسی (ناپەسەندی) سەفەرکردن بەقورئانەوە بۆ وڵاتی دوژمنانی (ی ئیسلام)

**هەروەها گێڕدراوەتەوە[١] لە موحەممەدی کوڕی بیشرەوە، لە عوبەیدوڵلاوە، لە نافیعەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

**وە ئیبنو ئیسحاق لە نافیعەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ پاڵپشتی گێڕانەوەکەی موحەممەدی کوڕی بیشری کردووە. بێگومان پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی سەفەریان کردووە بۆ وڵاتانی دوژمن، لەکاتێکدا قورئانیشیان دەزانی[٢].**

٢٩٩٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ العَدُوِّ.

**٢٩٩٠- عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە بە قورئانەوە سەفەر بکرێت بۆ وڵاتی دوژمنانی(ی ئیسلام).**

---

(١) کەناپەسندە سەفەرکرن بەقورئانەوە بۆ وڵاتی کافران.

(٢) کەواتە مەبەست لە سەفەرکردن بەقورئانەوە ئەو قورئانەیە کە نووسراوەتەوە، نەک ئەوەی موسڵمان دەیزانێ یان لەبەریەتی.(بڕوانە: إرشاد الساري:٦/٤٦٤).

## ١٣٠- بابُ التَّكْبِيرِ عِنْدَ الحَرْبِ

٢٩٩١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: صَبَّحَ النَّبِيُّ ﷺ خَيْبَرَ، وَقَدْ خَرَجُوا بِالْمَسَاحِي عَلَى أَعْنَاقِهِمْ، فَلَمَّا رَأَوْهُ قَالُوا: هَذَا مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ، مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ. فَلَجَئُوا إِلَى الحِصْنِ، فَرَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ يَدَيْهِ وَقَالَ: «اللهُ أَكْبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ». وَأَصَبْنَا حُمُرًا فَطَبَخْنَاهَا، فَنَادَى مُنَادِي النَّبِيِّ ﷺ إِنَّ اللهَ وَرَسُولَهُ يَنْهَيَانِكُمْ عَنْ لُحُومِ الحُمُرِ، فَأُكْفِئَتِ الْقُدُورُ بِمَا فِيهَا. تَابَعَهُ عَلِيٌّ عَنْ سُفْيَانَ رَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ يَدَيْهِ[1].

## ١٣٠- باسی (الله أكبر) کردن لەکاتی جەنگدا(دروستە)

**٢٩٩١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ڕۆژبوونەوەدا ڕۆیشتە سەر خەیبەر، لەوکاتەدا خەڵکی خەیبەر بەبێڵ و خاکەنازەکانیان بەشانیانەوە بوو (لە قەڵای خەیبەر) هاتنە دەرەوە (بۆ سەر باخ و کشتوکاڵەکانیان)، ئینجا کاتێك پێغەمبەر ﷺ (و سوپاکە)یان بینی، وتیان: ئەوە موحەممەد و لەشکرەکەیەتی، موحەممەد و لەشکرەکەی (هاتن)، بۆیە پەنایان بردەوە بۆ قەڵاکە(ی کە بەدەوری خەیبەردا بوو)، پێغەمبەریش ﷺ هەردوو دەستی بەرزکردەوە و فەرمووی: ((ئەڵڵاهو ئەکبەر، خەیبەر وێران بوو، بەڕاستی هەرکات ئێمە برۆینە گۆڕەپانی هەر گەلێکەوە، ئای چەند خراپە ڕۆژی بێدارکراوەکان))، چەند گوێدرێژێکمان دەستکەوت (سەرمان بڕین، گۆشتەکەیمان) کوڵاند و کردمان بەچێشت، جا جاڕدەرێکی پێغەمبەر ﷺ جاڕی دا و وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ (خواردنی) گۆشتی گوێدرێژتان لێ قەدەغە دەکەن، ئیتر**

---

(١) بروانە: ٣٧١.

مەنجەڵەکان قلْپ کرانەوە، ئەوەی تێیدا بوو ڕژێنرا. عەلی گێڕاویەتیەوە لە سوفیانەوە تا کۆتایی ڕشتەکە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەستی بەرزکردەوە، لەم بەشەی فەرموودەکەدا عەلی کوڕی مەدینی، پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەد دەکات.

## ١٣١- بَابُ مَا يُكْرَهُ مِنْ رَفْعِ الصَّوْتِ بِالتَّكْبِيرِ

٢٩٩٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَكُنَّا إِذَا أَشْرَفْنَا عَلَى وَادٍ هَلَّلْنَا وَكَبَّرْنَا، ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِبًا، إِنَّهُ مَعَكُمْ، إِنَّهُ سَمِيعٌ قَرِيبٌ، تَبَارَكَ اسْمُهُ وَتَعَالَى جَدُّهُ»[1].

## ١٣١- باسی ئەوەی ناپەسەندە لە دەنگ بەرزکردنەوە لە(الله أكبر) کردندا

٢٩٩٢- ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ : ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین، جا هەرکات لە بەرزییەکەوە سەیری دۆڵێکمان دەکرد، بەدەنگی بەرز (لا إله إلا الله) و (الله أكبر)مان دەکرد، دەنگمان بەرز دەبویەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خەڵکینە! بەزەییتان بەخۆتاندا بێتەوە، چونکە بەڕاستی ئێوە زاتێکی کەڕ یان دوور بانگ ناکەن، بێگومان ئەو (خوا) لەگەڵ ئێوەدایە، بێگومان ئەو (خوایە) بیسەری نزیکە، ناوی بەرز و پیرۆز بێت، پلە و شکۆی بڵند بێت)).

---

(١) بڕوانە: ٤٢٠٥، ٦٣٨٤، ٦٤٠١، ٦٦١٠، ٧٣٨٦.

## ١٣٢- بابُ التَّسْبِيحِ إِذَا هَبَطَ وَادِيًا

٢٩٩٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ حُصَيْنِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا إِذَا صَعِدْنَا كَبَّرْنَا، وإِذَا نَزَلْنَا سَبَّحْنَا[1].

## ١٣٢- باسی (سبحان الله) کردن کاتی (کەسی موسافیر) دادەبەزێ بۆ شیو و دۆڵێک

**٢٩٩٣- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: ئێمە کاتێك سەرکەوتینایە (بۆ سەر بەرزاییەك) (الله أکبر)مان دەکرد، وە کاتێك دابەزینایە (بۆ دۆڵ و شیوێك) (سبحان الله)مان دەکرد.**

## ١٣٣- بابُ التَّكْبِيرِ إِذَا عَلَا شَرَفًا

٢٩٩٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا إِذَا صَعِدْنَا كَبَّرْنَا، وَإِذَا تَصَوَّبْنَا سَبَّحْنَا[2].

## ١٣٣- باسی (الله أکبر) کردن ئەگەر (حاجی یان موسافیر) ڕۆیشتە سەر بەرزاییەک

**٢٩٩٤- جابیر ﷺ دەڵێ: ئێمە کاتی سەرکەوتینایە سەر بەرزییەك (الله أکبر)مان دەکرد، وە کاتێك دابەزینایە بۆ دۆڵێك (سبحان الله)مان دەکرد.**

---

(١) بڕوانە: ٢٩٩٤.

(٢) بڕوانە: ٢٩٩٣.

٢٩٩٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَفَلَ مِنَ الحَجِّ أَوِ الْعُمْرَةِ -وَلاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ قَالَ الغَزْوِ- يَقُولُ كُلَّمَا أَوْفَى عَلَى ثَنِيَّةٍ أَوْ فَدْفَدٍ كَبَّرَ ثَلاَثًا ثُمَّ قَالَ «لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ الله وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ». قَالَ صَالِحٌ: فَقُلْتُ لَهُ أَلَمْ يَقُلْ عَبْدُ اللهِ: إِنْ شَاءَ الله؟ قَالَ: لاَ[1].

**٢٩٩٥- عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بگەڕابایەوە لە حەج یان لە عومرە -ئەوەی ئاگاداربم وتی: لە غەزا بگەڕابایەوە-، جا هەر کاتێك بڕۆیشتایەتە سەر کێوێك یان ملەیەك یان بەرزاییەك سێ (الله اكبر)ی دەکرد، پاشان دەیفەرموو: ((هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لەخوای تاك و تەنیا کە هیچ هاوبەشێکی نییە، هەموو موڵك و دەسەڵات و سوپاس هەر بۆ ئەوەو ئەو بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، گەڕاوەین، تەوبەکارین، خواپەرستین، سوژدەبەرین، سوپاسگوزارین بۆ پەروەردگارمان، خوا بەڵێنەکەی بردە سەر و بەندەکەی خۆی (کە موحەممەد ﷺ) سەرخست، هەرخۆشی هەموو کۆمەڵەکانی تێکشکاند و بەزاندنی)). ساڵح دەڵێ : وتم بە سالیم: ئایا عەبدوڵلا نەیوت: (إِنْ شَاءَ الله) (لە پاش (آيِبُونَ))؟ وتی: نەخێر.**

## ١٣٤ - بابٌ: يُكْتَبُ لِلْمُسَافِرِ مِثْلُ مَا كَانَ يَعْمَلُ فِي الإِقَامَةِ

٢٩٩٦- حَدَّثَنَا مَطَرُ بْنُ الْفَضْلِ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، حَدَّثَنَا العَوَّامُ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ أَبُو إِسْمَاعِيلَ السَّكْسَكِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا بُرْدَةَ وَاصْطَحَبَ هُوَ وَيَزِيدُ بْنُ أَبِي كَبْشَةَ فِي سَفَرٍ،

---

(١) بڕوانە: ١٧٩٧.

فَكَانَ يَزِيدُ يَصُومُ فِي السَّفَرِ فَقَالَ لَهُ أَبُو بُرْدَةَ سَمِعْتُ أَبَا مُوسَى مِرَارًا يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ «إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ أَوْ سَافَرَ، كُتِبَ لَهُ مِثْلُ مَا كَانَ يَعْمَلُ مُقِيمًا صَحِيحًا».

## ١٣٤- باسێک: پاداشت دەنووسرێت بۆ ئەو کەسەی سەفەر دەکات بەوێنەی ئەو چاکانەی لە ماڵ و شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیدا دەیکات

**٢٩٩٦- ئیبراهیم کە ئەبو ئیسماعیل سەکسەکییە دەڵێ: لە ئەبو بوردەم بیست کە هاوڕێیەتی یەزیدی کوڕی ئەبو کەبشەی کردوە لە سەفەرێکدا، ئینجا یەزید لە سەفەرەکەدا بەڕۆژوو دەبوو، ئەبو بوردەش پێی وت: چەندجار لە ئەبو مووسام بیستووە کە دەیوت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێك نەخۆش کەوت یان سەفەری کرد، پاداشتی بۆ دەنووسرێت بەوێنەی ئەو چاکانەی کە لە ماڵەوە و بەلەشساغی دەیکرد)).**

## ١٣٥- باب السَّيْرِ وَحْدَهُ

**٢٩٩٧-** حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ يَقُولُ نَدَبَ النَّبِيُّ ﷺ النَّاسَ يَوْمَ الخَنْدَقِ، فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّا، وَحَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ». قَالَ سُفْيَانُ الحَوَارِيُّ: النَّاصِرُ[١].

(١) بڕوانە: ٢٨٤٦.

## ١٣٥- (حوكمى) ڕۆيشتن بۆ سەفەر بەتەنها

**٢٩٩٧- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی (غەزای) خەندەقدا داوای لەخەڵکەکە کرد (کەسێکیان بڕوات هەواڵی بەنی قوڕەیزەی بۆ بێنێت)، جا زوبەیر ئامادەیی خۆی دەربڕی، پاشان داوای لێکردن، دیسان زوبەیر ئامادەیی خۆی دەربڕی، دوای ئەوە داوای لێکردنەوە، هەر زوبەیر ئامادەبوو بڕوات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان هەموو پێغەمبەرێك حەواری[1] هەبووە، حەواری منیش زوبەیرە)). سوفیان دەڵێ: (الحَوَارِيُّ)، واتە: یاریدەدەر و پشتیوان.**

٢٩٩٨- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.
حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي الوَحْدَةِ مَا أَعْلَمُ مَا سَارَ رَاكِبٌ بِلَيْلٍ وَحْدَهُ».

**٢٩٩٨- ئیبنو عومەر[2] ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەوەی من دەیزانم لەبارەی تەنهاییەوە گەر خەڵکی بیانزانیبایە سوار (یان پیادە) یێك بەشەو نەدەڕۆیشت (بۆ سەفەر و شوێنێك) )).**

## ١٣٦- بابُ السُّرْعَةِ فِي السَّيْرِ

قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنِّي مُتَعَجِّلٌ إِلَى المَدِينَةِ، فَمَنْ أَرَادَ أَنْ يَتَعَجَّلَ مَعِي فليتعجل"[1].

---

(١) حەواری: بەچەند مانا مانایان کردووە: یاریدەدەر، دۆستی تایبەتی، لەبەر سپێتی پۆشاکەکەیان وایان پێ وتراوە، پشتیوان. .(بڕوانە: إرشاد الساري:٦/٤٧٠).

(٢) ئەم فەرموودەیە بەدوو ڕێگە و سەنەد هاتووە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ.

٢٩٩٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي قَالَ سُئِلَ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ ﵄ كَانَ يَحْيَى يَقُولُ وَأَنَا أَسْمَعُ فَسَقَطَ عَنِّي- عَنْ مَسِيرِ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ، قَالَ فَكَانَ يَسِيرُ العَنَقَ، فَإِذَا وَجَدَ فَجْوَةً نَصَّ: وَالنَّصُّ فَوْقَ العَنَقِ[٢].

## ١٣٦- باسی خێرایی لە ڕۆیشتندا (لەکاتی گەڕانەوە لە سەفەر)

**ئەبو حومەید دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من بەخێرایی دەگەڕێمەوە بۆ مەدینە، جا هەرکەسێك دەیەوێ بەخێرایی لەگەڵم بێت با خێرا بکات)).**

**٢٩٩٩- یەحیا دەڵێ: هیشام (ی کوڕی عوروە) دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە وتی: پرسیار لە ئوسامەی کوڕی زەید ﵄ کرا، یەحیا دەیوت: منیش گوێم لێبوو، بەڵام ئەم وتەیەم لەبیر چووبوو -دەربارەی شێوەی ڕۆیشتنی پێغەمبەر ﷺ- لە حەجی ماڵئاواییدا، ئوسامە وتی: پێغەمبەر ﷺ مامناوەند دەڕۆیشت، بەڵام ئەگەر بەردەمی چۆڵ بوایە خێراتر دەڕۆیشت. (هیشام دەڵێ:) (النَّصُّ) ڕۆیشتنێکە خێراتر لە (العَنَقِ) کە ڕۆیشتنی مام ناوەندە.**

٣٠٠٠- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي زَيْدٌ -هُوَ ابْنُ أَسْلَمَ- عَنْ أَبِيهِ، قَالَ كُنْتُ مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ بِطَرِيقِ مَكَّةَ، فَبَلَغَهُ عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ أَبِي عُبَيْدٍ شِدَّةُ وَجَعٍ، فَأَسْرَعَ السَّيْرَ حَتَّى إِذَا كَانَ بَعْدَ غُرُوبِ الشَّفَقِ، ثُمَّ نَزَلَ فَصَلَّى المَغْرِبَ وَالْعَتَمَةَ، يَجْمَعُ بَيْنَهُمَا، وَقَالَ إِنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ إِذَا جَدَّ بِهِ السَّيْرُ أَخَّرَ الْمَغْرِبَ وَجَمَعَ بَيْنَهُمَا[٣].

---

(١) بروانە: ١٤٨١.

(٢) بروانە: ١٦٦٦.

(٣) بروانە: ١٠٩١.

**٣٠٠٠- موحەمەدی کوڕی جەعفەر وتی: زەید -کە کوڕی ئەسلەمە- لە باوکیەوە بۆی دەگێڕایەوە، وتی: من لە ڕێگای مەککە لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عومەردا ﷺ بووم، کە هەواڵی ئازاری بەهێزی صەفییەی کچی عوبەیدی پێگەیشت، بۆیە پەلەی کرد لە ڕۆیشتندا[1] تا ئەو کاتەی سوورایی ئاسمان ئاوا بوو، پاشان دابەزی و لایدا و نوێژی مەغریب و عیشای کرد، پێکەوە دەیکردن (کۆی دەکردنەوە)، وتی: من پێغەمبەرم ﷺ بینیوە ئەگەر خێرا بڕۆیشتبایە نوێژی مەغریبی دوادەخست و لەگەڵ عیشادا پێکەوە دەیکردن.**

٣٠٠١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ سُمَيٍّ مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ العَذَابِ؛ يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ نَوْمَهُ وَطَعَامَهُ وَشَرَابَهُ، فَإِذَا قَضَى أَحَدُكُمْ نَهْمَتَهُ فَلْيُعَجِّلْ إِلَى أَهْلِهِ»[2].

**٣٠٠١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (سەفەر پارچەیەکە لە سزا و ئازار، ڕێگری نووستن و خواردن و خواردنەوە لە هەرکامتان دەکات، بۆیە هەر کەسێکتان مەبەست و پێویستیەکانی جێبەجێ بوو، با پەلە بکات لە گەڕانەوە بۆ لای کەسوکاری).**

---

(١) وڵاخەکەی بەپەلە لێ دەخوڕی.

(٢) بڕوانە: ١٨٠٤.

## ١٣٧- بَابٌ: إِذَا حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ فَرَآهَا تُبَاعُ

٣٠٠٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَوَجَدَهُ يُبَاعُ، فَأَرَادَ أَنْ يَبْتَاعَهُ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «لاَ تَبْتَعْهُ، وَلاَ تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ»[1].

## ١٣٧- باسێك: ئەگەر كەسێك ئەسپێكی بەخشی بەكەسێكی تر سواری بێ (بۆ جیهاد) دواتر بینی دەفرۆشرێ[2]

**٣٠٠٢- مالیك دەگێڕێتەوە لە نافیعەوە لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە رضي الله عنهما كە عومەری كوڕی خەتتاب رضي الله عنه ئەسپێكی بەخشی لە ڕێی خوادا بە غەزاكارێ سواری بێت، ئەنجا ئەسپەكەی دی دەفرۆشرێت، عومەریش ویستی بیكڕێت، بۆیە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد (بیكڕێت؟) ئەویش فەرمووی: ((مەیكڕە و بەخشینەكەت (بە پارە) مەگێڕەوە بۆ خۆت)).**

٣٠٠٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رضي الله عنه يَقُولُ: حَمَلْتُ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَابْتَاعَهُ -أَوْ فَأَضَاعَهُ- الذِي كَانَ عِنْدَهُ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِيَهُ، وَظَنَنْتُ أَنَّهُ بَائِعُهُ بِرُخْصٍ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «لاَ تَشْتَرِهِ وَإِنْ بِدِرْهَمٍ، فَإِنَّ العَائِدَ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ»[3].

**٣٠٠٣- زەیدی كوڕی ئەسلەم لە باوكیەوە دەیگێڕێتەوە و دەڵێ: لە عومەری كوڕی خەتتابم بیست رضي الله عنه دەیوت: ئەسپێكم دا بە پیاوێك بۆ خەبات و جیهاد لە ڕێی خوادا سواری بێ، جا ئەو كەسەی ئەسپەكەی لابوو دەیفرۆشت -یان**

---

(١) بروانە: ١٤٨٩.

(٢) دروستە بۆ ئەو كەسەی بەخشیوەیەتی بیكڕێت یان نا؟

(٣) بروانە: ١٤٩٠.

خزمەتی نەکرد و گوێی پێنەدا- بۆیە ویستم بیکڕمەوە و گومانم وابوو بە هەرزان دەیفرۆشێ، جا پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد (لەو بارەوە) ئەویش فەرمووی: ((مەیکڕە با بەیەك دیرهەمیش بتداتێ، چونکە بێگومان ئەو کەسەی بەخشینەکەی بگێڕێتەوە، وەك ئەو سەگە وایە ڕشانەوەی خۆی بخواتەوە)).

## ١٣٨- بابُ الجِهَادِ بِإِذْنِ الأَبَوَيْنِ

٣٠٠٤- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا حَبِيبُ بْنُ أَبِي ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الْعَبَّاسِ الشَّاعِرَ -وَكَانَ لاَ يُتَّهَمُ فِي حَدِيثِهِ- قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو ﷺ يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَاسْتَأْذَنَهُ فِي الجِهَادِ فَقَالَ: «أَحَيٌّ وَالِدَاكَ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ «فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ»[١].

## ١٣٨- باسی جیهادکردن بە مۆڵەتی دایک و باوک (ی مسوڵمان)

٣٠٠٤- عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺو داوای کرد ڕێگەی بدات (بەشداربێ) لە جیهاددا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دایك و باوکت لە ژیاندان و زیندوون؟)) وتی: بەڵێ. فەرمووی: ((دەی لە خزمەتکردنیاندا تێبکۆشە)).

## ١٣٩- بابُ مَا قِيلَ فِي الجَرَسِ وَنَحْوِهِ فِي أَعْنَاقِ الإِبِلِ

٣٠٠٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، أَنَّ أَبَا بَشِيرٍ الأَنْصَارِيَّ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ قَالَ عَبْدُ

(١) بروانە: ٥٩٧٢.

اللَّهِ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ: وَالنَّاسُ فِي مَبِيتِهِمْ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَسُولاً أَنْ لاَ يَبْقَيَنَّ فِي رَقَبَةِ بَعِيرٍ قِلاَدَةٌ مِنْ وَتَرٍ أَوْ قِلاَدَةٌ إِلاَّ قُطِعَتْ.

## ١٣٩- باسی ئەوەی وتراوە دەربارەی زەنگ و شتی وا لە ملی وشتردا بێت

**٣٠٠٥- عەببادی کوڕی تەمیم دەگێڕێتەوە، کە ئەبو بەشیری ئەنصاری ﷺ بۆی گێڕایەوە کە ئەو لە سەفەرێکدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو، عەبدوڵلا (ی کوڕی ئەبو بەکر) وتی: وابزانم (ئەبو بەشیر) وتی: خەڵکەکە لە شوێنی خەوتنیاندا بوون، جا پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی نارد کە بڵێ: ((هەر وشترێك ملوانکەی ژێ[١] یان هەر ملوانکەیەکی کەی لە مل دایە بیچڕێنرێت[٢])).**

## ١٤٠- بابُ مَنِ اكْتُتِبَ فِي جَيْشٍ فَخَرَجَتِ امْرَأَتُهُ حَاجَّةً، أَوَ كَانَ لَهُ عُذْرٌ، هَلْ يُؤْذَنُ لَهُ؟

٣٠٠٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيد، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي مَعْبَد، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُول: «لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ، وَلاَ تُسَافِرَنَّ امْرَأَةٌ إِلاَّ وَمَعَهَا مَحْرَمٌ». فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا، وَخَرَجَتِ امْرَأَتِي حَاجَّةً. قَالَ: «اذْهَبْ فَحُجَّ مَعَ امْرَأَتِكَ»[٣].

---

(١) ژێی کەوان، ڕیخۆڵەی بادراوە دەکرێ بە کەوانی تیر و کەوانەوە.

(٢) هۆی بچڕاندنی ژێ یەکێک لەم سیانەیە: (١) بۆ ئەوەی وشترەکە نەبێت بەچاوەوە ئەمەش قەدەغەکراوە. (٢) بۆ ئەوەی لەکاتی غارداندا وشترەکە نەخنکێت. (٣) زەنگیان پێدا دەکرد. (٤) ڕەنگە شەوان نەهێڵێت خەویان لێبکەوێت (والله اعلم).

(٣) بڕوانە: ١٨٦٢.

## ١٤٠- باسی كەسێ ناوی لە لەشكرێكدا نووسرابێ و هاوسەرەكەشی بەڕێكەوتبێ بۆ حەج، یان بیانویەكی هەبێت، ئایا مۆڵەتی پێ دەدرێت؟ (حەج بكات لەگەڵ هاوسەرەكەی)

٣٠٠٦- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە كە لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((هیچ پیاوێك بە تەنها نەبێت لەگەڵ ئافرەتێكی (بێگانەدا)، وە هیچ ئافرەتێك سەفەر نەكات مەحرەمێكی خۆی لەگەڵدا نەبێت))، ئەنجا پیاوێك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ناوم نووسراوە بۆ غەزای ئەوە و ئەوە، هاوكات هاوسەرەكەشم دەیەوێت بڕوات بۆ حەج، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((بڕۆ لەگەڵ هاوسەرەكەت حەج بكە)).

## ١٤١- بابُ الجَاسُوس

وَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ ۝١﴾ الممتحنة. التَّجَسُّسُ: التَّبَحُّثُ.

٣٠٠٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ -سَمِعْتُهُ مِنْهُ مَرَّتَيْنِ- قَالَ: أَخْبَرَنِي حَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا ﷺ يَقُولُ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنَا وَالزُّبَيْرَ وَالْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ قَالَ: «انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ، فَإِنَّ بِهَا ظَعِينَةً وَمَعَهَا كِتَابٌ، فَخُذُوهُ مِنْهَا». فَانْطَلَقْنَا تَعَادَى بِنَا خَيْلُنَا حَتَّى انْتَهَيْنَا إِلَى الرَّوْضَةِ، فَإِذَا نَحْنُ بِالظَّعِينَةِ فَقُلْنَا أَخْرِجِي الكِتَابَ. فَقَالَتْ مَا مَعِي مِنْ كِتَابٍ. فَقُلْنَا لَتُخْرِجِنَّ الْكِتَابَ أَوْ لَنُلْقِيَنَّ الثِّيَابَ. فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ عِقَاصِهَا، فَأَتَيْنَا بِهِ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَإِذَا فِيهِ مِنْ حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ إِلَى أُنَاسٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، يُخْبِرُهُمْ بِبَعْضِ أَمْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ

رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَا حَاطِبُ، مَا هَذَا؟». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لاَ تَعْجَلْ عَلَيَّ، إِنِّي كُنْتُ امْرَأً مُلْصَقًا فِي قُرَيْشٍ، وَلَمْ أَكُنْ مِنْ أَنْفُسِهَا، وَكَانَ مَنْ مَعَكَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ لَهُمْ قَرَابَاتٌ بِمَكَّةَ، يَحْمُونَ بِهَا أَهْلِيهِمْ وَأَمْوَالَهُمْ، فَأَحْبَبْتُ إِذْ فَاتَنِي ذَلِكَ مِنَ النَّسَبِ فِيهِمْ أَنْ أَتَّخِذَ عِنْدَهُمْ يَدًا يَحْمُونَ بِهَا قَرَابَتِي، وَمَا فَعَلْتُ كُفْرًا وَلاَ ارْتِدَادًا وَلاَ رِضًا بِالْكُفْرِ بَعْدَ الإِسْلاَمِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقَدْ صَدَقَكُمْ». قَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا المُنَافِقِ. قَالَ: «إِنَّهُ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَكُونَ قَدِ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ، فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ». قَالَ سُفْيَانُ وَأَيُّ إِسْنَادٍ هَذَا!.

## ١٤١- باسی (حوکمی) جاسووس

**وە باسی ئەو فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بەدۆستی خۆتان)**

(التَّجَسُّسُ) **گەڕان بەدوای شتدا (بەنهێنی).**

**٣٠٠٧- عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ من و زوبەیر و میقدادی کوڕی ئەسوەدی نارد و فەرمووی: ((بڕۆن هەتا دەگەنە ڕەوزەتە خاخ[1] جا بێگومان لەوێدا ئافرەتێکی لێیە نامەیەکی پێیە لێی سەنن))، ئێمەش دەرچووین و وڵاغەکانمان غاردا هەتا گەشتینە ڕەوزەتە خاخ و بە ئافرەتەکە گەیشتین و وتمان: نامەکە دەربێنە، وتی: هیچ نامەیەکم پێ نییە، ئێمەش وتمان: سوێند بەخوا ئەو نامەیە دەردێنی یا جل و بەرگەکەت لەبەرتدا نایەڵین و دادەکەنین، ئەوسا نامەکەی لە ناو پەلکەکانی[2] قژیدا دەرهێنا، ئێمەش نامەکەمان هێنایەوە**

---

(١) ڕەوزە خاخ: شوێنێکە نزیک مەدینە.

(٢) دروستە بە پرچ، یان کۆکردنەوەی هەندێکی لەسەر هەندێکی و دانانی لەسەر سەر، یان بە پەتی بەستنی پرچ و پەلکەش مانا بکرێ. بڕوانە: إرشاد الساري: ٤٧٨/٦.

بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، تێیدا نووسرابوو: لە حاتیبی كوڕی ئەبی بەلتەعەوە بۆ كەسانێك لە بتپەرستانی خەڵكی مەككە هەواڵی هەندێ كاروباری پێغەمبەری خوای ﷺ پێدابوون، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((حاتیب ئەمە چییە؟)) حاتیب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پەلەم لێ مەكە! من كەسێك بووم خۆم خستبووە پاڵ قوڕەیش و لەوان نەبووم، بەڵام ئەو كۆچەرانەی كە لەگەڵتان هەموویان خزم و كەسیان لە مەككە هەیە، كەس و كار و سامانەكانیان دەپارێزن، بۆیە منیش كە ڕەچەڵەكەم لەوان نەبوو، پێم خۆش بوو چاكەیەكم بەسەریانەوە هەبێت كە بە هۆیەوە خزم و كەسەكانم بپارێزن، من كە ئەم كارەم كردووە وە نەبێ بێباوەڕ بووبم، یان هەڵگەڕابمەوە لە ئایینەكەم، یان ڕازی بووبم بە بێباوەڕی پاش مسوڵمان بوونم، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ڕاست دەكات لەگەڵتان))، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێم گەڕێ با بدەم لە گەردنی ئەم ناپاكە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو (حاتیب) بەشداری بەدری كردووە، تۆ چوزانیت لەوانەیە خوا ئاگاداری بەشداربووانی بەدر بێت (چی دەكەن) و فەرموویێتی: چیتان دەوێ بیكەن، چونكە بەڕاستی من لێتان خۆش بووم))، سوفیان دەڵێ: ئەمە چ ڕشتەیەكە! (ئەم فەرموودەی پێ گێردراوەتەوە)[1].

---

(١) واتە: ئەو كەسانەی ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە هەموویان كەسانی گەورە و باوەڕپێكراون، سوفیان سەرسامە پێیان.(بڕوانە: إرشاد الساري:٦/٤٨٠).

## ١٤٢- بابُ الكِسْوَةِ لِلأسارى

٣٠٠٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرٍو، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمَ بَدْرٍ أُتِيَ بِأُسَارَى، وَأُتِيَ بِالْعَبَّاسِ وَلَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ ثَوْبٌ، فَنَظَرَ النَّبِيُّ ﷺ لَهُ قَمِيصًا فَوَجَدُوا قَمِيصَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ يَقْدُرُ عَلَيْهِ، فَكَسَاهُ النَّبِيُّ ﷺ إِيَّاهُ، فَلِذَلِكَ نَزَعَ النَّبِيُّ ﷺ قَمِيصَهُ الذِي أَلْبَسَهُ. قَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ كَانَتْ لَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ يَدٌ فَأَحَبَّ أَنْ يُكَافِئَهُ[1].

## ١٤٢- باسی جل و بەرگ دان بەدیلەکان

**٣٠٠٨- جابیر کوڕی عەبدوڵلا ﷺ لەو ڕۆژەدا کە (غەزای) بەدر بوو دیلەکان هێنران، عەبباس هێنرا و کراسی لەبەردا نەبوو، پێغەمبەریش ﷺ ڕوانی هەتا کراسێکی بۆ پەیدا بکات، ئەنجا بینیان کە کراسەکەی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی پڕەبەریەتی و بۆی دەبێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێی دا لەبەری کرد، جا لەبەر ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ کراسەکەی خۆی داکەند و کردیە بەری عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی (لە کاتی مردن و ناشتنیدا).**

**سوفیانی کوڕی عویەینە دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی چاکەیەکی هەبوو بەسەر پێغەمبەرەوە ﷺ، بۆیە پێی خۆش بوو پاداشتی بداتەوە.**

## ١٤٣- بابُ فَضلِ مَن أسْلَمَ عَلَى يَدَيه رَجُلٌ

٣٠٠٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدٍ القَارِيُّ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَهْلٌ ﷺ - يَعْنِي ابْنَ سَعْدٍ- قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ

(١) بروانە: ١٢٧٠.

يَوْمَ خَيْبَرَ: «لأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ غَدًا رَجُلاً يُفْتَحُ عَلَى يَدَيْهِ، يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، وَيُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ». فَبَاتَ النَّاسُ لَيْلَتَهُمْ أَيُّهُمْ يُعْطَى، فَغَدَوْا كُلُّهُمْ يَرْجُوهُ فَقَالَ: «أَيْنَ عَلِيٌّ؟». فَقِيلَ: يَشْتَكِي عَيْنَيْهِ، فَبَصَقَ فِي عَيْنَيْهِ وَدَعَا لَهُ، فَبَرَأَ كَأَنْ لَمْ يَكُنْ بِهِ وَجَعٌ، فَأَعْطَاهُ فَقَالَ: أُقَاتِلُهُمْ حَتَّى يَكُونُوا مِثْلَنَا. فَقَالَ: «انْفُذْ عَلَى رِسْلِكَ حَتَّى تَنْزِلَ بِسَاحَتِهِمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ، وَأَخْبِرْهُمْ بِمَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ، فَوَاللَّهِ لأَنْ يَهْدِيَ الله بِكَ رَجُلاً خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ يَكُونَ لَكَ حُمْرُ النَّعَمِ»(١).

## ١٤٣- باسی گەورەیی پاداشتی ئەو کەسەی کەسێک لەسەر دەستیدا مسوڵمان ببێت

**٣٠٠٩- ئەبو حازیم دەڵێ: سەهل بۆی گێڕامەوە -مەبەستی سەهلی کوڕی سەعدە- وتی: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی (غەزای) خەیبەردا فەرمووی: ((سوێند بەخوا سبەینێ بەیداخەکە دەدەمە (دەست) پیاوێك ئازادکردنی (ی خەیبەر) لەسەر دەستی ئەودا دەکرێ، خوا و پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت خوا و پێغەمبەرەکەشی ئەویان خۆش دەوێت))، جا خەڵکەکە ئەوشەوە بیریان لەوە دەکردەوە بەیداخەکە بە چ کەسێکیان دەدرێت، ئینجا بەیانی زوو ڕۆیشتن هەموویان بەئومێدی ئەوە بوون(٢)، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کوا عەلی؟)) پێی وترا: هەردوو چاوی دێشێت، (هات و) پێغەمبەریش ﷺ تفی کردە چاوەکانی و دوعای بۆ کرد ئیتر چاك بۆوە دەتوت هەر نەخۆش نەبووە، ئەنجا بەیداخەکەی پێدا (عەلیش) وتی: جەنگیان لە دژ دەکەم تا (مسوڵمان دەبن و)**

---

(١) بڕوانە: ٢٩٤٢.

(٢) ئەو مژدە و بەڵێنە بۆ ئەو بێت و بەیداخەکە بەو بدرێت.

وەك ئێمەیان لێ دێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بە هێواشی و لەسەرخۆ بڕۆ هەتا دەچیتە گۆڕەپانەکەیانەوە [١]، پاشان بانگیان بکە بۆ (هاتنە ناو) ئیسلام، وە پێیان بڵێ (کە مسوڵمان بوون) چ شتێك پێویستە لەسەریان، جا سوێند بەخوا ئەگەر خوا بەهۆی تۆوە یەك کەس هیدایەت بدات، بۆ تۆ چاکترە لەوەی وشتری سوورت هەبێ (و ببیبەخشی لەڕێی خوادا) )).

## ١٤٤- بابُ الأُسَارى فِي السَّلَاسِلِ

٣٠١٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «عَجِبَ اللهُ مِنْ قَوْمٍ يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ فِي السَّلَاسِلِ»[٢].

## ١٤٤- باسی دیلەکان بەکۆت و زنجیرەوە

٣٠١٠- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خوا لە خەڵکانێك ڕازییە[٣] بەکۆت و زنجیرەوە[٤] دەچنە بەهەشتەوە)).

(١) واتە: نزیک دەبێتەوە لێیان و دەگەیتە ئەو گۆڕەپانەی لە نێوان تۆ و ئەوان دایە.

(٢) بڕوانە: ٤٥٥٧.

(٣) وشەی (عَجِبَ) بۆ خوا بەکاردێت، مەبەست پێی ئەو مانا نییە کە بۆ مرۆڤەکان بەکاردێت، بەڵکو بەو جۆرەی شیاوی خوابێت وەکو هەموو سیفەتەکانی تری، چونکە ئەگەر بۆ مرۆڤەکان بەکاربێت (عَجِبَ) سەیریان دێ، سەریان سوڕ دەمێنێ، چونکە زانیاریان بەو شتە نییە، بەڵام بۆ خوا وانییە چونکە خوا زانیاری بە هەموو شتێک هەیە، بۆیە زانایان دەڵێن: (عَجِبَ) بۆ خوا مەبەست پێی ڕازیبوون و گەورەی ئەو شتەیە.

(٤) لە دونیادا کافربوون دیل کراون، پاشان مسوڵمان بوون، یان مسوڵمان بوون، کافران دیلیان کردوون و مردوون، یان بەدیلی کوژراون، مانای سێیەم: ئەوان لە دونیادا لە کۆت و زنجیردابوون کاتێ کافر بوون کە مسوڵمان بوون کۆت و زنجیریان پێوە نەماوە پاشان مردوون و چوونەتە بەهەشتەوە. بڕوانە: إرشاد الساري: ٤٨٢/٦.

## ١٤٥- بابُ فَضْلِ مَنْ أَسْلَمَ مِنْ أَهْلِ الكِتَابَيْنِ

٣٠١١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ حَيٍّ أَبُو حَسَنٍ قَالَ: سَمِعْتُ الشَّعْبِيَّ يَقُولُ، حَدَّثَنِي أَبُو بُرْدَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَاهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ثَلاَثَةٌ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ: الرَّجُلُ تَكُونُ لَهُ الأَمَةُ فَيُعَلِّمُهَا فَيُحْسِنُ تَعْلِيمَهَا، وَيُؤَدِّبُهَا فَيُحْسِنُ أَدَبَهَا، ثُمَّ يُعْتِقُهَا فَيَتَزَوَّجُهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَمُؤْمِنُ أَهْلِ الكِتَابِ الذِي كَانَ مُؤْمِنًا، ثُمَّ آمَنَ بِالنَّبِيِّ ﷺ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَالْعَبْدُ الذِي يُؤَدِّى حَقَّ اللهِ وَيَنْصَحُ لِسَيِّدِهِ». ثُمَّ قَالَ الشَّعْبِيُّ وَأَعْطَيْتُكَهَا بِغَيْرِ شَيْءٍ، وَقَدْ كَانَ الرَّجُلُ يَرْحَلُ فِي أَهْوَنَ مِنْهَا إِلَى المَدِينَةِ[1].

## ١٤٥- باسی گەورەیی پاداشتی ئەو کەسەی لەگاوور و جوو مسوڵمان بووە

**٣٠١١- ئەبو بوردە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ((سێ جۆر کەس دوو جار پاداشت دەدرێنەوە: پیاوێك کەنیزەکێکی هەبێت و (ئەوەی پێویستە لە ئیسلام) بەجوانی فێری بکات و پەروەردەی بکات بە پەروەردەیەکی جوان، پاشان ئازادی بکات و مارەی بکات بۆ خۆی، ئەو کەسە دوو پاداشتی هەیە، باوەڕدارێکی گاوور یان جوو کە باوەڕدار بووە (بە پێغەمبەرەکەی خۆی)، پاشان باوەڕی بە پێغەمبەر (ی ئیسلام) هێناوە، ئەو کەسەش دوو جار پاداشتی هەیە، بەندەیەکیش مافی خوای گەورە بەجێ بێنێ و دڵسۆز بێت بۆ گەورەکەی (لە خزمەتکردن و شتی تردا) ئەمیش دوو پاداشتی هەیە))، پاشان شەعبی وتی: ئەم فەرموودەیەم پێدایت بەبێ بەرانبەر، کە بێگومان کەسێك بۆ کەمتر لەمە سەفەری دەکرد بۆ مەدینە.**

---

(١) بڕوانە: ٩٧. شەعبی لە کوفە دانیشتووە و ژیاوە، مەبەستی ئەوەیە کە کەسێك لە کوفەوە دەڕۆشت بۆ مەدینە بۆ وەرگرتنی فەرمودەیەك.

## ١٤٦- بابُ أهْلِ الدَّارِ يُبَيَّتُونَ فَيُصَابُ الوِلْدَانُ وَالذَّرَارِيُّ

﴿ بَيَٰتًا ﴿٤﴾ ﴾ الأعراف، لَيْلًا. ﴿ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ ﴿٤٩﴾ ﴾ النمل: لَيْلاً. يُبَيِّتُ: لَيْلًا.

٣٠١٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ ﷺ قَالَ: مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِالأَبْوَاءِ -أَوْ بِوَدَّانَ- وَسُئِلَ عَنْ أَهْلِ الدَّارِ يُبَيَّتُونَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَيُصَابُ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذَرَارِيِّهِمْ قَالَ: «هُمْ مِنْهُمْ». وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «لاَ حِمَى إِلاَّ لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ ﷺ»[١].

## ١٤٦- باسی دانیشتوانی ماڵێک (کافری جەنگکەر) شەو هێرشیان بکرێتە سەر و منداڵیان بکوژرێت (دروستە یان نا؟)

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:)** ﴿ بَيَٰتًا ﴿٤﴾ ﴾ الأعراف: **لە شەودا.** ﴿ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ ﴿٤٩﴾ ﴾ النمل: **هێرش دەکەنە سەری بە شەودا.** (يُبَيِّتُ): **لە شەودا یان بەشەودا.**

**٣٠١٢- ئیبنو عەبباس دەگێڕێتەوە لە صەعبی کوڕی جەسامەوە ﷺ دەڵێ: لە ئەبوا -یان وەددان- پێغەمبەر ﷺ دای بەلامدا و پرسیاری لێکرا: دەربارەی دانیشتوانی ماڵێك لە بتپەرستان شەو بدرێت بەسەریاندا[٢]، جا ئافرەت و منداڵیان بەربکەون و بکوژرێن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەوانیش (ئافرەت و منداڵ) هەر لەوانن (بتپەرستە جەنگ کەرەکان) ))، صەعب دەڵێ: گوێم لێ بوو دەیفەرموو: ((قەدەغەکردن[٣] بۆ کەس دروست نییە جگە لە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ)).**

---

(١) بروانە: ١٨٢٥.

(٢) لە لایەن لەشکری ئیسلامەوە.

(٣) قەدەغەکردن: ئەوەیە کەسێکی دەسەڵاتدار جێگایەک پووش و لەوەڕی لێ بێ قەدەغەی دەکات و کەسی تر بۆی نییە ئاژەڵی تێدا بلەوەڕێنێ جگەلە خۆی.(إرشاد الساري:٦/٤٨٦).

٣٠١٣- وَعَنِ الزُّهْرِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ عُبَيْدَ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: حَدَّثَنَا الصَّعْبُ فِي الذَّرَارِيِّ،كَانَ عَمْرٌو يُحَدِّثُنَا، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فَسَمِعْنَاهُ مِنَ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ الصَّعْبِ قَالَ: «هُمْ مِنْهُمْ». وَلَمْ يَقُلْ كَمَا قَالَ عَمْرٌو «هُمْ مِنْ آبَائِهِمْ»(١).

**٣٠١٣- زوهری دەگێڕێتەوە کە ئەو لە عەبدوڵلای بیستووە ئەویش لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێ: صەعب بۆی گێڕاینەوە دەربارەی منداڵ و کوڕ و کاڵ.**
**هەروەها عەمرٍ بۆی گێڕاینەوە لە ئیبنو شیهابەوە(٢) لە پێغەمبەرەوە ﷺ (سوفیان دەڵێ:) جا ئەمەمان لە زوهریەوە بیستووە وتی: عوبەیدوڵلا بۆی گێڕاینەوە لە ئیبنو عەبباسەوە لە صەعبەوە وتی: ((ئەوانیش لەوانن)) بەو جۆرەی نەوت کە عەمرٍ وتی: ((ئەوانیش لە باوکیانن)).**

## ١٤٧- بابُ قتْلِ الصِّبيَانِ فِي الحَرْبِ

٣٠١٤- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، أَخْبَرَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ رضي الله عنه أَخْبَرَهُ أَنَّ امْرَأَةً وُجِدَتْ فِي بَعْضِ مَغَازِي النَّبِيِّ ﷺ مَقْتُولَةً، فَأَنْكَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَتْلَ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ(٣).

## ١٤٧- باسی کوشتنی منداڵان لە جەنگدا (قەدەغە کراوە)

**٣٠١٤- نافیع لە عەبدوڵلا (ی کوڕی عومەر) رضي الله عنهما گێڕایەوە کە ئافرەتێك لە یەکێك لە غەزاکانی پێغەمبەردا ﷺ بە کوژراوی دۆزرایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ نارەزایی دەربڕی لە کوشتنی ئافرەتان و منداڵان.**

(١) بڕوانە: ٢٣٧٠.
(٢) بە مورسەلی یەکسەر دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بێ ئەوەی ناوی صەحابەکە بێنێ لێی بیستووە.
(٣) بڕوانە: ٣٠١٥.

## ١٤٨- بَابُ قَتْلِ النِّسَاءِ فِي الحَرْبِ

٣٠١٥- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: قُلْتُ لأَبِي أُسَامَةَ: حَدَّثَكُمْ عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ، وُجِدَتِ امْرَأَةٌ مَقْتُولَةً فِي بَعْضِ مَغَازِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ[1].

## ١٤٨- باسی (قەدەغە کردن) کوشتنی ئافرەتان لە جەنگدا

**٣٠١٥- ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: لە یەکێك لە غەزاکانی پێغەمبەردا ﷺ ئافرەتێك بەکوژراوی دۆزرایەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە کوشتنی ئافرەتان و منداڵان.**

## ١٤٩- بَابٌ: لَا يُعَذَّبُ بِعَذَابِ اللَّهِ

٣٠١٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ بُكَيْرٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْثٍ فَقَالَ: «إِنْ وَجَدْتُمْ فُلاَنًا وَفُلاَنًا فَأَحْرِقُوهُمَا بِالنَّارِ» ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ أَرَدْنَا الخُرُوجَ «إِنِّي أَمَرْتُكُمْ أَنْ تُحْرِقُوا فُلاَنًا وَفُلاَنًا، وَإِنَّ النَّارَ لاَ يُعَذِّبُ بِهَا إِلاَّ اللهُ، فَإِنْ وَجَدْتُمُوهُمَا فَاقْتُلُوهُمَا»[2].

## ١٤٩- باسێک: کەس سزا نادرێ بە سزایەک تایبەتی خوایە

**٣٠١٦- سولەیمانی کوڕی یەسار لە ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی نارد لە یەکێك لەو هێزانەی دەینارد و فەرمووی: ((ئەگەر فلان کەس و فلان کەستان بینی ئەوە هەردووکیان بەئاگر بسوتێنن))،**

(١) بڕوانە: ٣٠١٤.

(٢) بڕوانە: ٢٩٥٤.

پاشان کاتێ و یستمان دەرچین پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من فەرمانم پێ کردن کە فلانە کەس و فلانە کەس بسوتێنن بەئاگر، بێگومان تەنها خوا بەئاگر سزا (ی خەڵك) دەدات، بۆیە ئەگەر هەردووکیانتان بینی (پێیان گەشتن) بیانکوژن)).

٣٠١٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، أَنَّ عَلِيًّا ﷺ حَرَّقَ قَوْمًا، فَبَلَغَ ابْنَ عَبَّاسٍ فَقَالَ: لَوْ كُنْتُ أَنَا لَمْ أُحَرِّقْهُمْ، لأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لاَ تُعَذِّبُوا بِعَذَابِ اللَّهِ». وَلَقَتَلْتُهُمْ كَمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»[1].

٣٠١٧- عیکریمە دەگێڕێتەوە کە علی ﷺ کەسانێکی بەئاگر سووتاند، ئینجا ئەم هەواڵە گەیشت بە ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: ئەگەر منبوومایە (لە جێگای عەلی) نەمدەسووتاندن، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((بەسزای خوا (کە ئاگرە) کەس سزامەدەن))، وە دەمکوشتن وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس پاشگەزبۆوە لە ئایینەکەی بیکوژن)).

## ١٥٠- بابٌ: ﴿ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴿٤﴾ ﴾ محمد

فِيهِ حَدِيثُ ثُمَامَةَ، وَقَوْلُهُ: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ﴿٦٧﴾ ﴾ الآيَةَ، الأنفال، يغلب.

## ١٥٠- باسێک: دەربارەی (جا دواتر یا بەمنەت و چاکە (دیلەکان بەرەڵاکەن) یان بەفیدیە و بریتی)

لەم باسەدا فەرموودەی سومامە هەیە[1]، وە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەش: (بۆ هیچ پێغەمبەرێك ڕەوا نییە کە دیلی (لە دوژمنان) هەبێت هەتا زاڵ نەبێت

---

(١) بڕوانە: ٦٩٢٢.

لە زەویدا، ئێوەماڵی دونیاتان دەوێ (بە وەرگرتنی فیدیە)، بەڵام خوا (پاداشتی) ڕۆژی دوایی دەوێ (بۆتان)، وە خوا زاڵی کاربەجێیە).

﴿ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: هەتا (پێغەمبەر ﷺ) زاڵ نەبێت لە زەویدا[٢].

## ١٥١- بابٌ: هَلْ لِلأَسِيرِ أَنْ يَقْتُلَ أَوْ يَخْدَعَ الذِينَ أَسَرُوهُ حَتَّى يَنْجُوَ مِنَ الكَفَرَةِ؟

فِيهِ المِسْوَرُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

## ١٥١- باسێک: ئایا دروستە دیل (ی مسوڵمان) ئەو کەسانە بکوژرێت و بخەڵەتێنێت کە دیلیان کردوە بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت لە دەستی کافران؟

لەم باسە فەرموودەکەی میسوەر هەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە[٣].

## ١٥٢- بابٌ: إِذَا حَرَّقَ المُشْرِكُ المُسْلِمَ هَل يُحَرَّقُ؟

٣٠١٨- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَهْطًا مِنْ عُكْلٍ ثَمَانِيَةً قَدِمُوا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَاجْتَوَوُا المَدِينَةَ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ابْغِنَا رِسْلاً. قَالَ: «مَا أَجِدُ لَكُمْ إِلاَّ أَنْ تَلْحَقُوا بِالذَّوْدِ». فَانْطَلَقُوا فَشَرِبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا حَتَّى صَحُّوا

---

(١) کە لە (كتاب المغازي، باب وفد بني حنيفة وحديث ثمامه بن أثال) بە ژمارە (٤٣٧٢) دێت لەوێ باسی دەکەین و شەرح و ڕاڤەی دەکەین إن شاء الله.

(٢) لە گەڕانەوەی ئەبی زەڕو کەریمەدا ئەم زەیادەی هەیە ( لە - حتى يَغْلِبَ في الأرض - تريدون عرض الدنيا) الأنفال: ٦٧،واتە: مانای ئەم بەشەی ئایەتەکەی کردوە:(﴿ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ﴿٦٧﴾ ﴾ الأنفال).

(٣) ڕابورد بە ژمارەکانی (٢٧٣١، ٢٧٣٢) لە (كتاب الشروط، باب الشروط في الجهاد والمصالحة مع أهل الحرب و كتابة الشروط).

وَسَمِنُوا، وَقَتَلُوا الرَّاعِيَ، وَاسْتَاقُوا الذَّوْدَ، وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلاَمِهِمْ، فَأَتَى الصَّرِيخُ النَّبِيَّ ﷺ، فَبَعَثَ الطَّلَبَ، فَمَا تَرَجَّلَ النَّهَارُ حَتَّى أُتِيَ بِهِمْ، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، ثُمَّ أَمَرَ بِمَسَامِيرَ فَأُحْمِيَتْ فَكَحَلَهُمْ بِهَا، وَطَرَحَهُمْ بِالْحَرَّةِ، يَسْتَسْقُونَ فَمَا يُسْقَوْنَ حَتَّى مَاتُوا. قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ قَتَلُوا وَسَرَقُوا وَحَارَبُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ﷺ وَسَعَوْا فِي الأَرْضِ فَسَادًا[١].

## ١٥٢- باسێک: ئایا ئەگەر بتپەرستێک مسوڵمانێکی سووتاند (ئەو بتپەرستە) دەسوتێنرێ؟

**٣٠١٨- ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ کۆمەڵێ کەس لە هۆزی عوکل کە هەشت کەس بوون هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ حەزیان بە دانیشتن لە مەدینەدا نەکرد[٢]، بۆیە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا شیرمان بۆ پەیدا بکە (بیخۆینەوە)، فەرمووی: ((دەستم ناکەوێ بۆتان مەگەر بڕۆن بگەن بەو چەند وشترەدا[٣]))، ئەوانیش ڕۆیشتن و لە میز و شیرەکانیان خواردەوە تا چاکبوونەوە و قەڵەو بوون، وە شوانەکەیان کوشت و بە پەلە وشترەکانیان دایە پێش خۆیان و فڕاندیان، وە پاشگەزبوو بوونەوە دوای مسوڵمان بوونیان، ئەنجا هاوارکەرێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ (هەواڵەکەی پێدا)، پێغەمبەریش ﷺ خەڵکی نارد بە شوێنیاندا خۆر زۆر بەرز نەبوو بۆوە (گرتنیان و) هێنران، ئەنجا (فەرمانی کرد) دەست و قاچیان بڕین، پاشان فەرمانی کرد چەند بزمارێك سوورکرانەوە چاویان پێ هەڵکۆڵی، وە لەبەر خۆر فڕێ دران، داوای ئاویان دەکرد و پێیان نەدەدرا هەتا مردن.**

**ئەبو قیلابە دەڵێ: (ئەو کەسانە) خەڵکیان کوشت و دزیان کرد و جەنگ و دوژمنایەتیان کرد لە دژی خوا و پێغەمبەرەکەی، وە هەوڵیاندا لە زەویدا خراپە بڵاوبکەنەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٢٣٣.

(٢) یان حەزیان بە ئاو و هەواو و خواردنی مەدینە نەکرد و پێیان نەدەکەوت.

(٣) کە هی زەکاتن.

## ١٥٣- بابٌ

٣٠١٩- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ وَأَبِي سَلَمَةَ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «قَرَصَتْ نَمْلَةٌ نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَاءِ، فَأَمَرَ بِقَرْيَةِ النَّمْلِ فَأُحْرِقَتْ، فَأَوْحَى الله إِلَيْهِ أَنْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةٌ أَحْرَقْتَ أُمَّةً مِنَ الأُمَمِ تُسَبِّحُ؟!»[1].

## ١٥٣- باسێک

**٣٠١٩- ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((مێرولەیەك پێغەمبەرێکی لە پێغەمبەران ﷺ گەست، پێغەمبەرەکەش فەرمانی کرد کە شارە مێرولەکە (بسوتێنن) وسوتێنرا، ئەنجا خوای گەورە نیگای بۆپێغەمبەرەکە کرد (و فەرمووی): لەبەر ئەوەی مێرولەیەك گەستیتی ئوممەتێکت لە ئوممەتان سوتاند کە تەسبیحات و بەندایەتی خوایان دەکرد)). (خوا وەك عیتاب و لۆمە ئەمەی پێفەرموو).**

## ١٥٤- بابُ حَرْقِ الدُّورِ وَالنَّخِيلِ

٣٠٢٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنِي قَيْسُ بْنُ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: قَالَ لِي جَرِيرٌ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلاَ تُرِيحُنِي مِنْ ذِي الخَلَصَةِ؟». وَكَانَ بَيْتًا فِي خَثْعَمَ يُسَمَّى كَعْبَةَ اليَمَانِيَةَ قَالَ: فَانْطَلَقْتُ فِي خَمْسِينَ وَمِائَةِ فَارِسٍ مِنْ أَحْمَسَ، وَكَانُوا أَصْحَابَ خَيْلٍ قَالَ: وَكُنْتُ لاَ أَثْبُتُ عَلَى الخَيْلِ، فَضَرَبَ فِي صَدْرِي حَتَّى رَأَيْتُ أَثَرَ أَصَابِعِهِ فِي صَدْرِي وَقَالَ «اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ وَاجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا».

---

(١) بڕوانە: ٣٣١٩.

فَانْطَلَقَ إِلَيْهَا فَكَسَرَهَا وَحَرَّقَهَا، ثُمَّ بَعَثَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يُخْبِرُهُ فَقَالَ رَسُولُ جَرِيرٍ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، مَا جِئْتُكَ حَتَّى تَرَكْتُهَا كَأَنَّهَا جَمَلٌ أَجْوَفُ أَوْ: أَجْرَبُ. قَالَ: فَبَارَكَ فِي خَيْلِ أَحْمَسَ وَرِجَالِهَا خَمْسَ مَرَّاتٍ[١].

## ١٥٤- باسی سوتاندنی ماڵان و باغی دار خورما (دروستە)

**٣٠٢٠- ئەبو حازیم دەڵێ: جەریر پێی وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێم: ((ئەرێ (بوتخانەی) زولخەلەصەم لەکۆڵ ناکەیتەوە و دڵخۆشم ناکەیت؟)) زولخەلەصە خانووی بوتێك بوو لەناو هۆزی خەسعەم دا پێی دەوترا کەعبەی یەمەن[٢]، جەریر دەڵێ: منیش بە سەد و پەنجا سوارەوە لە هۆزی ئەحمەس کە خاوەنی ئەسپی زۆر بوون دەرچووم و ڕۆشتم، جەریر دەڵێ: من خۆم نەدەگرت بەسەر ئەسپەوە بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەستی کێشا بەسنگمدا (بە جۆرێك) هەتا شوێنی پەنجەکانیم بەسنگمەوە بینی، وە فەرمووی: ((خوایە ڕاگیری بکە (بەسوار وڵاخەکەیەوە) بیکە بە ڕێنیشاندەرێکی ڕێنیشاندراو))، ئەنجا جەریر دەرچوو بەرەو زولخەلەصە (و خانووەکەی ڕوخاند و) شکاندی و سووتاندی، پاشان کەسێکی ناردەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە هەواڵەکەی پێ بدات، نێراوەکەی جەریر وتی: (ئەی پێغەمبەر) سوێند بەو زاتەی تۆی بەڕاستی ڕەوانە کردووە نەهاتووم بۆ خزمەتی تۆ هەتا ئەو کاتەی کە بەجێم هێشت دەتوت وشتری ناوبۆشە یان وشتری گەڕی قەترانی پیاکراوە، (ئەو کەسە) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێنج جار دوعای فەڕ و بەرەکەتی بۆ ئەسپ و پیاوەکانی هۆزی ئەحمەس کرد.**

---

(١) بڕوانە: ٣٠٣٦، ٣٠٧٦، ٣٨٢٣، ٤٣٥٥، ٤٣٥٦، ٤٣٥٧، ٦٠٩٠، ٦٣٣٣.

(٢) یانی کەعبەی لای ڕاست یان لە وەڵاتی یەمەن بوو.

٣٠٢١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ حَرَّقَ النَّبِيُّ ﷺ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ[١].

**٣٠٢١- ئیبنو عومەر ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ دار خورماکانی بەنی نەزیری سووتاند [٢].**

## ١٥٥- بابُ قتْلِ النَّائمِ المُشْرِكِ

٣٠٢٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ زَكَرِيَّاءَ بْنِ أَبِي زَائِدَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَهْطًا مِنَ الأَنْصَارِ إِلَى أَبِي رَافِعٍ لِيَقْتُلُوهُ، فَانْطَلَقَ رَجُلٌ مِنْهُمْ فَدَخَلَ حِصْنَهُمْ قَالَ: فَدَخَلْتُ فِي مَرْبِطِ دَوَابَّ لَهُمْ، قَالَ: وَأَغْلَقُوا بَابَ الحِصْنِ، ثُمَّ إِنَّهُمْ فَقَدُوا حِمَارًا لَهُمْ، فَخَرَجُوا يَطْلُبُونَهُ، فَخَرَجْتُ فِيمَنْ خَرَجَ أُرِيهِمْ أَنَّنِي أَطْلُبُهُ مَعَهُمْ، فَوَجَدُوا الحِمَارَ، فَدَخَلُوا وَدَخَلْتُ، وَأَغْلَقُوا بَابَ الحِصْنِ لَيْلاً، فَوَضَعُوا المَفَاتِيحَ فِي كَوَّةٍ حَيْثُ أَرَاهَا، فَلَمَّا نَامُوا أَخَذْتُ الْمَفَاتِيحَ، فَفَتَحْتُ بَابَ الحِصْنِ ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَيْهِ فَقُلْتُ: يَا أَبَا رَافِعٍ. فَأَجَابَنِي، فَتَعَمَّدْتُ الصَّوْتَ، فَضَرَبْتُهُ فَصَاحَ، فَخَرَجْتُ ثُمَّ جِئْتُ، ثُمَّ رَجَعْتُ كَأَنِّي مُغِيثٌ فَقُلْتُ يَا أَبَا رَافِعٍ، -وَغَيَّرْتُ صَوْتِي- فَقَالَ: مَا لَكَ؟ لأُمِّكَ الوَيْلُ قُلْتُ: مَا شَأْنُكَ قَالَ: لاَ أَدْرِي مَنْ دَخَلَ عَلَيَّ فَضَرَبَنِي. قَالَ: فَوَضَعْتُ سَيْفِي فِي بَطْنِهِ، ثُمَّ تَحَامَلْتُ عَلَيْهِ حَتَّى قَرَعَ العَظْمَ، ثُمَّ خَرَجْتُ وَأَنَا دَهِشٌ، فَأَتَيْتُ سُلَّمًا لَهُمْ لأَنْزِلَ مِنْهُ فَوَقَعْتُ فَوُثِئَتْ رِجْلِي، فَخَرَجْتُ إِلَى أَصْحَابِي فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِبَارِحٍ حَتَّى أَسْمَعَ النَّاعِيَةَ، فَمَا بَرِحْتُ حَتَّى سَمِعْتُ نَعَايَا أَبِي رَافِعٍ تَاجِرِ أَهْلِ الحِجَازِ. قَالَ: فَقُمْتُ وَمَا بِي قَلَبَةٌ حَتَّى أَتَيْنَا النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرْنَاهُ[٣].

---

(١) بروانه: ٢٣٢٦.

(٢) فەرمانی کرد بەسووتاندنی.

(٣) بروانه: ٣٠٢٣، ٤٠٣٨، ٤٠٣٩، ٤٠٤٠.

## ١٠٠- باسی كوشتنی بتپەرستی خەوتوو

٣٠٢٢- بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند كەسێكی ئەنصاڕی نارد بۆ سەر ئەبی ڕافیع بۆ ئەوەی بیكوژن، جا پیاوی لەوانە خێرا ڕۆشت و چوویە ژوورەوە بۆ ناو قەڵاكەیان، ئەو كەسە دەڵێ: ڕۆشتمە ئەو جێگای وڵاخیان تێدا دەبەستەوە، دەڵێ: ئیتر دەرگای قەڵاكەیان داخست، پاشان گوێدرێژێكیان ون كردبوو، بۆیە لە قەڵاكە ڕۆیشتنە دەرەوە بۆ گوێدرێژەكە دەگەڕان، منیش لەگەڵ ئەوانەی ڕۆیشتنە دەرەوە ڕۆیشتمە دەرەوە وام نیشاندا كە منیش لەگەڵیاندا بۆ گوێدرێژەكە دەگەڕێم، ئەنجا گوێدرێژەكەیان دۆزیەوە، جا ڕۆیشتنە ژوورەوە منیش ڕۆشتمە ژوورەوە، بەشەودا دەرگای قەڵاكەیان دادەخست و كلیلەكانیان لە تاقێكدا دانا كە من دەم بینی، جا كاتێ خەوتن كلیلەكانم هێنا و دەرگای قەڵاكەم كردەوە، پاشان ڕۆشتم بۆ لای ئەبو ڕافیع و وتم: ئەی ئەبو ڕافیع ئەویش وەڵامی دامەوە، منیش بەرەو دەنگەكە ڕۆشتم[١] و بە شمشێرەكەم لێمدا ئەویش هاواری كرد من هاتمە دەرەوە، پاشان هاتم جارێكی تر گەڕامەوە خۆم وا نیشاندا بەهانایەوە دەچم وتم: ئەی ئەبو ڕافیع -دەنگی خۆم گۆڕی- ئەوە چیتە هاوار بۆ دایكت وتم: چیت لێ هاتووە؟ وتی: نازانم كێ هاتۆتە ژوورەوە بۆ لام بە شمشێر لێی دام، دەڵێ: شمشێرەكەم خستە سەر ورگی، پاشان بە هەموو توانام خۆم دا بەسەری شمشێرەكەمدا هەتا گەشتە ئێسك (ی پشتی)، پاشان دەرچووم شڵەژابووم نەمدەزانی چی بكەم، جا پەیژەیەكیان هەبوو هاتم پێیدا دابەزم كەوتمە خوارەوە قاچم كوترا (و ئازارم پێگەشت)، ئەوسا هاتمە دەرەوە بۆ لای هاوڕێكانم و وتم: من ئێرە بەجێ ناهێڵم هەتا گوێم لە هەواڵی مردنی نەبێت، جا نەڕۆیشتم هەتا گوێم لە هەواڵی مردنی ئەبو

---

(١) چونكە شوێنەكە تاریک بوو.

ڕافیع بوو، (دەیانوت) بازرگانی حیجاز بوو، دەڵێ: هەستام و هیچ ناتەواو عەیبێکم نەبوو، گەڕاینەوە هەتا هاتینەوە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەمان پێدا.

٣٠٢٣- حدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنهما قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَهْطًا مِنَ الأَنْصَارِ إِلَى أَبِي رَافِعٍ فَدَخَلَ عَلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَتِيكٍ بَيْتَهُ لَيْلاً، فَقَتَلَهُ وَهُوَ نَائِمٌ[1].

٣٠٢٣- بەڕائی کوڕی عازیب رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند کەسێکی ئەنصاڕی نارد بۆ (کوشتنی) ئەبو ڕافیع، ئەنجا عەبدوڵڵای کوڕی عەتیک بەشەودا چووە ژوورەوە بۆ ماڵەکەی و کوشتی لە کاتێکدا خەوتبوو.

## ١٥٦- بابٌ: لَا تَمَنَّوْا لِقَاءَ العَدُوِّ

٣٠٢٤- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ يُوسُفَ اليَرْبُوعِيُّ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ الفَزَارِيُّ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمٌ أَبُو النَّضْرِ مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ، كُنْتُ كَاتِبًا لَهُ قَالَ: كَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى حِينَ خَرَجَ إِلَى الحَرُورِيَّةِ فَقَرَأْتُهُ فَإِذَا فِيهِ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْضِ أَيَّامِهِ الَّتِي لَقِيَ فِيهَا الْعَدُوَّ انْتَظَرَ حَتَّى مَالَتِ الشَّمْسُ[2].

## ١٥٦- باسێک: ئاوات مەخوازن بە دوژمن بگەن و ڕووبەڕوویان ببنەوە

٣٠٢٤- سالیم ئەبو نەصر کە ئازادکراوی عومەری کوڕی عوبەیدوڵڵا بوو، دەڵێ: من نووسەری عومەری کوڕی عوبەیدوڵڵا بووم: کاتێک دەردەچوو بەرەو

---

(١) بڕوانە: ٣٠٢٢.

(٢) بڕوانە: ٢٨١٨.

حەرورییە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفا نامەیەكی نووسی بۆ عومەری كوڕی عوبەیدوڵڵا منیش خوێندمەوە، جا ئەمەی تێدا نووسرابوو: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژێك لەو ڕۆژانەی كە تیایدا بە دوژمن گەشت و ڕووبەڕوویان بوویەوە، چاوەڕوانی كرد تا خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا.

٣٠٢٥ - ثُمَّ قَامَ فِي النَّاسِ فَقَالَ: "أَيُّهَا النَّاسُ، لاَ تَمَنَّوْا لِقَاءَ العَدُوِّ، وَسَلُوا اللَّهَ العَافِيَةَ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ الجَنَّةَ تَحْتَ ظِلاَلِ السُّيُوفِ" ثُمَّ قَالَ: "اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ وَمُجْرِيَ السَّحَابِ وَهَازِمَ الأَحْزَابِ اهْزِمْهُمْ وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ".وَقَالَ مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ: حَدَّثَنِي سَالِمٌ أَبُو النَّضْرِ كُنْتُ كَاتِبًا لِعُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ فَأَتَاهُ كِتَابُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَمَنَّوْا لِقَاءَ العَدُوِّ»[1].

٣٠٢٥- پاشان لە ناوخەڵكەكەدا هەستایەوە و فەرمووی: ((ئەی خەڵكینە ئاواتی گەشتن بەدوژمن مەخوازن، وە داوای بێوەی و سەلامەتی لە خوا بكەن، بەڵام ئەگەر پێیان گەشتن ئەوە ئارام بگرن و بزانن كە بێگومان بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەكان دایە))، پاشان فەرمووی: ((ئەی خودای دابەزێنەری قورئان، وە هێنەری هەورەكان، وە تێكشكێنەری تاقمە بێ باوەڕەكان تێكیان بشكێنەوە و سەرمان بخە بەسەریاندا)).

مووسای كوڕی عوقبە دەڵێ: سالیم ئەبو نەصر بۆی گێڕامەوە وتی: من نووسەری عومەری كوڕی عوبەیدوڵڵا بووم، ئەنجا نامەیەكی بۆ هات لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفاوە رضي الله عنهما گێڕایەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئاواتی گەیشتن بە دوژمن مەخوازن)).

---

(١) بڕوانە: ٢٨١٨، ٢٩٣٣.

٣٠٢٦- وَقَالَ أَبُو عَامِرٍ: حَدَّثَنَا مُغِيرَةُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا».

**٣٠٢٦- ئەبو عامیر دەڵێ: موغیرەی کوڕی عەبدوڕەحمان بۆی گێڕاینەوە لە ئەبی زینادەوە لە ئەعرەجەوە لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((ئاواتی گەیشتن بە دوژمن مەخوازن، بەڵام ئەگەر پێیان گەیشتن ئەوە خۆگر بن)).**

## ١٥٧- بابٌ: الحَرْبُ خَدْعَة

٣٠٢٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ عَنْ هَمَّامٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «هَلَكَ كِسْرَى ثُمَّ لاَ يَكُونُ كِسْرَى بَعْدَهُ، وَقَيْصَرٌ لَيَهْلِكَنَّ ثُمَّ لاَ يَكُونُ قَيْصَرٌ بَعْدَهُ، وَلَتُقْسَمَنَّ كُنُوزُهَما فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[١].

## ١٥٧- باسێک: جەنگ فێڵ و خەڵەتاندنە

**٣٠٢٧- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((کیسرا مرد و لەناوچوو، پاشان لە دوای ئەو کیسرایەکی تر نابێتەوە، وە بێگومان قەیصەریش لەناو دەچێت پاشان قەیصەرێکی تر دوا ئەو نابێتەوە، وە بێگومان گەنجینە و سامانی هەردووکیان لە پێناوی خوادا دابەش دەکرێن)).**

٣٠٢٨- وَسَمَّى الحَرْبَ خَدْعَةً[٢].

**٣٠٢٨- وە (پێغەمبەر ﷺ ) جەنگی بە فێڵ وخەڵەتاندن ناوبردووە.**

---

(١) بڕوانە: ٣١٢٠، ٣٦١٨، ٦٦٣٠.

(٢) بڕوانە: ٣٠٢٩.

٣٠٢٩- حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَصْرَمَ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمَّى النَّبِيُّ ﷺ الحَرْبَ خَدْعَةً[1].

**٣٠٢٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ جەنگی بەفێڵ ناو هێناوە.**

٣٠٣٠- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الفَضْلِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرٍو، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الحَرْبُ خَدْعَةٌ».

**٣٠٣٠- جابیری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((جەنگ بریتییە لە خەڵەتاندن و فێڵ كردن)).**

## ١٥٨- بابُ الكَذِبِ فِي الحَرْبِ

٣٠٣١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لِكَعْبِ بْنِ الأَشْرَفِ، فَإِنَّهُ قَدْ آذَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ؟». قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ: أَتُحِبُّ أَنْ أَقْتُلَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ: فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّ هَذَا -يَعْنِي: النَّبِيَّ ﷺ قَدْ عَنَّانَا وَسَأَلَنَا الصَّدَقَةَ، قَالَ وَأَيْضًا وَاللَّهِ لَتَمَلُّنَّهُ قَالَ: فَإِنَّا قَدِ اتَّبَعْنَاهُ، فَنَكْرَهُ أَنْ نَدَعَهُ حَتَّى نَنْظُرَ إِلَى مَا يَصِيرُ أَمْرُهُ قَالَ: فَلَمْ يَزَلْ يُكَلِّمُهُ حَتَّى اسْتَمْكَنَ مِنْهُ فَقَتَلَهُ[2].

## ١٥٨- باسی (حوكمی) درۆكردن لە جەنگدا

**٣٠٣١- جابیری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((كێ كەعبی كوڕی ئەشرەفم لەكۆڵ دەكاتەوە[3]، چونكە بەڕاستی ئازاری خوا و**

---

(١) بڕوانە: ٣٠٢٨.

(٢) بڕوانە: ٢٥١٠.

(٣) دەیكوژێت و لەناوی دەبات.

پێغەمبەرەكەی ﷺ داوە؟)) موحەممەدی كوڕی مەسلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەز دەكەیت بیكوژم ؟ فەرمووی: ((بەڵێ))، جابیر دەڵێ: موحەممەد ڕۆشت بۆلای كەعب و پێی وت: بێگومان ئەم پیاوە (مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو) ماندووی كردووین (بەفەرمان و ڕێكاریەكانی) و داوای ماڵ بەخشین (و سەرانە)مان لێ دەكات، كەعب وتی: هەروەها لەمەولا بێزار و بێتاقەت دەبن لێی، موحەممەد وتی: جا بێگومان ئێمە شوێنی كەوتووین بۆیە پێمان ناخۆشە وازی لێ بێنین، تا بزانین كارەكەی بە كوێ دەگات و چی لێ دێت، جابیر دەڵێ: بەردەوام قسەی لەگەڵدا دەكرد تا بە باشی دەستی پێیگەشت و كوشتی.

## ١٥٩- بَابُ الفَتْكِ بِأَهْلِ الحَرْبِ

٣٠٣٢- حدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لِكَعْبِ بْنِ الأَشْرَفِ؟». فَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ: أَتُحِبُّ أَنْ أَقْتُلَهُ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ: فَأْذَنْ لِي فَأَقُولَ. قَالَ: «قَدْ فَعَلْتُ»[١].

## ١٥٩- باسی كوشتنی كافری جەنگی لەناكاودا

٣٠٣٢- جابیر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرمووی: ((كێ كەعبی كوڕی ئەشرەفم لەكۆڵ دەكاتەوە؟)) موحەممەدی كوڕی مەسلەمەش وتی: پێتخۆشە بیكوژم؟ فەرمووی: ((بەڵێ))، موحەممەد وتی: ڕێگەم بدە هەندێ قسە بكەم[٢]، فەرمووی: ((بێگومان ڕێگەم دایت)).

(١) بڕوانە: ٢٥١٠.
(٢) دەربارەی خۆم و تۆ باواش نەبێت ئەوەی دەیڵێم.

## ١٦٠- بابُ مَا يَجُوزُ مِنَ الاحْتِيَالِ وَالْحَذَرِ مَعَ مَنْ تُخْشَى مَعَرَّتُهُ

٣٠٣٣ - قَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: انْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمَعَهُ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ قِبَلَ ابْنِ صَيَّادٍ، فَحُدِّثَ بِهِ فِي نَخْلٍ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّخْلَ، طَفِقَ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، وَابْنُ صَيَّادٍ فِي قَطِيفَةٍ لَهُ فِيهَا رَمْرَمَةٌ، فَرَأَتْ أُمُّ ابْنِ صَيَّادٍ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا صَافِ، هَذَا مُحَمَّدٌ، فَوَثَبَ ابْنُ صَيَّادٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ تَرَكَتْهُ بَيَّنَ»[1].

## ١٦٠- باسی ئەوەی دروستە لە فڕو فێڵ، وریابوون لە کەسێک کە مەترسی خراپەی لێ دەکرێ

**٣٠٣٣- عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو ڕوو بەو شوێنەی ئیبنو صەیادی لێیە، ئوبەیی کوڕی کەعبیشی لەگەڵدابوو- هەواڵی پێدرابوو کە ئیبنو صەیاد لە ناو باغێکی خورما دایە- ئەنجا کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ناو باغە خورماکە، دەڕۆشت و خۆی دەدایە پاڵ بنی دار خورماکان، ئیبنو صەیادیش (ڕاکشابوو) پارچە قەیفەیەکی دابوو بەخۆیدا، لەبەرخۆیەوە دەمی دەجولاند و دەنگێکی لێوە دەهات، جا دایکی ئیبنو صەیاد پێغەمبەری خوای ﷺ بینی و وتی: صافی ئەوە موحەممەدە، ئیتر ئیبنو صەیادیش قەڵەمبازێکی داو ڕای کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر دایکی وازی لێ بهێنایە حاڵ و وەزعی بۆ ڕوون دەبووە(بۆتان))).**

(١) بڕوانە: ١٣٥٥.

## ١٦١- باب الرَّجَزِ فِي الحَرْبِ وَرَفْعِ الصَّوْتِ فِي حَفْرِ الخَنْدَقِ

فِيهِ: سَهْلٌ وَأَنَسٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[١] وَفِيهِ يَزِيدُ، عَنْ سَلَمَةَ[٢].

٣٠٣٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ الخَنْدَقِ وَهُوَ يَنْقُلُ التُّرَابَ حَتَّى وَارَى التُّرَابُ شَعَرَ صَدْرِهِ -وَكَانَ رَجُلاً كَثِيرَ الشَّعَرِ- وَهْوَ يَرْتَجِزُ بِرَجَزِ عَبْدِ اللَّهِ:

اللَّهُمَّ لَوْلاَ أَنْتَ مَا اهْتَدَيْنَا... وَلاَ تَصَدَّقْنَا وَلاَ صَلَّيْنَا

فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا... وَثَبِّتِ الأَقْدَامَ إِنْ لاَقَيْنَا

إِنَّ الأَعْدَاءَ قَدْ بَغَوْا عَلَيْنَا... إِذَا أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا

يَرْفَعُ بِهَا صَوْتَهُ[٣].

## ١٦١- باسی هۆنراوە خوێندنەوە لە كاتی جەنگدا، وە دەنگ بەرزكردنەوە بەهۆنراوە لە كاتی هەڵكەندنی خەنەقدا

**لەم باسەدا ئەو فەرموودەی سەهل و ئەنەس ﷺ هەیە كە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە[٤]. هەروەها یەزید لە سەلەمەوە فەرموودەیەكی لەم بارەوەیە گێڕاوەتەوە[٥].**

**٣٠٣٤- بەڕا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە ڕۆژی غەزای خەندەقدا خۆڵی دەگوێزایەوە ئەوەندە تۆزاوی بوو بوو تۆزەكە مووەكانی سەرسنگی داپۆشیبوو. - پێغەمبەر ﷺ كەسێكی موو زۆر بوو- هۆنراوەكەی عەبدوڵڵای دەخوێندەوە:**

---

(١) بڕوانە: ٢٨٣٤، ٣٧٩٧.

(٢) بڕوانە: ٤١٩٦.

(٣) بڕوانە: ٢٨٣٦.

(٤) فەرموودەی سەهل بە ژمارە (٣٧٩٧) دێ، دواتر باسی دەكەین كە پێی گەیشتین، وە فەرموودەی ئەنەسیش بە (٢٨٣٤) باسمان كردووە.

(٥) لە باسی غەزای خەیبەردا دێت بەژمارە (٤١٩٦).

خودایە ئەگەر تۆ نەبوویتایە ڕێنموون نەدەبووین.... وە زەکاتمان نەدەدا و نوێژمان نەدەکرد

دەی کەوابوو ئارامی برژە بەسەرماندا و.... پێیەکانمان جێگیر بکە ئەگەر بەدوژمن گەشتین

بێگومان دوژمنان دەستدرێژیان کردۆتە سەرمان.... ئەگەر بیانەوێ بێباوەڕبین مل نادەین.

پێغەمبەریش ﷺ دەنگی بەرز دەکردەوە (بە وتنی) هۆنراوەکە.

## ١٦٢- بابُ مَنْ لا يثْبُتُ عَلَى الخَيْلِ

٣٠٣٥- حدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ نُمَيْرٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ جَرِيرٍ ﷺ قَالَ: مَا حَجَبَنِي النَّبِيُّ ﷺ مُنْذُ أَسْلَمْتُ، وَلاَ رَآنِي إِلاَّ تَبَسَّمَ فِي وَجْهِي[١].

## ١٦٢- باسی ئەو کەسەی بەسەر ئەسپەوە خۆی نەگرێت

٣٠٣٥- جەریر ﷺ دەڵێ: لەو ڕۆژەوەی مسوڵمان بووم پێغەمبەر ﷺ ڕێگری نەکردووە لێم بچمە خزمەتی، وە هەر کاتێ بینیومی لە ڕوومدا زەردەخەنەی کردووە.

٣٠٣٦- وَلَقَدْ شَكَوْتُ إِلَيْهِ: إِنِّي لاَ أَثْبُتُ عَلَى الخَيْلِ. فَضَرَبَ بِيَدِهِ فِي صَدْرِي، وَقَالَ: «اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ وَاجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا»[٢].

---

(١) بڕوانە: ٣٨٢٢، ٦٠٨١.

(٢) بڕوانە: ٣٠٢٠.

٣٠٣٦- (جەریر دەڵێ)، وە بێگومان من سكاڵای ئەوەم لاكرد كە من خۆم ناگرم بەسەر ئەسپەوە. جا بەدەستی دای بە سنگمداو فەرمووی: ((خوا ڕاگیریكە (بە سواری ئەسپەكەیەوە) بیكەرە ڕێنیشاندەرێكی ڕێنیشاندراو)).

## ١٦٣- بَابُ دَوَاءِ الجُرْحِ بِإِحْرَاقِ الحَصِيرِوَغَسْلِ المَرْأَةِ عَنْ أَبِيهَا الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ، وَحَمْلِ المَاءِ فِي التُّرْسِ

٣٠٣٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا أَبُو حَازِمٍ قَالَ: سَأَلُوا سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ ﷺ: بِأَيِّ شَيْءٍ دُووِيَ جُرْحُ النَّبِيِّ ﷺ؟ فَقَالَ: مَا بَقِيَ مِنَ النَّاسِ أَحَدٌ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، كَانَ عَلِيٌّ يَجِيءُ بِالْمَاءِ فِي تُرْسِهِ، وَكَانَتْ -يَعْنِي فَاطِمَةَ- تَغْسِلُ الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ، وَأُخِذَ حَصِيرٌ فَأُحْرِقَ، ثُمَّ حُشِيَ بِهِ جُرْحُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

## ١٦٣- باسی تیماركردنی زام بە سوتاندنی حەسیر (خۆڵەمێشەكەی بدرێ لە زامەكە)، وە ئافرەت خوێن بشوات بە ڕوخساری باوكیەوە و هێنانی ئاو لە قەڵغاندا

٣٠٣٧- ئەبو حازیم دەڵێ: پرسیاریان لە سەهلی كوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ كرد، بە چ شتێك برینەكەی پێغەمبەر ﷺ دەرمان كرا؟ سەهلیش وتی: لە ناو خەڵكدا (هاوەڵاندا) كەسێك نەماوە لە من شارەزاتر لەو بارەیەوە، عەلی لە قەڵغانەكەیدا ئاوی دەهێنا و ئافرەتەكەش - مەبەستی فاتیمە بوو- خوێنەكەی دەشۆری بە دەم و چاوی پێغەمبەرەوە ﷺ، جا (لە لایەن فاتیمەوە) پارچە حەسیرێك هێنرا و سوتێنرا، خۆڵەمێشەكەی خرایە سەر برینەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

---

(١) بڕوانە: ٢٤٣.

## ١٦٤- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ التَّنَازُعِ وَالاخْتِلَافِ فِي الحَرْبِ وَعُقُوبَةِ مَنْ عَصَى إِمَامَهُ

وَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ ﴿٤٦﴾ ﴾ الأنفال. قَالَ قَتَادَةُ الرِّيحُ: الحَرْبُ.

٣٠٣٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ مُعَاذًا وَأَبَا مُوسَى إِلَى اليَمَنِ قَالَ: «يَسِّرَا وَلاَ تُعَسِّرَا، وَبَشِّرَا وَلاَ تُنَفِّرَا، وَتَطَاوَعَا وَلاَ تَخْتَلِفَا»[1].

## ١٦٤- باسی دووبەرکی و ڕاجیاییەی ناپەسەندە لە کاتی جەنگدا، وە سزادانی ئەو کەسەی سەرپێچی پێشەواکەی کردبێت

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە جیاواز مەبن و دووبەرەکی مەکەن بەهۆیەوە بشکێن و لاوازببن و هێزتان بڕوا و نەمێنێ). قەتادە دەڵێ: (الرِّيحُ) واتە: جەنگ.**

**٣٠٣٨- سەعیدی کوڕی ئەبو بوردە لە باوکیەوە، ئەویش لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ موعاز و ئەبو مووسای نارد بۆ یەمەن و فەرمووی پێیان: ((ئاسانکاربن و گرانکارمەبن، وە مژدەدەربن تۆقێنەرمەبن، لەگەڵ یەکتر بگونجێن و جیاواز مەبن)).**

٣٠٣٩- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ البَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ رضي الله عنهما يُحَدِّثُ قَالَ: جَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى الرَّجَّالَةِ يَوْمَ أُحُدٍ -وَكَانُوا خَمْسِينَ رَجُلاً- عَبْدَ

---

(١) بڕوانە: ٢٢٦١.

اللَّهِ بْنَ جُبَيْرٍ فَقَالَ: «إِنْ رَأَيْتُمُونَا تَخْطَفُنَا الطَّيْرُ، فَلاَ تَبْرَحُوا مَكَانَكُمْ هَذَا حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ، وَإِنْ رَأَيْتُمُونَا هَزَمْنَا القَوْمَ وَأَوْطَأْنَاهُمْ فَلاَ تَبْرَحُوا حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ» فَهَزَمُوهُمْ. قَالَ: فَأَنَا وَاللَّهِ رَأَيْتُ النِّسَاءَ يَشْتَدِدْنَ قَدْ بَدَتْ خَلاَخِلُهُنَّ وَأَسْوُقُهُنَّ رَافِعَاتٍ ثِيَابَهُنَّ، فَقَالَ أَصْحَابُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جُبَيْرٍ الغَنِيمَةَ -أَيْ قَوْمِ- الغَنِيمَةَ، ظَهَرَ أَصْحَابُكُمْ فَمَا تَنْتَظِرُونَ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جُبَيْرٍ أَنَسِيتُمْ مَا قَالَ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالُوا: وَاللَّهِ لَنَأْتِيَنَّ النَّاسَ فَلَنُصِيبَنَّ مِنَ الغَنِيمَةِ. فَلَمَّا أَتَوْهُمْ صُرِفَتْ وُجُوهُهُمْ فَأَقْبَلُوا مُنْهَزِمِينَ، فَذَاكَ إِذْ يَدْعُوهُمُ الرَّسُولُ فِي أُخْرَاهُمْ، فَلَمْ يَبْقَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ غَيْرُ اثْنَيْ عَشَرَ رَجُلاً، فَأَصَابُوا مِنَّا سَبْعِينَ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ أَصَابَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ يَوْمَ بَدْرٍ أَرْبَعِينَ وَمِائَةً: سَبْعِينَ أَسِيرًا، وَسَبْعِينَ قَتِيلاً، فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: أَفِي القَوْمِ مُحَمَّدٌ؟ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَنَهَاهُمُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُجِيبُوهُ، ثُمَّ قَالَ: أَفِي الْقَوْمِ ابْنُ أَبِي قُحَافَةَ؟ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قَالَ: أَفِي الْقَوْمِ ابْنُ الْخَطَّابِ؟ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: أَمَّا هَؤُلاَءِ فَقَدْ قُتِلُوا. فَمَا مَلَكَ عُمَرُ نَفْسَهُ فَقَالَ: كَذَبْتَ وَاللَّهِ يَا عَدُوَّ اللَّهِ، إِنَّ الَّذِينَ عَدَدْتَ لأَحْيَاءٌ كُلُّهُمْ، وَقَدْ بَقِيَ لَكَ مَا يَسُوءُكَ. قَالَ: يَوْمٌ بِيَوْمِ بَدْرٍ، وَالْحَرْبُ سِجَالٌ، إِنَّكُمْ سَتَجِدُونَ فِي القَوْمِ مُثْلَةً لَمْ آمُرْ بِهَا، وَلَمْ تَسُؤْنِي، ثُمَّ أَخَذَ يَرْتَجِزُ: أُعْلُ هُبَلْ، أُعْلُ هُبَلْ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَلاَ تُجِيبُوا لَهُ؟». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا نَقُولُ؟ قَالَ «قُولُوا: اللهُ أَعْلَى وَأَجَلُّ». قَالَ: إِنَّ لَنَا الْعُزَّى، وَلاَ عُزَّى لَكُمْ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَلاَ تُجِيبُوا لَهُ». قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا نَقُولُ؟ قَالَ: «قُولُوا: اللهُ مَوْلاَنَا وَلاَ مَوْلَى لَكُمْ»[(١)].

**٣٠٣٩- بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە ڕۆژی غەزای ئوحودا پێغەمبەر ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری ﷺ کرد بەلێپرسراوی پیادەکان کە پەنجا کەس (ی تیرهاوێژ) بوون و پێی فەرموون: ((ئەگەر ئێمەتان بینی باڵندە دەمانفڕێنێت[(٢)]، ئێوە ئەم شوێنەی خۆتان بەجێمەهێڵن هەتا دەنێرم بە**

---

(١) بڕوانە: ٣٩٨٦، ٤٠٤٣، ٤٠٦٧، ٤٥٦١.

(٢) واتە: کوژراین لەو ناوەدا لاشەکانمان کەوتبوو قەل و داڵ گۆشتەکەمانی دەخوارد و دەیفڕاند.

شوێنتاندا، وە ئەگەر بینیتان ئێمە دوژمنمان تێکشکاند و بەسەر لاشەکانیاندا ڕۆشتین، شوێنی خۆتان بەجێمەهێڵن هەتا خۆم دەنێرم بە شوێنتاندا))، ئەنجا دوژمنیان شکاند. (بەڕا) دەڵێ: جا سوێند بە خوا من بەچاوی خۆم ئافرەتان (ی قوڕەیش)م دەبینی زۆر بەخێرایی ڕایان دەکرد پاوانە و قاچیان بەدەرەوە بوو، پۆشاکەکانیان هەڵکردبوو. هاوڕێکانی عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر، وتیان: ئەی خەڵکینە (ڕۆژی) دەستکەوتە (ڕۆژی) دەستکەوتە، هاوڕێکانتان سەرکەوتن دەی ئێوە چاوەڕوانی چی دەکەن؟ عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیریش وتی: لەیادتان چوو پێغەمبەری خوا ﷺ چی فەرموو پێتان؟ وتیان: بە خوا دەڕۆین بۆ ناو خەڵکەکە و جا بێگومان لەو دەستکەوتە بەشی خۆمان دەبەین، جا کە چوون بۆ ناو خەڵکەکە بەرودوا ڕوویان وەرچەرخێنرا و بەشکاوی گەڕانەوە، جا ئەوە ئەو کاتە بوو پێغەمبەر ﷺ لە کۆتایی لەشکرەکەیانەوە بانگی دەکردن، کە تەنها دوانزە کەس لە خزمەتیدا مابوون، وە دوژمن حەفتا کەسیان لێمان شەهید کرد، وە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لە جەنگی ڕۆژی بەدردا سەد و چلیان لە بتپەرستان کوشت و دیل کرد، حەفتایان دیل بوون و حەفتاشیان کوژران، جا ئەبو سوفیان وتی: موحەممەدتتان لەناو دایە؟ سێ جار دووبارەی کردەوە، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نەدان وەڵامی بدەنەوە، پاشان وتی: ئیبنو ئەبی قوحافە لەناوتان دایە؟ سێ جار ئەم وتەی دووبارە کردەوە، پاشان وتی: ئیبنو خەتتابنتان لەناو دایە؟ سێ جار ئەم وتەی دووبارە کردەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ لای هاوڕێکانی و وتی: وادیارە ئەوانە کوژراون، عومەر خۆی بۆ نەگیرا وتی: سوێند بەخوا ئەی دوژمنی خوا درۆت کرد، دڵنیابە ئەوانەی تۆ ناویانت هێنا هەموویان زیندوون، بەڕاستی ئەوەی تۆخەفەتبار و دلگران بکات ماوە، (ئەبو سوفیان) وتی: ئەمڕۆ لەبەرانبەر ڕۆژی بەدر دایە جەنگیش بەنۆرەیە، بێگومان ئێوە لە ناو کوژراوەکاندا لوت و گوێ بڕین و شێواندن دەبینن، من فەرمانم بەو

کاره نەداوه و پێشم ناخۆش نییه (کە کراوه)، پاشان دەستی کرد بەهۆنراوه خوێندنەوه: بابڵندبێت هوبەل بابڵندبێت هوبەل، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وەڵامی نادەنەوه؟)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بڵێین چی؟ فەرمووی: ((خوا بڵندتر و گەورەتره))، ئەبو سوفیان وتی: ئێمە عوززامان هەیە و ئێوه عوززاتان نییە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوه وەڵامی نادەنەوه؟)) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا بڵێین چی؟ فەرمووی: ((خوای گەوره پشتیوانی ئێمەیە ئێوه پشتیوانتان نییه)).

## ١٦٥- بابٌ: إِذَا فَزِعُوا بِاللَّيْلِ

٣٠٤٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَحْسَنَ النَّاسِ، وَأَجْوَدَ النَّاسِ، وَأَشْجَعَ النَّاسِ، قَالَ وَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ لَيْلَةً سَمِعُوا صَوْتًا، قَالَ: فَتَلَقَّاهُمُ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى فَرَسٍ لأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ، وَهُوَ مُتَقَلِّدٌ سَيْفَهُ فَقَالَ: «لَمْ تُرَاعُوا، لَمْ تُرَاعُوا». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَجَدْتُهُ بَحْرًا». يَعْنِي الْفَرَسَ[1].

## ١٦٥- باسێک: ئەگەر لە شەودا خەڵکی ترسان

٣٠٤٠- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ جوانترین کەس بوو، وەبەخشندەترین کەس بوو، وه ئازاترین کەس بوو، شەوێك خەڵکی مەدینە دەنگێکیان بیستوو ترسان، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ ڕووبەڕوویان هات و پێیان گەشت[2]، لەو کاتەدا بە سواری ئەسپێکی ئەبو تەلحەوه بوو بەپشتی ڕووتی و شمشێرەکەشی کردبوویە ملی و فەرمووی: ((مەترسن، مەترسن)) پاشان فەرمووی: وەك دەریا بوو بەلامەوه ((لە خێراییدا)) مەبەستی ئەسپەکە بوو.

---

(١) بڕوانە: ٢٦٢٧.

(٢) لە ڕۆیشتن بۆ جێگای مەترسییەکە پێش ئەوان کەوتبوو بۆ هەواڵ زانینی لە دەوروبەری مەدینە.

## ١٦٦- بابُ مَن رَأى العَدُوَّ فَنادى بأعْلى صَوْته: يَا صَبَاحَاهْ. حَتَّى يُسْمِعَ النَّاسَ

٣٠٤١- حَدَّثَنَا المَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ سَلَمَةَ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ قَالَ: خَرَجْتُ مِنَ المَدِينَةِ ذَاهِبًا نَحْوَ الْغَابَةِ، حَتَّى إِذَا كُنْتُ بِثَنِيَّةِ الْغَابَةِ لَقِيَنِي غُلَامٌ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قُلْتُ: وَيْحَكَ!، مَا بِكَ؟ قَالَ: أُخِذَتْ لِقَاحُ النَّبِيِّ ﷺ. قُلْتُ: مَنْ أَخَذَهَا؟ قَالَ: غَطَفَانُ وَفَزَارَةُ. فَصَرَخْتُ ثَلَاثَ صَرَخَاتٍ أَسْمَعْتُ مَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا: يَا صَبَاحَاهْ، يَا صَبَاحَاهْ. ثُمَّ انْدَفَعْتُ حَتَّى أَلْقَاهُمْ، وَقَدْ أَخَذُوهَا، فَجَعَلْتُ أَرْمِيهِمْ وَأَقُولُ:

أَنَا ابْنُ الأَكْوَعِ... وَالْيَوْمُ يَوْمُ الرُّضَّعِ

فَاسْتَنْقَذْتُهَا مِنْهُمْ قَبْلَ أَنْ يَشْرَبُوا، فَأَقْبَلْتُ بِهَا أَسُوقُهَا، فَلَقِيَنِي النَّبِيُّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ القَوْمَ عِطَاشٌ، وَإِنِّي أَعْجَلْتُهُمْ أَنْ يَشْرَبُوا سِقْيَهُمْ، فَابْعَثْ فِي إِثْرِهِمْ، فَقَالَ: «يَا ابْنَ الأَكْوَعِ، مَلَكْتَ فَأَسْجِحْ. إِنَّ القَوْمَ يُقْرَوْنَ فِي قَوْمِهِمْ»[1].

## ١٦٦- باسی کەسێ دوژمن ببینێ هەتا لە توانای دایە بەدەنگی بەرز هاواربکات فریام کەون زوو، هەتا خەڵک گوێیان لێ بێ

**٣٠٤١- یەزیدی کوڕی ئەبو عوبەید دەگێڕێتەوە لە سەلەمەوە کە بۆی گێڕاپەوە و وتی: لە مەدینە دەرچووم بەرەو غابە دەڕۆیشتم، هەتا گەیشتمە ملەی غابە غوڵامێکی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفم پێ گەشت (پەشۆکابوو). وتم: هاوار بۆ تۆ چیتە؟ وتی: وشترە شیراکانی[2] پێغەمبەر ﷺ دزران و بران، وتم کێ بردنی؟ وتی: (چەتەی هۆزی) غەتەفان و فەزارە، منیش سێ جار بەدەنگی بەرز هاوارم کرد فریاکەون فریاکەون، لەم سەری مەدینە بۆ ئەو سەری مەدینەم ئاگاردار کرد و دام بە گوێیاندا، پاشان تێم تەقان زۆر بەخێرایی (دوایان کەوتم) هەتا بگەم پێیاندا کە بێگومان وشترەکانیان بردبوو، منیش دەستم کرد بەتیر**

(١) بڕوانە: ٤١٩٤.

(٢) شیراکان: کۆی شیرایە واتە ئاژەڵێک شیری هەبێت کە لە باسەکەدا مەبەست پێی ئەو وشترانە بوو شیریان هەبوو.

تێگرتنیان و لەگەڵیدا دەموت: من سەلەمی كوڕی ئەكوەع ئەمڕۆ ڕۆژی تیاچوونی نامەردە، ئیتر وشترەكانم ڕزگاركرد لە دەستیان پێش ئەوەی ئاو بخۆنەوە، ئەنجا بەرەو مەدینە لێم خوڕین و گەڕامەوە، جا پێغەمبەر ﷺ بە من گەیشت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو چەتانە زۆر تینوون من نەمهێشت ئاوەكەیان بخۆنەوە، بۆیە هێزێك بنێرە بەدوایاندا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی كوڕی ئەكوەع زاڵ بوویت بەسەریاندا لێبوردنت هەبێ، بێگومان ئەوان ئێستا لەناو هۆزی خۆیاندا میوانداری دەكرێن )).

## ١٦٧- بابُ مَنْ قالَ: خُذْهَا، وَأَنَا ابن فُلَانٍ

وَقَالَ سَلَمَةُ: خُذْهَا، وَأَنَا ابن الأَكْوَعِ[١].

٣٠٤٢- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ البَرَاءَ ﷺ فَقَالَ: يَا أَبَا عُمَارَةَ، أَوَلَّيْتُمْ يَوْمَ حُنَيْنٍ؟ قَالَ الْبَرَاءُ وَأَنَا أَسْمَعُ: أَمَّا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَمْ يُوَلِّ يَوْمَئِذٍ، كَانَ أَبُو سُفْيَانَ بْنُ الحَارِثِ آخِذًا بِعِنَانِ بَغْلَتِهِ، فَلَمَّا غَشِيَهُ الْمُشْرِكُونَ نَزَلَ، فَجَعَلَ يَقُولُ:

"أَنَا النَّبِيُّ لاَ كَذِبْ... أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ"

قَالَ فَمَا رُئِيَ مِنَ النَّاسِ يَوْمَئِذٍ أَشَدُّ مِنْهُ[٢].

## ١٦٧- باسی ئەو كەسەی وتی: ئەو تیرە بگرە[٣] و من كوڕی فڵانە كەسم

سەلەمە وتی: ئەو تیرە بگرە و من كوڕی ئەكوەعم.

(١) بڕوانە: ٣٠٤١.

(٢) بڕوانە: ٢٨٦٤.

(٣) ئەو تیرەی بۆم هاویشتی.

٣٠٤٢- ئەبو ئیسحاق دەڵێ: پیاوێك پرسیاری له بەڕا كرد ﷺ و وتی: ئەی ئەبو عوماره له ڕۆژی غەزای حونەیندا ئێوه هەڵهاتن؟ منیش گوێم لێ بوو بەڕا وتی: بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕۆژەدا هەڵنەهات، ئەبو سوفیانی كوڕی حاریس هەوساری[1] ئێستره ماچەكەی گرتبوو، جا كاتێ بتپەرستان دابارین بەسەریدا و دەوریاندا له ئێسترەكەی دابەزی دەستی كرد بە وتنی: ((من پێغەمبەرم (بەڕاستی) درۆ نییە من كوڕەزای عەبدولموتتەلیبم))، بەڕا وتی: جا لەو ڕۆژەدا لەو حاڵەتە سەخت تر نەبینراوە كە بەسەر ئەو خەڵكەدا هات.

## ١٦٨- بَابٌ: إِذَا نَزَلَ العَدُوُّ عَلَى حُكْمِ رَجُلٍ

٣٠٤٣- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ -هُوَ ابْنُ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ بَنُو قُرَيْظَةَ عَلَى حُكْمِ سَعْدٍ -هُوَ ابْنُ مُعَاذٍ- بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَ قَرِيبًا مِنْهُ، فَجَاءَ عَلَى حِمَارٍ، فَلَمَّا دَنَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ». فَجَاءَ فَجَلَسَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ لَهُ: «إِنَّ هَؤُلَاءِ نَزَلُوا عَلَى حُكْمِكَ». قَالَ: فَإِنِّي أَحْكُمُ أَنْ تُقْتَلَ المُقَاتِلَةُ، وَأَنْ تُسْبَى الذُّرِّيَّةُ. قَالَ: «لَقَدْ حَكَمْتَ فِيهِمْ بِحُكْمِ المَلِكِ»[2].

## ١٦٨- باسێک: ئەگەر دوژمنەكان بەبڕیاری پیاوێک (لە مسوڵمانان) ڕازیبوون

٣٠٤٣- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ كاتێ بەنو قورەیزە بەبڕیاری سەعد- كە ئەو كوڕی موعازە- ﷺ ڕازی بوون پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوایدا-

(١) هەوسار بۆ هێستر بەكاردێت، ڕەشۆ و جڵە و بۆ ئەسپ و ماین بەكاردێت.
(٢) بڕوانە: ٣٨٠٤، ٤١٢١، ٦٢٦٢.

سەعد شوێنەکەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ نزیك بوو[١] - ئینجا بەسواری گوێدرێژێك هات، جا کە نزیك بوویەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەستن بەپیری گەورەکەتانەوە))، سەعدیش هات لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت، ئەویش فەرمووی پێی: ((بێگومان ئا ئەمانە بەبڕیاری تۆ ڕازیبوون))، سەعد وتی: دەی من بڕیار دەدەم جەنگەرەکانیان بکوژرێن و ژن و منداڵەکانیشیان بکرێن بە کۆیلە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی بەبڕیاری خوا بڕیارت دەربارەیان دا)).

## ١٦٩- بابُ قَتْلِ الأَسِيرِ وَقَتْلِ الصَّبْرِ

٣٠٤٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَامَ الْفَتْحِ وَعَلَى رَأْسِهِ المِغْفَرُ، فَلَمَّا نَزَعَهُ جَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ إِنَّ ابْنَ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الكَعْبَةِ، فَقَالَ: «اقْتُلُوهُ»[٢].

## ١٦٩- باسی (حوکمی) کوشتنی دیل، وە کوشتن بەدەست و قاچ بەستراوی

٣٠٤٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ساڵی ئازادکردنی مەککە ڕۆشتە ناو شاری مەککە کڵاوی ئاسنی لە سەردا بوو، جا کە لە سەری دایکەند پیاوێك هات وتی: بێگومان ئیبنو خەتەل دەستی گرتووە بەدامێنی کەعبەوە، فەرمووی: ((بیکوژن)).

---

(١) چونکە پێشتر بریندار بوو بوو.
(٢) بڕوانە: ١٨٤٦.

# ١٧٠- بابٌ: هَل يَسْتَأْسِرُ الرَّجُلُ؟ وَمَنْ لمْ يَسْتَأْسِرْ، وَمَنْ رَكَعَ رَكْعَتَيْن عِنْدَ القَتْلِ

٣٠٤٥- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ أَبِي سُفْيَانَ بْنِ أَسِيدِ بْنِ جَارِيَةَ الثَّقَفِيُّ -وَهْوَ حَلِيفٌ لِبَنِي زُهْرَةَ وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ أَبِي هُرَيْرَةَ- أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَشَرَةَ رَهْطٍ سَرِيَّةً عَيْنًا، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ عَاصِمَ بْنَ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيَّ جَدَّ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ، فَانْطَلَقُوا حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالْهَدَأَةِ وَهْوَ بَيْنَ عُسْفَانَ وَمَكَّةَ ذُكِرُوا لِحَيٍّ مِنْ هُذَيْلٍ يُقَالُ لَهُمْ: بَنُو لِحْيَانَ، فَنَفَرُوا لَهُمْ قَرِيبًا مِنْ مِائَتَيْ رَجُلٍ، كُلُّهُمْ رَامٍ، فَاقْتَصُّوا آثَارَهُمْ حَتَّى وَجَدُوا مَأْكَلَهُمْ تَمْرًا تَزَوَّدُوهُ مِنَ المَدِينَةِ فَقَالُوا: هَذَا تَمْرُ يَثْرِبَ. فَاقْتَصُّوا آثَارَهُمْ، فَلَمَّا رَآهُمْ عَاصِمٌ وَأَصْحَابُهُ لَجَئُوا إِلَى فَدْفَدٍ، وَأَحَاطَ بِهِمُ الْقَوْمُ فَقَالُوا لَهُمُ: انْزِلُوا وَأَعْطُونَا بِأَيْدِيكُمْ، وَلَكُمُ الْعَهْدُ وَالْمِيثَاقُ، وَلاَ نَقْتُلُ مِنْكُمْ أَحَدًا. قَالَ عَاصِمُ بْنُ ثَابِتٍ أَمِيرُ السَّرِيَّةِ: أَمَّا أَنَا فَوَاللهِ لاَ أَنْزِلُ اليَوْمَ فِي ذِمَّةِ كَافِرٍ، اللَّهُمَّ أَخْبِرْ عَنَّا نَبِيَّكَ. فَرَمَوْهُمْ بِالنَّبْلِ، فَقَتَلُوا عَاصِمًا فِي سَبْعَةٍ، فَنَزَلَ إِلَيْهِمْ ثَلاَثَةُ رَهْطٍ بِالْعَهْدِ وَالْمِيثَاقِ، مِنْهُمْ خُبَيْبٌ الأَنْصَارِيُّ وَابْنُ دَثِنَةَ وَرَجُلٌ آخَرُ، فَلَمَّا اسْتَمْكَنُوا مِنْهُمْ أَطْلَقُوا أَوْتَارَ قِسِيِّهِمْ فَأَوْثَقُوهُمْ فَقَالَ الرَّجُلُ الثَّالِثُ هَذَا أَوَّلُ الْغَدْرِ، وَاللهِ لاَ أَصْحَبُكُمْ، إِنَّ فِي هَؤُلاَءِ لأُسْوَةً. يُرِيدُ القَتْلَى، فَجَرَّرُوهُ وَعَالَجُوهُ عَلَى أَنْ يَصْحَبَهُمْ فَأَبَى فَقَتَلُوهُ، فَانْطَلَقُوا بِخُبَيْبٍ وَابْنِ دَثِنَةَ حَتَّى بَاعُوهُمَا بِمَكَّةَ بَعْدَ وَقْعَةِ بَدْرٍ، فَابْتَاعَ خُبَيْبًا بَنُو الحَارِثِ بْنِ عَامِرِ بْنِ نَوْفَلِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ، وَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ قَتَلَ الحَارِثَ بْنَ عَامِرٍ يَوْمَ بَدْرٍ، فَلَبِثَ خُبَيْبٌ عِنْدَهُمْ أَسِيرًا، فَأَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عِيَاضٍ أَنَّ بِنْتَ الحَارِثِ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهُمْ حِينَ اجْتَمَعُوا اسْتَعَارَ مِنْهَا مُوسَى يَسْتَحِدُّ بِهَا فَأَعَارَتْهُ، فَأَخَذَ ابْنًا لِي وَأَنَا غَافِلَةٌ حِينَ أَتَاهُ قَالَتْ فَوَجَدْتُهُ مُجْلِسَهُ عَلَى فَخِذِهِ وَالْمُوسَى بِيَدِهِ، فَفَزِعْتُ فَزْعَةً عَرَفَهَا خُبَيْبٌ فِي وَجْهِي فَقَالَ تَخْشَيْنَ أَنْ أَقْتُلَهُ؟ مَا كُنْتُ لأَفْعَلَ ذَلِكَ. وَاللهِ مَا رَأَيْتُ أَسِيرًا قَطُّ خَيْرًا مِنْ خُبَيْبٍ، وَاللهِ لَقَدْ وَجَدْتُهُ يَوْمًا يَأْكُلُ مِنْ قِطْفِ عِنَبٍ فِي يَدِهِ، وَإِنَّهُ لَمُوثَقٌ فِي الحَدِيدِ، وَمَا بِمَكَّةَ مِنْ ثَمَرٍ. وَكَانَتْ تَقُولُ: إِنَّهُ لَرِزْقٌ مِنَ اللهِ رَزَقَهُ خُبَيْبًا، فَلَمَّا خَرَجُوا مِنَ الحَرَمِ لِيَقْتُلُوهُ فِي الحِلِّ، قَالَ لَهُمْ خُبَيْبٌ: ذَرُونِي أَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ. فَتَرَكُوهُ، فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ قَالَ: لَوْلاَ أَنْ تَظُنُّوا أَنَّ مَا بِي جَزَعٌ لَطَوَّلْتُهَا اللَّهُمَّ أَحْصِهِمْ عَدَدًا،

وَلَسْتُ أُبَالِي حِينَ أُقْتَلُ مُسْلِمًا... عَلَى أَيِّ شِقٍّ كَانَ لِلَّهِ مَصْرَعِي

وَذَلِكَ فِي ذَاتِ الإِلَهِ وَإِنْ يَشَأْ... يُبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ

فَقَتَلَهُ ابْنُ الحَارِثِ، فَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ سَنَّ الرَّكْعَتَيْنِ لِكُلِّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ قُتِلَ صَبْرًا، فَاسْتَجَابَ اللهُ لِعَاصِمِ بْنِ ثَابِتٍ يَوْمَ أُصِيبَ، فَأَخْبَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَصْحَابَهُ خَبَرَهُمْ وَمَا أُصِيبُوا، وَبَعَثَ نَاسٌ مِنْ كُفَّارِ قُرَيْشٍ إِلَى عَاصِمٍ حِينَ حُدِّثُوا أَنَّهُ قُتِلَ لِيُؤْتَوْا بِشَيْءٍ مِنْهُ يُعْرَفُ، وَكَانَ قَدْ قَتَلَ رَجُلاً مِنْ عُظَمَائِهِمْ يَوْمَ بَدْرٍ، فَبُعِثَ عَلَى عَاصِمٍ مِثْلُ الظُّلَّةِ مِنَ الدَّبْرِ، فَحَمَتْهُ مِنْ رَسُولِهِمْ، فَلَمْ يَقْدِرُوا عَلَى أَنْ يَقْطَعَ مِنْ لَحْمِهِ شَيْئًا[١].

## ١٧٠- باسێک: ئایا مسوڵمان خۆی ڕادەستی دوژمن کات دیل کرێت ؟وە (حوکمی) کەسێک ڕازی نەبێ دیل کرێت، وە ئەو کەسەی لە کاتی کوشتنیدا دوو ڕکات نوێژ بکات

**٣٠٤٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دە چەکداری نارد بۆ سوسەکردن و زانینی هەواڵی دوژمن، عاصیمی کوڕی سابیتی ئەنصاڕیی کردە سەرکردەیان- کە باپیرەی عاصیمی کوڕی عومەرە- ئەنجا (لە مەدینە) دەرچوون هەتا گەیشتە هەدئەت- کە جێگایەکە لە نێوان عوسفان و مەککەدا- هەواڵی ئەم چەکدارانە درابوو بە تیرەیەك لە هۆزی هوزەیل کە پێیان دەوترا بەنو لیحیان، نزیکە دوو سەد پیاوی ئەو تیرەیە کە هەموویان تێرهاوێژ بوون دەرچوون بۆیان، جا شوێن پێیان هەلگرتن هەتا (لە جێگایەکدا) ناوکی ئەو خورمایەی خواردبوویان دۆزیانەوە کە لە مەدینە هێنابوویان لەگەڵ خۆیان، وتیان ئەم ناوکە هی خورمای مەدینەیە، ئیتر شوێن پێیان هەلگرتن (نزیکیان بوونەوە)، جا کە عاصیم و هاوڕێکارنی ئەوانیان بینی پەنایان بردە تەپۆڵکە و بەرزاییەك، کافرەکانیش چواردەوریان دان و پێیان وتن وەرنەخوارەوە و خۆتان بدەن**

---

(١) بڕوانە: ٣٩٨٩، ٤٠٨٦، ٧٤٠٢.

بەدەستەوە، وادە و پەیمانتان دەدەینێ کەستان نەکوژین، عاصیمی کوڕی سابیت کە لێپرسراوی چەکدارەکان بوو وتی: من بەش بەحاڵی خۆم سوێند بەخوا من ئەمڕۆ بەوادە و پەیمانی کافر باوەڕ ناکەم، خوایە هەواڵمان بدە بە پێغەمبەرەکەت، ئیتر تیربارانیان کردن، جا بەعاصیمەوە حەوت کەسیان لێ کوشتن، پاشان سێ کەسیان بەوادە و پەیمانی کافران هاتنە خوارەوە خۆیان دا بەدەستەوە، کە خوبەیبی ئەنصاڕی و ئیبنو دەسینە و پیاوێکی تر بوون، جا کە چنگیان لێیان گیر بوو (و کەوتنە ژێر دەستیان) ژێی کەوانەکانیان کردنەوە و توند بەژێکان بەستیانەوە، پیاوە سێ یەمەکە وتی: ئەمە سەرەتای ناپاکییە، سوێند بەخوا من لەگەڵتان نایەم، بێگومان ئا لەوانەدا- مەبەستی شەهیدەکان بوو- سەرمەشقی هەیە بۆ من، جا ڕایان کێشا و هەوڵیان لەگەڵدا کە لەگەڵیان بڕوات بەڵام نەڕۆشت، بۆیە کوشتیان، ئەنجا خوبەیب و ئیبنو دەسینەیان برد هەتا لە مەککە فرۆشتنیان، ئەمە دوا جەنگی بەدر بوو، ئەنجا کوڕانی حاریسی کوڕی عامیری کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبدولەناف خوبەیبیان کڕی، چونکە خوبەیب لە جەنگی بەدردا حاریسی کوڕی عامیری کوشت بوو، ئیتر خوبەیب بەدیلی لایان مایەوە (زوهری) دەڵێ: عوبەیدوڵڵای کوڕی عیاز بۆی گێڕاومەوە: کە کچی حاریس بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەوان کۆبوونەوە و بڕیاریاندا (بیکوژن)، (خوبەیب) داوای موسێکی لەو کچە کردووە مووی بەری پێ بتاشێت ئەویش پێی داوە: جا خوبەیب کوڕێکی منی گرتبوو لە کاتێکدا من لێی بێ ئاگابووم، کوڕەکە ڕۆشتبوویە لای خوبەیب، ئەو ئافرەتە دەڵێ: دیم کوڕەکەمی لەسەر ڕانی دانیشاندووە و مووسەکەیشی بەدەستەوەیە، بۆیە ترسێکی زۆرم لێ نیشت، خوبەیب لە ڕووخسارمدا هەستی پێکرد و زانی، وتی: دەترسی بیکوژم؟ من کاری وا ناکەم، (ئەو کچە دەڵێ:) سوێند بەخوا هیچ دیلێکم نەدیووە لە خوبەیب چاکتربێت، سوێند بەخوا ڕۆژێکیان بینیم بۆشێکی ترێی بەدەستەوە

بوو لێی دەخوارد، کۆت و زنجیریش کرابوو لەو کاتەشدا هیچ میوەیەك لە مەککەدا نەبوو. وە ئەو کچە دەیوت: بێگومان ئەو ترێ یە ڕۆزییەك بوو لە لایەن خواوە بە خوبەیبی دابوو، جا کاتێ لە حەرەم بردیانە دەرەوە تا لە دەرەوەی حەرەم بیکوژن، خوبەیب پێی وتن: لێم گەڕێن با دوو ڕکات نوێژ بکەم. ئەوانیش لێی گەڕان و دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان وتی: لەبەر ئەوە نەبووایە وا گومان ببەن لە مردن دەترسم نوێژەکەم درێژ دەکردەوە، خوایە هەموویان لەناوبەریت تاقیان نەهێڵیت گرنگ نییە بەلامەوە کاتێ بەمسوڵمانی دەکوژرێم بەهەر لایەکمدا بکەومە زەوی، مادام مردنەکەم لە پێناو خوایە، ئەو کوشتنەش لەبەر خوایە (و پاداشتی لای ئەوە)، ئەگەر بیەوی فەڕ و بەرەکەت دەخاتە ئەندامە پارچە پارچەکراوەکانەوە.

جا کوڕێکی حاریس خوبەیبی کوشت، ئیتر خوبەیب یەکەم کەس بوو دوو ڕکات (نوێژی سوننەتی) داهێنا بۆ هەموو مسوڵمانێك کە بە کۆت و زنجیرکراوی بکوژرێت، خواش دوعاکەی عاصیمی کوڕی سابتی گیرا کرد کە لە ڕۆژی شەهید بوونیدا کردی (پێش شەهیدبوونی)، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ هەواڵەکەیانی کە چیان بەسەر هاتووە گێڕایەوە بۆ هاوەڵانی، جا کەسانێك لە کافرانی قوڕەیش کە هەواڵیان پێدرا عاصیم شەهید بوو، خەڵکانێکیان نارد تا بچن بەشێك لە لاشەکەی عاصیم بێنن بزانن ئەوە، چونکە عاصیم لە غەزای بەدردا کەسێکی زۆر گەورەیانی کوشتبوو، بەڵام (خوای گەورە) پورەیە هەنگ (یان زەردەواڵە) وەك هەور ناردبوویە سەر لاشەکەی، وە پاراستی لە نێراوەکەی قوڕەیش، بۆیە نەیانتوانی یەك پارچە گۆشت لە لاشەی بکەنەوە.

## ١٧١- بابُ فَكَاكِ الأَسِيرِ

فِيهِ عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٣٠٤٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فُكُّوا العَانِيَ -يَعْنِي الأَسِيرَ- وَأَطْعِمُوا الجَائِعَ وَعُودُوا المَرِيضَ»[١].

## ١٧١- باسی ئازادكردنی دیل

**لەم باسەدا فەرموودەی ئەبو مووسا رضي الله عنه هەیە كە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

**٣٠٤٦- ئەبو مووسا رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((دیل ئازاد بكەن [٢] و برسی تێر بكەن (خواردنی پێبدەن) و سەردانی نەخۆش بكەن)).**

٣٠٤٧- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا مُطَرِّفٌ، أَنَّ عَامِرًا حَدَّثَهُمْ، عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيٍّ رضي الله عنه: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ مِنَ الوَحْيِ إِلاَّ مَا فِي كِتَابِ اللَّهِ؟ قَالَ: وَالَّذِي فَلَقَ الْحَبَّةَ وَبَرَأَ النَّسَمَةَ مَا أَعْلَمُهُ إِلاَّ فَهْمًا يُعْطِيهِ الله رَجُلاً فِي الْقُرْآنِ، وَمَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ. قُلْتُ: وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ؟ قَالَ: العَقْلُ، وَفَكَاكُ الأَسِيرِ، وَأَنْ لاَ يُقْتَلَ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ[٣].

**٣٠٤٧- ئەبو جوحەیفە دەڵێ: بە عەلیم رضي الله عنه وت: ئایا شتێك لە نیگاتان لایە جگە لەوەی لە قورئانەكەی خوا دایە؟**

**(عەلی) وتی: سوێند بەو زاتەی تومەكانی تەقاندووە و گیانلەبەرانی دروست كردووە، هیچ نازانم جگە لە تێگەیشتنێك لە قورئان خوا دابێتی بەكەسێك،**

(١) بڕوانە: ٥١٧٤، ٥٣٧٣، ٥٦٤٩، ٧١٧٣.

(٢) لە فەرموودەكەدا دەڵێ: العانی - یعنی الأسیر: واتە: (العانی): یانی دیل، ڕاڤەكاران دەڵێن: واتە دیلی موسڵمانان بیكڕنەوە و ئازادیان بكەن. بڕوانە: إرشاد الساری: ٥٢١/٦.

(٣) بڕوانە: ١١١.

لەگەڵ ئەمەش لەم تۆمارەدا نووسراوە، وتم: ئەو تۆمارە چی تیایە؟ وتی: خوێنی کوژراو وئازادکردنی دیل و ئەوەی کە مسوڵمان لە بەرانبەر کافردا ناکوژرێتەوە.

## ١٧٢- بابُ فِدَاءِ المُشْرِكِينَ

٣٠٤٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رِجَالاً مِنَ الأَنْصَارِ اسْتَأْذَنُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ائْذَنْ فَلْنَتْرُكْ لابْنِ أُخْتِنَا عَبَّاسٍ فِدَاءَهُ. فَقَالَ: «لاَ تَدَعُونَ مِنْهَا دِرْهَمًا»[1].

## ١٧٢- باسی بریتی وەرگرتن لە بتپەرستان (ی دیل کراو)

٣٠٤٨- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە چەند پیاوێکی ئەنصاری مۆڵەتیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ خواست و وتیان مۆڵەت بدە با دەست هەڵگرین لە بریتی عەبباسی خوشکەزامان، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دەست لە یەك درهەمی هەڵناگرن))، (کاتێك بەدیل گیرا لە جەنگی بەدردا).

٣٠٤٩- وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِمَالٍ مِنَ البَحْرَيْنِ، فَجَاءَهُ العَبَّاسُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَعْطِنِي فَإِنِّي فَادَيْتُ نَفْسِي، وَفَادَيْتُ عَقِيلاً. فَقَالَ: «خُذْ». فَأَعْطَاهُ فِي ثَوْبِهِ[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٥٣٧.

(٢) بڕوانە: ٤٢١.

٣٠٤٩- ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە بەحرەینەوە ماڵ و سامانێك هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا عەبباس هاتە خزمەتی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ماڵم پێ ببەخشە چونكە بەڕاستی من بریتی خۆم داوە، وە بریتی عەقیلیشم داوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بیگرە))، بۆی كردە كراسەكەیەوە.

٣٠٥٠- حدَّثَنِي مَحْمُودٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ -وَكَانَ جَاءَ فِي أُسَارَى بَدْرٍ- قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي المَغْرِبِ بِالطُّورِ[1].

٣٠٥٠- موحەممەدی كوڕی جوبەیر لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە - كە بۆ بریتی دانی دیلەكانی بەدر هاتبوو- دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی مەغریبدا (سورەتی والطُّورِ)ی دەخوێند.

## ١٧٣- بابُ الحَرْبِيِّ إِذَا دَخَلَ دَارَ الإِسلامِ بِغَيْرِ أَمَانٍ

٣٠٥١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا أَبُو العُمَيْسِ، عَنْ إِيَاسِ بْنِ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ عَيْنٌ مِنَ المُشْرِكِينَ وَهْوَ فِي سَفَرٍ، فَجَلَسَ عِنْدَ أَصْحَابِهِ يَتَحَدَّثُ ثُمَّ انْفَتَلَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اطْلُبُوهُ وَاقْتُلُوهُ». فَقَتَلَهُ فَنَفَّلَهُ سَلَبَهُ.

## ١٧٣- باسی (حوكمی) كافری دوژمن ئەگەر بێنە ناو وڵاتی ئیسلامی یەوە بەبێ مۆڵەتی پارێزگاری كردن لە گیانی

٣٠٥١- ئیاسی كوڕی سەلەمەی كوڕی ئەكوەع لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە كە دەڵێ: جاسوسێكی بتپەرستەكان هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ - كە لە سەفەرێكدا بوو-

(١) بروانە: ٧٦٥.

جاسوسەکە لای هاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ دانیشت و قسەی دەکرد، پاشان فرسەتی گرت و ڕایکرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بیگرن و بیکوژن))، سەلەمە کوشتی پێغەمبەریش ﷺ چەك وشتەکانی دابە سەلەمە.

## ١٧٤- بابٌ: يُقَاتَلُ عَنْ أَهْلِ الذِّمَّةِ وَلَا يُسْتَرَقُّونَ

٣٠٥٢- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: وَأُوصِيهِ بِذِمَّةِ اللَّهِ وَذِمَّةِ رَسُولِهِ ﷺ أَنْ يُوفَى لَهُمْ بِعَهْدِهِمْ، وَأَنْ يُقَاتَلَ مِنْ وَرَائِهِمْ، وَلاَ يُكَلَّفُوا إِلاَّ طَاقَتَهُمْ[1].

## ١٧٤- باسێک: جەنگ دەکرێت بۆ پارێزگار ئەوانەی سەرانە دەدەن وە ناشکرێنە کۆیلە

٣٠٥٢- عەمری کوڕی مەیمون دەگێڕێتەوە لە عومەرەوە ﷺ دەڵێ: وە ئامۆژگاری (جێنشینی پاش خۆم) دەکەم کە ئاگای لە پەنای خوا و پەنای پێغەمبەرەکەی ﷺ بێت (مەبەستی ئەهلی کیتابە)، وە پابەند بێت بەو پەیمانەی لەگەڵیان کراوە (بیباتە سەر و نەیشکێنێ)، وە جەنگ بکات لە دژی ئەوانەی لە دوایانەوە (واتە بیانپارێزێ لە دوژمنەکانیان)، وە زیاد لە تواناى خۆیان داوایان لێ نەکات.

## ١٧٥- بابُ جَوَائِزِ الوَفْدِ

## ١٧٥- باسی بەخشش دان بەنوێنەران

(١) بڕوانە: ١٣٩٢.

## ١٧٦- بابٌ: هل يُسْتَشْفَعُ إلى أهل الذِّمة ؟ ومعاملتهم

٣٠٥٣- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ الأَحْوَلِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: يَوْمُ الخَمِيسِ، وَمَا يَوْمُ الخَمِيسِ ثُمَّ بَكَى حَتَّى خَضَبَ دَمْعُهُ الحَصْبَاءَ فَقَالَ اشْتَدَّ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَجَعُهُ يَوْمَ الخَمِيسِ فَقَالَ: «ائْتُونِي بِكِتَابٍ أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ أَبَدًا». فَتَنَازَعُوا وَلاَ يَنْبَغِي عِنْدَ نَبِيٍّ تَنَازُعٌ فَقَالُوا: هَجَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ. قَالَ: «دَعُونِي فَالَّذِي أَنَا فِيهِ خَيْرٌ مِمَّا تَدْعُونِي إِلَيْهِ». وَأَوْصَى عِنْدَ مَوْتِهِ بِثَلاَثٍ «أَخْرِجُوا المُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَأَجِيزُوا الوَفْدَ بِنَحْوِ مَا كُنْتُ أُجِيزُهُمْ». وَنَسِيتُ الثَّالِثَةَ.
وَقَالَ يَعْقُوبُ بْنُ مُحَمَّدٍ: سَأَلْتُ المُغِيرَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ جَزِيرَةِ العَرَبِ. فَقَالَ: مَكَّةُ وَالْمَدِينَةُ وَالْيَمَامَةُ وَالْيَمَنُ. وَقَالَ يَعْقُوبُ: وَالْعَرْجُ أَوَّلُ تِهَامَةَ[1].

## ١٧٦- باسێک: ئایا تکا دەکرێ بۆ ئەوانەی سەرانە دەدەن؟ وە مامەڵە کردن لە گەڵیاندا

**٣٠٥٣- سەعیدی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەڵێ: ڕۆژی پێنج شەممە، ئای چ ڕۆژی بوو ڕۆژی پێنج شەممە[2]، پاشان ئیبنو عەبباس زۆر گریا هەتا بەفرمێسکی وردە بەردەکانی بەردەمی تەڕکرد و وتی: لە ڕۆژی پێنج شەممە نەخۆشی و ئازارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر گران بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تێنووسێکم[3] بۆ بێنن تا نامەیەکتان بۆ بنووسم لە پاش ئەو نامەیە هەرگیز ڕێبازی ڕاست ون نەکەن))، بەڵام هاوەڵان بوویە ناکۆکیان، لە خزمەتی پێغەمبەریشدا نابێ ناکۆکی بکرێ، جا هەندێ وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ (لەبەر ئازاری**

---

(١) بڕوانە: ١١٤.
(٢) واتە ڕۆژێکی زۆر ناخۆش بوو.
(٣) دەفتەر و کاغەز.

زۆری) قسەی دەبڕسکێنێ، فەرمووی: ((کەوابوو وازم لێ بێنن، چونکە ئەوەی منی تێدام زۆر چاکترە لەوەی ئێوە لە منتان دەوێ و منی بۆ بانگ دەکەن))، جا لە کاتی وەفاتیدا سێ ئامۆژگاری کرد و فەرمووی: ((بتپەرستان لە دورگەی عەرەب دەرکەن و وەك من بە جوانی نوێنەر بەڕێ بکەن))، وە ئامۆژگاری سێیەمم لە بیرچوو.

یەعقوبی کوڕی موحەممەد دەڵێ: پرسیارم لە موغیرەی کوڕی عەبدوڕەحمان کرد دەربارەی دوورگەی عەرەب (کوێ دەکرێتەوە؟) ئەویش وتی: مەککەو مەدینە و یەمامە و یەمەن.

وە یەعقوب وتی: عەرج [1] سەرتای تیهامەیە (بەشێکە لە دوورگەی عەرەب).

## ١٧٧- بابُ التَّجَمُّلِ لِلْوُفُودِ

٣٠٥٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: وَجَدَ عُمَرُ حُلَّةَ إِسْتَبْرَقٍ تُبَاعُ فِي السُّوقِ فَأَتَى بِهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ابْتَعْ هَذِهِ الْحُلَّةَ فَتَجَمَّلْ بِهَا لِلْعِيدِ وَلِلْوُفُودِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا هَذِهِ لِبَاسُ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ، أَوْ إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ». فَلَبِثَ مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ بِجُبَّةِ دِيبَاجٍ، فَأَقْبَلَ بِهَا عُمَرُ حَتَّى أَتَى بِهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْتَ: «إِنَّمَا هَذِهِ لِبَاسُ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ أَوْ: "إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لا خَلاَقَ لَهُ". ثُمَّ أَرْسَلْتَ إِلَيَّ بِهَذِهِ! فَقَالَ: «تَبِيعُهَا، أَوْ تُصِيبُ بِهَا بَعْضَ حَاجَتِكَ»[2].

---

(١) عەرج: گوندێکە حەفتا و هەشت میل لە مەدینەوە دوورە.

(٢) بروانە: ٨٨٦.

## ١٧٧- باسی خۆ جوانکردن[1] بۆ (پێشوازی کردنی) نوێنەران

٣٠٥٤- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: عومەر پۆشاکێکی ئاوریشمی ئەستووری بینی لە بازاڕدا دەفرۆشرا، عومەریش هێنای بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم پۆشاکە بکڕە و خۆتی پێ جوان بکە بۆ جەژن و پێشوازی نوێنەرەکان، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەم (ئاوریشمە) پۆشاکی کەسێکە (پیاوێکە) کە هیچ بەشێکی نەبێت (لە ڕۆژی دواییدا) ))، یان فەرمووی: ((بێگومان کەسێك ئەم (ئاوریشمە) لەبەر دەکات کە هیچ بەشێکی نەبێت (لە ڕۆژی دواییدا)، جا ئەوەندەی خوا حەز بکات مایەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ جوبەیەکی ئاوریشمینی بۆ نارد عومەر، بەو جوبەیەوە هات هەتا هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووت: ((بێگومان ئەم (ئاوریشم)ە پۆشاکی کەسێکە کە بەشی نەبێت (لە دواڕۆژدا))))، یان فەرمووی: ((بێگومان کەسێك ئەم (ئاوریشم)ە لەبەر دەکات کە بەشی نەبێت لە دوا ڕۆژدا))، پاشان ئەم (کراسە ئاوریشمەت) ناردووە بۆ من، ئەویش فەرمووی: ((بیفرۆشە، یان هەندێ پێویستی خۆتی پێ جێبەجێ بکە)).

## ١٧٨- بابٌ: كَيفَ يُعْرَضُ الإِسْلَامُ عَلَى الصَّبِيِّ؟

٣٠٥٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عُمَرَ انْطَلَقَ فِي رَهْطٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ قِبَلَ ابْنِ صَيَّادٍ حَتَّى وَجَدُوهُ يَلْعَبُ مَعَ الغِلْمَانِ عِنْدَ أُطُمِ بَنِي مَغَالَةَ، وَقَدْ قَارَبَ يَوْمَئِذٍ ابْنُ صَيَّادٍ يَحْتَلِمُ، فَلَمْ يَشْعُرْ حَتَّى ضَرَبَ النَّبِيُّ ﷺ ظَهْرَهُ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ

(١) بە لەبەرکردنی جل و بەرگی جوان.

ﷺ: «أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟». فَنَظَرَ إِلَيْهِ ابْنُ صَيَّادٍ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ الأُمِّيِّينَ. فَقَالَ ابْنُ صَيَّادٍ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟. قَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «آمَنْتُ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ» قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَاذَا تَرَى؟». قَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: يَأْتِينِي صَادِقٌ وَكَاذِبٌ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «خُلِطَ عَلَيْكَ الأَمْرُ». قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي قَدْ خَبَأْتُ لَكَ خَبِيئًا». قَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: هُوَ الدُّخُّ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اخْسَأْ، فَلَنْ تَعْدُوَ قَدْرَكَ». قَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ائْذَنْ لِي فِيهِ أَضْرِبْ عُنُقَهُ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنْ يَكُنْهُ فَلَنْ تُسَلَّطَ عَلَيْهِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْهُ فَلاَ خَيْرَ لَكَ فِي قَتْلِهِ»[١].

## ١٧٨- باسێک: چۆن مسوڵمان بوون بۆ منداڵ پێشنیار دەکرێت؟

**٣٠٥٥- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: کە عومەر و کۆمەڵێ لە هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕۆیشتن بەرەو ئەو شوێنەی ئیبنو صەییادی[٢] لێیە، هەتا بینیان لای قەڵای بەنی مەغالە لەگەڵ منداڵاندا یاری دەکات، لەو کاتەدا ئیبنو صەییاد نزیك باڵغ بوون بوو بوویەوە، هەستی نەکرد پێمان هەتا پێغەمبەر ﷺ لە دوایەوە بەدەستی ماڵی بە پشتیدا، پاشان فەرمووی (بە ئیبنو صەییاد): ((شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خوام؟)) ئیبنو صەییادیش تەماشای پێغەمبەری ﷺ کرد و وتی: شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری نەخوێندەوارەکانی. ئەنجا ئیبنو صەییاد وتی: بە پێغەمبەر ﷺ ئەی تۆ شایەتی دەدەیت کە من پێغەمبەری خوام؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێی: ((باوەڕم هەیە بەخوا و بە پێغەمبەرانی))، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((چ جۆرە خەوێك دەبینی؟)) ئیبنو صەییاد وتی: خەوی ڕاست و خەوی درۆش دەبینم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سەرت لێ شێوێنراوە؟)) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان من شتێکم لە دڵمدا شاردۆتەوە بۆت چییە؟)) ئیبنو صەییاد وتی:**

---

(١) بروانە: ١٣٥٤.

(٢) ئیبنو صەیاد: منداڵێکی جولەکە بوو، هەندێ دەڵێن: لە هۆزی نەجارە.

(الدُّخ)ـه. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێدەنگ به تۆ له پلەی خۆت (كه فالچیەتیه) تێپەڕ ناكەیت (ئەوەی پەنهانه نایزانیت) ))، ئەنجا عومەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێم گەڕێ با بدەم له گەردنی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر (دەججال) خۆی بێت ئەوە تۆ ناتوانی بیكوژی و زاڵ ببیت بەسەریدا، وە ئەگەر ئەویش نەبێ كەڵكێك له كوشتنیدا نییه)).

٣٠٥٦ - قَالَ ابْنُ عُمَرَ: انْطَلَقَ النَّبِيُّ ﷺ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ يَأْتِيَانِ النَّخْلَ الذِي فِيهِ ابْنُ صَيَّادٍ، حَتَّى إِذَا دَخَلَ النَّخْلَ طَفِقَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، وَهْوَ يَخْتِلُ ابْنَ صَيَّادٍ أَنْ يَسْمَعَ مِنِ ابْنِ صَيَّادٍ شَيْئًا قَبْلَ أَنْ يَرَاهُ، وَابْنُ صَيَّادٍ مُضْطَجِعٌ عَلَى فِرَاشِهِ فِي قَطِيفَةٍ لَهُ فِيهَا رَمْزَةٌ، فَرَأَتْ أُمُّ ابْنِ صَيَّادٍ النَّبِيَّ ﷺ وَهْوَ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، فَقَالَتْ لاِبْنِ صَيَّادٍ: أَيْ صَافِ-وَهْوَ اسْمُهُ- فَثَارَ ابْنُ صَيَّادٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ تَرَكَتْهُ بَيَّنَ»[1].

٣٠٥٦- سالیم دەڵێ: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ئەو جاره لەگەڵ ئوبەی كوڕی كەعبی ئەنصاری دا هەردووكیان بەرەو ئەو باخه خورمایه ڕۆیشتن كه ئیبنو صەیادی لێیه[2]، ڕۆیشتن هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ چوویه ناو باخەكەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دەدایه پەنای قەدی دارخورماكان، دەیویست ئیبنو صەیاد ئاگای لێ نەبێت، شتێكی لێ ببیستێ پێش ئەوەی ئیبنو صەیاد ببینی، لەو كاتەدا ئیبنو صەیاد لەسەر ڕاخەرە قەیفەكەی ڕاكشابوو ورەوورێكی لێوە دەهات، له پڕ دایكی ئیبنو صەیاد پێغەمبەری ﷺ بینی كه خۆی دەدایه پەنای قەدی دارخورماكان وتی: به ئیبنو صەیاد: ئەی صاف- كه ناوی ئیبنو صەیاد بوو - ئەوە موحەممەدە، ئیتر ئیبنو صەیاد بێدەنگ بوو،

(١) بڕوانه: ١٣٥٥.
(٢) ئیبنو صەیاد: منداڵێكی جولەكه بوو، هەندێ دەڵێن له هۆزی نەجارە.

**پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەو (دایکی) لێی گەڕایە ڕوون دەبوویەوە)).**

٣٠٥٧- وَقَالَ سَالِمٌ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ: ثُمَّ قَامَ النَّبِيُّ ﷺ فِي النَّاسِ، فَأَثْنَى عَلَى اللهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ ذَكَرَ الدَّجَّالَ فَقَالَ: «إِنِّي أُنْذِرُكُمُوهُ، وَمَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ قَدْ أَنْذَرَهُ قَوْمَهُ، لَقَدْ أَنْذَرَهُ نُوحٌ قَوْمَهُ، وَلَكِنْ سَأَقُولُ لَكُمْ فِيهِ قَوْلاً لَمْ يَقُلْهُ نَبِيٌّ لِقَوْمِهِ، تَعْلَمُونَ أَنَّهُ أَعْوَرُ وَأَنَّ اللهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ»[1].

**٣٠٥٧- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پاشان پێغەمبەر ﷺ هەستا لە ناو خەڵکەکەدا سوپاس و ستایشی خوای کرد بەو جۆرەی شیاوی بێت، پاشان باسی دەججالی کرد و فەرمووی: ((بێگومان من لە دەججال ئاگادارتان دەکەمەوە (دەتان ترسێنم)، هەموو پێغەمبەرێك بەدڵنیاییەوە گەلەکەی ئاگادارکردۆتەوە لە دەججال، بەڕاستی نووح ﷺ گەلەکەی لێ ئاگادار کردۆتەوە، بەڵام بەڕاستی من لەبارەی دەججالەوە وتەیەکتان پێ دەڵێم هیچ پێغەمبەرێك پێش من بەگەلەکەی نەووتووە: دەزانن کە دەججال چاوێکی کوێرە (یەکڵەچاوە)[2]، بەڵام بێگومان خوا چاوێکی کوێر نییە (یەکڵەچاونیە) )).**

## ١٧٩- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ لِلْيَهُودِ: "أَسْلِمُوا تَسْلَمُوا"

قَالَهُ الْمَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ[3].

---

(١) بڕوانە: ٣٣٣٧، ٣٤٣٩، ٤٤٠٢، ٦١٧٥، ٧١٢٣، ٧١٢٧، ٧٤٠٧.

(٢) یەکڵەچاو: گیاندارێکە کە چاوێکی کوێربێ. (فەرهەنگی خاڵ: ل٦٥٩)

(٣) بڕوانە: ٣١٦٧.

## ١٧٩- باسی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بەجووەکان: ((مسوڵمان ببن پارێزراو دەبن)).

**ئەم فەرموودەیە مەقبوری دەیگێڕێتەوە لە ئەبو هورەیرەوە.** (١)

## ١٨٠- بابٌ: إِذَا أَسْلَمَ قَوْمٌ فِي دَارِ الحَرْبِ وَلَهُمْ مَالٌ وَأَرَضُونَ، فَهْيَ لَهُمْ

٣٠٥٨- حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيْنَ تَنْزِلُ غَداً -فِي حَجَّتِهِ-؟ قَالَ: «وَهَلْ تَرَكَ لَنَا عَقِيلٌ مَنْزِلاً». ثُمَّ قَالَ: نَحْنُ نَازِلُونَ غَدًا بِخَيْفِ بَنِي كِنَانَةَ الْمُحَصَّبِ، حَيْثُ قَاسَمَتْ قُرَيْشٌ عَلَى الْكُفْرِ». وَذَلِكَ أَنَّ بَنِي كِنَانَةَ حَالَفَتْ قُرَيْشًا عَلَى بَنِي هَاشِمٍ أَنْ لاَ يُبَايِعُوهُمْ وَلاَ يُئْوُوهُمْ. قَالَ الزُّهْرِيُّ وَالخَيْفُ الوَادِي(٢).

## ١٨٠- باسێک: ئەگەر کەسانێک لە وڵاتێکدا کە حوکم تێیدا ئیسلامی نییە، وە ماڵ و سامانیان لەو وڵاتەدا هەیە، ئەوە هی خۆیانە

**٣٠٥٨- لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە دەڵێ: (لە حەجکردنەکەیدا) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا سبەینێ لە کوێ دادەنیشیت- ئەمە لە حەجەکەیدابوو- ؟ فەرمووی: جا بۆ عەقیل هیچ ماڵێکی بۆ بەجێلاوین؟ پاشان فەرمووی: ((ئێمە سبەینێ لە خەیفی بەنی کینانە کە موحەصصەبیشی پێ دەڵێن کە لە پاڵیدا**

(١) لەباسی جزیەدا دێت بەژمارە (٣١٦٧).
(٢) بڕوانە: ١٥٨٨.

**قورەیش سوێندیان بۆیەکتری خوارد و پەیمانیان بەست لەسەر کوفر و بێ باوەڕی))، ئەوەش لەبەر ئەوەبوو کە بەنی کینانە هاوپەیمانی بەست بوو لەگەڵ قورەیشدا دژی بەنی هاشم کە بڕیاریاندا نەکڕین و فرۆشتنیان لەگەڵدا بکەن، پەنایان بدەن و بیان گرنەخۆ)).**

**زوهری دەڵێ: (وَالخَيْفُ) واتە: شیو و دۆڵ.**

٣٠٥٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﷺ اسْتَعْمَلَ مَوْلًى لَهُ يُدْعَى: هُنَيًّا عَلَى الْحِمَى فَقَالَ يَا هُنَيُّ، اضْمُمْ جَنَاحَكَ عَنِ الْمُسْلِمِينَ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومِ، فَإِنَّ دَعْوَةَ المَظْلُومِ مُسْتَجَابَةٌ، وَأَدْخِلْ رَبَّ الصُّرَيْمَةِ وَرَبَّ الْغُنَيْمَةِ، وَإِيَّايَ وَنَعَمَ ابْنِ عَوْفٍ، وَنَعَمَ ابْنِ عَفَّانَ، فَإِنَّهُمَا إِنْ تَهْلِكْ مَاشِيَتُهُمَا يَرْجِعَا إِلَى نَخْلٍ وَزَرْعٍ، وَإِنَّ رَبَّ الصُّرَيْمَةِ وَرَبَّ الْغُنَيْمَةِ إِنْ تَهْلِكْ مَاشِيَتُهُمَا يَأْتِنِي بِبَنِيهِ فَيَقُولُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ. أَفَتَارِكُهُمْ أَنَا لاَ أَبَا لَكَ؟ فَالْمَاءُ وَالْكَلأُ أَيْسَرُ عَلَيَّ مِنَ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ، وَايْمُ اللَّهِ، إِنَّهُمْ لَيَرَوْنَ أَنِّي قَدْ ظَلَمْتُهُمْ، إِنَّهَا لَبِلاَدُهُمْ فَقَاتَلُوا عَلَيْهَا فِي الجَاهِلِيَّةِ، وَأَسْلَمُوا عَلَيْهَا فِي الإِسْلاَمِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْلاَ الْمَالُ الذِي أَحْمِلُ عَلَيْهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا حَمَيْتُ عَلَيْهِمْ مِنْ بِلاَدِهِمْ شِبْرًا.

**٣٠٥٩- زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کۆیلە ئازادکراوێکی خۆی کە ناوی هونەیی بوو کردی بە کاربەدەستی لەوەڕگایەکی قەدەغەکراو[١]، وتی: ئەی هونەیی: دەستت بگرەوە لە ستەم لە مسوڵمانان و خۆت لە دوعای ستەم لێکراو (ی مسوڵمانان) بپارێزە، چونکە بەڕاستی دوعای ستەملێکراو گیرایە، ڕێگە بە خاوەنی وشتری کەم[٢] و مەڕی کەم[١] بدە بێنە ژوورەوە (لە لەوەڕگاکە بخۆن)، وە**

(١) لەوەڕگایەکە تایبەت بەئاژەڵ و ماڵاتی زەکات ڕێگە نادرێت خەڵکی تر ئاژەڵی تێدا بلەوەڕێنی.

(٢) ژمارەیان تا سێ وشتر بێت.

ئاگاداری ماڵاتی ئیبنو عەوف و ماڵاتی ئیبنو عەففان بە (نەیەنە لەوەڕگاکەوە) چونکە ئەمانە ئەگەر ماڵاتەکانیان بمرێت دەگەڕێنەوە بۆ باخە خورما و کوشتوکاڵەکەیان، بەڵام خاوەن ئاژەڵ و ماڵاتە کەمەکە ئەگەر ئاژەڵەکانیان بمرێت منداڵەکانی دێنێ بۆ لام و دەڵێ: ئەی پێشەوای باوەڕداران - واتە هەژارم- دەی ئایا من وازی لێ بێنم باوکت بمرێت[٢] ؟ (بۆیە ڕێگەیان دەدەم) چونکە ئاو و پوش و لەوەڕ (بەخشینی) ئاسانترە بۆ من لە ئاڵتون و زیو، سوێند بەخوا بەدڵنیاییەوە وا دەزانن من ستەمم لێکردوون، بێگومان ئەم زەویە وڵاتی خۆیانە، لە سەردەمی نەفامیدا لە پێناویدا جەنگاون، وە لە سەردەمی ئیسلامیشدا لەسەر ئەم زەویە مسوڵمان بوون، وە سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر لەبەر ئەو ماڵ و سامانە نەبووایە وڵاخ (بکرم) خەڵکی سواری بیێ بۆ جیهاد لە ڕێی خوادا، یەك بستم لەم وڵاتەیان قەدەغە نەدەکرد.

## ١٨١- بابُ كِتَابَةِ الإِمَامِ النَّاسَ

٣٠٦٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اكْتُبُوا لِي مَنْ تَلَفَّظَ بِالإِسْلاَمِ مِنَ النَّاسِ». فَكَتَبْنَا لَهُ أَلْفًا وَخَمْسَمِائَةِ رَجُلٍ، فَقُلْنَا: نَخَافُ وَنَحْنُ أَلْفٌ وَخَمْسُمِائَةٍ؟! فَلَقَدْ رَأَيْتُنَا ابْتُلِينَا حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ لَيُصَلِّي وَحْدَهُ وَهْوَ خَائِفٌ.

٣٠٦٠م- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ: فَوَجَدْنَاهُمْ خَمْسَمِائَةٍ. قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: مَا بَيْنَ سِتِّمِائَةٍ إِلَى سَبْعِمِائَةٍ.

---

(١) ژمارەیان تا سێ ئاژەڵ بێت.

(٢) ئەمە دوعا لێکردنە و لە ناو عەرەبەکاندا بۆ کاتێ لۆمەکردن بەکاردێت.

## ١٨١- باسی ناونووسینی خەڵک لەلایەن پێشەواوە

٣٠٦٠- حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ناوی ئەوانەم بۆ بنووسن كە مسوڵمان بوون))، ئێمەش ناوی هەزار وپێنج سەد پیاومان بۆ نووسی جا (لە ناو خۆماندا) دەمان وت: ئیتر لە دوژمن بترسین كە ئێمە هەزار و پێنج سەد كەسین؟ بەڵام بەڕاستی خۆمان بینی تاقی كراینەوە، تەنانەت پیاو بەتەنهاش نوێژی بكردایە دەترسا (پێی بزانرێ تووشی زەحمەت ببێ).

٣٠٦٠م- هەمان فەرموودە ئەبو حەمزە لە ئەعمەشەوە دەیگێڕێتەوە و دەڵێ: جا دیمان پێنج سەد بوو.

ئەبو موعاویەش دەڵێ: لە نێوان شەش سەد بۆ حەوت سەد دەبوو.

٣٠٦١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي مَعْبَدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي كُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا، وَامْرَأَتِي حَاجَّةٌ. قَالَ: «ارْجِعْ فَحُجَّ مَعَ امْرَأَتِكَ»[1].

٣٠٦١- ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ناوم نووسراوە بۆ ئەو غەزایە و هاوسەرەكەشم دەیەوێ بڕوات بۆ حەج، فەرمووی: ((بگەڕێرەوە لەگەڵ هاوسەرەكەت حەج بكە)).

## ١٨٢- بابٌ: إِنَّ اللهَ يُؤَيِّدُ الدِّينَ بِالرَّجُلِ الفَاجِرِ

٣٠٦٢- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ ح. وَحَدَّثَنِي مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ ابْنِ المُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ:

---

(١) بڕوانە: ١٨٦٢.

شَهِدْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ خَيبَر فَقَالَ لِرَجُلٍ مِمَّنْ يَدَّعِي الإِسْلاَمَ: «هَذَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ». فَلَمَّا حَضَرَ القِتَالُ قَاتَلَ الرَّجُلُ قِتَالاً شَدِيدًا، فَأَصَابَتْهُ جِرَاحَةٌ فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الذِي قُلْتَ إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَإِنَّهُ قَدْ قَاتَلَ الْيَوْمَ قِتَالاً شَدِيدًا وَقَدْ مَاتَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِلَى النَّارِ». قَالَ: فَكَادَ بَعْضُ النَّاسِ أَنْ يَرْتَابَ، فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ إِذْ قِيلَ إِنَّهُ لَمْ يَمُتْ، وَلَكِنَّ بِهِ جِرَاحًا شَدِيدًا. فَلَمَّا كَانَ مِنَ اللَّيْلِ لَمْ يَصْبِرْ عَلَى الجِرَاحِ، فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَأُخْبِرَ النَّبِيُّ ﷺ بِذَلِكَ فَقَالَ: «اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنِّي عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ». ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَنَادَى بِالنَّاسِ «إِنَّهُ لاَ يدخلُ الجَنَّةَ إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَإِنَّ اللَّهَ لَيُؤَيِّدُ هَذَا الدِّينَ بِالرَّجُلِ الْفَاجِرِ»[1].

## ١٨٢- باسێک: بێگومان خوا پشتیوانی لە ئایینی ئیسلام دەکات بەپیاوێکی خراپ

**٣٠٦٢- ئەبو هورەیرە[2] ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادەی (غەزای) خەیبەر بووین، فەرمووی بە پیاوێك لەوانەی وای نیشان دەدا کە مسوڵمانە: ((ئەو پیاوە کەسێکی دۆزەخی یە)) جا کە جەنگ دەستی پێکرد، پیاوەکە جەنگێکی زۆر سەختی کرد، ئینجا پێکرا و بریندار بوو، جا وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کەسەی تۆ فەرمووت: بێگومان دۆزەخیە، جا بەڕاستی پیاوە کە ئەمڕۆ جەنگا بە جەنگانێکی زۆر سەخت و بەهێز و مرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((چوو بۆ دۆزەخ)) (ئەبو هورەیرە یان کەسێکی تر) وتی: جا نزیك بوو هەندێ کەس گومان پەیدا کەن (لە ڕاستی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ)، جا لەکاتێکدا لەو حاڵەدا بوون وترا: ئەو پیاوە نەمردووە، بەڵکو بە برینێکی سەخت بریندار بوو، جا کە شەو هات بەرگەی ئازاری برینەکەی نەگرت و خۆی کوشت، ئەوسا ئەو هەواڵە درا بە پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: ((ئەڵڵاهوئەکبەر شایەتی دەدەم کە من بەندە و پێغەمبەری خوام))،**

---

(١) بڕوانە: ٤٢٠٣، ٤٢٠٤، ٦٦٠٦.

(٢) ئەم فەرموودە بەدوو ڕشتە هاتووە.

پاشان فەرمانی کرد بە بیلال بەناو خەڵکدا جاڕ بدات بڵێ: ((بێگومان تەنها مسوڵمان دەچێتە بەهەشتەوە و بەڕاستی خوا پشتیوانی لەم ئایینە دەکات و سەری دەخات بە کەسانێکی خراپ و تاوانبار )).

## ١٨٣- بَابُ مَنْ تَأَمَّرَ فِي الحَرْبِ من غَيْرِ إِمْرَةٍ إِذَا خَافَ العَدُوَّ

٣٠٦٣- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلاَلٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَخَذَ الرَّايَةَ زَيْدٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا جَعْفَرٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ عَنْ غَيْرِ إِمْرَةٍ فَفُتِحَ عَلَيْهِ، وَمَا يَسُرُّنِي -أَوْ قَالَ مَا يَسُرُّهُمْ- أَنَّهُمْ عِنْدَنَا». وَقَالَ وَإِنَّ عَيْنَيْهِ لَتَذْرِفَانِ[1].

## ١٨٣- باسی کەسێک لە کاتی جەنگدا خۆی بکات بەلێپرسراو بێ ئەوەی (سەروی خۆی) کردبێتی بەلێپرسراو ئەگەر ترسا لە دوژمن[2]

٣٠٦٣- ئەنەسی کوڕی مالی ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری خوێندەوە و فەرمووی: ((زەید ئاڵاکەی هەڵگرت پێکرا و شەهید بوو، پاشان جەعفەر ئاڵاکەی هەڵگرت و پێکرا و شەهید بوو، پاشان عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە هەڵیگرت و لێیدرا و شەهید بوو، پاشان خالیدی کوڕی وەلید ئاڵاکەی هەڵگرت بێ ئەوە کرابێ بەسەرکردە (و ئەو کارەی پێ سپێردرابێ) ئەنجا سەر خرا، وە پێم خۆش نەبوو - یان فەرمووی: پێیان خۆش نەبوو - ئەوان لای ئێمەدا بوونایە[3]))، ئەنەس وتی: بێگومان هەردوو چاوی پێغەمبەر ﷺ فرمێسکیان دەڕشت.

---

(١) بڕوانە: ١٢٤٦.

(٢) پەلاماری لەشکری مسوڵمانان بدات یا بەبێ لێپرسرا و مسوڵمان تووشی زیانی گەورە بن.

(٣) بەڵکو پێم خۆشە یان پێیان خۆشە کە شەهیدبوون نەک زیندوو بوونایە و لای ئێمە بوونایە.

## ١٨٤- بَابُ الْعَوْنِ بِالْمَدَدِ

٣٠٦٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، وَسَهْلُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَتَاهُ رِعْلٌ وَذَكْوَانُ وَعُصَيَّةُ وَبَنُو لِحْيَانَ، فَزَعَمُوا أَنَّهُمْ قَدْ أَسْلَمُوا، وَاسْتَمَدُّوهُ عَلَى قَوْمِهِمْ، فَأَمَدَّهُمُ النَّبِيُّ ﷺ بِسَبْعِينَ مِنَ الأَنْصَارِ قَالَ أَنَسٌ: كُنَّا نُسَمِّيهِمُ الْقُرَّاءَ، يَحْطِبُونَ بِالنَّهَارِ وَيُصَلُّونَ بِاللَّيْلِ، فَانْطَلَقُوا بِهِمْ حَتَّى بَلَغُوا بِئْرَ مَعُونَةَ غَدَرُوا بِهِمْ وَقَتَلُوهُمْ، فَقَنَتَ شَهْرًا يَدْعُو عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ وَبَنِي لِحْيَانَ. قَالَ قَتَادَةُ: وَحَدَّثَنَا أَنَسٌ أَنَّهُمْ قَرَءُوا بِهِمْ قُرْآنًا: أَلاَ بَلِّغُوا عَنَّا قَوْمَنَا بِأَنَّا قَدْ لَقِينَا رَبَّنَا فَرَضِيَ عَنَّا وَأَرْضَانَا. ثُمَّ رُفِعَ ذَلِكَ بَعْدُ[1].

## ١٨٤- باسی هاوکاری و یارمەتی دان بەناردنی خەڵک (بۆیان)

**٣٠٦٤- قەتادە وتی: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە ڕیعل و زەکەوان و عوصەییە و بەنی لیحیان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بە قسەی خۆیان بەڕاستی مسوڵمان بوون، وە داوایان لێ کرد چەند کەسێکی (خوێندەوار) یان لەگەڵ بنێرێ بۆ لای هۆزەکانیان، پێغەمبەریش ﷺ حەفتا کەسی ئەنصاڕی بۆ ناردن، ئەنەس وتی: ئێمە بەو حەفتا کەسەمان دەوت قوڕئان خوێنەکان، بەڕۆژدا داریان دەکردەوە (دەیان فرۆشت) و بە شەودا شەونوێژیان دەکرد، جا ئەو هۆزانە ئەو حەفتا کەسەیان لەگەڵ خۆیان برد (و ڕۆیشتن) هەتا گەشتنە بیری مەعونە ناپاکیان لەگەڵ کردن و شەهیدیان کردن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ یەك مانگ دوعای قنوتی دەخوێند دوعای دەکرد لە هۆزی ڕیعل و زەکەوان و بەنی لیحیان.**

**قەتادە دەڵێ: ئەنەس بۆی گێڕاینەوە لە بارەیانەوە (قوڕئان دابەزی) هاوەڵان ئەو ئایەتانەیان دەخوێندەوە (کە ئەمەتانی): (ئەوسا بەهۆزەکەمان ڕاگەیەنن**

(١) بڕوانە: ١٠٠١.

که بێگومان ئێمه گەیشتینه خزمەتی پەروەردگارمان، جا ئەو لێمان ڕازی بوو و ئێمەشی ڕازی کرد) پاشان دواتر ئەو ئایەتە سڕایەوە و نەما.

## ١٨٥- بابُ مَن غَلَبَ العَدُوَّ فأقامَ عَلَى عَرْصَتِهِمْ ثَلاثًا

٣٠٦٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: ذَكَرَ لَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي طَلْحَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا ظَهَرَ عَلَى قَوْمٍ أَقَامَ بِالْعَرْصَةِ ثَلَاثَ لَيَالٍ. تَابَعَهُ مُعَاذٌ وَعَبْدُ الأَعْلَى حَدَّثَنَا سَعِيدٌ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ عَنْ أَبِي طَلْحَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[١].

## ١٨٥- باسی کەسێ زاڵ بێ و سەرکەوێ بەسەر دوژمندا ئینجا سێ ڕۆژ لە زەوی و گۆڕەپانی ئەواندا بمێنێتەوە

٣٠٦٥- قەتادە دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕاینەوە لە ئەبو تەڵحەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر زاڵ ببوایە بەسەر هۆزێکدا لە گۆڕەپانەکەیاندا سێ شەو دەمایەوە.
موعاز و عەبدولئەعلا دەڵێن: سەعید بۆی گێڕاینەوە لە قەتادەوە، لە ئەنەسەوە، لە ئەبو تەڵحەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە، ئەم فەرموودە دەگێڕنەوە و، پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ڕەوحی کوڕی عوبادە دەکەن.

## ١٨٦- بابُ مَنْ قسَمَ الغَنِيمَةَ فِي غَزْوِهِ وَسَفَرِهِ

وَقَالَ رَافِعٌ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِذِي الحُلَيْفَةِ، فَأَصَبْنَا غَنَمًا وَإِبِلاً، فَعَدَلَ كُلَّ عَشَرَةٍ مِنَ الغَنَمِ بِبَعِيرٍ[٢].

---

(١) بڕوانە: ٣٩٧٦.
(٢) بڕوانە: ٢٤٨٨.

٣٠٦٦- حَدَّثَنَا هُدْبَةُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، أَنَّ أَنَسًا أَخْبَرَهُ قَالَ: اعْتَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ الجِعْرَانَةِ، حَيْثُ قَسَمَ غَنَائِمَ حُنَيْنٍ[١].

## ١٨٦- باسی ئەو کەسەی لە غەزا و سەفەریدا دەستکەوت و تاڵانی دابەش کردبێت

**ڕافیع دەڵێ: ئێمە لە (زیلحولەیفە) لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین مەڕ و وشترێکی زۆرمان گرتبوو (لە کافران)، جا پێغەمبەر ﷺ دە سەرمەڕی بە وشترێك دادەنا.**

**٣٠٦٦- قەتادە دەڵێ: ئەنەس ﷺ هەواڵی پێدا و وتی: پێغەمبەر ﷺ لە جیعرانەوە ئیحرامی بەعومرە دابەست، لەوێدا کە دەست کەوتەکانی حونەینی دابەش کرد.**

## ١٨٧- بابٌ: إِذَا غَنِمَ المُشْرِكُونَ مَالَ المُسْلِمِ ثُمَّ وَجَدَهُ المُسْلِمُ

٣٠٦٧ - قَالَ ابْنُ نُمَيْرٍ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: ذَهَبَ فَرَسٌ لَهُ، فَأَخَذَهُ العَدُوُّ، فَظَهَرَ عَلَيْهِ المُسْلِمُونَ فَرُدَّ عَلَيْهِ فِي زَمَنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَبَقَ عَبْدٌ لَهُ فَلَحِقَ بِالرُّومِ، فَظَهَرَ عَلَيْهِمُ المُسْلِمُونَ، فَرَدَّهُ عَلَيْهِ خَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ بَعْدَ النَّبِيِّ ﷺ[٢].

## ١٨٧- باسێک: ئەگەر بتپەرستەکان ماڵ و سامانی مسوڵمانێک بگرن پاشان مسوڵمانەکە بیدۆزێتەوە [٣]

**٣٠٦٧- نافیع دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ وتی: ئەسپێکی ئیبنو عومەر ڕۆشت و دوژمن گرتیان، ئەنجا مسوڵمانان زاڵ بوون بەسەر دوژمنەکانیاندا، ئیتر ئەسپەکەی بۆ گێڕدرایەوە، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کۆیلەیەکیشی هەڵهات**

---

(١) بڕوانە: ١٧٧٨.

(٢) بڕوانە: ٣٠٦٨، ٣٠٦٩.

(٣) بەم جۆرە مسوڵمانان زاڵ بن بەسەر کافراندا ئەو ماڵەی مسوڵمانەکە بیبنەوە دەدرێتەوە بە خاوەنەکەی.

**پەیوەندی کرد بەرۆمەکانەوە، جا مسوڵمانان سەرکەوتن بەسەر ڕۆمەکاندا و خالیدی کوڕی وەلید دوای پێغەمبەر ﷺ کۆیلەکەی گێڕایەوە بۆ ئیبنو عومەر ﷺ.**

٣٠٦٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ قَالَ: أَخْبَرَنِي نَافِعٌ أَنَّ عَبْدًا لِابْنِ عُمَرَ أَبَقَ فَلَحِقَ بِالرُّومِ، فَظَهَرَ عَلَيْهِ خَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ، فَرَدَّهُ على عَبْدِ اللهِ، وَأَنَّ فَرَسًا لِابْنِ عُمَرَ عَارَ فَلَحِقَ بِالرُّومِ، فَظَهَرَ عَلَيْهِ، فَرَدُّوهُ على عَبْدِ اللهِ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: عَارَ مُشْتَقٌّ مِنَ العَيْرِ وَهْوَ حِمَارُ وَحْشٍ أَيْ: هَرَبَ[1].

**٣٠٦٨- نافیع دەڵێ: کۆیلەیەکی ئیبنو عومەر ﷺ هەڵهات و ڕۆشت بۆ لای ڕۆمەکان ئەنجا خالیدی کوڕی وەلید ئەو کۆیلەی گرت و گێڕایەوە بۆعەبدوڵلای کوڕی عومەر، وە ئەسپێکی ئیبنو عومەر ڕایکرد و ڕۆشت بۆ لای ڕۆمەکان خالید گرتی و هێنایەوە بۆ عەبدوڵلا.**

**ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: (عَارَ) لە (العَيْرِ)ـەوە وەرگیراوە، (العَيْرِ) کەرە کێوییە، (عَارَ)ـش واتە: ڕایکرد.**

٣٠٦٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ كَانَ عَلَى فَرَسٍ يَوْمَ لَقِيَ الْمُسْلِمُونَ، وَأَمِيرُ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَئِذٍ خَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ، بَعَثَهُ أَبُو بَكْرٍ، فَأَخَذَهُ الْعَدُوُّ، فَلَمَّا هُزِمَ العَدُوُّ رَدَّ خَالِدٌ فَرَسَهُ[2].

**٣٠٦٩- نافیع لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئیبنو عومەر سواری ئەسپێك بوو ئەو ڕۆژەی مسوڵمانان (بە ڕۆمەکان) گەشتن، سەرکردەی مسوڵمانان لەو ڕۆژەدا خالیدی کوڕی وەلید بوو، ئەبو بەکر ناردبووی، (ئەسپەکە ڕایکرد و) دوژمن گرتی، جا کاتێ دوژمن شکێنرا خالید ئەسپەکەی گێڕایەوە بۆ عەبدوڵلا.**

---

(١) بڕوانە: ٣٠٦٧.

(٢) بڕوانە: ٣٠٦٧.

## ١٨٨- بابُ مَن تَكَلَّمَ بالفَارِسِيَّةِ وَالرَّطَانَةِ

وَقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾ الروم، ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ ﴿٤﴾ ﴾ إبراهيم.

٣٠٧٠- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، أَخْبَرَنَا حَنْظَلَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ، أَخْبَرَنَا سَعِيدُ بْنُ مِينَاءَ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ذَبَحْنَا بُهَيْمَةً لَنَا، وَطَحَنْتُ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، فَتَعَالَ أَنْتَ وَنَفَرٌ، فَصَاحَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «يَا أَهْلَ الخَنْدَقِ، إِنَّ جَابِرًا قَدْ صَنَعَ سُؤْرًا، فَحَيَّ هَلاً بِكُمْ»[1].

## ١٨٨- باسی کەسێک کە بە زمانی فارسی و عەجەمی قسە بکات

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (وە جیاوازی زمانتان و ڕەنگتان)، (وە هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە بەزمانی گەلەکەی خۆی نەبێت).**

**٣٠٧٠- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرخێکمان هەبووسەرم بڕیوە، وە مەنێ جۆشم هاڕیوە، جا بەڕێزت لەگەڵ چەند کەسێك تەشریف بێنن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەدەنگی بەرز فەرمووی: ((ئەی هاوەڵانی خەندەق جابیر خواردنێکی دروست کردووە دەی هەمووتان وەرن)).**

٣٠٧١- حَدَّثَنَا حِبَّانُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، عَنْ خَالِدِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أُمِّ خَالِدٍ بِنْتِ خَالِدِ بْنِ سَعِيدٍ قَالَتْ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَعَ أَبِي وَعَلَيَّ قَمِيصٌ أَصْفَرُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «سَنَهْ سَنَهْ». قَالَ عَبْدُ اللَّهِ وَهْيَ بِالْحَبَشِيَّةِ: حَسَنَةٌ. قَالَتْ فَذَهَبْتُ أَلْعَبُ بِخَاتَمِ

---

(١) بڕوانە: ٤١٠١، ٤١٠٢.

النُّبُوَّةِ، فَزَبَرَنِي أَبِي قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَعْهَا». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ: «أَبْلِي وَأَخْلِفِي، ثُمَّ أَبْلِي وَأَخْلِفِي، ثُمَّ أَبْلِي وَأَخْلِفِي». قَالَ عَبْدُ اللَّهِ فَبَقِيَتْ حَتَّى ذَكَرَ[1].

**٣٠٧١- ئومموخالیدی کچی خالیدی کوڕی سەعید وتی: لەگەڵ باوکمدا کراسێکی زەردم لەبەردا بوو ڕۆشتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سەنە سەنە))، عەبدوڵلا (ی کوڕی موبارەك) دەڵێ: وتەکەی پێغەمبەر ﷺ بەزمانی حەبەشی واتە: جوانە، (ئوممو خالید) وتی: جا منیش ڕۆشتم و دەمویست یاری بەمۆر و نیشانەی پێغەمبەرایەتیەکەی[2] بکەم، بەڵام باوکم تێیخوڕیم و نەیهێشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((وازی لێ بێنە))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((جلەکەت کۆن کەیت و پینەی کەیت، جلەکەت کۆن بکەیت و پینەی بکەیت، جلەکەت کۆن کەیت و پینەی کەیت)) عەبدوڵلا دەڵێ: جا جلەکەی مایەوە تا باسی زۆر مانەوەی دەکرد یان تا بۆر بوو لە زۆر کۆن بوون و مانەوەدا [3].**

٣٠٧٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ الحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ أَخَذَ تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ، فَجَعَلَهَا فِي فِيهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ بِالْفَارِسِيَّةِ: «كَخٍ كَخٍ، أَمَا تَعْرِفُ أَنَّا لاَ نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ»[4].

**٣٠٧٢- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ دەنکە خورمایەکی لە خورمای زەکات هەڵگرت و خستیە دەمیەوە، جا پێغەمبەر ﷺ - بە فارسی- فەرمووی: ((کەخ کەخ، مەگەر نازانی کە ئێمە شتی زەکات ناخۆین؟)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٨٧٤، ٥٨٢٣، ٥٨٤٥، ٥٩٩٣.
(٢) کە لە نێو شانی پیرۆزی دابوو.
(٣) بە جۆری دیکەش مانا کراوە: جا (ئوممو خالید) زۆر ماو تەمەنی درێژ بوو، هەتا جلەکەی بۆر بوو لەبەر زۆر لەبەرکرنی ئەگەر بە (حَتَّى دَكَنَ) بێت کە بەو شێوەش هاتووە.
(٤) بڕوانە: ١٤٨٥.

## ١٨٩- بابُ الغُلُولِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ ﴿١٦١﴾﴾ آل عمران.

٣٠٧٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ أَبِي حَيَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو زُرْعَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَامَ فِينَا النَّبِيُّ ﷺ فَذَكَرَ الْغُلُولَ فَعَظَّمَهُ وَعَظَّمَ أَمْرَهُ قَالَ: «لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَوْمَ القِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ شَاةٌ لَهَا ثُغَاءٌ عَلَى رَقَبَتِهِ فَرَسٌ لَهُ حَمْحَمَةٌ يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَغِثْنِي. فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. وَعَلَى رَقَبَتِهِ بَعِيرٌ لَهُ رُغَاءٌ، يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَغِثْنِي. فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. وَعَلَى رَقَبَتِهِ صَامِتٌ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَغِثْنِي. فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. أَوْ عَلَى رَقَبَتِهِ رِقَاعٌ تَخْفِقُ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَغِثْنِي. فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ». وَقَالَ أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي حَيَّانَ: "فَرَسٌ لَهُ حَمْحَمَةٌ"[١]..

## ١٨٩- باسی دزیكردن له غەنیمەت

**باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (هەر کەسێك خیانەت بکات بەو خیانەتەوەی کردوویەتی دێت (و بەکۆڵیەوەیە))[٢].**

**٣٠٧٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ له ناوماندا هەستایەوە و باسی دزیکردنی له دەستکەوت کرد و بەتاوانێکی گەورەی دانا و کارەکەی بە گەورە لە قەڵەمدا و فەرمووی: ((له ڕۆژی دواییدا بەکەسێکتان نەگەم مەڕێك بەسەر ملیەوە بێت بباڕێنی، ئەسپێ بەسەر ملیەوە بێت بحیلێنی، ئەو کەسە بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە، منیش بڵێم: من هیچم له دەست نایە بۆت، بێگومان پێشتر پێم ڕاگەیاندی، وشترێك بەسەر ملیەوە بۆڕەی بی، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا فریام بکەوە، منیش دەڵێم: هیچم له دەست نایە بۆت، بەڕاستی پێشتر پێم ڕاگەیاندی و ئاگادارم کردیت، (یان دێت) ئاڵتون و زیو بەسەر**

---

(١) بڕوانە: ٢٣٧١.

(٢) الغلول: واتە خیانەت و دزی کردن له غەنیمەت پێش دابەشکردنی.

ملیەوەیە، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا وەرە بەهانامەوە، منیش دەڵێم: من ناتوانم هیچت بۆ بکەم بێگومان پێشتر پێم ڕاگەیاندی، یان قوماش و پۆشاکی بە ملەوەیە و با لێی دەدا و دەشەکێتەوە[1]، جا دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا وەرە بە هانامەوە، منیش دەڵێم: هیچم پێ ناکری بۆت، چونکە بەڕاستی پێشتر پێم ڕاگەیاندی و ئاگادارم کردیت)).

ئەیووب لە ئەبو حەییانەوە گێڕاویەتیەوە (بەم جۆرە): (ئەسپێك بحیلێنی).

## ١٩٠- بابُ القَلِيلِ مِنَ الغُلُولِ

وَلَمْ يَذْكُرْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ حَرَّقَ مَتَاعَهُ، وهذا أَصَحُّ.

٣٠٧٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: كَانَ عَلَى ثَقَلِ النَّبِيِّ ﷺ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: كِرْكِرَةُ، فَمَاتَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هُوَ فِي النَّارِ». فَذَهَبُوا يَنْظُرُونَ إِلَيْهِ فَوَجَدُوا عَبَاءَةً قَدْ غَلَّهَا. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ ابْنُ سَلَامٍ: كَرْكَرَةُ -يَعْنِي بِفَتْحِ الْكَافِ- وَهْوَ مَضْبُوطٌ كَذَا.

## ١٩٠- باسی (حوکمی) دزی کردنی کەم لە دەستکەوت

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەیگێڕاوەتەوە کە کەل وپەلی (کابرای دزی) سوتاندبێت ئەم گێڕانەوە ڕاسترە (لە پێچەوانەکەی).

٣٠٧٤- عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: پیاوێك چاودێری کۆڵ و باری پێغەمبەر ﷺ بوو پێیان دەووت کِرِ کِرە کوتوپڕ مرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەو لە دۆزەخ دایە))، جا هاوەڵان ڕۆیشتن سەیری کەل و پەلەکەیان کرد بینیان عەبایەکی دزیوە و (شاردویەتیەوە).

---

(١) چەند پارچە نووسراوێکی لە گەردن دایە دەشەکێتەوە.

ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئیبنو سەلام دەڵێ: (كَرْكَرَةُ) واتە: پیتی كافەكە سەری هەبێت بەو جۆرەش خوێندنەوەی تەواوە.

## ١٩١- بابُ مَا يُكْرَهُ من ذَبْحِ الإِبلِ وَالْغَنَمِ فِي المَغَانِم

٣٠٧٥- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رِفَاعَةَ، عَنْ جَدِّهِ رَافِعٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِذِي الحُلَيْفَةِ، فَأَصَابَ النَّاسَ جُوعٌ وَأَصَبْنَا إِبِلاً وَغَنَمًا، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ فِي أُخْرَيَاتِ النَّاسِ، فَعَجِلُوا فَنَصَبُوا الْقُدُورَ، فَأَمَرَ بِالْقُدُورِ فَأُكْفِئَتْ، ثُمَّ قَسَمَ فَعَدَلَ عَشَرَةً مِنَ الْغَنَمِ بِبَعِيرٍ، فَنَدَّ مِنْهَا بَعِيرٌ، وَفِي القَوْمِ خَيْلٌ يَسِيرٌ فَطَلَبُوهُ فَأَعْيَاهُمْ، فَأَهْوَى إِلَيْهِ رَجُلٌ بِسَهْمٍ، فَحَبَسَهُ الله فَقَالَ: «هَذِهِ البَهَائِمُ لَهَا أَوَابِدُ كَأَوَابِدِ الوَحْشِ، فَمَا نَدَّ عَلَيْكُمْ فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا». فَقَالَ جَدِّي: إِنَّا نَرْجُو -أَوْ نَخَافُ- أَنْ نَلْقَى العَدُوَّ غَدًا وَلَيْسَ مَعَنَا مُدًى، أَفَنَذْبَحُ بِالْقَصَبِ؟ فَقَالَ: «مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ فَكُلْ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ، وَسَأُحَدِّثُكُمْ عَنْ ذَلِكَ، أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ»(١).

## ١٩١- باسی ئەوەی ناپەسەندە لەسەر بڕینی وشتر و مەڕ لە دەستكەوتەكانی جەنگ

٣٠٧٥- عەبایەی كوڕی ڕیفاعە لە ڕافیعی باپیریەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین لە زیلحولەیفە، ئینجا برسیەتێكی زۆر بەسەر خەڵكەكەدا هاتبوو، وە چەند سەر وشتر و مەڕمان دەسكەوت، وە پێغەمبەر ﷺ لە دواوەی خەڵكەكەوە بوو، جا كەسانێك پەلەیان كرد (و سەریان بڕین) و مەنجەڵیان خستەسەر (ئاگر)،

---

(١) بڕوانە: ٢٤٨٨.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد کە مەنجەڵەکان (قلْپ بکرێنەوە)، ئەوسا مەنجەڵەکان قلْپ کرانەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ (وشتر و مەڕەکانی) دابەشکرد و هەر دە سەر مەڕێکی لە جێی وشترێك دانا، جا وشترێك لەو وشترانە یاخی بوو، لە ناو خەڵکەکەدا چەند ئەسپ سوارێکە کەم هەبوو، جا بەدوای وشترەکەدا ڕۆیشتن و ماندووی کردن (بۆیان نەگیرایەوە)، وە ئەنجا پیاوێکیان تیرێکی تێگرت ئیتر خوا (بەهۆی ئەوتیرەوە) جوڵەی لێ بڕی ڕایگرت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەم ئاژەڵانە یاخی بوونێکیان هەیە وەك یاخی بوونی ئاژەڵی کێوی، جا هەرکامێکیان لە دەستان دەرچوو (بۆتان نەگیرا) ئاوای لێ بکەن))، جا باپیرەم وتی: ئێمە سبەینێ بەتەماین- یان دەترسین- کە بە دوژمن بگەین و چەقۆشمان پێ نییە، ئایا بە قامیش (ئاژەڵ) سەربڕین ؟ فەرمووی: ((هەر شتێك خوێنی بڕژێنێت و ناوی خوای لەسەر هێنرا بێ ئەوە بیخۆن، جگە لە ددان و نینۆك، لەو بارەشەوە قسەتان بۆ دەکەم سەبارەت بە ددان ئەوە ئێسکێکە و سەبارەت بە نینۆکیش ئەوە چەقۆی خەڵکی حەبەشەیە)).

## ١٩٢- بابُ البِشَارَةِ فِي الفُتُوحِ

٣٠٧٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي قَيْسٌ قَالَ: قَالَ لِي جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلاَ تُرِيحُنِي مِنْ ذِي الخَلَصَةِ». وَكَانَ بَيْتًا فِيهِ خَثْعَمُ يُسَمَّى كَعْبَةَ اليَمَانِيَةَ، فَانْطَلَقْتُ فِي خَمْسِينَ وَمِائَةٍ مِنْ أَحْمَسَ، وَكَانُوا أَصْحَابَ خَيْلٍ، فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَنِّي لاَ أَثْبُتُ عَلَى الخَيْلِ، فَضَرَبَ فِي صَدْرِي حَتَّى رَأَيْتُ أَثَرَ أَصَابِعِهِ فِي صَدْرِي فَقَالَ: «اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ وَاجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا». فَانْطَلَقَ إِلَيْهَا فَكَسَرَهَا وَحَرَّقَهَا، فَأَرْسَلَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يُبَشِّرُهُ فَقَالَ رَسُولُ جَرِيرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، مَا جِئْتُكَ حَتَّى تَرَكْتُهَا كَأَنَّهَا جَمَلٌ أَجْرَبُ، فَبَارَكَ عَلَى خَيْلِ أَحْمَسَ وَرِجَالِهَا خَمْسَ مَرَّاتٍ. قَالَ مُسَدَّدٌ: بَيْتٌ فِي خَثْعَمَ[1].

(١) بڕوانە: ٣٠٢٠.

## ١٩٢- باسی ڕەوایەتی موژدەدان لە سەركەوتنەكاندا

**٣٠٧٦- ئەبو حازیم دەڵێ: جەریر پێی وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێم: ((ئەرێ (بوتخانەی) زولخەلەصەم لە كۆڵ ناكەیتەوە و دڵخۆشم ناكەیت؟)) كە خانوو (ی بوتێك بوو) لە ناو هۆزی خەسعەم دا پێی دەوترا كەعبەی یەمەن[1]، جەریریش دەڵێ: منیش بە سەد و پەنجا سوارەوە لە هۆزی ئەحمەس كە خاوەنی ئەسپی زۆر بوون دەرچووم و ڕۆیشتم، جا عەرزی پێغەمبەرم ﷺ كرد: من خۆم ناگرم بەسەر ئەسپەوە بۆیە دەستی كێشا بە سنگمدا (بە جۆرێك) هەتا شوێنی پەنجەكانیم بەسنگمەوە بینی و فەرمووی: ((خوایە ڕاگیریكە (بە سواری وڵاخەكەیەوە) بیكە بە ڕێنیشاندراوێكی ڕێنیشاندەر))، ئەنجا جەریر دەرچوو بەرەو زولخەلەصە (و خانووەكەی ڕووخاند و) شكاندی و سووتاندی، ئینجا كەسێكی ناردەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ كە هەواڵەكەی پێبدات، جا نێراوەكەی جەریر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەو زاتەی تۆی بەڕاستی ڕەوانە كردووە نەهاتووم بۆ خزمەتی تۆ هەتا ئەوكاتەی كە بەجێم هێشت دەتووت وشتری گەڕی قەترانی پیاكراو (ئەو كەسە وتی:) جا پێغەمبەر ﷺ پێنج جار دوعای فەڕ و بەرەكەتی بۆ ئەسپ و پیاوەكانی هۆزی ئەحمەس كرد.**

**موسەدەد لە گێڕانەوەكەیدا وتی:** (بَيْتٌ فِي خَثْعَمَ) **خانوویەك لە ناو هۆزی خەسعەمدا. لە جیاتی** (بَيْتًا فِيهِ خَثْعَمُ).

## ١٩٣- بابُ مَا يُعْطَى الْبَشِيرُ

وَأَعطَى كَعْبُ بْن مَالِكٍ ثَوْبَيْنِ حِينَ بُشِّرَ بِالتَّوْبَةِ[2].

---

(١) یانی كەعبەی لای ڕاست یان لە وەڵاتی یەمەن بوو.

(٢) بڕوانە: ٢٧٥٧.

## ١٩٣- باسی ئەوەی دەدرێت بەمژدەدەر

وە کەعبی کوڕی مالیك ﷺ کاتێ مژدەی گیرابوونی تەوبەی پێدرا دوو کراسی بەخشی (بەمژدەدەرەکە)[١].

## ١٩٤- بابٌ: لَا هِجْرَةَ بَعْدَ الفَتْحِ

٣٠٧٧- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ: «لاَ هِجْرَةَ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا»[٢].

## ١٩٤- باسێک: پاش ئازادکردن (ی مەککە) کۆچکردن نییە

**٣٠٧٧- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی ئازادکردنی مەککە فەرمووی: ((ئیتر کۆچکردن نەما، بەڵام خەبات و تێکۆشان و نیەتی (چاکەکردن) بەردەوامە، وە ئەگەر داوای دەرچوونتان لێ کرا بۆ خەبات[٣] هەموو دەرچن)).**

٣٠٧٨- ٣٠٧٩- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ مُجَاشِعِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: جَاءَ مُجَاشِعٌ بِأَخِيهِ مُجَالِدِ بْنِ مَسْعُودٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: هَذَا مُجَالِدٌ يُبَايِعُكَ عَلَى الْهِجْرَةِ. فَقَالَ: «لاَ هِجْرَةَ بَعْدَ فَتْحِ مَكَّةَ، وَلَكِنْ أُبَايِعُهُ عَلَى الإِسْلاَمِ»[٤].

---

(١) لە فەرموودەی (٤٤١٨) باسەکەی دێت.

(٢) بڕوانە: ١٣٤٩.

(٣) لە لایەن پێشەوا و سەرکردەی موسوڵمانانەوە.

(٤) بڕوانە: ٢٩٦٢، ٢٩٦٣.

**٣٠٧٨- ٣٠٧٩- ئەبو عوسمانی نەهدیی دەگێڕێتەوە لە موجاشیعی کوڕی مەسعوودەوە دەڵێ: موجاشیع موجالیدی کوڕی مەسعوودی برای هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەمە موجالیدە پەیمانت پێ دەدا لەسەر کۆچکردن. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((پاش ئازادکردنی مەککە کۆچکردن نییە، بەڵام پەیمانی لێ وەردەگرم لەسەر ئیسلام[1])).**

٣٠٨٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ عَمْرٌو وَابْنُ جُرَيْجٍ: سَمِعْتُ عَطَاءً يَقُولُ: ذَهَبْتُ مَعَ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ إِلَى عَائِشَةَ ﵂ وَهْيَ مُجَاوِرَةٌ بِثَبِيرٍ فَقَالَتْ لَنَا: انْقَطَعَتِ الْهِجْرَةُ مُنْذُ فَتَحَ اللهُ عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ مَكَّةَ[2].

**٣٠٨٠- عەتا دەڵێ: لەگەڵ عوبەیدی کوڕی عومەیردا ڕۆشتمە خزمەت عائیشە کە لە دامێنی چیای سەبیردا بوو[3] پێی وتین: لەو کاتەوە خوا مەککەی ئازاد کرد بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ کۆچکردن کۆتایی هات و نەما.**

## ١٩٥- بابٌ: إِذَا اضطرَّ الرَّجُلُ إِلى النَّظَرِ فِي شُعُورِ أَهلِ الذِّمَّةِ وَالْمُؤْمِنَاتِ إِذَا عَصَيْنَ اللهَ وَتَجْرِيدِهِنَّ

٣٠٨١- حدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حَوْشَبٍ الطَّائِفِيُّ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا حُصَيْنٌ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ -وَكَانَ عُثْمَانِيًّا- فَقَالَ لِابْنِ عَطِيَّةَ -وَكَانَ عَلَوِيًّا-: إِنِّي لَأَعْلَمُ مَا الذِي جَرَّأَ صَاحِبَكَ عَلَى الدِّمَاءِ سَمِعْتُهُ يَقُولُ بَعَثَنِي النَّبِيُّ ﷺ

(١) واتە: پابەندبوون بە یاساکانی ئیسلامەوە.

(٢) بڕوانە: ٣٩٠٠، ٤٣١٢.

(٣) سەبیر شاخێکی گەورەیە لە موزدەلیفە کە دەڕۆی بۆ مینا دەکەوێتە لای ڕاستەوە، دەکرێ بەم جۆرەش مانای بکەین: عائیشە لە نزیک چیای سەبیر خەریکی عیبادەت بوو.

وَالزُّبَيْرَ، فَقَالَ «ائْتُوا رَوْضَةَ كَذَا، وَتَجِدُونَ بِهَا امْرَأَةً أَعْطَاهَا حَاطِبٌ كِتَابًا». فَأَتَيْنَا الرَّوْضَةَ فَقُلْنَا: الكِتَابَ. قَالَتْ: لَمْ يُعْطِنِي. فَقُلْنَا: لَتُخْرِجِنَّ أَوْ لأُجَرِّدَنَّكِ. فَأَخْرَجَتْ مِنْ حُجْزَتِهَا، فَأَرْسَلَ إِلَى حَاطِبٍ فَقَالَ: لاَ تَعْجَلْ، وَاللهِ مَا كَفَرْتُ وَلاَ ازْدَدْتُ لِلإِسْلاَمِ إِلاَّ حُبًّا، وَلَمْ يَكُنْ أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِكَ إِلاَّ وَلَهُ بِمَكَّةَ مَنْ يَدْفَعُ الله بِهِ عَنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ، وَلَمْ يَكُنْ لِي أَحَدٌ، فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَتَّخِذَ عِنْدَهُمْ يَدًا. فَصَدَّقَهُ النَّبِيُّ ﷺ. قَالَ عُمَرُ: دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَهُ، فَإِنَّهُ قَدْ نَافَقَ. فَقَالَ «مَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ، فَقَالَ اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ». فَهَذَا الذِي جَرَّأَهُ[١].

## ١٩٥- باسێک: ئەگەر پیاوی مسوڵمان ناچار بوو سەیری قژی ئافرەتی (ذمي)[٢] و ئافرەتانی باوەڕدار بکات کە سەرپێچی خوایان کردووە، وە ڕووت کردنەویان لە جل و بەرگەکانیان

**٣٠٨١- ئەبو عەبدوڕەحمان - کە عوسمانی بەلاوە لە پێشتر بوو لە عەلی رضي الله عنهما - وتی: بە ئەبو عەتییە- کە عەلی بەلاوە لە پێشتر بوو لە عوسمانی رضي الله عنهما - بێگومان من دەزانم چ شتێك هاوڕێکەتی[٣] جورئەت پێداوە کە خوێن برژێ و خەڵك بکوژێ، لە خۆیم بیستووە دەیوت: پێغەمبەر ﷺ من و زوبەیری نارد و فەرمووی: ((بڕۆن بۆ فلانە ڕەوزە لەوێدا ئافرەتێك دەبینن کە حاتیب نامەیەکی پێداوە))، ئێمە ڕۆیشتینە ئەو ڕەوزەیە و وتمان (بە ئافرەتەکە) نامەکەمان بەرێ، وتی: نامەی پێنەداوم، جا وتمان: سوێندبێ یان نامەکەی**

(١) بروانە: ٣٠٠٧.

(٢) ذمي: بە پیاو و ئافرەتی گاوور و جوو دەوترێت لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا بژین و سەرانە بدەن بە دەوڵەتی ئیسلامی لە بەرانبەر پارێزگاری لە گیان وماڵ و ئایینیان..

(٣) مەبەستی عەلی کوڕی ئەبو تالیبە رضي الله عنه.

دەردەهێنی، یان ڕووتت دەکەینەوە، ئەنجا لەبەر پشتێنەکەیدا دەری هێنا جا (پێغەمبەر ﷺ) ناردی بەشوێن حاتیبدا، حاتیب وتی: پەلەم لێ مەکە، سوێند بە خوا پاشگەزنەبوومەتەوە، بەڵکو خۆشەویستیم بۆ ئیسلام زیادی کردووە، هەرکام لە هاوەڵانت لە مەککە کەسی هەیە پارێزگاری لە ماڵ و منداڵەکانی بکەن، بەڵام من کەسم نییە، بۆیە حەزم کرد و پێم خۆش بوو چاکەیەکم هەبێ لە چاویاندا، ئیتر پێغەمبەر ﷺ باوەڕی پێ کرد، عومەر ﷺ وتی: لێم گەڕێ با بدەم لە گەردنی، چونکە بێگومان ناپاکی کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((تۆ چوزانیت لەوانەیە خوا ئاگاداری بەشداربووانی بەدر بێ و فەرموبێتی: هەرچی دەتانەوێت بیکەن))، (ئەبو عەبدورەحمان) وتی: ئا ئەمە جورئەتی پێدا.

## ١٩٦- بابُ اسْتِقْبَالِ الغُزَاةِ

٣٠٨٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي الأَسْوَدِ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ وَحُمَيْدُ بْنُ الأَسْوَدِ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ الشَّهِيدِ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، قَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ لِابْنِ جَعْفَرٍ ﷺ: أَتَذْكُرُ إِذْ تَلَقَّيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنَا وَأَنْتَ وَابْنُ عَبَّاسٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَحَمَلَنَا وَتَرَكَكَ.

## ١٩٦- باسی پێشوازی کردن لە جەنگاوەران (کە دەگەڕێنەوە لە جیهاد)

٣٠٨٢- ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: ئیبنو زوبەیر بە ئیبنو جەعفەری ﷺ وت: ئایا بیرت دێ کاتێ من و تۆ و ئیبنو عەبباس (ڕۆیشتین بۆ پێشوازی) پێغەمبەری خوا ﷺ بە خزمەتی گەیشتین وتی: بەڵێ ئەوە بوو ئێمە (من و ئیبنو عەبباس) ی سوارکرد و تۆی بەجێهێشت. (واتە ئیبنو زوبەیری بە جێهێشت).

٣٠٨٣- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: قَالَ السَّائِبُ بْنُ يَزِيدَ ﷺ: ذَهَبْنَا نَتَلَقَّى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَعَ الصِّبْيَانِ إِلَى ثَنِيَّةِ الوَدَاعِ[1].

**٣٠٨٣- زوهری دەڵێ: سائیبی کوڕی یەزید ﷺ وتی: ئێمە لەگەڵ منداڵاندا تا (ثَنِيَّةِ الوَدَاعِ[2]) ڕۆیشتین بۆ پێشوازی پێغەمبەری خوا ﷺ و بەخزمەتی بگەین.**

## ١٩٧- بابُ مَا يَقُولُ إِذَا رَجَعَ مِنَ الغَزْوِ؟

٣٠٨٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا قَفَلَ كَبَّرَ ثَلاَثًا قَالَ: «آيِبُونَ إِنْ شَاءَ اللهُ تَائِبُونَ عَابِدُونَ حَامِدُونَ لِرَبِّنَا سَاجِدُونَ، صَدَقَ اللهُ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ»[3].

## ١٩٧- باسی کەسێک لە غەزا گەڕایەوە چی دەڵێت؟

**٣٠٨٤- عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ (لە غەزا) دەگەڕایەوە سێ جار (الله اکبر)ی دەکرد و دەیفەرموو: ((گەڕاینەوە (بۆ لای خوا) بەویستی خوا تەوبەکارین خواپەرستین سوپاسگوزارین سوژدەبەرین بۆ پەروەردگارمان، خوا بەڵێنەکەی بەجێهێنا و بەندەکەی خۆی (موحەممەدی ﷺ) سەرخست تەنها خوا کۆمەڵی کافرانی تێکشکاند)).**

٣٠٨٥- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ مَقْفَلَهُ مِنْ عُسْفَانَ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى رَاحِلَتِهِ، وَقَدْ أَرْدَفَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ، فَعَثَرَتْ نَاقَتُهُ فَصُرِعَا جَمِيعًا، فَاقْتَحَمَ أَبُو طَلْحَةَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ

---

(١) بڕوانە: ٤٤٢٦، ٤٤٢٧.

(٢) شوێنێکە لە نزیک مەدینە لە دەرەوەی مەدینە.

(٣) بڕوانە: ١٧٩٧.

اللَّهِ، جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ. قَالَ: «عَلَيْكَ الْمَرْأَةَ». فَقَلَبَ ثَوْبًا عَلَى وَجْهِهِ وَأَتَاهَا، فَأَلْقَاهَا عَلَيْهَا وَأَصْلَحَ لَهُمَا مَرْكَبَهُمَا فَرَكِبَا، وَاكْتَنَفْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ قَالَ: «آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ». فَلَمْ يَزَلْ يَقُولُ ذَلِكَ حَتَّى دَخَلَ الْمَدِينَةَ[1].

**٣٠٨٥- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین لە گەڕانەوەیدا لە عوسفان، پێغەمبەری خوا ﷺ بەسوار وشترەکەیەوە بوو، صەفییەی کچی حویەیی لە پاشکۆی خۆیدا سوارکردبوو، وشترەکەی سەرسمێکی دا پێغەمبەر ﷺو صەفییە هەردووکیان کەوتن، ئەبو تەڵحە (لە وشترەکەی) خۆی فڕێدایە خوارەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوا بمکات بە قوربانت، فەرمووی: ((ئاگات لە ئافرەتەکە بێت))، ئەبو تەڵحە پارچە قوماشێکی دا بە ڕووخساری خۆیدا ڕۆیشت بۆ لای صەفییە قوماشەکەی دا بەسەر صەفییەدا[2]، ئەنجا وشتری سواربوونەکەیانی بۆ چاککردنەوە و هەردووکیان سواری بوونەوە، ئەنجا ئێمە ئەم لاو لای پێغەمبەرمان گرت، کە شاری مەدینەمان بینی و لێمانەوە دەرکەوت فەرمووی: ((گەڕاینەوە تەوبەکارین خواپەرستین سوپاسگوزارین بۆ پەروەردگارمان))، جا بەردەوام ئەم دوعایەی دەخوێند هەتا ڕۆیشتە ناو شاری مەدینەوە.**

٣٠٨٦- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ أَقْبَلَ هُوَ وَأَبُو طَلْحَةَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَمَعَ النَّبِيِّ ﷺ صَفِيَّةُ مُرْدِفَهَا عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَلَمَّا كَانُوا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ عَثَرَتِ النَّاقَةُ، فَصُرِعَ النَّبِيُّ ﷺ وَالْمَرْأَةُ، وَإِنَّ أَبَا طَلْحَةَ - قَالَ: أَحْسِبُ قَالَ: - اقْتَحَمَ عَنْ بَعِيرِهِ فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ، هَلْ أَصَابَكَ مِنْ شَيْءٍ؟ قَالَ: «لاَ، وَلَكِنْ عَلَيْكَ بِالْمَرْأَةِ». فَأَلْقَى أَبُو طَلْحَةَ ثَوْبَهُ عَلَى وَجْهِهِ، فَقَصَدَ قَصْدَهَا فَأَلْقَى ثَوْبَهُ عَلَيْهَا، فَقَامَتِ الْمَرْأَةُ، فَشَدَّ لَهُمَا عَلَى رَاحِلَتِهِمَا فَرَكِبَا،

---

(١) بڕوانە: ٣٧١.

(٢) بۆ ئەوەی خەڵکەکە گیان و لاشەی نەبینێت.

فَسَارُوا حَتَّى إِذَا كَانُوا بِظَهْرِ المَدِينَةِ -أَوْ قَالَ: أَشْرَفُوا عَلَى المَدِينَةِ- قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ». فَلَمْ يَزَلْ يَقُولُهَا حَتَّى دَخَلَ المَدِينَةَ[1].

**٣٠٨٦- یەحیای کوڕی ئەبو ئیسحاق لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو و ئەبو تەڵحە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ گەڕانەوە (لە غەزای خەیبەر)، صەفییەش لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە پاشکۆی وشترەکەیدا بوو، جا کاتێ لە ڕێگادابوون وشترەکە سەرسمێکی دا و پێغەمبەر ﷺ و ئافرەتەکە لە وشترەکە کەوتنە خوارەوە، وە ئەبو تەڵحەش - وتی: وابزانم وتی: - لە وشترەکەی خۆی فڕێدایە خوارەوە و هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا بمکات بە قوربانت ئایا هیچ زیانێکت پێ گەشت؟ فەرمووی: ((نەخێر بەڵام بڕۆ بۆ لای ئافرەتەکە و بزانە چۆنە؟)) ئەنجا ئەبو تەڵحە کراسەکەی دابە ڕووخساری خۆیدا و بەرەو ئافرەتەکە ڕۆشت، کراسە (کە دابووی بە ڕووخساری خۆیدا) دای بەسەر صەفییەدا ئەنجا ئافرەتەکە هەستایەوە، ئەوسا ئەبو تەڵحە وشترەکەی بۆ توند و تۆڵ کردنەوە هەردووکیان سووار بوون، وە ڕۆیشتن هەتا ئەوکاتەی گەشتنە نزیك مەدینە - یان وتی: مەدینەیان بینی - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((گەڕاینەوە تەوبەکارین خواپەرستین سوپاسگوزارین بۆ پەروەردگارمان))، ئیتر بەردەوام ئەم دوعایەی دەخوێند هەتا ڕۆشتە ناو شاری مەدینە.**

## ١٩٨- بابُ الصَّلَاةِ إِذَا قَدِمَ مِنْ السَّفَرِ

٣٠٨٧- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَارِبِ بْنِ دِثَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ فَلَمَّا قَدِمْنَا المَدِينَةَ قَالَ لِي «ادْخُلِ الْمَسْجِدَ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٣٧١.

(٢) بڕوانە: ٤٤٣.

## ١٩٨- باسی نوێژکردن ئەگەر (ڕێبوار یان موجاهید) لە سەفەر گەڕایەوە

**٣٠٨٧- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: من لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووم لە سەفەرێکدا، جا کاتێ گەیشتینەوە مەدینە پێغەمبەر ﷺ بە منی فەرموو: ((بڕۆ مزگەوت و دوو ڕکات نوێژ بکە)).**

٣٠٨٨- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبٍ عَنْ أَبِيهِ وَعَمِّهِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبٍ عَنْ كَعْبٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ ضُحًى دَخَلَ المَسْجِدَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ[1].

**٣٠٨٨- کەعب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەر کات ئەگەر چێشتەنگاو لە سەفەرێك بهاتایەتەوە دەڕۆیشتە مزگەوت، پێش ئەوەی دابنیشێت دوو ڕکات نوێژی دەکرد.**

## ١٩٩- بابُ الطَّعَامِ عِنْدَ القُدُومِ

وَكَانَ ابن عُمَرَ ﷺ يُفْطِرُ لِمَنْ يَغْشَاهُ.

٣٠٨٩- حدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مُحَارِبِ بْنِ دِثَارٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا قَدِمَ المَدِينَةَ نَحَرَ جَزُورًا أَوْ بَقَرَةً.

زَادَ مُعَاذٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مُحَارِبٍ، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ: اشْتَرَى مِنِّي النَّبِيُّ ﷺ بَعِيرًا بِوَقِيَّتَيْنِ وَدِرْهَمٍ- أَوْ دِرْهَمَيْنِ- فَلَمَّا قَدِمَ صِرَارًا أَمَرَ بِبَقَرَةٍ فَذُبِحَتْ فَأَكَلُوا مِنْهَا، فَلَمَّا قَدِمَ المَدِينَةَ أَمَرَنِي أَنْ آتِيَ المَسْجِدَ فَأُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ، وَوَزَنَ لِي ثَمَنَ البَعِيرِ[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٧٥٧.

(٢) بڕوانە: ٤٤٣.

# ١٩٩- باسی خواردن لێنان لە کاتی هاتنەوە لە سەفەر

**ئیبنو عومەر ﷺ ڕۆژووی نەدەگرت[1] (و خواردنی دروست دەکرد)، لەبەر ئەو کەسانەی دەڕۆیشتن بۆ لای (بۆ بەخێر هاتنەوەی لە سەفەر).**

**٣٠٨٩- جابیری کوڕی عەبدوللا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هاتەوە بۆ مەدینە[2] وشترێك یان مانگایەکی سەربڕی.**

**موعاز گێڕاویەتیەوە لە شوعبەوە ئەویش لە موحاریبەوە لە جابیری کوڕی عەبدوللای ﷺ بیستووە ئەم زیادەی هێناوە: (جابیر دەڵێ:) پێغەمبەر ﷺ وشترێکی لە من کڕی بە دوو ئۆقیە و درهەمێك - یان بە دوو درهەم- جا کاتێ گەیشتە صیرار[3] فەرمانی کرد بە سەربڕینی مانگایەك و سەربڕا و لە گۆشتەکەیان خوارد، ئەنجا کە هاتەوە بۆ مەدینە فەرمانی پێکردم بڕۆمە مزگەوت و دوو ڕکات نوێژ بکەم، وە نرخی وشترەکەشی کێشا بۆم (و پێیدام).**

٣٠٩٠- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَارِبِ بْنِ دِثَارٍ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَدِمْتُ مِنْ سَفَرٍ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «صَلِّ رَكْعَتَيْنِ». صِرَارٌ مَوْضِعٌ نَاحِيَةً بِالْمَدِينَةِ[4].

**٣٠٩٠- جابیر ﷺ دەڵێ: لە سەفەرێك هاتمەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: ((دوو ڕکات نوێژ بکە))، (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) (صِرَارٌ) شوێنێکە لە دەرەوەی مەدینە.**

---

(١) چونکە ئیبنو عومەر ﷺ لە سەفەردا بەڕۆژوو نەدەبوو، بەڵام لەماڵدا زۆر بەڕۆژوو دەبوو بە ڕیوایەتێکی تر هاتووە، کە دەڵێ: خواردنی دروست دەکرد، مەبەستی جابیر ئەوەیە ئیبنو عومەر کە لە سەفەر دەگەڕایەوە چەند ڕۆژێک بەڕۆژوو نەدەبوو بۆ ئەوەی خواردن دروست کات بۆ ئەو کەسانەی دێن بۆ بەخێر هاتنەوەی لە سەفەر.(إرشاد الساري:٦/٥٦٠).

(٢) دوا غەزای تەبوک یان (ذات الرقاع).

(٣) شوێنێکە سێ میل لە مەدینەوە دوورە لە لای ڕۆژهەڵاتیەوە.(إرشاد الساري:٦/٥٦١).

(٤) بڕوانە: ٤٤٣.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٥٧- كِتَابُ فَرْضِ الخُمُسِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٥٧- پەڕاوی پێویست بوونی پێنج یەکی دەستکەوت(١)

### ١- بابُ فَرْضِ الخُمُسِ

٣٠٩١- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَلِيُّ بْنُ الْحُسَيْنِ، أَنَّ حُسَيْنَ بْنَ عَلِيٍّ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَلِيًّا قَالَ: كَانَتْ لِي شَارِفٌ مِنْ نَصِيبِي مِنَ المَغْنَمِ يَوْمَ بَدْرٍ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَعْطَانِي شَارِفًا مِنَ الخُمُسِ، فَلَمَّا أَرَدْتُ أَنْ أَبْتَنِي بِفَاطِمَةَ بِنْتِ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَاعَدْتُ رَجُلاً صَوَّاغًا مِنْ بَنِي قَيْنُقَاعَ، أَنْ يَرْتَحِلَ مَعِيَ فَنَأْتِيَ بِإِذْخِرٍ أَرَدْتُ أَنْ أَبِيعَهُ الصَّوَّاغِينَ، وَأَسْتَعِينَ بِهِ فِي وَلِيمَةِ عُرْسِي، فَبَيْنَا أَنَا أَجْمَعُ لِشَارِفَيَّ مَتَاعًا مِنَ الأَقْتَابِ وَالْغَرَائِرِ وَالْحِبَالِ، وَشَارِفَايَ مُنَاخَانِ إِلَى جَنْبِ حُجْرَةِ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، رَجَعْتُ حِينَ جَمَعْتُ مَا جَمَعْتُ، فَإِذَا شَارِفَايَ قَدِ اجْتُبَّ أَسْنِمَتُهُمَا وَبُقِرَتْ خَوَاصِرُهُمَا، وَأُخِذَ مِنْ أَكْبَادِهِمَا، فَلَمْ أَمْلِكْ عَيْنَيَّ حِينَ رَأَيْتُ ذَلِكَ الْمَنْظَرَ مِنْهُمَا، فَقُلْتُ: مَنْ فَعَلَ هَذَا فَقَالُوا: فَعَلَ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ المُطَّلِبِ، وَهُوَ فِي هَذَا الْبَيْتِ فِي شَرْبٍ مِنَ الأَنْصَارِ. فَانْطَلَقْتُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَعِنْدَهُ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ، فَعَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ فِي وَجْهِي الذِي لَقِيتُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا لَكَ؟» فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ قَطُّ، عَدَا حَمْزَةُ عَلَى نَاقَتَيَّ، فَأَجَبَّ أَسْنِمَتَهُمَا وَبَقَرَ خَوَاصِرَهُمَا، وَهَا هُوَ ذَا فِي بَيْتٍ مَعَهُ شَرْبٌ. فَدَعَا النَّبِيُّ ﷺ بِرِدَائِهِ

---

(١) بۆ ئەو کەسانەی لە ئایەتەکەدا باسکراون، سورەتی ئەنفال ئایەتی (٤١).

فَارْتَدَى، ثُمَّ انْطَلَقَ يَمْشِي، وَاتَّبَعْتُهُ أَنَا وَزَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ حَتَّى جَاءَ البَيْتَ الذِي فِيهِ حَمْزَةُ، فَاسْتَأْذَنَ فَأَذِنُوا لَهُمْ فَإِذَا هُمْ شَرْبٌ، فَطَفِقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَلُومُ حَمْزَةَ فِيمَا فَعَلَ، فَإِذَا حَمْزَةُ قَدْ ثَمِلَ مُحْمَرَّةً عَيْنَاهُ، فَنَظَرَ حَمْزَةُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ فَنَظَرَ إِلَى رُكْبَتِهِ، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ فَنَظَرَ إِلَى سُرَّتِهِ، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ فَنَظَرَ إِلَى وَجْهِهِ ثُمَّ قَالَ حَمْزَةُ: هَلْ أَنْتُمْ إِلاَّ عَبِيدٌ لأَبِي؟ فَعَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَدْ ثَمِلَ، فَنَكَصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى عَقِبَيْهِ الْقَهْقَرَى وَخَرَجْنَا مَعَهُ[1].

## ١- باسی پێویست بوونی پێنج یەک

**٣٠٩١- حوسەینی کوڕی عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە عەلی (باوکی) وتی: مێحوشترێکی پیری پەککەوتەم هەبوو، بەشی خۆم بوو لە دەستکەوتی (غەزای) بەدر، پێغەمبەریش ﷺ لە پێنج یەکی دەستکەوت مێحوشترێکی پیری پەککەوتەی تری پێدابووم، جا کاتێك ویستم فاتیمەی ﷺ کچی پێغەمبەری خوا ﷺ بهێنم[2]، بەڵێنم دا بە پیاوێکی زەرەنگەر لە بەنی قەینوقاع کە لەگەڵمدا بێت بڕۆین زوڕناتك بێنین، ویستم بیفرۆشم بەزەڕەنگەرەکان بۆ ئەوەی پارەکەی بۆ شایی ژن هێنانەکەم خەرج بکەم، لەو کاتەدا کە پێویستی حوشترەکانم ئامادە دەکرد لە کۆپان و خەرار و گوریس هەردوو حوشترەکانیشم لە تەنشت دیواری ماڵێکی ئەنصاریدا یێخ درابوون، جا کاتێك ئەوەی (پێویست بوو) کۆی بکەمەوە کۆمکردەوە و گەڕامەوە دەبینم حوشترەکانم کۆپارەکانیان بڕاوە، وە کەلەکەیان هەڵدراوە، وە بەشێك لە سی و جگەرەکەیان دەرهێنراوە، کە ئەو دیمەنەی وشترەکانم دی خۆم پێ نەگیرا و فرمێسك بە چاوەکانمدا هاتە خوارەوە! وتم: کێ**

---

(١) بڕوانە: ٢٠٨٩.

(٢) واتە: بیبێتە هاوسەر و خێزانم.

ئەمەی کردووە؟ وتیان: حەمزەی کوڕی عەبدولموتتەلیب کردوویەتی، ئەوەتا لەو ماڵەدا لەگەڵ چەند ئەنصارییەکدا عارەق دەخۆنەوە، منیش ڕۆیشتم هەتا ڕۆیشتمە ژوورەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ زەیدی کوڕی حاریسەی لە خزمەتدابوو، جا پێغەمبەر ﷺ لە ڕووخسارمدا هەستی بەوە کرد کە تووشم بووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((چیت لێ قەوماوە؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا هەرگیز کارەساتی وەك ئەوەی ئەمڕۆم نەدیوە، حەمزە پەلاماری هەردوو وشترەکەمی داوە و کۆپارەکانیانی بڕیوە و کەلەکەیانی هەڵدڕیوە ئێستاش لەو ماڵەیە کۆمەڵێ شەراب خۆری لەگەڵ دایە، پێغەمبەریش ﷺ داوای پشتە ماڵەکەی کرد و دای بەشانیدا، پاشان دەرچوو ڕۆیشت، من و زەیدی کوڕی حاریسە شوێنی کەوتین، هەتا ڕۆیشتە (بەردەم) ئەو ماڵەی کە حەمزەی لێ بوو، پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی خواست، مۆڵەتیاندا کە ڕۆیشتە ژوورەوە چەند کەسێکی لێ بوو عارەقیان دەخواردەوە، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە سەرزەنشتی حەمزە کە بۆچی وای کردووە، حەمزەش سەرخۆش و مەست بوو چاوی سوور بوو بوو، ئینجا حەمزە تەماشای پێغەمبەری خوای ﷺ کرد، لە دواییدا چاوی بەرزکردەوە، تەماشای ئەژنوی کرد، لە پاشان چاوی بەرزکردەوە و تەماشای ناوکی کرد، جا تەماشای ڕووخساری کرد، پاشان حەمزە وتی: بۆ ئێوە جگە کۆیلەی باوکی من چین؟ ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ زانی کە زۆر سەرخۆش بووە، (نەوەك زیاتر سنوور ببەزێنێت) پاشە و پاش گەڕایەوە ئێمەش لە خزمەتیدا ڕۆیشتینە دەرەوە.

٣٠٩٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ فَاطِمَةَ ﵍

ابْنَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سَأَلَتْ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَقْسِمَ لَهَا مِيرَاثَهَا، مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِمَّا أَفَاءَ اللهُ عَلَيْهِ(١).

**٣٠٩٢- عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە عائیشەی دایکی ئیمانداران ﷺ بۆی گێڕایەوە کە فاتیمەی ﷺ کچی پێغەمبەری خوا ﷺ پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە ئەبو بەکر ﷺ کرد، لەو دەستکەوتانەی خوا داویەتی بە پێغەمبەری خوا بەشە میراتی خۆی پێ بدات.**

٣٠٩٣ - فَقَالَ لَهَا أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ». فَغَضِبَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَهَجَرَتْ أَبَا بَكْرٍ، فَلَمْ تَزَلْ مُهَاجِرَتَهُ حَتَّى تُوُفِّيَتْ وَعَاشَتْ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سِتَّةَ أَشْهُرٍ. قَالَتْ وَكَانَتْ فَاطِمَةُ تَسْأَلُ أَبَا بَكْرٍ نَصِيبَهَا مِمَّا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ خَيْبَرَ وَفَدَكٍ وَصَدَقَتِهِ بِالْمَدِينَةِ، فَأَبَى أَبُو بَكْرٍ عَلَيْهَا ذَلِكَ، وَقَالَ: لَسْتُ تَارِكًا شَيْئًا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعْمَلُ بِهِ إِلاَّ عَمِلْتُ بِهِ، فَإِنِّي أَخْشَى إِنْ تَرَكْتُ شَيْئًا مِنْ أَمْرِهِ أَنْ أَزِيغَ. فَأَمَّا صَدَقَتُهُ بِالْمَدِينَةِ فَدَفَعَهَا عُمَرُ إِلَى عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ، فَأَمَّا خَيْبَرُ وَفَدَكُ فَأَمْسَكَهَا عُمَرُ وَقَالَ هُمَا صَدَقَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَانَتَا لِحُقُوقِهِ الَّتِي تَعْرُوهُ وَنَوَائِبِهِ، وَأَمْرُهُمَا إِلَى مَنْ وَلِيَ الأَمْرَ. قَالَ فَهُمَا عَلَى ذَلِكَ إِلَى اليَوْمِ(٢).

**٣٠٩٣- ئەبو بەکریش ﷺ پێی وت: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئێمە میراتمان لێ نابردرێت، هەرچیمان لە دوای خۆمان بەجێهێشت خێر و صەدەقەیە))، بۆیە فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ توڕە بوو، دەنگی لە ئەبو بەکر وەرگرت و بەردەوام بوو لەو دەنگ لێ وەرگرتنەی هەتا مرد، کە لە پاش پێغەمبەر ﷺ شەش مانگ ژیا. عائیشە دەڵێ: وە فاتیمە داوای بەشی خۆی**

---

(١) بڕوانە: ٣٠٩٣، ٣٧١١،٤٠٣٥، ٤٢٤٠، ٦٧٢٥.

(٢) بڕوانە: ٣٧١٢، ٤٠٣٦، ٤٢٤١، ٦٧٢٦.

دەكرد لە ئەبو بەكر لە خەیبەر و فەدەك و باخی مەدینە كە پێغەمبەر ﷺ بەروبوومەكەی كردبوو بەخێر، بەڵام ئەبو بەكر بەو داوایەی ئەو ڕازی نەبوو، وتی: هەر شتێك پێغەمبەر ﷺ كاری پێ كردبێ، منیش كاری پێ دەكەم وازی لێ ناهێنم، چونكە بەڕاستی دەترسم ئەگەر هەر فەرمانێكی ئەو واز لێ بێنم لە ڕاستی لابدەم. سەبارەت بە ئەو باخەی مەدینە كە كردبووی بەخێر، ئەوە عومەر داوێتی بە عەلی و عەبباس، خەیبەر و فەدەكیش بەدەست عومەرەوەیە و دەڵێ: وەقف بووە بۆ ئەو ماف و پێویستیانەی ڕووی لێ دەكرد و ئەو پێشهاتانەی لێی ڕوودەدات (لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ خۆیدا)، كەواتە خەیبەر و فەدەك تایبەتە بەو كەسەوە پێشەوا و گەورەی مسوڵمانانە وتی: ئەو دووانە بەو شێوەیە تا ئەمڕۆش.

٣٠٩٤- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُحَمَّدٍ الفَرْوِيُّ، حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسِ بْنِ الحَدَثَانِ، وَكَانَ مُحَمَّدُ بْنُ جُبَيْرٍ ذَكَرَ لِي ذِكْرًا مِنْ حَدِيثِهِ ذَلِكَ، فَانْطَلَقْتُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى مَالِكِ بْنِ أَوْسٍ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ الحَدِيثِ، فَقَالَ مَالِكٌ: بَيْنَا أَنَا جَالِسٌ فِي أَهْلِي حِينَ مَتَعَ النَّهَارُ، إِذَا رَسُولُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ يَأْتِينِي، فَقَالَ: أَجِبْ أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ. فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى عُمَرَ، فَإِذَا هُوَ جَالِسٌ عَلَى رِمَالِ سَرِيرٍ، لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فِرَاشٌ مُتَّكِئٌ عَلَى وِسَادَةٍ مِنْ أَدَمٍ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ ثُمَّ جَلَسْتُ فَقَالَ: يَا مَالِ، إِنَّهُ قَدِمَ عَلَيْنَا مِنْ قَوْمِكَ أَهْلُ أَبْيَاتٍ، وَقَدْ أَمَرْتُ فِيهِمْ بِرَضْخٍ فَاقْبِضْهُ فَاقْسِمْهُ بَيْنَهُمْ. فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، لَوْ أَمَرْتَ بِهِ غَيْرِي. قَالَ: اقْبِضْهُ أَيُّهَا المَرْءُ. فَبَيْنَا أَنَا جَالِسٌ عِنْدَهُ أَتَاهُ حَاجِبُهُ يَرْفَأُ فَقَالَ: هَلْ لَكَ فِي عُثْمَانَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَالزُّبَيْرِ وَسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ يَسْتَأْذِنُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَأَذِنَ لَهُمْ فَدَخَلُوا فَسَلَّمُوا وَجَلَسُوا، ثُمَّ جَلَسَ يَرْفَأُ يَسِيرًا ثُمَّ قَالَ: هَلْ لَكَ فِي عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَأَذِنَ لَهُمَا، فَدَخَلاَ فَسَلَّمَا فَجَلَسَا، فَقَالَ عَبَّاسٌ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، اقْضِ بَيْنِي وَبَيْنَ هَذَا. وَهُمَا يَخْتَصِمَانِ فِيمَا أَفَاءَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ مِنْ بَنِي

النَّضِيرِ. فَقَالَ الرَّهْطُ عُثْمَانُ وَأَصْحَابُهُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، اقْضِ بَيْنَهُمَا وَأَرِحْ أَحَدَهُمَا مِنَ الآخَرِ. قَالَ عُمَرُ: تَيْدَكُمْ، أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ، هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ»؟. يُرِيدُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَفْسَهُ. قَالَ الرَّهْطُ: قَدْ قَالَ ذَلِكَ. فَأَقْبَلَ عُمَرُ عَلَى عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ فَقَالَ: أَنْشُدُكُمَا اللَّهَ، أَتَعْلَمَانِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ قَالَ ذَلِكَ؟ قَالاَ: قَدْ قَالَ ذَلِكَ. قَالَ عُمَرُ: فَإِنِّي أُحَدِّثُكُمْ عَنْ هَذَا الأَمْرِ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ خَصَّ رَسُولَهُ ﷺ فِي هَذَا الفَيْءِ بِشَيْءٍ لَمْ يُعْطِهِ أَحَدًا غَيْرَهُ -ثُمَّ قَرَأَ ﴿ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ ﴾ الحشر، - فَكَانَتْ هَذِهِ خَالِصَةً لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ. وَاللَّهِ مَا احْتَازَهَا دُونَكُمْ، وَلاَ اسْتَأْثَرَ بِهَا عَلَيْكُمْ قَدْ أَعْطَاكُمُوهُ، وَبَثَّهَا فِيكُمْ حَتَّى بَقِيَ مِنْهَا هَذَا الْمَالُ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةَ سَنَتِهِمْ مِنْ هَذَا المَالِ، ثُمَّ يَأْخُذُ مَا بَقِيَ فَيَجْعَلُهُ مَجْعَلَ مَالِ اللَّهِ، فَعَمِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِذَلِكَ حَيَاتَهُ، أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمُونَ ذَلِكَ؟ قَالُوا: نَعَمْ. ثُمَّ قَالَ لِعَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمَانِ ذَلِكَ؟ قَالَ عُمَرُ: ثُمَّ تَوَفَّى اللهُ نَبِيَّهُ ﷺ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. فَقَبَضَهَا أَبُو بَكْرٍ، فَعَمِلَ فِيهَا بِمَا عَمِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُ فِيهَا لَصَادِقٌ بَارٌّ رَاشِدٌ تَابِعٌ لِلْحَقِّ، ثُمَّ تَوَفَّى اللهُ أَبَا بَكْرٍ، فَكُنْتُ أَنَا وَلِيَّ أَبِي بَكْرٍ، فَقَبَضْتُهَا سَنَتَيْنِ مِنْ إِمَارَتِي، أَعْمَلُ فِيهَا بِمَا عَمِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمَا عَمِلَ فِيهَا أَبُو بَكْرٍ، وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنِّي فِيهَا لَصَادِقٌ بَارٌّ رَاشِدٌ تَابِعٌ لِلْحَقِّ، ثُمَّ جِئْتُمَانِي تُكَلِّمَانِي وَكَلِمَتُكُمَا وَاحِدَةٌ، وَأَمْرُكُمَا وَاحِدٌ، جِئْتَنِي يَا عَبَّاسُ تَسْأَلُنِي نَصِيبَكَ مِنِ ابْنِ أَخِيكَ، وَجَاءَنِي هَذَا -يُرِيدُ عَلِيًّا- يُرِيدُ نَصِيبَ امْرَأَتِهِ مِنْ أَبِيهَا، فَقُلْتُ لَكُمَا: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ». فَلَمَّا بَدَا لِي أَنْ أَدْفَعَهُ إِلَيْكُمَا قُلْتُ إِنْ شِئْتُمَا دَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا عَلَى أَنَّ عَلَيْكُمَا عَهْدَ اللَّهِ وَمِيثَاقَهُ لَتَعْمَلاَنِ فِيهَا بِمَا عَمِلَ فِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَبِمَا عَمِلَ فِيهَا أَبُو بَكْرٍ، وَبِمَا عَمِلْتُ فِيهَا مُنْذُ وَلِيتُهَا، فَقُلْتُمَا: ادْفَعْهَا إِلَيْنَا. فَبِذَلِكَ دَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا، فَأَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ، هَلْ دَفَعْتُهَا

إِلَيْهِمَا بِذَلِكَ قَالَ الرَّهْطُ: نَعَمْ. ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ فَقَالَ: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ هَلْ دَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا بِذَلِكَ؟ قَالاَ: نَعَمْ. قَالَ: فَتَلْتَمِسَانِ مِنِّي قَضَاءً غَيْرَ ذَلِكَ؟ فَوَاللَّهِ الذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ، لاَ أَقْضِي فِيهَا قَضَاءً غَيْرَ ذَلِكَ، فَإِنْ عَجَزْتُمَا عَنْهَا فَادْفَعَاهَا إِلَيَّ، فَإِنِّي أَكْفِيكُمَاهَا[1].

**٣٠٩٤- ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە لە مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەسان، -(وە دەڵێ:) موحەممەدی کوڕی جوبەیر باسێکی ئەو فەرموودەی بۆ کردم، منیش ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە لای مالیکی کوڕی ئەوس و پرسیاری ئەو فەرموودەیەم لێکرد، مالیکیش وتی- : لە کاتێکدا من لە ناو ماڵ و منداڵی خۆمدا دانیشتبووم کە خۆر بەرزبوو[2]، لەو کاتەدا نێردراوی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هات بەدوام دا و وتی: (من نێردراوم کە) تۆ بچیت بەدەم پێشەوای باوەڕدارانەوە، منیش لەگەڵیدا ڕۆیشتم و چوومە ژوورەوە بۆلای عومەر ﷺ، جا دەبینم لەسەر تەختەیەکی بەپەلکە خورما چنراوی ڕووت دانیشتووە دۆشەك و شتی وای لەسەر ڕانەخرابوو، لەسەر پشتیەکی چەرمین شانی دادا بوو، منیش سەلامم لێکرد و، پاشان دانیشتم، وتی: مالی[3] بێگومان چەند بنەماڵەیەك لە هۆزەکەی تۆ هاتوون بۆ لام منیش هەندێ یارمەتیم بڕیارداوە بۆیان، وەری بگرە و دابەشی بکە بەسەریاندا. منیش وتم: ئەی پێشەوای باوەڕداران خۆزگە فەرمانت بکردایە بە کەسێکی تر جگە لە من بۆ ئەم کارە. وتی: دەبێ وەری بگری پیاوی باش، جا لە کاتێکدا من لای عومەر ﷺ دانیشتبووم دەرگاوانەکەی کە ناوی یەرفەء[4] بوو هات بۆ لای وتی: عوسمان و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و**

---

(١) بروانە: ٢٩٠٤.

(٢) پێش نیوەڕۆ چێشتەنگاوێکی درەنگ بوو.

(٣) کورتکراوەی مالیکە، عەرەب ئەو جۆرە دەربڕینەیان هەیە، بە عائیشە دەڵێن: عائیش.

(٤) (يَرْفَأ). کۆیلەیەکی ئازادکراوی عومەر بوو لە پێش هاتنی ئیسلام لە ژیاندا بووە، بەڵام نەبیستراوە کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر بوو بێت ﷺ.

زوبەیر و سەعدی كوڕی ئەبی وەققاص ﷺ داوای مۆڵەتت لێ دەكەن ڕێگەیان دەدەمیت؟ عومەر وتی: بەڵێ (با بێنە ژوورەوە)، ئەنجا مۆڵەتی دان و هاتنە ژوورەوە سەلامیان كرد و دانیشتن، پاشان یەرفەئیش كەمێك دانیشت، پاشان وتی: عەلی و عەبباس ﷺ (داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوە دەكەن) ڕێگەیان دەدەمیت؟ وتی: بەڵێ (با بێنە ژوورەوە) جا مۆڵەتی دان و هاتنە ژوورەوە و سەلامیان كرد و دانیشتن، ئەنجا عەبباس وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران لە نێوان من و ئەمەدا بڕیاربدە- وە هەردووكیان (عەلی و عەبباس) كێشەیان بوو دەربارەی ئەو دەستكەوتەی كە خوا دەستی پێغەمبەرەكەی ﷺ خست لە (سەروەت و سامانی) بەنی نەزیر- جا كۆمەڵەكەش- عوسمان و هاوڕێكانی- وتیان: ئەی پێشەوای باوەڕداران بڕیاربدە لە نێوانیاندا لە دەستی یەكتری ڕزگاریان بكە. عومەریش وتی: لەسەرخۆبن، تو ئەو خوایەی كە بەفەرمانی ئەو زەوی و ئاسمان ڕاوەستاوە، ئایا دەزانن كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئێمە میراتمان لێ ناگیرێ ئەوەی لێمان بەجێما خێرە[1] ؟)) پێغەمبەری خوا ﷺ بەم فەرموودەیە مەبەستی خۆیەتی، كۆمەڵەكە وتیان: بەڵێ ئەوەی فەرمووە، ئینجا عومەر ڕووی كردە عەلی و عەبباس ﷺ وتی: سوێندتان دەدەم بە خوا ئایا دەزانن كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرمووە؟ هەردووكیان وتیان: بێگومان ئەوەی فەرمووە، عومەر وتی: بێگومان دەربارەی ئەو كارە باستان بۆ دەكەم، بەڕاستی خوا هەندێ لەم دەستكەوتەی تایبەت كردووە بە پێغەمبەرەوە ﷺ بە كەسی تری نەداوە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (ئەو (دەستكەوتانەی) كە خوا سەندیەوە بۆ پێغەمبەرەكەی لە ماڵی (بەنی نەزیر) ئێوە بۆ بەدەست هێنانی هیچ ئەسپ و وشترێكتان تاونەداوە، بەڵكو خوا پێغەمبەرانی زاڵ دەكات

---

(١) دەدرێت بە مسوڵمانان، نابێتە میرات بۆ میراتگران لە كەس و كاری.

بەسەر هەرکەسدا کە بیەوێت، وە خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەدەسەڵاتە). دەی ئەمە تایبەت بوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەخوا کۆی نەکردۆتەوە بۆ خۆی بەتەنها ئێوەی لێ بێ بەش بکات، وە تایبەتی نەکردووە بەخۆی جگە لە ئێوە، بێگومان داوێتی بە ئێوەش و دابەشی کردووە بەسەرتاندا، هەتا ئا ئەم سامانەی لێ ماوەتەوە، جا پێغەمبەری خوا خەرجی و بژێوی ساڵێکی خاوخێزانی لەم سامانەبوو، پاشان ئەوەشی دەمایەوە بەماڵ و سامانی خوای دادەنا (لە بەرژەوەندی گشتییدا خەرجی دەکرد)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بەم جۆرەی دەکرد تا لە ژیاندابوو، سوێندتان دەدەم بە خوا ئەمە دەزانن؟ وتیان: بەڵێ (دەیزانین) پاشان بە عەلی و عەبباسی وت: سوێندتان دەدەم بە خوا ئێوەش هەردووکتان ئەمە دەزانن؟ (هەردووکیان وتیان: بەڵێ[1]) عومەر وتی: پاشان خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ بردەوە بۆ لای خۆی، جا ئەبو بەکر وتی: من میراتگری پێغەمبەری خوام ﷺ ئیتر ئەبو بەکر ئەو ماڵەی (فەیئەی) وەرگرت و بەو جۆرەی لێکرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دەکرد (لە ژیانیدا)، وە خواش دەزانێ بەڕاستی ئەبو بەکر دەربارەی ئەو سامانە ڕاستگۆ و سەر ڕاستانە شوێنکەوتەی هەق بوو، پاشان ئەبو بەکر کۆچی دوایی کرد، جا ئیتر من میراتگری ئەبو بەکر بووم، وە ماوەی دوو ساڵە لە لێپرسراوێتیەکەم ئەو ماڵی (فەیئەم) وەرگرتووە و بەو جۆرەم لێ کرد کە هەریەك لە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر کردیان، وە خوا دەزانێ کە من دەربارەی ئەو ماڵی (فەیئە) ڕاست و دروست و چاکەکار و سەر ڕاستانە و شوێنکەوتەی هەق بووم، پاشان هەردووکتان هاتوون بۆ لام، قسەم لەگەڵدا دەکەن، قسەی هەردووکیشتان یەکە، کارەکەشتان یەك کارە، عەبباس تۆ هاتووی داوای بەشەکەت لە برازاکەی خۆت

(١) ئەوەی لە ناو کەوانەکە دایە لە گێڕانەوەی عەقیل لە ئیبنو شیهابەوە لە (کتاب الفرائض)ـدا هاتووە.

دەکەیت، ئەمەش - مەبەستی عەلی یە- هاتووە بۆ لام بەشی هاوسەرەکەی لە باوکی داوا دەکات، منیش بە هەردووکتانم وت: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئێمە میراتمان لێ ناگیرێ هەرچیمان لێ بەجێما خێرە بۆ مسوڵمانان))، ئەنجا کاتێ بۆم ڕوون بوویەوە کە بیدەم بە هەردووکتان وتم: ئەگەر دەتانەوێ دەیدەم بەهەردووکتان بە مەرجێك پەیمان و بەڵێن بدەن بە خوا کە ئێوە لە ئەو (ماڵی فەیئە)دا بەو شێوەی لێ بکەن پێغەمبەری خوا ﷺ پێی کردووە، وە ئەبو بەکر پێی کردووە، وە من پێم کردووە لەو کاتەوەی بە دەستمەوەبوو. ئێوەش وتان: (بەو شێوە) بیدە پێمان، منیش بەو شێوە دام پێتان، جا سوێندتان دەدەم بە خوا (عوسمان و هاوڕێکانی) ئایا داومە بەو دووانە بەو شێوەیە؟ کۆمەڵەکەش هەموو وتیان: بەڵی. پاشان ڕووی کردە عەلی و عەبباس و وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا ئایا بەو جۆرە دام پێتان؟ هەردووکیان وتیان: بەڵێ، عومەر وتی: دەی جگە لەمە بڕیارێکی ترتان لە من دەوێ؟ جا سوێند بەو خودایەی کە ئاسمان و زەوی بەفەرمانی ئەو ڕاوەستاوە، هیچ بڕیارێکی تیا نادەم جگە لەمە، جا ئەگەر بەو شێوەی وتم نەتان توانی جێ بەجێی بکەن (و دەبێتە کێشەتان)، ئەوسا بیگێڕنەوە بۆ لای خۆم بێگومان خۆم لە جیاتی هەردووکتان ئەو کارە دەکەم.

## ٢- بابٌ: أَدَاءُ الخُمُسِ مِنَ الدِّينِ

٣٠٩٥- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ الضُّبَعِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ يَقُولُ: قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ القَيْسِ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا هَذَا الحَيَّ مِنْ رَبِيعَةَ، بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ كُفَّارُ مُضَرَ، فَلَسْنَا نَصِلُ إِلَيْكَ إِلاَّ فِي الشَّهْرِ الحَرَامِ، فَمُرْنَا بِأَمْرٍ نَأْخُذُ مِنْهُ وَنَدْعُو إِلَيْهِ مَنْ وَرَاءَنَا. قَالَ: «آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ، الإِيمَانِ بِاللهِ شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ -وَعَقَدَ بِيَدِهِ- وَإِقَامِ الصَّلاَةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَصِيَامِ رَمَضَانَ، وَأَنْ تُؤَدُّوا لِلَّهِ خُمُسَ مَا غَنِمْتُمْ، وَأَنْهَاكُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ وَالنَّقِيرِ وَالْحَنْتَمِ وَالْمُزَفَّتِ»[١].

## ٢- باسێک: پێنج یەک دان بەشێکە لە ئایینی ئیسلام[٢]

**٣٠٩٥- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: نوێنەری (عەبدولقەیس) هاتن وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی ئێمە کە خێڵێکین لە هۆزی ڕەبیعە لە نێوان ئێمە و جەنابتدا کافرانی هۆزی موزەڕ هەیە، جا بۆیە ئێمە ناتوانین بێنە خزمەتت لەو مانگانەدا نەبێت جەنگیان تێدا حەرامە، کەواتە فەرمانێکی (ڕوونمان) پێ بکە کاری پێ بکەین و دەستی پێوەبگرین و خەڵکانی دوای خۆمانی[٣] بۆ بانگ بکەین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((فەرمانتان پێ دەکەم بە چوار شت و، چوار شتیشتان لێ قەدەغە دەکەم: کە باوەڕبوونە بە خوا: شایەتیدان کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا- بە (پەنجەکانی) دەستی دەیژمارد- بە چاکی نوێژکردن و زەکات دان و ڕۆژووگرتنی (مانگی) ڕەمەزان، وە دەبێ پێنج یەکی دەستکەوتان بدەن بە خوا[٤]، وە ڕێگریتان دەکەم لە: کولەکەی هەڵکوڵراو کۆتکەی بنکی دار خورما و کوپەی سەوز و کوپەی قیر و زەفت تێهەڵسواو)).**

---

(١) بڕوانە: ٥٣.

(٢) یان بەشێکە لە ئیمان و باوەڕ وەک پێشتر لە (كِتَابُ الإِيمَانِ، بَابٌ: أَدَاءُ الخُمُسِ مِنَ الإِيمَانِ) باسمان کرد فەرموودەی (٥٣).

(٣) هۆزەکەمان، یان خەڵکی شوێنە دوورەکان لە دەرەوەی مەدینە.

(٤) ئەمانە ئەو چوار شتە بوون فەرمانی پێکردن.

## ٣- بابُ نَفَقَةِ نِسَاءِ النَّبِيِّ ﷺ بَعْدَ وَفَاتِهِ

٣٠٩٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَقْتَسِمُ وَرَثَتِي دِينَارًا، مَا تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِي وَمَئُونَةِ عَامِلِي فَهْوَ صَدَقَةٌ»[١].

## ٣- باسی خەرجی هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ دوای وەفاتی

**٣٠٩٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((میراتگرانم دینارێك دابەش نەکەن، لە پاش خەرجی خێزانەکانم و خەرجی سەرکارەکەم ئەوەی لێم بەجێما ئەوە خێرە (لە ڕێی خوادا دەبەخشرێت) )).**

٣٠٩٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمَا فِي بَيْتِي مِنْ شَيْءٍ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ، إِلاَّ شَطْرُ شَعِيرٍ فِي رَفٍّ لِي، فَأَكَلْتُ مِنْهُ حَتَّى طَالَ عَلَيَّ، فَكِلْتُهُ فَفَنِيَ[٢].

**٣٠٩٧- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد شتێك لە ماڵمدا نەبوو گیانلەبەر بیخوات، هەندێك[٣] جۆ نەبێ لە ڕەفەکەمدا بوو، جا بۆ ماوەیەکی زۆر لێم خوارد، ئەنجا پێوام ئیتر تەواو بوو.**

٣٠٩٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ الحَارِثِ قَالَ: مَا تَرَكَ النَّبِيُّ ﷺ إِلاَّ سِلاَحَهُ، وَبَغْلَتَهُ البَيْضَاءَ، وَأَرْضًا تَرَكَهَا صَدَقَةً[٤].

---

(١) بڕوانە: ٢٧٧٦.
(٢) بڕوانە: ٦٤٥١.
(٣) یان نیو وەسق.
(٤) بڕوانە: ٢٧٣٩.

٣٠٩٨- عەمری کوڕی حاریس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەدوای (وەفاتی) هیچی بەجێ نەهێڵا جگە چەکەکەی و، ئێسترە ماچە سپیەکەی و، زەویەك کە کردبووی بەخێر (لە ڕێی خوادا).

## ٤- بابُ مَا جَاءَ فِي بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ، وَمَا نُسِبَ مِنَ البُيُوتِ إِلَيْهِنَّ

وَقَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ ﴿٣٣﴾ ﴾ الأحزاب، وَ﴿ لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ ﴿٥٣﴾ ﴾ الأحزاب.

٣٠٩٩- حَدَّثَنَا حِبَّانُ بْنُ مُوسَى وَمُحَمَّدٌ قَالاَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ وَيُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: لَمَّا ثَقُلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ اسْتَأْذَنَ أَزْوَاجَهُ أَنْ يُمَرَّضَ فِي بَيْتِي فَأَذِنَّ لَهُ[1].

## ٤- باسی ئەوەی دەربارەی ماڵی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ هاتووە وە ئەو ماڵانەی دراوەتە پاڵیان

وە ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (وە لە ماڵەکانی خۆتاندا[2] بمێننەوە)، وە (مەچنە ژوورەوە بۆ ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ مەگەر ڕێگەتان پێ بدری).

٣٠٩٩- عوتبەی کوڕی مەسعوود دەگێڕێتەوە، کە عائیشەی ﵂ هاوسەری پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: کاتێ نەخۆشیەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ قورس بوو، مۆڵەتی لە خێزانەکانی خواست کە لە ماڵی من چاودێری نەخۆشیەکەی بکرێت، ئەوانیش مۆڵەتیاندا.

---

(١) بڕوانە: ١٩٨.

(٢) مەبەستی ئایەتەکە خێزانەکانی پێغەمبەرە ﷺ.

٣١٠٠- حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا نَافِعٌ، سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: تُوُفِّيَ النَّبِيُّ ﷺ فِي بَيْتِي، وَفِي نَوْبَتِي، وَبَيْنَ سَحْرِي وَنَحْرِي، وَجَمَعَ اللهُ بَيْنَ رِيقِي وَرِيقِهِ. قَالَتْ: دَخَلَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بِسِوَاكٍ، فَضَعُفَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْهُ، فَأَخَذْتُهُ فَمَضَغْتُهُ ثُمَّ سَنَنْتُهُ بِهِ[١].

**٣١٠٠- ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: عائیشە ﵂ وتی: پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی مندا و لەسەرەی مندا و (سەری) لە نێوان سنگ و گەردنی مندابوو وەفاتی کرد، وە خوای گەورە تفی من و ئەوی پێکەوە کۆکردەوە، عائیشە وتی: عەبدوڕەحان هاتە ژوورەوە سیواکێکی پێ بوو پێغەمبەر ﷺ خۆی توانای سیواك کردنی نەبوو، بۆیە من سیواکەکەم لێ وەرگرت و جویم، پاشان سیواکم پێ کرد بۆی.**

٣١٠١- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، أَنَّ صَفِيَّةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا جَاءَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ تَزُورُهُ، وَهُوَ مُعْتَكِفٌ فِي المَسْجِدِ فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ ثُمَّ قَامَتْ تَنْقَلِبُ فَقَامَ مَعَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى إِذَا بَلَغَ قَرِيبًا مِنْ بَابِ المَسْجِدِ عِنْدَ بَابِ أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، مَرَّ بِهِمَا رَجُلَانِ مِنَ الأَنْصَارِ، فَسَلَّمَا عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، ثُمَّ نَفَذَا فَقَالَ لَهُمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: «عَلَى رِسْلِكُمَا». قَالَا: سُبْحَانَ اللهِ يَا رَسُولَ اللهِ. وَكَبُرَ عَلَيْهِمَا ذَلِكَ. فَقَالَ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَبْلُغُ مِنَ الإِنْسَانِ مَبْلَغَ الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَيْئًا»[٢].

**٣١٠١- عەلی کوڕی حوسەین ﵄ گێڕایەوە کە صەفییەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕایەوە وتی: کە ئەو (صەفییە) هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی بکات[٣] لە کاتێکدا ئەو (پێغەمبەر ﷺ لە ئیعتیکافدا بوو لە مزگەوتدا، لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندا، پاشان هەستا بگەڕێتەوە (بۆ ماڵی خۆی)،**

---

(١) بڕوانە: ٨٩٠.

(٢) بڕوانە: ٢٠٣٥.

(٣) لە شەودا سەردانی کرد، لە جێگایەکی تردا بوخاری بەوجۆرە گێڕاویەتیەوە (ارشاد الساری: ٣/٤٤٣).

**پێغەمبەری خواش ﷺ لەگەڵیدا هەستا (لەگەڵی ڕۆشت) تا گەشتە ئەو دەرگایەی مزگەوت لای دەرگای (ماڵی) ئوممو سەلەمەی خێزانی پێغەمبەری خوایە ﷺ، (لەو کاتەدا) دوو پیاوی ئەنصارڕی تێپەڕین بەلای هەردووکیاندا و سەلامیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پاشان بەپەلە ڕۆیشتن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی بەهەردووکیان: ((پەلە مەکەن))[1] هەردووکیان وتیان: پاك و بێگەردی بۆ خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وتەکەی پێغەمبەریان لا گران و قورس بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان شەیتان لە مرۆڤدا دەگاتە ئەو شوێنەی خوێنی دەگاتێ، وە بەڕاستی لەوە ترسام کە شتێکی خراپ بخاتە دڵتانەوە)).**

٣١٠٢- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنْ وَاسِعِ بْنِ حَبَّانَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: ارْتَقَيْتُ فَوْقَ بَيْتِ حَفْصَةَ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْضِي حَاجَتَهُ، مُسْتَدْبِرَ القِبْلَةِ، مُسْتَقْبِلَ الشَّأْمِ[2].

**٣١٠٢- عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: (ڕۆژێك) ڕۆیشتمە سەربانی ماڵی حەفصە ﷺ و پێغەمبەرم ﷺ بینی دەستی بە ئاو دەگەیاند، پشت لەقیبلە بوو ڕووی لە شام بوو.**

٣١٠٣- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي العَصْرَ وَالشَّمْسُ لَمْ تَخْرُجْ مِنْ حُجْرَتِهَا[3].

**٣١٠٣- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسری دەکرد هێشتا تیشکی خۆر لە ژوورەکەی عائیشەدا مابوو.**

---

(١) مەبەستی ئەوە بوو ئەو ئافرەتەی لەگەڵم دایە صەفییەی خێزانمە.

(٢) بڕوانە: ١٤٥.

(٣) بڕوانە: ٥٢٢.

٣١٠٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ خَطِيبًا، فَأَشَارَ نَحْوَ مَسْكَنِ عَائِشَةَ فَقَالَ: «هُنَا الفِتْنَةُ -ثَلاَثًا- مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ»[1].

**٣١٠٤- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەستایەوە وتاریدا، جا ئاماژەی بۆ لای ماڵی عائیشە کرد و فەرمووی: ((لەوێوە[2] ئاژاوە پەیدا دەبێت - سێ جار دووبارەی کردەوە - لەو شوێنەوە کە شەیتان سەردەردێنێت)).**

٣١٠٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَمْرَةَ ابْنَةِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ عِنْدَهَا، وَأَنَّهَا سَمِعَتْ صَوْتَ إِنْسَانٍ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِ حَفْصَةَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا رَجُلٌ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُرَاهُ فُلاَنًا- لِعَمِّ حَفْصَةَ مِنَ الرَّضَاعَةِ-الرَّضَاعَةُ تُحَرِّمُ مَا تُحَرِّمُ الوِلاَدَةُ»[3].

**٣١٠٥- عەمرەی کچی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، کە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدا کە پێغەمبەری خوا لای ئەو بوو، وە عائیشە گوێی لە دەنگی کەسێك بوو مۆڵەتی دەخواست بۆ چوونە ژوورەوە بۆ ماڵی حەفصە ﷺ، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە پیاوێکە مۆڵەت دەخوازێ لە ماڵەوەی جەنابت (کە ماڵی حەفصەیە)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((وابزانم فلانە کەسە- مامی شیری حەفصە بوو- ئەوەی ڕەچەڵەك و لە دایك بوون حەرام دەکات، شیر خواردنیش حەرامی دەکات)).**

(١) بڕوانە: ٣٢٧٩، ٣٥١١، ٥٢٩٦. ٧٠٩٢، ٧٠٩٣.
(٢) لە ڕۆژهەڵاتەوە فیتنە و ئاشووب بەرپا دەبێت.
(٣) بڕوانە: ٢٦٤٤.

## ٥- بابُ مَا ذُكِرَ فِي دِرْعِ النَّبِيِّ ﷺ وَعَصَاهُ وَسَيْفِهِ وَقَدَحِهِ وَخَاتَمِهِ وَمَا اسْتَعْمَلَ الْخُلَفَاءُ بَعْدَهُ مِنْ ذَلِكَ مِمَّا لَمْ يُذْكَرْ قِسْمَتُهُ وَمِنْ شَعَرِهِ وَنَعْلِهِ وَآنِيَتِهِ مِمَّا يَتَبَرَّكُ أَصْحَابُهُ وَغَيْرُهُمْ بَعْدَ وَفَاتِهِ

٣١٠٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ ثُمَامَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ لَمَّا اسْتُخْلِفَ بَعَثَهُ إِلَى الْبَحْرَيْنِ، وَكَتَبَ لَهُ هَذَا الكِتَابَ وَخَتَمَهُ، وَكَانَ نَقْشُ الخَاتَمِ ثَلاَثَةَ أَسْطُرٍ مُحَمَّدٌ سَطْرٌ، وَرَسُولُ سَطْرٌ، وَاللَّهِ سَطْرٌ[1].

## ٥- باسی ئەوەی وتراوە لە بارەی زرێکەی پێغەمبەر ﷺ و گۆچان و شمشێرو جامی ئاو خواردنەوە و ئەنگوستیلەکەی، وە ئەوەی جێنشینەکان لە پاش ئەو لەو شتانەیان بەکارهێناوە لەوانەی باسی دابەشکردنی نەکراوە لە مووەکانی و نەعلەکەیی و قاپ و دەفری لەوانەی هاوەڵانی و کەسانی تر، پاش وەفاتی وەک موفەڕک بەکاریان هێناوە

**٣١٠٦- سومامە دەڵێ: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەبو بەکر ﷺ کاتێ کرایە جێنشین (ئەنەسی) نارد بۆ بەحرەین، وە ئەم نامەیەی بۆ نووسی و مۆری کرد، مۆرەکەشی سێ دێڕی لێ هەڵکۆڵرابوو (مُحَمَّدٌ) دێڕێك بوو، (رَسُولُ) دێڕێك بوو، (اللَّهِ) دێڕێك بوو.**

٣١٠٧- حدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأَسَدِيُّ، حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ طَهْمَانَ قَالَ: أَخْرَجَ إِلَيْنَا أَنَسٌ نَعْلَيْنِ جَرْدَاوَيْنِ لَهُمَا قِبَالاَنِ، فَحَدَّثَنِي ثَابِتٌ البُنَانِي بَعْدُ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّهُمَا نَعْلاَ النَّبِيِّ ﷺ[2].

---

(١) بڕوانە: ٦٥.

(٢) بڕوانە: ٥٨٥٧، ٥٨٥٨.

**٣١٠٧- عيساى كوڕى تههمان دەڵێ: ئەنەس ﷺ جوتێ نەعلی بێ مووی بۆ دەرهێنابن هەر تاکەی دوو ئاوزەنگی[١] هەبوو، (عیسای کوڕی تەهمان) دەڵێ: دواتر سابیتی بونانی بۆی گێڕامەوە لە ئەنەسەوە وتی: ئەو جوتە نەعلە نەعلەکانی پێغەمبەر ﷺ بوون.**

٣١٠٨- حدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلاَلٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: أَخْرَجَتْ إِلَيْنَا عَائِشَةُ ﷺ كِسَاءً مُلَبَّدًا وَقَالَتْ: فِي هَذَا نُزِعَ رُوحُ النَّبِيِّ ﷺ. وَزَادَ سُلَيْمَانُ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: أَخْرَجَتْ إِلَيْنَا عَائِشَةُ إِزَارًا غَلِيظًا مِمَّا يُصْنَعُ بِالْيَمَنِ، وَكِسَاءً مِنْ هَذِهِ الَّتِي يَدْعُونَهَا الْمُلَبَّدَةَ[٢].

**٣١٠٨- ئەبو بوردە دەڵێ: عائیشە ﷺ پۆشاکێکی خوری ئەستور (پینەکراو)ی بۆ دەرهێنابن، وتی: ئا لەم پۆشاکەدا پێغەمبەر ﷺ گیانی کێشرا.**
**سولەیمان لە حومەیدەوە لە ئەبی بوردەوە ئەم زیادەیان هێناوە (لە فەرموودەکەی پێشوودا نییە) و دەڵێ: عائیشە ﷺ پۆشاکێکی ئەستوری بۆ دەرهێنابن لەوانەی کە لە یەمەن دروست دەکرێن، وە پۆشاکێکیش لەوانەی پێیان دەڵێن مولەبەدە[٣].**

٣١٠٩- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ قَدَحَ النَّبِيِّ ﷺ انْكَسَرَ، فَاتَّخَذَ مَكَانَ الشَّعْبِ سِلْسِلَةً مِنْ فِضَّةٍ. قَالَ عَاصِمٌ: رَأَيْتُ الْقَدَحَ وَشَرِبْتُ فِيهِ[٤].

---

(١) القبال: ئاوزەنگی پێڵاو (ئەلمونجید بە کوردی ١٨/٤٠).
(٢) بڕوانە: ٥٨١٨.
(٣) الملبدە: پۆشاکێکی ناوەڕاست ئەستورە دەڵێی لەبادە، یان مەبەست پێی (پینەکراوە).
(٤) بڕوانە: ٥٦٣٨.

**٣١٠٩- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە جامەکەی پێغەمبەر ﷺ شکا، ئەنجا ئەو شوێنەی شکابوو بەتەلێکی زیو بەستیەوە[1]. عاصیم دەڵێ: ئەو جامەم دیوە و ئاوم تیا خواردۆتەوە.**

٣١١٠- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ مُحَمَّدٍ الجَرْمِيُّ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا أَبِي،أَنَّ الْوَلِيدَ بْنَ كَثِيرٍ حَدَّثَهُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَلْحَلَةَ الدُّؤَلِيِّ حَدَّثَهُ، أَنَّ ابْنَ شِهَابٍ حَدَّثَهُ، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ حُسَيْنٍ حَدَّثَهُ أَنَّهُمْ حِينَ قَدِمُوا المَدِينَةَ مِنْ عِنْدِ يَزِيدَ بْنِ مُعَاوِيَةَ مَقْتَلَ حُسَيْنِ بْنِ عَلِيٍّ رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَيْهِ لَقِيَهُ المِسْوَرُ بْنُ مَخْرَمَةَ، فَقَالَ لَهُ: هَلْ لَكَ إِلَيَّ مِنْ حَاجَةٍ تَأْمُرُنِي بِهَا؟ فَقُلْتُ لَهُ: لاَ. فَقَالَ لَهُ: فَهَلْ أَنْتَ مُعْطِيَّ سَيْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَغْلِبَكَ الْقَوْمُ عَلَيْهِ، وَايْمُ اللَّهِ، لَئِنْ أَعْطَيْتَنِيهِ لاَ يُخْلَصُ إِلَيْهِمْ أَبَدًا حَتَّى تُبْلَغَ نَفْسِي، إِنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ خَطَبَ ابْنَةَ أَبِي جَهْلٍ عَلَى فَاطِمَةَ ﷺ فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ النَّاسَ فِي ذَلِكَ عَلَى مِنْبَرِهِ هَذَا وَأَنَا يَوْمَئِذٍ مُحْتَلِمٌ فَقَالَ: «إِنَّ فَاطِمَةَ مِنِّي، وَأَنَا أَتَخَوَّفُ أَنْ تُفْتَنَ فِي دِينِهَا». ثُمَّ ذَكَرَ صِهْرًا لَهُ مِنْ بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ، فَأَثْنَى عَلَيْهِ فِي مُصَاهَرَتِهِ إِيَّاهُ قَالَ: «حَدَّثَنِي فَصَدَقَنِي، وَوَعَدَنِي فَوَفَى لِي، وَإِنِّي لَسْتُ أُحَرِّمُ حَلاَلاً وَلاَ أُحِلُّ حَرَامًا، وَلَكِنْ وَاللَّهِ لاَ تَجْتَمِعُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَبِنْتُ عَدُوِّ اللَّهِ أَبَدًا»[2].

**٣١١٠- ئیبنو شیهاب دەڵێ: عەلی کوڕی حوسەین بۆی گێڕایەوە کە ئەوان کاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە کە لای یەزیدی کوڕی موعاویە هاتنەوە، ئەوکاتەی حوسەینی کوڕی عەلی ﷺ کوژرا. میسوەری کوڕی مەخرەمە بەو گەیشت و وتی: بە عەلی هیچ پێویستیەکت بە من هەیە فەرمانم پێ بکەی؟ منیش وتم: نەخێر، جا مەخرەمە پێی وت: ئایا شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەی بە**

---

(١) دەگونجێ بەم جۆرەش مانا بکرێ: ئەنجا شوێنی شکاوەکەی بەزیو پینەکرد.

(٢) بڕوانە: ٩٢٦.

من، چونکە بەڕاستی من دەترسم کە ئەو کەسانە بەزۆر لێت بسەنن، سوێند بەخوا ئەگەر ئەو شمشێرە بدەیت بەمن هەرگیز ناکەوێتە دەستیان هەتا من دەمرم. بێگومان عەلی کوڕی ئەبو تالیب خوازبێنی کچی ئەبو جەهلی کرد بەسەر فاتیمەدا ﷺ، جا گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەیەوە وتاری دا بۆ خەڵکی لەسەر ئەو دوانگەیە و من لەو کاتەدا باڵغ بوو بووم فەرمووی: ((بێگومان فاتیمە لە منە، و من دەترسم دەربارەی ئایینەکەی تووشی فیتنە ببێت))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ باسی زاوایەکی خۆی کرد لە تیرەی عەبدوشەمس[1] و ستایشی کرد لە بارەی خزمایەتیەکەی لەگەڵیدا و فەرمووی: ((ڕاستی کرد لەو قسەی لەگەڵی کردم و بەڵێنی پێدام بەجێی هێنا، وە بەڕاستی من حەڵاڵ حەرام ناکەم حەرامیش حەڵاڵ ناکەم، بەڵام سوێند بەخوا هەرگیز کچی پێغەمبەری خوا ﷺ و کچی دوژمنی خوا پێکەوە کۆنابنەوە)).

٣١١١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سُوقَةَ، عَنْ مُنْذِرٍ، عَنِ ابْنِ الحَنَفِيَّةِ قَالَ: لَوْ كَانَ عَلِيٌّ ﷺ ذَاكِرًا عُثْمَانَ ﷺ ذَكَرَهُ يَوْمَ جَاءَهُ نَاسٌ فَشَكَوْا سُعَاةَ عُثْمَانَ، فَقَالَ لِي عَلِيٌّ: اذْهَبْ إِلَى عُثْمَانَ فَأَخْبِرْهُ أَنَّهَا صَدَقَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَمُرْ سُعَاتَكَ يَعْمَلُونَ فِيهَا.فَأَتَيْتُهُ بِهَا فَقَالَ: أَغْنِهَا عَنَّا. فَأَتَيْتُ بِهَا عَلِيًّا فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ: ضَعْهَا حَيْثُ أَخَذْتَهَا[2].

٣١١١- مونزیر لە موحەممەدی کوڕی حەنەفییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەگەر عەلی ﷺ باسی عوسمانی ﷺ بکردایە (بە خراپە)، ئەو ڕۆژە باسی دەکرد کە کەسانێك هاتن بۆ لای و سکاڵای خۆیان لە کارمەندانی زەکاتی عوسمانی هێنا بۆ لای، عەلیش ﷺ بەمنی وت: بڕۆ بۆ لای عوسمان و پێی بڵێ ئەو پەڕاوە (شێوەی

---

(١) مەبەستی عاصی کوڕی ڕەبیعە کە مێردی زەینەبی کچی بوو، پێش بون بە پێغەمبەر ﷺ. بڕوانە: إرشاد الساري:٧/٢٤.

(٢) بڕوانە: ٣١١٢.

دابەشکردنی) زەکاتی پێغەمبەری خوا ﷺ تێدایە، فەرمان بدە بەکارمەندانت کاری پێ بکەن لەسەری بڕۆن، منیش پەڕاوەکەم برد بۆ عوسمان ﷺ، ئەویش وتی: لایبە نامەوێ، ئیتر هێنامەوە بۆ عەلی ﷺ و هەواڵەکەم بۆ گێڕایەوە عەلیش وتی: بیخەرەوە ئەو جێگای لێت هێناوە.

٣١١٢ - قَالَ الحُمَيْدِيُّ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سُوقَةَ قَالَ: سَمِعْتُ مُنْذِرًا الثَّوْرِيَّ، عَنِ ابْنِ الْحَنَفِيَّةِ قَالَ: أَرْسَلَنِي أَبِي: خُذْ هَذَا الْكِتَابَ فَاذْهَبْ بِهِ إِلَى عُثْمَانَ، فَإِنَّ فِيهِ أَمْرَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الصَّدَقَةِ[1].

٣١١٢- مونزیری سەوری دەگێڕێتەوە لە ئیبنو حەنەفییەوە دەڵێ: باوکم ناردمی وتی: ئەم نامە بگرە و بیبە بۆ عوسمان ﷺ، چونکە بێگومان فەرمانی پێغەمبەری ﷺ تێدایە دەربارەی زەکات.

## ٦- بابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الخُمُسَ لِنَوَائِبِ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَلِلْمَسَاكِينِ

وَإِيثَارِ النَّبِيِّ ﷺ أَهْلَ الصُّفَّةِ وَالأَرَامِلَ حِينَ سَأَلَتْهُ فَاطِمَةُ وَشَكَتْ إِلَيْهِ الطَّحْنَ وَالرَّحَى أَنْ يُخْدِمَهَا مِنَ السَّبْيِ، فَوَكَلَهَا إِلَى اللهِ.

٣١١٣- حَدَّثَنَا بَدَلُ بْنُ المُحَبَّرِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي الحَكَمُ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي لَيْلَى، حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، أَنَّ فَاطِمَةَ ﷺ اشْتَكَتْ مَا تَلْقَى مِنَ الرَّحَى مِمَّا تَطْحَنُ، فَبَلَغَهَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أُتِيَ بِسَبْيٍ، فَأَتَتْهُ تَسْأَلُهُ خَادِمًا فَلَمْ تُوَافِقْهُ، فَذَكَرَتْ لِعَائِشَةَ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ فَذَكَرَتْ ذَلِكَ عَائِشَةُ لَهُ، فَأَتَانَا وَقَدْ دَخَلْنَا مَضَاجِعَنَا، فَذَهَبْنَا لِنَقُومَ فَقَالَ: «عَلَى مَكَانِكُمَا» حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قَدَمَيْهِ عَلَى صَدْرِي فَقَالَ: «أَلاَ أَدُلُّكُمَا عَلَى خَيْرٍ مِمَّا سَأَلْتُمَاهُ، إِذَا أَخَذْتُمَا

(١) بڕوانە: ٣١١١.

مَضَاجِعَكُمَا فَكَبِّرَا اللَّهَ أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ، وَاحْمَدَا ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَسَبِّحَا ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، فَإِنَّ ذَلِكَ خَيْرٌ لَكُمَا مِمَّا سَأَلْتُمَاهُ»[1].

## ٦- باسی بەڵگە لەسەر ئەوەیپێنج یەک بۆ ئەوڕووداو و کارەگرنگانەیە بۆپێغەمبەری خوا ﷺدێتەپێشەوە، وە بۆ هەژارانە

**وە پێغەمبەرﷺ باوی خەڵکی صوفە و بێوەژنانی دا (بەسەر خەڵکی تردا)، کاتێ فاتیمە﵂ سکالای (ماندووبوونی بەدەست) کردبە هاڕینی دانەوێڵە بە دەساڕ و داوای خزمەتکارێکی کرد لەدەستکەوتەکان کە خزمەتی بکات ، پێغەمبەریشﷺ (پێی نەداو) کاری ئەوی بەخوا سپارد.**

**٣١١٣-ئیبنو ئەبی لەیلا دەڵێ: عەلی﵁ بۆیگێڕاینەوە کە فاتیمە﵂سکالای ماندوبوونیکرد لەدەست گەنم وجۆ هاڕیین بەدەستاڕ، جا پێیگەیشت کەپێغەمبەری خواﷺچەند کۆیلەو کەنیزەکێکی بۆهێنراوە، ئەنجا فاتیمە﵂ڕۆشتبۆ خزمەتیو داوای خزمەتکارێکی لێ بکات، بەڵام پێغەمبەرﷺلەوێ نەبوو (نەیبینی)، بۆیە داواکەی بۆعائیشە﵂ باسکرد، جا پێغەمبەرﷺهاتەوە عائیشەش﵂ئەو داوای بۆباسکرد، (عەلی دەڵێ:) ئەنجا پێغەمبەر هات بۆلامان لەکاتێکدا (من و فاتیمە) چووبووینە ناو نوێنی نووستنەکەمانەوە ویستمان هەڵسین فەرمووی: ((لەشوێنی خۆتان بمێنن)) (قاچی خستە سەر سنگم) هەتا ساردی قاچیم هەست پێکرد لەسەر سنگم و فەرمووی: ((ئایا شتێکتان پێ بڵێم چاکتر لەوەی هەردووکتان داواتان کردووە؟ کاتێ ڕۆیشتنە سەرجێگای نووستنەکەتان سیوچوار جار بڵێن:(الله أكبر)وسیوسێ جار بڵێن:(الحمد لله)سیوسێ جار بڵێن:(سبحان الله)،چونکە بەڕاستی ئەوە چاکترە لەوەی داواتان کردووە)).**

---

(١)بڕوانە: ٣٧٠٥، ٥٣٦١، ٦٣١٨.

## ٧- بابُ قَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ ﴿٤١﴾﴾ الأنفال. يَعْنِي: لِلرَّسُولِ قَسْمَ ذَلِكَ

قَالَ النبي ﷺ: "إِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ وَخَازِنٌ، والله يُعْطِي".

٣١١٤- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ وَمَنْصُورٍ وَقَتَادَةَ، سَمِعُوا سَالِمَ بْنَ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا مِنَ الأَنْصَارِ غُلَامٌ، فَأَرَادَ أَنْ يُسَمِّيَهُ مُحَمَّدًا -قَالَ شُعْبَةُ فِي حَدِيثِ مَنْصُورٍ إِنَّ الأَنْصَارِيَّ قَالَ: حَمَلْتُهُ عَلَى عُنُقِي فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ. وَفِي حَدِيثِ سُلَيْمَانَ وُلِدَ لَهُ غُلَامٌ، فَأَرَادَ أَنْ يُسَمِّيَهُ مُحَمَّدًا -قَالَ: «سَمُّوا بِاسْمِي، وَلاَ تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي، فَإِنِّي إِنَّمَا جُعِلْتُ قَاسِمًا أَقْسِمُ بَيْنَكُمْ». وَقَالَ حُصَيْنٌ: «بُعِثْتُ قَاسِمًا أَقْسِمُ بَيْنَكُمْ». قَالَ عَمْرٌو: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سَمِعْتُ سَالِمًا عَنْ جَابِرٍ أَرَادَ أَنْ يُسَمِّيَهُ القَاسِمَ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «سَمُّوا بِاسْمِي وَلاَ تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي»[1].

## ٧- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (ئەوە بەڕاستی پێنج یەکی ئەو (دەسکەوتە) بۆ خوا و بۆ پێغەمبەر ﷺ...) (واتە: دابەشکردنی ئەو پێنج یەکە مافی پێغەمبەرە ﷺ)

**وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((بێگومان من تەنها قاسم (دابەشکەر) و گەنجینەوانم، وە خوا (بەهرەی خۆی) دەبەخشێت))**

**٣١١٤- جابیری کوڕی عەبدوڵلا رضي الله عنهما دەڵێ: پیاوێکی ئەنصارڕی لە ئێمە کوڕێکیان بوو، جا ویستی ناوی بنێت موحەممەد- شوعبە لە فەرموودەکەی مەنصوردا- دەڵێ: پیاوەکە وتی: منداڵەکەم خستە سەرملم و بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، وە لە فەرموودەی سولەیمان (گێڕاویەتیەوە) دەڵێ: کوڕێکی بوو جا ویستی ناوی بنێت موحەممەد- پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەناوی منەوە ناوی (منداڵتان)**

---

(١)بڕوانە: ٣١١٥، ٣٥٣٨، ٦١٨٦، ٦١٨٧، ٦١٨٩، ٦١٩٦.

بنێن، بەڵام بەنازناوی منەوە نازناو (لە منداڵەکانتان) مەنێن، چونکە بەڕاستی من کراومەتە قاسم (دابەشکەر)، لە نێوانتاندا (شت و مەك) دابەش دەکەم)).

وە حوصەین (لە گێڕانەوەکەیدا) دەڵێ: فەرمووی: ((من بەدابەشکار نێردراوم لە نێوانتاندا (سامان وشت) دابەش دەکەم)).

عەمرٍ دەڵێ: شوعبە بۆی گێڕاینەوە لە قەتادەوە وتی: لە سالیمم بیست لە جابیرەوە گێڕایەوە وتی: (پیاوەکە) ویستی ناوی بنێت قاسیم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەناوی منەوە ناو بنێن، بەڵام بەنازناوی منەوە نازناو مەنێن)).

٣١١٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلاَمٌ فَسَمَّاهُ القَاسِمَ فَقَالَتِ الأَنْصَارُ: لاَ نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ وَلاَ نُنْعِمُكَ عَيْنًا، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وُلِدَ لِي غُلاَمٌ، فَسَمَّيْتُهُ الْقَاسِمَ فَقَالَتِ الأَنْصَارُ: لاَ نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ وَلاَ نُنْعِمُكَ عَيْنًا. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَحْسَنَتِ الأَنْصَارُ، سَمُّوا بِاسْمِي، وَلاَ تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي، فَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ»[1].

٣١١٥- جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پیاوێك لە ئێمە منداڵێکیان بوو ناوی نا قاسیم، ئەنصاریەکانیش وتیان: نازناوی (أَبَا الْقَاسِمِ)ت لێ نانێین و چاو و دڵ خۆشت ناکەین (بەو نازناوە)، کابراش هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کوڕێکم بووە ناوم ناوە قاسیم، ئەنصاریەکانیش وتیان: ئێمە نازناوی (أَبَا الْقَاسِمِ)ت لێ نانێین وە دڵ و چاوتی پێ خۆش ناکەین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەنصاریەکان کارێکی چاکیان کردووە، بەناوی منەوە ناو بنێن، بەڵام بە نازناوی منەوە نازناو مەنێن، چونکە بەڕاستی بەتەنها من قاسیم (دابەشکەرم) )).

(١) بڕوانە: ٣١١٤.

٣١١٦- حَدَّثَنَا حِبَّانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ يُرِدِ الله بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، وَاللَّهُ الْمُعْطِي وَأَنَا الْقَاسِمُ، وَلاَ تَزَالُ هَذِهِ الأُمَّةُ ظَاهِرِينَ عَلَى مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ ظَاهِرُونَ»[1].

**٣١١٦- حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە کە لە موعاویەی بیست وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس خوا مەبەستی چاکەی بۆی بوێ چاك لە ئایین شارەزای دەکات، خوا بەخشەر و منیش دابەشکارم، وە بەردەوام ئەم ئوممەتی (ئیسلامە) زاڵ دەبێت بەسەر ئەوانەی دژیانن، هەتا ئەو کاتەی فەرمانی خوای دێت ئەوان (مسوڵمانان) هەر زاڵ و سەرکەوتوون)).**

٣١١٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، حَدَّثَنَا هِلاَلٌ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «مَا أُعْطِيكُمْ وَلاَ أَمْنَعُكُمْ، أَنَا قَاسِمٌ أَضَعُ حَيْثُ أُمِرْتُ».

**٣١١٧- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من (سامان) نابەخشم پێتان ناشیگرمەوە لێتان (ئەوە کاری خوایە)، بەڵکو من دابەشکارم لەو شوێنەدا دایدەنێم (دابەشی دەکەم) کە فەرمانم پێکراوە)).**

٣١١٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي أَيُّوبَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الأَسْوَدِ، عَنِ ابْنِ أَبِي عَيَّاشٍ -وَاسْمُهُ نُعْمَانُ-، عَنْ خَوْلَةَ الأَنْصَارِيَّةِ ﷺ قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ رِجَالاً يَتَخَوَّضُونَ فِي مَالِ اللَّهِ بِغَيْرِ حَقٍّ، فَلَهُمُ النَّارُ يَوْمَ القِيَامَةِ».

---

(١) بڕوانە: ٧١.

٣١١٨- خەولەی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بێگومان پیاوانێك زۆر بە ناڕەوا لرف[١] لە ماڵ و سامانی خوا[٢] دەدەن بە ناڕەوا، ئەوە لە ڕۆژی دوایی دا ئاگری دۆزەخیان بۆ هەیە)).

## ٨- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: "أُحِلَّتْ لَكُمُ الغَنَائمُ"

وَقَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ وَعَدَكُمُ اللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ ﴿٢٠﴾ ﴾ الفتح، وَهْيَ لِلْعَامَّةِ حَتَّى يُبَيِّنَهُ الرَّسُولُ.

## ٨- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ: ((دەسکەوتەکان بۆ ئێوە حەڵاڵ کراوە))

وە خوای ﷻ فەرموویەتی: (خوا بەڵێنی پێ داون کە غەنیمەتی زۆر (لە بێ باوەڕان) دەگرن، بۆیە ئەم (غەنیمەتەی خەیبەرە) ی بۆ پێش خستن)، وە ئەو غەنیمەتە بۆ گشت مسوڵمانانە هەتا پێغەمبەر ﷺ ڕوونی دەکاتەوە[٣].

٣١١٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، حَدَّثَنَا حُصَيْنٌ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ عُرْوَةَ الْبَارِقِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الخَيْرُ الأَجْرُ وَالْمَغْنَمُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ»[٤].

---

(١) لرف: لرفدان خواردنی شتە بە دەست و برد (فەرهەنگی خاڵ: ٥٢٩).
(٢) ماڵ و سامانی خوا: واتە ماڵ و سامانی مسوڵمانان ئەوی مافی مسوڵمانانە خوا بە هی خۆی ناوی بردووە.
(٣) کە چۆن دابەش دەکرێت، پێنج یەکی لێ جیا دەکرێتەوە $\frac{4}{5}$ی بۆ جەنگاروانە.
(٤) بڕوانە: ٢٨٥٠.

**٣١١٩- عوروەی باریقی ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ئەسپ و ماین خێر لە ناوچەوانیاندا گرێدراوە تا ڕۆژی دوایی: کە بریتییە لە پاداشت و دەستکەوت)).**

٣١٢٠- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا هَلَكَ كِسْرَى فَلاَ كِسْرَى بَعْدَهُ، وَإِذَا هَلَكَ قَيْصَرُ فَلاَ قَيْصَرَ بَعْدَهُ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَتُنْفِقُنَّ كُنُوزَهُمَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[1].

**٣١٢٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر کیسرا مرد و لە ناوچوو، ئیتر لە دوای ئەویکیسرایەکی تر نابێتەوە، وە ئەگەر قەیصەر مرد و لە ناوچوو، ئیتر قەیصەرێکی تر لە دوای ئەو نابێتەوە، وە سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە دڵنیابن گەنجینە و سامانی هەردووکیان لە پێناوی خوا (بۆ جیهاد) خەرج دەکەن).**

٣١٢١- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، سَمِعَ جَرِيرًا، عَنْ عَبْدِ المَلِكِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا هَلَكَ كِسْرَى فَلاَ كِسْرَى بَعْدَهُ، وَإِذَا هَلَكَ قَيْصَرُ فَلاَ قَيْصَرَ بَعْدَهُ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَتُنْفَقَنَّ كُنُوزُهُمَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[2].

**٣١٢١- جابیری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کیسرا مرد و لە ناوچوو، ئیتر لە دوای ئەو کیسرایەکی تر نابێتەوە، وە ئەگەر قەیصەر مرد و لە ناوچوو، ئیتر قەیصەرێکی تر لە دوای ئەو نابێتەوە، وە سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە دڵنیابن گەنجینە و سامانی هەردووکیان لە پێناوی خوا (بۆ جیهاد) خەرج دەکەن).**

(١) بڕوانە: ٣٠٢٧.
(٢) بڕوانە: ٣٦١٩، ٦٦٢٩.

٣١٢٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا سَيَّارٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ الفَقِيرُ، حَدَّثَنَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُحِلَّتْ لِي الغَنَائِمُ»[1].

**٣١٢٢- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دەستکەوتەکان بۆ من حەڵاڵ کراون)).**

٣١٢٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «تَكَفَّلَ الله لِمَنْ جَاهَدَ فِي سَبِيلِهِ، لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ الجِهَادُ فِي سَبِيلِهِ وَتَصْدِيقُ كَلِمَاتِهِ، بِأَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، أَوْ يَرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الذِي خَرَجَ مِنْهُ مَعَ مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ»[2].

**٣١٢٣- ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا دەستەبەری کردووە بۆ کەسێك تێکۆشان بکات لە پێناو خوادا، کە تەنها خەبات کردن لە پێناوی خوادا هۆکار دەرچوونی بووبێت لەگەڵ باوەڕی تەواو بەبەڵێنەکانی خوا کە بیخاتە بەهەشتەوە، یان بیگەڕێنێتەوە بۆ جێگاکەی کە لێوەی دەرچووە لەگەڵ پاداشت یان دەستکەوت)).**

٣١٢٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، حَدَّثَنَا ابْنُ المُبَارَكِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «غَزَا نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ فَقَالَ لِقَوْمِهِ: لاَ يَتْبَعْنِي رَجُلٌ مَلَكَ بُضْعَ امْرَأَةٍ وَهْوَ يُرِيدُ أَنْ يَبْنِي بِهَا وَلَمَّا يَبْنِ بِهَا، وَلاَ أَحَدٌ بَنَى بُيُوتًا وَلَمْ يَرْفَعْ سُقُوفَهَا، وَلاَ أَحَدٌ اشْتَرَى غَنَمًا أَوْ خَلِفَاتٍ وَهْوَ يَنْتَظِرُ وِلاَدَهَا. فَغَزَا فَدَنَا مِنَ القَرْيَةِ صَلاَةَ العَصْرِ أَوْ قَرِيبًا مِنْ ذَلِكَ فَقَالَ لِلشَّمْسِ: إِنَّكِ مَأْمُورَةٌ وَأَنَا مَأْمُورٌ، اللَّهُمَّ احْبِسْهَا عَلَيْنَا. فَحُبِسَتْ، حَتَّى فَتَحَ الله عَلَيْهِ، فَجَمَعَ الغَنَائِمَ، فَجَاءَتْ -يَعْنِي النَّارَ- لِتَأْكُلَهَا، فَلَمْ تَطْعَمْهَا،

---

(١) بڕوانە: ٣٣٥.

(٢) بڕوانە: ٣٦.

فَقَالَ: إِنَّ فِيكُمْ غُلُولاً، فَلْيُبَايِعْنِي مِنْ كُلِّ قَبِيلَةٍ رَجُلٌ. فَلَزِقَتْ يَدُ رَجُلٍ بِيَدِهِ فَقَالَ: فِيكُمُ الْغُلُولُ. فَلْتُبَايِعْنِي قَبِيلَتُكَ، فَلَزِقَتْ يَدُ رَجُلَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةٍ بِيَدِهِ فَقَالَ: فِيكُمُ الْغُلُولُ، فَجَاءُوا بِرَأْسٍ مِثْلِ رَأْسِ بَقَرَةٍ مِنَ الذَّهَبِ فَوَضَعُوهَا، فَجَاءَتِ النَّارُ فَأَكَلَتْهَا، ثُمَّ أَحَلَّ اللهُ لَنَا الغَنَائِمَ، رَأَى ضَعْفَنَا وَعَجْزَنَا فَأَحَلَّهَا لَنَا»[1].

**٣١٢٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران (ویستی) غەزا بكات بە گەلەكەی فەرمووی: هەر پیاوێك ژنی مارە بڕیووە دەیەوێ بیگوێزێتەوە و هێشتا نەیگوێزاوەتەوە با شوێنم نەكەوێ (لەگەڵم نەیەت)، هەروەها هەر كەسێك كە خانوویەكی دروست كردووە و هێشتا سەری نەگرتووە، هەر كەسێكیش كە مەڕ و وشتری ئاوسی كڕیوە و چاوەڕوانی زایینیان دەكات[2]، ئەنجا (پێغەمبەرەكە) ڕۆیشت بۆ غەزاكە، جا كاتی نوێژی عەسر یان نزیكی نوێژی عەسر لە شارەكە نزیك بوویەوە بە ڕۆژی فەرموو: بێگومان تۆ فەرمان پێكراوی و منیش فەرمان پێكراوم، خودایە ئەم ڕۆژە ڕاگرە بۆمان ئاوای مەكە، ئیتر ڕۆژەكەش ڕاگیرا هەتا خوا شارەكەی بۆ ئازادكردن، ئەوسا دەسكەوتەكانی كۆكردەوە و، جا هات -واتە: ئاگرێك- بۆ ئەوەی بیسوتێنێت، بەڵام نەیسووتاند، پێغەمبەرەكە فەرمووی: بێگومان لە ناوتاندا دزێك هەیە، دەی با لە هەموو خێڵێك پیاوێك پەیمانم پێ بدات، جا دەستی پیاوێك نووسا بەدەستی پێغەمبەرەكەوە ﷺ فەرمووی: دزەكە لە ناو ئێوە دایە، دەی با هەموو خێڵەكەت پەیمانم پێ بدەن، ئەنجا دەستی دوو، یان سێ پیاو نووسا بەدەستیەوە فەرمووی: دزەكە لە ناو ئێوە دایە، ئەنجا پارچەیەك ئاڵتوونیان هێنا وەكو سەری مانگا وابوو دایاننا (لەگەڵ دەستكەوتەكان)، ئەوسا**

---

(١) بڕوانە: ٥١٥٧.

(٢) با شوێنم نەكەوون و لەگەڵمدا نەیەن بۆ غەزا.

ئاگرێك هاتوو سوتاندی، پاشان خوای گەورە دەسکەوتی بۆ ئێمە حەڵاڵ کرد، کە بینی چەند لاواز دەستەپاچەین بۆیە حەڵاڵی کرد بۆمان)).

## ٩- بابٌ: الغَنِيمَةُ لِمَنْ شَهِدَ الوَقْعَةَ

٣١٢٥- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ: لَوْلاَ آخِرُ المُسْلِمِينَ مَا فَتَحْتُ قَرْيَةً إِلاَّ قَسَمْتُهَا بَيْنَ أَهْلِهَا كَمَا قَسَمَ النَّبِيُّ ﷺ خَيْبَرَ[١].

## ٩- باسێک: دەستکەوت بۆ ئەو کەسەیە ئامادەی جەنگەکەبێت

**٣١٢٥- زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە وتی: عومەر ﷺ وتی: ئەگەر لەبەر ئەو مسوڵمانانە نەبووایە کە دواتر دێن، هەر شارێکم ئازاد بکردایە لە نێوان خەڵکەکەیدا[٢] دابەشم دەکرد، هەرچۆنێك پێغەمبەر ﷺ خەیبەری دابەشکرد.**

## ١٠- بابُ مَنْ قَاتَلَ لِمَغْنَمِ هَلْ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِهِ؟

٣١٢٦- حدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى الأَشْعَرِيُّ ﷺ قَالَ: قَالَ أَعْرَابِيٌّ لِلنَّبِيِّ ﷺ: الرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِلْمَغْنَمِ، وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِيُذْكَرَ، وَيُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ، مَنْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ فَقَالَ: «مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[٣].

---

(١) بڕوانە: ٢٣٣٤.

(٢) ئەو خەباتکارانەی ئازادیان کردووە.

(٣) بڕوانە: ١٢٣.

## ١٠- باسی کەسێک بۆ دەستکەوت جەنگ بکات[1] ئایا لە پاداشتەکەی کەم دەبێتەوە؟

**٣١٢٦- ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: عەرەبیەکی دەشتەکی عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد، وتی: پیاو هەیە بۆ دەستکەوت دەجەنگێت و پیاو هەیە بۆ ئەوەی باسی بکرێت دەجەنگێ، وە پیاو هەیە بۆ ئەوەی شوێنی دیاربێ (و بڵێن ئازایە) دەجەنگێ، جا کام لەمانە لە پێناوی خوادایە؟ فەرمووی: ((ئەو کەسەی جەنگابێت تا وشەی خوا بەرزتر بێت (بەسەر هەموو وشەیەکی تردا) هەر ئەوە لە پێناوی خوادایە)).**

## ١١- بابُ قِسْمَةِ الإِمَامِ مَا يَقْدَمُ عَلَيْهِ، وَيَخبَأُ لِمَنْ لَمْ يَحْضُرْهُ أَوْ غَابَ عَنْهُ

٣١٢٧ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُهْدِيَتْ لَهُ أَقْبِيَةٌ مِنْ دِيبَاجٍ مُزَرَّرَةٌ بِالذَّهَبِ، فَقَسَمَهَا فِي نَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَعَزَلَ مِنْهَا وَاحِدًا لِمَخْرَمَةَ بْنِ نَوْفَلٍ، فَجَاءَ وَمَعَهُ ابْنُهُ المِسْوَرُ بْنُ مَخْرَمَةَ، فَقَامَ عَلَى البَابِ فَقَالَ: ادْعُهُ لِي. فَسَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ صَوْتَهُ فَأَخَذَ قَبَاءً فَتَلَقَّاهُ بِهِ وَاسْتَقْبَلَهُ بِأَزْرَارِهِ فَقَالَ: «يَا أَبَا الْمِسْوَرِ، خَبَأْتُ هَذَا لَكَ، يَا أَبَا المِسْوَرِ، خَبَأْتُ هَذَا لَكَ». وَكَانَ فِي خُلُقِهِ شِدَّةٌ.

وَرَوَاهُ ابْنُ عُلَيَّةَ عَنْ أَيُّوبَ. قَالَ حَاتِمُ بْنُ وَرْدَانَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ عَنِ المِسْوَرِ قَدِمَتْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ أَقْبِيَةٌ. تَابَعَهُ اللَّيْثُ عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ[2].

---

(١) مەبەستیشی سەرخستنی ئاینی ئیسلام بێت.

(٢) بڕوانە: ٢٥٩٩.

## ١١- باسی پێشەوا ئەو دیاریانەی بۆ دێن دابەشی بکات، وە لێی بشارێتەوە بۆ کەسێک لەوێ نییە، یان لە شوێنێکی دیکەیە

٣١٢٧- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو مولەیکە دەگێڕێتەوە: کە چەند کەوایەکی ئاوریشمی قوڵف ئاڵتونی بەیەکداچوو بە دیاری نێردرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش دابەشی کرد لە نێوان چەند کەسێك لە هاوەڵانیدا، کەوایەکیانی جیاکردەوە لێیان بۆ مەخرەمەی کوڕی نەوفەل، مەخرەمەش هات و میسوەری کوڕی مەخرەمەشی لەگەڵدا بوو، لەبەر دەرگای ماڵی (پێغەمبەر ﷺ) وەستا وتی: (بە میسوەر) بۆم بانگ بکە، پێغەمبەریش ﷺ گوێی لە دەنگی بوو کەوایەکی هەڵگرت و بە کەواکەوە هات بۆ لای و قوڵفە ئاڵتوونیەکانی کەواکەی نیشاندا و فەرمووی: ((ئەی باوکی میسوەر ئەمەم بۆ تۆ شاردۆتەوە، ئەی باوکی میسوەر ئەمەم بۆ تۆ شاردۆتەوە))، وە مەخرەمە سیفەتێکی زبری و توندی تیابوو.

- وە ئەم فەرموودەی ئیبنو عولییە لە ئەیووبەوە گێڕاویەتیەوە. (بە مورسەلی).

- حاتیم کوڕی وەردان دەڵێ: ئەیووب بۆی گێڕاینەوە، لە ئیبنو ئەبی مولەیکەوە، لە میسوەرەوە دەڵێ: چەند کەوایەك (بەدیاری) هات بۆ پێغەمبەر ﷺ.

لەیس لە ئیبنو ئەبی مولەیکەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئەیووبی کردووە.

## ١٢- بابٌ: كَيْفَ قَسَمَ النَّبِيُّ ﷺ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرَ؟ وَمَا أَعْطَى مِنْ ذَلِكَ فِي نَوَائِبِهِ؟

٣١٢٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي الأَسْوَدِ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: كَانَ الرَّجُلُ يَجْعَلُ لِلنَّبِيِّ ﷺ النَّخَلاَتِ حَتَّى افْتَتَحَ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرَ، فَكَانَ بَعْدَ ذَلِكَ يَرُدُّ عَلَيْهِمْ[1].

## ١٢- باسێک: پێغەمبەرﷺچۆن (دەستکەوتەکانی) قورەیزە و نەزیر دابەش کرد ؟ وە لەو دەستکەوتانە چەندی دەدا بۆ ئەو شتانەی بۆی پێش دەهات؟

**٣١٢٨- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پیاوی وا هەبوو چەند دار خورمایەکی دەدا بە پێغەمبەر ﷺ (بۆ پێویستیەکانی خۆی)، هەتا سامان و زەوی قورەیزە و نەزیری گرت و کەوتە دەست، جا دوای ئەوە دار خورماکانی بۆ دەگێڕانەوە[2].**

## ١٣- بابُ بَرَكَةِ الغَازِي فِي مَالِهِ حَيًّا وَمَيِّتًا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَوُلاَةِ الأَمْرِ

٣١٢٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: قُلْتُ لأَبِي أُسَامَةَ: أَحَدَّثَكُمْ هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ؟ قَالَ: لَمَّا وَقَفَ الزُّبَيْرُ يَوْمَ الجَمَلِ دَعَانِي، فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ فَقَالَ: يَا بُنَيِّ، إِنَّهُ لاَ يُقْتَلُ اليَوْمَ إِلاَّ ظَالِمٌ أَوْ مَظْلُومٌ، وَإِنِّي لاَ أُرَانِي إِلاَّ سَأُقْتَلُ اليَوْمَ مَظْلُومًا، وَإِنَّ مِنْ أَكْبَرِ هَمِّي لَدَيْنِي، أَفَتُرَى يُبْقِي دَيْنُنَا مِنْ مَالِنَا شَيْئًا؟ فَقَالَ: يَا بُنَيِّ، بِعْ مَالَنَا فَاقْضِ دَيْنِي. وَأَوْصَى بِالثُّلُثِ، وَثُلُثِهِ لِبَنِيهِ -يَعْنِي: عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ يَقُولُ: ثُلُثُ

---

(١) بروانە: ٢٦٣٠.

(٢) کە پێشتر دابویان بەلایەوە، سوودی لێ وەربگرێت.

الثُّلُثِ، فَإِنْ فَضَلَ مِنْ مَالِنَا فَضْلٌ بَعْدَ قَضَاءِ الدَّيْنِ شَيْءٌ فَثُلُثُهُ لِوَلَدِكَ. قَالَ هِشَامٌ: وَكَانَ بَعْضُ وَلَدِ عَبْدِ اللَّهِ قَدْ وَازَى بَعْضَ بَنِي الزُّبَيْرِ -خُبَيْبٌ وَعَبَّادٌ- وَلَهُ يَوْمَئِذٍ تِسْعَةُ بَنِينَ وَتِسْعُ بَنَاتٍ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَجَعَلَ يُوصِينِي بِدَيْنِهِ وَيَقُولُ: يَا بُنَيِّ، إِنْ عَجَزْتَ عَنْهُ فِي شَيْءٍ فَاسْتَعِنْ عَلَيْهِ مَوْلاَيَ. قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا دَرَيْتُ مَا أَرَادَ حَتَّى قُلْتُ: يَا أَبَتِ مَنْ مَوْلاَكَ قَالَ: اللهُ. قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا وَقَعْتُ فِي كُرْبَةٍ مِنْ دَيْنِهِ إِلاَّ قُلْتُ: يَا مَوْلَى الزُّبَيْرِ، اقْضِ عَنْهُ دَيْنَهُ. فَيَقْضِيهِ، فَقُتِلَ الزُّبَيْرُ ﷺ وَلَمْ يَدَعْ دِينَارًا وَلاَ دِرْهَمًا، إِلاَّ أَرَضِينَ مِنْهَا الغَابَةُ، وَإِحْدَى عَشْرَةَ دَارًا بِالْمَدِينَةِ، وَدَارَيْنِ بِالْبَصْرَةِ، وَدَارًا بِالْكُوفَةِ، وَدَارًا بِمِصْرَ. قَالَ وَإِنَّمَا كَانَ دَيْنُهُ الذِي عَلَيْهِ أَنَّ الرَّجُلَ كَانَ يَأْتِيهِ بِالْمَالِ فَيَسْتَوْدِعُهُ إِيَّاهُ فَيَقُولُ الزُّبَيْرُ: لاَ وَلَكِنَّهُ سَلَفٌ، فَإِنِّي أَخْشَى عَلَيْهِ الضَّيْعَةَ، وَمَا وَلِيَ إِمَارَةً قَطُّ وَلاَ جِبَايَةَ خَرَاجٍ وَلاَ شَيْئًا، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ فِي غَزْوَةٍ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ أَوْ مَعَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ ﷺ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الزُّبَيْرِ: فَحَسَبْتُ مَا عَلَيْهِ مِنَ الدَّيْنِ فَوَجَدْتُهُ أَلْفَيْ أَلْفٍ وَمِائَتَيْ أَلْفٍ.

قَالَ: فَلَقِيَ حَكِيمُ بْنُ حِزَامٍ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي، كَمْ عَلَى أَخِي مِنَ الدَّيْنِ فَكَتَمَهُ. فَقَالَ: مِائَةُ أَلْفٍ. فَقَالَ حَكِيمٌ: وَاللَّهِ مَا أُرَى أَمْوَالَكُمْ تَسَعُ لِهَذِهِ. فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ: أَفَرَأَيْتَكَ إِنْ كَانَتْ أَلْفَيْ أَلْفٍ وَمِائَتَيْ أَلْفٍ؟ قَالَ: مَا أُرَاكُمْ تُطِيقُونَ هَذَا، فَإِنْ عَجَزْتُمْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ فَاسْتَعِينُوا بِي. قَالَ: وَكَانَ الزُّبَيْرُ اشْتَرَى الغَابَةَ بِسَبْعِينَ وَمِائَةِ أَلْفٍ، فَبَاعَهَا عَبْدُ اللَّهِ بِأَلْفِ أَلْفٍ وَسِتِّمِائَةِ أَلْفٍ ثُمَّ قَامَ فَقَالَ: مَنْ كَانَ لَهُ عَلَى الزُّبَيْرِ حَقٌّ فَلْيُوَافِنَا بِالْغَابَةِ، فَأَتَاهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ، وَكَانَ لَهُ عَلَى الزُّبَيْرِ أَرْبَعُمِائَةِ أَلْفٍ فَقَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ: إِنْ شِئْتُمْ تَرَكْتُهَا لَكُمْ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لاَ. قَالَ: فَإِنْ شِئْتُمْ جَعَلْتُمُوهَا فِيمَا تُؤَخِّرُونَ إِنْ أَخَّرْتُمْ. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لاَ. قَالَ: قَالَ: فَاقْطَعُوا لِي قِطْعَةً. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَكَ مِنْ هَا هُنَا إِلَى هَا هُنَا. قَالَ: فَبَاعَ مِنْهَا فَقَضَى دَيْنَهُ فَأَوْفَاهُ، وَبَقِيَ مِنْهَا أَرْبَعَةُ أَسْهُمٍ وَنِصْفٌ، فَقَدِمَ عَلَى مُعَاوِيَةَ وَعِنْدَهُ عَمْرُو بْنُ عُثْمَانَ وَالْمُنْذِرُ بْنُ الزُّبَيْرِ وَابْنُ زَمْعَةَ فَقَالَ لَهُ مُعَاوِيَةُ: كَمْ قُوِّمَتِ الْغَابَةُ قَالَ: كُلُّ سَهْمٍ مِائَةَ أَلْفٍ. قَالَ: كَمْ بَقِيَ قَالَ: أَرْبَعَةُ أَسْهُمٍ وَنِصْفٌ. قَالَ الْمُنْذِرُ بْنُ الزُّبَيْرِ: قَدْ أَخَذْتُ سَهْمًا بِمِائَةِ أَلْفٍ. قَالَ عَمْرُو بْنُ عُثْمَانَ: قَدْ أَخَذْتُ سَهْمًا بِمِائَةِ أَلْفٍ. وَقَالَ ابْنُ

زَمْعَةَ قَدْ أَخَذْتُ سَهْمًا بِمِائَةِ أَلْفٍ. فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: كَمْ بَقِيَ فَقَالَ: سَهْمٌ وَنِصْفٌ. قَالَ: أَخَذْتُهُ بِخَمْسِينَ وَمِائَةِ أَلْفٍ. قَالَ: وَبَاعَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ نَصِيبَهُ مِنْ مُعَاوِيَةَ بِسِتِّمِائَةِ أَلْفٍ، فَلَمَّا فَرَغَ ابْنُ الزُّبَيْرِ مِنْ قَضَاءِ دَيْنِهِ قَالَ بَنُو الزُّبَيْرِ: اقْسِمْ بَيْنَنَا مِيرَاثَنَا. قَالَ: لاَ، وَاللَّهِ لاَ أَقْسِمُ بَيْنَكُمْ حَتَّى أُنَادِيَ بِالْمَوْسِمِ أَرْبَعَ سِنِينَ: أَلاَ مَنْ كَانَ لَهُ عَلَى الزُّبَيْرِ دَيْنٌ فَلْيَأْتِنَا فَلْنَقْضِهِ. قَالَ: فَجَعَلَ كُلَّ سَنَةٍ يُنَادِي بِالْمَوْسِمِ، فَلَمَّا مَضَى أَرْبَعُ سِنِينَ: قَسَمَ بَيْنَهُمْ قَالَ: فَكَانَ لِلزُّبَيْرِ أَرْبَعُ نِسْوَةٍ، وَرَفَعَ الثُّلُثَ، فَأَصَابَ كُلَّ امْرَأَةٍ أَلْفُ أَلْفٍ وَمِائَتَا أَلْفٍ، فَجَمِيعُ مَالِهِ خَمْسُونَ أَلْفَ أَلْفٍ وَمِائَتَا أَلْفٍ.

## ١٣- باسی فەڕو بەرەكەتی غەزاكار لە سامانیدا بەزیندووی و مردووی لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و فەرمان ڕەوایاندا

**٣١٢٩- ئیسحاقی كوڕی ئیبراهیم دەڵێ: وتم بە ئەبی ئوسامە ئایا هیشامی كوڕی عوروە لە باوكییەوە هیچی بۆ گێڕانەوە لە عەبدوڵلای كوڕی زوبەیر ﷺ؟ وتی: كاتێ زوبەیر لە ڕۆژی جەنگی جەمەلدا وەستابوو، بانگی كردم منیش لە تەنیشتیدا وەستام و وتی: ئەی كوڕە شیرینەكەم بێگومان ئەوەی ئەمڕۆ دەكوژرێت ستەمكارە یان ستەم لێكراوە، وە وا گومان دەبەم كەمن ئەمڕۆ بە ستەم لێكراوی دەكوژرێم، وە بەڕاستی خەفەتی هەرە گەورەم قەرزارییەكەمە، جا ئایا تۆ بزانی قەرزەكەمان (بیدەینەوە) هیچمان بۆ دەهێڵێتەوە لە ماڵ و سامانەكەمان؟ وتی: كوڕە خۆشەویستەكەم ئەوەی هەمانە بیفرۆشە و قەرزەكەمی پێ بدەرەوە، وە وەسیەتی كرد بە سێیەكی ماڵەكەی (ئەگەر لە قەرزەكە زیادبوو)، وە سێیەكی ئەو سێیەكەش بۆ كوڕەكانی بێت -مەبەستی كوڕانی عەبدوڵلای كوڕی زوبەیرە- كە دەڵێ: سێیەكی سێیەكەكە - جا ئەگەر لە سامانەكەمان زیادەیەكی هەبوو دوا دانەوەی قەرزەكە، ئەو سێیەكی بۆ كوڕەكەت.**

هیشام (ی کوڕی عوروه) دەڵێ: هەندێ لە کوڕانی عەبدوڵڵا یەکسان بوو بوون لەگەڵ هەندێ لە کوڕانی زوبەیر -وەك: خوبەیب و عەبباد[1] - وە زوبەیر لەو ڕۆژگارەدا نۆ کوڕ و نۆ کچی هەبوو.

عەبدوڵڵا دەڵێ: جا دەستی کرد بە ئامۆژگاری کردنم لە بارەی قەرزەکەیەوە و دەیوت: ئەی کوڕی خۆم ئەگەر نەتوانی بەشێکی بدەیتەوە ئەوسا داوای پشتیوانی لە گەورەکەم بکە، وتی: جا سوێند بە خوا نەمزانی مەبەستی چیە هەتا وتم: باوەگیان: کێیە پشتیوان و گەورەی تۆ؟ وتی: خوایە. عەبدوڵڵا دەڵێ: جا سوێند بەخوا بکەوتمایەتە هەر نارەحەتیەك دەربارەی قەرزەکەی هەر دەموت: ئەی پشتیوان و گەورەی زوبەیر قەرزەکەی بۆ بدەرەوە یەکسەر دەیدایەوە. ئینجا زوبەیر کوژرا و هیچ پارە و پوڵێکی لێ بەجێ نەما، جگە لە چەند زەوییەك غابە یەکێك بوو لەو زەویانە، لەگەڵ یازدە خانوو لە مەدینە، دوو خانووش لە بەصرە، خانوویەکیش لە کوفە، خانوویەکیش لە میصر، دەڵێ: بێگومان ئەو قەرزەی لەسەری بوو بریتی بوو لەوەی کەسێك پارەی دەهێنا بە ئەمانەت لای دایدەنا، زوبەیریش دەیوت: نەخێر بەڵکو قەرزە لام، چونکە من لە تیاچوونی دەترسم.

وە زوبەیر هیچ لێپرسراوێتی یان کۆکردنەوەی خەراج و موڵکانە و هەرکارێکی تری نەکردووە و وەرنەگرتووە مەگەر لە غەزادا بووبێ لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، یان لەگەڵ ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان دا ﷺ.

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ دەڵێ: ئەو قەرزەی لەسەری (باوکم) بوو حیسابم کرد دیم دوو ملیۆن و دووسەد هەزار بوو، دەڵێ: جا حەکیمی کوڕ حیزام بە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەر گەیشت، وتی: ئەی برازای خۆم زوبەیری برام چەند

(١) کە کوڕی عەبدوڵڵا بوون لەگەڵ مامەکانیاندا بەو وەسیەتیان کە باپیرەیان بۆی کردبوون یەکسان بوو بوون.

قەرزارە؟ عەبدوڵڵاش (ئەندازەی) شاردەوە وتی: سەد هەزار قەرزارە، حەکیمیش وتی: وەڵڵاهی پێم وانییە سامانەکەتان بەشی ئەو قەرزە بکات. عەبدوڵڵاش وتی: دەی پێم بڵێ: ئەگەر قەرزەکەی دوو ملیۆن و دووسەد هەزار بێت؟ وتی: وا نازانم ئێوە توانای دانەویتان هەبێ، جا ئەگەر هەرچییەکتان پێ نەدرایەوە ئەوە داوای کۆمەکی و یارمەتی لە من بکەن.

عوروە دەڵێ: زوبەیر موڵکی غابەی بەسەد و حەفتا هەزار کڕیبوو. ئەنجا عەبدوڵڵا فرۆشتی بە ملیۆنێك و شەش سەد هەزار، پاشان هەستا و وتی: هەر کەسێك هەقێکی لای زوبەیرە بابێت بۆ لامان بۆ غابە، جا عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ڕۆیشت بۆ لای- کە چوار سەد هەزار قەرزی لای زوبەیر بوو- جەعفەر بە عەبدوڵڵای وت: ئەگەر دەتانەوێ وازی لێ دێنم بۆتان. عەبدوڵڵاش وتی: نەخێر نابێ، وتی: ئەگەر دەتانەوێ دانەوەکەی دواخەن ئەگەر قەرزدانەوە دوا دەخەن، عەبدوڵڵا وتی: نەخێر (ئەوەش ناکەین)، وتی: دە باشە بەشێك (زەویەك) بۆ من جیاکەنەوە (لێتان بکڕم).

عەبدوڵڵاش وتی: ئا لێرەوە بۆ ئا ئەوێ بۆ تۆ. جا لێی کڕی و قەرزەکەی جەعفەری بە تەواوی دایەوە، وە چوار پشك و نیوی مایەوە[1] ئەنجا عەبدوڵڵا ڕۆشت بۆ (شام بۆ) لای موعاویە -عەمری کوڕی عوسمان و مونزیری کوڕی زوبەیر و ئیبنو زەمعەی لابوو- موعاویەش بە عەبدوڵڵای وت: زەویەکەی غابەت بە چەندێ پارە دانا؟ عەبدوڵڵاش وتی: هەر پشکێکی بە سەد هەزار. وتی: چەندێکی ماوەتەوە (نەفرۆشراوە)؟ وتی: چوار پشك و نیوی. مونزیری کوڕی زوبەیری وتی: ئەوا من پشکێکم برد بەسەد هەزار، عەمرِ کوڕی عوسمانیش، وتی: منیش پشکێکم برد بە سەد هەزار، ئیبنو زەمعەش وتی:

---

(١) زەوی غابە، ئەنجا عەبدوڵڵا ڕۆشت.

منیش بشکێکم برد بەسەد هەزار، موعاویشە وتی: چەندێکی ماوە؟ عەبدوڵلا وتی: پشك و نیوێك، موعاویەش وتی: منیش ئەوم کڕی بە سەد و پەنجا هەزار، (عوروە) دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر بەشەکەی خۆی (کە کڕیبوی) فرۆشتی بە موعاویە بەشەش سەد هەزار، ئینجا عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر لە دانەوەی قەرزەکەی (باوکی) تەواو بوو، کوڕەکانی زوبەیر وتیان: میراتەکەمان لە نێوانماندا دابەش بکە، عەبدوڵلاش وتی: نەخێر سوێند بە خوا دابەشی ناکەم لە نێوانتاندا هەتا چوار ساڵ لە کاتی حەججدا جاڕنەدەم و نەڵێم: هەر کەسێك قەرزی لای زوبەیرە بابێت بۆ لامان و قەرزەکەی بدەینەوە. دەڵێ: هەموو ساڵێك لە کاتی حەججدا جاڕی دەدا، ئەنجا کە چوار ساڵەکە تەواو بوو کەلەپورەکەی دابەش کرد لە نێوانیاندا، دەڵێ: زوبەیر چوار خێزانی هەبوو، سێیەکیش لێ لابرد بوو[1]، ئەنجا هەر خێزانێکی ملیۆنێك و دوو سەد هەزاری بەرکەوت، چونکە کۆی هەموو سامانەکەی پەنجا ملیۆن و دوو سەد هەزار بوو.

## ١٤- بابٌ: إِذَا بَعَثَ الإِمَامُ رَسُولًا فِي حَاجَةٍ أَوْ أَمَرَهُ بِالْمُقَامِ هَلْ يُسْهَمُ لَهُ؟

٣١٣٠- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ مَوْهَبٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: إِنَّمَا تَغَيَّبَ عُثْمَانُ عَنْ بَدْرٍ، فَإِنَّهُ كَانَتْ تَحْتَهُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺوَكَانَتْ مَرِيضَةً. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ لَكَ أَجْرَ رَجُلٍ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا وَسَهْمَهُ»[2].

(١) پێش مردنی وەسیەتی کرد بەو ئەندازەیە.

(٢) بڕوانە: ٣٦٩٨، ٣٧٠٤، ٤٠٦٦، ٤٥١٣، ٤٥١٤، ٤٦٥٠، ٤٦٥١، ٧٠٩٥.

## ١٤- باسێک: ئەگەر پێشەوا کەسێکی نارد بۆ کارێکی پێویست، یان فەرمانی پێکرد بەمانەوە[1] ئایا بەشی دەدرێت (لە دەستکەوتی جەنگ)؟

٣١٣٠- عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: بێگومان عوسمان ئامادەی (غەزای) بەدر نەبوو، چونکە ڕوقیەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانی بوو نەخۆش بوو، پێغەمبەریش ﷺ بە عوسمانی فەرموو: ((بێگومان تۆ پاداشت و پشکی پیاوێکت هەیە لەوانەی بەشداری بەدریان کردووە)).

١٥- قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: بابٌ: وَمِنَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الخُمُسَ لِنَوَائِبِ المُسْلِمِينَ مَا سَأَلَ هَوَازِنُ النَّبِيَّ ﷺ بِرَضَاعِهِ فِيهِمْ، فَتَحَلَّلَ مِنَ المُسْلِمِينَ، وَمَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَعِدُ النَّاسَ أَنْ يُعْطِيَهُمْ مِنَ الفَيْءِ وَالأنفالِ مِنَ الخمُسِ، وَمَا أَعْطَى الأَنْصَارَ، وَمَا أَعْطَى جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ تَمْرَ خَيْبَرَ

## ١٥- ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: باسێک: لەو بەڵگانەی کە پێنج یەک بۆ پێشهاتەکانی مسوڵمانانە: ئەوەی هۆزی هەوازن داوا (ی سامان و ژن و منداڵەکان) یان کرد لە پێغەمبەر ﷺلەبەر شیرخواردنی لە ناویاندا،بۆیە پێغەمبەرﷺداوای گێڕانەوەی ژن و منداڵەکانی (هەوزانی) کرد لە مسوڵمانان بۆیان.

---

(١) نەهاتن بۆ غەزا و جیهاد.

## (بەڵگەیەکی تر) ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ بەڵێنی دەدا بە خەڵکی لە فەیئو پێنجیەکی ئەنفال بەشیان بدات[1]، وە ئەوەی دای بە (هەندێ لە) ئەنصاریەکان[2]، وە ئەوەی دای بە جابیری کوڕی عەبدوڵلا لە خورمای خەیبەر[3]

٣١٣١- ٣١٣٢- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: وَزَعَمَ عُرْوَةُ أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الحَكَمِ وَمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ أَخْبَرَاهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ حِينَ جَاءَهُ وَفْدُ هَوَازِنَ مُسْلِمِينَ، فَسَأَلُوهُ أَنْ يَرُدَّ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ وَسَبْيَهُمْ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَحَبُّ الحَدِيثِ إِلَيَّ أَصْدَقُهُ، فَاخْتَارُوا إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ إِمَّا السَّبْيَ وَإِمَّا المَالَ، وَقَدْ كُنْتُ اسْتَأْنَيْتُ بِهِمْ».

وَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ انْتَظَرَ آخِرَهُمْ بِضْعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، حِينَ قَفَلَ مِنَ الطَّائِفِ، فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ غَيْرُ رَادٍّ إِلَيْهِمْ إِلاَّ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ. قَالُوا: فَإِنَّا نَخْتَارُ سَبْيَنَا.

فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي المُسْلِمِينَ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ إِخْوَانَكُمْ هَؤُلاَءِ قَدْ جَاءُونَا تَائِبِينَ، وَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ أَنْ أَرُدَّ إِلَيْهِمْ سَبْيَهُمْ، مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُطَيِّبَ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَكُونَ عَلَى حَظِّهِ حَتَّى نُعْطِيَهُ إِيَّاهُ مِنْ أَوَّلِ مَا يُفِيءُ اللَّهُ عَلَيْنَا فَلْيَفْعَلْ».

فَقَالَ النَّاسُ: قَدْ طَيَّبْنَا ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَهُمْ. فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّا لاَ نَدْرِي مَنْ أَذِنَ مِنْكُمْ فِي ذَلِكَ مِمَّنْ لَمْ يَأْذَنْ، فَارْجِعُوا حَتَّى يَرْفَعَ إِلَيْنَا عُرَفَاؤُكُمْ أَمْرَكُمْ» فَرَجَعَ النَّاسُ، فَكَلَّمَهُمْ عُرَفَاؤُهُمْ، ثُمَّ رَجَعُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرُوهُ أَنَّهُمْ قَدْ طَيَّبُوا فَأَذِنُوا. فَهَذَا الذِي بَلَغَنَا عَنْ سَبْيِ هَوَازِنَ[4].

---

(١) بڕوانە ئەم فەرموودانە: ٣١٣٤، ٣١٣٥، ٣١٣٧ کە دواتر باسیان دەکەین.

(٢) بڕوانە: ٢٦٣٠.

(٣) ئەبو داود گێڕاویەتیەوە بە ژمارە: ٣٦٣٢ لە سوننەکەیدا.

(٤) بڕوانە: ٢٣٠٧، ٢٣٠٨.

**٣١٣١- ٣١٣٢- عورەوە دەڵێ: مەڕوانی کوڕی حەکەم و میسوەری کوڕی مەخرەمە بۆیان گێڕامەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێنەرەکانی هەوازن هاتنە خزمەتی بە مسوڵمان بوونی و داوایان لێکرد کە سامان و ژن و منداڵەکانیان بداتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێیان: ((خۆشەویسترین وتە لای خوا ڕاست ترینیەتی، کەواتە یەکێك لەو دووانە هەڵبژێرن[1]: یان ژن و منداڵە دیلەکان، یان ماڵ و سامانەکە، وە بێگومان من پەلەم نەکرد و چاوەڕوانیم کردن))، - بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ گەڕایەوە لە تائیف تا کۆتایی هاتنی سەرو دە شەوێك چاوەڕێی کردن- ئینجا کە نوێنەرەکان بۆیان ڕوونبوویەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها یەکێك لەو دووانەیان[2] بۆ دەگێڕێتەوە، وتیان: کەواتە ئێمە ژن و منداڵە دیلەکانمان هەڵدەبژێرین، ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو مسوڵماناندا هەستایە سەر پێ و سوپاس و ستایشی خوای کرد بەو شێوەی شیاوی بێت، پاشان فەرمووی: ((دوای سوپاسی خوا، بەڕاستی ئا ئەم برایانەتان بە پەشیمانیەوە[3] هاتوون بۆ لای ئێمە، وە من بۆچوونم وایە ژن و منداڵە گیراوەکانیان بدەینەوە، جا هەر کەستان پێی خۆشە و لە ناخیەوە حەز دەکات ئەو کارە بکات بابیکات، وە هەر کەسێکیشتان پێی خۆشە بەشەکەی خۆی وەك خۆی بمێنێتەوە هەتا یەکەم دەستکەوت خوای گەورە پێمان دەبەخشێت دەیدەینێ با وابکات))، ئەنجا خەڵکەکە هەموو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەمان پێ خۆشە و بە دڵ ڕازین (ژن و منداڵە کانیان بۆ بگێڕینەوە)، ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی ئێمە نازانین کێتان مۆڵەت دەدا لەو بارەیەوە و کێتان مۆڵەت نادات[4]، کەواتە بگەڕێنەوە (جێگای خۆتان) با نوێنەر و سەرپەرشتیارەکانتان بڕیاری ئێوە بەرزکەنەوە بۆمان))، ئیتر خەڵکەکەش گەڕانەوە و نوێنەرەکانیان قسەیان**

---

(١) کە بۆتان بگێڕمەوە و بتاندەمەوە.

(٢) یان ژن و منداڵەکانیان یا ماڵ و سامانەکانیان.

(٣) واتە: مسوڵمان بوون و پەشیمانن لە ڕابردوویان.

(٤) بۆ گێڕانەوەی ژن و منداڵە گیراوەکانیان.

**لەگەڵ کردن، پاشان نوێنەرەکانیان گەڕانەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵیان پێدا کە خەڵکەکە هەموو پێیان خۆشە و ڕازین و مۆڵەتیاندا بە گێڕانەوەیان، (ئیبنو شیهاب) وتی: ئا ئەمە ئەوە بوو پێمان گەیشتووە دەربارەی ژن و منداڵە دیلەکانی هەوازن.**

٣١٣٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ قَالَ: وَحَدَّثَنِي الْقَاسِمُ بْنُ عَاصِمٍ الْكُلَيْبِيُّ -وَأَنَا لِحَدِيثِ القَاسِمِ أَحْفَظُ- عَنْ زَهْدَمٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي مُوسَى، فَأُتِيَ ذَكَرَ دَجَاجَةً وَعِنْدَهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَيْمِ اللَّهِ أَحْمَرُ كَأَنَّهُ مِنَ المَوَالِي، فَدَعَاهُ لِلطَّعَامِ فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُهُ يَأْكُلُ شَيْئًا، فَقَذِرْتُهُ، فَحَلَفْتُ لاَ آكُلُ. فَقَالَ: هَلُمَّ فَلأُحَدِّثْكُمْ عَنْ ذَاكَ، إِنِّي أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي نَفَرٍ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ نَسْتَحْمِلُهُ فَقَالَ: «وَاللَّهِ لاَ أَحْمِلُكُمْ، وَمَا عِنْدِي مَا أَحْمِلُكُمْ». وَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِنَهْبِ إِبِلٍ، فَسَأَلَ عَنَّا فَقَالَ: «أَيْنَ النَّفَرُ الأَشْعَرِيُّونَ؟».

فَأَمَرَ لَنَا بِخَمْسِ ذَوْدٍ غُرِّ الذُّرَى، فَلَمَّا انْطَلَقْنَا قُلْنَا: مَا صَنَعْنَا؟ لاَ يُبَارَكُ لَنَا، فَرَجَعْنَا إِلَيْهِ فَقُلْنَا: إِنَّا سَأَلْنَاكَ أَنْ تَحْمِلَنَا، فَحَلَفْتَ أَنْ لاَ تَحْمِلَنَا أَفَنَسِيتَ؟ قَالَ: «لَسْتُ أَنَا حَمَلْتُكُمْ، وَلَكِنَّ اللَّهَ حَمَلَكُمْ، وَإِنِّي وَاللَّهِ إِنْ شَاءَ الله لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا إِلاَّ أَتَيْتُ الذِي هُوَ خَيْرٌ وَتَحَلَّلْتُهَا»[1].

**٣١٣٣- ئەیوب لە ئەبی قیلابەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: قاسیمی کوڕی عاصیمی کولەیبی بۆی گێڕامەوە - وە من فەرموودەکەی قاسیم گێڕاویەتیەوە چاکتر لەبەرمە [2] - لە زەهدەمەوە گێڕاویەتیەوە و دەڵێ: ئێمە لای ئەبو مووسا بووین ﷺ، جا باس هاتە سەر- باسی مریشکێك [3] - وە پیاوێکی سووری تیرەی**

(١) بڕوانە: ٤٣٨٥، ٤٤١٥، ٥٥١٧، ٥٥١٨. ٦٦٤٩، ٦٦٧٨، ٦٦٨٠، ٦٧١٨، ٦٧١٩، ٦٧٢١، ٧٥٥٥.

(٢) لەو فەرموودەی ئەبی قیلابە گێڕاویەتیەوە.

(٣) گێڕەرەوەکە هەموو فەرموودەکەی لەبەر نەبووە تەنها وشەی مریشکەکە نەبێت.

تەیموڵڵای لابوو وەك بڵێی غەیرە عەرەب بوو[1]، ئەبو مووسا بانگی کرد بۆ نان خواردن، پیاوەکەش وتی، من ئەم مریشکەم دیوە شتێکی (پیسی) دەخوارد، بەو هۆیەوە قێزم لێی دێتەوە بۆیە سوێندم خواردووە ئەو مریشکە نەخۆم. ئەبو مووسا وتی: وەرە با فەرموودەیەکت لەو بارەوە بۆ بگێڕمەوە: من لەگەڵ چەند کەسێکی ئەشعەری دا ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ داوامان لێکرد وڵاخمان باتێ سواری بین (بۆ غەزا)، ئەویش فەرمووی: ((سوێند بەخوا وڵاختان پێنادەم سواری بن و هیچ وڵاخێکم لا نییە سوارتان بکەم))، لەو کاتەدا چەند وشترێکی بەغەنیمەت گیراویان بۆ هێنا، ئەوسا پرسیاری ئێمەی کردبوو فەرمووی: ((کوان کەسە ئەشعەریەکان؟)) جا فەرمانی کرد پێنج وشتری کوپارە سپیان پێداین، جا کەڕۆشتین وتمان: ئێمە چ کارێکی (خراپ) مان کرد؟ بەرەکەتی تێناکەوێ بۆمان، بۆیە گەڕاینەوە بۆ خزمەتی وتمان: (ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە داوامان کرد وڵاخمان بەیتێ سواری بین، تۆش سوێندت خوارد وڵاخی سواریمان پێ نادەیت ئایا (سوێندەکەت) لەبیرچوو؟ فەرمووی: ((من وڵاخم نەداوە بە ئێوە سواری بن، بەڵکو خوا وڵاخی پێدان سواری بن، وە بێگومان من ئەگەر خوا بیەوێ سوێند بخۆم لەسەر هەر شتێك و بزانم پێچەوانەکەی چاکترە لەوەی سوێندم لەسەر خواردوە، ئەوەیان دەکەم کە چاکترە و بریتی (کەفارەت) سوێندەکەم دەدەم)).

٣١٣٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ سَرِيَّةً فِيهَا عَبْدُ اللَّهِ قِبَلَ نَجْدٍ، فَغَنِمُوا إِبِلاً كَثِيراً، فَكَانَتْ سِهَامُهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيراً -أَوْ أَحَدَ عَشَرَ بَعِيراً- وَنُفِّلُوا بَعِيراً بَعِيراً[2].

---

(١) لە دیل و کۆیلەی ڕۆمی بێت.

(٢) بڕوانە: ٤٣٣٨.

**٣١٣٤- نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ پەلە لەشكرێكی نارد ڕووەو نەجد عەبدوڵلا (ی كوڕی عومەر) یشی تایبوو، ئەنجا وشترێكی زۆریان بە غەنیمە گرت، وە بەشی هەریەكیان دوازدە - یان یازدە وشتر بوو- هەر یەكەیان زیاد لە حەقەكەی خۆی وشترێكی پێدا (لەبەر لێهاتووی).**

٣١٣٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، أَخْبَرَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُنَفِّلُ بَعْضَ مَنْ يَبْعَثُ مِنَ السَّرَايَا لأَنْفُسِهِمْ خَاصَّةً سِوَى قَسْمِ عَامَّةِ الجَيْشِ.

**٣١٣٥- ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ بەخششی تایبەتی[1] دەبەخشی بە كەسانێك لەو هێزانەی دەینارد جگە بەشی هەموو لەشكرەكە.**

٣١٣٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا بُرَيْدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: بَلَغَنَا مَخْرَجُ النَّبِيِّ ﷺ وَنَحْنُ بِالْيَمَنِ فَخَرَجْنَا مُهَاجِرِينَ إِلَيْهِ، أَنَا وَأَخَوَانِ لِي، أَنَا أَصْغَرُهُمْ، أَحَدُهُمَا أَبُو بُرْدَةَ وَالآخَرُ أَبُو رُهْمٍ -إِمَّا قَالَ: فِي بِضْعٍ، وَإِمَّا قَالَ: فِي ثَلاَثَةٍ وَخَمْسِينَ أَوِ اثْنَيْنِ وَخَمْسِينَ رَجُلاً مِنْ قَوْمِي- فَرَكِبْنَا سَفِينَةً، فَأَلْقَتْنَا سَفِينَتُنَا إِلَى النَّجَاشِيِّ بِالْحَبَشَةِ، وَوَافَقْنَا جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ وَأَصْحَابَهُ عِنْدَهُ فَقَالَ جَعْفَرٌ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَنَا هَا هُنَا، وَأَمَرَنَا بِالإِقَامَةِ فَأَقِيمُوا مَعَنَا. فَأَقَمْنَا مَعَهُ، حَتَّى قَدِمْنَا جَمِيعًا، فَوَافَقْنَا النَّبِيَّ ﷺ حِينَ افْتَتَحَ خَيْبَرَ، فَأَسْهَمَ لَنَا -أَوْ قَالَ: فَأَعْطَانَا مِنْهَا- وَمَا قَسَمَ لأَحَدٍ غَابَ عَنْ فَتْحِ خَيْبَرَ مِنْهَا شَيْئًا، إِلاَّ لِمَنْ شَهِدَ مَعَهُ، إِلاَّ أَصْحَابَ سَفِينَتِنَا مَعَ جَعْفَرٍ وَأَصْحَابِهِ، قَسَمَ لَهُمْ مَعَهُمْ[2].

---

(١) نەفل: بریتییە لەو شتەی لێپرسراوی دەیبەخشێ بە هەندێ موجاهیدی ئازا و لێهاتوو، لەبەر زیادە ئازایەتی و لێهاتووی، یان لە جەنگەكەدا ئەوەی جگە لەوەی لە غەنیمەتی گشتی كە لەوەشدا بەشیان وەكو ئەوانی كە هەیە. بڕوانە: إرشاد الساري:٥٠/٧ - ٥١.

(٢) بڕوانە: ٣٨٧٦، ٤٢٣٠، ٤٢٣٣.

**٣١٣٦- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: ئێمە لەیەمەن بووین پێمان گەشت کە پێغەمبەر ﷺ پەیدابووە و ڕەوانە کراوە، جا هاتین و کۆچمان کرد بۆ لای، من و دوو برام کە من بچوکترینیان بووم، یەکێك لە براکانم ئەبو بوردە و ئەوەی کەیان ئەبو ڕوهم بوو، - یان وتی: لەگەڵ سێ تا نۆ یان وتی: پەنجا و سێ، یان پەنجاو دوو پیاوی هۆزەکەماندا- سواری کەشتیەك بووین، جا کەشتیەکەمان بردینی بۆ لای نەجاشی لە حەبەشە، لەو کاتەدا جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب و هاوەڵەکانی لای نەجاشی بوون (لە حەبەشە)، جەعفەر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردوینی بۆئێرە فەرمانی پێکردوین لێرە بمێنینەوە، ئێوەش لەگەڵ ئێمە لێرە بمێننەوە، ئێمەش لەگەڵی ماینەوە (لە حەبەشە تا ئەو کاتەی هەمووومان هاتین بۆ (لای پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە)، لەو کاتەدا بوو پێغەمبەر ﷺ خەریبەری ئازاد کردبوو، وە (لەو دەسکەوتەکان) بەشی بۆ ئێمەش دانا- یان وتی: لەو دەستکەوتەی داینێ[1]- وە پێغەمبەریش ﷺ لەو دەستکەوتە بەشی هیچ کەسێکی نەدابوو کە ئامادەی ئازادکردنی خەیبەر نەبووبێ جگە لەو کەسانەی لەگەڵیدا ئامادەبوون، جگە لە سەرنشینی کەشتیەکە لەگەڵ جەعفەر و هاوڕێکانی بوون، ئەوانە بەشی دان لەگەڵ موجاهیدەکان.**

**٣١٣٧-** حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُنْكَدِرِ، سَمِعَ جَابِرًا ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ قَدْ جَاءَنِي مَالُ الْبَحْرَيْنِ لَقَدْ أَعْطَيْتُكَ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا».

فَلَمْ يَجِئْ حَتَّى قُبِضَ النَّبِيُّ ﷺ، فَلَمَّا جَاءَ مَالُ البَحْرَيْنِ أَمَرَ أَبُو بَكْرٍ مُنَادِيًا فَنَادَى مَنْ كَانَ لَهُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ دَيْنٌ أَوْ عِدَةٌ فَلْيَأْتِنَا. فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِي كَذَا وَكَذَا. فَحَثَا لِي ثَلاَثًا -وَجَعَلَ سُفْيَانُ يَحْثُو بِكَفَّيْهِ جَمِيعًا، ثُمَّ قَالَ لَنَا: هَكَذَا قَالَ لَنَا ابْنُ

---

(١) یان وەک موجاهیدێک بەشی داون، یان بەشی داوون مەرج نییە وەک موجاهیدێک بەشی دابن.

الْمُنْكَدِرِ- وَقَالَ مَرَّةً: فَأَتَيْتُ أَبَا بَكْرٍ فَسَأَلْتُ فَلَمْ يُعْطِنِي، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَلَمْ يُعْطِنِي، ثُمَّ أَتَيْتُهُ الثَّالِثَةَ فَقُلْتُ: سَأَلْتُكَ فَلَمْ تُعْطِنِي، ثُمَّ سَأَلْتُكَ فَلَمْ تُعْطِنِي، ثُمَّ سَأَلْتُكَ فَلَمْ تُعْطِنِي، فَإِمَّا أَنْ تُعْطِيَنِي، وَإِمَّا أَنْ تَبْخَلَ عَنِّي.

قَالَ: قُلْتَ: تَبْخَلُ عَلَيَّ مَا مَنَعْتُكَ مِنْ مَرَّةٍ إِلاَّ وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُعْطِيَكَ. قَالَ سُفْيَانُ: وَحَدَّثَنَا عَمْرٌو عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ عَنْ جَابِرٍ: فَحَثَا لِي حَثْيَةً وَقَالَ: عُدَّهَا. فَوَجَدْتُهَا خَمْسَمِائَةٍ قَالَ: فَخُذْ مِثْلَهَا مَرَّتَيْنِ. وَقَالَ يَعْنِي: ابْنَ الْمُنْكَدِرِ: وَأَيُّ دَاءٍ أَدْوَأُ مِنَ الْبُخْلِ[١].

**٣١٣٧- سوفیان دەڵێ: موحەممەدی کوڕی مونکەدیر بۆی گێڕاینەوە کە لە جابیری ﷺ بیستووە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ماڵ و سامانی بەحرەینم بۆ بێت دڵنیابە ئەوەندە و ئەوەندە و ئەوەندەت پێ دەدەم)) جا ئەو ماڵ و سامانە نەهات هەتا پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ لای خوا، ئەنجا کاتێ سامانی بەحریەن هات ئەبو بەکر ﷺ فەرمانی کرد جاڕدەرێك جاڕ بدات هەر کەس قەرز، یان بەڵێنێکی هەبوو لای پێغەمبەری خوا ﷺ بابێت بۆ لامان (پێی بدەین)، منیش ڕۆیشتم بۆ لای ئەبو بەکر وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا و ئاوای بە من فەرمووە، ئەبو بەکریش سێ مشتی پێدام، -جا سوفیان مشتەکەی بە هەردوو دەستی پێکەوە ڕوونکردەوە، پاشان بەئێمەی وت: ئیبنو مونکەدریش ئاوای بە ئێمە وت- جارێکیان (سوفیان گێڕایەوە وتی: جابیر وتی:) ڕۆیشتم بۆ لای ئەبو بەکر و داوام لێکرد و پێی نەدام، پاشان جارێکی تر ڕۆشتم بۆ لای هەر پێی نەدام، پاشان بۆ جاری سێیەم ڕۆیشتمەوە بۆ لای وتم: داوام لێکردی و پێت نەدام، پاشان داوام لێکردی و پێت نەدام، پاشان داوام لێکردی و پێت نەدام، جا یان پێم بدە یان تۆ بەرانبەر بەمن ڕەزیل و ڕژدەیت، وتی: وتت: ڕەزیلی**

(١) بڕوانە: ٢٢٩٦.

**بەرانبەرم! جارێك نەبوو كە پێم نەداوی ئیللا ویستوومە پێت بدەم، سوفیان دەڵێ: عەمرٍ بۆی گێڕاینەوە لە موحەممەدی كوڕی عەلییەوە لە جابیرەوە وتی: جا بەهەردوو دەستی مشتێكی پێدام وتی: بیژمێرە، (كە ژماردم) بینیم پێنج سەدە، وتی: دوو ئەوەندەی تر بەرە، وە وتی: واتە: ئیبنو مونكەدیر: جا چ دەردێك لە دەردی ڕژدیی خراپترە.**

٣١٣٨- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا قُرَّةُ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْسِمُ غَنِيمَةً بِالْجِعْرَانَةِ إِذْ قَالَ لَهُ رَجُلٌ: اعْدِلْ. فَقَالَ لَهُ: «شَقِيتُ إِنْ لَمْ أَعْدِلْ».

**٣١٣٨- جابیری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە جیعرانە غەنیمەتی دابەش دەكرد لەو كاتەدا پیاوێك[1] پێی وت: دادگەربە، پێغەمبەریش بەوی فەرموو: ((بەدبەخت بووم ئەگەر دادگەر نەبم))[2] .**

## ١٦- بابُ مَا مَنَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى الأُسَارَى مِنْ غَيْرِ أَنْ يُخَمِّسَ

٣١٣٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ فِي أُسَارَى بَدْرٍ: «لَوْ كَانَ الْمُطْعِمُ بْنُ عَدِيٍّ حَيًّا، ثُمَّ كَلَّمَنِي فِي هَؤُلَاءِ النَّتْنَى، لَتَرَكْتُهُمْ لَهُ»[3].

---

(١) كە ناوی (ذو الخويصرة) بوو لە هۆزی تەمیم.

(٢) بەم جۆرەش مانا كراوە: (بێگومان تۆ بەدبەختی بووی، ئەگەر من دادگەر نەبم) بە هەردوو ماناكە زانایان مانایان كردووە.

(٣) بڕوانە: ٤٠٢٤.

## ١٦- باسی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ چاکی کرد لەگەڵ دیلەکاندا (بە ئازاد کردنیان) بێ ئەوەی پێنج یەک لە دەستکەوت جیا کاتەوە

٣١٣٩- موحەممەدی کوڕی جوبەیر لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی دیلەکانی بەدر فەرمووی: ((ئەگەر موتعیمی کوڕی عەدی زیندوو بووایە، پاشان قسەی لەگەڵمدا بکردایە دەربارەی ئا ئەو بۆگەنانە وازم لێ دەهێنان و بەرەڵڵام دەکردن لەبەر موتعیم[١])).

## ١٧- بَابٌ: وَمِنَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الخُمُسَ لِلإِمَامِ، وَأَنَّهُ يُعْطِي بَعْضَ قَرَابَتِهِ دُونَ بَعْضٍ: مَا قَسَمَ النَّبِيُّ ﷺ لِبَنِي المُطَّلِبِ وَبَنِي هَاشِمٍ مِنْ خُمُسِ خَيْبَرَ قَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ: لَمْ يَعُمَّهُمْ بِذَلِكَ، وَلَمْ يَخُصَّ قَرِيبًا دُونَ مَنْ هو أَحْوَجُ إِلَيْهِ، وَإِنْ كَانَ الذي أَعْطَى لِمَا يَشْكُو إِلَيْهِ مِنَ الحَاجَةِ، وَلِمَا مسه فِي جَنْبِهِ مِنْ قَوْمِهِمْ وَحُلَفَائِهِمْ.

## ١٧- باسێک: لەو بەڵگانەی کە پێنج یەک هی پێشەوایە: بێگومان پێغەمبەر ﷺ بەشی هەندێ لە خزمەکانی داوە جیا لەوانی تر، وەک ئەوەی لە پێنج یەکی دەسکەوتی خەیبەر بەشی بەنی موتتەلیب و بەنی هاشیمی داوە، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەو پێنج یەکەی بەهەموو خزمانی نەبەخشیوە، وە نەیداوە بەخزمێکی دیاری

(١) واتە: ئازادم دەکردن لە دیلی وەک ڕێزێک بۆ موتعیم، چونکە کاتێ خۆی پەنای پێغەمبەری ﷺدا کاتێ لە تائیف گەڕایەوە.

## کراو ئەگەر خزمێک لەو هەژاتر بووبێ، وە ئەگەر ئەوەی پێی داوە (خزمێکی دوورتر بووبێ) لەبەر ئەوە بووە سکاڵای نەبوونی لای پێغەمبەر ﷺکردووە، وە یان لەبەر ئەو (زیانە) ی لە لایەن قورەیش و هاوپەیمانەکانیانەوە تووشی بووە بەهۆی لایەنگریان لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

٣١٤٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ قَالَ: مَشَيْتُ أَنَا وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَعْطَيْتَ بَنِي الْمُطَّلِبِ وَتَرَكْتَنَا، وَنَحْنُ وَهُمْ مِنْكَ بِمَنْزِلَةٍ وَاحِدَةٍ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا بَنُو الْمُطَّلِبِ وَبَنُو هَاشِمٍ شَيْءٌ وَاحِدٌ». قَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ وَزَادَ: قَالَ جُبَيْرٌ وَلَمْ يَقْسِمِ النَّبِيُّ ﷺ لِبَنِي عَبْدِ شَمْسٍ وَلاَ لِبَنِي نَوْفَلٍ. وَقَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: عَبْدُ شَمْسٍ وَهَاشِمٌ وَالْمُطَّلِبُ إِخْوَةٌ لأُمٍّ، وَأُمُّهُمْ عَاتِكَةُ بِنْتُ مُرَّةَ، وَكَانَ نَوْفَلٌ أَخَاهُمْ لأَبِيهِمْ[1].

**٣١٤٠- جوبەیری کوڕی موتعیم دەڵێ: من و عوسمانی کوڕی عەففان رضي الله عنهما ڕۆیشتین بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (لە پێنج یەك) بەشی بەنی موتتەلیبت داوە، بەڵام بەشی ئێمەت نەداوە، لە کاتێکدا ئێمە و ئەوان خزمایەتیمان بۆ تۆ وەك یەك وایە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی بەنولموتتەلیب و بەنوهاشیم یەك شتن)).**

**- لەیس دەڵێ: یونس بۆی گێڕامەوە ئەم زیادەی هەبوو: جوبەیر وتی: پێغەمبەر ﷺ بەشی بەنی عەبدی شەمس و بەنی نەوفەلی نەدا.**

**- ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: عەبدوشەمس و هاشیم موتتەلیب بران لە دایکەوە، دایکیشیان عاتیکەی کچی مورەیە، نەوفەلیش برای هەرسێکیان بوو لە باوکیانەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٣٥٠٢، ٤٢٢٩.

# پێرستی بەرگی چوارەم

## ٤٥- پەڕاوێك دەربارەی هەڵگرتنەوەی ونبوو ٣

## ٤٧- پەڕاوی هاوبەشی ٥٩

## ٤٩- پەڕاوی ئازادکردنی کۆیلە ٨٦

## ٥٠- پەڕاوی نامە بۆ نووسراو ١١٦

## ٥٢- پەڕاوی شایەتیدان ١٨٢

## ٥٣- پەڕاوی ڕێکەوتن ( ئاشتەوایی ) ٢٤٥

## ٥٤- پەڕاوی مەرجەکان ٢٦٨

## ٥٥- پەڕاوى وەسيەت كردن ٣٠٩

## ٥٦- پەڕاوی خەبات و تێکۆشان و ژیاننامەی تێکۆشەران ٣٥٦

## ٥٧- پەڕاوی پێویست بوونی پێنج یەکی دەستکەوت ٦٠٥